

# ژیانی ڕۆشنایی چاوم

## پیغەمبەری خوا

( صلى الله عليه وسلم )

بەرگی دووەم

٢٠٢١

نووسيني: قاسم محسن عولا

ێ

**پیشه کی :**

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه ، و نعوذ بألله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له .**

**وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .**

**﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ ال عمران ١٠٢ .**

**﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء ١ .**

**﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ الاحزاب ٧٠-٧١ .**

**أما بعد : فإن أصدق الحديث كتاب الله ،وخير الهدى هدي محمد ﷺ ،وشر الامور محدثاتها ، وكل محدثة بدعة ،وكل بدعة ضلالة ،وكل ضلالة في النار ..!!**

**خوینه ری به ریز ، خوشك و برایانی زیده ئازیز ، موسلمانه ئیمانداره کان ، ئه وانه ی که بۆ خوا و پیغه مبه ره کەی صولحاون ئەوانه ی گه لپه ی ئیمان له دل و دەرونیان داگیرساوه .**

**من ناوم ( قاسم محسن عولا ) یه به پیویستم زانی ئەم په رتووکه ئاماده بکه م بۆ نەوه ی دوای خۆمان که ئاشنابن به پیغه مبه ره که یان به ئیسلامه که یان که ئاینی کی پاك و بیگه رده ، بۆیه له م په رتووکه باسی پیغه مبەری خودا( صلى الله عليه وسلم ) ده که م ، بۆ ئه وەی ببیته رۆشنای چاومان ، بۆ دونیا و دوا رۆژدا ، چونکه پیویسته هه موو موسلمانیك شاره زای و زانینی باشی له سه ر پیغه مبەری خواد(صلى الله عليه وسلم ) هه بیت ، ناکریت پیغه مبەره کەت نه ناسی؟ ، وه نەزانی ئاکارو رفتاری چۆنه ؟، وه چۆن ژیاوه ؟چۆن ئه م ئیسلامه ی به ئیمه گه یاندوه ؟ وه نەزانی چۆن له دایك بووه ؟ وه نەزانی نسب و حسبی کیه؟**

**بی گومان ده بیت ئه م زانیارانه هه مووی به باشی بزانین چونکه بۆ موسلمان زۆر پیویسته له ژیانی رۆژانەیدا بۆ به ر چاو رۆشنی خۆی ، چۆن له ژیانەدا پر له کیشمه کیشه دەر بازی ده بیت ،چۆن له ژیانی رۆژانه ماندا یاسای عورفی یان ئه و یاسایانه ی که ده وله ت داده**

ێ

ریژی ، پابه ندین پیوه ، ده بیت ئه و یاساو ئاكارو رفتارو فه رمایشته كانی پیغه مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) له سه ر چاومان دا بنین ، چونكه ده بیته به خته وەری هه موو موسلمانیك خۆشگوزەرانی ئیمانداران ، ژیانیكی پر له خۆشی و به ختەوەری له ژیانی دونیادا به ری دەكات ، هه روەها ده رباز بوونه له ئاگری دۆزەخ به روه به هەشتی نه براوه دەروات ، بۆیه هه موو ئاكارو رفتاره كانی پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ته نها یه ك خوا پەرستی بووه ، وه پشت و په نای تەنها به خوای گەوره بووه، وه ژیانیكی پر له حیكمه ت ساده ی هه بوو ، تەنها خه می سه رخستنی دینه كه ی بووه ، له گه ل هاوه له به ریزه كان سلاوی خوا یان لی بیت ..!!هه روەها لیره دا باسی ژیانی پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ده كه ین كه چۆن ژیاوه له سه ره تای له دایك بوونی پیش ئیسلام و دوای هاتنی ئیسلام واته هاتنی وەحی بۆ پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم )، هه ر وەها بزانین كه پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) له چ رۆژو مانگ و سالیكدا له دایك بووه ،هه ره وها له چ سالیكدا مال ئاوایی كردووه واتا : چركه ساتی گیان سپاردنی پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ، وه هه روەها پشت و نەسبی پیغه مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ، هه روەها ئه و كارو پیشانه ی پیغه مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) له ژیانی رۆژانەی دا كه ئه نجامی ده دا ، هه روەها خوا پەرستی نزاو پارنه وه ی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وه كۆچ كردنی پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) له مككه بۆ مدینه ، هه رەها سه رتایی په یامی پیغه مبه رایه تی واتا : هاتنی وحی و نیگا ، هه روەها قوناغی بانگەوازی پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) واتا : قوناغی نهینی بانگەواز ، قوناغی ئاشكرایی بانگه واز ، هەروەها شیوازه كانی ئه شكه نجه دان و ئازاردانی پیغەمبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وه هەواله كانی له لایه ن كافران یان بی باوەرانی قوریش ، یان مالی ئەرقه م رۆلی له بانگه وازی ئیسلامدا ، هه روەها په یمانی عه قه به ی یه كه م و دووه م ، هه روەها ئه و غزوه شه رانانی كه كافرانی قریش به ر پایان ده كرد به رامبەر پیغه مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) .. هه ر بۆ یه ( خوای گەوره ) پیغه مبه ره كه ی پارستووه له هه موو ئه و قەسه و باسانه ی كه ده كریت له سه ر پیغه مبه ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) له رۆژی له دایك بوو نیه وه تا رۆژی دوایدا پاراستوویه تی ، هه روه ك به معجیزه له دایك

ێ

بوو ، وه په یامه که شی معجیزه یه تا رۆژی دوایدا ، هه روه‌ها ( خوای گه وره ) مووژده‌ی سه رکه وتنی په یامه که ی داوه به پیغه مبه ره که ی ( صلی الله علیه وسلم )، بی گومان هه‌ر له سه‌ره تاوه پله پایه ی به‌رزی هه بووه له خۆره وشتی جوان و ئاکارو رفتاری جوان راست گویی و خاوه‌ن په یمان اخلاقی به‌رز بوو ،هه روه‌ها دلسوزی پیغه مبه‌ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئۆممه ته که ی وه وه‌فایی ئۆممه‌ته که ی له ئاست دلسۆزیه که ی ، هه روها ژیانی خیزانداری و ژیانی کۆمه‌لایه تی پیغه مبه‌ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وه ژنهینان و هه لسو که وتی له گه ل خیزانه کانی دا ،وه ره وشتی پیغه مبه‌رایه تی و فه زل و پله و پایه ی پیغه مبه‌رایه تی ( صلی الله علیه وسلم ) ،هه روه‌ها له گرنگترین رووداوه کانی پیغه مبه ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، یان وه‌سیه ته کانی پیغه بمه ری خوا ( صلی الله علیه‌وسلم ) ، هه روه‌ها روخسارو شیوازی پیغه مبه ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هه روه‌ها پیغه مبه‌ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) له سه‌رده می نه فامی دا دوور بووه له شته خرا په کانی نه‌فامیدا ، وه موعجیزه کانی پیغه مبه ری ( صلی الله علیه وسلم ) وه ك : ئیسرا و میعراج ، وه موعجیزه ی شق کردنی مانگ و چه ندین موعجیزه ی تری پیغه مبه‌ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، هه روه‌ها رفتارو کردار و به زه یی پیغه مبه ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) له گه ل خیزانه کانیدا و مندا لان و ئافره تان و خزمه تکاره کانی و ، وه خه لکی شارو بیابان نیشینه کاندا وه له گه ل دوژمنه کانی له مکه وه ك کافرانی قوریش بی باوه‌راندا ، هه روه ها جوونی پیغه مبه ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ( طائیف ) ئه و هه‌لویسته خرا پانه‌ی که به رامبه‌ر پیغه مبه‌ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کردیان ، وه نه‌رم و نایانی ره حم و به زه ی پیغه مبه ری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) به رامبه‌ر خه لکی ( طائیف ) .

خوینه‌ری به ریز ئه ی برای موسلمان : بزانه ؟

باشترین شتیك یان باشترین كاریك كه ئه نجامی بده ی یان باشترین كاتیك كه ته رخانی بكه یت ، وه توانای تیدا به كار بینی ، بریتیه له : دیراسه كردن و خوینه وه و سیره و ژیانی پیغه مبه‌ری خوا یه ( صلی الله علیه وسلم ) وه رۆژگاره نه‌مرو هه میشه زیندووه‌كانی .

ئ

چونكه خوينه رو يان ئه و كه سه ى ديراسه ى ژيانى پيغه مبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) ده كات ، هه ست به هاوده مى و هاو چه رخى ئەو سەرده مه يه بكات ، وا بزانيت له گه ليياندا دەژيت و له گه ل ڕووداوه كاندا تيكه ل ده بيت .هه ر له سيره ى ژيانى پيغه مبه رى خوا (صلى الله عليەوسلم) به نده ى موسلمان فيرى چه ند لايه نيكى ژيانى پيغه مبه رى خوا (صلى الله عليه وسلم) ده بيت ، وه ك : هەلسو كه وتى ، جوون و هاتنى ،ژيانى و گوزه رانى رۆژانەى له سه رده مى نه فاميدا تا مال ئاواى كردنى حج وداع ،وه شيوازى بانگەوازى كردنى ، پيشه وايى و سەركرده و قائد له غزوه كاندا ، وه صلح كردن و ئاشتى ئارمى له سەرده مى پيغه مبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) هەروەها رفتارى و ئاكارو ژيانى پيغه مبه رى خوا (صلى الله عليه وسلم) له خۆشى و نا خۆشيدا... هتد

هەروەها موسلمانان فيرى شەركدن ده بيت له شه ره كانيدا خاله لاوازه كانى غزوه ى ئووحد خاله سه ركه وتنه كانى غزوه ى بەدر ، وه موسلمان فيرى چونيه تى هەلسو كەوت له گه ل

ڕووداوه كاند ده بيت ، هه روەها ديراسه كردنى سيرەى پيغه مبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) وا له موسلمانان ده كات برواى به خۆ بيت و ئيمانى بتەو بيت برواى به قه دەرى خوا بيت وا له موسلمان ده كات ئيراده ى به هيز بيت له هه موو ڕووداوه كاند ، وه ورەى به رزببيتەوه ، ئوميدى زياد بكات ،دلنيا ده بيت له وه ى خواى گەوره هه موو كاتيك و هه موو ده ميك پشت گيرو سه ر سه ختى مرۆڤى موسلمانه ، به لام ده بيت موسلمان به اخلاصى و به پاگى صولحابيت بۆ پەرستنى و هه لسو كه وتكردن و ملكه جى فەرمانه كانى خواى گەوره و پيغەمبەره كه ى (صلى الله عليه وسلم) .

# به شی : یەکه م

غەزای ئوحود و رووداوەکانی .

غەزاو رووداوه کانی نیوان غەزای ئوحود و ئەحزاب.

کوشتنی فەرماندەی بنی هوذیل

رووداوي ( رجیع )

کاره ساتي بئري معون

غه زای بني نضیر

غه زای دومة الجندل

غه زای الاحزاب و رووداوه کانی دواي الاحزاب

غه زای بني قریظة رووداوه کانی

کوژرانی سلامی کوری ابی الحقیق

سریەکان و چالاکی سەربازی

رووداوی بووختتان بۆ خاتوو ( عائیشه ) ( حادثة الإفك )

ریکه وتنی الحدیبیة صلح الحدیبیة

# غەزای ئوحود و ڕووداوەکانی

غەزای ئوحود لە رۆژی شەممەی پانزە هەمی مانگی شەوالی سالی (٣) کۆچی دا بوو ، کە لە نیوان موسلمانەکان و بت پەرستەکانی قورەیش دا روویدا ..

بەلی ئەم غەزایە دووهەم جەنگی خۆینایی بوو کە لە نیوان موسلمانەکانی شاری مەدینە و ،بت پەرستانی مککە دا روویدا ..

ئەم جەنگە بە پی خۆ ئامادە کردنی سەر بازی لە جەنگی بەدر دا زۆر گەورە تر بوو واتە : ریژەی سەربازە کان لە هەر دوولا دا زیاتر بوون ..

## یەکەم : هۆی بەر پابوونی جەنگی ئوحود :

هۆی بەر پابوونی ئەم جەنگە گەورەیە و سەختە ئەوە بوو کە کاتیك بت پەرستان لە جەنگی بەدر دا دۆرا و ، موسلمانە کان دەستیکی چاکیان لە بت پەرستانی قورەیش وەشاند ، هەروەها فەرماندە و پالەوانەکانیان لی کوشتن ،ئابرووی قورەیشیان لە نیمچە دوورگەی عەربی دا بر د ، وە قورەیش لە مککە بریاریان دا کە تۆ لە لە موسلمانە کان بکەنەوە ، چونکە بت پەرستانی مککە ئاگر لە جەرگ و هەناویان بەر بوو بوو بە هۆی کارە ساتی جەنگی بەدر و ئەو شکستە گەورەی کە تووشیان هات ، وە کوژرانی فەرماندە کانیان و پیاو ماقولانیان ، بۆ تۆلەسەند نەوە ئەوانە ، تا رادەیەك گریانیان لە سەر کوژراوە کانیان قەدەغە کردبوو لە شاری مککە ، هەروەها بە خیرایش نە چوون بە دەم دیلە کانیان نە وە کە موسلمانە کان بە ئازارو نالە یان بزانیت ، چونکە زۆر لووت بەرز و لە خۆ باویی بوون ..

لە (ابن اسحاق) — خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( کافرەکانی قورەیش دوای ئەوەی کە توشی شکستە گەورەکەی بەدر هاتن ، کاروانە بازرگانیە کە یان دەر باز بوو و گەرایەوە شاری مککە ، هەندیك لە ناودارانی قورەیش وە (عبدالله کوری ربیعە) ، (عەکریمەی کوری ابوجهل) ، (صەفوانی کوری ئومەیە) وە پیاوانی تری قورەیش کە کور باوك برایان کوژرا بوو لە جەنگی بەدر دا ، هەموو پیکەوە داوایان لە (ابو سفیان) و ئە بازرگانانە کرد کە کاروانە بازرگانیە کەیان پیك هینا بوو و پییان ووتن : ئەی کۆمەلانی قورەیش خۆتان دەزانن کە محمد ئیوەی کردووتە دوو کەرتەوە ؟!

ئ

هەروەها ووتیان : پیاوە باشە کانیشی کوشتوون ، ئیوەش بەم سامانە تان کۆمەکی بکەن بۆ جەنگ کردن لە گەلیدا ، بەلکو تۆلە ی کوژراوانی خۆمانی لیبکەینەوە ؟! هەروەها قورەیش بەم پیشنیارە رازی بوون . بەلی هەموو کۆ بوونەوە لە سەر جەنگ کردن ، بە ( ابو سفیان ) و هەموو خاوەن سامانی کاروانەکەو هەموو لایەن گرانی قورەیش و هاوپە یمانە کانیان لە هۆزەکانی ( کینانە ) و دەشتی توهامە ، هەروەها پیشتریش ( ابو عیزەی جومەحی ) و لە گەل ( هوبەیرەی مەخزومی ) و ( ابن زەعبەری ) و ( عمری کوری عامر ) کە توو بوونە جۆش دانی خەلك بۆ ئامادە باشی و بەشداری کردن لەم جەنگەدا بۆ تۆ لە سەند نەوە ، لە پاشان قورەیش بە هەموو وورەیەکەوە و بە هەمووچەك و چەکدارەکانیەوە ویان سازداو بەری کەوتن و ژنانیشیان لەگەل خۆیان هینا لە گەل کەنیزە ك و کویلە کان بۆ وورە بەرزکردنەوە ، ( ابو سفیان ) کە سەر کردە یان بوو وە ژنە کەی کە ( هیندی کچی عوتبە ی ) لە گەل خۆ دا هینا ،وە ( صەفوانی کوری ئومەیە ) ئەویش ژنەکەی لە گەل خۆدا هینا کە ناوی ( بەرزەی کچی مەسعود بوو ،وە ( عمری کوری عامیش ) ژنەکەی لە گەل خۆ دا هینا کە ناوی ( ریطە ی کچی مونە بهی ) بوو ، وە ( طلحە ي کوری ابي طلحە )ش ( سولافەی کچی سعدی ) ژنە کەی لە گەل خۆ دا هینا ، هەموو پیکەوە بەری کەوتن بەرەو مەدینە ) .السیرە ابن هشام ٥/٣ برقم ٥٨٤ .

هەروەها واقیدی لە ( المغازی ) دا –خوا لی رازی بیت – دەلی : ( عباسی مامی پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) هەوالی وردی ئەم سوپایە ی بە نیرداوێك دا گەیاندە پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) لە شاری مەدینە پیش دەرچوونی سوپاکەی قورەیش ) . للواقیدی فی ( المغازی ) ١/٢٠٤ .

هەروەها ( زوهری ) – خوا لی رازی بیت – دە فەرموویت : ( سەرجەم ژمارەی سوپاکەی قورەیش ( ٣٠٠٠ ) کەس بوو ، و ( ٢٠٠ ) ئەسپ سواریان لە گەل خۆ یاندا هینا بوو ) . البیهقی فی الدلائل النبوە ٢٢٠/٣ .

هەروەها ( ابن اسحاق ) -خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( سوپاکەی قورەیش گەیشتنە نزیك شاری مەدینە و لە ئەو سەری شیوەکە ( السبخە ) بەرامبەر بە مەدینە و لای بەرزای ( العنین ) دابە زین ) .

بەلی ئەوە ی زیاتر هانی قورەیشی دا بۆ جەنگی ئوحود ، سریە کە ی ( زیدی کوری حاریسە ) بوو ، ئەو زیانە گەورەیە لە قورەیشدا پشتی ئابووری قورەیشی شکاند کە کاروانە بازرگانیە کە بوو ، کە ل وپەل قاپ و قاچاخی زیوی بوون ، ئیدی پشتی قورەیشی شکاندو زیانی زۆری بە ئابوورەیە کەیان گەیاند چونکە مال و سامانیکی زۆر بوو ، کە لە لای ( صەفوانی کوری ئومەیە ) بوو ..

ێ
بە لی یەکەم کاریك کە قورەیش ئەنجامی دا ئەوە بوو بریاری دا کە ئەو کاروانەی قوریش کە لە جەنگی بەرد دا رزگاریان بوو بوو ، بە سەرۆکایەتی (ابو سفیان ) ئەو کاروانە بکەن خەرجی جەنگی لە دژی موسلمانە کان دا تا کو تۆلە ی ئەو سەر شۆریەی جەنگی بەرد بکە نەو ، چونکە لە ناو عەرە بی ناوچە کە ئابروویان چوو بوو ، هەر بۆیە بە خاوەن پارو سامانە کانیان ووت : ئەی کۆمەلی قورەیش محمد پشتی ئیوەی شکاند لە جەنگی بە در دا ، وە پیاوە چاکەکانتانی کوشت ، جا ئیوە بەم پارە و سامانە یارمەتیمان بدەن لە گەلیاندا بجەنگین ، بە لکو تۆ لەی جەنگی بەدر بکەونەوە لە محمد !! بە لی ئەوانبیش هەر هەموویان بە گویان کردن و ، کاروانەکەیان کە هەزار ووشتر وپەنچا هەزار دینار ، واتە : پەنچا هەزار مسقال زیر بوو ، بۆ ئەو کارە تەرخان کرد .

هەروەها دەر بارەی ئەم هەلویستە چەوتە ی قورەیش قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە ، وورەی موسلمانەکانی بەرز کردوە و ، کە ئەو خوا نە ناسانە کە مال و سامانەکەیان بۆ دژایەتی کردنی دینی خوا خەرج دە کەن ، ئەوانە تەنها هەناسە هەل کیشانی پەشیمانی یان بۆ ئەمینیتەوە و لە ئە نجامیش دا ئەدۆرین .

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ **الانفال ٣٦** .

بەلی قورەیش هەر بە وە وە نەوەستا ، کە دانیشتوانی شاری مککەهەل بنی و هاندا بۆ جەنگ دژی موسلمانە کان لە شاری مەدینە ، بەلکو کەوتە رازیی کردنی هاوپەیمانەکانی شیان لە (احابیش ) وە هۆزەکانی دەورو بەری شاری مککە وەك : (هۆزی کینانە و دانیشتوانی توهامە ) هەموو جۆرە شیوازیکیان بۆ رازی کردنی خەلك بە کار هینا ، ئەوە بوو (صەفوانی کوری ئومەیە ) خۆی گەیاندە لای (ابو عیززەی ) شاعیر ، کە لە بەدر دا بە دیل گیرا بوو ، پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) ئازادی کرد بی بەرامبەر چونکە خاون مندال بوو هەژار بوو لە سەر شعرە کانی ئە ژای ، وەك لە پیش دا باسمان کرد ، ئەوە بو (صەوفانی کوری ئومەیە ) پی ووت : ئە گەر لە م جەنگە سەرکەوتوو بووین ئەوتندە پارەی بداتی تا پی دەولە مەن ببیت ، ئەگەریش نەگەرا یەوە ئەو ئاگای لە کچە کانی بیت ، بەلام بە و مەرجە ی هۆزەکانی دەوروبەری مککە هەل بنیت بۆ چەنگ کردنی دژی ئیسلام و موسلمانان بە شیعرە کانی خۆی ، بەلام (ابوعیزە) لەسەرتا دا حەزی نە ئەکرد وا بکات چونکە دەی ووت : محمد بی فیدیە ئازادی کردم وە حەز ناکەم دژایەتی بکەم ، بەلام (صەفوان کوری ئومیە ) کۆلی نەدا هەتا ئەو بەد بەختەی رازی کرد !! ئیتر (ابوعیزز)دەستی دایە هەلنا بەسەر نەوەی کینانە و دانیشتوانی تووهامە ، لە دژی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) وە بە شیعر خویندن دل یان ئەهینایە جۆش و خرۆش بۆ شەر کردن لە جەنگی ئوحودا ..!!

ئ

## دووەم : فەرماندە و ژمارەی سوپایی قورەیش، وە بەشداریی ئافرەتانی :

قورەیش لە شاری مککە دا ، خریکی کۆکردنەوەی بوون بۆ چەنگ لەدژی موسلمانەکان ، تا ئەوە بوو ژمارەی سەربازەکانی قورەیش گەیشتە( ٣٠٠٠ ) جەنگاوەر ، کە ٢٩٠٠ سەربازیان لە قوریش و هاوپەیمان و حەبەشیە بت پەرستەکان بوون ، وە (١٠٠) کە سیان لە هۆزی کینانە بوون ، بەلی ئەم سوپا گەورەیە ، دوورگەی عەرەبی هیشتا سوپایەکی وا گەورەی بە خۆ وە نەبینی بوو ، هەروەها (٣٠٠٠) ووشتریان لە گەل دا بوو بۆ سوار بوون ،وە (٢٠٠) ئەسپ وە سوار چاك لە گەلیان دا بوون ، وە بۆ پاراستنی سەبازە کانیان (٦٠٠) یان (٧٠٠) درع یان قەلغان یان پی بوو ..

هەروەها قورەیش بۆ سەر کردایەتی و فەرماندایەتی ئەم سوپا گەورە زەبەلاحە ، وای پی باش بوو ، کە (ابو سفیانی کوری حەربی) هەلبژیریت بۆ فەرماندەی گشتی سوپاکە ، وەهەروە ها (خالیدی کوری ولیدی ) کردە فەرماندەی سوار چاکەکان ئەوانەی ئەسپیان پی بوو یان ووشتر،وە (عکریمەی کوری ابو جهل ) یاریدە دەری بیت ، وە هەلگرتنی ئالاکەی سوپاکە درا بەنەوەی( عبدالداری کوری قوصەی ) سپردرا ، لە سەرتادا هەلگری ئالاکە بە دەست (طلحە ی کوری ابو طلحە عبدە ري )ە وە بوو ، کە ئەم پیاوە یەکەم پیاو ی کوژراو بوو لە هە لگرانی ئالای قورەیش ، کە ئەوە بوو لە سەرەتا جەنگ دا موسلمانەکان تاقیان لی برینەوە بە شوە یەك ئالای قورەیش کەوتە سەر زەوی و تیك شکا زۆر بە تەندی و خیرایی رایان کرد !!

بەلی دوای راویژ کردن تکبیری جەنگی هاتنە سەر باسی بەشداری کردنی ئافرەتانی قورەیش لە جەنگ دا ،ئەو ە بوو لە هەموو کەس زیاتر (هیندی کچی عوتبە ) سوور بوو لە سەر بەشداریی ئافرەتان لە م جەنگەدا ، ئەوە بوو قیژاندی بەسر ئەوانەدا کە نەیان ئەویست بەشداری بکەن و ، لەسەر رای خۆی پیی داگرت ، تا ئەوە بوو (١٥) ئافرەتی ناوداری قورەیش لەم جەنگەدا ، بۆهەل نانی پیاوان و هەل نەهاتنیان لە جەنگ ، بەشداری یان کرد ..

الرحيق المختوم ٢٥٣ ، غزوه احد لباشميل ٦٥-٦٧.

ئ

**ناوی هەندیك لە ئافرەتانی قورەیش کە بەشداری جەنگی ئوحود یان کرد بوو ئەمانەن :**

١- هاوسەری ( ابو سيفان ) ( هيندی کچی عوتبە ی کوری رەبیعە ).

٢- هاوسەری ( عیکریمەی کوری ابو جهل ) ( ئوم حەکیمی کچی حاریسی کوری هیشامی کوری موغیره ).

٣- هاوسەری ( حاریسی کوری هیشامی کوری موغیره ) ( فاطیمە ی کچی وەلیدی کوری موغیره ) .

٤- هاوسەری ( صەفوانی کوری ئومەیە ) ( بەرزەی کچی مەسعوودی کوری عمری ثقفي ) .

٥- هاوسەری ( عمری کوری عاص ) ( ريطه ي کچی مونەبییهی کوری حەججاجی سه همی ).

٦- هاوسەری( طلحه ی کوری ابو طلحه ) ( سه لا فەی کچی سعدی ).

٧- دایکی ( موصعەبی کوری عومەیری ) ( خوناسی کچی مالیك ی کوری مضره ب )

٨- کچی عەلقەمە ( عومەرەی کچی عەلقەمە ).ئەم ئافرەتە یەکی بوو لە ئافرەتانی نەوەی حاریسی کوری عبدالمنات بوو لە هۆزی کینانه .

شایەنی باسە کە (( فاطیمە ی کچی وەلیدی کوری موغیره ) خوشکی ( خالیدی کوری وليد ) بوو لە رۆژی فتحی مككه دا موسلمان بوو ، بەیعەتی دا بە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئافرەتیکی باش و زیره کو بەسەلیقەی لی دەر چوو بوو، بە جۆریك خالید برای لە زۆر بەی کارو بارە کانی پرس رای پی دەکرد ، هاوەلیکی بەریز و ژیریی لی دەر چوو .

ئەم ( ريطه ي کچی مونەبییهی کوری حەججاجی سه همی ) دایکی هاوەلی بەریز ( عبدالله کوری عمری کوری عاص ) بوو ، هەروەها لەرۆژی فتحی مككه دا موسلمان بووە ،بەیعەتی دا بە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەرەوەها عمری هاوسەری ريطه لە سالی حەوتەمی کۆچی دا لە گەل خالید هاتنە مەدینە و موسلمان بوون .

هەروەها ( سه لا فەی کچی سعدی ) ئەم ئافەرتە دایکی عوسمانی کوری طلحه یە ، لە رۆژی فتحی مككەدا موسلمان بوو و هەروەها پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بانگی کرد و کلیله کانی کەعبەی دایە دە ستی ، هەروەها لە جەنگی ئوحودا هاوسەرەکەی کوژرا ، کە (( طلحه ی کوری ابو طلحه ) بوو ، یەکیك بوو لە ئالا هەلگرانی قورەیش کە فەرماندەی ئالا هەلگرانی دە کرد .

ئ

## سى يەم : سوپای قورەیش جوولەی پی کرا و کەوتە ری :

بەلی بەر لەوە ی کە سوپای مککە یان قورەیش بکەویتە جوولە پیکردن یان بکەویتە ری ، کە هیشتان لە مککە دا بۆ خۆ ئامادە کردنی جەنگ لە دژی موسلمانە کانی مەدینە ، ئەوە بوو ( جوبەیری کوری موطعیم ) بانگی غولامیکی حەبەشی کرد غولامی خۆی بوو ناوی ( وحشی ) بوو ، ئەو غولامە حەبەشیە زۆر شارەزا بوو لە رم و تیر هاویشتن بە وینەی حەبەشی ، کەم هەلە ی دەکرد لە رم هاویشتن دا بەلی ( جوبەیر ) بانگی لی کرد کە لە گەل سوپادا بکەویتە ری و، لە کاتی جەنگ کردن دا نیشانە لە ( حمزە ی کوری عبدالمطلب ) بگریت و ، بە حەربە یان بە رم هاویشتن بیکوژیت ،ئەوە بوو پی ووت: ئەگەر تۆ توانیت لە جیاتی ( طوعیمە ی کوری عدي ) مام دا لە رۆژی بەدر دا ( حمزە ) ئەوی کوشتبووی، ئەو تو ئازاد بە .

هەروەها هیندیش بۆ کوشتنی ( حمزە ) وەحشی هان دەدا ، چونکە لە بەر ئەوەی خۆشەویستانی ئەویشی لە رۆژی بەدر دا کوژرا بوون ، هەروەها دوای ئەوەی هەموو پیداویستەکانی جەنگ ئامادە کران ، سوپای گەورەی قورەیش ، بە دلیکی پر لە قین قارەوە بۆ کوشتن و برین و تۆ لە سەندن ، بەرەو شاری مەدینەی پایتەختی ئیسلام کەوتەری .

سوپای مککە ئەم جارە وەك سوپای بەدر نە بوو ، چونکە یەکجار ریك و پیکی پیوە دیار بوو ، فەرماندە کان هیچ جیاوازی و دووبەرەکی لە نیوانیاندا نەبوو ، هە تا کو کۆتایی جەنگ هات و گەرانەوە ، سوپای قورەیش ریگای بری هاتا گەیشتە ناوچەی ( ئەبواء) کە لە و شوینەدا ئامینەی دایکی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نیژراوە ، کە گەیشتنە شوینە کە هەندی هەرچی وپەرچی هیچ و پوچ ویستیان قبرەکەی بکەنەوە ، بەلام سەرۆکەکانیان بەوە رازی نەبوون ، تا کو ئەو رفتارە نەبیتە باو چونکە ناشرینە لەناوعەرەبدا ووتیان شتیکی وەها باس نەکەن ، ئەگەر ئیمە شتی وەها بکەین ئەوا نەوەی بکر و نەوەی خوزاعە ش قبری مردووەکان ئیمە ئەکەنەوە .

هەروەها قورەیش هاتن تا ئەوە بوو لە لە لایەکی کیوی ( ئوحود ) دا کە پینج میل لە مەدینەوە دوور بوو دا یان خست .

غزوه أحد لمحمد احمد باشميل ٦٧-٦٩، السيره النبويه لابى شهبه ١٨٧/٢،الرحيق المختوم ٧١ .

ئ

**شاینی باسه با کەمیك باسی ئەم دووهاوەلە بکەین کەلە سەردە می نەفامی دا دژایەتی پیغمبەری خوا یان کرد ووە ( صلی الله علیه وسلم ) ئەویش ئەدوو هاوەلە بوون :**

١-( جوبەیری کوری موطعیم کوری عدي کوری نوفلي کوری عبدالمنافي قورەیشي ) بوو ، لە سەردەمی نەفامی دا یەکی بووە لە سەردارانی قورەیش و بە چاکی موسلمان بووە و ، هاوەلیکی چاکی پایەداری لی دەر چوو ، بووە یەکی لە کەلە زانا و سەردارە کانی قورەیش و ، لە ناسینی رە چە لەکیش دا دەستی بالای هەبووە ، وە بوخاری و موسلیم فەرمووەدیان لی یەوە ریوایەت کردووە ، وە لەسالی ٥٩ کوچیدا وەفاتی کردووە –خوا لی رازی بیت –

٢-( وەحشی کوری حەربی ابو دەسمە ) بەلی ئەو پیاوە لە غولام و بەندە کانی نەوی نوفل بووە و ، لەسەردە می نەفامی دا یەکی بوو لە بەندە ئازاد کراوە کان ، لە جەنگی ئوحود دا ( حمزەی ) شەهید کردووە ،لە گەل نوینەرانی شاری طائیف دا هاتنە مەدینەو لە ویدا موسلمان بووە و بۆتە هاوەلانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە شداری لە جەنگی مرتد یان پاشگەزبوونەوە کانی کردووە ، یە کی بووە لە م دوو کە سەی کە ( موسەیلەمەی ) درۆزن یان کوشتووە ، دوای ئەم جەنگە ئەی ووت : بەم حەربەیەم چاکترین کەسم کوشتووە، واتە : ( حمزە ) وە بەم حەربەیەم خراپ ترین کەسم کوشتووە واتە : ( موسەیلە مە ) ی درۆزن ، بەلی ( وحشی کوری حەرب ) لە شاری حیمص لە ولاتی شام واتا : سوریا لە سالی ٥٢ کۆچی دا وەفاتی کردووە ...!!!

ئ

## چوارەم : هەواڵگەریە كانی شاری مەدینە جوولەو هاتنی سوپای قورەیشیان بە مەدینە گەیاند ، وە خۆئامادەكردنی سوپای مەدینە :

بە لی ( عباس ی كوری عبدالمطلیب ) چاودیری جموجول و ئامادەگی سەربازەكانی قورەیشی دەكرد و هەركە ئەم سوپایە كەوتە جوولە ( عباس ) نامەیەكی بە پەلەی نووسی بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە دیریژی دەنگ و باسی جوولە خۆ ئامادە كردنی سوپای قورەیش تیدا بوو ، بەلی نیردراوەكەی ( عباس ) كەوتەری ئەوەندە خیرا رۆیش ماوەیە نیوان شاری مككە و مەدینەی بە ( ٣ ) رۆژ بری كە ( ٥٠٠ ) كیلۆ مەتر دە بیت ، هەروەها نامە كەی دا یە دەستی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە مزگەوتی ( قباء ) دا ، هەر لە گەل گەیشتنی نامە كە بە دەستی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علی وسلم ) پیغەمبەر دایە دەستی ( ابی كوری كەعب ) ئەویش نامە كەی بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) خۆیندە وە ، هەروەها پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانی پیدا كە با نهینی بیت لە نیوان خۆی و ( ابی كوری كەعب ) هەر لە كاتەدا پیغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) بە پەلە گەرایە وە بۆ شاری مەدینە باسەكەی بۆ سەركردە كانی سوپای ئیسلام باس كرد ، واتە : كۆچ كەران و ئەنصارە كان وەك ئەو س خەزرەج .

بەلی چاردان لە ناو شاری مەدینەدا لی درا ، وە پیاوان هەمیشە چەكیان پی بوو ،لە كاتی نویژدا لیان نەدە كردەوە نەدە با لە ناوشاری مەدینە شتیك روو دبدات ، هەروەها مەفرەزەیەكی ئەنصاریە كا ن كە ( سعدی كوری موعاز ) و ( اسیدی كوری حضیر ) امیری مەفرەزەكە بوون ، ئەوان پاسەوانی پیغەمبەری خوا یان كرد ( صلی الله علیه وسلم ) بەلی بە چەكەوە پاسەوانیان كرد تا بەرە بەیان لە بەر دەرگای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) راوەستان ،بەلی لە سەر هەموو ریگاكانی دەرەوە ی شاری مەدینە مەفرەزە دان دران بۆ حالەتی بە پەلە و لە ناكاو تا كو لە ئامادە باشی بن بۆ پاراستنی شاری مەدینە ، هەروەها بۆ زانینی جموجۆلە كانی دوژمن ،وە هە لستان بە چاودیری كردنی ئەو ریگاو بانانەی كە لە دەرە وە لە ناوەوەی شاری مەدینە ، كە لەوانە بوو موشریكەكانی سوپای قورەیش هیرش بكەنە سەر شاری مەدینە ،بەلی هەر هەموو موسلمانەكان كەوتنە حالە تی ئامادە باشی بۆ هەر ئەگەریك نەوەكا دوژمن لە ناكاو هیرش بكات بۆ سەر شاری مەدینە ، لە لایە كی تروەش خۆیان بە خت دە كرد بۆ پاراستنی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نەوەك دوژمن دەستی لی بوەشینن و ئازاری بدەن ...!!!

ئ

بەلی وەك لە پیشدا باسمان کرد کە لە جەنگی بەدر دا ( عباسی ) مامی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە دیل گیرا بوو ، دواتر بە فیدیە دان بەر بوو گەرایە وە بۆ شاری مککە ، ئەوە بوو هیشتان موسلمان بوونی خۆی بە ئاشکرا رانەگەیاند بوو ،بەلام دلسۆزی برازاکەی بوو ، کە پیغە مبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بوو ، ئەترسا تووشی زیان و ئازار بیت بە دەستی قورەیش و بت پەرستان ، هەر بۆیە بە ووردی چاودیری هەلس و کەوت جم جۆلی سوپای قورەیش دە کرد نەوە کا زیان بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بگەیەنن ، چونکە برازای بوو و کوری برای بوو ،بەلی کاتیك قورەیش سوپاو لشکری پیك هینا و بەرەو شاری مەدین کەوتە ری ، ( عباسی ) مامی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ئاگاداری هەموو هەوالیك بوو یان ئاگادرای هەمووشتیك بوو ، بەلی ئەوە بوو ( عباس ) پیاویکی متمانە پی کراوی دۆزیەوە تاکو هەوال و دەنگ و باسی سوپای قورەیش بگەینیتە بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم پیاوەش لە هۆزی عفار بوو بۆ ئەم کارە گرینگە هەلی بژارد ، وەفەرمانی پی دا بە پەلە خۆی بگەینیتە شاری مەدینە ،بەلی بۆ ماوەیی ( ٣ ) رۆژ ئەم ریگایە بری ، کە لەرۆژی ئاسایی دا بە ( ١٠ ) رۆژ ئەم ریگا یە نیوان مککە و مەدینە بوو ، بۆیە هەوالە کە گەیشتە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ خویندراوە ، چونکە بە خۆی خوێندە واری نەبوو ، دواتر پیغەمبەر : ( صلی الله علیه وسلم ) با ئەم هەوال بۆ ماوەیە نهینی بیت ،هەروەها بۆ چاو ساغ کردنەوەی ئەم هەوالە ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دوبرای بەناوی ( ئەنەس و موئنیس ) کە لە کورانی ( فضالە ) بوون ، ناردی بۆ دەرەوەی شاری مەدینە تا کو هەوالی سوپای قورەیش بهینن ، بەلی کاتیك رۆیشتن بۆ چاودیری کردن و زانیاری وەرگر تن لە سەر سوپای دوژمن ئەوە بوو کە بینیان سوپایەکی گەورەی قورەیش چەند میلیکەوە لە شاری مەدینە دوورە ، وە لە شیوی ( عەقیق ) ی گرتووە بەرەو لای راست دا گەیشتووە شیوی ( القنات ) و ، لە باکووری شاری مەدینەدا ، لە شونیکی نزیك چیایی ( عینین ) کە لەمەو دوا ناونرا چیای ( الرماة ) واتە : تیر هاویژە کان ، بەلی کاتیك ئە دوو برایە گەرانەوە هەوالە کەی سوپای قورەیشیان گەیان بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە مەو دوا ئەم هەوالە بەنهینی نەمایە وە و ، گەیشتە بەر گویی هەموو دانیشتوانی شاری مەدینە، دواتر ( حوبابی کوری منزریش ) رەوانە کرا هەمان هەوالی هینایە وە ، بەلی ئەنصارەکانەزۆر بە اخلاصەو چاودیری و پاراستنی پیغەمبەری خوایان ( صلی الله علیه وسلم ) گرتە ئەستۆی خۆ وەك ( سعدی کوری موعاز ) ، ( اسیدی کوری حضیر ) ، ( سعدی کوری عبادە ) شەو تا بەیانی پاسەوانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دە کرد لەبەر دەرگای بوون بە چەکەوە تا بەیانی ...!!!

ئ

## پێنجەم : راوێژكردنی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە گەڵ هاوەڵانی دا سەركردە كانی سوپای ئیسلام لە كۆچ كەران و ئەنصارەكاندا :

بەڵی لەدوای ئەوەی هەواڵگەریە كانی سوپای ئیسلام ، هەواڵ لەدوای هەواڵ و رووداو لەدوای رووداو یان ئە گەیاندە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) و شاری مەدینە ، دەربارەی سوپایی دوژمنی قورەیش لە هەر جمو جۆڵیكی سەربازی دا ،ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كۆ بوونەوەیە كی گەورەی دروست كرد لەگەڵ سەركردە كانی سوپایی ئیسلامدا و ، بە تایبەتی لە گەڵ كۆچ كەران و ئەنصارە كاندا ، ئەم كۆ بوونەوەیە بۆ را گۆرینەوە بوو ، تا بگەن ئە نجامیكی باش تا بزانن چ هەلویستیك بگرنە بەر ، بۆ پەرچ دانەوەی سوپای قورەیش ، چونكە لە و كاتەدا قورەیش بە هەموو هیزو توانایە كیانەوە هاتوون بۆ قەلاچۆكردنی سوپای ئیسلام ، لە ناو بردنی موسلمانان و ، رووخاندنی دەولەتی ئیسلام لە شاری مەدینەدا

هەروەها ( موسای كوری عوقبە ) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( هەندیك لەو موسلمانانەی كە شداری نەبوون لە جەنگی بەدر دا ، خۆزگەیان دەخواست كە دوژمن بیت تا ئەوانیش وەك برایانی اهلی بەدر دا رۆل بگیرن لە جەنگی قورەیش دا و پاداشتی بەرز بەدەست بینن ، وە كاتیك ( ابو سفیان ) لە گەل موشریكەكاندا لای خوارووی ( ئوحود ) دا دابەزین ، ئە و موسلمانانە زۆر دلخۆش بوون ، بە هاتنی دوژمندا وە دەیان ووت : ( خوای گەورە ) ئاواتەكەمانی بۆ هیناوەتە دی ، پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە شەوی جمعە دا خەونیكی بینی و كە بەیانی بووە بۆ هاوەلانی گیرایە وە كە هاتبوون بۆ لای وە پی فەرموون : ( رأيت البارحة في منامي بقرا تذبح ، ورأيت سيفي ذوالفقار أنقصم من عند ظبته ) او قال ( به فلول فكرهته وهما مضيبتان ) ورايت أني في درع حصينه وأني فاولتها المدينة ) واتە : دوینی شەو كە خەوتبوو م ، خەویكم بینی كە چەند گایەك سەر ئەبران ، وە شمشیرەكەی زولفقار ، واتە : شمشیرەكە ی نووكی كەل بوو ،هەروەها دەستم بەسەر قەلغانیكی مەحكەم دا كرد ،كە مەدینەم لیك دایە وە .

چەند روایەتیكی تر هەن لەسەر ئەم فەرموودەی دا ، نووكی شمشیرەكە كەل ئە بیت ئەوا ، یەكیك لە خزمە كانی شەهید دە بیت ئەویش ( حمزەی كوری عبدالمتلیب ) بووە ، جەند گایەك سەر ئەبران ، ئەوانیش شەهید بوونی جەند موسلمانیك بووە لە جەنگی ئوحودا ، هەروەها بینی كە دەستی خستە قەلغان و سینگی زۆر بتەوە ئەوە ش مانایی ئەوە یە شاری مەدینە جیگر و خۆراگرا بتەوە . البيهقى الدلائل النبوه ٣/٢٠٦ .

ئ
بەلی لە رۆژی جمعەدا کۆ بوونەوەکە روویدا هەر لە کۆ بوونەوەیەدا بۆ ووتو ویژکرد ن گفتو گۆ کردن دەر بارەی خۆ ئامادە کردن بۆ رووبەروو بوونەوەی سوپای دوژمن ، ئەوە بوو سەرۆکی موناڤیقان بەشداری تیدا کرد ئەویش ( عبداللە کوری ئوبەی کوری سەلول ) بوو ، ئەوە بوو لە شەوی جمعەدا پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) خەونیکی بینی خەونەکەی بۆ گیرانەوە ، هەروەها وتوویژ کرا دەربارەی بەرنگار بوونەوەی دوژمن و شوینی موسلمانان ئایا لە ناو شاری مەیدنەدا بمینەوە یان لە دەرەوی شاری مەدینە دا جەنگ بکەن، هەر وەك ( موسی کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) خەونەکەی بۆ گیرانەوە بۆ لیك دانەوە فەرمووی : بە هاوەلانی با بمینینەوە لە شاری مەدینە گەر ئەوان بینە ناوەوە بۆ مان لە ناو شارەکەدا شەریان لە گەل دا دەکەین ).سیر ابن هشام ٣/٨ .

هەروەها لە ریوایەتکی تردا کە ( ابن اسحاق ) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) فەرمووی : گەر بە چاکی ئەزانن با لە شاری مەدینەدا مبینینەوە ، وازیان لی بهینن با ئەوان لە جیگەی خۆیان دا بمیننەوە و ئەوە خرا پترین شوینە بۆ ئەوان ، وە ئەگەر هاتنە سەرمان بۆ ناو شارەکە ئەوا لە ناو شارەکەدا لە گەلیان دە جەنگیین ) . السیر ابن هشام ٣/٩ .

هەروەها ( موسی کوری عوقبە ) – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) بە هاوەلانی فەرمووو : بمینینەوە لە ناو شاردا ، و ژن و منالەکان بکەنە ناو مالە کانەوە ،ئە گەر ئەوانیش هاتنە ناوەوە بۆ مان ، کۆلان بەکۆلان لە گەلیان دا دە جەنگیین و لەسەر خانووە کانیشەوە ئافرە تان تیر بارانیان دە کەن ، بەلام ئەوانەی کە جەنگی بەدر یان نەبینی بوو ، ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) سویند بە خوا ، ئەوان واتە : قورەیش لە زەمانی نەفامیدا نەیان توانیوە بینە سەرمان بۆ ناو شار ، ئەی ئیستا چۆن !! دەتوانن بینە سەرمان دوای موسلمان بوون مان ، ئیمە ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) ئاواتە خواز بووین و دوامان لە خوا دەکرد کە رۆژیکی وا بیتە پیشەوە بۆمان ئەوتا ئیستا ( خوای گەورە ) ئاواتە کەمانی بۆ هیناوینەتە دی و رگەکەی بۆ نزیك کردووینتەوە ،وە هەندیك لە پیاوانی ئەنصار ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) گەر لە شیوەکەی خۆمان لە گەلیان بەجەنگ نەیەن ئەی کەی و لە کوی لەگەلیان بجەنگین ، وە هەندیکی تر ووتیان : ئیمە چی بکەین دەبیت جەنگکە لە کیلگەکانمان دوور بخەینەوە ، وە پیاویکی تر ووتەی خۆی ووت و راست گۆیانە لەسەری رۆیشتن لەوانەی کە کۆچ کەران بوون...!!!

ئ

( حمزەی کوری عبدالمتلیب ) مامی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : سویند بەوەی ئەو کتیبەی بۆ دابەزاندوی دەبیت بەجەنگ بیین لە گەلیاندا لە دەرەوەی شاری مەدینە دا ، وە ( یەعموری کوری مالیکی کوری سەعلبە ) فەرمووی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە هەشتمان لی قەدەغە مەکە سویند بەوەی گیانی منی بەدەستە دەبیت بچمە ناو بە هشتەوە ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پی ی فەرموو : بەچی دە چیتە نا ئەو بەهەشتەوە ؟ ووتی : بەوەی کە من خواو پیغەمبەرم خۆش دەویت ، وەلە رۆژی رووبەروو بوونەوەشدا راناکەم پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پیی فەرموو : راست دە کەیت . البیهقی فی الدلائل النبوە ٣/٢٠٧ .

هەروەها ( ابن اسحاق ) – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( بۆ چوونی ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) لەگەل بۆ چوونی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دابوو کە نەچنە دەرەوە بۆ یان ) اخرجه : عبدالرزاق ( ٩٧٣٥ ) و ، احمد فی المسند ١٤٨٧٨.

هەرووەها ( موسی کور عوقبە ) – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( بەم جۆرە زۆرینەی خەلکان رازی نەبوون بە نەچوونە دەرەوە بۆ دوژمن ، و لەگەل ووتە و بۆ چونەکە ی پیغەمبەر دا ( صلی الله علیه وسلم ) نەبوون ، گەر ئەوان رازی بوونایە بەفەرمانەکەی هەر ئەوە چاکتر بوو ، بەلام قەزاو قەدری خوا وا بوو ، ئەو رۆژە رۆژی جمعە بوو ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم لە ووتاردا جمعەدا ئامۆژگاری کردن و ئەو باسە ی بە بیر هینانەوە ، وفەرمانی پی کردن بە جیهاد کردن ووتارەکەی تەواو کرد و تویژەکەی بۆ کردن ، پاشان دوای چەکەکەی و کەل پەلی جەنگی کرد و جلی جەنگی لەبەر کرد ، و پی فەرموون : گومانم وایە ئەمرۆ کوژارو زۆر دەبیت لە ئیوە و لەوان ئالەو رۆژە دا پیاویك لە ئەنصار کە ناوی ( مالیکی کوری عمر ) بوو مرد ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نویژی لەسەر کرد ، وە دوای تەواو بوونی ناشتنی ئەو پیاوە ،گەرایە وە ناو موسلمانان و هاوەلە کانی ، و ئەوان پەشیمان بوو نەوە و لە نا و خۆیاندا ووتبویان : نە ئوبوو ئیمە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نا چار بکەین و زۆری لی بکەین بۆ چوونە دەرەوە ،وهەندیك لە پیاوە کارناس و ژیرەکاننیان ووتیان : پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) داوای لی کردین کە لە مەدینە بمیینینەوە ،و گەر دوژمن هاتەناوەوە بۆ مان لە کۆلانە کاندا لە گەلیان دە جەنگیین ، وە ئەو پیغەمبەرە و هەوالی لە ئاسمانەوە بۆدیت و زاناترە بە خواو فەرمانە کانی ، لەگەل ئەووەش دا ئیمە زۆریمان لی کرد تا بۆ چوونەکەی ئیمە قبول بکات ، پاشان ئەم ووتانە لە لایەن هەموو کۆچ کەران و ئەنصارە کان دەیان ووتەوە لە نیوان خۆیاندا ...!!!

ئ
بۆ یە هەموو تیکرا هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) با لە شار دا بمینینەوە و هەر بۆ چوونەکەی تۆ راستە !! و ئیمەش پشت گیریت لی دە کەین ، پیغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : (إنه ليس لنبي إذا لبس لأمته أن يضعها حتى يقاتل وقد دعوتكم إلى هذا الحديث فأبيتم الا الخروج فعليكم بتقوى الله والصبر عند البأس إذا لقيتم العدو انظروا ما ىمركم به فافعلوا) واتە : هیچ پیغەمبەریك بۆی نی یە چەکی لە خۆی بەست دای بنیت تا شەرنەکات ، وە من پیش تر ئەوەم لی دوا کردن بەلام ئیوە تەنها بە دەرچوون نەبیت رازی نەبوون ، لەبەر ئەوە گوی رایەل بن بۆ فەرمانەکانی خوا ، و بە ئارام و خۆگربن لە کاتی تیکەل بوون تان لە گەل دوژمن دا ، وە ئەوەی فەرمانم پی کرد زۆر بەچاکی جی بەجی بکەن).

بەلی پاشان پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد بۆ دەرچوون لە شار و رووبەروو بوونەوەی موشریکان . البیهقی فی الدلائل النبوه ٣/٢٠٧ .

ئ

## شەشەم : خۆ ئامادە کردنی سوپای مەدینە بۆ جەنگی ئوحود :

سەرجەم موسلمانان کەوتنە خۆ ئامادە کردن بۆ رووبەروو بوونەوە و بەرەنگاربوونەوە ی دوژمنی موشریك و کافرانی قورەیش ، تەنانەت ئەوانەش کە مندال و کەم ئەندام بوون ، بەلام پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) رێگەی تەنها بە هەندێکیاندا بۆ بەشدار بوون لەم جەنگە دا ، وە لەوانەی کە پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) رێگە ی نەدان بەشدار بن وەك ( عبدالله ی کوری عمر کوری ختاب ) وەك خۆی دەفەرمووێت : ( دوای بەشدار بوونم کرد لە جەنگی ئوحودا تەمەنم چواردە سال بوو ، بەلام پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) رێگەی نەدام ) . اخرجه : البخاري ٤٠٩٧.

هەروەها ابن هشام – خوا لی رازی بێت - دەفەرمووێت : ( پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) رێگەی دا بە ( سەمورەی کوری جوندوب ) و ( رافعی کوری خەدیج ) کە هەر دووکیان تەمنیان پانزە سال بوون .. بەلام رێگەی نەدا بە ( ئوسامەی کوری زید ) و ( زید ی کوری ثابت ) و ( بە رائي کوری عازب ) و عمری کوری حەزم ) و ( ئوسیدی کوری ضهیر ). السیرة ابن هشام ١٤/٣ ، والبیهقی في الکبری ١٨/١٠ .

بەلی موسلمانان و هاوەلانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پێش برکی یان دە کرد بۆ بەشداری کردن لە جەنگی ئوحود دا ، تەنانەت کەم ئەندامەکانیانەوە ، هەر هەمووی پەرۆشی جەنگی ئوحود بوون ، بە ئاواتی خۆزگەی ئەوەی بە هەشتی نەبراوە بە قسمەتیان بێت بۆ هەتا هەتایی ، بەلی موژدەی بە هشتی پێدان هەرکەسێك کە لەم جەنگەدا شەهید بێت لە رێگەی خودا دا جیهاد و تی کۆشان بکات .

ابن اسحاق –خوا لی رازی بێت – دەفەرمووێت : ( عمری کوری ئەلجەموح ) پیاوێکی شەلی لاق خوار بوو ، وە خاوەنی چوار کور بوو کە لە گەل پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە هەموو جەنگ و غەزاکان بەشدار دە بوون ، کاتێك جەنگی ئوحود هات پێش ویستیان رێگە لە باوکیان بگرن وە پێیان ووت : تۆ پاساوی بەشدار نە بوونەت هەیە و ( خوای گەورە ) دوای بەشدار بوونت لی ناکات ، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) و پی ووت : کورەکانم دەیانەوێت رێگەم لی بگرن بۆ جەنگی ئوحود لە گەلتدا ، سوێند بە خوا من بە هیوام بەم قاچە شەلەمەوە بە ناو بەهەشتدا برۆم ، پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) پی ی فەرموو : ( بەلام تۆ جیهاد ت لەسەر نیە و خاوەن عوزرێت وە بە کورە کانیشی فەرموو: پێویستە ئێوەش رێگری نەکەن بەلکو خوا شەهیدی پی بە خشێت ) ئەوە بوو بەشدار بوو وە لە جەنگی ئوحودیشدا شەهید بوو ) السیر ابن هشام برقم ٦٣١ ، البیهقی الدلائل ٢٤٦/٣ .

ئ

وه ئەم باسەش لە ریوایەتیکی تر دا هاتووه کە لە ( جابره ) وه –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( کە ( عمری کوری ئەلجەموح ) لاقی شەل بوو ،هات بۆ لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە رۆژی ئوحود دا ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەگەر من ئەمرۆ بجەنگیم لە پیناوی خوا دا تا دە کوژریم دەچمە بەهەشت ، وه ئەم قاچەم ساغ دەبیتەوه و پی ی برۆم لە ناو بەهەشتدا ؟! پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : بەلی . عمریش ووتی : سویند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ناگەریمەوه بۆ لای خیزانەکەم تا نەچمە ناو بەهەشتەوه ! ( عمری کوری ختاب ) فەرمووی : سویندەکەت مەکە بەمەرج بەسەر خواوه . پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( مهلا یا عمر فأن منهم من لو أقسم على الله لابره منهم عمرو بن الجموح ) واته : لە سەر خۆ ئەی عمر تیاندا هەیە گەر سویند دانین لەسەر خوا ، ( خوای گەوره ) سویندەکەی ناشکینیت بۆی دەهینیتە دی لەوانەش ( عمری کوری ئەلجەموح ) . الفتح الباری ٣/٢١٦ ، احمد ٢٢٥٥٣ .

بەلی موسلمانان هەر هەموو چەکیان لە خۆ بەست ، و پیداویستی جەنگیان ئامادە کرد ،وه پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) چەکی لە خۆ بەست و دوو قەلغانی سەر سەنگی بەست ، وه ( ئوسامەی کوری زید ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : لە جەنگی ئوحودا دوو ( درع ) واته : دوو قەلغان پاریزگاری کردنی سنگی لە خۆ بەست بوو لە پیش و پاشەوه ، واته : قەلغانیك بۆ پاراستنی سنگ و قەلغانیك بۆ پاراستنی پشت ) . اخرجه : ابو داود ٢٥٩٠ ،ابن ماجه ٢٨٠٦.

پاشان پیغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانی دا بەدرچوونی سوپای موسلمانان و هەموو دەر چوون بەسەر ناوچەی ( البدائع ) دا رۆیشتن وه ژمارەیان ( ١٠٠٠ ) کە دە بوون ، وه ژمارەی کافران ( ٣٠٠٠ ) کە دە بوون ) اخرجه : البیهقی فی الد لائل ٣/٢٨ .

و پیغەمبەرخوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( هل من رجل یدلنا الطریق على القوم من کثب ) واته : ئایا پیاویك هەیە ریگامان نیشان بدات بەسەر ئەو بەرزاییەدا برۆین تا دەگەینە لایان ، هەندیك لە شارەزایانی ریگە لە پیشەوه دەچوون و ئەو ریگەیە یان نیشان دا کەبەسەر ( ثنیة الوداع ) واته : تە پولکە کانی ( الوداع ) دەرۆیشت ) . اخرجه : عبدالرزاق فی ( المنصف ) برقم ( ٩٧٣٥ ) .

ئ

بەلی موسلمانەکان لەدەورو بەری شاری مەدینە کۆبوونەوە و هاتنە مزگەوتی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) نویژی عصریان بە جی هینا و ، ( ١٠٠٠ ) جەنگاوەر دە بوون ، لە ناو شاری مەدینەدا کۆبوونەوە و جارچی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) جاری لە شار دەر چوونی سوپای ئیسلامی دا ، ووتمان : سوپای ئیسلام ( ١٠٠٠ ) جەنگاور دە بوون ، کە تەنها ( ١٠٠ ) قەلغان و ( ٥٠ ) ئەسپیان لە گە لدا بوو ، بەلام ( ابن حجر حەسقەلانی ) دەری بریوە کە هیچ ئەسپی کیان پی نەبوو ، هەروەها ( واقیدیش ) ووتوویەتی : تەنها پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەسپیك و ( ابو درداء ) ئەسپیکی پی بووە .

بەلی بۆ کاروبـاری مەدینەو پیش نویژی کردنی موسلمانـان پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بە ( ابن ام کتوم ) سپررا ، پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) سوپاکەی کردە بە ( ٣ ) کتیبە وە :

١-کتیبەی کۆچکەران ، کە ئالاکەی بەدەستی ( موصعەبی کوری عومەیری عبدەری ) سپارد .

٢-کتیبەی ئەوس ،کە ئالاکەی بەدەستی ( اوسیدی کوری حضیر ) سپارد .

٣-کتیبەی خزرەج ، کە ئالاکەی بەدەستی ( حبابی کوری منذیر ) سپارد .

ئ

## حەوتەم : گێرانەوەی هێزیکی جوولەکەی ناپاك و خیانەت كار دل رق و پیس :

بەلی سوپای ئیسلام بەرەو باکوری کەوتەری و لە شار دەرچوو ، هەردوو ( سعد ) ( سعدی کوری موعاز ) کە سەردای ئەوس بوو ، ( سعدی کوری عبادە ) کە سەرداری خەزرەج بوو ، خۆیان بە درع و قەلغان دا پۆ شی بوو ، وەك پاسەوان پیشی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە وتبوون ، کە سوپای ئیسلام لە ( ثنیة الوداع ) تیپەری کرد ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) چاوی بە کتیبە یەکی چەکداری ریك وپیك کەوت کە لە سوپاکەی خۆی جیا بوو و بە تەنیا ئەرۆیشت ،بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پرسیاری کرد ئەوانە کین ؟! هەوالیان دایە کە ئەوانە جوولە کە هاوپە یمانەکانی ( عبدالله ی کوری ئوبەین ) فەرمووی : هل اسلموا ؟! واتە : موسلمان بوون ؟! ووتیان : نەخیر . فەرمووی : لا حاجە لنا فیهم إنا لا نستعین بکافر علی مشرك .. واتە : تی گەیاندن کە موسلمان پویستی و کۆمەکی بە ئەوان نیە و ، لە دژی موشریکان کۆمەکی لە کافران وەرناگرن ..

بەلی ئەم کاریکی یەکجار چاك بوو ، کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علی وسلم ) بەرامبەر بە جوولە کە کردی ، چونکە ئەوان کۆمەلیك بوون لە گەل ناپاکیی و نیفاق راهاتبوون و ، جی متمانە نەبوون بۆ هیچ کات ، هەر خەریکی دووبەرەکی نیفاق و خیانەت و ناپاکی بوون ، لە ناوچەکەدا ، بۆیە هەر کەسیك پشتی بە جوولە کە بەست بیت ،هەموو کات میلەتەکی ژیر دەست بەرسی مال ویرانە کار بەدەستەکانی کوردیش هەموو کات پشتیان بە اسرائیل بەستووە وەك ریفراندومی ٢٠١٧ ، ووتیان :اسرائیل بشتمانە ئە نجامەکەی جی بوو ، بوو بە لەدەست دانی خاکی کوردستان مال ویرانی کوردانی دەرەوی ناوچەدابراوەکان ...!!!

بە لی کاتیك کە سوپای ئیسلام لە شاری مەدینە دەرچوو ،هێزیکی جوولە کە پرچەکیان بینی هێزیکی ریك و پیك و بە چەك و تفاق بوون ، کە هاتبوون بۆ کۆمەکی موسلمانان لە جەنگی ئوحود دا ، بەلام ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانی بە هاوەلانی کرد ، ئایا ئەوانە موسلمان بوون ئەوانیش ووتیان : نەخیر ، ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، پیغەمبەرییش فەرمووی : ئیمە پیویستمان بە کافران نیە بۆ کۆمەکی کردن ، لەجەنگی ئوحودا ،چونکە بی باوەرن و موشریکن ...!!!

ئ

له ( ابی حومەیدی ساعید ی ) وه – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەرچوو بۆ جەنگی ئوحودا و ، لەناوچەی ( ثنیة الوداع ) تیپەری بوو ، ئاوری دایه وه تەماشای کرد هیزیکی پر چەك و تفاق به دوایاندا دەروات ، پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ئەوانەکین ؟! ئەوا ( عبدالله کوری ئوبەی )یه لەگەل ( ٦٠٠ ) پیاو له جوولەکه هاوپەیمانەکانی ، پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) ئایا ئەوانه موسلمان بوو؟! ووتیان : نەخیر ئەوان لەسەر ئاینی خۆیانن ، پیغەمبەر ( صلی اللهی علیه وسلم ) فەرمووی : ( قولوا لهم فلیر جعوا فانا لا نستعین بالمشرکین علی المشرکین ) واته : پییان بلین با بگەرینەوه دوای یارمەتی له موشریکین ناکەین دژبه موشریکینی تر ) .

اخرجه : البیهقی فی الدلائل ٣/٢٠٨ .

ێ

## هەشتەم : پاشە کەشە کردنی سەرۆکی نیفاق ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) :

بەلی کاتیك سوپای ئیسلام گەیشتە ناوچەی ( الشیخان ) پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) سوپای ریز کرد و ، هەرچی مندال بوو و بەرگەی جەنگی نە دەگرت گیرایەوە دوا ، کە ئەم مندالانە بوون : ( عبدالله ی کوری عمر )،( ئوسامەی کوری زید ) ، ( ئوسیدی کوری زوهیر ) ، ( زیدی کوری ثابت ) ، ( زیدی کوری ئە رقە م ) ، عورابە ی کوری ئە وس ) ، ( عمری کوری حە زم ) ، ( ابو سعدی خضري ) ، ( زیدی کوری حاریثە ئە نصاری ) ، ( سعدی کوری حە ببە ) ، ( برائي کوری عازیب ) ، بەلام لە ناو مندالان دا تەنها دوو مندال ماوەیان دا بەشداری بکەن ئەم دووانە بوون ( رافیعی کوری خودەیج ) ، ( سەموری کوری جوندوب ) چونکە ( رافیعی کوری خودە یج ) لە تیر هاویشتن دا کارامە بوو ، پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) ماوەی دا بەشداری جەنگی ئوحود بکە ، ( سەموری کوری جوندوب ) یش ووتی : من لە رافیع بەهیز ترم و ئەشی دەم لە زەوی دا ، ئەم هەواڵە و ووتەی ( سەمور ) گەیشت وە پیغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) و فەرمانی دا لە بەردە می دا زۆران بازی بکەن ، کە ( سەمور) ( رافیعی ) دا بەزەوی دا ) پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) ماوەی ( سەموری کوری جوندوب ی ) دا .

بەلی هەر لەم شوینەدا ئیوارە بەسە ر سوپای ئیسلام هات ، نویژی مەغریب و عیشا یان لەوی بەجی هینا ،( ٥٠ ) پیاو بۆ پاسەوانی سەربازەکەی ئیسلام هەلبژیردران ،( زکوانی کوری عبدالقیس ) کرا بە پاسەوانی تایبەتی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ).

بەیانی زوو بەر لە رۆژ هەلاتن سەربازانی سوپای ئیسلام هەستان و بەو تاریکەیە کەوتنە ری ، هەتا گەیشتنە ناوچەی ( شوط )لەوی نویژی بەیانیان بەجی هینا ، کە زۆر لە سوپای دوژمن نزیك کەوتبوونەوە ، بە رادەیەك یەکتریان دە بینی ، بەلی ئا لە شوینەدا لە بەردەم سوپای قورەیش دا ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) گەورە سەرۆکی مونافیقان دوو رووان و ناپاك و خیانەت کار ، لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەلگەرایەوە ، بەلی بی گومان پیشە ی نیفاق دوو روو هەر وایە ، لە کاتی تەنگە نەدا ئەمە هەلویستی یەتی ،( عبدللەی کوری ئوبەی کوری سولول ) ( ٣٠٠ ) سەربازی هەل خەلە تاند و ، ئەوانیشی گیراندەوە دواوە ، هەر ئەی ووت : ( بە گویی ئەوانی کرد و لە قسە کەی من یا خیی بوو ، واتە : ( لە شار دا نەمایە وە ) لە پیش دا ووتمان ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سولول ) ووتی : با لە ناو شاری مەدینەدا بمینینەوە ، بەلی سەرۆکی مونافیقان : ئەی ووت : ئەی خەلکینە ! لە شوینەدا بۆ چ خۆمان بە کوشتن بە دەین ؟! ئیتر بەم هەلویستەی سەرۆکی نیفاق هەر چی ئیمان لاواز بوو دانەمەزراو بوو لەگەل خۆی گیرایەوە دوا .

ئ
بی گومان هۆی جیابوونەوەی ئەو مونافیقە لەو کاتە ناسکەدا ئەوە نەبوو کە دەری ئەبریی کە گوایە بە گوێی ئەو نەکراوە ، خۆ ئەگەر وا بوایە هەر لە مەدینە دەر نەئە چوو و ، نەئەکەوت گەر سوپای ئیسلام ، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو لە کاتە ناسەکەدا و لەبەردەم دوژمنی ئامادەباش و خاوەن سوپای بەهیز دا ، ئاژاوەو دووبەرەکی بخاتە ناوسوپای ئیسلامەوە ، تا خەڵکی زیاتر لە ئیسلام بکشیتەوە ،ئەوانی تریش کە هاوەڵی پیغەمبەری خوان ( صلی الله علیه وسلم ) وورەیان نەمینی بروخیت ، لە هەمان کات دا کە دوژمن ئەمە ببینی زیاتر لە سەر هیرش کردن سوور بیت خۆی بەهیز بکات لە بەرامبەر سوپای ئیسلام دا ، بەم هەلویستەی لە ناو بردنی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و هاوەڵە کانی یەکجار ئاسان بیت بۆی ، بەلی ئەو کاتە ئەو مونافیقە دوو رووە ، کە بەتەمایی پاشایەتی شاری مەدینە بوو ،بە ئاواتی خۆی بگات

ئەوە بوو دوو تیرە ی ئەنصار ، کە لە ( نەوەی ئەوس ) و ( نەوەی خەزرەج ) ویستیان کۆڵ بدەن و وازبهینن ، دوای ئەوەی کە ئاژاوە و شەل ژان دروست بوو ، ویستیان بگەرینەوە و بە هۆی دووبەرەی دووروویی ئەو منافیقە کە ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سولول ) کردی . بەلام بە هۆی کۆمەی ( خوای گەورە ) ئیمانیان دامەزراوە بە هیز بوونەوە ، وە لە وبارەی وە ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموویت : ﴿إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلَا وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ال عمران ١٢٢ .واتە : ئەو سا خەریك بوو دوو دەستە لە ئیوە پەشیمان بنەوەو لە نیوە ی ری بگەرینەوە ، بەلام خوا یارو یاوەریان بوو دلیانی دامەزراند لە سر فەرمانبەر داری دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەستن .

بەلی کاتیك سەرۆکی نیفاق ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سولول ) خۆی و ( ٣٠٠ ) کەسەوە گەرانەوە دوا ، ئا لە و کاتەدا ( عبدالله ی کوری عمری کوری حرام ) باوکی ( جابر ) کەوتە دوا یان بانگ هاورای لی کردن ، کە لەم کاتە ناسکەدا کە دوژمن هاتۆتە سەریان ، با دەست بەرداری پیغەمبەر و موسلمانان نەبن .

ئەوانیش وەلامی ( عبدالله یکوری عمری کوری حرام ) یان دایەوە ووتیان : ئەگەر بزانین جەنگ ئەکەن وازتان لی نا هینین ، بەلکو وای ئەبینین کە جەنگ نابیت ، باوکی ( جابر ) زۆری ووت و نەیان بیست ، لە دوا جار ووتی : هەی دوژمنانی خوا ! خوا دوورتان بخاتەوە ، خوا ناهیلی پیغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) پیویستی بە ئیوە هەبی . ابن هشام فی السیره ٣/١١ .

ئ

هەروەها دەربارەی ئەو منافیقانە (خوای گەورە ) ئەم دوو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموویت : ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَاتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾ ال عمران ١٦٦-١٦٧. واتە: ئەوەش کە تووشتان بوو لە رۆژی بەیەك گەیشتنی هەر دوو ئوردووەکە لە جەنگی ئوحود دا ئەوە بە فەرمان و ویستی خوا بوو ، تا ئیمان باوەرداران دەربخات .. دووروویی و نالەباریی دووروووەکانیش دەربخات ، کاتیك پییان وترا : بجەنگن لە پیناوی خوادا ، هیچ نەبیت بەرگری لەخۆتان و مال و مندالتان بکەن ، ووتیان: ئەگەر بمانزانیایە شەرو جەنگ بە پا دەبیت ئەوە شوینتان دەکەوتین و دەجەنگاین ، ئەوانە ئەو رۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لەئیمان ، بەدەمیان شتیك دەلین کە لە دل و دەروونیاندا نییە ، خوایش زانایە بەوەی کە دەیشارنەوە ..

بەلی دوای ئەوەی کە سەرۆکی مونافیقان و ئەوانەی لە گەلیدا رۆیشتن ، (عبدالله کوری عمر کوری حرام ) یش بانگی لی کردن تا بگەرینەوە و ، نەگەرانەوە پاشەکشەیان کرد لە جەنگی ئوحود دا رایان کرد هەر وەك پیشەی هەموو مونافیقانە کە لە کاتە پیوستەکان ئەمە رفتارو کاری نابە حی یانە ، بەلی ئیمە لەم رۆژگارەدا دە بینین کە کار بەدەستانی دەولەت چۆن نیفاق لە کەل گەلە کەیاندا دە کەن ،هەموو کات پە یمان وبەلین دەدەن بەلام نای بەنەسەر لە گەل خەلکدا ، هەموو کات پیشە یان دۆراندنە بەرامبەر بە دوژمنان چونکە راست ناکەن ،درۆزنن ، بی هەل ویستن لە هەموو کارە کانیاندا ،ئەوە تا لەم زەمانەدا شونیە مال سامان نیان تیدا نەبیت بیناکانیان دەچیتە هەور ، خەلکیش وا دەمری لە برساندا ،هیچ کارو کاسبی یەکیان بۆ خەلك نەهیشتووە بەس بۆ خۆیان هەموو شتیکیان قورخ کردووە ،خەلکی کوردستان داهاتی نەوتە نەوت لە هەمووشوینیك دا، خەلك وا دەمری لە برسان ، لە سالی ٢٠٢٠- نەوت بە بیست دۆلار بوو ،فەرمانبەر بی مووچە بوو ،ئیستا سالی ٢٠٢٢ نەوت بە ١٣٠ دۆلارە هەر فەرمانبەر موچەی نیە !!تاکەی ئەم زولە لەم خەلکە موسلمانەکە دەکریت ؟! بەس خۆشبەختانە هەموورۆژیك درۆکانیان سپی دەبیتەوە لە ناو خەلك دا ، وەك سەرۆکی نیفاق سەردەمی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) ، چونکە سەرئەنجامی نیفاق هەر سەر شۆریە و ،روە راستەقینەکەی دەر دەکەویت لە ناو خەلك دا ،بەلی برسی کردنی خەلك یەکیکە لە نیفاقە گەورە کان کە زلم و ستەمیکی زۆر گەورە یە ،ئەمەی لە م سەردە مەدا دە کریت بە دریژایی میژوویی کوردی بە خۆ یەوە نەبینیوە ،چونکە کورد هە رژیر دەستەی بیگانە بووە نۆکەری کردوە ،بەنۆکەری خۆی رازی بووە،ئەوەندە ستەمیان لی نەکردووە ، بەلام ئیستا بە خۆی دەسەلاتی خۆی گرتۆتە دەست ، زولمی زۆر ستەمی زۆر لە خۆی دەکات ، لە میژوودا نەبووە ...!!!

ئ
تۆ بیت لە میلەتەکەی خۆت باج و سەرانە لەسەر هەمووشتێك دا بنێت تەنانەت لەسەر ئاو هەواش دایی ناوە ،بۆ بەرزکردنی بیناکانیان و مانەوەی بنەمالەی خۆیان و ،شاردنەوەی پارە یان سپی کردنەوەی پارە لە بانکەکانی جیهان کرین خانوو لە ولاتانی ئەورپاو امریکا دا ،هێنانی دوژمنانی ئیسلام بۆ وەلات بەناوی ریخراوی مرۆیی و ریخراوی خیر خوازی ، بازرگانی کردن لە گەل ئیسرائیل و جوولە کەدا یان هاو پە یمانی کردن لە گەلیاندا دانانی یاسایەکی رۆئاوایی بۆ پاراستنی خۆیان بنەمالەیان بەناوی دژە تیرۆر ،ئەوەی لە گەلیاندا نەبیت ئەوا بەتیرۆر دادەنریت یان ئەوەی رەخنە بگریت بەتیرۆردادنریت یان تیرۆر دە کریت یان زیندانی دە کریت بۆ هەتاهەتایی ،هەموویەنامەو ئایدەلوجیایان دژ بە ئیسلامە ،هەر خەریکی بەد رەوشتی بلاو کردنەون بەناوی گەشت گوزارو هاتنی گەشتیاران بۆ ناو وەلاتانی موسلمانان ،بەرز کردنەوەی بیناکانیان داگیر کردنی زەوی و زار لە هەموو لایە کەوە ،بەراستی هیچ کات میژوو رەحمیان پی ناکات لە نووسینەوەی ، بۆیە دە بیت جیل لەدوای جیل بزانن ئەو دەسەلاتەکوردیە چۆن بووە ، چ کاریکی قیزەونی کردووە بۆ گەلە کەی تا هەتایی خەلکی کوردستان لە بیریانەچیتەوە ، لە درندایەتی ئەم دەسەهەلاتەکوردیە بەرامبەر بە خەلکی موسلمانی کوردستان ، بۆ هەر کاتێك باسی سەرۆکی نیفاق کرا دەبیت باسی ئەو دەسەلاتەکوردیە بکریت کەلە ( ٣١ ) سالی رابردوو دا چیان بەسەر ئەم خەلکەمووسلمانەدا هیناوە ،چ کارە ساتیکیان دروست کردووە بۆ نەوە لەدوای نەوە هەر دە بیت بگیرینەوە ، بە ناو سیاسەت کردن و دیمکراسیەتی رۆژئاوا و علمانەتیان پەیرەو کردنی ئاینی مەسیحی و جوولە کە ، چونکە نۆکەری ئەم دوو ئاینەن ، دژایەتی کردنی ئاینی ئیسلام ی پیرۆز ، بەلی ئەمانە هەمووی پیشەی دوو روو موناڧیقانە درۆزنانە هیچ ووتەیەکیان نیە لە درۆکردن زیاتر پیشە ی هەمیشەی ئەوانە درۆکردنە لە ناو خەلك دا بریقە دانی قسەکانیان بەلام کە چی درۆزن و دووروون ، لە دەرەوە شتێك دەلین بەلام لە ناوەوەدا دوو روو موناڧیقن ،دلیان پیسە ناخیان پرە لەڨینە بەرامبەر بە ئیسلام و خەلکی هەژار و نەدار ،ئەو کاتەی ئیشان بەخەلکە خۆیان دەکەن بە پرد بەلام کاتێك ئیشیان پی نەمان ،گوی یان لی ناگرن ،خەزمەتیان ناکەن ئازاریان دەدن و زیندانیان دەکەن بە ناوی جۆراوجۆر ئازاری دەروونی خەلك دە دەن ، باشە ئەمانە کەی مرۆڤن ،باشە ئەمانە کەی عەقل هۆشیان دەخەنەگەر ،بەلی نەگویان هەیە ببیستن ،نە چاویان هەیە ببین ئەوانەئاژەلن بەلکو زیاتریش ،د لیان ختمی رەشی لیدراوە هیچ کات هیدایەت نادرین تا نەچینە ژیر گل ...!!!

ئ
بەلی دوای ئەوەی موسلمانەکان کەوتنە باسی ئەوەی کە دەر هەق بەم مونافیقە ترسنۆکانە چی بکەن ؟!

دەستەیەك لەفەرماندە کانی سوپای ئیسلام رایان وەها بوو بەر لەوەی لەگەل دوژمنی بت پەرست واتە قورەیش بەجەنگین ،دەست لەو مونافیقانە بووە شینن و پاکیان بکەنەوە ، چونکە نامەردانە لە هەلویستی ناسك دا پشتی ئیسلام و موسلمانیان بەردا ، بەلام دەستەیەکی تر یان لە سەرووی هەمووشیانەوە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وای بۆ نەئەچوو ، بەلکو وای بەچاك ئەزانی با وازیان لی بهینریت و ، ئیستا دەستیان لی نەدری ، بەلی ئەم رایەی دووەم رایەکی پر لە حیکمەت بوو ،بۆ موسلمانەکان ، چونکە بەگژدا چوونەوەی ئەو یاخی بووانە ئان ئە نا پاکانە و خیانەتکارانە ، لەو ساتە دا کاتیکی زۆر ناسك بوو ، چونکە ئەوپەری مەترسی تیدا بوو ، وە سەلامەتی سوپای ئیسلام شتیکی مەسۆگر نابیت کاتەی زۆر ناسکە ، چونکە بە کوشتاری ئەوان موسلمانەکان دە کەوتنە نیوان دوو ئاگرەوە لە لایەك کافرانی قورەیش لە لایەکی ترەوە مونافیقان بەسەرۆکایەتی ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) ، بەلی ئەو کاتەش سوپای قورەیش زۆر بەئاسانی ئەتوانی گەمارووی سوپای مەدینە بدات و دەست بەسەر شاری مەدینەدا بگریت .

بەلی دوای گەرانەوی سەرۆکی مونافیقان ئەوانەی گەلە گەلی بوون ( ٣٠٠ ) کەس دە بوون ، وە پاشماوەی سوپای ئیسلام بووە بە ( ٧٠٠ ) جەنگاوەر بوون ، بەرەو دوژمن کەتنە ری . هەروەها ئەو شوینەی کە پیویست بوو کوسلمانان بیکەنە بنکە لە هەندی شویندا سوپای قورەیش ماوەی ئەوەی نەهیشت بوو تا موسلمانەکان تیپەر بن ، بۆیە پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( من رجل يخرج بنا على القوم من كثب ايى من قريب من طريق لا يمر بنا عليهم ) دوای لە پیاویك کرد تا ریگا یان پی نیشان بدە تاکو تیپەر بکەن و بچنە بن پالی چیای ئوحود ،بەلام لە کەنارەوە برۆن و نەنیشنە مل سوپای قورەیش ، ئەوە بوو ( ابو خيثم ) بۆ بەرییەر و ری نیشاندەر یان ،ری یەکی کورتی هەل بژراد و سوپای بت پەرستەکانی خستە لای خۆر ئاواوە ،بە ئەسپایی تیپەری کرد ، لەو کاتەدا سوپای ئیسلام بە لای باخچەی ( مورەبەعی کوری فەیزیدا ) کە موناففیکی نا بینا بوو ،تی پەری کرد ، وە هەستی بە تیپەر بوونی سوپای ئیسلام کرد ، ، دەستی بەخۆل وەشاندن کرد بە رووی موسلمانەکاندا و، ئەی ووت : ئەگەر پیغەمبەر خوایت ریت نادەم بیتە باخچە کەمەوە ، خەلکە کە هەلمەتیان دا تا بی کوژن ، کەچی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی ( لاتقتلوه فهذا أعمى القلب أعمى البصر ) واتە : مەی کوژن ، چونکە ئەمە چاویش و دل یشی کویرن. الرحيق المختوم ٢٥٥-٢٥٩ .

٥٩٩

ئ

## نۆیەم: ریخستن و هاندانی موسلمانان وە ئامۆژگاری کردنیان لە لایەن پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ جەنگی ئوحود :

بەلی لە بەر بەیانی رۆژی شەمەی مانگی شەوال سالی ( ٣ ) کۆچی دا ، بەرانبەر بەسالی ٦٢٥ زاینی ، سوپای ئیسلام گەیشتنە بەرزای چیایی یان شاخی ئوحود .

بەلی لەو رۆژەدا بەیداخیکی رەش هەلکرا لەگەل سی ئالادا یەکەم: ئالای کۆچ کەران بەدەستی ( موصعەبی کوری عومەیرە ) بوو، دووەم : ئالای نەوەی ( ئەوس ) بەدەستی ( ئوسیدی کوری حوزیر ) بوو ، سی یەم : ئالای نەوەی ( خەزرج ) بەدستی ( حوبابی کوری منزیر ) بوو .

هەروەها ( سعدی کوری الموسیب ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( بەیداخەکەی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لەرۆژی جەنگی ئوحود دا پارچە پۆشاکیکی رەشی خاتوو عائیشە –خوا لی رازی بیت - بوو ، وە بەیداخەکەی ئەنصار پی دە وترا ( العقاب ) ، و فەرماندەی دەستە راست ( علی کوری ابی تالیب ) بوو ، وە فەرماندەی دەستە چەپ ( منزیری کوری عمری کوری الساعدی ) بوو ، وە فەرماندەی پیادە روە کان ( زوبیر کوری عەوام ) یان ( میقدادی کوری اسود ) بوو ، وە فەرماندەی ناوەراستی سوپاکە ( حمزە کوری عبدالمتلیب ) بوو ، وە ئالای سەرەکیەکەش بەدەستی ( موصعەبی کوری عومەیرە ) بوو ).

اخرجە : البخاری ( ٤٠٥١ ) ، البیهقی فی الدلائل ٣/٢٠١ .

هەروەها لەو رۆژە دا هیما و نهینی یەکتر ناسینەوەی هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەمە بوو ( امت امت ) بوو واتە : ( بکوژە بکوژە ) . اخرجە : احمد ٤/٤٦ ، ابو داود ٢٥٩٦ ، ابن هشام ٣/١٧.

هەووەها ( موسی کوری عوقبە ) – رزای خوای لی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و موسلمانان لە خوارووی چیای ئوحود ریز بوون ، وە موشریکەکانیش لە ( السبخە ) واتە : زەویە خوییاویەکەی بەرانبەر بە چیای ئوحود وەستان ، هەر دوو لا خۆیان ئامادە کرد بۆ شەرەکە ) .

البیهقی فی الدلائل النبوە ٣/٢٠٩ .

ئ

بەلی ئاموژگاری پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ سوپای ئیسلام و بەتایبەتی بۆ تیر هاویژه کان پیەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دوای ئەوەی کە سوپاکەی ریکخست ، ( ٥٠ ) تیر هاویژی زۆر چالاکی لە سوپاکەی هەلبژراد ، وفەرمانی پی کردن لەسەر تە پۆلکەی ( عینین ) یاخود گردەکەی تیر هاویژەکان بەرزایەکەی ( ١٥م ) بوو وە ( ١٥٠م ) دوور بوون لە سوپای موسلمانانەوە وفەرمانی پی کردن کە لەوی جیگیر بن و بە هیچ شیوەیەك نینە خوارەوە تا فەرمانیان پی دە کات .

بەلی گرنگی تیر هاویژەکان لە سی خال دا بوو :

١-دەست بەسەراگرتنی ئەو شوینە زال بوون بەسەر هەموو قۆلەکانی شەرەکەدا .

٢- پاراستنی سوپای موسلمانان لە پیشەوە .

٣-بەرەنگار بوونەوەی هیرشی ( ٢٠٠ ) ئەسپ سوارەکەی سوپای مککە کە رۆلیان وەك ئوتۆمبیلی زری بۆشی ئیستا وا بوو لە م شەرەدا .

هەروەها ( ابن اسحاق ) خوا لی رازی بیت – ئەو ئامۆژگاریە مان بۆ دەگیریتەوە دەفەرموویت : ( پیغەمبەر ﷺ ( عبدالله کوری جوبەیر ) کردە فەرماندەی تیر هاویژەکان کە ژمارەیان ( ٥٠ ) کە س بوو ، وە ( عبدالله کوری جوبەیر ) پۆشاکی سپی لەبەر دا بوو ، وە بەوە لە ناویاندا دەناسرایە وە ، وە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئامۆژگاری ( عبدالله یکوری حوبەیر ) ی کرد و فەرمووی : هیرشی ئەسپ سوارە کانی سوپای قورەیشمان لی دوور بخەرەوە بە تیر ، تا لەدواوە پەلامارمان نەدەن ، گەر لە جەنگە کە دا سەرکەوتین یان سەرنەکەوتین تۆ لە جی خۆت بمینەرەوە تا لە ویوە پەلامار نەدرین ) .

غزوه احد دراسه دعویه ص ٩ ، ابن هشام فی السیر برقم ( ٥٨٩ ) البیهقی فی الدلائل ٣/٢٢٧ .

پاشان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئامۆژگاری تیرهاویژەکانی کرد ، هەر وەك ( موسی کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ( ٥٠ ) کەسی تیرهاویژ هەلبژراد و لە رووی ئەسپ سوارەکانی قورەیش دا داینا ، وە ( عبداللە ی کوری جوبەیر ) کردە فەرماندەیان پاشان ئامۆژگای تیر هاویژەکانی کرد و فەرمووی : ئەی تیرهاویژەکان گەر ئیمە شوین پیی خۆمان لە شەرەکەدا قایم کرد و بینیتان ئەسپ سوارەکانی کافران کەوتنە جوولە و لە دوژمنانی خوا شکان و رایان کرد ئیوە جیگەی خۆتان جی مەهیلن ،من دواتان لی دەکەم کە هیچ پیاویك لە ئیوە جیگەی خۆی چۆل نەکات و ( هیرشی ) ئەسپ سوارەکا نمان لی دوور بخەنەوە ).اخرجه : البیهقی فی الدلائل ٣/٢٠٩ .

ئ

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاری تیر هاویژەکانی کرد کە بەشداری سوپای ئیسلام نەکەن ، لە کۆکردنەوەی دەست کەوتەکانی جەنگ دا ، (ابن عباس) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تیرهاویژەکانی لە م شوینەدا جیگیر کرد و پاشان پی ی فەرموون : (احموا ظهورنا ، فان رايتمونا نقتل فلا تنصرونا ،وإن رايتمونا قد نمنا فلا تشر كونا ) واتە :

پشتەوە ی سوپای ئیسلام بپاریزن ، گەر ئیمەتان بینی وا دە کوژرین سەرمان مەخەن ،وە گەر ئیمەتان بینی دەسکەوتمان لی گرتن بەشداریمان مەکەن ). اخرجه : احمد (٢٦٠٩) ،التبرانی فی الكبير(١٠٧١٩)

وە هەروەها ئامۆژگای کردن جیگەکانی خۆیان چۆل نەکەن گەر سوپای ئیسلامیش شکان لە جەنگە کەدا

لە (بەرائی کوری عازب) دەفەرموویت : (پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاری کردن و پی ی فەرموون ( جیگەکانی خۆتان چۆل مەکەن ، گەر سەرکەوتین بەسەر یاندا ، یان ئەوان تان بینی سەرکەوتن بەسەر ماندا ، مەیەن بۆ لامان و کۆمەکیمان مەکەن ) اخرجه : ابن حبان (٤٧٣٨) .

وە هەروەها ئامۆژگاری کردن و ئاگاداری کردنەوە ، نابیت جیگەی خۆتا چۆل بکەن تا نیردراو نەنیرم بۆ لاتان ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (إن رايتمونا تخطفنا الطير فلا تبرحوا مكانكم هذا حتى أرسل إليك ، وإن رايتمونا هزمنا القوم وأو طأناهم فلا تبرحوا حتى أرسل إليكم ) واتە :

گەر ئیمەتان بینی بالندە دەی فراندین ئیوە جیگەی خۆتان چووڵ مەکەن تا نیراو دەنیرمە لاتان ، وە گەر ئیمە تان بینی ئەوا نمان شکاندو بەدوایان کەوتین ئیوە جیگەی خۆتان چۆل مەکەن تا نیراو دەنیرمە لاتان ) . اخرجه : احمد (٤/٢٩٣) والبخاری (٣٠٣٩) ، وابو داود (٢٦٦٢) .

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هانی موسلمانانی دەدا بۆ بەرنگار بوونەوەی کافرانی قورەیش لە جەنگی ئوحودا ،بۆ ئەوەی سوپای موسلمانان بە هیزو خۆ راگریەکی گەورەوە بەرنگاری دوژمن ببنەوە ،وورەی موسلمانانی بەهیز کرد ، لەم جەنگەدا تا کو توانای بەرگریەکی بەهیز بەتەویان هەبیت لە بەرانبەر دوژمنانی ئیسلام ،ئەوانەی کە هاتوونە بەنیازی ئەوەی دەلە تی مەدینە بسرنەوەو ناوی ئیسلام بسرنەوەلە سەر رووی زەوی دا ، بەلام خەیال یان خاوبووو چونکە نەیاند دەزانی کە پیشەوا یەك پیشەوایەتیان دەکات کە سەرداری هەموو جیهانە رحمەتە بۆ مرۆڤایەتی ویەکسانی گرۆی زەوی لە ریگای پەیامەکەی لە لە (خوای گەورە) وە بۆ هاتۆتەخوارەوە بۆ یەکسانی داد پەروەری و یەك خوا پەرستی ...

ێ

بەلی دوای ئەوەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ریزی سوپای موسلمانانی ریکخست و هەرە موسلمانە قارەمانە ئازاکانی لە پیشەوەی سوپاکە دانا ،و پی ی راگەیاندن هیچ کەسیک هیچ کاریك لە خۆیەوە ئەنجام نەدات تا فەرمانی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پی ی دەگات ، پاشان بە مەبەستی بەرزکردنەوەی وورەی موسلمانان و زیاتر خۆراگریان پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شمشیرەکەی خۆی بەرز کردەوە فەرمووی : کی ئەم شمشیرەم لی وەردەگریت و مافی خۆی دەداتی ، تا ئەوە بوو (ابو دوجانە) وەری گرت و زیاتر وورەی موسلمانانی بەرز کردەوە ، ئەم بەسەرهاتەش لەم سی ریوایەتەدا هاتووە :

١-لە (ئەنسی کوری مالیك) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شمشیریکی بەرزکردەوە و فەرمووی : کی ئەم شمشیرەم لی وەردەگریت ؟! هەموویان دەستیان بۆ دریژ کرد و هەر یەکەیان دەیووت : من ،من ،تا هەندیکیان لی یان گرت و تەماشایان دەکرد ، پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : ئەی کی وەر دەگریت و حەقی بۆ دەستینیت ؟! ئینجا هەموو چوونە دواوە ، (ابو دوجانەی سماکی کوری خەرشە) ووتی : من وەری دەگرم و بەحەقی خۆی دەگەیەنم ،پاشان وەری گرت و پیشە سەری موشریکەکانی پی شکاند و راستگۆیانە لە رووی دوژمندا پی جەنگا و بەحەقی خۆی گەیاند).

اخرجە : مسلم (٢٤٧٠) ، البیهقی فی الدلائل ٢١٥/٣ .

٢-لە (ابن اسحاق) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (ابو دوجانە) شمشیرەکەی وەرگرت لە دەستی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئینجا پارچە پەرووی بەناو چەوانیەوە بەست (هەندیك ئەلین پارچە پەرووی سوور بوو) ، پاشان بە هەیبەتەوە دەرۆیشت لە ناو ریزی پیشەوە موسلماناندا ، لە پیش چاوی کافرانی قورەیش دا ، پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (ابو دوجانەی) بینی وا بە هەیبەتەوە دەروات لە پیش چاوی موشریکاندا ، فەرمووی (إنها لمشية يبغضها الله إلا في مثل هذا الموطن) واتە : ئە جۆرە رۆیشتنیکە (خوای گەورە) خاوەنەکی دەی بوغزینی تورە دەکات مەگەر لە جیگەیەکی وا دا نەبیت)

ابن هشام فی السیرە ١٦/٣ .

ئ

٣-له (زوبير كورى عوام ) –خوا لى رازى بيت – دەفەرموويت : (له رۆژى ئوحودا شمشيريكى نمايش كرد و پيشانى موسلمانانى دا فەرمووى : (من يأخذ هذا السيف بحقه ) واته: كى ئەم شمشيره وەر دەگريت و حەقى خۆى دەداتى ؟! (عمر ) هەستاو ووتى : من وەرى دەگرم ئەى پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) ؟! پيغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) رووى لى وەرگيرا ،و پاشان ووتەكەى يەكەم جارى دووبارە كردەوە ، منيش ووتم : من وەرى دە گرم ئەى پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ؟! بەلام رووى له منيش وەرگيرا ، پاشان ووتەكەى سى بارە كردەوە و ، (ابو دوجانه سمكاى كورى خەرشە ) هەستا و ووتى : من بەحەقى خۆى ورى دەگرم بەلام حەقى خۆى چى يە ئەى پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) ؟

پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) پى ى فەرموو : ( الا تقتل به مسلما ولاتفر به عن كافر ) – وفي رواية – : (أن تضرب به العدو حتى ينحني ) واته : حەقى ئەوە يە موسلمانى پى نەكوژرى وله رووى كافريشدا رانەكەيت ، وە له دوژمن بدەيت تا دەچەميتەوە ، پاشان پيغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) شمشيرەكەى دايە دەست (ابو دوجانه ) ئەويش پياويكى ئازا بوو و بە هەيبەت بوو له كاتى جەنگ دا و ئەگەر ويستى شەر كردنى بوايە خۆى نيشانە دەكرد و پارچە قوماشيكى سورى بەناوچەوانيەوە دەبەست و خەلكى ئەوەيان بەر چاو بكەو تايە دەيانزانى كە بەراستى شەر دەكات ) التبرانى فى الكبير ١٩/٩ (١٤).

بە لى ئا لەو جيگەيەدا هەنديك له هاوەلانى پيغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دواى سەركەوتن و شەهيدى و شكۆمەنديان له (خواى گەورە ) كرد ، ئەمەش بووە هۆيەكە تر بۆ بەرزكردنەوەى وورەى موسلمانان .

له (سعدى كورى ابى وەقاص )- خوا لى رازى بيت – دەفەرموويت : (عبدالله ى كورى جحش ) له رۆژى ئوحود دا پى ووتم : خوايە گيان گەر بە دوژمن گەيشتم ،رووبەرووى پياويكى زۆر ئازى پرچەكەم بكەرەوە تا له پيناوى تۆدا بەشەر بيم لەگەليدا ، پاشان سەرم بخە بەسەر يدا تا بيكوژم و كەل ويەلە كانى ببيتە دەسكەوتم . (عبدالله كورى جحش ) ووتى : ئامين ، ئينجا ئەو دوعاى كرد ووتى : خوايە رووبە رووى پياويكى زۆر ئازاى پرچە كم بكەرەوە تا له پيناوى تۆ دا بەشەر بيم له گەليدا و پاشان بمكوژيت و گويچكە و لووتم ببريت تا سبەينى پيت بگەم و پيم بليت : كى لووت و گويچكە ى بريت ؟ منيش بليم :له پيناوى تۆدا و پاشان له پيناوى پيغەمبەرەكەت دا تۆش بليت : راستت كرد ،(سعد ) ووتى : بەراستى دوعاكەى ئەو له دوعاكەى من باشتر بوو و بۆ ئەو ئيوارەيە هاتە دى ) البيهقى فى الدلائل ٢٥٠/٣ .

ئ

هەروەها لەو کاتەدا (عمر) و (زیدی برای ) پیش برکیان لەگەل یەکتر دا کرد بۆ بەدەست هینانی پلەی شەهید ، (عبدالله کوری عمر کوری ختاب ) دەفەرموویت : ((عمر) لەرۆژی ئوحودا بە زیدی برای ووت : برام ئەو قەلغانی سەر سنگم بگرە با بە تۆ بیت ؟زیدیش ووتی : تۆ چۆن شەهیدیت دەویت منیش ئاوها شەهیدیم دەویت ، ئیتر هەر دووکیان بەجی یان هیشت ) .

اخرجه :التبرانی فی الاوسط ١٠٥/٣ بو نعیم في (الحلیة ) ٣٦٧/١

## دەیەم : خۆئامادەکردنی سوپای موشریکی قورەیش بۆ جەنگی ئوحود :

بەلی موشریکان قورەیش خۆیان ئامادە کردو بەریز وەستان ، و (١٠٠) ئەسپ سواریان بە سەرکردایەتی (خالیدی کوری ولید ) لە لای دەستە راستی سوپاکەی قورەیش دانا ، وە (١٠٠) بە سەرکردایەتی (عەکریمەی کوری ابو جهل ) لە لای دەستە چەپی سوپاکە ی قورەیش دانا ، وە (صەفوانی کوری ئومەیە کوری خلف ) بۆ بە سەرکردەی هێزی پیادەکانی پیشەوەی سوپاکەی قورەیش ، وە سەر کردایەتی گشتی سوپاکەی قورەیش بەدەست (ابو سفان ) وە بوو ، ئەو سەرکردایەتی هەموو سوپاکەی بەدەستەوە بوو ، وە ئالاکەی سوپاکەی قورەیش بەدستی (طلحە ی کوری عوسمان ) بوو لە کورانی بەنی عبد الدار بوو ،

بەلی لەو کاتەدا (ابو سفیان ) کە فەرماندەی سوپاکی قورەیش بوو ، ئامۆژگاری ئالا هەلگری کردوو هانی دان بۆ جەنگی ئوحود .

لە (ابن اسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( ابو سفیان بە هەلگرانی ئالاکەی لە (بنی عبد الدار ) ووت وەك هاندانیك بۆ یان ووتی : ئەی کورانی (عبد الدار ) ئیوە بە ئالاکەیانەوە راتان کرد لە شەری بەدر وبینیتا چیمان لیهات ، و خەلکان بە هۆی ئالاکەیانەوە تووشی تەنگەشەدین ،گەر نەمینیت ئەووانیش نامینن ، یا ئەوە تا ئالاکەمان بۆ دەبپاریزت ، یا ئەوە تا بیدەنە دەست خۆمان تا بۆ تانی دەبپاریزین . وە ئالاهەلگرانیش تورەبوون وهەرەشە یان لی کرد وپییان ووت : ئیمە ئالاکەمان بدەینە تۆ کە شەر دەستی پی کرد و پیان گەیشتین ئەوجا دەزانی کە چۆن دە بین ؟! ) . السیر ابن هشام ١٦/٣ .

لە ریوایەتیکی تردا هاتووە کە لە (موسی کوری عوقبە ) لە ئیمامی (زوهریە ) و – خوا لە هەردوو کیان رازی بیت - دە گیریتەوە فەرموویەتی : خاوەن هەلگری ئالای قورەیش (طلحە کوری عوسمان ) کەمیك ناساغ بوو ، وە ئەوان لە (بنی عبدالدار ) بوون کە خاوەنی پەردە پۆش کردنی کەعبە بوون ،و بەیروەبردنی دانیشتنە کان و ئالا هەلگری قورەیش بوون ،(ابو سفیان ) پی ووتن : ئالاکە تان تیا چوو لە شەری بەدر دا تا ئەو هەمووە بە چواردەوریەوە کوژران ، وا بەچاك دەزانم ئالایەکی تر هەلبکەم ، (بنی عبدالدار و الاحلاف ووتیان : گەر ویستان لی ی ئالایەکی تر بەرز کەنەوە بەلام دەبیت تەنها بەدەستی یەکیك لە (بنی عبد الدار ) بەرز بکریتەوە ، ئەو کاتە (ابو سفیان ) پی ووتن : نا بەلام خۆراگر بن بە ئالاکەتانەوە ). اخرجە : البیهقی فی الدلائل ٢٠٩/٣ .

ئ
هەروەها قورەیش دوایان لە ( ابو عامری کوری راهیب ) کرد ، کە سەرکردە و ناوداری پێشووی شاری مەدینە بوو ، هەولبدات تا دووبەرەکی دروست بکات لە ناوریزە کانی سوپای موسلمانان دا .

لە ( ابن اسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( ابو عامری کوری راهیب ) کە ناوی( عبد عمری کوری صەیفی ) بوو ،یە کیك بوو لە ناودارە کانی شاری مەدینە ، و بەهاتنی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئەو شارە ، (ابو عامر کوری راهیب ) بە خۆی (٥٠) یاخود (١٥) گە نجەوە لە (الاوس ) چوون خۆیان گەیاندە شاری مککە ، و ئەو بە قورەیشی راگەیاند بوو کە هەر کات بە خزمەکانی خۆی (الاوس ) بگات هەمووی گوی رایەلی دەکەن وە هیچ یەکیکیان سەرپێچی ناکەن .

بۆیە لەم جەنگەی ئوحود دا ،کە هەر دوولا رووبەرووی یەك وەستان ، (ابو عامر کوری راهیب ) لە ریزی هاوپە یمانەکانی قورەیش هاتە دەرەوەو بانگی لی کردن ووتی : ئەی کۆمەلی ئەوس من (ابو عامری کوری راهیب ) م ، ئەوانیش وەلامیان دایەوە ووتیان : ئەی فاسق هەرگیز خۆشی بە چاوی خۆت نەبینی ، بەلی (ابو عامر ) لە زەمانی نەفامی دا یان جاهیلی دا نازناوی (الراهیب ) ی هە بوو ، بەلام پێغەمبەری خوا لەسەردەمی ئیسلام نازناوی گۆری بۆ (الفاسق ) ، دواتر (ابو عامر ) وەلامی ئەوانی گویی لی بوو ووتی : بەراستی خزمەکانم لەدوای من تیکچوون و شیت بوون ) .

ابن هشام فی السیر ٣/١٦ ،التبرانی فی التاریخ٢/٥١٢ .

ئ

## یانزەھەم: سەعاتی سفر ھاتە بەرەوە ، دەست پی کردنی جەنگ :

بەلی ھەردوو سوپاکە لە یەك نزیك کەوتنەوە ،سەعاتی سفر ھاتە بەرەوە ، قورەیش بە (٣٠٠) جنگاوەری پر لە چەك تفاقەوە ھاتۆ نەبۆ جەنگ کرد لە گەل سوپاکی ئیسلامدا وە بۆ دەست بەسەر داگرتنی شاری مەدینەوە تۆلە سەند نەوەی جەنگی بەرد ، بەلی دلی ھەر سەر بازیکی ئەم سوپایە پر بوو لە رەق و قینە ی ئەو رۆژەی بەدر بۆ تۆلەسەند نەوەی جەنگی بەدر ، ھەروەھا سوپای ئیسلام لە بەرامبەریاندا (٧٠٠) سەر بازی دامەزراوی پر لەئیمان بوون ، ووتمان لە سەرتادا سوپای ئیسلام (١٠٠٠) سەر باز بوو ، بەلام بە ھۆی پاشەکشەکردنی سەرۆکی مونافیقان کە (٣٠٠) سەر باز بوون ، پشتیان لە شەرە کە کردو بە ھەر جۆریك بیت خۆیان دزیەوە لە سوپای ئیسیلام ،بۆ یە (٧٠٠) جەنگاوەری خۆراگر و بە ھیمەت و دامەزراو لەبەرانبەر سوپا زۆرە کەی قورەیش دا بوو ن ، بەسەر کردایە تی پیشەوایی مرۆڤایەتی و رۆشنایی چاومان نوری چاومان قائدەو فەرماندەی موسلمانان پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) بوو ، بەلی جەنگاوەرە کانی ئیسلام لە و رۆژەدا ، ھەموو خۆزگە و ئاواتیان ئەوە بوو کە شەھید بن لە پیناوی خوا پیغەمبەرەکەی دا ھەر ھەموویان بەیعەتی مردنیان دا بوو ، لە پیناوی خوا دا ، ئەوان لە مردن بە ھیچ شیوە یەك نەدە ترسان ،بە لی موسلمانان بەو ھیوایەوە بە دینی پاك و بی گەرد خزمەتی گرۆی مرۆڤایەتی بکەن ، بەلام چەکی بەھیزو کارگەریان ئیمانە پتەو و دامەزراوە کە یان بوو .

لە دوو ریوایەتی (ضعیف) دا ھاتووە ، کە سەرە تا جەنگە بە شەرە شمشیر لە نیوان ئالاھەلگرانی سوپای قورەیش و ، وە ئالا ھەلگرانی سوپای موسلمانان بە تایبەتی کۆچ کەران دا دەستی پی کردووە .

١- لە (موسی کوری عوقبە) لە ئیمامی (زوھریە) و – خوا لە ھەردوو کیان رازی بیت – دە گیریتەوە فەرموویەتی :(طلحە ی کوری عوسمان) ئالاھەلگری قورەیش کان بوو ، وە ئالاھەلگری کۆچ کەران (عاصم) بوو ، کە دە ی ووت : من پاریزەرم بۆ ئەوانەی کە لەگەلم دان (انشا اللە)، و (طلحە ی کوری عوسمان) پی ووت ك دە توانیت لەگەلمدا بجەنگییت ؟ ووتی : بەلی و عاصمیش دەست پیشخەری کرد و بە شمشیرە کەی دای بەسەریدا کوشتی بە کوشتنی ئەم ئالا ھەلگرەقورەیش خەونەکەی پیغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ھاتە دی کە بینی بووی بەرانیك بەدوای خۆیدا رادەکیشیت ) .

اخرجە : البیھقی فی الد لائل ٣/٢١٠.

ئ

٢-له (ابن هشام ) وه دەفەرموويت : (ئيمامى على ) – خوا لى رازى بيت - به ئالاكەوه چووه پيش و ووتى : من پشت شكينم ، (ابو سعدى كورى ابوطلحه يش ) ئالا هەلگرى قورەيش بوو ووتى : بر نايەيته ، مەيدانەوه به شەر ببين ، هه ر دوولايان بەشەر هاتن وه (ئيمامى على ) داى به زەويدا و كوشتى . له ريوايەتيكى تردا هاتووه كه دەلين : ((ابو طلحه ) له نيوان هەر دووسوپاكه دا هاته مەيدانى نيوانيان و بانگى كرد ، من پشت شكينم كى ديته دەرەوه بۆم ؟ چەند جار ئەمەى دوو باره كرده وه و كەس له موسلمانان نه چووه دەرەوه پاشان ووتى : ئەى هاوەلانى محمد ئيوه ئەلين كوژراوەكانتان له بەهەشتدايه ، و كوژراوەكانى ئيمەش له دۆزەخدايه ، درۆ دەكەن گەر ئەوه بەراست بزانن يەكيكتان دەهاته دەرەوه بۆم !! ئينجا (على كورى ابى تاليب ) – خوا لى رازى بيت – بۆ هاته دەروه و بەشەر هات ن كوشتى ). اخرجه : ابن هشام فى السير ٣/٣٢ .

به لى دواى كوشتنى (ابو طلحه ) ئالا هەلگرانى قورەيش كه نازناوى (كبش الكتيبه ) لى نرا بوو ، واته : بەرانى جەنگاوەرانى قورەيش ، لەدواى ئەو واته : (ابو طلحه ) (٥) كەسى تر له براكانى هەليان گرت يەك له دواى يەك كوژران ،له دواى ئەوانيش (١١) كەسى له كورانى (بنى عبدالدار ) هەليان گرت يەك لەدواى يەك كوژران ، له كۆتاييدا كۆيلەيەكيان هەلى گرت كه ناوى (الصواب ) بوو ، لەدوايدا ئەويش كوژرا ، پاشان ئالاكەيان كەوته سەر زەوى و كەسيان نەديده ويرا لى ى نزيك بيتەوه وەك ( زوبير ى كورى عوام )-خوالى رازى بيت – دەفەرموويت : ( ئالا هەلگرانى قورەيش يەك لەدواى يەك دا كوژران تا كۆيلەيەكيان هەلى گرت كه ناوى (صواب) بوو لەدوايدا ئەويش كوژرا ، وه هەموويانمان كوشت و ئالاكەيان كەوته سەر زەوى و هيچ كەسيكيان نده ويرا لى نزيك بيتەوه تا ئافرەتيكيان كه ناوى (عەمرەى كچى عەلقەمه ) بوو ئەو بەرزى كردەوه ، وه برديەوه ولى ى كۆبوونەوه ) . اخرجه : ابن هشام فى السير ٣/٢٨ .

پاشان هيرشى موشريكانى قورەيش دەستى پى كرد ، وه له قولى دەسته راست و دەستەچەپ و ناوجەرگەوه ، و له دواياندا ئافرەتانيان دەفيان لى دەدا وورەى موشريكانى قورەيشان بەرزدەكردنەوه وه هانيان دەدان بۆ جەنگ كردن .(ابن اسحاق ) – خوالى رازى بيت – دەفەرموويت : ( كاتيك هەردوولا بەيەك گەيشتن و هيرش دەستى پى كرد و لەيەكتر نزيك بوونەوه ،( هيندى كچى عوتبه ) و ئافرەتانى تر كه له گەليانادا بوون هەستان و دەفەكانيان بەدەستەوه گرت و لەدواوه پياوانيان هاندەدا و ، ( هيندى كچى عوتبه ) دەى ووت: (وبها بني عبدالدرا وبها حماة الادبار ضربا بكل بتار ) واته: ئاى كورانى عبدالدار ئاى پاريزگارانى دواى خەلكان ليبدەن به هەموو شمشيريكى تيژ ...

ئ
وه هەروەها دەیان ووت :

نحن بنات طارق نمشي على النمارق

والمسك في المفارق ان تقبلوا نعانق

أو تدبروا نفارق فراق غير وامق

واتە : ئیمە کچانی **طارق** دەرۆین لەسەر دۆشەکەی نەرم و بۆنی میسکیش لەسەر مەچەکەکانمان گەر بینە لامان دەستە ملان دەکەین ، و گەر پشتمان لیبکەن بە ناخۆشی لییان جیادەبینەوە ).

اخرجە : التبرانی ی الکبیر ٩/١٩،ابن هشام فی السیر ١٧/٣ ، البیهقی فی الدلائل ٢٣٣/٣ .

سەبارەت بە بەشداری کردنی ئارەتانی موسلمان لەجەنگی ئوحودا و چەند ریوایەتیکی ( ضعیف ) هەیە ، بەلام ئیمە ئەوەی ( ابن مسعود ) مان –خوا لی رازی بیت - هیناوەتەوە کە دەفەرموویت : ( ئافرەتانی موسلمان لە جەنگی ئوحودا لە دوای پیاوان بوون ، بۆ یارمەتی کۆمەکی جەنگاوەرانی سوپای ئیسلام ، وە تیمار کردنی بریندارا ن و ئاو هینانیان بۆ جەنگاوەرانی سوپای ئیسلام ).

اخرجە : احمد فی مسند ( ٤٤١٤ ) ، ابن كثير في البدايةو النهاية ٤٠/٤ .

بەلی لەپاش ئەمە هیرشی سوپای ئیسلام دەستی پی کرد بۆ سەر موشریکان و کافرانی قورەیش زۆر بەتوندی دەستی پی کرد .

لە ( موسی کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( لەدوای کوشتنی ئالاهەلگرانی قورەیش ، پیغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) و هاوەلانی لە هەموو قۆلیکەوە هیرشیان بردە سەر موشریکان و کافرانی قورەیش و ، وە پەلاماریاندان وهیرشی ئەوانیان پەك خست و ، پاشان سی جار ئەسپ سوارەکانیان هیرشیان هیناو تیرهاویژە موسلمانەکانی سەر گردەکە لییان هاتنە دەست و لەهەرسی جارەکەدا رویان نان و پاشە کشییان پی کردن ) . البیهقی فی الدلائل النبوە ٢١٠/٣ .

بەراستی پالەوانانی سوپای ئیسلام لییان هاتنە دەست و، بەراستی دەستیکی کوشندەیان لیدان و وە شەریکی بی وینەیان لەگەل کردن لەوانە ( حمزە ) و ( ابو دوجانە ) وەك ( سعدی کوری وەقاص ) دەفەرموویت : ( ( حمزە ) لە جەنگی ئوحود دا لە پیشی پیغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) دەجەنگا و دەی فەرموو : من شیری خوا و پیغەمبەرم ) . . اخرجە : الحاكم ١٩٣/٣ .

ئ

وه له ( عومەیری کوری اسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دەەرموویت : ( ( حمزه ) لەجەنگی ئوحود دا له پیشی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) به دوو شمشیر شەری دەکرد و دەی ووت : من شیری خوام ).

البیهقی فی الدلائل النبوه ۲٤۳/۳ .

هەروەها ( ابو دوجانه ) زۆر به قارەمانانه و مەردانه دەجەنگا ، وه جۆنیەتی جەنگانەکەشی لەم دوو ریوایەته ( ضیف ) ە دا هاتووه .

۱-له ( زوبیری کوری عوام ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( ( ابو دوجانه ) به هەرکەسیکی موشریك و کافر بەگەیشتایه ئەی کوشت ،وه له موشریکه کانیش پیاویك هەبوو ، به هەر برینداریکی ئیمه بگەیشتایه ئەی کوشت ،هەر یەکیان له یەکتر نزیك بوونەوه ، و منیش دوعام کرد بەیەك بگەن ، ئەوه بوو بەیەك گەیشتن ، و موشریکەکه شمشیریکی داوەشان بۆ ( ابو دوجانه ) وه ( ابو دوجانه ) قەلغانیکی دایه بەر ، وه پاشان شمشیریکی لیدا و کوشتی ). اخرجه : ابن هشام فی السیر ۱۹/۳ .

۲-هەر له ( زوبیری کوری عوام ) وه – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت – ( ووتم دەبیت ئەمرۆ تەماشای ابو دوجانه بکەم تا بزانم چۆن شەریك دەکات ، تەماشام دەکرد هەر شتیك بهاتایەته بەردەمی دەی خست و له ناوی دەبر د ) .اخرجه : الحاکم ۲۳۰/۳ .

وه هەروەها پیاویك که ناوی ( قزمان ) بوو وه لەبەر خوا لەم جەنگه دا بەشداری نه کرد بوو بەلکو لەبەر ناو شوهرەت بەشداری کرد بوو ،ئەم پیاوه زۆر به توندی دەجەنگا لەگەل موشریکان و کافرانی قورەیشدا .

له ( سەهلی کوری سعد ) – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیاویك هەبوو له ریزی هاوەلانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دا دەجنگا ،نەی دەهیشت موشریکان و کافرانی قورەیش له دەستی دا دەرباز بن ، تا خۆیی پیانی دەگەیاند و بەشمشیرەکەی لی دەدان ، تا دواتر ووترا : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەوەی فلان کەس ئه نجامی دا ئەمرۆ بەکەسمان ئه نجام نەدرا ، پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) یش فەرمووی : ( اما انه من اهل النار ) واته : لەگەل ئەووشدا ئەوه دۆزەخی یه ) .

اخرجه : البخاری ( ٤۲۰۲ ) ، و مسلم ( ۱۱۲ ) .

ئ
بەلی هیرشی موسلمانان بۆ سەر موشریکەکان بەردەوام بوو ، تا کو راویان نان ، و گەیشتنە سەرکردایەتیان ، و نزیك بوو ، وە ( ابو سفیان ) نی سەرکردە یان بکوژریت .. !!

وە ( زوبیری کوری عوام ) - خوا لی رازی بیت - دەفەرموویت : ( حنظلە ی کوری عامر ) بە ( ابو سفیان ) گەیشت و دای بەزەویدا ، ونزیك بوو بیکوژیت ، بەلام ( شەدادی کوری ئەوس ) چاوی پی کەوت و هات لە دواوە شمشیریکی لی داو شەهید بوو ).

اخرجه : ابن هشام فی السیر ٢٣/٣ ،البیهقی فی الدلائل ٢٤٦/٣.

بەلی هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) گیان لەسەر دەستانە دەجەنگان .

( جابر ) خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیاویك لە جەنگی ئوحودا ، ووتی : ئەی پیغەمبەری خوای ( صلی الله علیه وسلم ) گەر بکوژریم لە کوی دە بم ؟! پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( لە بەهەشتدا دەبیت ) پیاوەکەش هەندیك خورمای بەدەستەوە بوو ،فری داو جەنگا تا شەهید بوو ).

اخرجه : البخاری ( ٤٠٣٦ ) ، و مسلم ( ١٨٩٩ ) ، والنسائی ٣٣/٦.

وە لە ریوایەتیکی تردا هاتووە ( کە ( عبدالله ی کوری جحش ) ئەو رۆژە شەری کرد، لە جەنگی ئوحودا شمشیرەکەی شکا ، و هات بۆلای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە پلە دار خورمایەکی دا بە دەستی ( عبدالله ) و بوو بە شمشیرو پیی دەجەنگا ) . اخرجه : البیهقی فی الدلائل ٢٥٠/٣ .

بەلی هیرشی موسلمانان بەردەوام بوو ، و موشریکە کانیش رایان کرد ، و خیوتگەکە یان گیرا ، وە ئەو ئافرەتانەش کە لەگەلیاندا بوون هەل هاتن .

( براء ) دەفەرموویت : ( کاتیك بە موشریکەکان گەیشتین و هیرشمان بردە سەریان رایان کرد ، هەموو ئافرەتە کانیشیان رایان دەکرد بەرە و بەرزاییەکەو وجلەکانیان هەلکرد بوو و خر خالە کانی قاچیشیان دیار بوو ) . اخرجه : البخاری ( ٤٠٤٣ ) .

( زوبیری کوری عوام ) دەفەرموویت : ( سویند بەخوا تەماشام دەکرد خرخالەکانی ( هیندی کچی عوتبە ) و هاوەلە ژنەکانی دیار بوو ، خۆیان کۆکردبووە وە رایان دەکرد ، کەم تا زۆریکیان مابوو کەدەست بەسەر بکرین ) . ابن هشام فی السیر ٢٨/٣ .

ئ

لەو رۆژەدا ( ابو دوجانە ) بە دوایان کەوت گەیشتە ( هیندی کچی عوتبە ) و ریزی لە شمشیرەکەی پیەمبەری خوا ( صلى الله علیه وسلم ) کە بەو شمشیرە لە ژن بدات .

لە ( زوبیری کوری عوام ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( کە ( ابو دوجانە ) بە دوایان کەوت تا گەیشتە ئافرەتە دەفە بەدەستە کانی قورەیش لە قەراغی بەرزایەکەی ئەو بەر ، وە ( ابو دوجانە ) شمشیرە کەی داوەشان بۆ ( هیندی کچی عوتبە ) بۆ ئەوەی لی بدات ، پاشان وازی لی هینا کە جەنگە کە تەواو بوو بە ( ابو دوجانە )م ووت : هەموو کارە کانتم ئەمرۆ بینی ، تەنها ئەوە نەبیت کە شمشیرە کەت بەرزکردەوە لە ئافرەتەکە و بەلام لیت نەدا ؟! ( ابو دوجانە ) ووتی : بەلی راستە سویند بە خوا ریزم لە شمشیرەکەی پیغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) گرت کە ئافرەتیکی بی کۆمەکی پی بکوژم ).

اخرجه : البزار ( ٩٧٩ ).

ئ

## دووانزه هه‌م : هه‌له‌ی تیر هاویژه کان :

له کاتیك دا که خه‌ریك بوو سوپا خنچیلانه‌که‌ی ئیسلام سه‌ر که‌وتنیکی یه‌کجار گه‌وره‌ی تری تۆمار ده‌کرد به‌سه‌ر سوپای موشریکه بت په‌رسته‌کانی قوره‌یش ،که هیچی که‌متر نه‌بوو له سه‌ر که‌وتنی جه‌نگی به‌در ، به‌لام له‌لایه‌ن تیر هاویژه‌کانی سه‌ر گرده که‌وه هه‌له‌یه‌کی گه‌وره‌یان ئه نجام دا ، ره‌وشه‌که به یه‌کجاری گۆرا و ، وه بووه هۆی زیانی کی گه‌وره به موسلمانه‌کان له‌م جه‌نگه دا ، خه‌ریك بوو ببیته هۆی شه‌هید بوونی پیغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم ) وه به هۆی هه‌له‌ی تیر هاویژه‌کان سوپای ئیسلام به‌ره‌و به‌رزایه کانی چیای ئوحود پاشه‌کشه‌ی کرد ، پیشتر باسی ئه‌وه مان کرد ، که پیغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم ) چه‌ند فه‌رمانیکی دا به‌سه‌ر تیر هاویژه‌کان ، ئه‌وه بوو پی فه‌رموون که به هیچ شیوه یه‌ك جیگه ی خۆتان به جی نه‌هیلن ،ئیمه سه‌رکه‌وتین یان دوژمن سه‌رکه‌وت به‌سه‌رمان ،به لام به هۆی هه‌ندیك هه‌لی تیرهاویژه‌کان ئه‌م زیانه به موسلمانان که‌وت ، هه‌له که‌ش ئه‌وه بوو کاتیك تیر هاویژه کان بینیان که‌وا موسلمانان راوی موشریکانیان ناوه ، ده‌ستیان به هه‌لگرتنه‌وه‌ی ده‌ست که‌وته کانی جه‌نگ کردووه غنیمه‌ته کان کۆده‌که‌نه‌وه ، هه‌ندیك له تیر هاویژه‌کان خۆشه‌ویستی دونیا چاوی کویر کردن ، وه هه‌ندیکیان به‌یه‌کتریان ووت : وا هاوه‌له کانمان غنیمه‌ت کۆده‌که‌نه‌وه وه ئیمه‌ش وا لیره‌ین ، فریایی ده‌ست که‌وته کان نه‌که‌وین هه‌مووی ده‌بن فریایی هیچ شتیك ناکه‌وین ، هه‌روه‌ها ووتیان ئیمه چاوه‌ری چی ده که‌ین لیره ؟!

به‌لام (عبدالله کوری جبیر ) ئه‌میری ئه‌م کۆمه‌له تیرهاویژه بوو ، وه ووته‌کانی پیغه‌مبه‌ری خوای صلى الله عليه وسلم بیر هینانه‌وه و ، وه پیی ووتن : ئه‌ری له بیرتان چوو پیغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم ) چی پی فه‌رموون ؟!

ی

بەلام زۆرینەیان گوێ یان نەدا بە ووتەکەی (عبدالله کوری جبیر ) ووتیان ئیمەش دەرۆین لە گەل ئەو خەلکەدا غنیمەت کۆدەکەینەوە ، بەلی لە پاشان (٤٠) پیاو لە تیر هاویژەکان کیوەکەیان چۆلکرد و ، هاتنە خوارەوە بۆ ناو سوپاکە بۆ کۆکردنەوەی غنیمەت ، بەلی بەم شیوەیە پشتی سوپای ئیسلام چۆل بوو ، جگە لە (عبدالله کوری جبیر ) (٩) کەسی تری هاوەلی کە لەیدا مانەوە و بریاریاندا کە لەویدا بمیننەوە تا لە ناو دەچن یان مۆلەت دەدرین ، ئیدی ئەوانی تر کیوەکەیان بەجی هیشت و هاتنە خوارەوە.

لە (زوبیری کوری عوام )- خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( سویند بەخوا ئیمە لەو کاتەدا زال بوو بووین بە سەریاندا و سەرکەوتنمان بەدەست هینا بوو ،بەلام لە ناکاو تیرهاویژەکان فەرمانەکەی پیغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم ) شکاند ، وە تیرهاویژەکانیش لە نیوان خۆیاندا جیاوازی کەوتبووە نیوانیاندا ،کۆمەلیکیان دوای ئەوەی بینیان کە هەندیك لە موسلمانان کەوتوون بەسەر ئەو دەستکەوتاندا

ووتیان : دەست کەوتە کان دەست کەوتە کان ئەی خزمان ، وا هاوەلەکانمان سەرکەوتن چاوەری چی دە کەن ؟! وە کۆمەلیکی تریان ووتیان : پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دوای لی کردن کە ئیرە بەجی نەهیلن بەسەرکەوتوو بیت یان سەنەکەووتن بیت !! وە ئەمیرە کەیان کە (عبدالله کوری جبیر ) بوو ، پیی ووتن : بیرتان چووەوە پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) چی پی ووتن ..!! ).

ئیتر ئەوە بوو دەمەقالی و جیاوازی کەوتە نیوانیان وە سەرپیچی فەرمانەکانی پیغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم ) کرد و شکستیان هینا . پاشان کۆمەلیکیان لەوانە دەیان ویست بچنە خوارەوە بۆ شت کۆکردنەوە ، ووتیان سویند بە خوا دەبیت برۆین و لەدەستکەوتەکەدا بەشداربین .(زوبیری کوری عوام ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( بەم جۆرە تیر هاویژەکان سەرپیچی فەرمانەکەی پیغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم ) کرد و جیگەکەی خۆیان چۆل کرد ، و هاتنە جیگەکەی شەرگە کە کە موشریکەکانمان لی روانان کەوتنە کەل و پەل کۆکردنەوە و پشتەوە یان چۆل کردین ).

ئ

بەلی ئالەو کاتەدا ئەسپ سوارەکانی موشریکانی قورەیش ، بە سەرۆکایەتی ( خالیدی کوری ولید ) لە جیگەی تیرهاویژەکانەوە هیرشیان هینایە سەر موسلمانان و ، وە سوپای ئیسلام گەرایەوە دواوە و ئەوانیش واتە : سوپای قورەیش بەدویان کەوتنەوە ، وە ریزی سوپای پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەموو بەیەکدا چوون وەك تیکەل بوونی هەر دوو دەست ، ئالۆزی کەوتە ناو سوپا و وە ریزەکانیان شیواو و تیکەل و پیکەل بوون ، وە یەکیك لەوکاتەدا هاواری کرد هەموو وایان دەزانی کە ئەوە شەیتان بووە ، و ووتیان : بۆیان بگەرینەوە ، بۆیان بگەرینەوە ، ( محمد ) ( صلی الله علیه وسلم ) کوژار . ئەمەش زیاتر موسلمانانی پەشیوکرد و هەموو بەسەر یەکدا کەوتن و بوونە بە ( ٣ ) بەشەوە بەشیك کوژار و بەشیك بیندار بوو بەشیك رای کرد و هەلات ).

اخرجه : البزار ( ٩٧٩ ) ، احمد ٤/٢١٣،ابو داود ( ٢٦٦٢ ) ،البخاری ( ٤٠٤٣ )،البیهقی فی الدلائل٣/٢١٠-٢٦٧.

احمد٤/٢٩٣ ، ابو داود ( ٢٦٦٢ )، ابن هشام فی السیر ٣/٢٨ .

( موسی کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( موسلمانان بەسەر یەکدا گەرانەوە و کەتنە شەر کردن لە گەل یەکدا بی ئەوەی یەکتر بناسنەوە ،کوژراویان زۆر بوو ).البیهقی فی الدلائل ٣/٢١٠ .

بەلی بەم شیوەیە ( خالیدی کوری ولید ) کە بینی وا موسلمانان یان تیر هاویژەکان شوینی خۆیان چۆل کرد ئەوەیش بە هەلی زانی و بە فرسەتیکی گەورەی زانی وە لەویوە پەلاماری داو ، لە دواوە پشتی لی گرتن ، و پاشان موشریکەکان بۆیان هەلگەرانەوە و موسلمانان ئابلوقە دران ،وجی پی یەکەی خۆیان لە دەست چوو ،و لەبەر یەك هەلوەشان و بی سەرەو بەرەیی رووی تی کردن و بەش بەش بوون و هەر بەشەی بەجیا لەلایەکەوە شەری دەکرد ، وەهەندیك نەیدەزانی شەربکا یان هەل بیت ، بگرە واشپرزەبوون کە یەکتریشیان نەدەناسیەوە و پەیوەندیان بەسەر کردایە تیانەوە نەما بوو ، وە بە هەلە ( الیمان ) کە موسلمانیك بوو بەدەستی موسلمانان کوژرا وایان دەزانی کە یەکیکە لە موشریکەکان .

( عائیشە ) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( لە جەنگی ئوحود موسلمانان شکان ، ئیبلیس واتە : شەیتان ( لعنه الله علیه ) هاواری کرد ، بۆیان بگەرینەوە ، و بەم جۆرەش هەر دوو لای سوپاکەیان گەرانەوە سەر موسلمانان ، لە و کاتەدا ( حوزیفە الیمان ی باوی بینی ).

ئ

( عوروه )- خوا لی رازی بیت – دەفە رموویت : ( موسلمانان بە شمشیرەکانیانەوە لی کۆبوونەوە وایان دەزانی کە ئەوە یەکیکە لە موشریکانی قورەیش ( حوزیفەش ) هەر دەی ووت : ئەی بەندەکانی خوا ،ئەوە باوکمە ئەوە باوکمە ، بەلام ئەوان لەقسەکەی تی نەدەگەیشتن ، سویند بەخوا لی دوور نەکەوتنەوە تا کوژرا و نەیان دەناسی ، ( حوزیفە ) پی ووتن : باوکی منتان کوشت . ئەوانیش ووتیان : سویند بە خوا نەمان ناسی ، وە ئەوان راستیان دەکرد ، ( حوزیفە ) ووتی : خوا لیتان خۆش بیت خوا لیتان خۆش بیت ،( خوا لە هەموو کەسی بەبەزەیی ترە ) ، دواجار پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ویستی پارەی خوینەکەی بدات ، بەلام ( حوزیفە ) وەری نەگرت ، کردیە چاکە بۆ موسلمانان ، ئەمەش هۆی زیاتر ریزدار بوونی لای پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) .

اخرجه :ابن حبان ( ٧٠٢٥ )، البخاري ( ٤٠٦٥-٣٧٢٤ ) ، ابن هشام فى السير ٤٢/٣ ، برقم ( ٦٢٥ ) ، البيهقى فى الدلائل ٢١٨/٣،التبرانى فى التاريخ ٥٣٠/٢ .

بەلی بەم شیوەیە سوپای موسلمانان شیرزە بوون هەندیکیان چەکیان داناو دانیشتن و هەندیکی تریان تا مردن شەریان کرد وە ك ( ئەنسی کوری مالیك )- خوالی رازی بیت – دەفەرموویت ( ئەنسی کوری النضري )مامم دوا کەتبوو لەجەنگی بەدر دا ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە یەکەم جەنگت لە گەل موشریکان دواکەتووم واتە: مەبەستی جەنگی بەدر بوو ، بەلام ئەگەر ( خوای گەورە ) پاشان پیغەمبەر ئەم جارە ئامادەیی جەنگی موشریکانم بکات دەبینیت چی دەکەم – وترسام هیچی تر بلیت – کاتیك کە شەری ئوحود بوو موسلمانان رایان کرد ووتی : خوایە من دوای لی بوردنت لی دەکەم لەو کارەی کە موسلمانان کردیان – وە لە پیناوی تۆدا بەریم لەوەی کە موشریکەکان پیی هاتوون و ئە نجامیان داوە ، پاشان شمشیرە کەیەوە چووە پیش ، و ( سعدی کوری موعاز ) بەرەو رووی هات و پی ووت : باوکی عمر بۆ کوی دەچیت ؟! ئەویش ووتی : دەچم بۆ بە هەشت سویند بە خوا ئا بۆنی بەهەشت کە خۆشە لە ناو هەمووتاندا من بۆنی دەکەم . ( سعدیش )پی ووت : ئەی برام چی دەکەیت منت لەگەلدام ،( سعد ) دواتر بەم پیغەمبەری خوای ( صلى الله عليه وسلم ) ووت : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوەی ئەو واتە: ( ئەنسی کوری النضري ) ئە نجامی دا من نەمتوانی ئە نجامی بدەم ( ئەنسی کوری النضري ) رۆیشت جەنگا لە گەل موشریکەکان تا بە پلەی شەهیدی گەیشت ...

ئ

هەروەها ( ئەنسی کوری مالیك ) دەفەرموویت : کە دواتر لاشەکەی ( ئەنسی کوری النضري ) مان دۆزیەوە و تەماشامان کرد لە ( ٨٣ ) شوێن لیدرا بوو بەشمشیر و رم و تیر ،دواتریش موشریکە کان لاشەکەیان شیواند بوو کەس نەی دەناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبیت کە پلکی من بوو ناوی ( روبیعەی کچی نضر ) بوو ووتی : براکەم نەدەناسیەوە تەنها بەسەر پەنچەکەیدا نەبیت ).اخرجە : البخاری ( ٢٨٠٥ ) و مسلم ( ١٩٠٣ ) .

بەلی لە هاوەلانەی کە زۆر مەردانەو قارەمانانە دەجنگا لەشەری ئوحودا ئەویش ( حمزی کوری عبدالمطلب ) ی کە مامی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) شیری خوای گەورە بوو .

( جابری کوری عبدالله ) – خوا لی رازی بیت – دەفەر موویت : ( پیاویك ووتی : من ( حمزە ) م بینی لە لای ئەو کۆلە درەختەوە و ئەو دەی ووت : من شیری خوا پیغەمبەرە کەیم ، خوایە من بەریم ئەوەی کە ئەو موشریکانە پی هاتوون ، وە دوای لیبوردنت لی دەکەم بۆ ئەو کارەی ئەمانە ئەنجامیان دا ، واتە: ئە و موسلمانانەی کە رایان کرد .. ) اخرجە : الحاکم فی المستدرك ٣/١٩٩ .

بەلی بی گومان بەرستی ( حمزە ) شیر ئاسا دەجەنگا و موشریکەکانی شپرزە کرد بوو ، تا دواجار لە دوورەوە بە ( رم ) هاویشتن شەهید کرا ، کەس نەدە ویرا رووبەرووی ببیتەوە ، بەلی بەدەستی کویلە یەکی حەبەشەی کە کویلە ی ( جوبەیری کوری موطعیم ) بوو ، ئەم کویلە یە ناوی ( وحشی ) بوو .

بەلی بەسەرهاتی شەهید بوونی (( حمزی کوری عبدالمطلب )) لەم دوو ریوایەتە دا هاتوو :

١-لە ( وحشی ) یەوە بۆ مان دە گیریتەوە دەلیت : ( کە ( حمزە ) لە جەنگی بەدر دا مامی خاوەنەکەمی کوشت بوو کە ناوی ( توعەیمەی کوری عدی ) بوو ، بۆیە خاوەنەکەم ( جوبەیری کوری موطعیم کوری عدی ) پیی ووتم : گەر تۆ ( حمزە ) م بۆ بکوژیت لە تۆلەی مامەدا من تۆ ئازاد دەکەم ، منیش لەگەل ( قورەیشدا ) چووم بۆ چەنگی ئوحود بەشداریم کرد ، کاتیك بەیرز وەستاین بۆ شەر ، پیاویك لە قورەیش کە ناوی ( سیباع ) بوو چووە دەرەوەو ووتی : کی دیتە دەرەوە جەنگم لەگەلدا بکات ؟! ( حمزی کوری عبدالمطلب ) بۆی چووە دەرەوە و پیی ووت : ئەی ( سیباع ) کورەکەی دایکی ئەنمار دژایەتی خواو پیغەمبەرەکەی دەکەیت ؟ ئە نجا ( حمزە ) پەلاماری داو دەست بە جی کوشتی ، منیش لەژیر ( بەردیك ) دا خۆم مات کرد بوو بۆی تا بەلامدا تیپەری و کاتیك لیم نزیك بوویەوە رمەکەمم تی گرت و دام لە خواری ناوکی و لە پشتیەوە دەر چوو.. ).

ئ

٢-ئەم ریوایەتەش ( جعفەری کوری ئومەیەی زمەری ) لە (وحشی ) یەوە گیرایەتەوە دەلیت : ( من کویلەیەکی ( جوبەیری کوری موطعیم کوری عدی ) بووم ، وە مامە کەی ناوی (( توعە یمەی کوری عدی ) بوو لە جەنگی بەدر دا کوژار بوو ، کاتیك قورەیش بۆ جەنگی ئوحود رۆیشتن منیش لەگەلیاندا بووم ، ( جوبەیر ) بە منی ووت : گەر تۆ ( حمزە ) ی مامی محمد بکوژیت لە تۆلەی مامی مندا ئەوا من تۆ ئازاد دەکەم وە منیش پیاویکی خەلکی حەبەشە بوو ، وەك ئەوان دەست راست بوو لەرم هەلدداندا ، و بەدەگمەن هەلەم بکردایە ، کاتیك کە شەرەکە دەستی پی کرد من دەگەرام بەدوای ( حمزە ) دا و چاوم بۆ دەگیرا ، تا لە ناوەراستی شەرەکەدا بینیمەوە لە هەموو لایەکەوە خەلکانی بەشمشیر ەکەی دەدا بە زەویدا و هیچ کەسیك لە روویدا خۆی بر رانەدەگیرا ، منیش خۆمم بۆ ئامادەکرد و ئەو بە شەرەوە پشتاو پشت هات وە من خۆم بۆ مات کرد لەژیر بەرد بوو یان کۆلە درەخیت بوو بۆ ئەوەی زیاتر لیم نزیك بیتەوە ، لە پشت منەوە ( سیباع کوری عبد عوزا ) بۆی چووە پیش و ( حمزە ) پی ووت : وەرە بۆلای من ئەی کوری ژنە خەتەنەچیە کە ، ئە نجا بە یەکەم جار لیدا و لە ناوی بدر ، منیش رمەکەم بۆی جولاند و مشتم لی گرت و پاشن تیم گرت دام لەبەر میزەلدانی و لە پشتیەوە دەرچوو،ئە نجا ویستی بەرەو من بۆم بیت و کەوت ، منیش لی گەرام هە تا مرد ، پاشان هاتم رمەکەم لە لاشەی دەرهینا و گەرامەوە لای خیوتگەکەی قورەیش لەوی دانیشتم و هەقی کەسی ترم نەبوو ، چونکە من تەنها ( حمزە )م کوشت بۆ ئەوەی ئازادبم )

.ابن هشام فی السیر٣/٢٢.

ئ

## سی نزەهەم : بلاوبوونەوەی هەوالی شەهید بوونی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ):

هەروە ها هەلگری ئالای سوپای موسلمانان لە جەنگی ئوحود دا ، بەدەستی ( موصعەبی کوری عەمەیر ) بوو ، بەلی لە کاتی هەلەی تیر هاویژەکان هیرشی خالید لە پشتەوە و شپرەزەی بی سەروبەری موسلمانان ، ئەوە بوو ( موصعبی کوری عەمەیرە ) شەهید بوو، کە ئالای سوپای بەدەستەوە بوو .

( ابن اسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت: ( موصعەبی کوری عەمەیرە ) بەرگری لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کرد تا شەهید بوو ، ئەو پیاوەی کە ئەوی شەهید کرد ناوی ( قمئة الليثي ) بوو ، وای دەزانی کە پیغەمبەری خوای شەهید کردووە ،بۆیە گەرایەوە لای سوپای قورەیش و ووتی : محمد م کوشت وە ، دوای شەهید بوونی ( موصعەبی کوری عەمەیرە ) ئالاکە درایە دەستی ( علی کوری ابی تالیب ) کە لەگەل چەندین پیاوی موسلمانی تردا بەرگریان لە پیغەمبەر ﷺ و سەرکدەی خۆشەویستیان دەکرد ) . ابن هشام فی السیر ٣/٢٢ ، برقم ٥٩٩ .

بەلی چەند ساتیك بەسەر شپرزەی سوپای ئیسلام تینە پەری بوو ، دەست بەجی هەوالی شەهید بوونی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە ناو هەردوو سوپادا بلاوبۆوە و ، ئەمە ئەو ساتە بوو کە وورەی موسلمانان رووخا بەشەهید بوونی پیغەمبەرە کەیان ،بەلی ئەوانەی دوور بوون لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هیز و ئەژنۆیان شکا ،وە شلەژان و شپرەزەیی کەوتە ریزەکانی سوپای ئیسلام ، پشیویکی زۆر لەناویان دا دروست بوو ، لە هەمان کات دا هاوارو وورەی بت پەرستا ن زیاتر بوو ، وە شالاوی هیرش کردنیان زیاتر بوو ،چونکە باوەریان وابوو کە گیشتوونەتە ئاما نجی خۆیان ، هەندیکی تریشیان خەریکی شیواندنی جەستەی شەهیدە کانی موسلمانان بوون .

ئیدی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) توانی ریگە بە سوپاکەی ببریت و لەو گەمارۆدانە رزگاریان بکات ، رووی تی کردن ، ( کەعبی کوری مالیك ) یەکەم کەس بوو ناسیەوەو بەدەنگی بەرز هاواری کرد لە موسلمانان ، ووتی : موسلمانینە مژەبیت پیغەمبەری خوا ﷺ زیندوە شەهید نەبووە ، هەروەها پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئاماژەی بۆ ( کەعبی کوری مالیك ) کرد تا کو بی دەنگ بیت هاوار نەکات ، بۆ ئەوەی موشریکانی قورەیش شوینەکەی نەزانن ، بەلام هاوار کردنەکە دەنگە کە کەوتە بەرگویی موسلمانەکان و ، خیرا هاتن بۆ لای نزیکەی ( ٣٠ ) کەس دەبوون بەدەوری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کۆبوونەوە ...

ئ

بەلی وەك باسمان كرد هۆی بلاوبوونەوەی ئەم پروپاگەندەیەش ئەوە بوو كە یەكی لە ئەسپ سورانی قورەیش كە ناوی (( قمئة الليثي ) بوو ، كە تووشی ( موصعەبی كوری عەمەیرە ) بوو ، كە هەلگری ئالای سوپای ئیسلام بوو شەهیدی كرد ، بەلی رروخساری ( موصعەبی كوری عەمەیرە ) لە روخساری پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئە چوو ،بە تاییەتی لە كاتیك دا كە كەل و پەل و كەرەسەی جەنگی دەپۆشی ،بۆی بت پەرستان ( موصعەبی كوری عەمەیرە ) یان بە پیغەمبەری خوا زانی و ، وە هاواری كرد محمد م كوشت . ئتر هەواله كە دەما و دەم بلاو بوویە وە، ئەم هەواله درۆینە ئەوەندی تر موسلمانەكان شپرەزە بوون و سەریان لی شیوا ،بە تاییەتی ئەوانەی ك كەوتبوونە ناوە راستی سوپای موشۆیكانی قورەیش لە پیشەوە سوپا گەورە كەیان لەدواوەشیان سوپاكەی خالید كوری ولید ، بەلی موسلمانەكان هەندیكیان سەرسام مابوون و نەیان ئەزانی چی بكەن و ،هەندیكی تریشیان لە جەنگ كۆلیان ئەدا و شمشیرە كانیان دانا و ، هەندیكی تریش بیریان لەوە ئەكردەوە پەیوەندی بە سەرۆكی مونافیقان بكەن ( عبدالله كوری ئوبەی ) لە مەدینە دا ، تا خۆ بەدەستەوە دانیان بە سوپای قورەیش بگەیەنی و ئەمانیان بۆ وەر بگری ، چونكە وایان ئەزانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) شەهید بووە ،بەلی یەكیكیان لەو موسلمانانە ووتی : خۆزگە نیردراویكمان بناردایە بۆ لای ( عبدالله كوری ئوبەی ) تاكو لا ( ابو سفیان ) ئەمان مان بۆ وەرگری

هەروەها ( ئەنسی كوری نضري خەزرەجی ) بەلای موسلمانەكان دا رۆیشت زۆر شپرە زە بوون ، بەم هەواله بینی وا موسلمانان ئەژنۆیان شكاوە و چەكیان فریداوە ،بەلی ( ئەنس ) كە پرسیاری هۆی ئەم دەستە ساردبوونەوەی لی كردن ، ووتیان : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) شەهید بووە .

( ئەنس ) ووتی : ئەگەر پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) كوژا بیت ؟! خۆ پەروەردگاری پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نەكوژراوە ، دەی ئیوە دوای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ژیانتان بۆ چیە ؟! دە هەستن لە پیناوی ئەو دینەدا كە ئەو جەنگی بۆ كرد لە پیناویشی دا مرد ، ئیوەش بجەنگن و لە پیناویشی دا بمرن ؟! لەدوای ئەم ئامۆژگاریەی ( ئەنس ) موسلمانان وورەیان هاتەوەبەر دەستیان بەكوشتار كردن كرد و هەرەوەها (( ئەنسی كوری نضري خەزرەجی ) دەستی دایە شمشیرەكەی دەستی بە كوشتار كردنی كافران كرد تا كو بە پلەی شەهیدی گەیشت ،هەروەها دەربارەی ئەم قارەمانە ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتی دابەزاند دەفەرموویت : ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا﴾ الاحزاب ٢٣ .

ئ

## چواردەهەم : ریکخستنەوەی سوپایی موسلمانان :

بەلی موسلمانان تووشی شکستی زۆر گەورە هاتن بە هۆی هەلەی تیر هاویژە کانەوە ،هەروەها بەهۆی بیستنی هەوالی شەهید بوونی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) موسلمانان یەکجار شپرزە بوون و ، وە هیزە کانیان بەش بەش بوون ، وە بۆچوونی جیاوازیان لە نیوان دا پەیدا بوو .

(موسی کوری عوقبە ) لە (ابی شهابی زوهریەوە ) دەیگیریتەوە دەفەرموویت : (کاتیك هیزە کانی موسلمانان پەرتەوازە بوون بە هۆی هیرش هینانەوە بۆ سەر موسلمانا لە پیشەوە ، پاشان موسلمانا هیزەکانی خۆیان یەکخستەوە بۆ بەرگری کردن ، لەو کاتەدا هاواریك یان دەنگیك بەرز بۆ وە ، ووتیان : وەرنەوە دواوە ، وەرنەوەدواوە ، پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) شەهید بوو ، بەبیستنی ئەم هەواله جەرگ برە ئەوەندی تر موسلمانان وەری خۆیان لە دەست داو بی توانا بوون و ژمارەیە کی زۆریان لی شەهید بوو،وە کۆمەلیکیان بەرەو شیوە کان هەلهاتن و ئاوریان لەکەس نەدە دایە وە ، بەلام پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) خۆ راگرانە لەجیگەی خۆی مایەوە و بانگی لی کردن ، تا هەندیکیان کۆبوونەوە و هاتنە شوین (بارانەوەکەی شیوە کە ، و پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) دیار نەما ، وپیاویك لە مسلمانان ووتی : دیارە پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) شەهیدبووە ،ئیوەش بگەرینەوە بۆلای خزم وکەس کارتان تا پەناتان بدەن پیش ئەوەی بگەن سەرتان و بتان کوژن ، چونکە ئەوان دوایی دەچنە ناو شارەوە ، وەپیاویکی (منافق ) ووتی : ئەگەر دەسەلاتمان هەبوایە و شتمان بەدست بوایە ئالیرە نەدە کوژراین ، وە هەندیکی تریان ووتیان : گەر پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) کوژرابیت ئیوەش بجەنگن بۆ پاریزگاری کردنلە ریباز و ئاینەکەی پیغەمبەرە کەتان تا شەهید دەبن دەگەنە خوا ، پاشان پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم بەدوای هاوەلانی دا گەرا ، بەلام موشریکەکان لەریگەی دابوون پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) کە ئەوانی بینی فەرمووی : (اللهم ان تشا لايغلبنك احد في الارض ) واتە : خوایە گەر ویستت لی بیت کەس لەدەستت رزگاری نابیت لەسەر زەویدا ، ئینجا موشریکەکان بلاوەیان کرد لەو قۆلەوە پیغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم ) ریگەی شاخاوی گرت وە بانگی لە هاوەلانی کرد ، تا بەرەو شاخەکە پاشە کشە بکەن وە کۆمەلیك لە موسلمانان وە ك (طلحە ی کوری زوبیر ) وە بە چواردە وری پیغەمبەر ﷺ وە مانەوە و خۆ راگریان کرد و بەلینی جەنگ کردنیان دایە تامردن واتە بیعەتی مردنیان پی دا ، وە خۆیان کردبووە قەلغان بەدەوری دا دەجەنگان و پاریزگاریان لی دەکرد ).

اخرجه : البيهقى الدلائل النبوه ٢١/٣ .

ی
بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە گەرمەی شەرە کەدا خۆ گەیاندە کۆمەلیکی تری موسلمانان و ، وە بە بینینی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه و سلم ) یە کجار وورەیان بەرز بووە و هیزیان هاتەوە بەر چالاك تر بوون .

لە ( عورەی کوری زوبیرە )وە – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) کاتیك گەیشتە هەندیك لە هاوەلانی تری و چاویان پیی کەوت ( طلحە و زوبیر و سهلی کوری حە نیف و الحارسي کوری الصومی ) لە گەلدان ، و موسلمانان ئەمانیان نەناسیەوە و وایان زانی دوژمنن ، تا یەکیکیان تیریکی بۆ ئامادەکردن بەلام کاتیك ئەوان قسەیان کرد پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) بانگی کردن ، بەراستی ئەوان کە چاویان بە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) کەوت و زانیان کە زیندووە وە ك هیچ زیانیکیان پی نەگەیشتبی و وەرەیان بەرزتر بۆ وە ) . البیهقی الدلائل النبوە ٣/٢٧١ .

لە ( ابن عباس ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( ئەو موسلمانانە دوای ئەوەی ئەو بانگە یان گوی لی بوو کە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) کوژراوە ،هیچ گومانیکیان لەم هەوالە نەبوو ، و ئەیان ووت : ئیمە لەو حالە دابووین ، تا بینیمان پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە ناوماندا هات لە نیوان هە ر دوو ( سعد ) وە هەر لە دوورە وە بەشیوەی رۆیشتنەکەی ناسیمانەوە ،وە زۆر دلخۆش بووین و دەت ووت هیچمان بەسەر دا نە هاتووە ) .اخرجە : التبرانی فی الکبیر ( ١٠٧٣١ ) ، البیهقی فی الدلائل ٣/٢٧١ .

( علی کوری ابی تالیب )- خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( کاتیك هیرشی موشریکە کان کەمیك رەویەوە ، تەماشای ناو کوژراوە کانم کرد پیغەمبەر م ( صلی الله علیه وسلم ) نەبینی ووتم : سوید بە خوا پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) رای نەکردووە ،وە نەشم بینیەوە لە ناو کوژراوەکاندا ، بە لام وا ئەزانم ( خوای گەورە ) بە هۆی ئەم کارەمان لیمان توورە بووە ، و پیغەمبەرە کەی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوە و چاکتر وایە بۆ من شەربکەم تا دە کوژریم ئە نجا کیفی شمشیرە کەم شکاند و ویستم برۆم بۆ پەلاماردانی دوژمن ئەوەندم زانی ئەو کۆمەلە موسلمانە بە رووما هاتن و تەماشام کرد پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە ناویاندایە ). اخرجە : ابویعلی ( ٥٤٦ ).

ئ

بەلی یەکەم کەس لەو موسلمانانەی کە پاشەکشەیان کرد بووە شیوەکە پیغەمبەر ی خوای ( صلى الله عليه وسلم ) ناسیەوە ( کەعبی کوری مالیك ) بوو .

( موسی کوری عوقبە ) لە ( عوروەی کوری زوبیرە ) – خوالی رازی بیت – دە گیریتەوە دەفەرموویت : ( لەدوای شکستی موسلمانان و بلاوبوونەوەی هەوالی کوژرانی پیغەمبەری خو ( صلى الله عليه وسلم ) یەکەم کەس کە پیغەمبەر ی خوای ( صلى الله عليه وسلم ) ناسیەوە ( کەعبی کوری مالیك ) بوو کە دەیووت : جا تەماشام کرد هەردوو چاوە ( پیرۆزە کانی ) دەدرەوشانەوە لە ژیر کلاوە ئاسنینە سەنگینەکەی سەری ، ئیتر بە هەموو دەنگم هاوارم کرد : ( الله اكبر ) مژدە ئەی کۆمەلی موسلمانان ئەوە پیغەمبەری خوایە ، پیغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) ئیشارەتی بۆ کردم کە بی دەنگ بم ، موسلمانان کە پیغەمبەریان ناسیەوە هەموو هەستان و ( پاشە کەشەیان ) کرد بەرەو شیوەکەی چیای ئوحود ، و علی کوری ابی تالیب و ابو بکر صدیق و عمری کوری ختاب و زوربیر و حاریسی کوری صومە و چەند کەسیکی تریان لە گەلدا بوو )

اخرجه : ابن هشام فی السیر ٣/٣٨ ، ابو نعیم فی الدلائل ( ٤١٤ ) ، والبيهقى فی الدلائل ٣/٢١١-٢٣٧ .

ئ

## پانزه هەم : پاراستنی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە لایەن هاوا لان:

بە لی دوای کۆ بوونەوەی ئەو کۆمەلە موسلمانە لە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) موشریکە کان هیرشە کەی خۆیان توندو چرو پرتر کرد لەسەر موسلمانان ، و پاشان هەندیکیان لە هاوەلان شەهید بوون ، بە هۆی بەرگری کردن لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە پیغەمبەریش بریندار کرا لەم جەنگەدا ،

لە ( ئەنسی کوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – دە فەرموویت :( پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە جەنگی ئوحود دا تەنها ( ٩ ) کەس لە چواردەوری مانەوە ،ئەوانیش ( ٧ ) یان لە ئەنصارە کان بوو ن ، ( ٢ ) لە کۆچ کەران بوون ، کافرە کان زۆر نزیك بوونەوە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( کی ئەوا نمان لی دوور دە خاتەوە هاوەلم یان هاوریم دە بیت لە بەهەشتدا ، پیاویك لە ئەنصارەکان چووە پیش و دەستی بە شەرکردن کرد تا کو شەهید بوو ، لە پاشان ووتەکەی دووبارە کردەوە و یەکیکی تر چووە پیش دەستی بە شەر کردن کرد تا کو شەهید بوو ،بەم جۆرە تا هەر ( ٧ ) یان شەهید بوون پاشان پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە ( ٢ ) هاوەلەکەی ووت : کە مابوونەوە لەگەلیدا : بەراستی داد پەروەر نەبووین لەگەل هاوریکا نمان دا ). اخرجە : مسلم ( ١٧٨٩ ) .

پاشان لەدوای پاشەکشە کردنی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ سەر شاخەکە دا ،( ٩ ) کەسی تر لە هاوەلە کانی شەهید بوون .

لە ( جابری کوری عبدالله ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( موسلمانەکان لە جەنگی ئوحود دا پاشەکشەیان کرد بۆ سەر شاخەکە تەنها ( ١١ ) پیاو لە چوار دەوری پیغەمبەی خوا دا مابوونەوە ، کە ( طلحە ی کوری عبدالله ) یان لە ناو دا بوو ، وە پاشەکشەیان دە کرد بەرەو شاخەکە ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( کی دیتە دەست بۆ ئەو کافرانە ) (( طلحە ی کوری عبدالله ) ووتی : من ئە ی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پی فەرموو: ( لە جی خۆت بە ئەی ( طلحە ی کوری عبدالله ) پاشان پیاویکی ئەنصار ووتی : من ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( تۆ برۆ ) چووە شەر کردن لە گەل کافرانىدا تا کو شەهید بوو ، پیغەمبەر ﷺ و ئەوانەی کەلەگەلی دا بوون ،ئەندیکی تر سە ر کەوتن بەسەر شاخەکەدا ، پاشان کافرەکانی پی گەیشتنەوە ، دیسان بە هەمان شیوە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ووتەکەی دووبارە کردەوە ، وە دیسان ( طلحە ی کوری عبدالله ) دە ی ووت : من ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ...

ئ

بەلام پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ماوەی نەدا ، پیاویکی تری ئەنصار دوای کرد کە شەر بکات لە گەل کافرە کاندا وماوەی ئەو پیاوە ئەنصاریەی دا، ئەویش وەك هاوەلەکانی پیشووی شەری کرد تاکو شه هید بوو ،ماوەیە ك کافرە کان لە پیغەمبەری خوا هاوەلانی دوور دە کەوتنەوە ، ئەوانیش سەر دە کەوتن بۆ سەر شاخەکە دا ،و پاشان دوژمن دە گەیشتەوە سەریان ، تا کو وای لیهات تەنها ( طلحة ی کوری عبدالله ) بە چوار دەورە وە مایەوە ، و پیغەمبەرﷺ فەرمووی : ( کی ئەم دوژمنانەی خوا دوور دەکاتەوە ) ئەم جارەش ( طلحة ی کوری عبدالله ) ووتی : من ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئینجا ((( طلحة ی کوری عبدالله ) شەری هەر ( ١١ ) کەسەکەی پیش خۆی کرد و ، واتە : ( بە ماوەی ئەوان جەنگا ) تا کو لە دەستی درا هەندیك لە پەنچەکانی قرتا ووتی : ( ئاخ ) پیغە مبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : گەر بت ووتایە ( بسم الله ) ئەوا فریشتەکان دەیان فراندیت لە پیش چاوی خەلکیدا ، وە لە ریوایەتیکی ترد دەفەرموویت : گەر بتووتایە ( بسم الله ) لە پیش چاوی خەلکاندا فریشتەکان بەرزیان دەکردیتەوە تا ئەیان گەیاندیتە ئاسمان ، وە لە ریوایەتیکی تردا دەفەرموویت : گە ر بتووتایە ( بسم الله ) دەت بینی بەوە مالیکت بۆ دروست دەکرا لە بەهەشتدا و تۆش هیشتا زیندووبویت لە دونیا ) وە پاشان خوای گەورە کافرەکانی دوور خستەوە ) . اخرجه : البيهقى فى الدلائل النبوه ٢٣٦/٣،فضائل الصحابة ( ١٢٩٤ ) عبدالله بن احمد .

بەلی ( طلحة ی کوری عبدالله ) بەهۆی ئەم لیدانەوە ئەو دەستەی تووشی شەلە هات ، وەك ( قیس ) – خوا لی رازی بیت ) دەفەر مووی : ئەو دەستەی کە ( طلحة ی کوری عبدالله ) شەری پی کرد بوو بە ئیفلیجی بینی بوو ، کە پاریزگاری کرد بوو لە پیغەمبە ری خوا دا ( صلى الله عليه وسلم ) البخارى ( ٤٠٦٣ ).

وە لە ریوایەتیکی ترد ( ابراهيم ی کوری محمد ی کوری طلحة ) – خوا لی رازی بیت – دە فەرموویت : ( یەکیك لە کافرەکان کە ناوی ( مالیکی کوری زوهیر ) بوو تیریکی هەلدا هاویشتی بەرە و پیغەمبەری خواﷺ ( طلحة ی کوری عبدالله ) دەستی دابەری نەی هیشت بەر پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کەویت ، ئەو تیرە بوو ، بوە هۆی ئیفلیجی دەستی طلحة لە گەل ئەوە شدا طلحة لە زۆر لاوە بریندار کرا و خوینی لی دە رۆیشت ) . اخرجه : الحاكم فى المستدرك ٣٦٩/٣ .

لە ریویەتیکی تردا هاتووە کە لە ( موسى کوری عوقبە ) گیراویەتەوە دەفەرموویت ( طلحة ی کوری عبدالله ) لە ( ٢٥ ) یان ( ٢٧ ) لاوە بریندار کرا بوو ، بە تیر و رم شمشیر ، وە لە ناو چەوانی درا بوو وە پەنچەی شەهادەتی قرتابوو ،وە پەنچە کانی تریشی ئیفلیج ببوون ) اخرجه : الحاكم فى المستدرك ٢٥/٣ .

ئ

لەرایەتیکی تردا (موسی کوری عوقبە ) دەفەرموویت : ( دوای ئەمە (سعدی کوری وەقاص ) ها ت و لە و رۆژە دا تەنها سعد و طلحە لای پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) ما نەوە ) اخرجه : البخاری (٣٧٢٤).

بەلی (سعدی کوری وەقاص ) تیر هاویژەکی زۆر باش و ئازا و دەست راست بوو ، بە لی لە و کاتەدا خۆی گەیاندە لای پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لە ناو شەرە کەدا ، ئەم بەسەر هاتەش خۆی دە گیریتەوە و دەفەرموویت : (کاتیك لە جەنگی ئوحود دا موسلمانان پەر شو بلاوبوون پەرتەوازە بوون ، لە پیغەمبەری خوا دا (صلی الله علیه وسلم ) دوور کەو تبوونەوە ، و منیش چوومە لایە کەوە و ووتم : پاریزگاری لە خۆم دەکەم یان شەهید دە بم یان رزگارم دەبیت ، تا کو دە گەمە بە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لە و کاتەدا پیاویکم بینی دەم و چاوی هەل پیچاوبوو ،واتە: دای پۆ شی بوو ، نەم دە زانی کی یە !! کافرەکان بۆی چوون تا ووتم ئیستا لە ناوی دە بەن ، بەلام ئەو کەسە دەستی پر لە ووردە چەو کرد بوو ، وە پاشان پرژاندی بە روویان دا ، تاکو هەر هەموو کافرە کان پاشاو پاش گەرانەوە دواوە ،ئەمە چەند جار روویدا هەر نەم دەزانی ئەو کەسە کی یە !! (میقدادم ) لی نزیك بوو ،ویستم پرسیاری ئەو پیاوەی لی بکەم ،بەلام (میقداد ) ووتی : (سعد ) ئەوە پیغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم ) وا بانگت دە کات ، ووتم : ئەوە لە کویە ؟! (میقداد ) دەستی بۆ راکیشا و منیش هەستام وەك هیچ (خەفە ت ئازاریکم تووش نەبوو بیت ) چووم پیغەمبەر فەرمووی : (سعد ) ئەم رۆ لە کوی بوویت ؟! منیش ووتم : لەو جیگەیە بووم کە منت تیدا بینی ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) ،وە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لە پیشەوە جیگەیەکی بۆ دەست نیشان کردم و لەو جیگەیە دانیشتم و کەوان و تیرەکانم ئامادەکرد و کە دەم هاویشتن لە کافرە کاندا دەم ووت : خوایە تیرەکەت بدە لە دوژمنەکەت ، پیغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم ) دەی فەرموو: ( خوایە دوا وا کەی (سعد ) جی بەجی بکە ، خوایە تیرەکەی (سعد ) بە نیشانەکانی خۆی بگەیە نی ،واتە : بدات لە و جیگەیە کە (سعد ) بۆی دەهاویژیت ، یان دەی فەرموو: دە تیان بگرە (سعد ) دایك باو کم بە فیدات بیت ، وە هەر تیریکم دە هاویشتە کافرە کان ، پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) دەی فەرموو : خوایە داوای کەی (سعد ) جی بەجی بکە ،و تیرەکانی بگەیەنە بە نیشانەکانی خۆی ، تا هەموو تیرەکانی کیفەکەم تیگرتن و تیرم پی نەما ، ئینجا پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) تیرەکانی کیفەکەی خۆی بۆ هەلریژام – وە (زوهیر ) دەفەرموویت : ئەو رۆژە (سعد ) (١٠٠٠) تیری هاویشت ) . اخرجه : الحاکم فی المستدرك ٢٥/٣.

بەلی (ابو طلحە ) لە و رۆژە سەختەدا بە تیرو کەوانەکەیەوە دە جەنگا و خۆ دەخستە بەر ئەو تیرانەی کە دە هاویژرا بۆ پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ).(انسی کوری مالیك ) - خوا لی رازی بیت - دەفەرموویت : ( لە رۆژی جەنگی ئوحود دا هەندیك لە موسلمانان بەچوار دەوری پیغەمبەرەوە پاشە کشەیان کرد بوو ، بەلام (ابو طلحە ) خۆی کرد بووە قەلغانی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) لە بەر دەمیدا وەستا بوو ، (ابو طلحە ) تیر هاویژەکی دەست راست بوو ، تیرەکانی لە کەوانەکەیدا زۆر رای دە کیشان ئینجا دەی هاویشت ، بۆیە ئەو رۆژە دوو یان سی کەوان بەدە ستیەوە شکا ، لە و رۆژە دا هەر پیاویك لەویدا تیەری بایە و تیری پی بایە پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) دەی فەرموو : تیرەکانت هەبریژە بۆ (ابو طلحە ) ، وە تیرە کانی باهاویشت بایە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) سەری بەرز دە کردەوە تا کو ببینیت تیرە کە لە کوی دەدات ، (ابو طلحە ) سینگی بەرز دە کردەوە و ، واتە: خۆی دەدایە پیشی پیغەمبەر ﷺ وە دەی ووت : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دایك و باكم بە قوربانت بیت ، سەرت بەرز مەکەنەوە نەوەك تیریك لە تیرەکانیان پیت کەویت وە سنگم قەلغانە بۆ سینگت ، (ابو طلحە ) خۆی خستبووە بەردەم پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) و دەی ووت : من بەهیزترین کەسم لە ناو خزمەکانی خۆم پیم بلی چیت دەویت با بۆت جی بەجی بکەم ) .اخرجە : البیهقی فی الدلائل النبوە ٢٣٤/٣ ،ابن هشام فی السیر ٣٤/٣ . وە لەریوایەتیکی تردا هاتووە کە (قتادەی کوری النعمان ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( کە فەرموویەتی: کەوانیك کرایە دیاری بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دای بەمن لە جەنگی ئوحود دا ، منیش ئەوەندەم تیر پی هاویشت تا تالەکەی پسا یان قرتا، بەلام هەر لە جیگەی خۆم وەستام و سەرم لە پیشی سەری پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) وەستان بوو بۆ ئەوەی رووخساری لە تیر دوژمن بپاریزم هەرتیر بەرەو رووی بهاتایە من سەرم بۆ لاردەکردەوە تا دەم و چاوی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) بپاریزم چونکە تیرم هیچ پی نە ما بوو ، تا لە کۆتاییدا تیریك لای چاوی دام چاوم دەرپەری ، و کافرەکان رایان کرد ، منیش چوومە لای پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) بەلەپی دەستمەوە گرتبووم پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) کە منی بەو جۆرە بینی فرمیسك لە چاوانی هاتە خوارەوە و فەرمووی : خوایە (قتادە) بپاریزراو بکەیت وە چۆن دەم چاوی پیغەمبەرەکەتی پاراست ، خوایە ئەم چاوەی بکەیت تیژترین و چاکترینی هەر دوو چاوانی دواتر ئەو چاوی چاکترین چاوی بوو ) . بەم جۆرە پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) لە گەل ئەو هاوەلانەی کە ژمارەیان (٣٠ ) کەسی خۆراگر بوون، لەرووی هیرشە یەك لەسەر یەکەکانی دوژمنانی قورەیش ، وەکەم کەم پاشە کشەیان کرد بۆ سەر شاخەکەی ئوحود .اخرجە: ابو نعیم فی الدلائل النبوە (٤١٧) ابن هشام فی السیر ٣٦/٣،البیهقی فی الدلائل ٢٥١/٣، البدایە والنهایە٢٣/٤ .

ئ

## شانزەهەم : كوشتنى ( ئوبەى كورى خەلف ) :

ئەوە بوو يەكى لە سوارچاكانى قورەيش ، كە ناوى ( عوسمانى كورى عبدالله ى كورى موغيرە ) بوو، ئەسپە كەى بەرەو پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) تاو دابوو بە نيازى كوشتنى ئەو و ، ئەشى ووت : رزگار نەبم ئەگەر ئەو رزگارى ببى .. بەلى پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وە ستا و خۆى ئامادە كرد بۆ شەر كردن لە گەل ئەو پياوە ، كەچى بە فەرمانى خوا ئەسپى ئەو پياوە لە كاتى تاودانى سەرى سمى دا لە زەويدا و ، پياوەكەى هەلدا يە خوارەوە كەوتە چاليكەوە و ، نەگەيشتە لاى پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە دواى دا خيرا يەكيك لە پاسەوانەكانى پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كە ناوى ( حاريسى كورى صوممە ) بوو ، بە پەلە هەلمەتى دا و خۆى گەياندە لاى پياوە كافرە كەى قورەيش ، دەستيان بە شەرە شمشير كرد ، ( حاريسى كورى صوممە ) شمشيريكى لە ( عوسمانى كورى عبدالله كورى موغيرە ) تەختى زەوى كرد ، لە دواى دا هەلمەتى دا و كوشتى ، وە چى كە ل و پەلى جەنگى پى بوو لى وەرگرت و خۆى گەياندە لاى پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەويش فەرمووى : ( الحمدالله الذي أماته ) واتە : سوپاس بۆ ئەو خوايەى كە لە ناوى برد ، دواى ئەوە كافرە بت پەرستەكان كەوتنە هيرش كردن و تا نەهلين موسلمانەكان بگەنە شوينى خۆيان و ، دەستيان بگاتە پيغەمبەر و بى كوژن ،ئەوە بوو يەكى لە بت پەرستەكانى قورەيش كەناوى ( عبدالله كورى جوبير ى كورى عامير ) بوو ، هەلمەتى دايە ( حاريسى كورى صوممە ) كە شمشيريكى دا لەسەر شانى و بە سەختى زامدارى كرد ، بەرادە يەك كە موسلمانەكان نا چار بين زامەكەى تيمار بكەن و خۆيشى بە كۆل هەل بگرن ..بەلى لەو لاوە ( ابو دوجانە ) پالە وانى بەناو بانگ دايە سوار چاكە قورەيشە يە كە كە ( حاريسى كورى صوممە ) ى زامدار كرد ، واتە : پياوە قورەيشەكە كە (( عبدالله كورى جوبير ى كورى عامير ) ، بەلى ( دوجانەى ) پالە وان يەك شمشيرى بۆ دا هينايەوە و ملى پەراند تەختى زەوى كرد ئەو كافرە بت پەرستە ، لە پاشان دا ( ئوبەى كورى خەلف ) بەدبەخت بە فيز لووتەبەرزى دەماريكى نەفاميدا ، ئەسپەكەى تاودا هينايە غاردان و بەرەو پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەلمەتى ئەدا بەو هيوايەى دەستى لى بووەشينى و ، ئەشى ووت : محمد كوانى ؟! رزگار نەبم ئەگەر ئەو رزگارى بى . پيغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەدياريەوە وەستا و بەر لەوەى بيتە پيشەوە حەربەكە ى تى گرت و كوشتى ، بەلى ( ئوبەى كورى خەلف ) يەكەم مرۆڤى بەد بەخت بوو ، كە پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەدەستى موبارەكى كوشتى .

ئ

له (ابن اسحاق) وه – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (که پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) له شیوەکەدا پالی دا بە کیوە کەوە ، (ئوبەی کوری خلف) لی نزیك کەوتەوە و ، ئەی ووت : کوانی محمد ؟! رزگارنەبم ئەگەر ئەو رزگاری ببی . خەلکە کە ئەوانەی پاسەوانی پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ! ئایا پیاویکمان بچیت بەدەمیەوە ؟! پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (دعوه) واتە : وازی لی بهینن . بەلی کە نزیك کەوتەوە پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حەربەکەی لە (حاریسی کوری صوممە) ی وەرگرت ، هاویشتیە (ئوبەی کوری خلف) دای لە ملی ، ئەوەندە توند لیدا چەند جاریك بەسەر ئەسپەکەیەوە غولایەوە ، و دوای بەو لیدانەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەرایە وە شاری مککە و زامدار بوو بەهۆی ئەمە مرد .

بەلی ئەم پیاوە بەدبەختە واتە : (ئوبەی کوری خەلف) لەشاری مککەدا زۆر دژایەتی پیغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) دە کرد ، هەروەها هەرە شەی کوشتنی لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دە کرد ، بەلی هەرچی تووشی (ئوبەی کوری خەلف) بووبایە لە شاری مککە هەرەشەر ی کوشتنی لە پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ، هەروەها پیغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) ئەی فەرموو : (بل أنا أقتلك إن شاء الله) واتە : انشا الله من تۆ دە کوژم . بەلی (ئوبەی کوری خەلف) ئەو هەرەشەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر لە یاد بوو ، لە بیری نەچوو بوو ، بۆیە کە لەرۆژی جەنگی ئوحود دا بە زامداری گەرایەوە ناو خزمەکانی، ئەی ووت : بە خوا محمد کوشتوومی ،خەلکە کە ووتیان ، زراووت چووە دە بەخوا هیچت نیە !! ئوبەی ووتی : دە بەخوا هەر لە مککە پی و تووم : من تۆ ئە کوژم . دە بە خوا ئەگەر تفیکیشم تب بکا ، هەر پیی ئەم کوژی . لە کاتی گەرانەوەدا بەرەو شاری مککە ، کە گەیشتە (سەریف) بە هۆی زامی حەربەکەی پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خواوە مرد .. لە ریوایەتەکەی (ابو اسود وە) هاتووە دەفەرموویت : کە (ئوبەی کوری خلف) وەك گاجووت ئەی قوراند و ئەی ووت : بەو خوایەی کە گیانی بەدەستە ، ئەگەر ئەوەی بە منەوە یە بەدانیشتوانی زیلمە جازەوە بیت هەر هەمووی ئەمرن . الرحيق المختوم : ۲۷۸-۲۸۰ .

ێ
له سی ریوایەتی زانایانی ( سیره ) دا هاتووه كوشتنی ( ئوبەی كوری خەلف )

١-له ( عوروەی كوری زوبەیر ) – خوالی رازی بیت – دەفەرموويت : ( ئوبەی كوری خەلف ) له مككه سويندی خوارد بوو كه دەبیت پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بكوژیت ، وه ئەم هەوالەش گەیشتەوه به پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) و فەرمووی : ( بەلكو من ئەو دە كوژم انشا الله ) له رۆژی جەنگی ئوحود دا ( ئوبەی كوری خەلف ) هەموو لاشەی به ئاسن قەلغان و درع پۆشی بوو ، وه سەر كلاوەكەشی به ئاسن پۆشا بوو بۆتەنها چاویشی دیار نەبوو ،هیرشی هیناو ووتی : رزگارنەبم گەر محمد رزگاری بیت هیرشی هینا بۆ پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) و ( موصعەبی كوری عومەیره ) له پیشی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) وەستا بوو بۆ پاریزگاری كردنی ، و موصعەب كوژرا ، و پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) چاوی به ئەلقەیەكی كراوەی نیوان كلاو ( درع ) ه كەی لەسەر قورقوراگەی ،( ئوبەی كوری خلف ) كەوت ، رمیكی بۆ هەلدا و له وجیگەیه ی داو لەسەر ئەسپەكەی خستیه خوارەوه و بەلام خۆین لەجی برینەكەی نەهات دەر ، و هاوەلانی هەلیان گرتەوه وەك گا دییۆراند و پییان ووت : بۆ وا بی غیرەتی ئەوه تەنها رووشاویەكه؟ ئەویش بەلینەكەی پیغەمبەری ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ گیرانەوه كەوتبووی : من ئوبەی كوری خەلف دە كوژم ، پاشان ووتی : سویند بەخوا ئەو ئازارەی ئیستا بەمنەوه یەگەر بەخەلكی هەموو ( ذي الحجاز ) وەبیت هەموویان دەمرن . ئەوه بوو ( ئوبەی كوری خەلف ) پاشان مرد ).

البیهقی فی الدلائل ٣/٢٥٨ ، ابو نعیم فی الدلائل ٤١٥ .

٢-له ( موسی كوری عوقبه ) كه له ( سعیدی كور موسەییەوه ) دە گریتەوه – خوا لیان رازی بیت – دەفەرموويت : ( لەو رۆژه دا ( ئوبەی كوری خەلف ) تەنها چاوی دیار بوو بەسەر ئەسپەكەیەوه هیرشی دەهیناو دەی ووت : رزگارم نەبیت گەر محمد رزگاری بیت ،بەلام هەندیك له موسلمانان ریگه یان پی گرت ، بەلام پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی پی كردن كه ریگەی بۆ چۆل بكەن ، ( موصعەب كوری عومەیره ) بەرەو رووی چوو موصعەبیش كوژرا ، پاشان پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) چاوی كەوت بەئەلقەیەكی كراوەی سەر قورقوراگەی ( ئوبەی كوری خەلف )، ورمیكی تیگرت و بەر قورقوراگەی كەوت و له ئەسپەكەی كەوتە خوارە وه خوین له برینەكەی نەهات دەر .... وپاشان ( ئوبەی كوری خەلف ) له ریگەی گەرانەوەی بۆ شاری مككه له ناو چوو . . ).البیهقی فی الدلائل ٣/٢١١ .

ئ

٣-هەروەك لە پێش دا باسمان كرد كە (ابن اسحاق) گێڕایەوە تەوە كە لە (ابن شیهابی زوهری بۆی گرامەوە لە عبدالله كوری كەعبی كوری مالیكەوە) – خوا لیان رازی بیت – دەفەرموویت : ( كاتیك پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە شیوەكەدا بەرەو شاخەكە پاشە كشەی دە كرد ،(ئوبەی كوری خەلف) پەیدا بوو دەی ووت : محمد ئەم رۆ رزگارم نەبیت گەر تر رزگارت بیت ، هاوەلانی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویان : ئەی پیغەمبەری خوا پیاویك لە ئیمە بۆی بگەریتەوە ؟! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : لی گەرین ، كاتیك نزیك بووەوە پیغەمبەر ﷺ رمەكەی لە (حاریسی كوری صوممە) وەرگرت رووی كرد (ئوبەی كوری خەلف) گوری بۆ خوارد كە تی ی گریت ئیمە هەموو پەرش و بلاو كەوتین بەم لاولادا ، پاشان تی ی گرت و دای لە ئەلقەكراوەكەی و درعە كە و لە قورقوراگەی داو لە ئەسپە كەی كەوتە خوارەوە و چەندەها تەقلەی لیدا ).

اخرجه : البیهقی فی الدلائل ٣/٢٣٨، ابونعیم فی الدلائل ٤١٤ ، ابن هشام فی السیر ٣/٣٨ .

ئ

## حەفدەهەم: زامدار کردنی یان بریندار کردنی پیغەمبەری خوا ﷺ

بەڵی لە کاتی پاشەکشە کردنی موسلمانان بەرەو شاخی ئوحود ، کافرەکان زیاتر هیرشە کانیان توند ترو چرتر کردەوە بۆ سەر خودی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) تا لە کۆتایی دا چەناگەی پیەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) زامدار بوو ، وە یە کیك لە ددانە كانی شکا ، وە لیوی پیرۆزیی لە ناوە وە زامدار بوو ، وە سەر ئەژنۆکانیشی رووشا ، وە کەوتە چالیك لە چالە کانەوە .ئەمانە لە چەندین فەرمووده دا هاتووە، وە دوای کۆکردنەوەو ریخستنیان بە م جۆرە دە بیت :-

لە ( ئەنسی کوری مالیکەوە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە جەنگی ئوحود دا دەم چاوی بریندار کرا ). وە چەناگەی بریندار کرا تا خوینی بەلای دەمی دا هاتە خوارەوە ). وە یەکیك لە ددانەکانی خریکانیشیان شکاند ،وە لە قولیشەیەوە درا وە تاسی کلاوەکەی سەریشی لیدار و شکا ) . پیغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) خوینی بە دەم و چاوی دا بوو ، واتە : لیو چەنەگەیەوە دەسری و دەی فەرموو : ( کیف یفلح قوم خضبوا وجه نبیهم بالدم وکسروا رباعیته ). وهو یدعوهم الى ربهم ) واتە : چۆن رزگار دەبن کەسانیك کە دەم چاوی پیغەمبەرە کەیان خەڵتانی خوین کردووە و ددانی خریشیان شکاند وە ، لە کاتیك دا کە ئەو بانگیان دەکات بۆ لای خوای خۆیان . وە دەی فەرموو: ( اشتد غضب الله على قوم دموا ، وجه رسول الله ) .واتە: خوا زۆر توورەیە لەسەر ئەوانەی کە دەم و چاوی پیغەمبەری خوایان خویناوی کردووە ، لە ریویەتیکی تردا دەی فەرموو : ( اشتد غضب الله على قوم هشموا البیضة على راس نبیهم و هو یدعوهم الى الله ) . واتە : خوا زۆر توورەیە لەوانەی کە تاس کلاوی ئاسنیان لەسەر صسغەمبەر وکەیان دا شکاندووە ، کە ئەو بانگیان دە کات بۆ لای خوا ). لە ریوایەتیکی تردا ( عمری کوری ختاب ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )

لە جەنگی ئوحود دا فەرمووی : ( اللهم العن ابا سفیان ، اللهم العن الحرث بن هشام ، اللهم العن صفوان بن امیة ، کیف یفلح الله قوم شجوا نبیهم و کسروا رباعیته وهو یدعوهم الى الله ) .

اخرجه : احمد ( ٨٢٢١ )، ( ١٢٨٣١ )،( ١١٩٥٦ )، ترمزي ( ٣٢٠٢ )،البخاري ( ٤٠٧٥ ) ، ( ٤٠٧٦ )،البزار( ١٧٩٣ ).

ئ

قال : نزلت ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾ ال عمران ١٢٨ . ( فتاب الله عليهم فاسلموا و حسن اسلامهم ) . واته :خوايه نەفرەت له صەفوانی کوری ئومیه بکه ، چۆن رزگار بوو دەبن کەسانێك که پێغه مبەره کەیان خوێناوی کردووه و ددانی خرییان شکاندوه ،که ئەو بانگیان دەکات بۆ بای خوا ، ئ نجا ئەم ئایەته دابەزی : که ( خوای گەوره ) دەفەرموویت : ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾ ال عمران ١٢٨ . پاشان خوا تۆبەی لی قبول کردن موسلمانیکی باشیان لی دە رچوو.وه لەریوایەتیکی تردا دەفەرموویت : که ئەو ئایەته دابەزی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( اللهم اغفر لقوم فانهم لا یعلمون ) . واته : خوایه له و خزم کەسانەم خۆش بە ئەوان نەزانن . اخرجه : مسلم ( ١٧٩١ )، الترمذي ( ٣٠٠٣ ) ، البخاری ( ٤٠٦٩ )، ابن حبان ( ٩٧٣ ).

ئ

**له هەندیك ریوایەت دا هاتووە كە ئەم كەسانە پیغەمبەریان(صلى الله عليه وسلم) زامدار كردووە :**

١-لە (ابو ئومامە) وە – خوا لی رازی بیت دەفەرموویت : (عبدالله ی كوری قومەئە) بەردیكی هاویشتە پیغەمبەر ﷺ ناوچەوانی زامدار كرد ، وددانای خری شكاند ووتی : بگرە لە (ابن قومیئە) وە پیغەمبەر ﷺ خوینەكەی بەدەم و چاویەوەسری و فەرمووی : (خوا كەرت كەرتت بكات) ئەوە بوو لەدوای گەرانەوەی ، (خوای گەورە) بەرانیكی كیوی بەسەردا زال كرد ،لیدا و تا كەرت كەرتی كرد ).التبرانی فی الكبیر (٥٦٩٤) .

٢-لە (ابن شیهابی زوهری) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (عوتبەی كوری ابی وەقاص) ددانی پیغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) شكاند و دەم چاوی خویناوی كرد ، پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوعای لی كرد و فەرمووی : (خوایە سالی بە سەردا نی یەتەوە و بەكافری بمریت) ئەوە بوو سالی بەسەر دا نەهاتەوە بە كافری مرد ) . اخرجە : عبدالرزاق (٩٦٥١) ، البیهقی فی الدلائل ٣/٢٦٥.

٣-(ابن هیشام) لە (ابو سعیدی خدریەوە) دەگیریتەوە و – خوا لیان رازی بیت – دەفەرموویت : (كە (عوتبەی كوری ابی وەقاص) بەردیكی دا لە ددانی خریی خوارەوە ی لای راستی پیغەمبەر ﷺ وە لیوی خواروی زامدار كرد ، وە (عبدالله كوری شیهابیش نەچەوانی بریندار كرد ، وە (ابن قومیئەش) سەر روومەتی زامدار كرد ، و دوو ئەلقە لە ئەلقە كانی (المغفر) ی لە سەر روومەتی گیر بوو ، وە هەروەها كەوتە چالیك لە چالانەی ك (ابو عامر) هەلی كەند بوو ، بۆ ئەوەی موسلمانانی تیبكەون بی ئەوەی ئاگاداربن ، (علی كوری ابی تالیب) دەستی پیغەمبەری گرت و طلحةي كوری عبید) لاشەی بەرز كردەوە تا هەستایەوە ،وە (مالیكی كوری سینان) خوینەكەی بەدەم صاوی پیغەمبەرە وە هەلمژی وپاشان تفی كردەوە و رۆی كرد) وە لە ریوایەتكی تردا هاتووە كە (ابو سعیدی خدی) خوینەكەی هەلمژیوە و پاكی كردە وە تەوە ).ابن هشام فی السیر ٣/٣٢،البیهقی فی الدلائل ٣/٢٦٦.

ئ

## هەژدەهەم : موسلمانان پال بە كیوی یان شاخی ئوحود دا ئەنین :

بەلی دوای ئەم هەموو شەرە ، كۆمەلیك لە هاوەلە قارەمانەكانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كە بە چوار دەورە وەی بوون ، بەر گریەكی قارە مانەیان كرد لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئا لەو كاتەدا كافرەكانی قورەیش دوا هیرشی خۆیان ئە نجام دا بۆ مەبەستی گرتنی شاخەكانی كیوی ئوحود وە پەلامار دانی موسلمانان لە پشتەوە .

لە ( عوروەی كوری زوبیرە وە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت ( ... موسلمانان لەو حالەدا بوون شەیتان وەسوە سەی بۆ دروست كردن و غەمباری دەكردن كە بە بەرچاوی خۆیانەوە ئەو برایانەیان شەهید كران و باسی كوژراوەكانیان لە یەكتر دە پرسی و لەو كاتەدا تەواو غەم و پەژارە دایگرتبوونەوە و ، ئینجا ( خوای گەورە ) موشریكەكانی هینانەوە سەر تا ئەو هەمووخەفت و نارەحەتی یەیان لی دوور بخاتەوە ، لە ناكاودا تەماشایان كرد وا دوژمن لەسەریانەوە و، دەیانەویت سەری شاخەكەی چیایی ئوحود لی بگرن ئا لەو حالەدا هیچ غەم و خەفەتیكیان لە دل نەما و پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( اللهم ليس لهم أن يظهروا علينا ) واتە : خوایە بۆیان نی یە ئەوانە بەرز بن بەسەرمان داو پاشان دوعای كرد وەهاوەلانی هان دا بۆ پەلاماردانیان و خۆی و ( عمری كوری ختاب ) وە تاقمیك لە كۆچ كەران بۆیان سەركەوتن بە شیوەكەدا تا گەیشتنە لای دوژمن و بەشەر هاتن لەگەلیان دا تا راویان نان و لەشاخەكە دایانبەزاننە خوار ). ابن هشام فى السير ٣/٤١ ، والبيهقى فى الدلائل ٣/٢٧١ .

لە ریوایەتیكی ترا كە لە ( ئەنسی كوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( ... پیغەمبەر ﷺ بەدوای هاوەلانی دا بوو تەماشای كرد وا كافرە كان لەسەر ریگاكەیان وەستاون ، كە ئەوانی بینی لەروویاندان فەرمووی : ( اللهم إن تشا لا يغلبك أحد في الارض وقال : اللهم إن تشا لا تعبد ). واتە : خوایە گەر ویستت لی بیت كەس زال نابیت بەسەر فەرمانتا لە سەر زەوی دا ، خوا یە گەر ویستت لی بیت نا پەرستریت ). اخرجه : مسلم ( ١٧٤٣ ).

ئینجا كافرەكانی لی دوور كەوتنەوە و پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و كۆمەلیك لە هاورییانی كە : ( طلحه و زوبیر ) یان تیادا بوو بە چوار دەوری پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بوون وە دەیان پاراست و بەرەو چیاكە كەوتبوونە ری و لەگەل كافرەكان بە جەنگ ها تبوون و هەموویان كوژران تەنها شەش یان حەوت كەس بە چواردەوری یەوە ما بوونەوە ).البيهقى فى الكبير ( ١٣٥٦٣ ) و فى الدلائل النبوه ٣/٢١١ .

ئ

**به لی ئالەم تەنگانە و نارەحەتی یانەدا ( خوای گەورە ) راستی مونافیق و دووڕووە کانی خستە روو ، وە بۆئەوە بوو تاکو باوەرداران هیمن ئارام ببنەوە ،وەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿ثُمَّ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُعَاسًا يَغْشَى طَائِفَةً مِنْكُمْ وَطَائِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنْفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ هَلْ لَنَا مِنَ الْأَمْرِ مِنْ شَيْءٍ قُلْ إِنَّ الْأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ يُخْفُونَ فِي أَنْفُسِهِمْ مَا لَا يُبْدُونَ لَكَ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ مَا قُتِلْنَا هَاهُنَا قُلْ لَوْ كُنْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَى مَضَاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِيَ اللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ **ال عمران ١٥٤ .**

**وە ( ابو طلحه ی انصاری ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( غەم وپەژارە هەموومانی گرتبووە وە لە ریزەکان دا لە جەنگی ئوحود دا ، سەرم بەرز کردەوە تەماشام کرد هەموو یەکیکمان بەملاو بەولادا دەکەوت بە هۆی ئەو غەم پەژارەیەی لە جەنگی ئوحودا ، وە منیش یەکیك بووم لەوانەی کە ئەو زۆر غەم و پەژارە م تووش هات ،تا زۆر جار شمشیرە کەم لە دەست دە کەوت بەهۆی شپرەزەیم و غەم و پەژراو لە دەست دانی چەندین هاوەلی بەریزە وە ، بەلام کۆمەلیکی تر واتە: مونافیق و دووڕووە کان هەر غەمی خۆیان بوو ،چونکە ترسنۆك ترین و بی دەسەلات ترین کەسان بوون گومانی خراپیان دەبرد بە ( خوای گەورە ) وەك گومانی نەفامی لەگەل ئەوەش دا کەسانیکی زۆر بە گومان و دوو دل بوون لە فەرمانە کانی خوای گەورە ).**

**اخرجه : الترمزی ( ٣٠٠٧-٣٠٠٨ ) ، احمد ٢٩/٤ ، البخاری ( ٤٥٦٢,٤٠٦٨ ) البیهقی فی الدلائل٢٧٢/٣ .**

**بەلی لە پال دامینی شاخی ئوحودا موسلمانان لەوەی دا جیگیر بوون ،وا دیارە ئەمەش بە بۆنەی ئەو نەخشە جوانەوە بوو کە رۆشنایی چاومان بۆ موسلمانەکانی کیشا ، ئەوە بوو شوینیکی چاکی بۆ سەر بازگەی موسلمانان هەلبژارد ، کە بریتیی بوو ، لە دامینی چیایی ئوحودا و ، وە دوایش کەلك لە بەرزایە کانی شاخی ئوحود دا وەرگیرا و ، خۆیان پی مەحکەم کرد و هیرشە کانی قورەیش بی کەلك دەر چوون ..**

**بەلام لەوە ئەچی هەندیك لە هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە هەوالی سەلامەتی بوونی پیغەمبەریان نەئەزانی ، پیشی ئەو کە تبوون و کشابوونەوە بۆ سەر بەرزایەکانی چیایی ئوحود ، کە بەرە بەرە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و هاوەلانی کە لە گەلی بوون دە کشانەوە سەر شاخی ئوحود ، بە ی یەکیك لەو موسلمانانەی کە پیش پیغە مبەر و هاوەلانی تری بەسەر شاخە کە کەوتبوو ، کە پیغەمبەری خوای ( صلی الله علیه وسلم ) بینی وای زانی ئەوە لە موشریکانی قورەیشە ، کە دوای موسلمانەکان کەوتوون ، بۆیە خەریك بوو پیغەمبەری رۆشنایی چاومان بکوژی بە هەلە.. !!**

ێ

بەلی ئەو موسلمانە تیری خستە کەوانەکەیەوە و نیشانەی گرتە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) خەریك بوو تیرە کە بەهاویژی بەرەو سەنگی شەریفی رۆشنایی چاومان ، خیرا پیغەمبەری خوا (َلی اللە علیە وسلم ) پی زانی ، وە زانیشی یەکیکە لە سەربازەکانی موسلمانان ، بۆیە ئاگادری کرد وە فەرمووی : (انا رسول اللە ) . وە موسلمانەکە تیرەکەی لە کەوانەکەی دەرهینا ، خۆشی و شادومانی کەوتە سەر رووەمتی ئەویش و ئەوانیش کەلە گەلیان بوون ، بە بۆنەی ئەوە و بوو ، کەسەلامەتی رۆشنایی چاومانی بۆ ساغ بوویەوە و کە گەیشتە لایان .. بەلی خۆش ترین کاتی ئەو موسلمانە ئەوە بوو کاتی کە تیرە کەی لە کەوانە کەی دەرهینا و نەی هاویشت ،کە سەرداری مرۆڤایەتی پی نەکوشت ..

بەلی موسلمانەکان بەمە گەیشتنە شوینی ئەمین و سەلامەت ، هەر کافریکیش لی یان نزیك بکەوتایە تەوە موسلمانەکان تیر بارانیان دە کردن ، چونکە سوپای جەم بووی قورەیش لە ژیر بەرزایەکانی ئوحود دا ، کۆبووبوونەوە و موسلمانەکان بەسەریان دا زال بوون ..بەلی کە موسلمانەکان لە بەرزایەکانی ئوحود دا شوینی خۆیان گرت ، کافرانی قورەیش چەند جاریك هەولیان دا هیرشیان بکەنە سەر ، بەلام ئەوە بوو بەسۆزو رەحمی خوای گەورە ئەو هەولانە هەموویان پوچەل دەر چوون ، چونکە موسلمانەکان مەردانە هیرشیان لە دژی قورەیشی یە کان کرد ، تا چاریان کردن پاشە کشە بکەن و هیوای ئەوەش ببرن نەتوانن جاریکی تر دەست لە موسلمانەکان بوەشینن .. بەلی دوا هەلمەت یان کۆتا هەلمەت کە سوپایی قورەیش ئە نجامی دا بۆ لی دانی موسلمانەکان لە بەرزایەکانی ئوحود دا ، بەلی ئەو هەلمەتە بوو کە کەتیبەیەك لە ئەسپ سوارە کانی سوپای قورەیش ، بە سەرکردایەتی و وە فەرماندەی گشتی سوپای مککە (ابو سفیان ) بوو ، وە فەرماندەی ئەسپ سوارە کان (خالید ی کوری ولید ) کردیانە سەر سوپای ئیسلام لە سەر بەرزایەکانی شاخی ئوحودا بە هیوای دەست وەشاندن لە بنکەی سەرەکی موسلمانان .

بەلی ئەم هەلمەتە تا رادەیەك لە بنکەی فەرماندەیەتیی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) نزیك کەوتەوە و ئەوە بوو پیغەمبەر (َصلی اللە علیە وسلم ) فەرمووی : (اللهم انە لاینبغی لهم ان یعلونا ) . خیرا موسلمانان بە فەرماندەیی ( عمری کوری ختاب ) دژە هیرشیکیان کردن سەر ئەسپ سوارانی (ابو سفیان ) و ( خالیدی کوری ولید ) کوشتاریان کردن هەتا ئەوە بوو تا چاریان کردن کە بکشینەوە و دابەزنەخوارە وە و ناو دۆلە کە .بەلی لەم هیرشەی قورەیش دا سی پیاویان لی کوژرا ، کە هەر سی کوژراوە کە بە دەستی تیر هاویژی بەناوبانگی ئیسلام (سعدی کوری ابی وەقاص ) سی پیاوی سوپای قورەیش کوژران ...

ئ
بەلی بە تیك شكاندنی دوا هەلمەتی (ابو سفیان ) ئیتر ئەسپ سوارانی سوپای قورەیش و دەستیان لەوە شۆرد كە جاریكی تر دەست لە سوپای ئیسلام بوەشینن ،بەلی فەرماندە كانی سوپای قورەیش گەیشتنە ئەو یەقینەی كە موسلمانەكان زۆر لەوە بەهیزترن كە ئەوان دەستیان بۆ بكەنەوە ، ئەو چەند ساتەش كە دەستیان لی وەشاندن هەلەیەكی كاتی بوو تی كەوتن و مەردانە خۆیان لەدوای ئابلوقە رزگار كرد و بە كۆبوونەوەیان لەدەوری ئازیز گەرانەتەوە دۆخی بەهیزی جارانیان ،بەلی (ابو سفیان ) هاتە سەر ئەو ئە نجامەی ناتوانی جاریكی تر دەست لە سوپای ئیسلام بەوەشینیت بۆیە ئەو بریارەی دا كە كۆتا بەجەنگ بهینی نەوەك شەوی بەسەر دا بیت ،بۆیە كۆتای بەجەنگ هینا و ،بەبی دەنگ ملی ریگای مككەی گرتەبەر كۆتایی بەجەنگ لە ناوچەی ئوحودا هینا ...

ئ

## نۆزدەهەم : شیواندنی جستەی شەهیدەکانی سوپای ئیسلام :

بەڵی لە دوای دا (ابو سفیان ) کە بریاری دا کۆتایی بە جەنگی ئوحود بەهینی ، سوپاکە ی گەراندەوە بۆ شاری مککە ، هەروەها سەر بازە موشریکە کانی (ابو سفیان ) دەستیان دایە خۆ پیچانەوە بۆ گەرانەوە بۆ شاری مککە،وە هەندیکیشیان خۆیان گەیاندە مەیدانی جەنگ و دەستیان دایە بە گەران بەدوای کوژراوە کانیان دا ، وە هەنیکیشیان لە سەر بازە موشریکە کانی (ابو سفیان ) بە رق و قین و دل پیسیی قینە لەدل ناخ بۆ گەنی نەفامی یەوە ، دەستیان دایە شیواندنی جستەیی شەهیدەکانی سوپای ئیسلام ، دەستیان بە لووت و گویی برین کرد و، وە هەل درینی سەگیان و ، دەرهینانی ناو سگیان ، بگرە برینی عەورەتی هەندیك لەو شەهیدانە ، وە لە ناو هەموو شەهیدەکان دا (حمزەی کوری عبدالمطلب ) کە سەرداری شەهیدانی ریگای خوا بوو، مامی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بوو ، خوا لی رازی بیت ، بەڵی لە هەموو کە زیاتر بەر ئەو تۆلە و لاشاوەی درانداەی قورەیش و کافرانی مککە بوو، چونکە (حمزە) لە هەموو موسلمانەکان زیاتر بەلای قورەیشەکانەوە تاوان بار تر بوو ، چونکە (حمزە ) لە رۆژی جەنگی بەدر دا لە گەل (علی کوری ابی تالیب ) برازای دا ، وە سەردارانی شاری مککە کە (عوتبەی کوری رەبیعە) و (شیبەی کوری رەبیعە)ی برای و ، (ولیدی کوری عوتبە ) و ، لە یەکەم زۆران بازی دا کوشتبوون ، وە هەموویان لە نەوەی (ئومەییەی کوری عبد الشمس ) بوون ، هەر لەبەر ئەمە بوو و کە (هیندی کچی عوتبە ) کە هاوسەری (ابو سفیان ) بوو ، لە هەموو کەس زیاتر رقی لە (حمزە ) بوو ، بەڵی ئەم ژنا دەوەری کاریگەری هەبوو لە کۆکردنەوەی سوپای قورەیش لە مککە ، بۆ هیرش کردنە سەر سوپای ئیسلام لەمەدینەدا ، هەروەها خۆشی لە گەل (ابو سفیان ) دا ئامادەی جەنگی ئوحود ببوو ، وە لەگەل ژنانی تری قورەیش دا پیاوە کانیان هاندەدا بۆ جەنگ کردن ، بەڵی (هیندی کچی عوتبە ) زانی بووی کە وا (جوبیری کوری موطعیم ) بە لینی بە (وەحشی ) بەندەی داوە کە ئەگەر (حمزە) بکوژیت ئازادی بکات، بەڵی (هیندی کچی عوتبە ) هەر جاریك بەلای ئەو بەندە حەبەشیە دا تی پەری بکردایە هاندەدا بۆ کوشتنی (حمزە ) و بەلینی پیدا بوو کەوا (حمزە ) بکوژیت خەلاتیکی پی دە بەخشیت ، بەڵی کاتیك جەنگ تەواو بوو ،(وەحشی ) هاتە لای (هیندی کچی عوتبە ) و پیی ووت : ئەگەر بکوژی باوکت بکوژمەوە چیم ئەدەییتی ؟! (هیندی کچی عوتبە ) ش ووتی : هەرچی جل و بەرگ و خشلیکم پیوەیە !! (وەحشی ) پی ووت : کە (حمزە) ی کوشتووە بە متمانەوە ، وە بە و بۆنەیەوە (هیندی کچی عوتبە ) جل و بەرگ و خشلە کەی پیدا و ، وە بەلینیشی پیدا کە گەرانەوە شاری مککە خەلاتیکی گەورە تری پیدا !! بەڵی (وەحشی ) کەوتە پیش (هندی کچی عوتبە ) و بردیە سەر لاشەکەی (حمزە) ی شەهید ی ریگای خوا ..

ئ

بەلی ( هیندی کچی عوتبە ) بەو پەری بی ویژدانیەوە درندانە سگی ( حمزە ) ی هەلدری و جگەری دەرهینا و ، بە سەیر کردنی جگەری ( حمزە ) شادو مان بوو ، هەروەها خوینیشی لەنیوان پەنچە کانیدا ئەچۆرا، وە ( هیندی کچی عوتبە ) نزری کرد بوو ، ئەگەر دەستی بگاتە ( حمزە ) و بی کوژیت لە جگەرە کەی بخوات ، بۆیە هەندی لە جگەری جوویی و هەولی دا قووتی دا بدات کەچی بۆی قووت نەدرا و دوای تفی کرد ، وە هەندیك لە سیرە نووسان ئەلین ( هیندی کچی عوتبە ) ناوسگی ( حمزە ) ی هەل دریوە و گویی و لووتی بریوە ، ئەمانەی کردووە بە بازوو بەندی دەستی ملوانکە ی ملی هەتا گەیشتۆتە شاری مککە .وە ئەو ئافرەتانەی کەلەگەل ( هیندی کچی عوتبە ) بوو بە هەما شیوەی ئەو گویی ولووتی شەهیدە کانی ئوحود یان بریوە ، بەلی با ئاوریك لە جەنگی بەدر دا بدەینەوە ، خۆ موسلمانەکان لە مەیدانی جەنگ دا کافرەکانیان کوشتبوو ، بە هەمان شیوەی مرۆڤایەتی جستە و لاشەی هیچیان نەشیواندو بەلکو مردوە کانی شیان شاردەوە لە بیرە کانی بەدر دا ، وە نەیان هیشت ببنە خۆراکی درندو باللندە ، کەچی ئەوان کافرەکان بۆ ماوەیەکی کەم زال بوون بەسەر موسلمانەکاندا ، ئابەم شیوەیە جستەی شەهیدەکانی سوپای ئیسلام یان شیواند ، بەلی ئەوە جۆرە رفتارانە هی کەسانی موشریك و بت پەرست و مونافیق و خوین ریژو دل پیس و قین لە دل ، بەرامبەر بە موسلمانە کان ، لەچ شوینك دا موسلمانی راستە قینە ئەو کارە ناشرینانەی کردووە ، بەلکو هەر پیشەی کافرو موشریك مونافیقە لە میژووی مرۆڤایەتی دا ، بگرە لە سەدە کانی رابرووددا یان لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم دا ، چەندین کاری درندانە کراوە دژ بەموسلمانان مرۆڤایەتی دا ، صەدامی خوین ریژ لە ریگای دولەتە ئەورپیە کان دا کیمایی بەسەر موسلمانانی شاری هەلەبجەی شەهیدا کرد ، ئەویش لە ریگای دولەتیکی ئەورووپایی ، کە دولەتی هۆلندای مەسیحیەت بوو ، کمیایی لەو دەولەتە وەرگرت ، هەر وەها دەولەتی ئەمریکا کە بە ناپالم لە ناکازاکی هیرۆشیما دا لە وەلاتی ژاپۆن دا، ئەمە ئاینی ئیسلام بوو یان لەژیر ئالای مەسیحیەت دا بوو ، بەلی ئیستاش وا روسیایی مەسیحیەت لە ئۆکرانیایی مەسیحیەت دەدا ، هەر هەردووکیان تاوانی جەنگ دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجام دە دن رووسیا لە سوریا شاری حەلەبی ویران کرد ، چەندین مندال و ژن و پیرو کەسی سفیلی کوشت بەساروخە کانی ،هەروەها ئۆکرانیا مەسیحیەتیش لە دولەتی شیشانی ویران کرد کوشتنی هاولاتیانی بی تاوان لە سالانی نۆهەتەکاندا هەمووی قتل وعام کرد بەناوی مەسیحیەت وە بەژداری لە جەنگی گەردەلول لە عیراق دا کرد چەندی کەس بی تاوانیان لە هاوپەیمانە کانیان کوشت بەسەرۆکایەتی ئەمریکا بوو، ئیستاش وا جیهان سووزو بەزەیی بە ئوکرانیای مەسیحیەت دا دە با ، بەلی ئەویش رابردووی هەیە دژی مرۆڤایەتی ، دە ئیستا برا هاو دینە کانیان بە هانایان بیت وەك ئەلمانیا و ئەورپایی مەسیحیەت ...

ئ
نەخیر ئەمانە هەر هەموویان یەك سیفات و یەك رفتاریان هەیە دژبە مرۆڤایەتی ، لافی مافی مرۆڤایەتی لی دە دەن کەچی هەر بە خۆیان خوین مژن درندن دژبەمرۆڤ ، تەنها لە پیناوی بازرگانی کردن چەك و تۆپ کەسەری چەنگی بەمرۆڤایەتی دا ساغ دە کەنەوە لە پیناوی قازانج کردن مرۆڤ دە کوژن قتل و عامی مرۆڤایەتی دە کەن ، بە شیعار و پروپاگەندە کانی شیان دەی خەنە سەر ملی ئیسلام ، کە ئەمەرەوای مرۆڤی عاقل دە بیت بزانی کی تاوانی جەنگی دەکات ؟! لە هەر وەلاتیکی ئیسلام دا عامیل کەسانی نۆکەری خۆیان هەیە کار بۆ جوولە کەی مەسیحیەت دەکات ، بنکەی موساد لە هەموو وەلاتیکی جیهانی ئیسلام دا هەیە ، ئەم دەزگایەی موساد ی جوولەکە بەس بۆ فتنە نانەوا لەنیوان وەلاتانی موسلمانان دا دروست بووە ، ئیستا لە کوردستانی خۆمانبە قسەی ئیران ئەلین هەیە بۆ یە ساروخ رژیی کرد لە مالیکی هاولاتی کوردستانی دا لە سالی ٢٠٢٢ دا ، ئەم بنکەی تەنها بۆ ئەمە دروست کرایە ویرانی وەلاتان بکات بۆ بەرژەوەندی سەهیۆنیەتی جوولە کە دا ، بەلی ئەوەی دەست بە ئیسلام مە راستە قینەکەدا بگریت هەرگیر فیرو ناخوات بە دەست رۆژئاواو وەلاتانی ئەوروپا و ئەمریکا و مەسحیەت و جوولە کەدا ، بەلام لە ناو وەلاتانی ئیسلام بە وەلاتە عەربیە کانیشەوە هەر هەمووی نۆکەرایەتی ئەوانەدە کە بۆیە خەلکی بیزارە و برسیە و بی جارەیە لەدەستیاندا ، ئیستا جەنگی روسیاو ئۆکرانیایە خەلکانیکی موسلمان پەشت گیریان لیدە کەن یان لەروسیا یان لە ئۆکرانیا دا ، کە ئەمە رەوایە خۆ هەر دوو دەولەت لە ژیر ئالای مەسیحیەت دا جەنگ دە کەن ، بەلی ئیستا جیهانی ئیسلامی بەسەر دووبەرە دا دابەش بوون ، بەرەی رۆژهەلاتی مەسیحیەت و بت پەرست ،بەرەی رۆژئاوایی جوولە کە و مەسیحیەت دا ،ئەوانەی لە گەل رووسایی و چینن ئەوا بەرەی شیعەو صوفیگەرین وە ك دەولەتی شیشان ، وە ئەوانەی لە گەل ئەورپاو ئەمریکان ئەوانەش بەرەی سوونەن کەزۆربەیان موناڤیقن و دوورن کە میکیان نەبیت لەسەر فرقە ناجیەن ،کە سعوودیا وەك دەولەت و دەسەلات لە گەل ئەورپاو ئەمریکا دایە نەك وەك خەلکی موسلمانی راست قینە، یان دورگەی عەربی وە امارت و قتر و بەحیرین و دەلەتانی تردا ئەوانەی لە گەل رۆژئاوا نین موسلمانی راستە قینەن دولەتەکەیان ویران کراوە ، پرە لە ئاژاوە جەنگ کوشتن و برین برسیەتی هەژاری دا ، ئیستاش وایان لەخەلکی موسلمان کردووە کە وەلاتەکەیان بەجی بهیلن رووبکەن وەلاتی ئەوان ، چونکە لە هیچ وەلاتیکی ئیسلامی مانای ژیانیا نەهیشتووە هیچ درفەتیك بۆ ژیان نەمایەتەوە،ئا ئەمە سیاسەتی برسی کردنی مەسیحیەت و جوولە کەو دووروو موناڤیقانە لەم وەلاتانەدا ، ئەوانەی لە گەل ئەوان دا ، هەموو بەرنامەو سیاسەتیکی ئەوان پەیرەو دەکەن بی کەم کوری چونکە نۆ کەریانن ، ئەوانە کەلە وەلاتانی موسلماناندا جاسووسی رۆژئاوا ئەورپاو ئەمەریکان ،کار بۆ ئەوان دە کەن بۆیە زولم ستەمان یەکجار زۆر ئەوەندە درندە بە مژینی خوینی خەلکی موسلمان وەك ئاژەلیان لی ها تووە

ئ
نەگویی دە گرن نەدەبیست ،نەدەبینن ، وا خەلك دەمریت لەبرساندا ، تەنها بیر لە خۆیان مال منداڵیان و هاوپە یمانەمەسیحیەکان و جوولە کەکانی خۆیان دە کەنەوە ، کەی ئەمە رەوایە مەلتیك بمریت لەبرسان ولە هەژاری دا بیت ،وە ك درندە و خوین مژ بەربینە گیانی ئەو خەلکە؟! بەلی میژووی کورد لەم سەردەمەدا بە قیزەونترین میژوو دەسەهەلاتی کوردی دادەنریت بەدرندە ترین میژووی خوین مژی مرۆڤایەتی دادەنریت چونکە باکیان بەهیچ نیە لە پیناوی بەر ژەوەندی خۆیان ، خوا نەکات دەولەتی کوردی دا بمەزریت ، ئەوکات دەبمەنە درندەی جیهان ،خۆ ئیستا دولەتە نیە وادەکەن تەنها دووبنەماڵەن ئەی قوربەسەرمان دولەت دورست بیت چی لە گیانی خەلك دەکەن ،هەرگیز نابیت کورد خاون دەسەهەلات بیت چونکە ، لە ماوەی (٣١) سالی رابردوودا هەر زولم ستەمی لە خەلکی خۆی کردووە ،بەرانبەر بە بیگانەش نۆکەرایەتی کردووە ، جاسوس و یارەمەتی دەری دوژمنی کورد بووە ، با پیمان بەلین جیان کردووە بۆ ئەو مەلەتە قوربەسەر لەلایەك عەرب دژایەتی دە کات و لە لایەك فارس لەلایەکی ترەو تورك لە هەر چوارپارچەکی کوردستان دا ، بەلی بی گومان سەرتاپەی میژووی کورد بە خیانەت نۆکەرایەتی دوژمنانی کورد نوسراوە تەوە ، لەوەتەی لە تەمەنی خۆم دا بینوومە هیچ کاتیك و لە هیچ روودا ویکدا کە بەسەر خەلکی کوردستاندا هاتبیت دەستی خۆمانی تیدا نەبیت یان خیانەتی خۆمانی تیدا نەبیت ، جا سەیرە کە ئەوەیە دەیخەن سەر ملی ئیسلام ،چونکە موونافیق و غیرون نەك خۆری چونکە خۆریاتیان پی ناکریت مەبەستم دەسەلاتەکوردیە کەی ئەم سەردمەیە ، دەی خەنە ملی ئیسلام هەر ئەلین ئیسلام وا و ئیسلام وا ،ئەمانە موونافیق خیانەتیان لە ئیسلامیش کردووە ،کە ئەمانە هاتن دەسەهلاتیان وەرگرت و لە پیناوی بەرژەوەندی خۆیان رازی کردنی جوولەکە مەسیحیە ت ئەوروپاو ئەمریکا دا ، هاتن دژایەتی دینی ئیسلامیان ، چونکە هەند ترسنۆك بوون و هەند بیگانە پەرست بوون ،و خیانەت کار بوون لە گەل ئیسلام و خۆاياندا ، کەوتنە تانەو تەشەنەلە ئاینی ئیسلام دا ، هاتن بە داخسنی مەزگەوتەکان و زیندانی کردنی پەیرەوانی ئاینی ئیسلام و، هەروەها گرتنی ماموستایانی ئاینی زیندانی کردنیان ، ریش سووتاندنی ماموستایانی ئاینی ئیسلام ، بۆ رەزامەند بوونی هاوپە یمانیە کانیادا ، کەی ئەم زولم وستە راوایە ؟! پیم نالین (خوای گەورە ) چۆن سەرتان دەخات ؟! چۆن رزگارتان دەبیت لە عەزابی خوای گەورەدا ،هەرچی تاوانی کوشتن و برین زیندانی کردن بوو ئیوە ئە نجامتان دا بەرانبەر بە گەلە کەتان دا ، نازانم سەرکردە کانی کورد چۆن روویان دی بەرانبەر بە (خوای گەورە ) ئەوەند زولمەیان ئە نجاداوە ،بەلی ئەوانە خۆشی و چەژنەکانیشان زولم ستە بەسەر خەلکی کوردستاندا ، لەژیر ناوی کوردایەتی هەرچی تاوانە ئە نجامی دەدن ،دژ بەئیسلام و خەلکی کوردستان ...

ئ
بەلی میلەتیك لە ژیر دەست هەلاتی ئەمانە دا دەژی تەنها خوای گەورە پشت پەنایەتی ، خودایە دوعا کان مان لی قبول بکە ، زولم ستەمی ئەم زالمانە قبول مکە بەسزایی خۆیانیان بگەیەنە ، خوادیە ئەم دەسەهەلاتە نەگەینە سالیکی تر کە ئەمرۆ سالی ٢٠٢٢ /٢١/٣/ تاکو سالی ٢٠٢٣ /٢١/٣/ تەخت تجیان ویرانکە ی خودایە دەربەدرەو ئاوەرەیانکە کە ئەو خەلکەیان دەر بەدەر کرد ، خودایە تۆلە یان لی بکەیتەوە ، وەك ( فیرعەون ، هامان و قارون ، ابو لهب ، ابو جهل ، هیتلەر و ، نلین و ،مارکس و، صدام حسن ، محمد قزافی ، ئەوانی تر خودیە بەدەردی ئەوانەبچم چونکە زۆر ستەمکارن خەلك بەدەستیان وادەنالینی ، خوایە کەسانیك راست گۆ موسلمانی راستە قینە بینە شونیان ،خودایە وەك ئەمەنانەبەدەستی خەلك سزا بدرین بۆخاتی گەورەی خۆت ، انشا الله ...

ئ

## بیستەهەم : شانازی کردنی ( ابو سفیان ) دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود :

بەڵی دوای ئەوەی سوپای قورەیش جستەی شەهیدە کانی سوپای ئیسلامیان شیواند و ، زانی یان لە هەردوو لاد کی کوژراوە ، وە ( ابو سفیان ) کە فەرماندەی گشتی سوپای قورەیش بوو ، فەرمانی دا بە سوپای ملهوری قورەیش کە بگەرینەوە شاری مککە کۆتایی بەجەنگ بهینن .

بەلام بەر لەوەی ( ابو سفیان ) بە سوپاکەی بگەریتەوە شاری مککە، بە سواری ئەسپەکەی سەر کەوتە کیویك لە کیەوەکانی ئوحودا ، کە نزیك بۆوە لە موسلمانەکانی سە کیوی ئوحود دا ، بە لام بەچی شیوە یەك بوو ، بەڵی ( ابو سفیان ) بەشیوەی لووت بەرزی و فیز دەمارە وە خۆی بەزل دەزانی کە وا بۆ ماوەیە کی زۆر کەم جەنگە کەی بردۆتەوە لە موسلمانەکان ،بەلی کاتی چووە سەر کیوە کەوە بە هەموو دەنگی هاواری کرد و قیراندی ، بە خۆی ئەووت : دەستت خۆشبیت ،لە پاشان دا رووی لە موسلمانەکانی سەر کیوەکە کرد ووتی : ئایا محمد لە ناو ئەم خەلکە دایە ؟! پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) فەرمووی : ( لا تجیبوه ) واتە : وەلامی مەدەنەوە . هەروەها ( ابو سفیان ) پرسی : ئایا ( کوری ابو قوحافە ) لە ناو خەلکەکە دایە ؟!

هەروەها ووتی : ئایا ( کوری خطاب ) لە ناو ئەو خەلکە دایە ؟! هەموو جاریك پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) دەی فەرموو : وەلامی مەدەنەوە .

( ابو سفیان ) ووتی : ئەوانە کوژراون ، چونکە ئەگەر زیندوو بوونایە وەلامیان ئە دایە وە ، ئیتر ( عمری کوری خطاب ) خۆی پی نەگیراو فەرمووی : دە بە خوا درۆت کرد ئەی دووژمنی خوا، ئەوانەی کە تۆ ناوت هینان زیندوون ، ئەوانەش کە تۆ پیت نا خۆشە ماون ،هەروەها ( ابو سفیان ) ووتی : ئەم رۆژە بەرۆژی بەدر جەنگیش بە نۆرەیە .

( عمری کوری خطاب ) فەرمووی : وەك یەك نین ، چونکە کوژراوەکانی ئیمە لە بەهەشت دان ، وە کوژراوەکانی ئیوەش لە ناو ئاگردان .

هەروەها ( ابو سفیان ) ووتی : لە ناو کوژراوەکانتان دا هەندیك ئەبینن کە جەستەیان شیواوە ،من نەفەرمانم بەوە داوە ،نە پیشم خۆشە !!

ێ
پاشان ( ابو سفيان ) دەنگی بەرزکرد ووتی : ( أعل هبل ،أعل هبل ) واته : یا بەرزو بلند بی هۆبل .. یان هۆبل دینەکەت سەرخە .

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( أجیبوه ) واته : وەلامی بدەنەوە . ئەوانیش ووتیان : چی پی بلین ؟! فەرمووی : (( قولوا : الله على وأجل )) واته : خوا بەرزو مەزن ترە ..

هەروەها ( ابو سفيان ) ووتی : ئیمە عوززامان هەیە و ، ئیوە عوززاتان نیه !!

پیغەمبەر ( صلى الله عليەوسلم ) فەرمووی : (( قولوا : الله مولانا ولا مولى لكم )) واته : بیلن ئیمە : زاتی ( الله ) كۆمەك پیشتوا نمانە و ، ئیوە كۆمەك پیشتیوانتان نیه !!

لە پاشان ( ابو سفيان ) ووتی : سالیكی تر لە بەدر دا بەلینی نیوا نمان بیت .

پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەیەكیك لە هاوەلانی فەرموو : ( قل : نعم هو بيننا وبينك موعد )) واته : بلی : باشە با بەلینی نیوا نمان بیت .

لە ریوایەتیکی تردا وا هاتووە کە کاتی ( ابو سفيان ) دەنگی ( عمری کوری خطاب ) بیست دوای لی کرد یەك ببینن و ووتی : عمر وەرە بۆ لام ، کە پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) زانی ( ابو سفيان ) پی خۆشە ( عمر ) ببینی ، فەرماندی دا بروا لی نزیك بیتەوە بزانی چی دە لیت ! هەرچەندە لە حالەتی جەنگ دابوو ( عمر ) لی چووە پیشەوە .

( ابو سفيان ) لە( عمری ) پرسی : سویندت بە خوا ئەدەم ، ئایا ئیمە محمدمان کوشتووە ؟!

عمریش فەرمووی : نەخیر . ئیستا وا گویی لە قسە کانتە . ( ابو سفيان ) بە عمری ووت :بەلامەوە تر راستگۆترو چاك تری لە ( کوری قومیئە ) .

( کوری قومیئە ) ئەو کەسە بوو کەووتی : محمد کشتووە ، کەچی ( موصعەبی کوری عومەیرە ) شەهید کرد بوو ، وای زانی پیغەمبەری خوایە ( صلى الله عليه وسلم ) .چونکە لەیەك ئەچوون ، بەتایبەتی بە جلی جەنگی ، بۆیە وای بلاو کردبووە وە کە پیغەمبەری ( صلى الله عليه وسلم ) کوشتووە ...

ئ

بەلی کە بەلین درا بۆ سالیکی تر وە لەبەدر دا بەیەك بگەن ، خیر (ابو سفیان ) لەسەر کیوەکە دابەزی و بەسوپاکەیەوە هەر ئەو ئیوارەی رۆژی جەنگی ئوحود بەرەو شاری مککە کەوتە ری ، وە کۆتای بە تاقی کردنەوەیە کی سەختی موسلمانەکان هات ، کە پاك و پیسی تیدا جیاکرانەوە، چونکە کۆمەلەی ئیماندار هەتا بە چاکی تاقی نەکریتەوە ،نابیتە جی متمانەی پەروەردگای خۆی ، وە نابیتە کەسیکی دامەزراو بە استقامە ئیمانداری (خوای گەورە ) ئەوە تا قورئانی پیرۆز دە فەرموویت : ﴿مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ ال عمران ١٧٩ .اخرجه : التبرانى فى الكبير (١٠٧٣١)،احمد(٢٦٠٩)، البخارى(٤٠٤٣)،البيهقى : فى الدلائل ٢٩٦/٣،البيهقى فى الدلائل٢١٥/٣،ابن هشام فى السير ٥٠/٣ .

ئ

## بیست ویەکەمین : گەرانەوەی سوپایی قورەیشی کافرو موشریك :

بەلی سوپایی قەرەیشی کافرو موشریك گەرانەوە بەرەو شاری مککە ، بەلی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کۆمەلیك لە هاوەلانی نارد بەدوایان دا بۆ چاودیری کردنی سوپایی قورەیشی موشریك ، وە ترساندی سوپای قورەیش تا وەکو بیر لە گەرانەوە نەکەنەوە بۆ پەلاماردانی شاری مەدین.

لە ( عائیشە ) و ە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( دوای ئەو کارەساتەی کە پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) لە گەل هاوەلانی توشی هاتن لە جەنگی ئوحود دا ،وە سوپای موشریکان گەرانەوە ، پیغەمبەر ﷺ بیرە لە وە کردەوە کەوا نەك سوپای قورەیش بگەریتەوە بۆ پەلاماردانی شاری مەدینە ، بۆیە بە هاوەلانی فەرمووی : ( من يذهب في أثرهم ) واتە : کی بەدوا یان دا دەروات ؟!

( ۷۰ ) پیاو لە هاوەلانی کە ( ابو بکر ) ( زوبیر ) یان لە ناو دا بوو ، ئامادەی خۆیان نیشان دا بۆ ئەو کارەو پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوانی نارد بەدوای سوپای موشریکەکان دا رۆیشتن ).اخرجه :البخاری ( ٤٠٧٧ ). ( موسى کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – لە ( عوروەی کوری زوبیرە وە ) دەگیریتەوە وردە کاری پاشەکشەی سوپای موشریکەکان وە ، دواتریش ناردنی ( سعد ) بە شوینیان دا روون دەکاتەوە دەفەرموویت : ( موشریکەکان کە زانیان پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) زیندووە ، وە هاواریان لە هەندی لە هەندی گەورەو پیاوانی هاوەلانی کردو زانیان ئەوانیش هەر زیندوون ، ئەو کات خوا بی هیوای کردن و گەرانەوە بۆ لای شوینی چادرە کانیان ، و موسلمانان نەیاندەزانی کە موشریکە کان بەرەو کی دەچن ، بۆیە پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( ئەگەر ئەوانتان بینی سواری پشتی ئەسپەکانیان بوون و ، ووشترە کانیان بە دوای خۆیان دا راکیشا ، ئەوە دەیانەویت نزیك ببنەوە لە خانوو قەلاکانی شاری مەدینە کە ژن و مندالە کانیان تیدایە ، سویند بەخوا گەر بەو کارە هەستن بەشەر دیم لە گەلیاندا لەشاری مەدینەدا ، وە ئەگەر ئەوان سواری پشتی ووشترە کانیان بوون ، ئەسپە کانیان بەدوای خۆیاندا رادەکیشا ، ئەوە دەیانەویت راکەن و دەرباز بن ) سوپای موشریکە کان کە پشتیان کردە موسلمانان و بەری کەوتن و گەرانەوە ، پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ( سعدی کوری ابی وەقاصی ) نارد بەشوینیان دا و فەرمووی : ( هەوالی ئەوا نمان بۆ بزانە ) ( سعد ) خیر بە دوایاندا رۆیشتووە هەوالی زانین و پاشان گەرایەوە ووتی : ئەوانم بینی سواری پشتی ووشترەکانیان بوو بوون و دەرۆیشتن ، ئەسپە کانیشیان بەدوای خۆیان دا رادە کیشا ، ئەو جا موسلمانان دلیان خۆش بوو بەرۆیشتنی دوژمن ).

اخرجه : البیهقی فی الدلائل ۳/۲۱۳ .

ئ

بەلی پاشان پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نویژی نیوەرۆی بۆ کردن بەدانیشتنەوە ، چونکە بەهۆی بریندار بوونی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە موسلمانەکانیش هەر هەموویان بەدانیشتنەوە لە دوای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نویژیا کرد ).ابن هشام فی السیر ٣/٤٣ برقم ( ٦٢٤ ).

بەلی لە پاش تەواو بوونی جەنگە کە ژنانی ناو شاری مەدینە ، خواردن و نان و ئاویان بۆ پیغەمبەر ﷺ و هاوەلانی هینا ،لە ژنانی کۆچ کەران و ئەنصارە کان دا خواردن و نان و ئاویان دە هینا هەروەها ( فاطیمە ی کچی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ) لە ناو دابوو .

هەروەها ( عمری کوری ختاب ) دەفەرموویت : ( ام سولەیت یەکیك بوو لەو ئافرە تانەی کە گورزی پر ئاوی بەشان بۆ دەهینایین لە رۆژ ئوحود دا .وە ( وە حەمنەی کچی جەحش ) ئاوی دەدایە بریندارە کان تیماری بریندارە کانی دە کرد . هەروەها لە ( ئەنسی کوری مالیك )وە – خوا لی رازی بیت – دەفەر موویت : ( بینم عائیشەی کچی ابو بکر و ام سولەیت .. گۆزەی ئاویان پر دەکردەوە دەیان هینا دەیان دا بە هاوەلانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) وە ( فاطیمە ی کچی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە ناو ئەو ژنانەدا بوو ، و هات و بینی دەم چاوی باوکی خویناوی یەو خوینەکەی بۆ سری. هەروەها ( موسی کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( فاطیمە ) لە ناو ئەو ژنانەدا بوو ، کاتیك باوکی بەو هەموو خوینەوە بینی باوشی پیدا کرد و دەستی کردە ملی و خوینەکەی بە روخساری یەوە دە سری ، و پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەی فەرموو : ( اشدت غضب علی قوم ذموا وجه رسول الله ، واشتدغضب الله علی رجل قتله رسول الله ( ﷺ ) واتە :توورەی خوا توند تر بووە لەسەر کەسانیك کە رۆخساری پیغەمبەرە کەیان خویناوی کردوە ، وە تووەیی خوا توند تر بووە لەسەر پیاویك کە بەدەستی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کوژرابی ). اخرجه : البخاری ( ٤٠٧١ ) ، البیهقی فی الدلائل ٣/٢١٤ ،البخاری ( ٣٨١١ ).

وەلە لەم ( ٣ ) فەرموودەی تریشەوە هاتووە :

بروانە :اخرجه : التبرانی فی المعجم الکبیر ( ٥٨٢٣ ) ،البخاری ( ٤٠٧٥ ) ،احمد٣/١٦٥، البخاری ( ٤٠٧٦ ).

ئ

## بیست دووه مین : بەسەر کردنەوەی شەهید وبریندارەکان :

بەلی دوای ئەوەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دلنیا بۆوە لەوەی کە سوپای قورەیش نیازی نیە پەلاماری شاری مەدینە بدا ، بەنیازی پاشەکشە یە بگەریتەوە بۆ شاری مککە ، بەلی لەو کاتەدا کەوتە هەولی ئەوەی کە بزانی کی بریندار بوو ە یان شەهید بووە یان وون بووە ، واتە گەران بە دوای هاوەلانی خۆی سەرو سۆراخیان بزانیت لە سەلامتیان بپرسیت ، بەلی لەسەر کیوی ئوحودا بە خۆی هاوەلانی دا بەزینە خوارە بۆ مەیدانی جەنگە کە ، تاکو بەشیوەیەکی ریك پیك بریندارە کان تیمار بکرین و شەهیدەکانی جەنگی ئوحود زۆر بە جوانی بنیشرین هەروەها فریایی بریندارو زامدارە کان بکەون زامەکانیان تیمار بکەن ،بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەتایبەتی ( محمد ی کوری مسلمەی ) نارد تاکو هەوالی ( سعدی کوری ربیعە ) بزانی ، کە یەکیك بوو لە فەرماندە بەناوبانگە کانی سوپای ئیسلام وە لە ئەنصاریە کان بوو ، ناردی تا بزانی زیندووە یان شوهید بووە ، کە ( محمدی کوری مسلمە ) لە ناو مەدیانی جەنگ دە سورایەوە و بەدوای ( سعدی کوری رەبیعە ) دا دە گەرا بینی وا ( سعد ) لە خوینی خۆی گەوزا بوو ، خوینی زۆری لی ئەرۆیشت و ، وە لە دوا ساتەکانی ژیانی دا بوو ، دانیشت لە سەری دا هەوالی پی دا کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەتایبەتی بۆ لای ئەوی ناردوە بۆ هەوال پرسینی بزانی ئەو زیندووە یان شەهید بووە ، بەلی ( سعد ) بە دەنگی کی نزمەوە ، بە ( محمدی کوری مسلمە ) ی ووت :تازە ئەمن لە دەست چووم ، بە بۆنەی زامە سەختەکەیەوە جاریکی تر هەلناسیتەوە ،بەلی ( سعدی کوری رەبیعە ) لە م هەست ناسکەی دا بوو ، بیری لە لای ژن مندالە کانی نە بوو ، بەلکو خەمی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بوو ، وە خەمی بوو ، ئەگەر هەندیك کەس شەهید بن ، پیغەمبەری خوا وەك جاران خزمەت نەکری ، ئەوە بوو ، بەر لەوەی کە گیانی پاکی بسپیریت بەرەو بەهەشتی خوا بکەویتە ری ،نامەیەکی بە ( محمد یە کوری مسلمە ) دوو نامەی نار د یەکەمیان بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دووەمیان بۆ ئەنصارە خزمە کانی دا ،لە نامەی یەکەم دا ووتی : سەلامم بنیرە بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علی وسلم ) بلی : ( سعیدی کوری ربیعە ) ئەلیت : بە چاکترین شیوە خوای گەورە پاداشتی پیغەمبەریك لە ئوممەتەکەیەوە بداتەوە ، وەهاش لە ئیمە پاداشتی تۆ دباتەوە ، وە لەنامەی دووەم ووتی : سەلامیش بە خزمەکانت واتە : ئەنصار بگەینە و پییان بلی :سعدی کوری رەبیعە بیتان ئەلی : هەتا ئاو لە چاوتان دا بی ، ئەگەر زیانیك بە پیغەمبەرەکەتان ( صلی الله علیه وسلم ) بگات ، ئیوە هیچ بیانوویەکتان نابی ، بەلی ئەوەندە ی پی نەچوو گیانی پاکی دەرچوو ،وە ( محمدی کوری مسلمە ش ) دیتەوە لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەوالە کەی ئەدا تی.ابن هشام فی السیر ٣/٥٢ .

ێ

بەلی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تێپەری بەلای (عمری کوری جەموح) لاقی شەل و بینی بە شەهیدی وا لاشە کەی کەوتووە فەرمووی : (كأني أنظر إليك تمشي برجلك هذه صحيحة في الجنة) واتە: لەبەر چاومی وا تەماشات دەکەم بەم لاقەت بە ساغی دەرۆیت بە ناو بەهەشتدا ) اخرجه : احمد(٢٢٥٥٣).

هەروەها پیەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) تپەری بەلای لاشەی (موصعەبی کوری عومەیرە ) بە شەهید کراوی ، وە (ابو هورەیرە ) دەفەرموویت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە کاتی گەرانەوەی لە ئوحودا تپەری بەلای (موصعەبی کوری عومەیرە ) کە شەهید کرا بوو، لەسەر ریگەکەی وەستا لەسەری ، وە دوعای بۆ کرد و پاشان ئەم ئایەتەی خویندەوە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا﴾ الاحزاب ٢٣ .

البدايه والنهايه ابن كثير ٤/٤٥ ، البيهقي في الدلائل ٣/٢٨٤

هەروەها پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) چووە بەلای لاشەی (حمزەی ) دا ، کوژار بوو وە هەردوو گوی برا بوو وەلاشەکی شیونیرا بوو ، (ئەنسی کوری ماليك ) دەفەرموویت : (پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە جەنگی ئوحود دا ، تێپەری بەلای لاشەی ( حمزە )ی مامی دا و بینی هەر دوو گویی برا بوو ، وە لاشە کەی شیونرا بوو ، فەرمووی : (لو لا أن تجد صفية في نفسها لتركته حتى تأكله العافية و حتى يحشره الله من بطون الطير والسباع ) واتە :گەر لە بەر ئەوە نەبیت کەصەفیە واتە: خوشکەکەی نارەحەت دەبیت ، ئەوا لی دە گەرام تا بالندە و درندە کان جەستەیان دە خوارد و تا خوای گەورە کوی دەکردەوە لە ناو سکی بالندە و درندەکان ). اخرجه : التبرانى فى الكبير ٣/١٤٤ ، ابو داود (٣١٣٦) .

هەروەها لە (زوبیرە ) وە ریوایەتی کردووە — خوا لی رازی بیت — دەفەرموویت : ( لەدوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود دا ،ئافرە تیك بەراکردن هات تا نزیك بووە بچیتە سەر شەهیدە کان پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) پی باش نەبوو کە چاوی پیبیان بکەویت بۆیە فەرمووی : ( ئەوئافرەت ، ئەو ئافرە تە ) ( زوبیر ) دەفەرموویت : هەر لە دوورە وە ناسیمەوە کە ئەو ئافرەتە (صفیەی دایکمە ) خیر پی گەیشتم پیش ئەوە ی بگاتە سەر شەهیدە کان ، وە پیشم لی گرت بەلام ئافەرتیکی زۆر بەهیز بوو بە دەستی یەك چە پۆکی دا بەسر سنگا و پی ووتم دوور کەروەوە لیم هەی زەوی نەت گریتە خۆ ، منیش پیم ووت : پیغەمبەر (صل الله عليه وسلم ) ئەمەی لی دوا کردوویت ، ئینجا وەستا دوو پۆشاکی دەرهینا ووتی : هەوالی کوژرانی (حمزە ) برام پی گەیشتووە و ئەم دوو پۆشاکەم هیناوە تا بیکەنە (کفن ) بۆی )

اخرجه : احمد فى المسند (١٤١٨) ، البيهقى ى الكبرى ٣/٤٠١ .

ئ

بەلی ئەنصاریەکان بریاریان دا کە تۆلەی شەهیدەکانیا بکەنەوە ، چونکە سووکایەتیان پی کردبوون جستەیان شیواندرا بوو ، ( ابو بکری کوری کەعب ) دەفەرموویت : ( لە جەنگی ئوحود دا ، ( ٦٤ ) کەس لە ئەنصارە کان دا وە ( ٦ ) کەس لە کۆچ کەران وە ( حمزە ) یان لە ناو دا بوو شەهید ببوون ، وە سووکایەتی بە جستە یان کرا بوو ، بۆیە ئەنصارە کان بریاریاندا گەر بکەونە ژیر دەستمان تۆ لەی ئەمانەیان لی دە کینەوە ، کاتیک رۆژی ئازاد کردنی مککە یان فتحی مککە هاتە پیش ئەم ئایەتە دابە زی کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ﴾ **النحل** ١٢٦ .

وە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( نصبر ولا نعاقب ) واتە : ئارم دە گرین تۆ لە یان لی ناکەینەوە ) . اخرجە : احمد ١٣٥/٥ . وە پاشان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( کفوا عن القوم الا اربعة ) . واتە : لە هەموویان گەرین تەنها چوار کەسیان نەبیت ) . اخرجە : احمد ( ٢١٢٣٠ ) .

هەروەها پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) مژدەی دا کە ( حنظلە و حمزە ) فریشتە کان دەیشۆن و پۆسیار لە هاوسەرەکەی بکەن ، هاوسەرەکەشی ووتی : ( حنظلە ) لەشی پیس بوو ، هەر گویی لە خۆ ئامادە کردن بوو بۆ جەنگ چووە دەرەوە خۆی نەشۆرد پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( لە بەر ئەوە بووە کە فریشتە دە یشۆن ) . اخرجە : الحاکم ٢٠٤/٣ .هەروەها پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) مژدەی دایە ( جابر ) کە باوکی ناوی ( عبدالله ) بوو ، دوای شەهید بوونی فریشتە کان بە بالیان سیبەریان بەسەرەوە کردووە ، لە ( جابرە ) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( لاشەی باوکمیان هینا بۆ لای پیغەمبەر ﷺ لە بەر دەستی دانرا ، بە پۆشاکیك دا پۆشرا بوو ، چوون تا کو پۆ شاکە کە لەسەر دەم چاوی لا ببەم ،خزمە کانم ریگریان لی کردم و ئینجا دەنگی گریانیك هات ووترا ، ئەوە ( کچەی عمرە یان خوشکەکەی عمرە ) واتە : پوری ( جابر ) پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ، ( لم تبکی ... اولا تبکی مازالت الملائکة تظلە بأجنتها حتی رفع ) واتە : بۆ دە گریت ، مەگیریی بەردەوام فریشتە سیبەریان بۆ دە کرد بە بالە کانیان تا بەرز کرایەوە ، وە لەریوایەتیکی تردا ( جابر ) دەفەرموویت : ( باوکم شەهید بوو لە جەنگی ئوحود دا ، پۆشاکە کەم بەسەر رووی لادا ئە گریام ، هاوەلانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دوا یان لی دەکردم وانەکەم ، بەلام پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هیچی نە ووت : وە پورم زۆر بۆی دە گریا ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( تبکیە اولا تبکیە مازالت الملائکة تظلە بأجنحتها حتی رفعتموە ) واتە : بۆی بگریت یان نەگریت بەردەوام فریشتەکان بە بالەکانیان سیبەریان بەسەروە دە کرد تا بەرز بەرزیان کردەوە )اخرجە : البخاری ( ١٢٤٤، ٢٨١٦ )، ومسلم ( ٢٤٧١ )، احمد ٢٩٨/٣ ، وانسائی ١٣/٤

.

ئ

## بیست سی یەهەم : ناشتنی شەهیدەکانی جەنگی ئوحود :

بەلی بەم جۆرە جەنگی ئوحود کۆتایی هات ، بە شەهید بوون و بریندار بوونی ژمارەیەکی زۆر لە هاوەلانی پیغه مبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ، جەندین بۆ چوون هەیە دەربارەی ژمارەی شەهیدە کانی جەنگی ئوحود .

لە ( عوروەی کوری زوبیر ) وە – خوا لی رازی بیت - دەفەرموویت : شەهیدەکانی ئوحود ( ٤٤ ) کە س بوون .

لە( موسی کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : شەهیدەکانی ئوحود ( ٤٩ ) کەس بوون .

اخرجه : البيهقى فى الدلائل النبوه ٣/٢٧٩ .

لە ( ابن اسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( تیکرای شەهیدەکانی موسلمانان لە رۆژی ئوحود دا ( ٦٥ ) کە س بوون ) . ابن هشام فى السير ٣/٨٣ .

لە ( براء) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت ( ووتەی راست ترو بەهیز تر ئەوەی کە ژمارەی شەهیدەکان ( ٧٠ ) پیاو بوون ) . اخرجه : البخارى ( ٤٠٧٨ ).

لە ( ئەنسی کوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( موسلمانەکان لە جەنگی ئوحود دا ( ٧٠ ) یان لی کوژرا وە لە ( بئر المعون ) وە لە جەنگی ( اليمامه ) ش ( ٧٠ ) لی کوژرا ) اخرجه : البخارى ( ٤٠٧٨ ).

لە ( ئوبەی کوری کەعب )یش –خوا لی رازی بیت – دەفەرمووی : لە جەنگی ئوحود دا ( ٦٤ ) پیاو لە ئەنصار کوژراو ( ٦ ) پیاو لە کۆچ کەران کوژرا ). اخرجه : احمد ( ٢١٢٣٠ ).

وەژمارەی موشریکەکانیش سی بۆچوون هەیە :

لە ( ابن اسحاق ) – خوا لی رازی بیت - دەفەر موویت : ( لە جەنگی ئوحود دا ( ٢٢ ) پیاو یان لی کوژرا ).

ابن هشام فى السير ٣/٨٥.

لە( عوروەی کوری زوبیر )-خوا لی رازی بیت- دەفەرموویت : ( موشریکە کان (١٩) پیاویان لی کوژرا ).

البيهقى فى الدلائل النبوه ٣/٢٧٨ .

لە ( موسی کوری عوقبە ) –خوا لی رازی بیت- دەفەرموویت : ( موشریکەکان ( ١٦ ) پیاویان لی کوژرا ).

البيهقى فى الدلائل النبوه ٣/٢٧٨ .

ئ

هەروەها چۆنیەتی ناشتنیان بەو جۆە بوو کە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی دا شەهیدەکان لە گۆرەپانی جەنگەکە بنیژرین و تەرمەکانیان نەبرینەوە بۆ شاری مەدینە .

لە( جابر ) وە – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( هەندیك لە تەرمی شەهیدەکان گۆزرانەوە بۆ شاری مەدینە ، بەلام پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی دا کە تەرمی کوژراوە کان بهینرینەوە لە جی شەهید بوونیان دا بنیژرین ). اخرجه : ابو داود ( ٣١٦٥ ) ، والنسائى ( ٢٨٤/١ ) ، الترمزى ( ١٧١٧ ).

وە لە ریوایەتیکی تردا ( جابر ) دەفەرموویت : ( من لە شاری مەدینە بووم ، کاتیك کورە پورەکەم تەرمی باوکم و خالم ی بەسەر ووشترەکەیەوە هەلگرتبوو ، وە دەی ویست بهینیتەوە ناو شاری مەدینە تا لە گۆرستانەکەی دا بینیژریت ، بەلام پیاویك دوای کە تبووە بانگی دەکرد و دی ووت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمانتان پی دە کات تەرمی کوژراوەکان بگیرنەوە و لەو جییەی لی ی شەهید کراون بنیژرین ، ئینجا ئیمەش هەر دوو تەمەکەمان گیرایەوە ناشتمان لەگەل کوژراوەکانی تردا لەو جیگەیەی کەلی شەهید کرا بوون ). اخرجه : احمد ( ٣٩٧/٣ )، البيهقى فى الدلائل النبوه ٢٩٢/٣ .

بەلی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە لای شەهیدە کان دا وەستاو مژدەی پی دان .

لە ( عبدالله کوری سەعلەبەی کوری صوعەیر ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە سەر شەهیدەکانی جەنگی ئوحود دا وەستاو فەرمووی : ( أنا شهيد على هؤلاء أنه مامن جريح يجرح في سبيل اللة إلا والله يبعثه يوم القيامة يدمى جرحه : اللون لون دم والريح ريح مسك ) واتە : من شایەتم لەسەر ئەمانە کە هەر برینداریك لە پیناوی خوادا بریندار کرابی ، ئەوا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە لە رۆژی قیامەت دا برینەکەی خوینی لی دەتکیت : رەنگە کەی رەنگی خوینەو بۆنەکەی بۆنی میسکە واتە : بۆن خۆشترین بۆنە میسك ).

ابن ابى شيبه ( ٣٦٧٨٧ ).ابن هشام فى السير برقم ( ٦٤٤ )، البيهقى فى الدلائل النبوه ٢٩٠/٣ .

پاشان پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی دا کە شەهیدە کان نەشۆردرین و بەجل و بەریگە کانیانەوە لە خاك دا بنێژرێن .

لە ( جابر ) وە –خوا لی رازی بێت – دەفەرموویت : ( پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( إدفنوهم في دمائهم يعني شهداء احد ولم يغسلهم - وفي راوية – انا شهيد على هؤلاء لفوهم في دمائهم ) واتە : بیان نێژن بە خوێنەکانیانەوە ، وە مەیان شۆن من شایەتم بەسەر ئەوانەوە بیان پێچنەوە بە جەستە خویناویەکانیانەوە ).اخرجه : البخاری ( ١٦٥/٣ ) ، ابو داود ( ٦٠/٢ ) والنسائی ( ٢٧٧/١ )

بەلی شەهیدەکانی ئوحود زۆر بوون پۆشاك کەم بوو ، بۆ ( کفن ) کردن هەر بۆ یە دوو پیاو یان سی پیاو لە یەك ( کفن ) دا ئەنیژران . لە ( ئەنسی کوری مالیك ) وە – خوا لی رازی بێت – دەفەرموویت : ( شەهیدەکانی ئوحود زۆر بوون ، و کفن و پۆشاکیش کەم بوون ، بۆ یە دوو پیاو یان سی پیاو لە یەك کفنەوە بوون )اخرجه : ابو داود ( ٣١٣٦ ).

لە( جابر )وە–خوالی رازی بێت – دەفەرموویت : ( باوکم پۆشاکیکی ( نمره ) کرا بە کفن بۆی ئەویش دەم و چاوی پی دا پۆشرا ، وە گژوگیای ( الحرمل ) درا بەسر هەردوو پی یە کانی ) زاد المعاد ٢١٦/٣ .

بەلی سەبارەت بە نویژ کردن لەسەر شەهیدەکانی جەنگی ئوحود دا ، چەند ریوایەتیکی جیاواز هەن هەندیکیان ئەلین : پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نویژی لەسەر کردوون ، وەهەندیکیان ئەلین: پێغەمبەری خوا ﷺ نویژی لەسەر نەکردوون ، وە هەندیکی تریش ئەلین : تەنها نویژی لەسەر ( حمزه ) مامی دا کردووە ، بروانە ئەم چەند بەلگەیە کە ریوایەت کراوە لەم سەرچاوانەوە :

١- اخرجه : ابو داود ( ٣١٣٥ ).
٢- اخرجه : البخاری ( ١٣٤٣ ).
٣- اخرجه : ابوداود ( ٣١٣٧ ).
٤- اخرجه : ابن ماجه ( ١٥١٣ )، واحاكم ( ١٩٧/٣ )،والبهقی ( ١٢/٤ )
٥- اخرجه : احمد ٤٦٣/١، والحاكم ١١٩/٢ ،و زاد المعاد ٥٠٣/١ .
٦- اخرجه : الطحاوي المعاني الاثار ( ٢٩٠/١ .
٧- اخرجه : احمد ( ٤٤١٤ ).
٨- انظر : سن الترمذي باب ماجاء في ترك الصلاة على الشهيد الحديث ( ١٠٣٧ )
٩- اخرجه : الطحاوي ( شرح المعاني الاثار ) ٥٠٤/١ .
١٠- انظر : فتح الباري ، للحافظ ابن حجر العسقلاني ٢١٠/٣-٢١١.

ئ

## بیست و چوارەم: پیغەمبەری خوا ﷺ دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود ،لە خوا دەپاریتەوە دوعا دە کات :

بەلی دوای تەواوبوونی جەنگی ئوحود و ناشتنی شەهیدەکان ، پیغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دوای لە هاوەلانی کرد کە بەریز بەوەستن و پاشان دوعای کرد لە کافرەکان و سوپاس وستایشی خوای کرد .

لە (ریفاعەی ئەلزورقی ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( لە جەنگی ئوحود و لە دوای پاشەکشە کردنی موشریکە کان پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( ریك بووەستن ئینجا پیغەمبەر (صلى الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( اللهم لك الحمد كله ،اللهم لاقابض لما بسطن ، ولا باسط لما قبضت ولاهادي لما اضللت ، ولا مضل لمن هديت ، ولا معطي لما منعت ، ولا مانع لما اعطيت ، ولا مقرب لما باعدت ، ولا مباعد لما قربت ، اللهم ابسط علينا من بركاتك ورةحتك وفضلك ورزقك اللهم اني اسالك النعيم المقيم الذي لا يحول ولايزول ، اللهم اني اسالك النعيم يوم العيلة ،ولأمن يوم الخوف – في رواية – يوم الحرب ، اللهم عائدبك من شر ما أعطيتنا ، وشر مامنعت منا ، اللهم حبب إلينا الايمان و زينة في قلوبنا ،و كره إلينا الكفر والفسوق والعصيان ،واجعلنا من الراشدين . اللهم توفنا مسلمين ، واحينا مسلمين و والحقنا بالصالحين غير خزايا ولا مفتونين . اللهم قاتل الكفرة الذين يكذبون رسلك ، ويصدون عن سبيلك ، واجعل عليهم رجزك وعذابك . اللهم قاتل الكفرة الذين او توا الكتاب –في رواية – اللهم قاتل كفرة أهل الكتاب ،إله الحق (امين ) )). واتە : خوایە سوپاس هەمووی هەر بۆ تۆیە ، خوایە ئەوەی تۆ بیهینیتەوە یەك فراوان کاری نیە ، وە ئەوەی تۆ فراوانی بکەی بیهینەرەوە کاری نیە ، وە ئەوەی رینوویبکەیت گومرا کاری نیە ، وە ئەوەی تۆ گومرای کەیت رینمووی کاری نیە ، وە ئەوەی تۆ بیبەخشی ریگری نیە ، وە ئەووەی تۆ ریگری بکەیت بەخشینی نیە ،وە نزیکار نیە بۆ ئەوەی کە تۆ درووت کردەوە ، و دوور کەرەوە نیە بۆ ئەوەی کە تۆ نزیکت کردۆتەوە ، خوایە بەرەکەتەکانی خۆت هەتا هەتایت لیدەکەم کە گۆران و نەمانی بەسەر دا نایەت ، . خوایە من دوای نیعمەتەکانت لی دەکەم لەرۆژی تەنگانەدا ، وە داوی ئاسایشیت لیدە کەم لە رۆژی حەنگ و ترسدا ، خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لەخراپە و لەزیانی ئەوەی پیت بەخشیوین ،ووە خراپە و زیانی ئەوەی کەلیت قەدەغە کردووین ،خوایە باوەر خۆشەویست بکە لامان ،بیرازینەرەوە لە دلە کانماندا ، وە تاوان و بی باوەری و خرپە مان لا ناشیرین بکە و بمانکەرە ریزی هۆشمەندکانەوە ، خوایە بەموسلمانی بمان مرینە ،وە موسلمانی بما ژینە وە بمان گەیەنەرە لە پیاو چاکان و بەبی سەر شۆری و هەلگەرانەوە ،خوایە ئەو کافرانە بە کوشتن بەرە کە پیغەمبەرەکانت بە درۆ دەخەنەوە خەلکان دوور دەخەنەوە لە ریگە وئاینەکەت ، خوایە ئەشکەنجە وسزاو خۆتیان پیبگە یەنە خوایە کافرەکانی خاوەن (کتیب ) بە کوشتن بەرە ئەی خوای راست (امین ) خوایەلیمان وەرگرە .اخرجه : البخاری فی الادب مفرد (٦٩٩ )، والنسائی فی الکبیر (١٠٤٤٥)، ابو نعیم فی الحلیه (١٠/١٢٧ ).

ئ

## بیست و پینچەم : گەڕانەوەی سوپای ئیسلام بۆ ناو شاری مەدینەدا :

بەڵی لەدوای ئەم نزاو پاڕانەوەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و هاوەڵانی ، هەر هەموویان ماندوو بریندارو زامدار ببوون ، پاشان گەڕانەوە ناو شاری مەدینە ، دانیشتوانی شاری مەدینە لە ژن و مندال پیر بەرەو پیش وازیان هاتن :لە ( ابن ساحاق )وە – خوای لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( پاشان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەرەو شاری مەدینە گەڕایەوە ، و ( حمنەی کچی جەحشی ) پی گەیشت ،وە خەڵکان هەواڵی شەهید بوونی ( عبدالله کوری جەحشی ) برایان پی گەیاند بوو ،ئەویش ووتی : ( انا الله وانا الیه راجعون ) پاشان هەولی شەهید بوونی ( حمزی کوری عبدالمطلب ) ی خالیان پی گەیاند بوو ئەویش دیسان ووتی : ( انا الله وانا الیه راجعون ) پاشان هەواڵی شەهید بونی ( موصعەبی کوری عومەیرە ) ی میردیان پی گەیاند بوو ،هاواری کردو زۆر نارەحت بوو ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( میرد جیگایەکی تایبەتی هەیە لە لای ژن ) بەلام ئەم فەرموودەیە بە ( ضعیفي ) هاتووە .

اخرجه : الطبراني في التاريخ ٥٣٣/٣ . لە ریوایەتیکی تردا هەر ( ابن اسحاق ) ریوایەتی کردووە دەفەرموویت : ( پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) تیپەری بەلای ئافرەتیکی( بنی دینار ) کە برا کەی و باو کە کەی و میردە کەی هەموویان شەهید بوون لە جەنگی ئوحود لە گەل پیغەمبەر دا ( صلی الله علیه وسلم ) ، کاتیك هەواڵی شەهید بوون ئەو ( ٣ ) کە سە یان پی گەیاند ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) چی بەسەر هات ؟! ووتیان : ئەو زۆر چاکە و سەلامەتە ، وە ووتی : ئەی دایکی فلان کەس و ئەو سوپاس بۆ خوا جۆنت پی خۆشە ئەوهایە ، ئافرەتەکەش ووتی : نیشانم بدەن تاتەماشای بکەم ، ئەوانیش نیشانیاندا و ئافرەتەکەش کە بینی ووتی : هەموو نارەحەتیەك لەدوای بینینی تۆ بچوك دەبیت ) البیهقی فی الدلائل ٣٠٢/٣ . لە ( ئەنسی کوری مالیك ) وە - خوا لی رازی بیت –دەفەرموویت : ( لەرۆژی جەنگی ئوحود دا دەنگ و باسی وا بلاو بووە بەناو خەڵکی شاری مەدینەدا ، دە ووترا : محمد کوژراوە ، تا هاوار لە ناو شاری مەدینە دا بەرز بووە وە ، تا ئافرتیك لە ئەنصار چووە دەرەوە ، و تەرمی باوکی کورەکەی و میردەکەی و براکەی کە نازانم کامیان لە پیشدا بەرویدا هات ئافرەتەکە ووتی : ئەمانە تەرمی کین ؟ ووتیان : باوکت و ، براکەت ، و میردە کەت ، و کورە کەتن ، ئەویش ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علی وسلم ) خۆ چی بەسەرنەهاتووە ؟! ووتیان : ئەوتە لە پیشتەوەیە تا بردیان بۆ لای پیغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتەکە لایەکی جل بەرگەکەی پیغەمبەری گرتوو پاشان ووتی : باوك و دیکم بەفیدات بن ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ هیچ بە لامەوە گرنگ نیە تۆ دەبینك بی زیانیت ). اخرجه: الطبراني في الاوسط ( ٩٧٨ ).

ئ

# ڕووداوه کانی نیوان غەزای ئوحود و ئەحزاب.

## یەکەم: ڕاوه دوونانی موشریکانی قورەیش تا ناوچەی ( حمراءالاسد ):

بەلی لە دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود ، هەلەی تیرهاویژەکان و پەرتەوازەیی موسلمانان ، گەرانەوەیان بۆ شاری مەدینە ، پێویست بوو دەرسیکی سوپای موشریکان بەدرێت ، هەروەها چاوشکاندنی تیرە وهۆزەکانی نیمچە دورگەی عەرەبی بەتایبەتی هۆزەکانی دەوروبەری شاری مەدینە ، چونکە ئەوان ئەم جەنگەیان وا دەبینی بەشکستی سوپای ئیسلام تەواو بووە، لەراستی دا ئەمە ناحەقیە تەنها هەلەی جەند تیرهاویژیك بوو ، ئەم ڕووداوانەی لی کەوتەوە ،بەلی موسلمانان لەدوای گەرانەوەی بۆ شاری مەدینە پێویست بوو ، هەلمەتیکی ڕاوەدوونان ئەنجام بدە بۆ سوپای ملهوری قورەیش ،وەك چاو شکاندی قورەیش و هۆزەکانی چاویان بڕیبووە شاری مەدینە و، سوپای ئیسلام ، بەلی ئالەم کاتەدا هەندیك هەوال هاتە ناو شاری مەدینە ، گوایە سوپای موشریکی قورەیش نیازی وایە و دەیانەویت بگەرینەوە بۆ شاری مەدینە دەست بە کوشتن وتالان کردن و کاول کاری بکەن ، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ موسلمانانی هاندا تا خۆ ئامادە بکەن بۆ ڕاوەدونانی سوپای موشریکانی قورەیش ، وە داوای لی کردن تەنها بەژداربوانی جەنگی ئوحود ، بەژداری لەم هەلمەتە دا بکەن ، بەلی جگە لە ( جابری کوری عبدالله ) موسلمانان بەم هەموو برین و ئازارەوە بەدەم ئەم هەلمەتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتن بۆ ڕاوه دوونانی سوپای موشریکان ،بەلی سوپای ئیسلام بەریکەوت تاگەیشتە ناوچەی ( حمراء الاسد ) کە ( ٨ ) میل واتە : ١٤ کم دوورە لەشاری مەدینە دا، لەوی ماوەیەك مانەوە موشریکەکان ترسان و دەست بەردانی گەرانەوەیان بن . بەلی ووردەکاری ئەم ڕووداوە ( اهلی سیرە ) و ( اهلی فەرموودە ) دوای ڕیخستنیان باسە کە بەم جۆرە دەبیت :

لە ( موسی کوری عوقبە ) و ( عوروەی کوری زوبی ) —خوای گەورە لی یان ڕازی بیت _ فەرموویانە: ( پیاویکی خەلکی مککە هاتەلای پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری ( ابو سفیان ) و سوپاکەی قورەیشی لی کرد ، پیاوەکەش ووتی : دابەزیمە ناویانەوە گویم لییان بوو لۆمەو گازندەی یەکتریان دەکرد و هەندیکیان بە هەندیکیان دە ووت ، هیچتان نەکرد ، تیژی و درکەکانیانتان شکاند و پاشان بەجی تان هیشتن و لە ناو تان نەبردن ، هیشتا هەندیك کەسیان تیدا ماوە خەلکانتان بۆ کۆبکەنەوە ، مەبەستی هیشتا ماون قتل وعام نەکراون و مەدینە ویران نەکراوە ..!!

ئ

لەریوایەتیکی تردا ( ابن عباس ) – خوا لی رازی بیت –وا دەفەرموویت : ( ابو سفیان و موشریکەکان ئوحود یان بەجی هیشت و بەری کەوتن تا گەیشتنە ناوچەی ( الروحاء ) کە ٣٦ میل لە مەدینە دوورە ، لە ویدا ( ابو سفیان ) ووتی : نە محمد تان کوشت ، وەنە ژنەکانتان لەگەل خۆتان هینا ، خراپترین کارتان ئە نجامدا .... با بۆ یان بگەرینەوە ، ئەم هەواڵە ش گەیشتەوە پیغەمبەری خوا ﷺ .

اخرجه : التبرانی فی الکبیر ( ١١٦٣٢ ) والنسائی فی التفسیر ( ١٠٣ ) .

لە ریوایەتیکی تردا ( عائیشە ) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : پیغەمبەر خوا ﷺ لە دوای ئەوەی ئەو شکستەی بەسەر هات لە ئوحود دا ، و موشریکەکان رۆیشتنەوە ، پیغەمبەر ﷺ ترسا لەوەی کە بگەرینەوە بۆیە فەرمووی :( من ینتدب لهولاء في اثارهم حتى يعلموا ان بنا قوة ) واتە : کی خۆی ترخان دەکات تا بە شوین پی یاندا بروات تا موشریکە کان بزانن کە هیشتا خاوەن گور و هیزن ، لەویدا ( ٧٠ ) کەس خۆیان تە رخان کرد بە دوویاندا برۆن کە ( ابو بکر ) و ( زوبیر کوری عوام ) یان لە ناو دا بوو ، واتە : ئەمان وەك پشینەی سوپاکەی پیغەمبەر ( صلى الله عليه سلم ) رۆیشتوون پاشان پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )و پاشماوەی سوپاکە بەدوای ئەوانە دا هاتوون ) اخرجه : البخاری( ٤٠٧٧ ) و مسلم ( ٢٤١٨ ) و ابن ماجه ( ١٢٤ ) .

بەلی پاشان پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە موسلمانان دا کە هەموو خۆیان ئامادە بکەن بۆ راوەدوونانی سوپای موشریکانی قورەیش ، وە بۆ ئەوەی کە ئەم هەواڵە بگاتەوە ئەوان ، موسلمانانیش بە و هەموو برین و برینداریەوە . براوانە : جوامع سيره ( ١٢٨ ) .

بەلی ئامادە باشی خۆیان راگەیاند ، پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( کەس لەگەلماندا نەیت تەنها ئەوانەی بەژداری جەنگی ئوحود یان کردووە ، سەرۆکی نیفاق ( عبداللە کوری ئوبەی ) ووتی : لە گەلتاندا بیم ؟ پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ووتی : نەخیر . پاشان ( جابری کوری عبدللە ) هات ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ من لە گەلتاندا هاتم بۆ بەژدار بوون ، لەشەرە کەدا ، بەلام باوکم منی گەراندەوە ، و زۆر داوای لی کردم کە ئافرەتەکانمان بەجی نەهیلم ، ئەمەش بە هیوای ئەو شەهید بوونەی بوو کە بەدەستی هینا ، وە بۆ ئەوەی من بمینمەوە تا قەرزەکانی بۆ بدەمەوە و تا ئاگام لە میرتیەکەی بیت ، وە من پیم خۆشە روو بکەیتە هەر شوینیك منت لەگەلدا بم ، ئیستاش ریگە نادەی کەست لە گەلدا بەژدار بیت تەنها ئەوانەی کە پیشتر لەگەلتدا بەژداربوون بۆیە داوات لی دەکەم کە ریگەم بدەی تا بەژدار بم لەم رۆیشتەدا ؟! پیغەمبەریش ﷺ ریگەی دا بەژداری بکات .

ئ

بەلی لە پاشاندا موسلمانان هەموو خۆیان ئامادە کردوو بەری کەوتن بە دویاندا تا گەیشتنە ناوچەی (حمراء الاسد ) و بیری (ابو عوتیبە ) و موشریکەکان ئەم هەوالە یان پی گەیشت و نەگەرانەوە پاشان موسلمانان بە (فضل ) ی خوا گەرانەوە بەسەر بەرزی و شکۆمەندیەوە و (خوای گەورە )ش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموویت : ﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ال عمران ١٧٢ . واتا : ئەوانەی کە بدەم بانگەوازی خواو پیغەمبەرەوە ﷺ چوون ، دوای ئەوەی کە تووشی ناخۆشی و زام وئیش بوون ، بۆ ئەوانەیان کەچاکەیان کردو پاریزکار بوون ، پاداشتی زۆر گەورە و بی سنوور ئامادەیە ..!! اخرجە : البخاري (١٤٠٧٧).

بەلی ئەم باسەی رووداوی (حمراء الاسد ) (ابن سحاق ) – خوای لی رازی بیت_ بۆ مان دە گیریتەوە دەفەرموویت : ﴿ پیغەمبەر ﷺ رۆژی دووشەمە و سی شەمە و چوار شەمە لەویدا مایەوە ، هەر لەویدا (مەعبەدی کوری ئەبی مەعبەدی خوزاعی ) پی گەیشت لەو رۆژەدا خوزاعە تیکرا بە موسلمانەکان موشریکەکانیانەوە پشت گیری و دل سۆزی پیغەمبەریان ﷺ دە کرد ، لە ناوچەی (توهامە ) دا و هیچ هەوالیکیان لی نەدەشاردەوە ،(مەعبەدی کوری ئەبی مەعبەد ) ئەو رۆژە هیشتا هەر موشریك بوو ، بە پیغەمبەری ﷺ ووت : ئەی محمد سویند بە خوا زۆر دلگران بووین بەوەی کە تووشت هات و ئەو هاوەلانەت کە شەهید بوون ، وە زۆر پیمانە خۆش بوو کە خوا سەلامەتی بکردایت لەو جەنگە دا و پاشان (مەعبەدی کوری مەعبەد ) پیغەمبەری خوای ﷺ و هاوەلانی لە (حمراءالاسد ) بەجی هیشت بەرەو مککە رۆیشت ، تا ناوچەی (الروحاء) دا بە (ابو سفیان ) سوپاکەی گەیشت لەو کاتەدا ئەوان بریاری گەرانەوە یان دابوو ، (ابو سفیان ) کە (مەعبەدی کوری مەعبەدی ) بینی پیی ووت :چ هەوالی ئەم ریگایەت لایە ئەی (مەعبەد ) ؟ مەعبەدیش ووتی : محمد و تیکرایی هاوەلانی دەرچوون و بە شوینتاندا دەگەرین و ئەوەندەی لەگەلیدا یە تا ئیستا ژمارەی ئەوەندە زۆرم نەدیوە زۆر تورە و بە داخن لیتان ، ئەوانیش کەلەگەلیدا نەهاتبوون بۆ جەنگەکە هەموو پەشیمان بوون لەو کارەیان ، ئەوندە لیتان بەرقن تا ئیستا شتی وام نەدیوە ،(ابو سفیان ) ووتی : ئەوە ئاگات لە خۆتە دەلی چی ؟! (مەعبەد ) ووتی : سویند بە خوا وا بزانم فیا ناکەویت ئیرە بەجی بهیلیت تا سەری ئەسپەکانی ئەوانت لی دەردەکەویت ، ئەم هەوالەش (ابو سفیان ) سوپاکەی سارد کردەوە لە گەرانەوە، وە لەریگادا چەند کاروان چیەکی خیلی (عبد قەیسی ) پیگەیشت و پی ووتن : بەرەو کی دەچن ؟! ئەوانیش ووتیان : بەرەو مەدینە ، (ابو سفیان ) ووتی : بۆ چی دەچن بۆ شاری مەدینە ؟! ئەوانیش ووتیان : بۆبازرگانی دەچین ، (ابو سفیان ) ووتی : ئیوە نامەیەکی من بگەیەننە بە محمد منیش چەند باریك میوژتان دەدەمی گە ئیوە هاتنە بازاری (عکاظ ) ؟! ئەوانیش ووتیان : باشە .

ئ

(ابو سفيان ) ووتی : گەر بە محمد گەیشتن پی راگەیەنن کەئیمە بریارمان داوە جاریکی تر هیرشیان بیینەوە سەر تا پاشماوەکانیان ریشە کیش بکەین ،کاروانە بازرگانیەکەی ( عبد قیس ) بەریکەوتن لە ناوچەی ( حمراءالاسد ) بە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم گەیشتن و نامەکەی ( ابوسفیان )یان پی گەیاند پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ( حسبنا الله ونعیم الوکیل ) . سیرة ابن هشام ( ٣/٦٣-٦٤ )

پاشان لە رۆژی چوارشەمە دا پیغەمبەر ﷺ و هاوەلانی شکۆمەندانە گەرانەوە ناو شاری مەدینە .هەروەها لەریوایەتکی ( ضعیف ) دا هاتووە لە گەرانەوەی سوپای ئیسلام بۆ شاری مەدینەدا دوو لە کافرانی قورەیش بەدەستی سوپای ئیسلام کوژران ، ئەوانیش ( ابو عیزەی جومەحی ) و ( معاویە کوری موغیرە ) کوژران ، ( ابو عیزە جومەحی ) گەورە شاعیری موشریکانی قورەیش بوو ، بەشعرە کانی بژیوی ژیانی خۆی پەیدا دەکرد ، هەروەها ( ابو عبیدە ) بۆ مان دە گیریتەوە دەفەرموویت : ( پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەرانەویدا لە ( حمراء الاسد ) وە پیش گەیشتنەوە بە شاری مەدینە ، دوانی لە موشریکان دەست گیر کرد ، کە ئەوانیش ( معاویە ی کوری موغیرە ) و ( ابو عیزەی جومەحی ) شاعیری موشریکەکان کە لە جەنگی بەدر دا پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە بی بەرانبەر ئازادی کرد واتە : فدیە ی لی وەرنەگیرا ، بەمەرجیك بەشداری هیچ شەریك یان چالاکیەك نەکات دژ بە موسلمانان ، ( ابو عیزە ) ووتی : محمد ئازادم بکە ؟! پیغەمبەریش ﷺ پی ووت : ( لا والله لاتسمح عارضیك بمكة بعدها و تقول : خدعت محمد مرتین ..؟!! ). واتە ك نەخیر سویند بە خوا جاریکی تر دەست بە هەردوو لای سملتا نا هینیت بلییت ، محمد م دووجار خەلەتان لە ملی درا ).

اخرجە : ابن هشام فی السیر ( ٣/٦٥ ). و البیهقی فی الدلائل ( ٣/٢٨١ ).

هەروەها سەکردەی ناوداری مونافیقان یان دوورووە کان ، ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) لە یەکەم هەینی دوای جەنگی ئوحود ، ئەو پیاوە ناپاکە ، ویستی نیاز پاکی خۆی و لایەنگیری خۆی وەك جاران دووبات بکاتەوە بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانان، دوای ئەوەی کە لە پشدا باسمان ئەو پیاوە نیفاقە و دووروە ، لە جەنگی ئوحود پیش جەنگ سەیەکی سوپای ئیسلام گیرایەوە و پاشگەزی کردنەوە ...

ی

هەروەك ( ابن اسحاق ) دەفەرموويت : ( عبدالله كوری ئوبەی ) يەكيك بوو لە پياو ماقولانی هۆزەكەی خۆی ، لە هەموو كورو كۆرو كۆبوونەوەيەك ، لەناو هەمووان دا هەلدەستايەوە ،لايەن گيری سەر سەختی خۆی بۆ پيغەمبەر ﷺ دووپات دەكردەوە ، تا ئەوە بوو ئەو كارە نابەجی يەی ئەنجام دا لە جەنگی ئوحود ، وە سەيەكی سوپاكەی گەراندەوە ، لەدوای ئەوە ديسان وەك جاران ويستی خۆی لە رۆژی هەينی هەلسيت لە ناو خەلكەكەدا و لايەنگری خۆی دووپات بكاتەوە ، بەلی ( عبدالله كوری ئوبەی ) ئەم جارە كەويستی هەلسيت ، مووسلمانان لە هەموولايەكەوە جل و بەرگەكەيان گرت و پييان ووت : دانيشە ئەی دوژمنی خوا تۆ ئەو پياوە نيت دوای ئەوەی ئەو كارەت ئەنجامدا ؟!، واتە : ئەوكاتەی جەنگی ئوحود ،سيەكی خەلكی گەراندەوە ، ( عبدالله كوری ئوبەی ) بەسەر خەلكەكە دا هەنگاوی ئەناو بۆ چوونەدەرەوە، لە مزگەوت دەی ووت : هەستام لايەنگيری دەكەم دەلی ی قسەی ناشيرينم كردووە ، لەم كات دا پياويكی ئەنصاری لە دەرگای مەزگەوت دا پيی گەيشت و پيی ووت : كورە بگەريرەوە تا پيغەمبەر دوای ليخۆشبوونت بۆ بكا ؟! ئەويش ووتی و الله نامەويت دوای لی خۆش بوونم بۆ بكات !! ) . سيره ابن هشام ٦٦/٣ ، ابن كثير بداية والنهاية ٥٩/٤ .

ئەم باسە كە نزيكە لەم ئايەتەی ( خوای گەورە ) لە سورەتی المنافقون ئايەتی ( ٥ ) كە دەفەرموويت : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾ المنافقون ٥ . واتا : كاتيك پيان بوتريت وەرن پيغەمبەری خوا ﷺ ، دوای لی خۆش بوونتان بۆ دەكات ،سەر بادەدەن و لووت بەرزی دەكەن ، دەيانبينيت روو وەردەگيرن و بەر هەلستی دەكەن ،لە كاتيكدا ئەوانە خۆيان لا گەورە دەبيت و خۆ بە زلزانن ..!!

هەروەها هاوەلانی پيغەمبەر ( صلی الله عليه وسلم ) سەبارەت بەمە بوون ، بە دوو كۆمەل كۆمەليك ئەيانە ووت ئەيان كوژين !! كۆمەلەكەی تر ئەيان ووت : نايان كوژين !! ( خوای گەورە ) ش ئەم ئايەتە پيرۆزەی دابەزاند كە دەفەرموويت :﴿ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُمْ بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَنْ تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا﴾ النساء ٨٨ . واتا : جا ئەوە چيتانە ( ئەی ئيمانداران ) دەربارەی دوورووەكان بوون بە دوو دەستەوە ؟! لە كاتيكدا خوا سەر شۆری كردوون وەری گيراونەتەوە بۆ بی باوەری بە هۆی ئەو كردەوانەی كە كردوويانە ، ئايا دەتانەويت (دلی ) كەسيك هيدايەت و رينموويی بكەن كە خوا گومرای كردووە ؟!بەهۆی باوەری دانە مەزراو و دل و دەروونی نەخۆشيەوە ، بی گومان ئەوەی خوا گومرای بكات بەهۆی كارو كردەوەی ناپەسەنديەوە ئەو هەرگيز ريگە يەكت دەست ناكەويت بۆ رينموويی كردنی ...

ئ
( ابن اسحاق ) –خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( بەراستی  رۆژی ئوحود توش بوون و تاقیکردنەوەو پاکردنەوە بوو ( خوای گەورە ) باوەردارانی تیادا تاقی کردووە ، وە تیایدا ئەو دوو روانەی کە بە زمانیان باوەری خۆیان ئاشکرا دەکرد ، وبی باوەریان لە دلیاندا دەشاردەوە ئالە و رۆژەدا ( خوای گەورە ) ئاشکراو ریسوای کردن ، وە ئەوە رۆژیك بوو کە ( خوای گەورە ) هەندیك لە  پیاو چاکی خۆی ریزدار کرد ریزو پلە ی شەهیدی پی بە خشین ). سیرە ابن هشام ٣/٢٢٢ .

## قورئانی پیرۆز باسی جەنگی ئوحود دەکات لە چەند خالیکدا دەی خەینەروو

**لەراستی دا دەربارەی چەنگی ئوحود ( ٦٠ ) ئایەت هاتووە تە خورەوە ، باسی لایەنە جۆور بەجۆرەکانی ئەم رووداوە دەکات ، تاوە کو موسلمانان پەندە لەم رووداوە وەرگرن ، لە چەند خالیکدا دەی خەینەروو :**

**١-قوناغی یەکەمی جەنگی ئوحود ، کەبریتیە لە خۆئامادەکردن بۆ جەنگەکە ، هەروە ك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ **ال عمران ١٢١ .**

**( لیرەدا قورئانی پیرۆز لە سەر غەزای ئوحودا ئەدویت ) واتا : یادی ئیمانداران بخەرەوە کاتیك بەیانی زوو لە مال دەرچوویت ، شوینی جەنگت بۆ ئیمانداران دیاری کرد ، تیر هاویژان لەسەر گردەکە دامەزراند و فەرمووی پیان : ئیمە سەرکەوتوو بووین ،یان شکستمان هینا ،ئیوە شوینی خۆتان بەجی مەهیلن و شوینی تریشی بۆ ئەوان تر دیاری کرد ،( خوای گەورە )ش بیسەر ، بە گوفتارتان زانایە بە بیرو بۆچوونتان )..!!**

**٢-پاشان قورئانی پیرۆز دەربارەی مونافیقە کان یان دوو رووە کان باس دەکات ، کە ژمارەیان نزیکەی ( ٣٠٠ ) پیاو دە بوو ، بەسەرکردایەتی ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) کە لە پیغەمبەری خوا ﷺ هەلگەرانەوە و ،لە نیوەی ری دا ، کە بەرەو ئوحود دەچوون گەرانەوە بۆ شاری مەدینە ..!!**

**( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَاتَّبَعْنَاكُمْ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ الَّذِينَ قَالُوا لِإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُوا لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنْفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾**ال عمران ١٦٧-١٦٩ . واتا: دوو روویی و نالەباریی دووروەکانیش دەربخات ، کاتیك پییان وترا : وەرن بجەنگن لە پیناوی خوادا ، یان هیچ نەبیت بەرگری لە خۆتان و مال و مندالتان بکەن ، ووتیان ئەگەر بمانزانیایە شەرو جەنگ بە پا دەبیت ئەوە شوینتان دەکەوتین و دەجەنگاین ، ئەوانە ئەو رۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لە ئیمان ، بەدەمیان شتیك دەلین کە لە دل دەروونیاندا نییە ، خوایش زانایە بەوەی کە دیشارنەوە ..!!ئەوانەی بۆی دانیشتن نەچوون بۆ جەنگ بەبراکانی خۆیانیان ووت: ئەگەر ئەوانە واتە : ( شەهیدەکان ) بەقسەی ئیمەیان بکردایە نە دەکوژران ، ئەی پیغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) پییان بلی : دەی کەواتە مردن لە خۆتان دووربخەنەوە ئەگەر راست دەکەن ؟! هەر گیز وامەزانن و وادامەنین ئەوانەی لە پیناوی خوادا شەهید بوون و کوژران ، مردوون ، نەخیر ئەوانیە، بەلکو ئەوانە زیندوون ، لای پەروەردگار یان لە رزق و رۆزیی هەمە جۆرو تاییەت ..!!**

ێ

**٣-قورئانی پیرۆز باسی ئەو دابەش بوونە پر مەترسیە دەكات ، كە بە بۆنەی هەڵگەڕانەوەی سەرۆكی مونافیقان و مونافیقەكانەوە بوو ، كە خەریك بوو لەناو سوپایی ئیسلام دا روو بدات ، بەر لەوەی سوپایی ئیسلام بگاتە شوێنی خۆی واتە : ( ئوحود ) .**

**كە( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلَا وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ **ال عمران ١٢٢-١٢٣ .**

**واتا : ئەوسا خەریك بوو دوو دەستە یان دوو تاقمە ، لە ئێوە جیاببنەوە یان بەشیمان ببنەوە ، لە نیوەی ڕێگا بگەڕێنەوە ، بەڵام خوا یاوەریان بوو ، دڵ یانی دامەزراند لەسەر فەرمانبەرداری دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەستن ..!!بێ گومان خوا لە غەزای بەدر دا سەری خستن ، هەرچەندە ئێوە لەژمارە و چەك وتفاق دا ، لاواز ترو كەم تر بوون ، دەی كەواتە لە خوا بترسن بۆ ئەوەی سوپاسگوزاربن ..!!**

**٤-بەڵی قورئانی پیرۆز باسی ئەو سەكەوتنە خێرایەی موسڵمانان دەكات ، كەلە سەرەتایی جەنگی ئوحودا بەدەستیان هێنا ، بە بۆنەی گوێرایەڵی ( خوای گەورە ) پێغەمبەركەی ﷺ موسڵمانەكان فەرمانەكانیان جی بەجی كرد ، فیداكاریان كرد بۆ ( خوای گەورە ) هەروەها ( خوای گەورە ) ئەم سەر كەوتنەی پێشكەش كردن و ، سوپایی ملهوری قوریشی بت پەرستیان تێك شكاند وتەفر تووناوان كرد ، هەروەها باسی ئەو هەڵە گەورەیەی تیرهاوێژەكانیش دەكات كە بەهۆی نەزانیان دەرچوون لە فەرمانەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ و تووشی ئەو زیانەهاتن ..**

**كە( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بِإِذْنِهِ حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا أَرَاكُمْ مَا تُحِبُّونَ مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ **ال عمران ١٥٢ .**

**واتا : سوێند بێت ، خوا بەڵێنی خۆی بۆ ئێوە بەڕاستی بردە سەر لە سەرەتایی جەنگی ئوحودا ،هەر بە مۆڵەت و یارمەتی ئەو ( دوژمنانتان ) بەگیر هیناو تێكتان شكاندن ، هەتا ئەو كاتەی كە ساردیی رووی تێكردن و بوو بە كیشەتان لەسەر هەندێك شت و یاخی بوون لەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ سەنگەرتا چۆڵ كرد ، دوای ئەوەی هەندی شتی نیشاندان كەحەزتن لیدەكرد ، هەتانە دنیای دەویت و هە تانە قیامەتی مەبەستە ، لەوەودوا دەستی ئێوەی كۆتاكرد ، لە دوژمنان تا تاقیتان بكاتەوە ، سوێند بێت ، بەڕاستی خوا چاوپۆشی لی كردن و لیتان خۆشبوو و خوا فەزل و ڕێزی هەیە بۆ ئیمانداران ..!!**

ێ

٥-بەلی قورئانی پیرۆز باسی دامەزراوی پیغەمبەری خوا ﷺ دەکات ، کە لەکاتی پەرتەوازەی موسلمانان ، بەلی ئالەم کاتەدا موسلمانان نەیان دەزانی چی بکەن ، سەرەرایی ئەو هەموو ترس ولەرزە کە چووبۆتە دلی هەندیك لە موسلمانان ، بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ نەشلە ژاو دامەزراو بوو ..!!

کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَى أَحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ فَأَثَابَكُمْ غَمًّا بِغَمٍّ لِكَيْلَا تَحْزَنُوا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَا أَصَابَكُمْ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ال عمران ١٥٣ .

واتا : ئیتر ئەوە بوو کە ( بە شەرهاتن و کشانەوە و شپرزە و پەرت و بلاو بوون ،خۆتان هەلدەگیرا یان سەردەکەوتن بەسەری ( کیوی ئوحودا )و دەروبەری دا و ئاورتان لە کەس نەدەدایەوە ،لە کاتیدا پیغەمبەریش بەدواتاندا بانگی دەکردن ( ئەی ئەندەکانی خوا بگەرینەوە و رامەکەن ، جا ئەوە بوو ئیوە خەم و خەفتتان کردە دلی پیغەمبەرەوە بە نافەرمانیتان ( خوای گەورە ) خەم و پەژارەی کردە دلی ئیوەوە بەنگو باسی بریندار بوونی پیغەمبەرو شەهید بوونی تاوەکو خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لەدەستتان چووە و ئەوەش کە خوا تووشی کردوون و بە سەری هینان دیارە هاوەلانی پیغەمبەریان لە خۆیان و لە هەمووشت لا خۆشەویستر بووە ، خواش ئاگادارە لە و کارو کردەوانەی کە ئە نجامی دەدەن ..!!

٦-قورئانی پیرۆز باسی پروپاگەندی بلاوبوونەوەی ، کوژانی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەکات ، کە چۆن ئەو دەنگوباس ئەژنۆیی موسلمانا ئەشکینی ، تا وای لیهات هەندیك لە موسلمانان شمشیرەکانی شیان فیردا ، لەبەر ئەم هەوالە ناخۆشە کەبلاوبوویەوە بە ناراست ، جا قورئانی پیرۆز لەوەش تیمان ئەگەیەنی کە محمد ﷺ هەر وەك بەدن کانی خوا مرۆڤیکە وەك هەمووان ئەویش مردنی لەریدایە ، وە بە هەتاهەتایی لە ژیانی دونیادا نامینیتەوە ئەمریت ، لە جەنگیش دا شەهید ببی نابیت هاوەلانی وورەیان نەمینیت ئەژنۆیان بشکیت ، وە دەست بەرداری دینی حەق بن ، بەلکو پیویستە چاکتر لەجاران چەك هەلگرن رووبەرووی ناحەقی بوەستنەوە حەق سەر بخەن ، چونکە ئەگەر ئەو ئازیزەشیان لەدەست بەجی خۆ پەیامەکەی بەجی ماوەو هەردەمینی تاهەتایی و ، خۆ ئاینی خوا هەمیشەیە بۆ هەتاهەتایە ئەمینیتەوە ..!!

ئ

که ( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت :** ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ **ال عمران ١٤٣ .**

**واتا : محمد ( صلى الله عليەوسلم ) تەنها پیغەمبەریك نەبوو ، كۆچی دوای بكات ، بی گومان پیغەمبەرانی پیش ئەویش كۆچی دوایان كردووە ، ئایا ئەگەر كۆچی دوای كرد یان شەهید بوو ، ئیوە پاشگەز دەبنەوە و هەدەگەرینەوە ؟! لە دین و ئاینەی كەپیی راگەیاندوون ، خۆ ئەوەی هەلگەریتەوە و پاشگەزبیتەوە و ئەوە هەر گیز زیان بە خوا ناگەیەنیت ، لە داهاتویەكی نزیكدا( خوای گەورە ، پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە ..!!**

**٧-هەروەها قورئانی پیرۆز باسی خیرەت وجوامیرانەی دل ودەروون دامەزراوی موسلمانان دەكات ، كە چۆن حەزیان لە شەهید بوون بووە لە پیناوی ( خوای گەورە ) ..**

که ( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت :** ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنْكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ **ال عمران ١٥٥ .**

**واتا : بی گومان ئەوانەی پشتیان هەلكرد لەجەنگی ئوحودا لەرۆژی بەیەك گەیشتنی هەر دوو سوپا یا ئوردوو ، واتە : سوپای ئیمانداران و سوپای موشریكان یان بی باوەران ، ئەوان تەنها شەیتان تووشی هەلەی كردن لە خشتەی بردن بە هۆی هەندیك گوناهەوە كە ئە نجامیان دابوو، بەراستی خوا لییان خۆشبوو چونكە بی گومان خوا لی خۆشبووە لە گوناهەكەتان و ئارامگرو خۆراگرە زوو تۆلە لە یاخی بوان ناسینیت ..!!**

**٨-هەروەها قورئانی پیرۆز ، موسلمانەكان ئاگادار دەكاتەوە ، ئەگەر ئەوان لەجەنگی ئوحود دا تووشی زەرە و زیان بووبن ، بەهۆی هەلەی هەندی لەدەستەی تیرهاویژەكانەوە ، جا كە پرسیار ئەكەن ئەمە چیە ؟! وە بلی ئیمە بەتەمای سەركەوتن بووین ، نەوەك تیكشكان ، ئەی محمد ﷺ پیان بلی : ئەم شكستە هەلی خۆتانە؟! بەمەرجی ئەوەی لە ئیوە كە شەهید بوونی ( ٧٠ ) پیاو تانە ، بەلام لە جەنگی بەدر دا سوپای قورەیش دوو ئەوەندە زیانیان لی كەو ت ، كە ئەویش كوژانی ( ٧٠ ) پیاو و ، بەدیل گیرانی ( ٧٠ ) پیاویان .**

ئ

كه ( خواى گەورە ) دەفەرموويت : ﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ال عمران ١٦٥ . واتا : ئايا كاتيك بەلاو ناخۆشيتان تووهات لە جەنگى ئوحود دا بۆ دەلێن : ئەمەچی بوو ؟! بۆ واهان بەسەر هات ؟! لە كويوە ئەمەيان بۆ هات ؟! ئەی لە يادیان چوو ،خۆ لە جەنگى بەدر دا ، بەراستى ئيوە دوو ئەوەندەتان بەوان كرد ؟! ئينجا پييان بلى : ئەو بەلايە لەلايەن خۆتانەوە تووشتان هات ، كاتيك نافەرمانى پيغەمبەرتان كردو تەماعى دنيا لە دەروونتاندا جوولا ، بەراستى خوا دەسەلاتى بەسەر هەموو شتيك دا هەيە ،بەندە چاكە كانيشى كاتيك هەلە بكەن تووشى بەلايان دەكات ..!!

٩-هەروەها قورئانى پيرۆز ، موسلمانان ئاگادار دەكاتەوە ، كە مردن ئەوەندە كاريكى سەخت و ناهەموار نيە ئەوان لى بترسين ، چونكە هەركەسيك ئەجەلى خۆی يان قەدرەی خۆی دياری كراوە ، تا كاتى نەيەت نامريت ، بى گومان مردن بۆ ئەوانەی كە ئيماندارى راستەقينەن و كارو كردەوەی باچ ئە نجام ئەدەن بەهيچ شيوەيەك سەخت نيە ، بەلام بۆ ئەوانەی كەبى باوەرن و كارو كردەوەی باش ئە نجام نادەن و زالم و ستەكارن و مال وسامانى ئەم خەلكە ئەدزن دەسەهەلات داری ستەم كارن، ئا بۆ ئەوانە زۆر سەختە بەلكو قيامەتى ئەوانەيە رۆژی حيساب لى پيچينەوەيانە لە ناوقەقبری تسك و ناخۆش تاريك دا ..!!

كه ( خواى گەورە ) دەفەرموويت : ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُؤَجَّلًا وَمَنْ يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَنْ يُرِدْ ثَوَابَ الْآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ﴾ ال عمران ١٤٥ .

واتا : هيچ كەسيكيش نامريت مەگەر بەويستى خوا نەبيت ، لە كات و وەقتى دياری كراودا ، ئەمەش خۆی هاندەريكە بۆ ئيماندار كە لە مەرگ نەترسيت ، جا ئەوەی پاداشتى دنيای دەويت هەنديكى پيدەبە خشين ، ئەوەش قيامەتى دەويت هەنديكى پى دە بەخشين لە داهاتوويەكى نزيكيشدا پاداشتى سوپاسگوزاران دەدەينەوە ..!!

ئ

١٠-هەروەها قورئانی پیرۆز سەرنجی موسلمانان را ئەکیشی ، کە ئەوان یەکەم دەستە  یان قەوم یان ئومەت نەبوون ، لە قەومی پیغەمبەران ، کە تووشی ناخۆشی زەرەو زیان بەلاو تاقی کردنەوە بوون ،بەلکو زۆربەی پیغەمبەران  تووشی ئەو بەلاو تاقی کردنەوە بوو ، ئەمەش بۆ دل دانەوەی موسلمانان بوو کە بەسەریان داهات لە جەنگی ئوحود دا ، بەلی زۆربەی پیغەمبەران بە زەحمەت وناخۆشیەو تاقی کردنەویە دا تیپەر بوون ، بەرانبەر بەدوژمنانی ( خوای گەورە ) ، ئەوە شی شانی داوەتی بەم ئاینە  پاکەی ( خوای گەورە ) بەر گەی ئەم ئازارو ئەشکە نجەیە هاتووە ، ئەوا ( خوای گەورە ) پاداشتی دینایی بەجوان ترین شویەوە سەربەرزانەی پی بەخشین ، وە لەقیامەتیشدا بە پلە ی بەرز پاداشتیان دەدریتەوە ، بەشەهید ئەژمار دەکردن ، پلەی شەهیدیش زۆر فەزل گەورەیی هەیە لە لایەن پەروەدرگارەوە ...!!

کە ( خوای گەورە )دەفەرموویت: ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ نَبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ  وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّا أَنْ قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ  فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الْآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ ال عمران ١٤٦-١٤٨ .

واتا : چەندە ها پیغەمبەر هەبوون ، کە خوا ناس و  پیاوچاکانی زۆر ەگەلیدا بوون ،و دژبە دوژمنانی خوا جەنگاون ، جا ئەوانە هیچ کات سستی و بیزاری وبیتاقەتی رووی تینەکردوون بەهۆی ئەوەی کە تووشیان هاتووە ، لە  پیناو ریبازی خوا دا ، لاوازو بی هیزو سەرشۆریش نەبوون بۆ دوژمنان ، ( خوای گەورە ) ئەو ئارامگرو خۆراگرانەی خۆش دەوییت .. ئەو کاتە گوفتاریان تەنها ئەمە بووە کە  ووتویانە : پەروەردگارا لە گوناهو هەلەکانمان ببورەو لە زیادەرەوی کاروبارمان خۆش ببە ، دامەزراومان بکە ، سەرمان  بخە بەسەر ئەم گەلە بیباوەرەدا .. ئەو سا ئیتر ( خوا ) پاداشتی دنیای پی بەخشین بەسەرکەوتن و پایەداریی پاداشتی چاکی قیامەتیشی بۆ مسۆگەر کردن و خوا ئە چاکەکارانەی خۆش دەوییت ..!!

ئ

بەلی لە سالی ( ٣ ) کۆچی دا پیغەمبەری خوا ﷺ خاتوو ( حەفصە کچی عمری کوری خطابي ) مارە کرد ، بەلی خاتوو ( حەفصە ) کچی ( عمر ) لە پیشدا هاوسەری ( خونەییسی کوری حوزافەی سەهەمیی ) بوو ، کە یەکیك بوو لە هاوەلە کانی غەزای بەدر دا ، لە دوای تەواو بوونی جەنگی بەدر دا ،کۆچی دوای کرد یان وەفاتی کرد ..

هەر لەم سالە دا رووداویکی تر روویدا ئەویش ( فاطمە ) ی کچی پیغەمبەری خوا ﷺ کە هاوسەری ( علی کوری ابی تالیب ) بوو ، مندالیکی بوو ئەویش ( حسن ) بوو –خوا لی یان رازی بیت ) لە سالی دواتر دا ( حسین ) لە دایك بوو ، واتە لە سالی چوارەمی کۆچی دا ..

بەلی هەر لەم سالەشدا ( عوسمانی کوری عەففان ) خاتوو ( ئوم کلثومي ) کچی پیغەمبەری خوای ﷺ مارە کرد ، بەلام پیش تر ( عوسمانی کوری عەففان ) خاتوو ( روقیە ) کچی پیغەمبەری خوا ﷺ هاو سەری بوو ، ئەوە بوو لە جەنگی بەدر دا ، بە نەخۆشی کۆچی دوای کرد بەلی کاتیك ( عوسمان ) خوازبینی ( ئوم کلثومي ) کچی پیغەمبەری خوای ﷺ کرد ، پیغەمبەری خوا ﷺ پی فەرموو : ( لو كان لي يا عثمان عشرة لزوجتك واحدة بعد الاخرى ) واتە : عوسمان ! ئەگەر ( ١٠ ) کچم هەبن یەك لە دوای یەك مارەیان ئەبرم لیت .

ئەلین : جگە لە عوسمان هیچ کەسیکی تر دووکچی پیغەمبەرکی یەك لە دوای یەك مارە نەکردووە ، هەر لەبەر ئەمە پیان ووتوە یان نازناوی (( ذو النورين )) لین نراوە ..!!

سریەی ( ابو سلمە ):

بەلی لەسالی چوارەمی کۆچی دا ، یەکەم دەستە یان کۆمەلە لەدوای ئەو ئازارەی جەنگی ئوحود ، هەستان بە دژایەتی کردنی موسلمانەکان ئەوانیش هۆزی ( بنو اسدی کوری خزیمە ) بوون ،هەوالگەریەکانی شاری مەدینە هەوالیان یان خبریان هینا ، بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ ، کە وا هەردوو کورەکەی ( خویلد ) واتە : ( طلحە ) و ( ابو سلمە ) لەگەل دارو دەستەکانیان ، وا خەریکی هاندان و بانگەشەی ( بنو اسد ) دەکەن بۆ جەنگ کردن دژ بە پیغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانان و شاری مەدینە ...

ئ

بەلی ئالەم کاتەدا خیرا و بەپەلە پیغەمبەری خوا ﷺ سریەکی نارد ، کە ژمارەیان نزیکەی (١٥٠) پیاو دە بوو ، لە کۆچ کەران و ئەنصارەکان ، وە (ابو سلمە ) ی کردە ئەمیری ئەم سریە یە ، کە ئالاکەی دایە دەستی (ابو سلمە ) ، لە ناکاو دا هیرشی کردە سەر (بنو اسد ) لە ناو خانوو و مالی خۆیاندا ، پیش ئەوەی ئەوان هیرش دەست پی بکەن ، بەلی (ابو سلمە ) هاوەلەکانی هۆزی الاسد یان خیلی الاسدیان پەرتەوازە کرد تەفرو تونایان کردن ، هەروەها ئەم سریەیەی (ابو سلمە ) دەستیان گرت بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە مەرو مالات و ووشتر ،دەست کەوتی جەنگی پاشان بەبی هیچ بەرنگار بوونەوە یەك یان هیچ جەنگیك لەریگادا گەرانەوەی شاری مەدینە ،وە باس دەکەن ئەم سریەیە لەمانگی موحەرەم و لە سالی چوارەمی کۆچی دا بوو ، بەلی کاتیك (ابو سلمە ) گەرایەوە بۆ شاری مەدینە ، کە پیشتر لە جەنگی ئوحود دا بریندار ببوو ئازاری زۆر بوو ، بەلام بە هۆی ئەم هەلمەتەی بۆ سەر (بنو اسد ) ئازارو برینداریەکەی زیاتر بوو و سەری هەلدایەوە ، (ابو سلمە ) پاش ماوەیەك لەسەر ئەم برینەیی کۆچی دوایی کرد . زاد المعاد ١٠٨/٢ .

## کوشتنی فەرماندەیەکی هۆزی (هوزەیل ) کە ناوی (خالیدی کوری سیفان بوو

لە مانگی موحەرەم سالی چوارەمی کۆچی دا ،فەرماندەی بالای موسلمانان هەوالیکی پی گەیشت کە فەرماندەی هۆزی (هوزەیل ) یان (بنی هوذیل ) بە سەرۆکایەتی (خالیدی کوری سفیان ) خەریکە سوپایەك لە ئەعرابییەکانی ناوچەی عورەنە کۆدەکاتەوە ، بە نیازی ئەوەی کە هیرش بکاتە سەر شاری مەدینەو موسلمانەکان ، بۆ تالان کردنی شاری مەدینە ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەوالەی بیست یان ئەم خبرەی بیست ، یەکیك لە پالەوانەکانی سوپای ئیسلام بە ناوی (عبدالله ی کوری ئونەیس ) بوو ، بانگی کرد و ، ناردی بۆ ناوچەی (عورەنە ) تاکو ئەم هەوالە ساغ بکاتەوە ، جا ئەگەر هەوالە کە راست بوو ، ئەوا یەکسەر فەرماندەی هۆزی هوزەیل ' یان (بنی هوذیل ) بکوژیت ، چونکە بە کوشتنی ئەو پیاوە ناپاکە کۆتایی بە پیلانەکەی دیت ، هیچ پیویست ناکات سوپای ئیسلام بۆ ئەم ناوچە دوورانە رەوانەبکریت ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ بە (عبداللەی کوری ئونەیس ) ی ووت : فەرمانی بەسەر دا ، ئەگەر هەوالەکە راست بوو ، بە هەر شیوەیەك بیت ، ئەوا ئەو پیاوە بکوژیت ، بەلام (عبدالله کوری ئونەیس ) (خالیدی کوری سفیان ) ی نەدەناسی ، هەر بۆیە داوای لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد تاکو بۆی وصف بکات...

ێ

بەلی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : (اذا رأیته ، وفرقت منه ، وذکرت الشیطان) .واتە: کە چاوت پی کەوت لی ئەترسی و ، سامت لی ئەنیشی و ، شەیتانت بیر دەکەویتەوە ، ئینجا (عبدالله) ئەی ووتی : من لە هیچ پیاویك نە دە ترسام . جا (عبدالله ی کوری ئونەیس) بۆ ئەوەی کارەکەی جی بەجی بکات لەم شوینە دوورە ، ماوەی خواست یان مۆلەتی خواست لە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەندیك شتی ناراست بلی ،یان هەندیك دۆر بکات ، بۆ ئەوەی کارەکەی خۆی جی بەجی بکات ، پیغمبەری خواش ﷺ ماوەی پی دا یان مۆلەتی پی ..

بەلی (عبدالله) بە پەلە بەرەو ئەم ناوچەیەی (بنی هوذیل) کەو تەری ، بەلی گەیشتە ئەو شوینە ناوچەی (عورەنە) بینی وا هەوالەکە راستە و فەرماندەی (بنی هوذیل) وا خەریکی کۆکردنەوەی سوپایە بۆ هیرش کردنە سەر شاری مەدینە ، بەلی (عبدالله) لەم ناوچەیە دا وەها خۆی ناساند کە لە هۆزی خوزاعە یە یان (بنی خوزاعە) ..

هیواش هیواش خۆی لە فەر ماندەی (بنی هوذیل) نزیك کردەوە ، (خالیدی کوری سفیان) ووتی : ئایا ئەو پیاوە کی یە ؟! ئەویش پی ووت : من پیاویکی بنی خوزاعەم !! بیستومە بۆجەنگی محمد خەلك کۆدەکەیتەوە ، منیش هاتووم لە گەلتان دا بیم بۆ ئەم جەنگە ، (خالیدی کوری سفیان) زۆری پی خۆش بوو..!! بەلی (عبدالله) کە (خالیدی) بینی هەر بەم شیوەیە بوو کە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووی باس کردبوو ..!!

بەلی کاتیك فەرماندەی هۆزی هۆزەیل (خالیدی کوری سفیان) لە (عبدالله ی کوری ئونەیس) هیمن و ئارام بووە ، کەوتنە پیاهەلدانی خۆی سوپاکە ، پاشان (عبدالله) کەناری لە (خالید ی کوری سفیان) گرت ، پاش ئەوەی پاسەوانەکانی لی جیا بوونەوە و دوورکەوتنەوە ، (عبدالله) هەلی بۆ رخسا و بە شمشیر هەلمەتی دایە و یەکسەر کوشتی بەپەلە سەری (خالیدی کوری سفیانی) لە جستەی کردەوە ، بۆئەوەی دارو دەستەکی ئەی دۆزنەوە دەست بەسەری نەکەن ، خۆی گەیاندە ئەشکەوتیك خۆی تیدا شاردەوە ، بەلی کاتیك گەرایەوە و گەیشتەوە شاری مەدینە ، بینی وا پیغەمبەری خوا ﷺ لە مەزگەت دایە ، کە چاوی بە (عبدالله ی کوری ئونەیس) کەوت فەرمووی (افلح الوجه) واتە : رووت گەشاوەبووە ، ئەویش ئەلی : رووی خۆت گەشاوەبیت ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ...

ئ

بەلی ( عبدالله كوری ئونەیس ) سەری ( خالیدی كوری سفیان ) سەركردەی هۆزی هۆزەیل دەخاتە بەردەستی پیغەمبەری خوا ﷺ پیشانی دەدات و ، هەوالەگە شی بۆ ئەگیریتەوە ، بەلی لەم هەلمەتەدا ( عبدالله ) ( ١٨ ) شەوی پی چوو ، بەلی لەم رووداوە دا بۆ مان دەر دەكەویت ، كە پیغەمبەری خوا ﷺ نەی ئەهیشت دوژمنانی خوا ، نەخشە وپیلان بگیرن بۆ سەر موسلمانان ، پیغەمبەری خوا ﷺ بە زووترین كات نەخشەو پیلانەكانیانی پووچەل دەكردەوە ،بە كەم ترین زیان دەربازیان ئەوبوو لە مەترسی دوورخستنەوەی موسلمانان ، هەروەها هەلبژاردنی ( عبدالله ی كوری ئونەیس ) بۆ ئەم كارە باشترین هەلبژاردە بوو ، لە لایەن پیغەمبەری خوا ﷺ ، چونكە ( عبدالله ) لەم هۆزانە نزیك بوو، چونكە ئەولە هۆزەكەی ( جوهەینە ) نزیك بوو .

الرحيق المختوم ٢٩٦ ، السيره النبويه لابى شهبه ٢٤٣/٢ ، اليسر ابن هشام ٦٠٩/٣-٦٢٠ .

## رووداوی ( رەجیع ) یان شاندەكەی ( رەجیع )

لەمانگی سەرفەری هەمان سالدا واتە : سالی چوارەمی كۆچی دا بوو ،كۆمەلیك لە هۆزەكانی ( عضل ) و ( قارە ) هاتنە شاری مەدینە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ خۆیان بە موسلمان بوون ، خستە پیش چاو و ، ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ خەلك لەلای ئیمە موسلمان بووە ، جا چەند كەسیك لە هاوەلەكانت بنیرە بۆمان تۆ فیری ئەم دینەی ئاینی ئیسلامان بكات و ، فیری قورئان خویندمان بكات فیری شەریعەتی ئیسلمان بكات ..!!

بەلی بۆ ئەم داوایە ی ئەم شاندە ، پیغەمبەری خوا ﷺ ( ٩ ) كەسی لە هاوەلەكانی هەلبژارد : ( مورثیدي كوري ابو مورثیدي خە نە وي ) كردە ئەمیری ئەم كۆمەلە موسلمانە ، وە ( عاصمي كوری ثابتي كوری ابو ئە فلح ) كە یەكیك بوو لە تیرهاویژەكانی جەنگی ئوحود ، لەگەل هاوەلە كانی تریش ، كەوتنە ری ، بەلی ئەم دەست موسلمانە قورئان خوینە ، لە گەل ئەو كۆمەلە ناپاكە و بت پەرستە و نەخشە گیر و پیلان گیرە كەوتنە ری بەرەو شاری مككە ، هەتا گەیشتنە سەر ئاوی ( رەجیع ) كە ناوچەی ( هوذیل )یە لە نیوان عوسفان و مككە دا یە ، ( ٩ ) هاوەلە قورئان خوینە موسلمانەكە لەسەر ئاوەكەدا لایان دا و هیچ خەمیان نەبوو ، كە چی ئەو شاندە موناڧیقە دوو رووە ناپاكە خیانەتیان لە گەلدا كردن ، یەك لەدوای یەك خۆیان دزیەوە و ، بەرەو رووی ( بنى هوذیل ) چوون هاواریان لی كردن تا بینە سەر ئەم كۆمەلە موسلمانە ، ئەوە بوو ( ٢٠٠ ) پیاو هاتن لە هۆزی هوزەیل ، هیرشیان كردە سەر ئەم دەستەقورئان خوینە موسلمانە ، بینیان وا چواردەوریا گیراوە بە شمشیر ، ئا لەم كاتەدا خیرا ئەم دەستە یان كۆمەلە موسلمانە دەستیان دایە شمشیرەكانیان بۆ بەرگری لە خۆ كردن ...

ئ

بەلی جەنگ لە نیوانیاندا گەرم بوو ،بەلی ئا لەم کاتەدا کافرەکان یان ناپاکەکان زانیان چاری ئەم دەستە موسلمانە کەمە ناکەن چونکە خۆیان بۆ مردن ئامادەکردبوو ، هەر بۆیە کەوتنە فرو فیل کردن داوای وەستاندنی جەنگ وشەریان لی کردن ، ووتیان : ئیمە بەخوا نامانەویت بتان کوژین ..!! عهد و پەیمانی خوابیت کە نەتان کوژین ..!! کاتیك موسلمانەکان ئەمەیان بیست لە کافرەکان ، دوو رای جیاوازیان هەبوو .. بەشی زۆریان رایان وابوو ، کە بەهیچ شیوەیەك باوەر بە پەیمانی عهدی کافران ناکەن .. واتا : ( ٧ ) کەسیان ئەم رایەی هەبوو ، هەر بۆیە دەستیان کرد بە کوشتاری کافرەکان ، بەلام کافرەکان یەکجار زۆر بوون لە چاو ئەدەستە موسلمانە ، بەلی هیرشیان کردنە سەریان ئەو قورئان خوینە پاکانەیان شەهید کرد ن ، بەلام ( ٣ ) کەسەکەی تر کە دەیان ووت : بەر گری کردن لە گەل ئەم کۆمەلە زۆرە کافرە هیچ سوودی نیە ،براوایان بە بەلینەکەی ئەوان کرد خۆیان دا بەدەستەوە ،ئەم ( ٣ ) هاوەلە بوون : ( عبداللە ی کوری طاریق )، ( خوبیبي کوری عە دیي ) ، ( زیدي کوری دثنیە ) خۆیان دا بە دەستەوە ، ( ٧ ) هاوەلەکەی تریش لەویدا شەهیدبوون ، ئەم ( ٣ ) هاوەلەش کافران نامەردانە قول بەدەستیان کردن ، بە پەلە بەرەو شاری مککە کەوتنە ری تاکو لەویدا بیان فرۆشن بە کافرانی قورەیش ،کەدەیان زانی قورەیش یەکجار شادومان ئەبن بە دەست بەسەرداگرتنی ئەم موسلمانانە ، بەلی کاتیك ( عبداللە ی کوری طاریق ) ناپاکی ئەم دەستە یان کۆمەلە کفرەی بینی ، یەکسەر پەشیمانی خۆی دەربری بۆ خۆ بەدەست وەدانەکەی ، کە گەیشتنە ناوچەی ( زهران ) لەسەر ریگای شاری مککە ، ( عبداللە ) دەستی خۆی دامالی و و شمشیری یەکیك لە کافرانی فراندو دەستی دایە جەنگ و شەرکردن لەگەلیان دا ، بت پەرستان نەیان ویرا بە شەرە شمشیرە لە گەلی بەجنگن بەلکو هەر لە دوورەوە بەرد بارانیان کرد و شەهیدیان کرد ، پاشان هۆزی هۆزەیك ( زید ) و ( خوبەیب )یان بردەوە بۆ شاری مککە ، ئەوە بوو بت بەرستانی قورەیش لە گەل هۆزی هۆزەیك کەوتنە مامەلە کردنی ئەو دوو دەست بەسەر دا گیراوەی شاری مەدینە ، سەر ئە نجام قورەیش دیل بەدیل لە گەل هۆزی هۆزەیل ریکەوتن ، دوو دیلی هۆزی هۆزەیل یان ئازاد کردن ، لە جەنگی لە مەو پیش دەست قورەیش کەوتبوون ، و هۆزی هۆزەیل یش ( زید ) و ( خوبەیب )ی دایە دەست قورەیش ..!!

ێ
بەڵی ئەم دوو موسلمانە واتە : ( زید ) ، ( خوبەیب ) هەردووکیان بەشداری جەنگی بەدر و ئوحودیان کردووە ،

جا ( ابن عباس ) باسی ئەوەی کردووە کە ( صەفوانی کوری جوممەحی ) ( زید ) یە کریووە و تاکو لە جیاتی( ئومەیی کوری خەلەفی ) باوکی دا ، کە موسلمانەکان لە جەنگی بەدر دا کوشتبوویان ، تا ئەویش لە جیاتی باوکی بی کوژیتەوە ، هەروەها ( حوجەیری کوری ابو ایهابیش ) ( خوبەیب )ی کریووە ، دایە دەستی ( عوقبەی کوری حاریس ) ی خوشکەزای تا کو لەجیاتی باوکی دا بی کوژیتەوە ، ئەم ڕووداوە لە مانگی حەرامدا ڕوویداوە و چونکە بت پەرستان لەمانگە دا کوشتن یان لەسیدارەدان یان حەرام کرد بوو ، یان دوایان خست بوو ، بەڵی دوایان خستن تاکو ئەم مانگە بەسەر بچیت ، پاشان بیان کوژن بەشیوەیەکی درندانە ، لەو ماوەیەدا ( خوبەیب ) لە مالی ( بني حاريث ) زیندانی کرا بوو ، کە ماوەی شەهید کردنەکەی نزیك بووە ، چووە لای کەنیزەکەی مالە کە ، موسیك یان گویزانیکی لی وەرگرت تاکو خۆی پی پاك بکاتەوە ،ئیتر کەنیزەکە بەشتی تر سەر قاڵ بوو ، منداڵیکی مالی ئاغاکەی لە یاد چوو، منداڵە کەش ڕۆیشت بۆلای ( خوبەیب ) ئەویش منداڵەکەی لەسەر ڕانی خۆی دانا ، کە نیزەکە ئەوی دی سەرسام بوو ، بە ترس ولەرزەوە لەدلی خۆی دا ووتی : بە خوا کابرا بە کوشتنی منداڵە کە تۆ لەی خۆ سندەوە ..!!ئا لەم کاتەدا ( خوبەیب ) هەستی بە ترس و لەرزی پەشۆکاوی ئەم ئافرەتە کەنیزەکە کرد ، هەر بۆیە پی ووت : ئەترسی بی کوژم ؟! إن شاء الله شتی وا ناکەم ..!! بەڵی کاتیك کەنیزەکە موسلمانان بوو ، ئە م باسەی کردووە ، ووتویەتی : هەرگیز دیلی وا باشم نەبوی نی بوو ، بەڵی کەنیزەکە چاوی لی بوو کە ووشیەیە تری دەخوارد ، ئەو ڕۆژە لە شاری مککەدا هیچ میوەیەکی تیدا نەبوو ، لە کاتیك دا کۆت وزنجیر لەدەست پی دابوو ، بەڵی ئەوەش رزق بوو کە ( خوای گەورە ) پی بەخشی بوو ، بەڵی قورەیش هەر وەك لە مانگی حەرام دا خوینیان نەئەریژت ، هەروەها لە ناچەی حەرەمی مککەشدا خوینان نەئەریشت ، هەر بۆیە بردیانە دەرەوەی شاری مەدینە هەردووکیان شەهید کرد ..!!بەڵی کاتیك ئەو دوو دیلە موسلمانە دەبرا بۆ کوشتنیان لە دەرەوەی شاری مککەدا ، ئەوە بوو خەلکی شاری مککە ، لە ژن و منداڵ وپیرو بەندەکان لەدوایانەوە بوو ن ، تەنانەت ( ابو سفیان ) یشیان لەگەل دا بوو ،ئەوەبوو ( ابو سفیان ) ( زید ) ی دا یە دەست بەندەیەکی خۆی کەناوی ( نستاس ) بوو ، فەرمانی بەسەردا کە ( زید ) بکوژی ، بەلام پیش ئەوەی ( زید ) بکوژی ، ( ابو سفیان ) بۆ تاقی کردنەوەی ( زید ) چەند قسەیەکی لەگەل دا کرد ، بەڵی ( ابو سفیان ) لی پرسی : ئەی ( زید ) بۆ خوا لیت ئە پرسم : ئایا پیت خۆش بوو ئیستا محمد لە جیاتی تۆ بایە ؟!! بدرایە لەملی و ، تۆش لە ناو مال ومنداڵی خوت بوویتایە ...؟!!

ئ
(زيد) يش –خوا لى رازى بيت – وەلامى دايە وە ووتى : نە بەخوا ، پيم خۆش نيە ئيستا محمد لەو شوينەى خۆيدا دركيكى لە پى راچى و ئازارى بدات و و منيش لە ناو مال و مندل و كەس وكارى خۆم دا نيشتبم ..!!

هەروەها (ابو سفيان) نيش ووتى : نەبينيوە هيچ كەس وا كەسيكى خۆش بويت ، وەك ئەوەى هاوەلەكانى محمد يان ئەوەندە خۆش دەويت ..!!بەلى ئەوە بوو بت پەرستان بە شيوەيەكى زۆر درندانە شەهيديان كرد دەستيان بە تيرهاويشتن كرد تاكوو شەهيدى بكەن بەلام لە شوينيا وەهايان نەدەدا تاكو بمرى بەلكو بەشيوەيەكى ئازاردان شەهيديان كرد ، دەيان ووت بەلكو لە ئاينەكەى پاشگە ببيتەوە ، ئەويش زۆر مەردانە بەجەگانە بەرگەى ئەم ئازاردانەى گرت و ، بە شەهيدى سەرى نايەوە گەرايە وە بۆ لاى (خواى گەورە ) .

بەلام (خوبەيب) قورەيشەكا ئانگى كى زۆر گەورە يان گيرا تاكو شەهيديان كرد ، بەلى خەلكى زۆر هاتبوون بۆ تەماشاكردنى پارچەپارچە كردنى لاشەى يان جستەى (خوبەيب) ، بەلى دەستيان كرد بە هەرەشە لى كردن تاكو واز لە ئاينەكەى بهينى ..!! بەلينيان پى دا ئەگەر لە ئاينى محمد پاشگەز ببيتەوە ئاوا ئازادى دەكەن ..!! ئەويش وەك ئيمانداريكى راست گۆ شەهيد كردنى بەلاو خۆشەويستر بوو نەك ئەوەى كە بەقسەو بەلنى درۆينەى ئەوان پاشگەز ببيتەوە لە ئاينەكەى ..!! پيش شەهيد كردنى مۆلەتى لە بت پەرستان وەرگرت تاكو دوو ركعەت نويژ بكات ، ئەوانيش ريگەياندا ، ئەويش دووركعەت نويژى كرد بەخشووعەوە ، (ابن اسحاق ) – خوالى رازى بيت – دەفەرموويت ك يەكەم كەس كە ئەم دووركعتە ى كرد بيت (خوبەيب ) بووە پيش مردنى ، ئەفەرمووى : ئەوە ش بۆتە سوونەت پيش مردن كە دوو ركعەت بكريت باشە ، ئەگەر بوارى بۆ برخسيت ..!!

لە (ئوسامە) – خوا لى رازى بيت – دە گيريتەوە دەفەرموويت : ( كە پيغەمبەرى خوا ﷺ لەو رۆژە كە (خوبەيب ) لە سيدارە درا بوو – لە ناو هاوەلەكانى دا نيشتبوو ، ئەو حالە تەى بەسەرهات ، كە لە كاتى دابەزينى وەحى بەسەرى ئەهات ، گويمان لى بوو ئەى فەر موو :( و عليكم السلام ورحمە اللە وبركات ) پاشان فەرمووى : (هذا جبريل يقرئني السلام ، خبيب قتلته قريش ) ، دواى وەلامدانەوەى سەلامەكە فەرمووى : ئەوە جبريلە هاتووە و سەلامم لى ئەكات ، قورەيش (خوبەيب ) يان كوشتووە .

پاشان (خوبەيب ) لە خوا پارايەوە تاكو قورەيش لەناو بەريت ،و ئەى ووت : (أللهم أحصهم عددا ، واقتلهم بددا ، ولا تغادر منهم احدا ).

ئ

بەلی لەو رۆژەدا کە ( ابو سفیان ) ( معاویەی ) کوری لە گەلە خۆ هینا بوو ، بۆ ناچەی ( تنعیم ) کەلەویدا ( خوبەیب ) تیدا لەسیدارە درا ، ئا لەو کاتەدا ( خوبەیب ) دەستی بەرز کردە وە دوعاو نزای کرد لە قورەیش ، بەلام ( ابو سفیان ) یەکسەر ( معاویە ی ) کوری ، کە ئەو کات مندال بوو، لەسەر زەوی داینشاند ، چونکە پی وابوو ، ئەگەر رای بکیشی بەسەر زەوی یان دانیشی ئەوا دوعا کە کاری تی ناکات ،بەلی پاشان قورەیش ( ٤٠ ) گەنج یان لاویان بانگ کرد ،کە ئەوانەی باوکیان یان خزم و کەسیان لە جەنگی بەدر دا کوژرا بوو ، هەر یەکیکیان رمیکیان دایە دەستیان ، پی یان ووتن : ئەمە باوکی ئیوەی یان خزم کەسی ئیوەی کوشتووە ، ئەوانیش هەریەکەو لەراستی خۆی رمی ئەهاویشت لاشەی یان جستەی ( خوبەیب ) پارچە پارچە بوو ، بەلی ئا بەم شیوەیە خوبەیب)ی پالاوانیان شەهید کرد بەلی بەشیوەیەکی درندانە ،وەك دەلین : ( قتل وحشی ) یان کوشتنی درندانە ، بەلام ئەم شیوە کوشتنەی ( خوبەیب ) خۆ بەفیرۆ ناروات ، بەرهەمیکی هەمیشەیی بۆ هەتاهەتایی ئەبیت ،ئەویش بەهەشتی پان وبەرینی ( خوای گەورە ) یە کە بۆ ئەو کەسانەی بە ناحەق دە کوژرین و پلەی شەهیدی بەدەست ئەهینن ، پرسیار ئایا ؟! ئاینی ئیسلام یان ئاینی محمد ئەوەندە بە نرخە تا خەلکی بە پەرۆشەوە خۆی بەقوربان بکات ، ئەوا نموونەی ( خوبەیب ) بە هەزارانی وەك ( خوبەیب ) کە لەسەر ریبازی ئیسلام خۆیان بەخت کرد ، چوونە کاروانی شەهیدان ،بەلی لەو رۆژەوە کە ئیسلام هاتووە هەزاران ئیماندار بەو پەری فەخر وشانازی یەوە خۆیان بە قوربانی ئەم ئاینە پاکەی محمد ﷺ کردووە ، بەلی ئا ئەوانە لە چینی بەریزی مرۆڤەکان بوون ، چونکە نرخی ئەم ئاینەیان ئەزانی بۆیە بە پەرۆشەوە باوەشیان بۆ ئەکردەوە .!!

بەلی جوولەکە و مونافیقەکان زۆر دل یان خۆش بوو بە کوشتنی ئەم دەستە موسلمانە هەربۆیە ( خوای گەورە ) وەلامی دانەوە دەفەرموویت :﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ (٢٠٤) وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾البقرە٢٠٤-٢٠٥ ..!!

## کارەساتی بیری ( مەعونە )

بەلی هەر لەمانگەدا واتا مانگی صەفەر سالی چوارەمی کۆچی دا، ڕووداویکی تر لە کارەساتی شاندەکەی (رجیع ) کارەسات بار تر و خەمناك ترو ترسناکتر بوو ، بۆ موسلمانەکان بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ بەلی ئەم کارەساتە بە کارەساتی ( بئر معونە ) ناو دەبریت، پیاوی بە ناوی (ابو براء ) یان (عامیری کوری توفەیل ) ، بەلی ئەم پیاوە یەکیك بوو لە سەرکردە ناودارەکانی نەوەی عامیر ، کە پیاویکی لە سنوور دەرچوو و ستەمکار بوو،هەروەها پیشی وا بوو کە پیغەمبەری خوا ﷺ بەسەر هەموو دوورگەی عەرە بی دا زال دەبیت دەست هەلاتی دەبیت ،چونگە زۆر لە خۆ بایی بوو و ، حەسوود و تەماع کار بوو ، هە ر بۆیە ئەم بت پەرستا کافرە ، سی دوای لە پیغەمبەری خوا ﷺ (٣ ) پیشنیاری بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ کرد ، کە پیغەمبەری خوا ﷺ یەکیکیان هەلبژیریت : أ- یان دەسەهەلاتی پیغەمبەر دابەشکریت لە نیوان خۆی و پیغەمبەری خوا ﷺ ب- یان ببیتە جیگری پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم ) لە شاری مەدینەو دەوروبەری دا ، ج- یان ئەواتا هیرش بکاتە سەر شاری مەدینە بە هەزاران ئەسپ سوارەوە .!

صحیح البخاری (٤٠٩١).

بی گومان پیغەمبەری خوا ﷺ بەم پیشنیارانە هیچیان رازی نەبوو، چونکە نەفامیك بت پەرستیك هاتووە پیشنیار بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ بەلی پیغەمبەر ﷺ سەر لە بەری رەتکردووە ،هیچ کام لە پیشنیارەکانی پەسەند نەکرد ، ئینجا (عامیری کوری مالك)کە سەرۆکی نەوەی عامیر بوو ،بە( ملاعب سنە ) ناو دەبرا ، دواتر خۆی هاتە شاری مەدینە کە دیاری پیشکەش بە پیغە مبەری خوا ﷺ کرد ، پیغەمبەر ﷺ دوای لی کرد کە موسلمان ببیت و ، ئەو بت پەرستە رازی نە بوو ، هەروەها پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( لا اقبل هدیة من مشرك ) واتە : هدیە یان دیاری لە کافرو مشرك یان بت پەرست وەرناگرم ، (عامیریش ) ووتی ك هاوەلەکانت بنیرە بۆ ناوچەی ( نجد ) من دەیان پاریزم و پەنایان دەدەم ، پیغەمبەری خواش ﷺ هەلسا بە ناردنی کۆمەلە هاوەلیکی خۆی یان کۆمەلیك لە موسلمانان ...

ێ

هەروەها لە (انس کوری مالك ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : ( کەسانیك لە نەوەی عامیر هاتنە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ووتیان : چەند هاوەلیکت بۆ مان بنیرە بەلکو قورئان وسوونتمان فیر بکەن ، پیغەمبەری خواش ﷺ هەلسا بە ناردنی (٧٠ ) پیاو لە هاوەلەکانی ئەنصارەکان ، یان (القراء ) یان پی دە ووترا ، حەرامی خالی ئەنسی کوری مالك تیدا بوو ، ئەو پیاوانە قورئان خوین بوون ، شەوان بەیەکەوە دەیان خویندو فیری قورئان دە بوون ،بەرۆژیش ئاواین بۆ مەزگەوت ئەهینا ، یان داریان ئەبری و دەیانفرۆشت ، بۆ خواردنی هەژارەکانی صوففە ، ئیتر ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ ( نجد ) ئەوانیش دانیشتن و ئەوانیان کوشت پیش ئەوەی بگەنە جیگای خۆیان ، ئەوانیش واتە : موسلمانەکان یان ئەو هاوەلانەی پیغەمبەر ﷺ ناردی پیش ئەوەی بمرن دوعاو نزایان کرد ، ووتیان : خوایە پیغەمبەرکەت ئاگادار بکەوە لیمان کە ئیمە چاومان پیکەوت و رازیت کردین و لیمان رازی بووی ، هەروەها ئەنس دەلی : پیاویك هاتە لای خالی من ، واتە (حەرام ) لە پشتەوە بە رمەکەی لیدا لە سینگی دەر چوو ، حەرام ووتی : فزت ورب الکعبە ) واتە : سویند بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم ، ئیتر پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بە هاوەلە کانی : ( اخوانکم قد قتلوا ) واتە: براکانتان کوژران ، وتیان : خوا پیغەمبەر کەت لە بارو دۆخمان ئاگاداربکە ). صحیح مسلم ( ٦٧٧ ) .

بەلی وەك دە گیرنەوە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم کارەی بەدل بوو ، بۆ ئەوەی ئاینی ئیسلام بلاو بیتەوە خەلکی فیری شەریعەتی ئاینی ئیلام بکریت ، بەلام لە هەمان کات دا ترسی لەوەش بوو نەك دانیشتوانی ( نجد ) دەستیان لی بوەشینن پەلاماری ئەم (٧٠ ) پیاوە لە قورئان خوینان بدەن ، چونکە ئەمانە بە (القراء ) ناسراو بوون وە ناویان دەر کردبوو ، کەسانیکی لە خوا ترس وئیمانداریکی راستەقین بوون ، هەر بۆیە پیغە مبەری خوا ﷺ بە ( عامیری کوری مالك ) ی ووت : ( إنی أخاف علیهم أهل نجد ) . هەروەها ( عامیر کوری مالك ) دەر بری کە ئەو هاوەلانە لە پەنای ئەو دان دەیان پاریزی ، بەلی ئەم کۆمەلە گە نجە زۆر بەیان لە ئەنصاریەکان بوون ، هەروەها (منذري کوری عمری ) ئەنصاری یەکیك بوو لە دوانزە نقیبەکەی عەقەبەی دووەم کرد ئەمیری ئەم کۆمەلە موسلمانە خواناسە ،هەروەها هەندیك لە ناوی هاوەلەکانی ئەم کۆمەلەیە : ( حاریث کوری صیمصان ) ، (منذري کوری عمر ) ، ( حە رامی کوری میلحان ) ، ( عامری کوری فوهیرە ) ، ( عوروە ی کوری اسمائي کوری صە لت )، ( نافعي کوری بودیلي کوری وە رقاء )...

ێ
بەلی ئەم کۆمەلە موسلمانە لە گەل (عامیری کوری مالك) دەر چوون لە شاری مەدینە بەبی خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ لە گەل بت پەرستان و موشریکان دا ، بەلی روویان کردە ناوچەی (نجد) بەنیازی ئەوەی دانیشتوانی (نجد) بانگ بکەن بۆ بانگەوازی ئیسلام و خواپەرستی راستەقینە. بەلی ئەوان رۆیشتن تا گەیشتنە ناوچەیە پی دەووترا : (بئر معونە) کە دە کەویتە نیوان نەوەی عامیر و نەچە سەختە بردەلانەکەی نەوەی سلیم ..!! هەروەها لە ناوچەی (بئر معون) کە ، (حەرامی کور میلحان) برای ئوم سلیم بوو ، هەلبژارد تا نامەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ بەبات بۆ (عامیری کوری توفەیل) کە سرکردەیەکی زالم ستەم کار بوو ،ئەم (عامیری کوری توفەیل) برازی (عامیری کوری مالك) یان (ملاعب سنە) بوو .. بەلی(عامیری کوری توفەیل) پیاویکی درندەو داخ لە دل بوو بەرانبەر بە ئیسلام و پیغەمبەری خوا ﷺ ، جا کە نامەکەی بۆ برد تەماشای ناکەکەی کرد ، فەرمانی دا بەیەکیك لە پاسەوانەکانی کرد کە (حەرام) بکوژن ، پاسەوانەکەی رمیکی لە پشتی (حەرام) داو لە سنیگی دەرچوو ، (حەرام) خیرا ووتی : (الله ابکر) سویند بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم و بردمەوە ..!! بەلی ئەوەی کە (حەرامی کوری میلحانی) شەهید کرد ناوی (جەبباری کوری سولما) بوو کە ئەو چەند ووشەیەی لە دەم (حەرام) بیست و سەری لی سورما ..!! ئەم پیاوە چی ئەلیت ..؟!! رمەکە لەسەر سینگی دەر چووە ..!! ئەلی تیش : پەروەردگاری کەعبە و سەرکەوتم و بردمەوە ، چی بردۆتەوە..؟!! ئە ووت : ئەی من ئەم پیاوەم نەکوشتووە چی بردۆتەوە ..؟! بەلی دوای (جەببار) کە پرسیار دەکات دەربارەی ئەم چەند ووشەی (حەرام) پی ئەلین : ئەوە مەبەستی ئەوە بووە کە بە پلەی شەهیدی گەیشتووە ،(جەبباریش) ئەلیت : دە بە خوا سەرکەوتووە ، ئەمە ئەبیتە هۆی موسلمان بوونی (جەببار).

پاشان (عامیری کوری توفەیل) هاوەرای لە هۆزەکانی نەوەی عامیر کرد تا بەهەموویانەوە هەلمەت بەرن یان هیرش بکەنە سەر ئەم (٧٠) کەسە موسلمانە تا کو هەر هەموویان بکوژن تاقیان ببرن ، بەلام هۆزەکەی نەوەی عامیر ، بە قسەی ئەم زالمو ستەکارەیان نەکرد ، چونکە ووتیان: ئەوانە هاتوونەتە پەنای ئیمە خۆ هیچ تاوانیکیان نەکردوە ئیمە بیان کوژین ، بەلام (عامیری کوری توفەیل) هاواری لە هۆزەکانی تر کرد ، ئەوانیش بەدەم هاوارەکەی هاتن لەوانە ئەم هۆزانە بوون : (نەوەی سلیم) ، (نەوەی رەعل) و (نەوەی زەکوان) ئەوانیش نامەردانە بەدەم هاوارەکەی یان بانگەوازەکەی (عامیری کوری توفەیل) هاتن ، دەستیان دایە شمشیر و سواری ئەسپە و ولاغەکانیان بوون ، کە هەزار سوار دە بوون ...

ئ

لە ناكاو دا هێرشیان بردە سەر كۆمەڵە موسڵمانە قورئان خوێنەكە ، كە ئەوان چاوەڕوانی نێردراوەكەیان دەكرد بگەڕێتەوە ، ئیتر بەخەیاڵیان نەهات ، كە ئەو هۆزانە بەچەك ئەسپە وسوارییەوە هەڵمەت دەكەنە سەریان ، بەڵێ دارو دەستەی (عامیری كوڕی توفەیل ) و بە پاڵ پشتی نەوەی سلیم هۆزەكانی تر ، چواردەوری موسڵمانەكانیان دا ، بەڵێ ئەوە بوو موسڵمانەكان بەرگریەكی مەردانەیان نواند ، بەڵام بەهۆی زۆری كافرو بت پەرستەكان ، لەدوای دا یەك لەدوای یەك بە پلەی شەهیدی گەیشتن ..!!

بەڵێ لەم كۆمەڵە موسڵمانە پاكە تەنها یەكێكیان تێدا دەرچوو ، ئەویش ناوی ( كەعبی كوڕی زید ) بوو ، بە هۆی بریندابوونی كە لەو كاتەدا لە هۆش خۆی چوو بوو ، وایان زانی مردوە ، بەڵام دواتر رزگاری بوو لە دەستیادا ، ئەو هاوەڵە لە غەزای خەندەق شەهید كرا ..!! بەڵام دووانی تر لە هاوەڵە بەڕیزانە ئەوانیش رزگاریان بوو و لەم هەڵمەتەدا و ئەوانیش لە گەڵ ئاژەڵەكانیا رۆیشت بوون ، خەریكی ئاژەڵە كانیان بوون ، ئەوان لەوی نەبوو ، كە ئەم كارەساتە ی بئر معونە روویدا ، ئەوانیش (عمری كوڕی ئومە ی ضمري ) ، ( منذري كوڕی عوقبە كوڕی عامر ) بوون ، بەڵێ ئاگایان لە هیچ شتێك نەبوو ، بەڵام كاتێك تەماشای ئاسمانیان كرد ، بینیان وا باڵندە بەسەر ئەم ناچەیە دا دەسوڕیتەوە ، واتە: بئر معونە دا ، ئەوانیش هەر دووكیان ووتیان : دە بەخوا بوونی باڵندە شتێك روویداوە ..!! بەڵێ كاتێك گەڕانەوە بینیان وا براكانیا لە خویندا نقووم بوون خەڵتانی خوێن بوونە ، هەروەها هەر دووكیان سەیری یەكیان كرد ، (منذر) بە (عمر) ئەڵیت : چی بە چاك ئەزانیت ..؟!ئەویش ئەڵیت : وای ئەبینم خۆمان بگەینە خزمە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ، بەڵام (منذر) ووتی : بەڵام من پێم خۆش نیە لە شوێنێك دا ك (منذری كوڕی عمر ) واتە ئەمیری موسڵمانەكان تێدا كوژرابی من خۆم بپارێزم ، بێشم خۆش نیە هەواڵە كە بگەیەنیم ..!! بەڵێ (منذر) دەستی دایە كوشتار كردن لە گەڵ كافران دا هەتا بە پلەی شەهیدی گەیشت ، (عمر) جەنگی كرد هەتا بەدیل گیرا ، بەڵی كاتی (عمر ) هەواڵی بە (عامیری كوڕی توفەیل ) كە ئەو لە تیرەی (مضرە ) ئەویش قژی پێشەوەی كەمێك بری و ئازادی كرد ،بەڵێ ئالەم كاتەدا كە (عمر ) ئازاد كرا ، گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە ، لە ریگادا دوو پیاوی نەوی عامیری بنی و ئەویش خۆی شاردەوە تا ئەوان خەوتن چووە سەریان هەردوو كیانی كوشت ، بەڵام (عمر ) بی ئاگابوو لەوی كە ئەم دوو پیاوە ئەمانیان لە پیغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتبوو ...

ی

ئەوانی کوشت  چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکە ی بۆ گێڕایەوە و کە چیان بەسەر هات بەدەست سەرکردەی زاڵم و ستەکاری وەك (عامیری کوڕی توفەیل ) هەروەها باسی کوشتنی ئەم دوو پیاوەشی کرد ، کە لەڕێگادا کوشتی لە تۆڵەی ئەو موسڵمانانەی کە لە بئر معونە بەدەستی نەوەی عامیر و نەوە ی سلیم شەهید کران ، بەڵام پێغەمبەری خوا زۆری پێ ناڕەحەت بوو بە کوشتنی ئەو دوو پیاوەی نەوەی عامیر و چونکە ئەمانی پێ دابوون ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بە عمری فەرموو : ( لقد قتلت قتيلين لاديهما ) واتە: دوو پیاوت کوشتوون و مەگەر من خوێنەکەیان بدەم ، پاشان (عمر ) ووتی : (هذا عمل ابي البراء ، قد لهذا كنت كارها متخوفا ) واتە: ئەمە کاری عامیری کوڕی توفەیل بوو ، من کارەکەم بەدل نەبوو و ئەش ترسام ..!! بەلی دەنگوباسی ئەم شەهیدانەگەیشتنەوە شاری مەدینە ، زۆر پێ خەمناك و دڵ گران بوون ، چونکە کارەساتێکی زۆر گەورە بوو ، ئەوەندەی کارەساتی جەنگی ئوحود ڕووداوی شاندەکەی رجيع گەورەتر بوو ،چونکە لە (٧٠) پیاو تەنها دوو پیاو تیدا ڕزگاریان بوو ، لەم کارەساتە دڵ تەزێنە دا ، ئەوانە هەر هەمووی لە هەر موسڵمانەچاکەکانی شاری مەدینە بوون ، ئەوانە بە کەسانی قورئان خوێن و ماموستای فێرکردنی ئاینی ئیسلام ناوزند دەکران ، پیان دەووترا (القراء ) ، بەلی کارەساتی شەهیدانی (رجيع ) و شەهیدانی (بئر معونە) زۆر کارەساتێکی گەورە بوو ،ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵ گران بوو ، هە ر بۆیە بۆماوەی مانگێك لە پێنج فەرزەی نوێژدا بەتایبەتی نوێژی بەیانی دا ، دوعای دەکرد لە هۆزەکانی نەوەی سلیم و  نەوەی رەعل و نەوە ی زەکوان  و نەوەی عوصییە کرد ،شایەنی باسە (خوای گەورە ) تۆڵەی لە (عامیری کوڕی توفەیل ) کردەوە ، دوای ئەوەی کە رەبیعە ئامۆزای هەواڵی دایە بی کوژی ، ئەویش لە ترسان گەیشتە شاری مەدینە لە ماڵی ئافرەتێکی نەوەی سەلول بوو ، تووشی جۆرە تاعونێك بوو ، کە ئاژەڵ یان ووشتر تووشی دەبوو ، لەدا خان سواری ئەسپەکەی بوو ، لە دەشت ودەر دەگەڕان هەر بەسواری ئەسپەکەی تۆپی گیان دەرچوو ، بی کەس بی دە رلە چۆڵەوانی تۆپی بوە خواردنی باڵندەکان ، هیوادار م هەر کەسێك دژایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئاینەکەی بکات یان دژایەتی فەقیر هەژاران و لی قەماوان بکات ، بەدری ئەو پیاوە ستەکارە بچێت ، چونکە زۆر لەم پیاوە خراپانەمان بەچاوی خۆمان دیوە، وە چاوەڕوانی ئەوانی تریش دەکەین ، لەکاتی ئیستا دا وا خەڵك بەدەستی زاڵم ستەم کار دەناڵێنی ،چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله  عليه وسلم ) رحمة للعالمين و هەر کەس دژی خۆی و دینەکەی بووەستی خوا ڕیسواو سەر شۆری ئەکات ، ئەی کاتە پەندی زمانە ..!!

ئ
واقیدی دەفەرموویت : هەوالی کارەساتی رووداوی ( رەجیع ) و ( بئر معون ) بە یەك شەو بە پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشتووە، هەروەها لە سیرە ابن هشام دا هاتووە ، کە ( عمر ) گەیشتە دوو پیاوەکەی نەوەی عامیر یان نەوەی کیلاب ، لە سەر ری ( قنات ) ئەوان لە بن درختیکدا خەو تووبن ، ( عمر ) هەر دووکیان کوشت ، لە تۆلەی کارەساتی بئر معونە ، هەروەها نەی زانی کە ئەمانیان لە پیغەمبەر ﷺ وەرگرتووە ، ئەوە بوو پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : دەبیت خوینەکەیان بدەم ، دەبیت سەر قالی کۆکردنەوەی فیدەیەکەی بم لەلای موسلمانان شاری مەدینەو جوولەکەکانی شاری مەدینە دا . ابن هشام ئەلیت : ئەمە بووە هۆی غەزای نەوەی نضیر ، یان رووداوی ( بنی نضیر ) ، هەروەها ( ابن سعد ) لە ( انسی کوری مالك ) دەگیرتەوە _ خوا لیان رازی بیت – دەلیت : هەرگیز نەبینیوە پیغەمبەری خوا ﷺ بەئەندازەی هەوالی هاوەلانی بئر معوونە ئەوەند خەم پەژارە دلی داگرتبیت .

السیرەابن هشام ٣/١٨٣- ١٨٨ ، زاد المعاد ٣/١٠٩-١١٠ ، البخاری ٢/٥٨٤-٥٨٦ ، البخاری ٣/٥٨٧-٥٨٨ .

ئ

## هاوسەرگیری پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل خاتوو ( زینب کچی خوزیمە ) :

خاتوو ( زینب کچی خوزیمەی کوری حاریث هیلالی ) لە هۆزی بنی عبدالمنافی کوری هیلالی کوری عصعصە هەژاران دەدا ، پیغەمبەر ﷺ بەلی لە سەرتای سالی چوارەمی کۆچی دا ، مارەی کردو هاوسەرگیری لە گەل کرد ، بۆ ماوەی هەشت مانگ لە لای پیغەمبەر ﷺ مایەوە پاشان کۆچی دوای کرد ، بەلی خاتوو ( زینب کچی خوزیمە ) پیشتر هاوسەری ( عبدالله ی کوری جحش بوو ، کە ئەو هاوەلە لە جەنگی ئوحودا شەهید کرا ، ئیتر پیغەمبەری خوا ﷺ وەك ریزیك لە شەهیدە ، هەستا بە مارە کردنی ( زینب ) کەدوای ئەوەی ئەم کارەساتەی بەسەر هات بی هاوسەر مایەوە ، پیغەمبەری خواش ﷺ بەچاکی زانی وەك دلدانەوەی ژنە شەهیدیك هاوسەرگیری لە گەلدا بکات ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ زۆری پی ناخۆش بوو بە تنها بە بیوەژنی بمینیتەوە ، هەر بۆیە خەلاتی کرد لە سەر چاکە کردن بۆی لە پاششەهید کردنی هاوسەرەکە ی ..!!

بی گومان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وصلم ) ئەو ئافرەتانەی کە هاوسەرگیری لە گەل کردوون ، هەر هەموویان هۆکاری خۆی هەبووە ، جا ئەوەیە بۆ بانگەوازی پەیامەکەی ( خوای گەورە ) بیت ، یان ئەوە یە ئەو ئافرەتانە بی کەس و لی قەوماو مابوونەوە ، هاوسەرەکانیان لە ریگای خودا گیانیان بەخیت کرد بوو چووبوونە کاروانی شەهیدانی ریگای ( خوای گەورە ) ، پیغەمبەری خواش ﷺ بە باشی دەزانی کە دل نەوایان بکاتەوە ئاگاداریان بیت ،جا چ بە هاوسەرگیری لە گەلیان یان بە یارمەتی دانی ئەو ئافرەتە لی قەوماوەنە ، کە هاوسەرەکانیا شەهید ببوون ، بەلی پیغەمبەر خوا ﷺ هیچ کام مانەی کە مارە کرد بوو ، لە بەرژەوەندی خۆی دانە بوو ، بەلکو هۆکاریکی تایبەت هەبوو ،بۆیە ئەم ئافرەتانەی مارە کردوە ، هەندیکیان بۆ پەیوەندی بتەوە کردنی هاوەلانی خۆی ، یان ئەو بوو چاودیری هاوسەری شەهیدەکان بکات ، دل یان خۆش بکات ، کە پیغەمبەری خوا ﷺ چاوی لیانە دەیان پاریزی ، دل یان ئارام دەکاتەوە ، بەلی یان ئەوە تا بۆ خۆی مارەی دەکردن ،یان بە هاوەلانی رادەگەیاند کەمارەیان بکەن ، بی گومان ئەمانیش لە سەر رەزامەندی خۆیان بوون ، نەوەك بەزۆر مارەکردن ، لە کاتی ئیستا دا بە هەزاران ئافرەتی بی پیاوەیان ئافرەتی ژنە شەهید ماوەتەوە کە سیك نیە بە هانی ئەم ئافرەتە داماوانە بچیت دل نەوایان بکات ، یارمەتیان بدات ، بەلکو ریسوا دە کرین لە نیو ئەم کۆمەلگایە علمانیەتە دژە ئیسلام ، بۆیە ئەوە چاکەی پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل ئەم ئافرەتانەی سەردەمی خۆی کردی لە میژوودا وینەی نیە ..!! بروانە : المفصل ی احکام المرأە ، عبدالکریم زیدان ( ٤٦٩/١١ ).

ئ

## هاوسەرگیری كردنی پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل ( ام سلمه )

( ام سلمه ) ناوی ( هند بنت ابی أميه حذافه بن المغيرة القرشية المخزومية ) كە خیزانی ( ابو عبدالله كوری عبدال الاسدی ) ئامۆزای بوو ، هاوسەرەكەی واتە : ( ابو عبدالله كوری عبدال الاسد ) كوری پورزای پیغەمبەری خوا ﷺ واتە : ( ابو عبدالله كوری براء كچی عبدالمتلب ) بوو وە برای شری پیغەمبەر ﷺ بوو .بەلی ( ام السلمه ) لە گەل ( عبدالله ) هاوسەری كۆچی كرد بۆ حەبشە پاشان گەرانەوە بۆ شاری مەدینە ، دووبارە كۆچیان كردەوە بۆ شاری مەدینە ، پاش ئەوەی پیغەمبەر و موسلمانان كۆچیان كرد بۆ شاری مەدینە ، گفتو گویە كی ( ام سلمه ) و ( ابو سلمه ) پیش كۆچی دوای ( ابو سلمه ) ئەوە بوو ، ( ام سلمه ) بە ( ابو سلمەی ) ووت : پی گەیشتوە كە هەر ئافرەتیك پیاوە كە ی بمریت ، شوونەكاتەوە ، ئەوا بەهەشتی بە قسمەت دەبیت ، یان لە بەهەشت دا بە یەكتر دەگەنەوە ، جاوەر پەیمان بەیەكتر بدەین من شووناكەمەوە تۆش ژن نەهینیت ، ووتی : گیرایەلم دەبیت ؟! ( ابو سلمه ) ووتی : بەلی . ئەگەر من مردم تۆ لە دوای من شووبكە ..!! هەروەها ئەم دوعایەشی كرد ووتی : خوا یە لە پاش من هاوسەریكی لە من باشتر بی ببە خشیت بە ( ام سلمه ) با خەمباری نەكات و یارمەتی بدات چاكەی لە گەل دا بكە ، جا كاتیك ( ابو سلمه ) كۆچی دوای كرد یان وەفاتی كرد ، ( ام سلمه ) ووتی : كی بیت لە ( ابو سلمه ) چاكتر بیت ..؟! زۆری پی نەچوو پیغەمبەر ﷺ هات و خوازبینی كرد لە برازاكەی یان لە كورە كەی . سير اعلام النبلاء ٢/٢٠٣ .

بەلی حیكمەت لە هاوسەر گیری پیغەمبەر ﷺ لەگەل ( ام سلمه ) تەنها بۆ هاوسەرگیری حەلال و شەهوات نەبوو ، چونكە ( ام سلمه ) كۆمەلیك مندالی هەتیوی هەبوو ، بە لكو لەبەر پلەو پایەی ( ام سلمه ) چونكە شیرە ژن بوو ، هەر كەسیك تەماشای بیرو بۆچوونی ( ام سلمه ) بكات ئەو راستیە بۆ دەر دەكەویت لە رۆژی حودیبیە ، یان بۆ دل دانەوەی بۆ مردنی هاوسەرە كەی پیغەمبەر ﷺ مارەی كرد یان خوازبینی كرد ، هەروەها ( ام سلمه ) لە نەوەی مەخزوم بوو ، ئەوان گرنگترین تیرەی هۆزی قورەیش بوون ، بەلی ئەم هاوسەر گیریە كاریگەی خۆی دە بیت لە سەر كە سانیك كە ئالای جەنگیان هەلكردووە دژی پیغەمبەر موسلمانا ، بەلی ( ام سلمه ) لە سالی ( ٦١ ) كۆچی دا وەفاتی كردووە ، هەروەها ( ٣٨٨ ) فەرموودەی لە پیغەمبەری خوا ﷺ گیراوەتەوە ،هەروەها بوخاری و مسلم ( ١٣ ) فەرموودەیان بە صحيح هیناوە ، هەروەها جگە لە ( ٣٠ ) فەرموودە تەنها لە لای بوخاریە .

ئ

## ( زیدی کوری ثابت ) فێری زمانی جوولەکە دەبێت لەساڵی چوارەمی کۆچی دا

بەڵی هەر لەم ساڵەدا ( زید ) فێری زمانی جوولە کەدەبێت و ، وە فێری کتێبی جوولە کەکان دەبێت ، هەروەها لە ( خاریجەی ) کوری زید دەگێریتەوە -خوا لی یان رازی بێت – دەفەرموویت : ( پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد ، فێری نووسینی جوولەکەکان بێت بۆ ئەوەی نووسراوەکانی بۆ بخوێنێتەوە ).
صحيح البخاری كتاب الاحكام رقم ( ٧١٩٥ ).

بەڵی ( زیدی کوری ثابت ) لە ( ١٣ ) رۆژ دا فێری زمانی جوولە کە بوو ، هەروەها لە ریوایەتیکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە شاری مەدینە ، (( زیدی کوری ثابت ) بردە لای ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە گەنجێکە لە نەوەی نەجار ،چەند سوورەتێکی لەبەر لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز ، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پی خۆشحال بوو ، فەرمووی : ئەی ( زیدی کوری ثابت ) خۆت فێری نووسینی جوولەکە بکە بۆم ، چونکە سویند بە خوا من لەوان دڵنیا نیم ..!! ( زیدی کوری ثابت ) دەڵێت : منیش لە ماوەی ( ١٥ ) رۆژ دا تەواو فێر بووم ، دوای ئەوە نووسراوەکانی جوولەکەم بۆ دەخوێندەوە وەلامیشم دەدایە وە ).کاتب وحی جامع القران ( ٨٠-٨١ )صفوان داودی . بەڵی ئەم هەواڵەش گرنیگی زۆر دەردەخات بۆ دەوڵەتی ئیسلام یان دەوڵەتی مەدینە ، چونکە دەبێت زمانی ئەو کەسانەبزانرێت کە لەدەور بەری مەدینەدان یان زمانیان جیاوازە ، دەبێت نوسراوەکان بەدەستی خۆیان بنووسن یان بخوێنەوە، خۆ ناکرێت کەسێکی تر سەریی نوسراوەکانی دەوڵەتی ئیسلام بکات ، زۆر گرینگە کە لەزمانی دوژمنەکانی ئیسلام و زمانی دوژمن بگەیت ، هەر بۆیە ئیستای بە ناو دوڵەتە کوردیەکە کە دەچنە دانوسان لە گەڵ دوژمنانی کورد یان ئەوانەی تەماعیان لە ئەم بەناو دەڵەتەهەیە ، ئەجن نەزان و جاهیل و نەخوێندەوارو ناکەچ بەچە دەبەن بۆ گفتو گۆ کردن ، یان هیچ زمانی دوژمن نازان هەر بۆیە رۆژ بەرۆژ تووشی شکست و داروخان دە بن ، چونکە نەفام پیشەوایەتی ئەم میلەتە هەژارە دەکات ، لە زمانی کوردی تەواونیە دەبیتە شاندی دانوسان بۆ ماف کانی کورد ......؟!!!

بەڵی( زیدی کوری ثابت ) لە سەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانی لەبەر کرد ، یەکێکیش بوو لە نووسەرەکانی وەحی قورئان لەبەردەستی پێغەمبەر ﷺ هەر ئەویش بوو ، لەسەردەمی ( ابو بکر صدیق ) ( عوسمانی کوری عفان ) هەموو قورئانی پیرۆزی نووسیەوە ..!!

ئ

## غەزای (بني نضير )

بەڵی غەزای (بني نضير ) لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچی دا ، ڕوویدا ،وەك پێشتر باسمان کرد ، جوولەکە زۆر داخ لە دڵ بوون بۆ پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانەکانی شاری مەدینە ، بەڵام جوولە کە هەمیشە ترسنۆك و حیزەڵەن وەك هاوشێوە کانی کە ئێستا دەست هەڵاتی ئەم جیهانەیان لە دەست دا یە ، بە هۆی سەگەکانیان و جاسووسەکانیان دەست هەڵاتیان لەدەست ماوە ،بەڵام دڵ نیام ڕۆژی خۆیان دادێت و زۆریش نزیکە هەر وا بە زوڵم ستەم کردن نامێنەوە ، بەڵی لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ دا بە ئێستاشەوە تەنها خەریکی ئاژاوە فتنەو ئاشووب و پرو پاگەندە نانەوە بوون لە ناو خەڵك دا ، ئێستاش هاوشێوەکانی جوولە کە هەمان ڕەفتاری جوولەکەی سەردمی پغەمبەری خوا ﷺدەکەن ، بەڵی ئەوان تەنها لە شاری مەدینەو دەوروبەری دا خەریکی ئاژاوەو فتنەو ئاشووب خراپەکاری و فروفێل و تەڵکە بازی بوون ، هەر بۆیە هەوڵی ئاژاوەیان دەدا لە بنەوە بەفروفێل جاسووی کردن ، جا دوای دەر کردنی نەوەی (قينقاع ) کە پێشتر باسمان کرد وە کوشتنی (کعب کوڕی الاشرف ) گەورە پیاوی جوولەکە ترسیان چووە دڵیانەوە ..

بەڵام دواتر کە موسڵمانەکان لە جەنگی ئوحودا ،کۆمەڵێك لە هاوەڵانی شەهید کران ، هەروەها دوای ڕووداوی شاندەکەی (ڕەجیع ) و (بئر معوونه ) پۆلێك لە هاوەڵە کانی پێغەمبەر ﷺ شەهید کران ، ئەم سی ڕووداوە زۆر دڵ تەزین بوو ، بۆ پێغەمبەر و موسڵمانەکان ، بەڵی بەم ڕووداوانە جوولە کەی ناپاك ترسیان شکاو ، دەمیان بەڕەڵا بوو ، بەڵام لە هەمان کاتدا پێغەمبەر ﷺهەر ئارامیان لە گەڵ گرت ،کەچی سەرەرای ئەوەش کەوتنە پیلان گێری بۆ لەناو بردین پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵی باسی ئەوەشمان کرد کە جوولەکەکانی (نەوەی قينقاع ) پێش هەموو جوولە کەکان ناپاکیان لە گەڵ موسڵمانا دا کرد ، وە ئەو (عهد ) و پەیمانەیان شکاند ، کەلە گەڵ پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان بەستبوویان ، بەڵام ئەوە بوو (بني نضير ) هەمووکات لە پیلان دا بوون دژی موسڵمانا ، تا کە ئاواتیان ئەوە بوو موسڵمانەکان بە تەواوی لە ناو بچن ، هەر بۆیە بڕیاریاندا بە هەر شێوەیەك بێت ، دەست لە پێغەمبەری خوا (صلى عليه وسلم ) بوەشێنن و وە لەناوی ببەن ، بەنیازی ئەوەی کە ئاینەکەشی لە ناو بچێت ،بێ گومان (بني نضير ) چاوەروانی ڕۆژێك بوون کە ئەو هەڵەیان بۆ بڕخسێت یان دەست بکەوێت ، بۆ لە ناو بردنی موسڵمانان و پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە جوولەکە زۆر دڵ گران ببوون بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاینی ئیسلام ، هەروەها ئەم ئاینە لە گەڵ بەرژەوەندیە کانی جوولەکە نەدە گونجا بەئێستا شەوە ، ئەبینین ، وا هاوشێوە کانی یان سەگەکانی ژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن ، هەر وەك جوولەکەی (بني نضير ) و چونکەلە گەڵ بەرژەوەندیە کانی ئەوان دا ناگوجێت .

ئ

## بەلی هۆكاری بەرپاكردنی غەزای (بنی نضیر )

١-هەولوەشاندنەوەی (بنی نضیر ) بۆ ئەوە پەیمانەی كەبە پیغەمبەر ﷺ دا بوو ، كە بە هیچ شیوەیەك دوژمنە كانی ئیسلام و موسلمانان لە خۆ نەگرن ، هەر بە ئەوەندەش راوە نەستان كە چاوساغی دوژمنانی ئیسلام بوون ، بۆ هیرش كردنە سەر خالە لاوازەكانی شاری مەدینە ..!! ئەم كارە یان لە غەزای (السویق ) دا ئە نجام دا ، چونكە (ابو سفیان ) لە پاش جەنگی بەدر نەزری كرد بوو ، كە (بنی نضیر ) سەری تەرنەكات لە جنابەت تاكو هیرش نەكەنە سەر شاری مەدینە ، جا كە بە (٢٠٠ ) سوار چاك هاتن بەرەو شاری مەدینە ، سەرۆكی یان سەرگەورەی (بنی نضیر ) كە (سلامی كوری مشكم ) بوو، لە گەلی راوەستا و میواندار ی چاكی (ابو سفیان ) ی كرد ، هەوال و خبری شاری مەدینە بە (ابو سفیان ) وە ك بلین : سیخوری كردن لە دەولەتی مەدینە یان دەولەتی ئیسلام ، خیانەت و نا پاكی كرد بۆ موشریكانی قورەیش،

٢-هەولدان بۆ كۆمەل كوژی پیغەمبەر ﷺ لە گەل هاوەلانی دا ، بەلی كاتی پیغەمبەری خوا ﷺ كاتی لە گەل هاوەلانی دەر چوو بۆ (قوباء ) بۆ لای مالە كانی (بنی نضیر ) بۆ ئەوەی خوینی ئەو دوو پیاوە بدە كە (عمری كوری ئومیە ضمری ) كوشتی لە گەرانەوەی دا ، كاتیك ئەوان پەیمانیان لە گەل پیغەمبەر ﷺ بە ستبوو ، بە لام ئەو بە هەلە كوشتنی ، بۆ كۆكردنەوەی فیدایە یان پارەی خوینی ئەم دوو كەسە ، جوولەكە كانی (بنی نضیر ) بە روویەكی گەشەوە پیشوازیان لە پیغە مبەری خوا (صلی الله وسلم ) كە چی لە ژیرەوە خەریكی پیلان گیری بوون بە كوشتنی پیغەمبەر ﷺ كۆمەل كوژی هاوەلە كانی پیغە مبەر ﷺ ئەم پیلانەشیان وا بوو ، كە كاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناویان بۆ كۆكردنەوەی فدیە ی خوینی ئەم دوو كەسە ، هەستن بە نەخشەو پیلانیكی قیزەون نەمەدرانە بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لە سەر دیواریكی مالە كانی (بنی نضیر ) بە هەلگرتنی بەردیكی گەورە بۆ سەر پیغەمبەر ﷺ یان پیدادانی بەردیكی گەورە بە پیغەمبەر ﷺ، بەلام پیغەمبەر (صلی الله علیەوسلم ) لە ژیر چاودیریو پاراستنی (خوای گەورە ) دایە ، بەلی هەوال و وەحی لە ئاسمانەوە پی گەیشت كەوا ئە جوولەكە نا پاكانە بە نیازی كوشتنی ئەون ، هەر بۆیە كە پی زانی ئەوانە نا پاكی لە گەلدا ئەكەن ە بە پەلە هەستاو گەرایەوە بۆ شاری مەدینە ، دواتر هاوەلە كانیش بەدوای دا هاتن ،بەلی ئەم كارەش تەنها بۆ كوشتنی پیغەمبەر ﷺ نەبوو بەلكو بۆ لە ناو بردنی بانگەوازی ئیسلام هەمووی بوو ..!!

ئ

هەر لە بارەیەشەوە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَنْ يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾المائدە ١١ . واتا : ئەی ئەوانەی باوەر تان هیناوە یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لە سەرتان کاتێك هەندیك ویستیان دەستدریژی بکەنە سەرتان ، خواش دەست دریژیەکەی راگرتن و ئیوەی پاراست ، دەی کەواتە لە خوا بترسن و پاریزگار بن ،دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەست تا هەمیشە فریا یان بکەویت و لە پیلانی دوژمنان بیان پاریزیت ..!! هەروەها لەیدانەوەی زانایانی تفسیری قورئانی پیرۆز بۆ ئەم ئایەتەی ( خوای گەورە ) کە دابەزاندووە بۆ سەر پیغەمبەر ﷺ و موسلمانان ، ئەوەی کە ووتویانە : ئەم ئایەت ی دەربارەی ( بنی نضیر ) کە نەخشەو پیلانیان دانا بوو بۆ کوشتنی پیغەمبەری خوا ﷺ ( خوای گەورە )ش ئەم ( نیعمەتە ) باشەی بە پیغەمبەر ﷺ و موسلمانان دا وە پاراستنی لە و نەخشەو پیلانەی ناپاکانی جوولەکەی ( بنی نضیر ) بەلی بووە ئەوەی رزگار کردنی پیغە مبە ر ﷺ لەو نەخشەو پیلانە قیزەونە دا ، بەلام ( خوای گەورە ) ئەم پیلانەی ئەوانی پووچەل کردەوە ..!! بەلی جوولەکەی ( بنی نضیر ) وەك پیشەی هەمیشەیان بەردەوام لە ئاواتی ئەوە بوون بۆ کوشتنی پیغەمبەر ﷺ بۆ قەلاچۆکردنی موسلمانان یان لەو بردنیان ،ئەو ئاوتەیان بیتەدی ، بەلی بۆ ئەم مەبەستە بریارایاندا بە هەر شیوەیەك پیت دەست لە پیغەمبەر ﷺ و موسلمانان بوەشینن ،بەلی بە دریژایی میژووی جوولەکە خەریکی ناپاکی خیانەت و جاسوویی و سیخوری کردن و پیلانگیری بوون ،بەرانبەر بە پیغەمبەران و هەروەها کوشتنیان ،جا ئە مجارەش وویسیان وەك پیشەیی هەمیشەییان ویستان پیغەمبەری خوا ﷺ بکوژن و لە ناوی بەرن ، ئەویش کاتی پیغەمبەری خوا ﷺ لە قەلاکانی ( بنی نضیر ) نزیك بووە چووە نەو خانووە کانیان ، یەکیك لە سەردارانی ( بنی نضیر ) لە گەل خەلکە کەی خۆیان کۆ بوونەوە بریاریاندا بە کوشتنی پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل هاوەلە کانی ، بەلی ووتیان : ئەم جارە هاتۆوتە ناو مان جاریکی تر وا بە ئاسانی نایەتەوە ناو مالە کانمان ، جا یەکیك لە ئیوە سەر کەویتە سەر دیوار یان سەر خانوو بەردیکی گەورە هەلگری و بخاتە بەسەری دا و بی کوژی ، با هەموو مان لەدەستی ئەو پیاوە رزگار ببین ، جا هەر لەم کۆ بوونەوەیەدا یەکیکیان کە سەرداریکی ( بنی نضیر ) بوو ، بەناوی ( سلامی کوری مشکم ) نارە زایی و رەخنە یخۆی دەر بری لە م نەخشەو پیلانە ناپاکەدا بە هەنگاویکی زۆر خراپ و مەترسی داری ناوبرد ، پی ووتن : شتی وەها نەکەن ، بە خوا ئەوەی نیاز تان کردووە لی ئاگادار ئەکری ، سەرەرای ئەوەش ئیمەو ئەوان پە یمان و بەلین و عهد لەنیوا نمان دایە ..!!

ئ
بەلام ئەم هەولەی ( سلامی کوری مشکم ) سەری نەگرت و بە قسەیان نەکرد ، هەولی ناپاکی خۆیان دا بۆ ئەنجامدانی ئەو پیلانە قیزەونە ، بەلی پرسیاریان کرد ؟! کی ئەو پیاوەیە کە دەبیت بچیتە سەر بان یان سەر دیوار بەردیکی گەورە بەسەری پیغەمبەر ﷺ دادە ؟! یەکیك لە بەدبەختە کانی جوولەکەی ( بنی نضیر ) بە ناوی ( عمری کوری جحاش ) کە خۆی تەرخان کرد بۆ ئەم کارە ..!!

بەلی بۆ کوژانەوەی نووری خوا لە سەر زەویدا ، وەنەبی هەر ئەم پیاوە بەدبەختە دژایەتی پیغەمبەری خوا ﷺ کردبی بەلکو زۆریکی تریش هەلیان داوە لە رابردوودا لە ئیستاش دا و کە زیان پیغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانان ئیسلام بە گەیەنن ، بەلام هەر هەموویان یەك چارە نووس چاوەریان ئەکات ، ئەویش ئەوەیە کە ببنە پەندی زمانە و سەر شۆری دونیاو قیامەت بن و خەجالەتی سەرشۆریی مایە یان بووە ،بەلی بەدبەخت یان نامەرد چووە سەر دیوار یان سەر بان ، بەردی هینان تا بیدات بەسری پیغەمبەر ﷺ ئەم وەحیە ی بۆ هات لە پیلانە پیسەی جوولەکەی ( بنی نضیر ) ئاگادار کرا ، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَنْ يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ المائدە ١١ . بە لی لە ئاسمانەوە نیگای بۆ کرا کە جوولە کەی ( بنی نضیر ) کە نیازایان وایە بی کوژن ، بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم هەوالەی پی گەیشت ، لە سەر خۆ هەستا و هیچ خۆی تیك نەدا ، یەك ووشەو قسەی لەگەل جوولە کەی( بنی نضیر ) دا نە کرد ، دوای ئەوەی هاوەلە کانیشی هەستان و شوینەکەیان بەجی هیشت واتە خانووە کانی یان قەلاکانی ( بنی نضیر ) ، بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ وەهای دەر نەکرد کە بە پیلانەکەی جوولەکەی ( بنی نضیر ) زانیوە ..!! نەوەك جوولە کەی ( بنی نضیر ) بە کەونە خۆ دەورەیان بدەن هەموویان بکوژن ، بی ئەوەی نیازی خراپ و نەخشەکەی جوولە کەئەنجام بدریت ، پیغەمبەر ﷺ گەرانەوە شاری مەدینە دا ،بەلی لە شاری مەدنەدا پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەوالی بە هاوەلە کانی دا کە جوولەکەی ( بنی نضیر ) بە نیازی نەخشەو پیلانی ئەوا پیس و قیزەون بوون بۆیان ، هەر بۆ یە پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەلویستە نامەردانەی جوولە کەی ( بنی نضیر ) وەها لە قەلەم دا کە پەیمان و عهد لەنیوانیان دا نەماوە ، چونکە ئەوان نیازیان خراپە بە پیغەمبەر ﷺ و موسلمانانادا ، هەروەها بریاری دا ئەم جوولە کە پیسانە لە ناوچەی ( یثرب ) یان ( مەدین ) دا دەر بکرین ..!!

ئ

بەلی ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ ( محمدی کوری مەسلەمەی ) نارد بۆ لای جوولە کەی ( بنی نضیر ) پی فەرموو ( إذهب إلى يهود بني النضير وقل لهم : إن رسول الله أرسلني إليكم أن أخرجوا من بلادي ، لقد نقضتم العهد الذي جعلت لكم مما هممتم بة من الغدر ، لقد أجلتكم عشرا ، فمن رؤى بعد ذلك ضربت عنقه ) . واتە : برۆ بۆلای جوولەکەی نەوەی نضیر و پی یان بلی : پیغەمبەری خوا ناردوومی بۆ لاتان کە ئەفەرمووی : لەم ولاتە دەرچن ، چونکە بەو نیازە خراپەی کە ویستان غەدر بکەن ئەو پەیمانەتان هەلوەشاندەوە کە پیتانم دابوو ، (١٠) رۆژ مۆلەتم بۆ تان داناوە ، جا لەوەو دوا هەر کەستان لەم وەلاتەدا ببینری لە ملی ئەدەم یان لە گەردنی ئەدەم ..!!

بەلی جوولەکەی ( بنی نضیر ) هیچ وەلامیکی ( محمد کوری مەسلەمە )یان نەدایەوە ، وە ئەوشیان زانی کە پیغەمبەری خوا ﷺ بە پیلانەکەی جوولەکەی ( بنی نضیر ) زانیوە ، بەلی بی گومان ئەو نەخشەو ریگا چاکەی پیغەمبەر ﷺ بۆ جوولە کەی ( بنی نضیر ) کاریکی یەکجار چاك و پەر لە حیکمەت بوو ، بەلام جوولەکە ( بنی نضیر ) هیچ جارەیەکی تریان نەما و ئەو مەر مالات و ووشترانەی کە بەرالیان کردبوون خیرا کۆیان کردنەوە ، هەندیك ووشتری تریشیان لە نەوەی ( اشجع ) بە کری گرت ، بە و هیوایە ی کە بار بکەن برۆن لە و ناوچەیە نەمینن ، چونکە هیچ ریگە جارەیەکیان نەما بوو ، چونکە ئەیان زانی ئەگەر هەر سەرکیشی یەك بکەن ، لە لایەن سوپا بەهیزەکەی ئیسلام گورزی کەمرشکینیان پی دەکەویت ، بەر گەلی شیرو پلەنگە کانی سوپای دامەزراوی ئیسلام نا گرن ......!!!!

بەلی کاتی ئەم دەنگوباسەی چۆل کردنی ( بنی نضیر ) یان دەر کردنیان لە ناوچەی مەدینەدا، گەیشتە سەرۆوکی موناڤیقان یان دووروان ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلوول ) زۆری پی ناخۆش بوو ، چونکە هەستی بە لە ناو بردنی خۆشی ئەکرد ..!! بەلی دوینی ( نەوەی قینقاع ) ئەمرۆ ( نەوەی نضیر ) سبەینی ( نەوەی قوریظه ) ئیتر کی پشت و پەنای سەرۆکی نیفاق بیت ..؟!! کەواتە هەر لەئیستاوە سەرۆکی نیفاق دووروان تیا چوون ..؟!! بەلی ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلوول ) کە بیری لەم بارو دوخە کردەوە کە وتە پەلە قاژەو ترس لەرز ، چونکە هەمیشە رەوشتی موناڤیق دوو رووان پەلە قاژە و ترس لەرز ، چونکە هەموو ژیانی بە نامەردی ترسنۆکی درۆ کردن خیانەت و ناپاکی و جاسوویی کردن و ئاژاوەنانەوە بەسەر دە بات ، سەرەرایی ئەوەش هەمیشە سەر شۆری بۆ ئەمینیتەوە لەدونیا و قیامەت دا ..

ێ

کەسیکی نارد بۆ لای (بنی نضیر ) کە دان بە خۆ دا بگرن شوینی خۆیان بەجی نەهیلن بۆ موسلمانەکان ، ئە گەر هاتوو جەنگ بە پابوو ئەوا (عبداللە ی کوری ئوبەی کوری سەلوول ) پشتیان دە گری و یارمەتیان ئەدات بۆ جەنگ کردن ، هەروەها ئەگەر (بنی نضیر ) ناوچەکەیان جی هیشت ئەوا ئەوانیش لە گەلیان دەر بچن واتە دووڕووە کان یان منافیقە کان ، بەلی سەرۆکی منافیقەکان بەنهینی ئەم هەوالەی بە جوولەکەی (بنی نضیر ) گەیاند و ئەوان تا دوا هەناسە لەگەلیان دا ئە بن ، هەروەها پی ووتن : لە ناوچەی خۆتان دەرنەچن ، و لەقەلاکانتان بمینەوە ، چونکە من لەگەل خزمەکانم عەرەبەکانی دوورگە (٢٠٠٠) هەزار کەسم لەگەل دایە ، دینەناو قەلاکانی ئیوە ، مەگەر دوا پیاومان بکوژریت چۆلی ناکەین ، ئا ئەوەتا نەوەی ( قوریظە ) و ( غطفان ) هاوکاری و یارمەتی تان بۆ ئەنیرن ..؟!!

بەلی ئەو هەموو وورە بەرز کردنەوەی سەرۆکی مونافیقان بۆ (بنی نضیر ) ئەوە بوو جوولەکەی (بنی نضیر ) وورەیان هاتەوە بەر و ، دوای ئەوەش جوولە کەی (قوریظە ) بە ئاشکرا پشتوانی خۆیان بۆ (بنی نضیر ) راگەیاند و ، هەندیك لە زانایانی فەرموودە تەکیدی ئەوە یان کردۆتەوە ،کەوە جوولەکەی (بنی قوریظە ) بەشداری یان کردووە لە م غەزای (بنی نضیر )دا ..!!

بەلی لە پاش ئەو هاندانەی سەرۆکی مونافیقان و نەوەی (قوریظە ) ، وەریان هاتەوە بەر خۆیان ، ئەوە بوو پیاویان نارد بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداریان کرد کەوا ئەوان شوین و مەنزلی خۆیان چۆل ناکەن ، وە چۆن پی یان خۆشە جی دە کە ن با بی کەن ..!! پاشان دەستیان کردن بە قایم کردنی قەلاکانیان لە کۆلانەکانیان سەرنگەری بەرگریان دانا ، وە دەستیان کردن بە هینانی بەردی گەورە بۆ سەر قەلاکانیان ، تا ئەگە ر موسلمانەکان هیرشیان کرد ئەوا بەرد بخەنە سەریان ، هەروەها خۆراکی یەك سال لە ناو خەزانەکانیان دانا ، بەلام خەمی ئاویان نەبوو چونکە لە ناو قەلاکانیان بیری زۆری تیدا بوو .. بەلی بیگومان سەرۆکی (بني نضير ) کە (حيي بن الاخطب ) بووە سەرۆکایەتی جوولەکەکانی (بني نضير ) ی دەکرد ، زۆر بی شەرمانە وەلامی نارد پیغەمبەری خوا ﷺ کە ئیمە دەر ناچیت لە قەلاکا نمان چیت پی خۆشە بیکە ..؟!!

ئ

بلى كه پيغەمبەرى خوا ﷺ كه وەلامەكەى جوولەكەى (بني نضير ) پى گەيشت فەرمووى (الله اكبر ) هاوەلە كانيش لەدواى فەرموويان (الله اكبر ) يەكسەر فەرمانى دا بە هاوەلانى بۆ ئابلووقەدانى جوولەكەى (بني نضير ) بدريت ، وە هەلمەت و ببريتە سەر قەلاكانى (بني نضير ) شاينى باسە قەلاكانيا يەكجار قايم و محكەم بوون ، هەر بۆيە ئەوان بى باكانە بەرگريان لە قەلاكانيان دەكرد بيگومان لە مانگى رەبيعى يەكەمى سالى چوارەمى كۆچى دا بەرانبەر سالى ٦٢٥ زاينى دا بوو ، بەلى موسلمانان هەلمەتيان بردە سەر قەلاكانى (بني نضير ) ، ئەوە بوو پيغەمبەرى خوا ﷺ (ابن ام كتوم ) كردە سەرو كارى شارى مەدينە يان ئەميرى مەدينە ، بەلى (ابن ام كتوم ) هاوەليكى كۆچ كەران بوو ، وە پياويكى نابينابوو ، بەلى ئەوە بوو بۆ ماوەى يانزە شەو ئابلووقەى يان گەمارۆى قەلاكانى جوولە كەى (بني نضير ) يان دا ..!! ئەوە بوو پيغەمبەرى خوا ﷺ بينى وا جوولە كەكانى (بني نضير ) بەرگريەكى بە هيز دە كەن بەهۆى قايم محكەمى قەلاكانيانەوە ، فەرمانى دا بە هاوەلانى خۆى بە برينى دار خورماكانى (بني نضير ) ، بۆ ئەوەى وورەى ترس لەرز لەدلى جوولە كەى (بني نضير ) بەرپابيت بە هۆى برينى دارخورما كانيانەوە ، چونكە ئەوان تەماعى دونيا چاوى كوير كردبوون ،بەلى جوولەكە بە دريژايى ميژوو هەر خەريكى مادە و پارە پەرستن بوون ، بەلى ئەو باخە دار خورمايانە لەدەستى جوولە كە دەرچوون ، كەوتنە دەستى سوپاى ئيسلام ، هەر بۆيە هاوەلان تەنها ئەم دار خورمايانەيان ئەبرى كە لاوازو بى بەر بوون نەك هەموو جۆرەكان ، تاكو وورەيان برووخيت ، ئەو دار خورمايانەش ئەو ترا (لينە ) خورماى ئەم دارانەش زياتر خواردنى ووشترو مەر مالات بوو ..!!

هەر كە جوولەكە ئەم هەوالەى برينى دار خورماكانيان بيست ، چاويان چووە پشتى سەرى قەدەميان شكاو ترس ولەرزيان لى نيش ، و هاواريان لى بەرز بوويەوە ، لە تەماعى خۆيان هاتنە سەر ئەوە بريارە كە خۆيان بەدەستەوە بدەن ..!! هەر ئەوە بوو جوولە كەى (بني نضير ) نارەزايان دەربرى هاواريان كرد : ئەى محمد !! تۆ جاران قەدەغەى فسادت ئەكرد ، هەر كەس ئەم كارەى ئە نجام بدايە بە شوورەيت لە قەلەم ئەدا ، ئيستا بۆچى دار خۆرما دەبرى دە سووتينى ..؟!

ئ
به لی بی گومان ئەم نارەزاییە ی جوولەکە کەس گویی بۆ ناگری و چونکە ئەمە جەنگ و شەر کردنە ، جەنگیش پیوستی بە نەخشەو پیلانی تووکمە هەیە بۆ سەرکەوتن تیدا ، نابیت رەحم بە دوژمنەکەی خۆت بکەیت دەفەرتی بدەی تی چونکە ئەو لە ناوت ئەبدات ، دەبیت نەخشەو پیلانك داریژ دریت بۆ رووخاندنی وورەی دوژمن ، جا ئەمە جنگە هەر نەخشەیەك بیت بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمن دا ،ئەگەر تۆ نەی کەیت ئەوا ئەو ئەنجامی ئەدات و لە ناوت دەبات ..!!بەلی ئالەم کاتەدا لە کاتی برنی دار خورماکان ، موسلمانەکان ئەم کارەیان پی قورس گران بوو ، هەر بۆیە ( خوای گەورە ) ئەم فەرمایشتەی دابەزاند کە پشت گیری لە نەخشەو پیلانەکەی پیغە مبەر ﷺ دە کات ، کەدەفەموویت ﴿مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾ الحشر ٥ . واتا : هەر دەرختیکی تەر تان بری بیت یان وازتان لی هینابیت و لەسەر بنجی خۆی مابیت ( لە خەیبەر دا ) بە فەرمانی خوا بووە ، و ویستی ئەوی لەسەرە ، تا تاوانباران و لە سنوور دەر چووەکان سەر شۆر و خەجالەت بکات ..!!

بەلی ئەگەر سەرنج بدەینە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز دە بینین یەك سورەت لە سورەتەکانی قورئان باسی غەزای ( بنی نضیر ) دەکات ئەویش سورەتی ( الحشر ) ، تەنانەت ( عبدالله ی کوری عباس ) ئەم سورەتەی بە سوورەتی غەزای ( بنی نضیر ) ناو بردووە لە صحیح بخاری دا هاتووە . بخاری : كتاب المغازی وباب فەرموودەی ( بنی نضیر ) رەقم ٤٠٢٩ .

بەلی ئەم سورەتە باسی ووردەکارەی کانی ئەم غەزای ( بنی نضیر ) دەکات ،لەگەل باس کردنی حوکمی دەست کەوتەکانی ئەم غەزایە ، ستایش و هەلویستی موونافیقان ،بەرانبەر بە جوولەکە کان ،بەلی کۆمەلی پەدندو وانە لە سورەتەدا ، واتا : سورەتی ( الحشر ) وەرگرین ، بۆ سوودە وەر گرتن لی ...!!!

ئ

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١) هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُمْ مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ (٢) وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ (٣) ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَنْ يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٤) مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ (٥) وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٦) مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٧) لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩) وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠) أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١١) لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ﴾ **الحشر ١-١٤** .

**پەندو وانەكان : لە سوورەتی ( الحشر ) :**

**١-سورەتەكە بە ستایش كردنی خوای گەورە دا دەستی پێ كردووە و گەردوونیش بە هەموو بوونەوەرەكانیەوە ستایشی خوای گەورە دەكەن ، ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ بەڵی هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەكان و زەویدان خوای گەورە پاك رادەگرن و ستایشی دەكەن ، خوای گەورە خاوەن دەسەلاتە و هەموو شتێك و لەژێر فەرمانیدایە ..!!**

**٢-ترس وسام لە سەر بازەكانی خوای گەورە : كە دەفەرموويت :** ﴿هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُمْ مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ **واتا : ئەو خوایە ئەو زاتەیە ، ئەوانەی بی باوەر بوون لە خاوەنی كتیب ، دەری كردن یانە هەلی كەندە لە شوینەكانیان یان لە جیگەكەیان ، و ناچاری كۆچ كردنی كردن لە ، یەكەم دەست پی كردنی كۆكردنەوەو دەر كردنیانیادا بۆ وەلاتی شام یان بۆ خەیبەر ..!! بە تەمای ئەوە نەبوون و گومانتان نەدەبرد ئاوا بە ئاسانی برۆن ، ئەوانیش گومانیان وانە بوو و كە بەراستی قەلاكانیان بەرگریان دەكات لە ویست و فەرمانی خوا ، ئەو سا ئیتر لە لایەكەوە خوا بەلای بەسەر هینان كە بەخەیالیاندا نە هاتبوون و حیسابیان بۆ نە كردبوو ، ئەو سا خوا ترسیكی فریدا یە دلیانەوە ، بەناچاری دەستیان كرد بە كاولكردنی خانووبەرە و مالە كانیان بەدەستی خۆیان ( مەبەست ( بنی نضیر ) كە بەدەستی خۆیان مالە كانیان كاول كرد ) وە دەستی ئیماندارن ، كەواتە : ئەی خاوەن بیرو هۆش و دووربینە كان دەرس و پەندو ئامۆژگاری وەر بگرن ، جوولەكە هەروا بۆیان ناچیتەسەر ..!!**

ێ

٣-ئەوە ی دوژمنایەتی خوا پیغەمبەرکەی بکات لە دوونیا و دوارۆژ بە سزای خۆی دەگات ، لەدونیا مالو سامانەکەی ویران دەبیت دەربەدەر دەبیت ..!! کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَنْ يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ واتا: خۆ ئەگەر خوا چۆلکردنی لەسەر بریار نەدانایە و ئەوە هەر لە دنیا دا سزای دەدان ، لە پیامەتیش دا سزای ئاگری دۆزەخ بۆیان ئامادەیە ، چونکە زۆر دلرەق و پیلانگیرن .. ئەو سزایە بەهۆی ئەووەوە بوو بەراستی ئەوانە دوژمنایەتی خوا پیغەمبەرەکەیان کرد ، ئەوەی دژایەتی ئاینی خوا بکات ، با چاك بزانیت خوا سزاو تۆلەی زۆر بە ئیش و ئازارە ..!!هەر درەختیکی تەتان بری بیت یان وازتان لی هینابیت و لەسەر بنجی ما بیت (لە خەیبەر دا ) بە فەرمانی خوا بووە و ویستی ئەوی لەسەرە ، تا تاوانباران لە سنوور دەچووەکان سەر شۆرو خەجالەت بکات ..!!

٤-(خوای گەورە ) باسی مال و سامانەکەی (بنی نضیر ) دەکات :

دەفەرموویت : ﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتا : ئەو دەستکەوت و مالە زۆرە لە جوولەکەی (بنی نضیر ) سەندووە بە خشیوویەتی بە پیغەمبەرە کەی ، ئیوە هیچ خۆتان ماندوو نە کردبوو بۆ بەدەست هینانی نە بە سواری ئەسپ بۆی چووبوون نەبەسواری ووشتر ، بەلکو ئەوە خوایە کە پیغەمبەرەکەی زال دەکات بەسەر هەر دەستە و تاقمیکداد کە بیەویت ، خوایش دەستە لاتی بەسەر هەموو شتیکدا هەیە ..!!

بەلی لەم ئایەتدا بۆمان رووندەکاتەوە ، کە ئەو مال سامانەی کە بە موسلمانان بەخشیوە بەبەی هیلاکی یان جەنگیکی سەخت بە وانی بەخشیوە ، چونکە موسلمانان بە ئاسانی فتحی قەلاکانی (بني نضري ) یان کرد ، بەلی کە بەو شیوە ئاسانە دەست پیغەمبەری خوا ﷺکەوت بەبی بە کارهینانی سوارچاك و ئەسپ و ووشتر ، بەتاییەتی بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ هەر بۆیە خەرجی سالیکی سوپای ئیسلام پەیدا بوو ، ئەمەش بۆ خەرج کردنی کەرەسە جەنگ بۆ سوپای ئیسلام لە پیناوی خواد . صحيح مسلم كتاب الجهاد باب حكم القى ء رقم (١٧٥٧ .

هەروەها (خوای گەورە ) دەست کەوتەکانی بەگشتی باس کردن لە ناوچەی موشریك و بی باوەران و ناپاك خیانەتکاران ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ واتا : ئەو دەست کەوتانە (خوای گەورە ) کە بەخشی بە پیغەمبەرەکەی لە خەلکی دیهات و شارەکانی جوولەکە (بنی نضیر ) ئەوە خوا بریاری لەسەر داوە کە بۆ پیغەمبەر و خزمانیەتی بۆ هەتیوان و هەژاران و ریبوارانیشە، بۆ ئەوەی ئەو سامانە تەنها لە نیوان دەولەمەندەکان ئیوەدا نەبیت ، جا ئەوەی پیغەمبەر ﷺ پی بەخشیوون وەر بگرن ، هەر فەرمانیکی پیدان بە گویی بکەن ، قەدەغەی هەر شتیکی لی کرن مەیکەن ، لە خوا بترسن ، چونکە بەراستی خوا بە توندی تۆ لە دەسینیت ..!!

ی

بەڵی کاتێك پێغەمبەری خوا ئەم دەست کەوتانەی جوولەکەی (بنی نضیر) دەست کەوت بانگی (ثابت ی کوری قیسي) کرد، پی فەرموو : (ادع لی قومك) واته : قومەکەت یان هۆزەکەت بۆم بانگ بکە ، ووتی : هۆزی (خەزرەج) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەڵکو هەموو ئەنصارەکان ، واته : هۆزی (اوس) (خەزرەج) ، بەڵی کاتێك هاتن پێغەمبەر ﷺ سوپاس و ستایشی (خوای گەورە) ی کرد و بۆ ئەم دەست کەوتانەی غەزای (بنی نضیر) ، هەورەها باسی فەزل و گەورەیی ئەنصارەکانی کرد ، فەرمووی : ئەگەر پێتان خۆشە ئەو دەست کەوتانە بەش دەکەم ، لە نیوان ئیوە و کۆچ کەران دا ، و ئەوان لە ماڵەکانتان بمینەوە ، ئەگەریش حەز دە کەن بەشی ئەوان دەدەم لە ماڵە کانتان دەر بچن ، هەردوو (سعد) سعدی کوری عوبادە) و (سعدی کوری موحاذ) ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵکو بیدە بە کۆچ کەران با هەر لە ماڵە کانیشمان دا بمینەوە) صحیح مسلم کتاب جهاد باب القیء(١٢٧٦/٣) رقم ١٧٧٥ .

شایەنی باسە لە پێشدا ئەگەر خوینەری بەریز لە بیری مابی ووتمان کە ئەنصارەکان باوەشیان بۆ کۆچ کەران کردەوە لە ماڵە کانی خۆیان نیشتەجییان کردن ، بوونە برا بۆ یەکتری بە ماڵ وسامانیان .

هەروەها ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ دەست کەوتەکانی غەزای جوولەکەی(بنی نضیر) دابەش کرد بە شی هیچ لە ئەنصارەکانی نەدا بە هەردوو هۆزی (اوس) و (خەزرەج)وە بەڵام تەنها لە ئەنصارەکان بەشی (ابو دوجانە) و (سوهیلی کوری حونەیف) نەبیت چونکە زۆر هەژارو نەدار بوون .شرح الزرقانی علی المواهب (٨٦/٢) .

٥-فەزلی کۆچ کەران و ئەنصارەکان :

هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ واتا : هەروەها لەو دەستکەوتانە ، بەشی کۆچ کەرانی هەژار دەبیت بدریت ، ئەوانەی لە شوینە وارو سامانیان دوور خرانەتەوە و دەرکراون ، ئەوان بە تەمای بەخششی خواو رەزامەندیی ئەون و بەبی هیچ تەماعیك پشتیوانی لە خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی سەرخستنی بەرنامە کەیان دەدەن هەر ئا ئەوانە راستگۆ و راستانن ..!! ئا ئەوانە کە پیشتر ماڵ و شوینی خۆیان ئامادەکرد بۆ پشتیوانی لە کۆچ کەران و دڵ و دەروونی خۆیان رازاندەوە بە ئیمان ، ئەوانەشیان خۆش دەویت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لەدڵ و دەرونیاندا جی هیچ جۆرە حسوودی و بەخیلیەك نابیتەوە لەسەر ئەوەی کەبەشی کۆچ کەران دراوە بەشی ئەوان نەدراوە ، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن ، فەزلی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن ، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی رەزیل بپاریزیت و زاڵ بیت بەسەریدا ، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن ..!!

ئەوانەش بە شوین کۆچ کەران و پشتیوانانداا هاتن و تا کۆتایی دونیا ئەمە دوعا و نزایانە و بەردەوام دەلێن : پەروەدگارا لە ئیمە و لەبرایانەشمان خۆش ببە کە پیش ئیمە ریبازی ئیمانیان گرتەبەرو لە دلە کانماندا هیچ جۆرە رق و بوغزو کینەیەك مەخەرە دل مانەوە لەئاستی ئەوانەی ئیمانیان هیناوە وپەروەردگارا تۆ بەراستی بەسۆز بەخشندە ز میهرەبانیت ..!!

٦-هەلویستی موناڤیقەکان یان دوو رووەکان لەشاری مەدینە دا :

بەلی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەباسی بارودۆخی موناڤیقەکان دیار دەکات لەشاری مەدینەدا ، کە هاوپەیمانیان کردبوو لە گەل جوولەکەی (بني نضير ) دا کە چۆن بە درۆ بەلی نیان بە جوولەکەدا :

کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ﴾ واتا : ئایا سەرنجت نەداوە کە دوو روو و موناڤیقەکان لە خاوەن کتیب دەلین : ئەگەر ئیوە دەربکرین ، ئیمەش لە گەل تاندا دەر دەچین ، هەر گیز دژی ئیوە بەقسەی کەس ناکەین ، خۆ ئەگەر جەنگ تان دژ بکریت ئیمە پشتیوانیتان لی دەکەین ، بەمەرجیك ، خوا شایەتە کەوان بی گومان درۆزنن..!! سویند بە خوا ئەگەر دەربکرین لە گەلیاندا دەرناچن و ئەگەر جەنگیان دژبکریت ، پشتیوانیان لی ناکەن و ئەگەر پشتیوانیشیان لی کردن ، تاویك پشت هەلدەکەن و پاشان سەر کەوتوو نابن ..!!

بەلی بی گومان ئەمەیە رەوشت و سیفاتی موناڤیق دوو رووەکان ، لە هەموو بارودۆخیك دا پشت هەلدەکەن ، پشتیوانی هیچ کەسیك ناکەن بۆ کاری باشە ، بەلکو هەولی بلاو بوونەوەی فتنەو ئاشووب بلاو بوونەوەی خراپە کاری دەدەن ، لە ناو هەر هۆزیك هەر قەومیك دا ، یان لە ناو هەر کۆمەلگایەك میلەتیکدا ،ئا ئەوا ئیستا ئیمە لە سەردەمەی ئیستا بە چاوی خۆمان دە بینین ، دە توانین ناوی ئەم سەردەمە کە سالی ٢٠٢٢ زاینیە ناوی بنین سەردەمە موناڤیقەکان یان سەردەمی دوو رووەکان ، چونکە لەم سەردەمەدا موناڤیقەکان کار بەدەست دەسەهەلات دارو فەرمان رەوەی ئەم میلەتەن ، بەناوی هاتوون کۆمەلگا چاك بەکەن کاری باشە ئە نجام بەدەن ، بەلام نەخیر بەهیچ شیوەیەك وانیە ، ئەوانە خراپەکاری و فتنە ئاشووب و فسادی بلادەکەنەوە لە م وەلاتەدا بە بەلگەی ئەم ئایەتە ی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموویت : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ البقره١١-١٢ واتا : ئەوانە کاتیك پییان دە وتریت تۆوی گوناهو تاوان و خراپە کاری مەچینن لە زەویدا دەلین : بەراستی ئیمە تەنها چاکسازی دەکەین ..!! ئاگاردار بن کە بەراستی هەر ئەوانە تۆوی خرپە دەچینن بەلام بە هۆی لووت بەرزی و دەردەدارییانەوە هەستی پی ناکەن و خۆیان لی گیل دەکەن ..؟!!

ئ
بەلی لەو کاتە دا موسلمانان گەمارۆی جوولەکەی (بني نضير ) یان داو ، ئەوە بوو کە پشتر سەرۆکی مونافیقەکان (عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلوول ) هۆزی (غە تەفان) هاوپەیمانیان لە گەل جوولەکەی (بني نضير ) کرد بوو، کە ئەوان پشتیوانیان دەکەن و ئەگەر دەرشکرین ئەوان لەگەلیان دا ئەچن ، بەلام (عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلوو ) لە مالی خۆی دا پالی دا بۆوە ، هەر گویشی بەبەلینەکەی نەدا ، چونکە مەبەستی بوو ، کە فتنە و ئاشووب دروست بکات ، دژی موسلمانان ، هانی جوولەکەی (بني نضير ) دا کە خۆیان بەدست نەدەن شوینەکانیان جی نەهیلن شەر بکەن ، بەلی گە مارۆدانی جوولەکە بەردەوام بوو، ئەوانیش لە سەر قەلاکانیانەوە تیریان ئەهاویشتە چادرەکانی فەرماندەیەتی سوپای ئیسلام ، ئەوە شوینی چادرەکانیان گواستەوە بەهۆی تیر هاویشتنی جوولەکەکانی (بني نضير ) ، هەروەها یەکیك لە جووله کەکان کەناوی (غەزوەل ) بوو بەخۆی و (١٠ ) لە جوولەکە کانی ناو قەلاکان هاتنە دەروە بۆ دەست وەشاندن لە سوپای ئیسلام ، هەروەها (علی کوری ابو تالیب ) و (سوهیلی کوری حونەیف ) و (ابو دوجانە ) – خوا لی یان رازی بیت – خۆیان بۆ ئامادەکردن ، هیرشیان کردنە سەر هەر هەموویان کوشتن ، هەروەها (علی کوری ابو تالیب ) سە ری ئەو جوولەکەیەی کە ناوی (غەزوەل ) بوو هینەیەخزمەت پیغەمبەر ﷺ بەلی ئەو جوولەکەیە تیرهاویژەکی باشی جوولەکە بووە کە بدەستی (علی ) کوژار ..!!

بەلی هەر لەم کاتەدا کە جووله کە دەورەیان درا بوو ، دووله پیاونی جوولەکەی (بني نضير ) کە ناویان (یامینی کوری عومەیرە ) و ( ابو سعدی کوری وەهب ) بوون ، (یامینی کوری عومەیرە ) ئامۆزای (عمری کوری جحاش ؟ ) بوو کە ویستی بەردە گەورەکە بەسەری پیغەمبەری خوا ﷺ دا بدا ، هەر دووکیان واتە : (یامین ) و ( ابو سعد ) لە قەلاکانیان هاتنە خوارەوە ئەوەی تریان بە ئەویتری ووت : بەخوا تۆ چاك ئەزانی کە پیغەمبەری خوا یە ، ئەوە بوو لەسەر ئەوە ریکەتن کە خۆیا بگەینە سوپای ئیسلام و موسلمانەکان موسلمان ببن ، بەلی شەو بەنهینی لەقەلاکاننەوە هاتنە خوارەوە ، پەیوەندیان بە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد موسلمان بوونی خۆیان بۆ راگەیاند ، هەر چەندە ئەو چەند رۆژە کە گەمارووۆی قەلاکانی جوولەکە درا بوو ، (یامینی کوری عومەیرە ) هەولی لەگەل جووله کەدەدا کە خۆیان بەدەستەوە بدەن ، بەلام هەولەکەی بی سوود بوو ، هەر لەم چەند رۆژەش دا هەولی کوشتنی (عمری کوری جحاش ) دا کە ئامۆزای خۆی بوو، چونکە ئەو هەولی کوشتنی پیغەمبەری خوای ﷺ دا بوو ، بەلی (یامین )وەستی تۆلەی ئەم ناپاکەیە بکاتەوە کە جوولەکە پەیمانیان دا بوو بە موسلمانان پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلی نەك (یامینی کوری عومەیر ) دەیزانی کە محمد ﷺ پیغەمبەری خوایە ، بەلکو هەموو جوولەکەی دوورگەی عەرەبی دەیانزانی چونکە موژدەی هاتنی درا بوو ، بەجوولەکەکان .بەلی هەرواش بوو کە (یامینی کوری عومەیر ) بەلینی بە بە پیاویکی نەوەی قیس دا کە (عمری کوری جحاش ) ی بۆ بکوژیت و ئەویش پینج ئوقیە یان ویسق خورمای بداتی ، بەلی کابرای نەوەی قەیس هەلی بەدەست هیناو پیش ئەوەی (بني نضير ) خۆیان بەدەستەوە بدن (عمری کوری جحاش ) کوشت ..!!

ئ
بەلی لە پاش گەمارۆدانی سەخت لەسەر جوولەکەی (بني نضير) خۆیان رانەگرت ، دوای ماوەیەکی کەم نوینەرایان رەوانەکردت بۆ لای پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ دانووسان و گفتو گۆکردن ، پیغەمبەری خواش ئەوەی قبول کرد لیان و گفتوگۆ کردن ووتو ویژکردنی بەمەرج لە گەل جوولەکەی (بني نضير) ریکەوتنی بەمەرجی بە سەردا سپاندن بۆ چۆکردنیان لە قەلا کانیان :

١-جوولەکەی (بني نضير) ناوچەی (يثرب) بەجی دە هیلن بۆ کوی دە جن بە ویستی خۆی تیان .

٢-جوولەکەی (بني نضير) چ چەك و کەرەسەری جەنگی هەیە بەهەموو جۆرەکانیەوە دەبیت تسلیمی یان رادەستی سوپای ئیسلامی بکات ،کاتی شاری مەدینە بەجی بهیلن هەرچی چەکیان هەیە لەدەستیان نەمینی .

٣-جوولەکەی (بني نضير) چ مال و سامانیان هەیە دەتوانن بیبەن لە گەلە خۆیان جگە لە چەك کەرەسەی جەنگی .

٤-جوولەکەی (بني نضير) هەرچیان لی بەجی ئەمینی دەبیتە دەست کەوتی موسلمانان بۆ موسلمانان دەبیت .

٥-فەرماندەیاتی موسلمانان بەر پرسن لەسەلامەتی جوولەکەی (بني نضير) تاکو دەر دەچن لەشاری مەدینە و ناوچەی دەسەهەلاتی موسلمانان .

بەلی جوولەکەی (بني نضير) خۆیان پیچایەوە چی کەل وپەل بۆیان ئەبردا لە گەل خۆیان بردیان باری ووشترەکانیان کرد و شاری مەدینەیان چۆل کرد ، بەلی بی گومان ئەو جوولەکانەی (بني نضير) زۆر دەولەمەندو زەنگین بوون ، چونکە باری (٦٠٠) ووشتریان بار کرد ، کە زۆربەی بارە ووشترە کان ئالتون و زیو بوون ، هەتا ئەگیرنەوە (سلامی کوری ابو الحقيق) پر بە پیستی گایەك زیرو زیوی لە گەل خۆیدا بردوە ، هەروەها دەستی لە پیستە پر لە زیرو زیوە کەی ئەدا ئەی ووت : ئەم زیرو زیوە مان ئامادە کردووە تاکو زەوی پی بەرزو نزم بکەینەوە ، گەر ئیمە دار خورمامان بەجی هیشتبی ، ئەوا لە (خەیبەریش) دارخورما هەیە ..؟!!

ێ

بەلی بەدریژایی میژوو جوولەکە شەیداو ئاوات خوازی دەسەهەلات و مال و سامان و پارە و زیرو زیو بوون ،بۆیە هەموو کات هەولیان ئەدا بە پارە دەست هەلات وەرگرن ،بەلام بۆیان نەچووە سەر ،هەر بۆیە هەرچی ریگای ناشەرعی هەبوو گرتیانەبەر بۆ پەیدا کردنی پارە و دەسەهەلات ، کەچی هەر بە ئاواتی خۆ نەگەیشتن و ، هەر نەحەسانەوە ، وەك ئەم سەردەمەی بە ناو حوکمرانی نۆکەرانی جوولەی خۆ فرۆش ،بەلی کاتیك قەلاکانیان بەجی هیشت ، دیوارو کۆلانەکانیان دەرو خاندن تاکو موسلمانان سوودیان لی وەر نەگرن ، کاتیك جوولەکەی (بني نضير ) دەرچوون لە مەدینە خۆیان بە دامەزارو لە قەلەم ئەدا ، ژنەکانیا لە کەژاوەکانیا بار دەکردن ، کەژاوەکانیان ئەرازانەوە ، بە جل و بەرگی ئاوریشم و قەدیفەی کەسك و سوور ، بزیور زیوی زۆر لەبەر ئافرەتەکانیان بوو ، دەف شمشالیان لی ئەدا ، هەر وەك هەرەشەکردن لەموسلمانان بکەن ، هەر واش بوو ، هەروەك عەرەبە بت پەرستەکانی دوورگەی عەرەبی هەولیاندا هەموو خەلکی ناوچەکە لەدژی موسلمانان هان بدەن ، لە غەزای خەندق یان لاحزاب ، ئەوە بوو ( خوای گەورە ) موسلمانە کانی پاراست لەم پیلانە و نەخشەی دوژمنانی ئیسلام و موسلمانان ..!!

نەخشەیەکی تری جوولەکە لەم سەردمی پیش هاتنی ئاینی ئیسلام لە نیمچە دوورگەی عەرەبی ، ئەوە بوو کە هەر ژنیك مندالب بۆ نەمایە یان بمردایە ، ئەوا خراب بوو دە بووە سەر زاری خەلکی ، جوولە کە ئەو فیلەی دۆزیەوە ، واتە: هەر کەس نەیەویت مندالەکەی نەمری ئەوا با بیکات بە جوولەکە ، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە ئانی جوولەکە زیاد بکات لە نیمچە دوورگەی عەرەبی دا ، بەم پی یە هەندیك لە مندالانی ئەنصارەکان بوونە جوولەکە، کە (بني نضير ) مەدینەیان چول کرد ، ئەو عەرەبە نەفامانە کەوتنە گەریان لە گەل جوولەکەکان باریان کرد ، ئەوە بوو کەس و کارەکانیان نەیان هیشت ئەمانە لە گەل جوولە کەکان کۆچ بکەن لی یان قەدەغەکردن ، کەچی پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : با ئەوانیش برۆن لەگەل یان چونکە لە دینداری دا زۆری نیە ..؟!بەلی زانایان تفسیر هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە دەگەرینەوە بۆ کۆچ کردنی (بني نضير ) کە هەندیك لە مندالە کانیان کردبووە جوولەکە ئەوانیش ئەنصارەکان بوون بۆیە ئەم ئایەتە دا بەزی کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ **البقره ٢٥٦** . **سنن ابی داود** ( ١٣٣/٢ ).

ئ

واتا: بەهیچ جۆریك زۆر كردن نی لە وەرگرتنی بیروباوەری ئیسلام دا ، دینداری بەزۆری نابیت بكریت و دین بەزۆر نادریت بەسەر كەسدا ، چونكە بەراستی ریبازی چاك و دروست ، روون و ئاشكرا بووە و جیابۆتەوە لە گومرایی و سەر كەشی ،جا ئەوەی باوەری نەبیت بە – تاغووت – كە بریتیە لە : هەموو ریگەو ریبازو هیزو بەرنامە و لادان و بتیك ، و باوەری دامەزراو بهینیت بە خوا ، جا بی گومان ئەو كەسە دەستی گرتووە بە بهیزترین هۆكاری رزگارییەوە ، شوین دامەزراوترین بیرو باوەر كەوتووە ، كە هیچ پسان هەلەوشاندنەوەیەكی بۆ نیە و هەمیەشە پتەو و دامەزراوە ، خوای گەورەش بیسەرو زانایە ..!!

بەلی هەندیك لە جوولەكە كانی (بنی نضیر ) كۆچ یان بۆ (ازرعات ) وەلاتی شام كرد ، هەندیكیشیان كۆچ یان بۆ (خەیبەر ) كرد كە ئەم سی سەركردەی جوولەكەی (بنی نضیر ) یان لە گەل دابوو كۆچ یان بۆ (خەیبەر ) كرد ئەوانیش ئەمانە بوون : ( (حویەیی كوری ئەختب ) و (سلامی كوری ابو الحقیق ) و ( كینانەی كوری رەبیعە ) یان لەگەل دا بوو ، بە شیوەیەكی گشتی ناوچەی (خەیبەر) یان كرد بە دژایەتی كردنی موسلمانان و سوپای ئیسلام ، بنكەیەكی دژایەتی یان دروست كرد دژ بە موسلمانان ، لە كۆتایی دا (خەیبەر)یشیان قوربەسەرو مال ویران كرد ، هەروەها جوولەكەی (بنی نضیر ) تا پیان كرا كەل پەلەكەیان لە گەل خۆ برد و باری ووشترە كانیان كرد ، بەلام دەست كەوتی جەنگیش بەجی ما بۆ سوپای ئیسلام كە ئەمانەبوون : (٥٠) قەلغان و حەربە ، (٣٠٠ ) جلی درع و شمشیر ، هەروەها دانەویلەیەكی زۆر باخ و باخاتیكی زۆریان بەجی هیشت ، بەلی دەست كەوتە كان بەشیوەیەكی ریك پیك دابەش كرا بە سەر موسلمانە كۆچ كەرەكاندا (٣) لە ئەنصارەكانیش دەست كەوتی جەنگیان بەر كەوت ،كە لە پیشدا باسمان كرد ، هەروەها بە تیكشكاندنی جوولەكەی (بنی نضیر ) پشتی مونافیقەكانیش شكا بەتایبەتی (عبدالله كوری ئوبەی كوری سەلوول ) بەلی مونافیقەكان و دوو رووەكان هیچ پشتیان نەما بە یەكجاری پشتیان شكا ، چونكە ئەوان بەس لە هەولی هاندانی دوژمنای ئیسلام دا بوو ن ، بۆ دەست بەسەر داگرتنی شاری مەدینەو لەناو بردنی پیغەمبەری خوا ﷺ هاوەلەكانی ، سەرئە نجامی (بنی نضیر ) چۆن بوو ، سەرئە نجامی هەركەس هە ر قەومیك هەر هۆزیك و هە میلەتیك و هەكۆمەلیك دەستە تاخمیك و زالم وستەم كاری ئەوایە ، كە دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بكات و نەخشە پیلانی پیس و قیزەون داریژیت بۆ ئیسلام سەر ئە نجامی وەك (بنی نضیر ) و (بني قوریظة )و (بني (مصتلق ) و (بني قوریش ) و(بني سلیم ) و ( بني قینقاع ) و (بني الاسد ) و ( بني هوزیل ) ...هتد

ئ

**بەلی ئیسلام هەر لەسەر پی خۆیەتی سەربەرزانەماوەتەوە رۆژ بە رۆژ کۆمەل بەکۆمەل دینە ناو بازانەی ئیسلام فەخرو شانازی بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن ، رۆژ بەرۆژ روو لەزیاد بوون ٬ با ناحەزانی ئیسلام هەر لە خەفەتا بمرن بتوینەوە ، ئە وا ئەم ئاینە وەك چرایەکی رووناك رۆژ بەرۆژ گەشاوەترئەبیت ..!!**

ئ

## حەرام كردنی ( خمر ) یان ( ئارەق یان مەی یان شەراب )

بەلام دەگێرنەوە دەلین : حەرام كردنی ( خمر ) لەو كاتەی كە گەمارۆی یان ئابلوقە دانی جوولەكەی ( بنی نضير ) درا بوو ، ( خمر ) یان ئارەق حەرام كرا ،بەلی حەرام كردنی ( خمر ) لە سالی چوارەمی كۆچی دا بوو بە چوار قوناغ حەرام كرا :

**قوناغی یەكەم :** ( خوای گەورە ) تەنها ئاماژە بە بەروبومی تری دەكات ، وە ك لە سورەتی ( نحل ) داهاتووە دەفەرموویت : ﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ النحل ٦٧ . واتا : لە بەروبوومەكانی دارخورما و رەزی تریكانیش هەندی جار شتی سەرخۆشكەر یان بی هۆشكەر دروست دەكەن ،گەلیك جاریش بەرهەمی چاك و بە سوود (وەك : دۆشاوو میوژو شەربەت ..هتد ) بەراستی ئالەوەشدا بەلگەو نیشانەی ئاشكرا هەیە بۆ كەسانیك عەقل و ژیری خۆیان دەحەنەكار ، تا بیر بكەنەوە چۆن لە م دارو درەختە رەق و تەقانە ئەم بەرهەمانە دروست دەبیت ، چ كار خانەیەك لە ناوكی خورماو تری و میوە جۆرەكاندا حەشار دراوە تا لە پارودوخی خۆیدا بكەویتە كارو خزمەت بە ئادەمیزاد بكات ..هتد ..!!

**قوناغی دووەم :** ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّى تَغْتَسِلُوا﴾النساء ٤٣ . واتا : ئەی ئەوانەی باوەرتان هیناوە نزیكی نویژ مەكەون لە كاتیكدا ئیوە سەر خوش و بی هۆشن ، ( ئەمە كاتیك بوو هیشتا مەی یان خمر یان شراب حەرام نەكرابوو، بەتەواوەتی ، هە تاكو ئاسەواری سەر خۆشی یان بی هۆشی نەمینیت لە كاتی ئە نجام دانی نویژ دا ، وە دەزانن چی دەلین لە نویژەكەدا ، وە بەلەشی پیسەوە نویژ مەكەن ..!!

**قوناغی سی یەم :** ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾البقره٢١٩. واتا : پرسیارت لی دەكەن دەربارەی ( خمر یان ئارەق ) و ( قومار ) پیان بلی : لەو دووانەدا تاوان و گوناهیكی گەورە هەیە ، هەر چەندە چەند سوودیكیشان تیدایە بۆ خەلكانیك ، بی گومان گوناهەكەیان گەورەترە لە كەلك و سوود یان ، پرسیارت لی دەكەن كەچی ببەخشن ؟! پییان بلی : هەر چیتان لی زیادە دەتوانن بیبەخشن ، ئا بەو شیوەیە ( خوای گەورە ) ئەم بەلگەو فەرمانانەتان بۆ روون و ئاشكرا دەكات بۆ ئەوەی بیر بكەنەوە و واز لەو شتانە بهینن كە زیانیان زۆر ترە لە سوودیان ، وەچی بۆ هەر دوو جیهانتان چاكە ئەوە بكەن ..!!

ێ
**قوناغی چوارەم :** ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ  إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾ المائده ٩٠-٩١ . واتا : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هیناوە ،دڵنیا بن کە ( خمر یان ئارەق ) و ( قومار ) و ( گوشتی ماڵاتی سەر براو بۆ غیری ( خوای گەورە ) لە و شوینانەی کە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیسلام ، بورج حەرام و حەلال زانین بە هۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسن و لە کارو کردەوەی شەیتانن ، کە واتە ئیوەش خۆتانی لی دوور بگرن و خۆتانی لی بپاریزن ، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بهینن لە هەردوو جیهان دا ..!!

بەراستی شەیتان هەر دەیەویت لەریگەی ( خمر یان ئارەق ) و ( قومار ) ڕەوە دوژمنایەتی و بوغزو قینە بخاتە نیوانتانەوە و لە یاد کردنی خوا و ناوە پیرۆزە کانی ویلتان بکات ، هەروەها سست و تەمەڵتان بکات لە ئە نجامدانی نویژەکان بەشینەی ، ئایا ئیتر بەس نیە ؟! ئایا کۆڵ نادەن ؟!! جا هەر کە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە ، جار درا بە ناو شاری مەدینە دا کە ( خمر یان ئارەق ) حەرام کراوە ، ئەو سا ئیماندااران قەرابە گۆزە و دیزە و هەرچی ( خمر یان ئارەق )ی تیدا بوو ڕشتیانە بە کۆڵانەکانی شاری مەدینە ..!!

دیارە لە م قوناغی چوارەمەدا بە تەواوەتی ( خمر یان ئارەقە ) قەدەغەکرا یان حەرام کرا ، لە موسڵمانان ،هەر بۆیە بەئاسانی دەستیان لی هەڵگرت ، چونکە ئیمانیکی دامەزراوە لەدڵ یان دا هەبوو ، بۆ ئەم ئیسلامە ، بەڵی هەرکەس وهەر کۆمەڵیك یان هەر میلەتیك ئیمانیکی دامەزراو بەهیزی هەبیت ، زۆر بە ئاسانی دەست بەرداری حەرام و قەدەغەکراوەکانی ( خوای گەورە ) دەبیت ، هەروەها فەرمانەکانیشی جی بەجی دەکات بە بی دوو دڵی یەوە ..؟!

ئ

## غەزای ( نجد ) یان غەزای ( ذات الرقاع ) لە سالی چوارەمی کۆچی دا

دوای ئەوەی کە موسلمانەکان لە غەزای (بني نضير) ، سەر کەوتنیکی گەورەیان بەدەست هینا بەسەر ئەو مونافیق و ناپاکانەدا ،بەلی لەشاری مەدینەدا دەست هەلاتیان پەیدا کرد ،سەر شۆریش بۆ جوولەکە و مونافیقەکان مایەوە ، بەلی ئالەم کاتەدا پیغەمبەری خوا ﷺ خەمی جوولەکەکانی (بني نضير) نەما ، ئەوسا ئاوریکی دایە وە لەو عەرەبە موشریکانە کە لە دووربەری مەدینە دا بوون ، چاویان بڕییوو شاری مەدینە ، تەماعی دونیا چاویانی کویر کردبوو ، بەلی ئەو عەرەبە موشریکانە دوای جەنگی ئوحود بە نارەوا دەستیان لە موسلمانەکان دا وەشاند ، هاتنە سەر ئەوەش کە غیرەت بکەن هیرش بکەنە سەر شاری مەدینە .

نووسەرانی سیرەی پیغەمبەری خوا ﷺ رای جیاوازیان هەیە دەر بارەی ئەم غەزایە ، وەك بوخاری پی وایە لە پاش غەزای (خەیبەر) بووە واتە : دوای جەنگی خەندق یان الاحزاب ، هەروەها (واقیدی)،(ابن سعد) ئەلین لە سالی پینچەمی کۆچی دا بووە . بەلام (ابن اسحاق) پی وایە لە دوای دەرکردنی جوولەکەکانی (بني نضير) بووە ، هەروەها منیش ئەمە بەراست دەزانم چونکە هۆی ناپاکی جوولەکەی (بني نضير) هۆزە عەرەبەکان دوورگە ئەوە بوو دوای شکست هینانی موسلمانان لە جەنگی ئوحودا دەرکەوت ، کە موشریك ناپاك و مونافیق جوولەکە و عەرەبە بت پەرستە کان دوای جەنگی ئوحود بە ئاشکرا دەیان ویست دەست لە موسلمانان و سوپای ئیسلام بوەشینن . شایەنی باسە لە نیوان جەنگی بەدر و جەنگی ئوحودا هەلمەتیکی تری هیرش خرایە سەر ئەم هۆزانە ئەویش بەناوی (ذی مر) بوو ،کە لە پیش دا باسمان کرد ، کەواتە ئەم غەزایە لە جمادی یەکەمی سالی چوارەمی کۆچی دا بوو ،هەروەها هۆی ناونرانی ئەم غەزایە بە ( ذات الرقاع ) ئەوەیە کە (ابو موسى الاشعري ) - خوا لی رازی بیت -باسی کردووە کە ئەمامی بوخاری بۆ مان دە گیریتەوە صحيح بوخاری (٤١٢٨) دەلی: ئیمە لەو غەزایە دا بە پینج شەش کەس لە ووشتریك دا بە نۆرە سواری پشتی ئە بووین ، هەر بۆیە پەرۆمان لە پیە کانمان دەئالاند لە جیاتی پیلاو نەعلە ، پینەو پەرۆمان دەکردە پیە کانمان ، هەر لە بەر ئەمەشە ( ذات الرقاع ) ناونراوە چونکە (رقعة) واتە : پینە و پەرۆ ، یان پەرۆیان لە پی دا ئالاندوە لە جیاتی پیلاو ، وە هەندیکش ئەلین : ئەو شوینەی ئەم غەزایەی لی روویدا وە هەندیکی رەش و سپی بووە وەك پینە و پەرۆ .صحيح بوخاری (٤١٢٨) .هەروەها ووتراویشە غەزای ( نجد ) چونکە بەرەو ( نجد ) سوپای ئیسلام کەوتەری ..!!

ئ

هەروەها لە سیرەی ابن هشام دا هاتووە (٣/٩٧-١٠٠) دەلی : دوای ئەوەی کە پیغەمبەری خوا ﷺ ، جوولەکەکانی (بني نضیر ) لە شاری مەدینە دا دەر کرد و هەندیك چوونە بۆ وەلاتی شام هەندیکی تر چوونە بۆ (خەیبەر ) لە جمادی یەکەمی سالی چوارەمی کۆچی دا بوو ، لەم ماوەیە دا بوو و پیغەمبەری خوا ﷺ هەوالی پی گەیشت کە وا (بنی محارب و بنی ثعلبە و غطفان ) وە، سوپایەکی زۆریان کۆکردۆتەوە خۆ ئامادە دەکەن بۆ هیرش کردن سەر شاری مەدینە ، پیغەمبەری خواش ﷺ وەك مرۆڤیکی شارەزا لە هەموو بوارەکانی ژیان دا وە پیشەوایەك بۆ ئۆمەتەکەی و بۆ موسلمانان بەتایبەتی ، کە ئەم هەوالەی بیست ، یەکسەر دەست پیشخەریی کرد ، سوپای ئیسلامی ئامادەکرد ، بۆ دەست وەشاندنی لە دوژمنانی ئیسلام دا ، پیش ئەوەی ئەوان خۆیان کۆ بکەنەوە بەباشی ، سوپای ئیسلام هیرش بکات بەسەریان دادات و لە ناویان بەرن .

بەلی ئا بەم شیوەیە پیغەمبەری خوا ﷺ لەگەل هاوەلانی و سوپاکەی بەروە (نجد ) کەوتنە ری ، ئەلین : (ابو ذر الغفاري ) یان (عثمان بن عفان ) ی لەشوینی خۆی دا نا لە شاری مەدینە ،ئینجا بەری کەوتن لە شوینك بەناوی (نخل ) تووشی کۆمەلیکی زۆر لە (بني غطفان ) بوون ، بەلام کەوتنە بەرانبەر یەك دا ، شەرو جەنگ و کوشتن لە نیوانیاندا رووی نەدا ، بەلی هەر لەم غەزایە شدا نویژ کردنی ترس جی بەجی کرا یان دانراوە بۆ موسلمانان ، وەك (جابری کوری عبدالله ) - خوا لی رازی بیت - دە گیریتەوە دەلی : (فنودی بالصلاة ، فصلی بطائفة رکعتین و ثم تأخروا وصلی بالطائفة الاخری رکعتین ، قال : فکانت لرسول الله ( ) أربع رکعات و وللقوم رکعتان ) .رواه بخاري ٤١٣٦.

واتە : بانگدرا بۆ نویژ ، پیغەمبەر ﷺ هاوەلانی بەریزی کردە دوو بەش ، بەرەو رووی دوژمن وەستان ، دوورکات نویژی بۆ بەشیکیان کرد ، ئنجا ئەوان کشانەوە و دوای دوو رکات نویژیشی بەوانەی دی کرد و بەو شیوەیە پیغەمبەر ﷺ چوار رکعاتی ئە نجام دا هاوەلانیشی دوو رکعاتیان ئە نجامدا ...

ئ

هەر دەربارەی نوێژی ترس ئەم ئایەتەی ناردە خوارە وە کە ،( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَإِذَا كُنْتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِنْ وَرَائِكُمْ وَلْتَأْتِ طَائِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّوا فَلْيُصَلُّوا مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُمْ مَيْلَةً وَاحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ كَانَ بِكُمْ أَذًى مِنْ مَطَرٍ أَوْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَنْ تَضَعُوا أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُوا حِذْرَكُمْ إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا﴾ النساء ١٠٢ .واتا: کاتێك تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو هاوەڵاندا بویت ،وپێش نوێژیت بۆ دەکردن لە ( کاتی جەنگدا ) ئەوە با دەستە یەکیان لە گەڵ تۆ دا بوەستن بۆ نوێژ و چەکەکانیان پێ بێت ، جا کاتێك ئەم دەستەیە ی کە نوێژ دەکات چوونە سووژدە با ئوانی تر لە پشتانەوە بن ، ئینجا کە لیبوونەوە لەو رکعاتە ، ئەو دەستەی تر کە پاسەوانیان دەکردو نوێژیان نە کردووە با بێن لە گەڵ تۆ دا نوێژە کەیان بکەن ، با هۆشیارو چەکداریش بن ، چونکە بێ باوەران ئاواتە خوازن کە ئێوە غافل بن لە چەکە کانتان و کەل وپەلەکانتان ، تایەك هێرش بکەن سەرتان و تەفرو توناتان بکەن ، بەلام بۆتان هەیەو قەیناکات چەکە کانتان دانێن ئەگەر ناڕەحت بوون بەهۆی بارانەوە ، یان هەندیکتان نەخۆشکەوتن، هەمیشە وریابن ، بەڕاستی خوا سزای ریسواکەرو شەرمە زاری بۆ خوانە ناسان ئامادە کردووە ..!! بەلی ئەم نوێژ کردن لە ناوچەی ( نخل ) ئە نجام درا ، ناوچەی ( نخل ) دوو رۆژە ری لە شاری مەدینە دوورە بوو ، بەلی ئەم حوکمە شرعیە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە نوێژ گرنگیەکی زۆری هەیە لەرووی بیروباوەر عقیدەی موسلمانان ، تەنانەت نابێت نوێژ بە فیرۆ بدرێت ئەگەر لە ناو جەرگەی دوژمنیش بێت ، هە گیز بوار نەدراوە لە هیچ بارو دوخیکدا نوێژ بە فیرۆ بدرێت ، تەنانەت لە کاتی جەنگ کردنیشدا یان نەخۆشی دا تەنها توانای ئەوەی هەبێت ، کە هۆشی ماوە دەبێت لەسەر جیگاش نوێژ ئە نجام بدرێت ، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت ، کە هیشتان تەمەنی نەبووە بەوەی کە نوێژ لەسەری واجب ببێت ، یان ئەو کەسەی کە عەقلی لەدەست داوە ، یان ئەوەکەسەی کە خەوتووە بەخەبەر نەهاتووە لە کاتی نوێژی فەرز دا ، یان ئەو کەسەی کە موسلمان نیە باوەری بە ئیسلام نیە ، وادیارە نوێژ پردی پەرینەوەی نیوان موسلمانان و کافرەانە، دیار ئەوەی نوێژ بکات ، ئەوا بە موسلمانا هەژمار دەکرێت ، ئەووش نوێژ نەکات دەرچووە لە ئیسلام م بە کافرە هەژمارە دەکرێت ،وەك ئەم فەرمووودەیەی پێغەمبەری خوا( صلی الله الله علیه وسلم ) .عن ( جابر ) ( رضی الله عنه ) قال : سمعت النبي ( ﷺ ) يقول : ( إن بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة ). واتە : لە ( جابر ) – خوا لی رازی بێت – دەلی بیستومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( نیوان پیاویك و هاوەل بۆ خوا بریاردان و کوفردا نوێژ نەکردنە..!!

ئ

بەلی هەردوولا لیکتر نزیك بوونەوە لە بەرانبەر یەك وەستان ، ئەوەبوو لەم کاتەدا نویژی ترس ئەنجامدرا ، هەردوو سوپا لە بەرانبەر یەك دا وەستا بەلام هیچ کامیان هیرشی نەکرد ، سەر ئەنجام هۆزەکانی ( الاعراب ) واتە سوپای ( محارب و ثعلبە و غطفان ) کشانەوە و پشتیان لە جەنگ کردو ترسان لە سوپای ئیسلام ، ئەوە بوو بە کیو چیاکاندا بلاوەیان لی کردو هەلهاتن ، بەلام موسلمانەکان دوایان نەکەوتن ، لەم غەزایە دا موسلمانەکان هیچ دەست کەوتیکی جەنگیان بەدەست نەکەوت ،چونکە سوپای ( محارب و ثعلبە و غطفان ) رایان کرد ، بەلام چەند ئافرەتیك لیان بەجی ما کەتنە دەست سوپای موسلمانان ، بەلی دوای ئەوەی کە سوپای الاعراب هەلهاتن و رایان کرد و بلاوەیان لی کرد بەکیو چیاکان ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و بە سوپای موسلمانان بەسەر کەتووی بەرەو شاری مەدینە گەرانەوە ، بەلی ئەم غەزایە ( ١٥ ) رۆژی پی چوو ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ یەکیك لە هاوەلانی لە پیشە خۆی دا رەوانەکرد بۆ مژدەی سەرکەوتن بە شاری مەدینە ، ئەویش ( جوعالی کوری سوراقە ) بوو ، هەر لەم غەزایە دا رووداویکی تریش روویدا لە ریگای گەرانەوەی سوپای ئیسلام بۆ شاری مەدینە دا ، ئەویش ئەو رووداوە بوو ، ووت مان کە چەند ئافرەتیکیان لە پاش بەجی ماو کەوتەدەست موسلمانەکان ، یەکیك لە پیاوانی ئەو ئافەرتانە کە نەزری کردبوو ، ئیتر نەگەریتەوە تاکو خوینیك نەریژیت ،لە نیو هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیتر کاتی شەو داهات پیغەمبەر ﷺ دوو هاولالی دانا بۆ پاسەوانی کردنی سوپای ئیسلام لە کاتی خەودا ،کە ئەم دوو هاوەلە بوون ، ( عباسی کوری بەشیر ) ، ( عماری کوری یاسر ) بوو ، ئەوە بوو ( عباسی کوری بەشیر ) لە کاتی شەو نویژ کردن دا یەکیك لە بت پەرستە الاعرابەیە کان ، تیر هاویژی کرد ، ئەویش لە نویژ دا بوو، یەکەم جار تیریکی هاویشت لە پشتی ( عباسی کوری بەشیر ) ی دا ئەویش نویژەکەی نەبری ،تا کو کردیە بە ( ٣ ) تیر لە پەشتی دا ئەویش وازی لە نویژەکەی نەهینا تاکو سەلامی دایەوە ، ئینجا هاوەلە کەی تری پی ووت : برا گیان بۆ ئاگاداری منت نەکرد ،ئەویش ووتی : سویند بەخوا لە سورەتیکی قورئانی پیرۆز بووم ، دە م خویندەوە ، حەزم نەکرد ببیرم ، بەلام کاتیك تیرە کانی تری تی گرتم کرنۆشم برد و ئاگادارم کردیتەوە ، سویند بەخوا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە ئەم جیگایە دەپاریزم هەناسەم دەبرا و ئەو سورەتەی قورئانم نەدەبری . السیر ضوء المصادر الاصلیة ( ٤٢٧ )...

ێ

بەلی لەم ڕووداوەشدا گرنگی نوێژ دەردەخات ، پەندو ئامۆژگاریە بۆ ئەوانەی کە نوێژ دەبرن یان نوێژناکەن ، یان لە کاتی خۆی جی بەجی ناکەن ، هەر بۆیە نوێژ کۆڵەکەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ..!!

بەلی هەر لەکاتی گەرانەوەی سوپای موسلمانان و پیغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای ( نجد ) یان غەزای ( ذات الرقاع ) دا ، ڕووداویکی تریش ڕوویدا ، کاتیك کاروانیك بە سوپای موسلمانان گەیشت لە دۆلیکی پر لە دار و درەخت دا ، هاوەلانی پیغەمبەر ﷺ بلاوەیان لی کرد ، پیغەمبەر خواش ﷺ لە ژیر سیبەری داریکدا شمشیرەکەی هەلواسی بوو ، ئەم ڕووداوە ، ( جابری کوری عبدالله ) بۆمان دەگیریتەوە دەلی : ئیمە خەوتین پیغەمبەر ﷺ بانگی کردین ،وە چووینە لای ( الاعرابیك ) یان عەرە بیکی بیابانشینی پی بەتی لەلای پیغەمبەری خوا ﷺ دا نیشتبوو ، پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی : من خەوتبووم ، ئەم پیاوە شمشیرەکەی هەلکیشاو ، بە ڕووتی بەدەستیەوە بوو ، پی ووتم ، کی ڕزگارت دەکات یان بەرگریت لی دەکات ، بەرانبەر بەمن ؟! منیش پیم ووت : خوا . ئا ئەوە تا خۆشی دانیشتووە لە لامدا ، پیغەمبەریش ﷺ سزای ئەو پیاوەیە نەدا ، ناوی ئەو پیاوەش ( غورصي کوري حاريث ) بوو، بەلی ئەم پیاوە واتە : ( غورصي کوري حاريث ) پە یمانی بە پیغەمبەری خوا دا ﷺ هەر گیز شەری لە گەل دا نەکات ، پیغەمبەری خواش ﷺ وازی لی هینا ، ئەویش گەرایەوە لای کەس و کارەکەی ووتی : لە لای چاکترین کەسەوە گەرامەوەتەو بۆ لاتان . السير ضوء المصادر الاصلية ( ٤٢٦ ). هەروەها ئەم ئایەتی سورەتی المائده دەربارەی ئەم ڕووداوە هاتەخوارە وە کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَنْ يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ المائده ١١. واتا : ئەی ئەوانەی باوەرتان هیناوە یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لە سەرتان کاتیك هەندیك ویستیان دەستدریژی بکەنە سەرتان ، خوایش دەستدریەکەی ڕاگرتن و ئیوەی پاراست ، دەی کەواتە لە خوا بترسن و پاریزگاربن ، دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەست ، تا هەمیشە بەهانیان یان فریا یان بکەویت و لە پیلان و نخشەی دوژمنان بیانپاریزیت ..!!هەروەها ئەم ئایەتش بەلگەیە لەسەر پاراستنی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ المائده ٦٧ . واتا: ئەی پیەمبەرو فرستادە ، هەرچی فەرمان و پەیامیکت بۆ دابەزیووە لەلایەن پەروەردگارتەوە ( بی دوو دلی ) ڕای بگەینە ، خۆ ئەگەر بەو کارە هەنەسایت ، ئەوە مانای وایە پەیامەکەت بە تەواویی نەگەیاندووە ، ( دل نیاش بەکە خوا دەتپاریزیت لە شەر و خراپەی خەلکی ، چونکە بەراستی خوا هیدایەت و ڕینموویی قەوم و هۆزی بی باوەران نادات ..!!

## غەزای ( بەدری دووەم ) یان غەزای ( شەعبان )

بەلی ئەم غەزایە لە مانگی شەعبانی سالی چوارەمی كۆچی دا روویدا ، بەرانبەر بەسالی ٦٢٦ زاینی دا ، بەلی كاتیك سوپای ئیسلام كەوتەری بەرەو بەدر لەویدا بە سوپای مكە یان قورەیش بگەن ، ئەمەش ئەوە بوو تا لەبەردەم هەموو دورگەی عەربی دا ئەوكات بسەلمینن ، كە سوپای ئیسلام هەرگیر بەرانبەر بە سوپای بت پەرست و موشریكانی قورەیش سل ناكات كۆل نادات ، هەموو كات ئامادەیە دەست لە موشریكان كافران بوشینی بۆ هەموو كات ،دەرسیكی ئاوایان بدەن بۆ ئەبەد تەمی بن هەرگیز بیر نەكەنەوە بەرانبەر بە سوپای ئیسلام و پیغەمبەرو هاوەلانی دا ، ئەمە لە لایەك دا لە لایەكی تریشەوە ، لە سالی پاردا واتا: لە جەنگی ئوحودا ، كەسالی سیەمی كۆچی دا ، ( ابو سفیان ) لە كاتی كۆتایی هاتنی جەنگی ئوحود ، لە ئیوارەكەی ، بەر لە كشانەوەی سوپای مككە یان سوپای قورەیشی موشریك و كافر ، لە مەیدانی جەنگی ئوحودا ، بەلینی لە موسلمانان وەرگرت كە سالیكی تر لە رۆژەدا یان لەم شوینە دا لە بەدر دا ، بە یەكتر ئەگەینەوە ، دەست دەكەینەوە جەنگ و شەر كردن لە گەل یەكتر دا ، تاكو یەكیكیان یەكیكیان لە ناو دەبات یان بەزەوی دا بدات ، بەلی هەردوو واتە: سوپای ئیسلام و سوپای قورەیش خۆیان بۆ ئەم رۆژە ئامادەكرد ، هەرچەندە لەماوەی ئەم سالەدا جەندین رووداوی ناخۆش بەسەر موسلمانان دا هات ، وە ك لە پیشدا باسمان كرد ، رووداوەكانی ( شاندەكەی رەجیع ، بئر معوونە ، جەنگە كانی ( بنی الاسد ) ، ( هوذە یل ) ، ( بني نضیر ) ..هید بەلام قورەیش هیچی لە م جەنگانە نەهاتبووە ری ، بەلی خۆیان ئامادەكرد تا لە بەدر دا وەك سالی پیشوو بەیەك بگەن ، وا دیارە ئەم جەنگە لە جەنگی بەدری یەكەم دا گەورە تربیت ، چونكە هەردوو لا هیزیان زیاتر بووە وەك لە پیشدا ، هەر بۆیە زیاتر خۆیان ئامادە كرد بوو ..

ئەوە بوو سوپای قورەیش بە سەرۆكاتی ( ابو سفیان ) ( ٣٠٠ ) سەربازی ئامادە كرد بوو ، كە ( ٥٠ ) ئەسپیان پی بوو ، لە مككە بەری دەكەون قوناغیك دەبرن دەگەنە ، ( الظهران ) لە ( مجنة ) سوپا لەویدا بار دا دەخەن . بەلام سوپای ئیسلام ( ١٥٠٠ ) جەنگاوەر دەبوو ، كە تەنها ( ١٠ ) ئەسپیان پی بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ خۆی فەرماندەی سوپای ئیسلام بوو ، بەرەو بەدر كەوتنە ری ، بەبی وەستان سوپای ئیسلام گەیشتە ناوچەی بەدر ، لەویدا مولگەی خۆیان دورست كرد ، بەمە پیش قورەیش بەلینی خۆیان بردەسەر .بەلی لەم غەزایە دا پیغەمبەری خوا ﷺ ئالای سوپای ئیسلام دایە دەستی ( علی كوری ئەبو تالیب ) هەروەها لە شوینی خۆیدا لەشاری مەدینە ، ( عبدالله كوری رواحەی ) دانا بۆ جی بەجی كردنی كارو باری مەدینە...

ئ

بەلی ئەم غەزایە ئەوە بوو کە ( ابو سفیان ) لەرۆژ بەدری یەکەم دا ، بەلینی بە موسلمانان دا بوو ، کە بە یەکتر بگەن، بەلام سەریری سوپاکەی خۆی کرد ،دەیزانی ئەم جارە قورەیش بەرگەی سوپای ئیسلام ناگری وتەفرو تونا دەبیت ، بەلی ( ابو سفیان ) دەستی کرد بە پرو پاگەندە بلاوکردنەوە ، بۆ ئەوەی سوپای ئیسلام بۆ جەنگی بەدری دووەم ری نەکات ، نەشی دەویست بە ئاشکرا سوپاکەی بکشینیتەوە ،ئەش ترسا لە سوپای ئیسلام ، خۆشی بەشەرمەزا دەزانی ئەگەر نەیتە ناوچەی بەدر ، چونکە ئەوە بەلینی خۆی بوو ، بەلی ( ابو سفیان ) دەی ویست ئە نجام نەدانی ئەم جەنگە بخاتە ئەستۆی موسلمانان و سوپایی ئیسلام ، هەر بۆیە کەسیکی بەکری گرت بۆ پروپاگەندە بلاو کردنەوە لەناو شاری مەدینە ، بۆ ئەوەی ترس دل راوکی لە ناو سوپای ئیلام بلاو بیتەوە دەرنەچن بۆ بەدر ، هۆکارەکەی بخاتە ئەستۆی سوپای ئیسلام ،هەر بۆ ئەم مەبەستە ، پیاویکی بەکری گرت کە پیاویك بوو لەهۆزی ( غطفان ) بەناوی ( نعمانی کوری مسعوودی کوری اشجعی ) تا بروات بۆ شاری مەدینە پروپاگەندە بلاو بکاتەوە ترس دلە راوکی لەناو سوپای ئیسلام بلاو بکاتە وە ، کە دەر نەچن بۆ بەدر ،چونکە بەرگەی سوپای مککە ناگرن ، بەلام ئەمە پیچەوانەکەی راست بوو ، ( ابو سفیان ) چاك ئەی زانی ئەم جارە سوپای ئیسلام لەناویان دەبات تەفروتوونایان دە کات ، بەلی هەر بۆیە بە ( نعمانی ) بەکری گرت بۆ ئەم مەبەستە ،هەروەها ( ابو سفیان ) پیشی ناخۆش بوو ، سوپای ئیسلام دەر بچیت ، چونکە ئەو سەر شورۆی بۆ دەمایەوە نەدەهات بۆ جەنگ ، بەلی بە ( نعمان ) ی جا تۆ برۆ بۆ شاری مەدینەئەم پرو پاگەندە بلاو بکەوە بلی : سوپای مککە ژمارەیان زۆرن ئیوە بەرگەی ئەم ژمارە زۆرە ناگرن ، هەروەها پی ووت : ئەگەر ئەمەت کرد ، من ئەوندە ووشترە پی دەدەم لەسەر دەستی ( سوهیلی کوری عمر ) دا ، بەلی دوای ئەوە ی ( سوهیل ) بووە بەکەفیلی ( ابو سفیان )

( نعمان ) بەری کەوت بەرەو شاری مەدینە ، بۆ بلاو کرنەوەی ئەم پرو پاگەندانە ، دەستی کرد بەبلاو کردنەوی قسەو هەوالی درۆ بۆ سوپای مککە ، لە لایەکی تریشەوە مونافیقە کانیش ئەم هەوالە یان بلاو کردەوە لە گەل جوولەکە ناپاکەکان ، خەلکیان دەترسان دو ، هانی خەلکیان ئەدا کە نەچن بۆ جەنگی بەدری دووەم ، ئەوە بوو ترسی کی زۆریان لە ناو خەلك دابلاو کردەوە ، بەمەش جوولەکە و مونافیقەکان زۆر دل یان پی خۆش بوو ، ئەمەشیان ووت : محمد لە دەستی ئەو سویا زۆرە رزگاری نابیت ..!!

ێ
بەلی کاتیك سوپای قورەیش گەیشت (الظهران) یان (عوسفان) لەویدا سوپا دابەزی و باری دانا ، فەرماندە کانی سوپای قورەیش لەویدا کۆبوونەوە هاتنە سەر ئەو بڕیارەی کە سوپای قورەیش چی تر بەرەو پیش نەچیت ، بگەرینەوە بەرەو شاری مککە ، هۆکاریشیان یان بیانووشیان بۆ ئەم کارە ئەوە بوو بارودۆخ گونجاونیە بۆ جەنگ کردن لە ئیستادا ، سالە کە سالیکی ووشکە یان سالکی شوومە ، بۆ ئەمە دەست نادە جەنگی تیدا بکریت ، ئەوی (ابو سفیان) فەرماندە گشتی سوپاکە دەستی کرد بە ووتار دان ، بە سوپاکەی ووت : ئەی کۆمەلی قورەیش ! سالیکی بەپیت بە کەلکی ئیوە دیت ، ك گیا زۆر بی و ئاژەلە کانتان بلەوەرینن ، وشیرو بۆ خواردنەوەتان زۆر بی ، بەلام ئەم سال سالیکی ووشکە ، بۆیە من دەگەریمەوە ئیوەش بگەرینەوە..!! بەلی یەکەس نارەزای دەر نەبری هەر هەموو خۆیا پیچایەوە بۆ پاش کشە کردن و گەرانەوە بۆشاری مککە ،بەلی هەر لەویدا گەرانەوە کۆتایی پی هات و بەسەر شۆری گەرانەوە بۆ مککە .

بەلام سوپای ئیسلام ئەوەندی پیویست بوو لە بەدر دا مایەوە بۆ چاوەر وانی سوپای قورەیش ، ئەگیرنەوە دەلین سوپای ئیسلام (٨) رۆژ لە ناوچەی بەدر دا مانەوە ، کە هەرچی کەل وپەلی بازرگانیا پی بوو ، لەویدا موسلمانەکان رشتیان لە هەموو درهەمیك دوو درهەمیان قازانج کرد ، پاشان بەسەر بەرزی گەرانەوەبۆ شاری مەدینە ، بە شاهیدی هەموو هۆزەکانی عەرەب ، بەلی بەم غە زایە بۆ هەموو نیمچە دوورگەی عەرەبیان سەلماند ، کە موسلمانان لە رۆژی جەنگی ئوحودا نەدۆران ، بەلکو بەهۆی هەندیك هەلەی تیر هاویژەکانەوە بوو ، ئا ئەواتە ئەمرۆش گەورە ترین هیزی دوورگەی عەرەبی کە سوپای قورەیشە ناویرت بیت بۆ مەیدانی جەنگ لە گەل سوپای ئیسلام. بەلگەی ئەمەش کە دەسەلاتی سوپای ئیسلام زۆر بەهیز ببوو ، لەناچەکەدا ئەوە بووکە سەر رۆکی هۆزی (ضمري) یەکیك بوو لە هۆزەانی ناوچەی بەدر ، هاتە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمەش لەو کاتە بوو کە سوپای ئیسلام چاوەری سوپای قورەیشی دە کرد لە بەدر دا ، هاتوو ووتی : ئەی محمد ! ئایا هاتووی لە سەر ئەم ئاوە لە گەل قورەیش دا بجەنگی ؟! مەبەستی ئاوی بەدر بوو ، گوایە وا لە سەر زەوی نەوەی (ضمري) دایە ، شانی باسە ئەو هۆزانە پیش بەدر ی گەورە پەیمانیا دابوو بە پیغەمبەری خوا ﷺ کە دەست دریژی نەکەنە سەر مەدینە ، بەلی کەسەرۆکی هۆزی یان نەوەی (ضمري) قەسەی کرد پیغەمبەر ﷺ بە پەری دل نیایەوە وەلامی دایەوە ، فەرمووی (نعم یا اخا ضمرة ، وإن شئت رددنا علیك ما كان بيننا وبينك ، ثم جالدناك حتى يحكم الله بيننا وبينك ). واتە : تی گەیاند ئەگەر ئەیەوی با پەیمانەکەی نیوانیان بداتەوە و ، پاشان دەست بدنە یەخەی یەکتری تا خوا یەکیکیان سەر بخات ..!! بەلی خیرا کابرا دەستی دایە ووتەی نرم و ووتی : نەبە خوا ئەی محمد شتی وەهامان ناویت ..!! . الرحيق المختوم (٣٠٤).

## غەزای ( دومة الجندل )

بەلی دوای ئەوەی کە پیغەمبەر خوا ﷺ لە غەزای بەدری دووەم یان بەدری بچووك گەرایەوە و دوای شەش مانگ لەمەدینە دا بوو ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەوالیکی یان خبریکی بیست کەوا هۆزەکانی ( دومه الجندل ) خەریکی کاری خراپ و ریگری کردنی هەر کەسیك یان هەر بازرگانیك دەکەن کە بەلایان دا تی پەر دەبیت ، مال وسامانەکەی لی زەووت دەکەن رووتی دەکەنەوە وە جەدەیەك لە سەریگای خەلکی دا بۆسەیان دەنایەوە خەلکیان تالان دەکرد ، هەروەها هانی خەلکشیان دەدا و خەلکیان کۆدەکردەوە بۆ هیرش کردنە سەر شاری مەدینە ، بە کورتی ببونە هەرشە بۆ نیمچە دووگەی عەرەبی دەولەتی مەدینە ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) سوپای ئیسلامی یان سوپای مەدینەی ئامادە کرد بە ( ١٠٠٠ ) جەنگاوەرەوە ، لە رەبیعی یەکەمی سالی پینچە می کۆچی دا ، بۆ هیرش کردنە سەر ئەو هۆزانەی کە لە ناوچەی ( دومه الجندل ) بوون ، شوینی هەلکەوتەی جوغرافی ( دومه النجدل ) کەلە باکوری شاری مەدینە بوو ، ( ١٥ ) رۆژ ری دوور بوو لە شاری مەدینە یان ( ٤٥٠ ) کلم لە مەدینە دوور بوو ، پینج رۆژ ریگا مابوو بگەیشتە وەلاتی شام یان ( دمشق ) ، کە ئەو کاتە پایتەختی دووەمی ئیمپراتۆریەتی رۆما بوو ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ یەکیك لە هاوەلانی لە جیگای خۆ کردە ئەمیری شاری مەدینە بۆ بەری کردنی کاروباری مەدینە، ئەویش ( سباعی کوری عەفەرتەی غفاری ) بوو ، بەلی سوپای ئیسلام بە پیشەوایەتی پیغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ( دومه الجندل ) کەوتەری و ، لەشاری مەدینە دەرچوو ، بە پەلە بەریکەوتن بەریگادا بۆ ئەوەی لە ناکاو بەسەر دوژمنانی ئیسلام دابدات ، بۆ ئەمە بەرۆش خۆیان حەشار ئەدا ، بەشەو ریگایان دەبری ، بۆ ئەوەی دوژمن هەست پی نەکات و لە ناکاو هیرش بکەن سەریان ، بەلام دانیشتوانی ناوچەی ( دومه الجندل ) رۆژ پیش گەیشتنی سوپای ئیسلام هەوالی یان پی گەیشت ، یەکسەر ترس لەرز چووە دلیانەوە بە پەلە خیورا بلاوەیان لی کرد رایان کرد بۆ خۆدەرباز کردن لەدەست سوپای ئیسلام ، هەروەها مال منزل و سامانیان بە جی هیشت لە ترسی سوپای ئیسلام هەر یەکەو بەلایکدا رای کرد ، بەلی ئەو هۆزانە مەرو مالاتیکی زۆریان لەدوای خۆیان بەجی هیشت ، سوپای ئیسلام دەستی بەسەر ئەو مەرو مالاتەدا گرت ، کە چوونە شوینی نیشتە جی بوونیان کەسی تیدا نەمابوو ، بۆیە جەند رۆژیك سوپای ئیسلام لەویدا مایەوە ، هەروەها جگە لەوەی کە ( محمدی کوری مەسلەمە ) تاقە پیاویکی گرت و هینایە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ، پیغەمبەریش ( صلى الله عليەوسلم ) هەولی خەلکە کەی لی پرسی ؟! ئەویش ووتی دوینی رایان کرد ، پیغەمبەریش ﷺ دوای موسلمان بوونی لی کرد ئەویش موسلمان بوو ..!!

ئ

سوودو ئامانجی غەزای (دومه الجندل ) بۆ دەوڵەتی مەدینە یان سوپایی ئیسلام :

١-بەلی تا ئەو کاتە سوپای ئیسلام ئەوەندە لە شاری مەدینە دوور نەکەوتبوونەوە ، زۆر دوور بوو بۆ سوپای ئیسلامی تازە پێگەیشتووە ، کە تەنها پێچ شەوی مابوو بۆ شاری (دمشق ) لەوە لاتی شام ، کە ئەو کات پایتەختی دووەمی ئیمپرا تۆری رۆما بوو، کە بۆ ئە ئیپراتۆریەی بەسەلمینن کە سوپای ئیسلام هەیە لە ناوچەکەدا ، بەلی بەو نیازەی کە دانیشتوانی ناوچەکە دەنگ و باسی ئاینی تازەیان بەگویی بکەویت ،لەلایەکی تریشەوەپاشای رۆما واتە : (قەیصەر ) ئاگاداری سوپای ئیسلام بیت، سل لە هیچ هیزیك ناکاتەوە رۆژ بەرۆژ بەهیزتر دەبیت لە ناوچەکەدا ، هەروەها زۆریك لە میژوو نووسان ئاماجی ئەو عەزایە ترسانی رۆمەکان بوو کە تەنها ماوەی پینج شەو دوور بوو لی یان ..!!

٢-برینی ئەو هەمووریگایە وەك مارۆنی سەربازی وابوو ،بۆ سوپای ئیسلام ، چونکە پیشتر هەرگیز سوپای ئیسلام ریگای ئەوا دووری نەبیر بوو ، تاکو خۆیان ئامادە بکە بۆ جیهاد کردن بۆ وەلاتانی دوورە دەست ، بەلی گەلانی سەر زەوی چاوەر وانی سوپای ئیسلام بوون لەم سەردەمە تاریکەی جیهاندا ، کە ئیسلام وە رووناکیەك بۆ گەلان سەرزەوی دەرکەوت ، بەلی گەلانی چاوەر وانی فتح کردنی وەلاتەکانیان بوون لە ژیر سایەی دەولەتی ئیسلامدا ، هەر واشبوو ، فتح کردنی رووخاندنی دوو ئیپراتۆری گەورە ، وە ك : (فارس و رۆما ) .

٣-مەسەلەیەکی تریش ئەوە بوو ، بۆ هەموو نیمچە دورگەی عەرەبی دا ، بسەلمینن کە سوپای ئیسلام پاریزگاری لە مال وسامانیان دەکات و ،بازرگانیاکانیا دەپاریزیت کە بەرەو شام دە چوون ،

٤-بی بەش کردنی قورەیش لە هەر هاوپەیمانی یەك ،کەدەی کەن لە هۆزەکانی نیمچەدورگەی عەرەبی ، هەروەها ریگا ی بازرگانی قورەیشی بە ئامانج دەگیرا بەرانبەر سوپای ئیسلام ، ریگایان بەر تەسك دەبۆ وە کە بەرەو شام بازرگانیان دەکرد .

**هەروەها لە کاتی گەرانەوەشی دا پیغەمبەری خوا ﷺ لە (دومەالجندل ) هاوپەیمانی بەست لەگەل سەرۆکی هۆزی (بنی الغزاری ) کە (عویینە کوری حصن الغزاری ) بوو ، ئەویش ریگای پیدا کە مەرو مالات ووشترەکانی لە جیگایەك لە نزیك شاری مەدینەدا بلەوەرینی ..!!**

ئ

## غەزای الاحزاب و ڕووداوەکانی یان غەزای خەندەق و ڕووداوەکانی

### یەکەم : میژووی غەزای لاحزاب :

بەلی زانایانی سیرە ژیانی پیغەمبەر ﷺ دەلین : ئەو غەزایە لەمانگی شەوالی سالی پینچەمی کۆچی دا روویداوە ، (واقیدی ) دەلی : لە رۆژی شەممە لە (٨) مانگی (ذي العقدة) سالی پینچەمی کۆچی دا روویداوە ، هەروەها (ابن سعد ) دەلی : (خوای گەورە ) نزای پیغەمبەری ﷺ وەرگرت ، ئەو دەستە و کۆمەلانەشی شکست پی هینا ، لە رۆژی چوارشەممە لە مانگی (ذي العقدة) ی سالی پینچەمی کۆی دا روویداوە ، کەواتە کۆیی زانایان لەسەر ئەوە ریکن لە سالی پینچەمی کۆی دا بووە ، هەربۆیە غەزای مصتلق دوای ئەو غەزایە دیت ، چونکە بە پی ریزبەندی کتابی (الرحيق المختوم ، غەزای بنی مصتلق دوای غەزای الاحزاب دیت ، هەروەها رووداى بوختان یان (حادثة الافك ) بۆ خاتوو (عائیشة ) لە دوای گەرانەوەی لە غەزای بنی مصتلق بووە ، هەروەها چونکە مردنی یان وەفاتی (سعدی کوری موحاذ ) لەدوای غەزای بنی قوریظة بووە ، کەواتە لە سالی پینچەمی (ذی العقدة ) هەمان مانگ و هەمان سالە لەگەل غەزای لاحزاب لیردا غەزای الاحزاب مانگی (ذی العقدة ) سالی پیچەمی کۆچی دابووە ، کەواتە هەردوو غەزایە کە واتە: غەزای بنی مصتلق دیت دواتر غەزای بنی قوریظة لە دوای دیت ، چونکە هەردوو هۆزی جوولەکە پشت گیریان لە هیزەکانی بت پەرستان کرد لە غەزای الاحزاب ...

بی گومان میژووەکەی راستر وایە بلین مانگی (ذي العقدة ) ی سالی پینچەمی کۆچی دابووە ، چونکە هەروەك باسمان کرد لە پیش دا لە سالی سیەمی کۆچی دا غەزای ئوحود روویدا ، لە پاش دوو سال دا ئینجا غەزای الاحزاب بەرپا دەبیت ، لەنیوان سوپای ئیسلام و سوپای قورەیش دەستە و کۆمەل و تاخمە کانی کە هاوپەیمانیان لە گەل قورەیش هەبوو ، هەر بۆیە لەغەزایە دا روولی و کاری گەری جوولەکە زۆر بوو بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و شاری مەدینەو لە هەمان کاتدا روولی مونافیقەکانیش زۆر کاریگەر بوو ، بە هاتنی سوپای لاحزاب ، چونکە دلیان پی خۆش بوو بۆ لەناو بردنی سوپای ئیسلام لە شاری مەدینە دا ، هەر بۆیە لە پاش شکستی سوپای لاحزاب گەرانەوەیان بەسەر شۆری ، مونافیقە کانی شاری مەدینە ، هیچ یان بە دەستەوە نەما ، کەوتنە بوختان کردنی بە هاوسەری پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بە رووداى (حادثة لافك ) ناو دەبردریت ، لە هەمان کاتدا جوولەکەکانیش ری خۆشکەر بوون بە هینانی سوپای لاحزاب بۆ شاری مەدینە ..!!

ێ

## دووەم : غەزای لاحزاب دوو ناوی هەیە :

أ- ( غزوت الاحزاب ) چونکە کۆمەلیك لە حیزب و دەستە و کۆمەلی شاری مککە و دەوروبەری یەکیان گرت بو داگیر کردنی شاری مەدینە و دەوروبەری وەك : هۆزەکانی قوریش و کینانەوغطفان و هۆزەکانی جوولەکە وە موناقیقە کان . هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾ الاحزاب ٢٢. واتا : کاتیك ئیمانداران ئەو هەموودەستەو کۆمەل و گرۆهانەیان بینی ووتیان : ئەمە ئەوەی کە خوا پیغەمبەرەکەی بەلینی پیداوین ، کە ئاوا دژایەتی ئایینەکەی دەکریت و کافران و دوو رووەکان نەخشەو پیلان بۆ ریشەکیش کردنی ، دیارە کە خوا پیغەمبەرەکەی راستیان فەرموو لە پیش هاتنیدا ، بی گومان ئەو دژایەتیە باوەرو ملکەچی نەبیت هیچی تری بۆ زیاد نەکردن ( واتە سوور تر بوون لەسەر ئیمانی دامەزراویان ) ..!!

ب-( غزوت الخندق )چونکە موسلمانان لەم جەنگەدا ، بەفەرمانی پیغەمبەری خوا ﷺ لە سەر پیشنیاور نەخشە وپیلانی ( سلمانی فارسی ) لە چەند شوینیکی دەرەوەی شاری مەدینەدا ، هەستان بە خەندەق لیدان یان هەلکەندنی زەوی وەك عەفرکردن و قوّل کردنی زەوی بۆ ئەوەی ببیتەبەر بەستیك لە نیوان خۆیان و دوژمنانی سوپای لاحزاب ،بۆ ئەوەی دوژمنان سەفەر بە موسلمانان نەبن نەتوانن بە ئاسانی پیشرەوی بکەن ، بەلی ئەو کارە یەکەم جار بووە کە موسلمانان بیکەن ، هەر بۆیە لە ناو نیمچە دوورگەی عەرەبی دا شتیکی تازە نویی و داهیناور بوو بۆ نەخشەی جەنگی .

هەر بۆیە ئەگەر سەیر بکەین دەبینین کە پیغەمبەری خوا ﷺ لەجەنگە دا بەقسەی یان پیشنیاری ( سلمانی فارسی ) پەسەندە کات ، لە راستی دا خۆی پیشەوای موسلمانان بوو هەر خۆی فەرماندەیاتی ئەو سوپا بەهیزەی ئیسلامی دەکرد و ئەبینین چۆن بەقسە ( سلمانی فارسی ) کرد بۆ نەخشە کیشانی جەنگی ، لەسەر پیشنیاری ئە و ئەم خەندەقەی لیدا ، بۆ خۆ پاراستن لە دوژمن ، شتیکی تریشمان بۆ دەر دەکەویت ئەوەیە کە پیغەمبەری خوا ﷺ لە ( غیب )ی نەدەزاین مەگەر وەحی بۆ دابەزی بایە ، هەر بۆیە ئەو فەماندەیە یان ئەو پیشەوایە تەنها بە لیهاتووی خۆی نەخشە و پیلانەکانی جەنگی دادەنا یان ئەوەتا هاوەلەکانی پیشنیاری چاك و پاشایان بۆ دەکرد ، بەلی ئەم پیشنیارەی ( سلمانی فاری ) زۆر پیشنیاریکی بەجی بوو زۆریش سەرکەو توبوو ...؟!!

ێ

## سی یەم : هۆکارە کانی غەزای الاحزاب :

بەلی ئاینی ئیسلام لە نیمەچە دوورگەی عەرەبی هات ،بۆ ئەو نەفام وجاهیلانە کە میشکیان داخرا بوو لە شتی پرو پوچ و بی سوود خورافایات ، هەر بۆیە ئاینی تازە لە هەموولایە کەوە دژایەتی دەکرا ، هەرچەندە هەلویستی پیغەمبەر و موسلمانا زۆر روون وئاشکراو ، نەرم نیان بوو ،لە گەل ئەو هەموو دوژمنەی کەلەچوار دەوری بوو ، بە هیچ شیوەیە ك دایەتیان لەگەل هیچ کەس دەستە و کۆمەلیك دا نەدە کرد ، بەلکو بە هیمنی و بە ئارامی عبادەتی ئاینی خۆیان دەکرد ،تەنانەت لە سەردەمی مککە شدا ، بەلام ئەوە بوو کە سالە های سال قورەیش و هاوپەیمانیان و مونافیق جوولەکەکان دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان دەکرد لەناوچەکەدا ، هەلویستیان ئەوە بوو کە بەهیچ شیوەیەك ئیسلام نەمینی تۆی ببریتەوە لەسەر زەوی ، هەروەها قورەیش بە هەموو شیوەیەك زولم ستەمی لی دەکرن و سزای نارەوای ئەدان ، سەرئە نجام لە شاری مککە دەری پەراندن و ، هیشتان بەوەش نەوەستان پەلاماری شاری مەدینەشیان دا ، وە لەدوای ئەو هەموو جەنگ شەرو شۆرەی کە بەنارەوا دەیان سپاند بەسەر موسلمانەکاندا ، لەو لاوەش موسلمانەکان موسلمانەکان پەیمانی دۆستانەیان لە گەل جوولەکەکانی مەدینەو دەروبەری دا ئەبەست یان لە گەل هۆزە عەرەباکانی نیمچەدورگە دا ، بەلکو لە کاتی تەنگانەدا ناپاکی لەگەلیان دا نەکەن دەستی هاریکاریان بۆ دریژ بکەن ، یان چ نەبیت بی هەولیست دانیشن و دژایەتی ئیسلام نکەن و خەلکی هان نەدن دژی بەرژەوەندیەکان دەولەتی مەدینە ،، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی دۆستانەی لە گەل جوولەکەکان بەست بۆ ئەوەی بە هیچ شیوەیەك بیر لە ناپاکی کردن نەکەنەوە ، کە دوژمن هیرشی هینا بۆ شاری مەدینە ، بەلکو ئەوانیش بەرگری لی بکەن، بەلام نەك بەرگریان لی کرد بەلکو بۆ نە چاوساغی دوژمنانی شاری مەدینەو هانی دوژمنانیان دا ، کە هیرش بکەن سەر شاری مەدینە ، بەلی کە چی جوولەکەی (بنی قینقاع ) و ( بنی نضیر ) ، (بني مصتلق ) ، (بني قوريظة) هەر هەموویان پەیمانیان شکاندو بەلکو دژایەتی ئیسلامیان کرد هانی دوژمنانی ئیسلامیان دا ، بوونە چاوساغی دوژمن ریگای دوژمنانی ئیسلامیان خۆش دەکرد کە دەست بەسەر شاری مەدینەدا بگرن ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ چاوپۆشی لە جوولەکەکانی (بنی قینقاع ) و ( بنی نضیر ) بەلکو پەیانی ووت دەر بچن لە شاری مەدینەدا نەرمی لەگەل نواندن ، ئەوانیش لە (خەیبەر ) نیشتە جی بوون ، بەلام لەدوای دا (خەیبەر ؟! ) بووە شوینی مونافیق ناپاك وخیانەتی جوولەکەکان بووە بەمەلبەندی جاسووس وچاو ساغی دوژمنانی ئیسلام ، هەروەك ئیستا کە دزگای (موسادی ) ئیسرائیل لە هەموو وەلاتیك دا جاسووسی داناوە و ، بۆ تە تیکدرەی سەر تاپایی جیهان لە خراپەکاری فیتنەوئاشووب دا ،لە گەل جاسووسەکانی خۆیان کاردەکەن بۆ بلاو بوونەوەی فیتنە فسادی سەر زەوی ..؟!!

ێ

بەلی ئەو دوو هۆزەی جوولەکە کە (بنی قینقاع ) و ( بنی نضیر ) پیغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەدینە دا دووری خستنەوە ، بەلام چوونە (خەیبەر ) دیسان دەستیا بە ناپاکی کرد و بوونە سەرە خۆرەی جوولەکەکانی (بني قوریظة) ، بەلی لەلایەکی ترەوە پیغەمبەر ﷺ پی خۆش بوو لەگەل سەرجەم هۆزەکانی عەرەبی پەیمانی دۆستانە ببەستیت ، پەیمانی ئاشتی لە نیوانیاندا بیت ، کەچی ئەو هۆزانە زۆر نەمەك حرام بوون ، کەچی یەك لەدوای یەك هەولی ئەوە یان ئەدا هیرش بکەن سەر شاری مەدینە چاویان تی بری بوو ،لە چەند لایەکیشەوە پیشتر باسمان کرد ،کە نا پاکیان لە گەل موسلمان کرد ، چەندین هاوەلی پیغەمبەریان ﷺ شەهید کرد ، وەك : رووداوی (رەجیع ) و (بئر معوونە ) چەندین ناپاکی تر ، بەلی ئەم سی هیزە بی رەحمە و بی بەزەیە وەك : قورەیش و هۆزەکانی تر و یان هۆزە جوولەکەکانی ترو یان مونافیقەکان ، ئەمانە زۆر بی رەحمانە دژایەتی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دە کرد ،بەلی لە کاتیکدا کە جوولەکە کەوتنە هەل نانیان ئەوا پشتی هیزەکان قورەیش هۆزەکانی تریان گرت ، لەدژای موسلمانان بۆ ریشە کیش کردنی تەواوەتی ئیسلام ، خۆ ئەگەر بە تەنها قورەیش هۆزە عەرەبەکان بانە بە تاییەتی وە هۆزی (کینانە و غتفان ) ئەو سوپای ئیسلام دەی توانی جاریان بکە ، بەلام ئەو هەمو هیزە زۆر سەخت و ئەستەم ،ئە گەر جیاجیا بان باشتر بوو ، بەلا لەلایەکی تریشەوە ئەو هۆزە عەرەبانەبەتەنها نەدەویران دەست لە سوپای ئیسلام بوە شین ، هەر وەك جوولەکەکانیش نەدەویران ، بەلکو ئەوان هەر هەموویان کۆ بوونەوە هیزیکی زۆریان پیك هینا لە لاحزاب دا ، بە لی بە رووالەت لە م جەنگە دا هەلمەتیکی سەربازی قورەیش و غتفان بوو ، بەلام بە نەخشە وپیلانی جوولەکە ئەم نەخشەو پیلانەی دارشت بوو بۆ لە ناوبردنی ئیسلام ، ئەم غەزایە بریتیە بوو لە پیلانیك بۆ رووخاندنی دەولەتی مەدینە ، کە بەدەستی سەۆکی هۆزەکان جوولە کە ئە نجام درا ، بەشی زۆری خەرجی مەسرەفی ئە م جەنگە جوولەکە سەرفی دەکرد ، وەك ئیستا هەموو پیلانەکانی جیهان بەدەستی جوولەکە دا ئەریژریت دەستی جوولەکەی یان دەستی صهیونی تیدا بەدی دەکریت ، بەلی ئەو جوولەکانە بەدریژایی میژوو سەرچاوەی هەموو فتنە و ئاشووبی سەر زەوی بوون ،بەلی قورەیش غتفان جوولەکە و مونافیقەکان توانیا (١٠) هەزار سەرباز کۆ بکەنەوە بۆ سەر موسلمانەکان لە شاری مەدینەدا ،چونکە جوولە کە قەومیکی ئەوەندە پیس بوون ، بە دریژایی میژوو دژی هەموو کەسیك بوون جگە لە غیری خۆیان هەرگیز کەسیان خۆش نەویستووە ..؟!!

ێ

بەلی جوولەکەی (خەیبە ) و (قینقاع ) و ( نضیر ) و (قوریظە ) هەموویان یەکیان گرت ، سەرۆکەکانیان کەوتنە بیرو کردنەوە و نەخشەو پیلان وتکبیر کردن بۆ لە ناو بردنی دەولەتی مەدینە ، بەلی کۆبونەوەیە کیان ئەنجامدا لە (خەیبەر ) تاکو باسی بارودوخی خۆیان بکەن ، لەنیمچە دورگەدا شوینی خۆیان بکەنەوە ،بە تایبەتی دوا رووخاندنی بنکەی سەرکیان لە شاری مەدینەدا ،ئەوە بوو داوی بیر کردنەوە لیکدانەوەیان ، نەخشەیکی وورد دابریژی تاکو هیرشکیکی گشتی هەمەلایەنا بکەن سەر شاری مەدینە ، بەلام هیرشەکە زۆر ترین تیروە هۆزی عەرەبەکانی نیمچە دورگە بەشداری تیدا بکە ، بەتاییە تی هۆزەکانی قورەیش و نجد کینانەو غتفان ، پیلانگیرانی جوولەکە بانگەوازی بۆ ئەم جەنگە بکەن کە جەنی الاحزاب بوو، وە خەرجی ئەم جەنگەش لە ئەستۆی هۆزە جوولەکەکانی (خەیبەر ) بوو ، وەك پەرلەمانی جوولەکەوا بوو (خەیبەر ) .

هەروەها (ابن هشام ) – خوا لی رازی بیت – دەلی : چەند کەسیك لە جوولەکە کانی (بنی نضیر ) کە بە هۆی پە یمان شکاندیان لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو، پیغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینەدا دووری خستنەوە ، بەشیکیان چوونە وەلاتی شام ، بەشەکەی تریان چوونە (خەیبەر ) وەك : تیرەی (بنی وائل ) ، ئەو کەسانە بوون کە لەوانە بوون : ( سلام بن ابی الحقیق النضري ) و ( حیي بن اخطب النضري ) و ( کنانة بن ابي الحقیق النضري ) و (هوذة بن قیس الوائلي ) و( ابو عمار الوائلي ) ئەمانە خەلکیان هاندا ، وە کۆمەل دەستەکانیان کۆکردەوە یان حیزبەکانیان کۆکردەوە لە ژی پیغەمبەر ﷺ و موسلمانان ، نوینەریان نارد بۆ لای قورەیشیەکان لە شاری مککە و زۆر یان هاندان بۆ دژایەتی پیغەمبەر ﷺ کە بە یەکەوە بەسەر شاری مەدینەدا بدەن و محمد کۆمەلەکەی ریشە کیش بکەن و تەور وشکیان بەیەکەوە بسووتینن ، بەلی هەر لەم رووداوە دا بوو کە قورەیشیەکان لە جوولەکەکانی (خەیبەر) یان پرسی ئیوە ئەهلی کتابن و زانیاریی و وەحیی ئاسمانتان لایە کە ئیمە لامان نیە ، ئایا ئاینی ئیمە چاکترە یان ئاینی محمد ؟! ئەوانیش ووتیان : بی گومان ئاینی ئیوە چاکترە ..!! ئینجا (خوای گەورە) ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ، کە دەفەرموویت : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا﴾ النساء ٥١-٥٢ . واتا: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی ، کە شتیك لە کتیبی خویان پی دراوە ، ئیمان دینن بە (جبیت یان صەنەم ) طاغووت ، وە بەوانەی ، کە کافرن دەلین: ئیوە دینەکەتان چاکترە لەهی ئەهلی ئیمان ..!! کەواتە هۆی رووداني جەنگی الاحزاب هەل گیرساندنی ئاگرەکەی جوولەکە بوو .

السیره ابن هشام (٣/١٠٣-١٠٤ ) .

ئ

## چوارەم : نەخشەو پیلانی ( الدار الندوە ) یان پەرلەمانی قورەیش ،شاندەکەی جوولەکە :

ئەوە بوو کە جوولەکەی ( خەیبەر ) نوینەری خۆیان رەوانەکرد بۆ لای قورەیش کەئەمانەبوون : ( سلام بن ابی الحقیق النضري ) و ( حیي بن اخطب النضري ) و ( کنانة بن ابي الحقیق النضري ) و ( هوذة بن قیس الوائلي )و( ابو عمار الوائلي ) بەلی ئەمانەلە سەرەتا دا پەیوەندیان بە سەرۆك و فەرماندەکانی قورەیش کرد ، بۆ هیرش کردنە سەر شاری مەدینە ، کە فەرماندەکانی قورەیش ئەمەیان بیست لە شاندەکەی ( خەیبەر ) زۆر دل خۆش و شادومان بوو ن ، یەکسەر رەزامەندیان لەسەر نواند ، سوپاسی جوولەکەیان کرد بۆ ئەم نەخشەو پیلانەی کەدایان رشتووە ،چونکە قورەیش خۆیان نەیان ئەویرە بەتەنها روو بەرووی سوپای ئیسلام بوەستنەوە ، بۆ ئەم مەبەستە فەرماندو سەرۆك پیاو ماقولانی مککە کۆبوونەوەیەکیان ساز کرد لە ( دار الندوە ) دا کەوە پەرلەمانی خۆمان وایە کەئیستا هیچ جیاوازیەك نابینم لە بریاردانیان هەمووکات دژی خەلکی هەژار بریار دەدەکەن لە راستی دا خۆ هیچ شەرعی نیە و چوکە جەندین کەسی نویژ نەکەور زیناکارو گۆرانی بیژو مونافیق درۆزنی تیدایە ، بەلی ئەوان کۆبوونەوەلە ( الدار الندوە ) بۆ نەخشەو پیلانی جەنگی الاحزاب ، بەلی نوینەرانی جوولەکە راستە خۆ چوونە لای قورەیش لە مککە دا هەر چەندە شوین ومنزلی ئەوان لە هۆزی غتفان نزیك تر بوولە قورەیش ، بالام ئەوان دەیانزانی ئەچنە لای کی و وەلامیان چی دەبیت ، هەر بۆیە وەلامیکی باشایان وەر گرت لە قورەیش بۆ هیرش کردنە سەر دەولەتی مەدینە ، بۆ ئەم مەبەستە گەورە پیاوان وسەرۆك فەرماندەکان قورەیش کۆ بوونەوە یان ئە نجامدا پیلانەکەیان تاو توی کرد و ، بۆ ئەوەی هیزیکی یەگرتووی عەرەبی ناوچەکە و یهودی یان جوولەکە دروست بکەن ، ئەوە بوو ( ابو سفیان ) بە ناوی فەرماندە گشتی سوپای قورەیش تووتاریکی پیشکەش کرد بە ئامادە بوان لە ( الدار الندوە ) خۆش حالی خۆی دەر بری بۆ ئەم نەخشە و پیلانە ، هەر لەو دانیشتە دا گەورە پیاوانی قورەیش ئەمەیان بەهەل زانی هەندیك پرسیارین لە زانایانی جوولەکەکان کرد دەربارەی ئاینی قورەیش ئاینی محمد ،وەك لە پیش دا باسمان کرد ، بەلام لیرەدا ناپاکی نامەدری جوولەکە بەدیار دەکەویت هەرچەندە ئاینی جوولەکە ئاینیکی ئاسمانیە وەك ئاینی ئیسلام ، بەلام ئەوان بۆ بەرژەوندی خۆیان ئاینی قورەشیان پی باشتر و چاکتر بوو لە ئاینی محمد ﷺ ئەمەیە رەوشت و سیفاتی جوولەکە ،بەلی دەست پیوندەکان و سەگەکانی شیان هەر وان لەم سەردەمەدا ، دەست بۆ ئاینی شەیتان پەرست ئاینی گاورەکان ئاینی جوولەکە دریژ دەکەن بەلام باوەش بۆ ئاینی ئیسلام ناکەنەوە ، هەمیشە لە دژایەتی کردنی پەیەوانی ئاینی ئیلام دان ، خەریکی نەخشەو پیلان گیری ئەم ئاینە جوانەن خەریکی تیکدانینە جاریك بەناوی لارهاب و تیرۆرستی جاریکی بەناوی ئازادی جاریك بەناوی علمانیەت جاریك بەناوی مافی مرۆڤ ،خەرکی رەخنەگرتن لەم ئاینە پیرۆزەی ئیسلام دا ...؟!

ێ
بەلی جوولەکە دیزانی کە ئاینی ئیسلام یان ئانی محمد ئاینی خوایە ، ئەشیان زانی پیغەمبەری خوا کۆتا پیغەمبەری خوایە ﷺ کە ناردویەتی بۆ هەموو جیهیانیان وە رحمە للعالمین ، وە هەموو نیشانە و ناونیشانەکەی لە کتیبە کانیان داهەبوو ، لە گەل ئەمەش دا پیچەوانەی راستیە کان وەلامیان دایەوە ، ئا ئەوە تا یەکیك لە جوولەکەکانی ئەوسەردەمە دا ئەم کارەی جوولەکەی بە کاریکی هەلە لەقەم ئەدا ، کە ئەویش ئیسرائیلیە (دکتور لفنسۆنە) لە کتیبی (تاریخ الهود فی بلاد العرب ) .

بەلی ئەوە بوو جوولەکە قورەیشی رازی کرد بە و نەخشەو پیلانە ، دواتر بەرەو ( نجد ) بۆ ناو هۆزەکان غتفان کەوتنە ری ، هەروەها ئەوە بوو چوونە ناو هۆزە کانی (بنی موررە ) ، ( بنی فەزارە ) ، ( بنی غتفان ) ، (بنی ئەشجەع ) ، (بنی سلیم ) ، (بنی سعد ) ، (بنی (الاسد ) هەر هۆزیکی تریش کە داخ لەدلی ئیسلام بوون ،جا لەبەر (عوینەی کوری حیصنی کوری بەدر) سەرداری نەوەی (فەزارە ) بوو ، کەبەشیك لە غتفان بوو ، بەلی هەوالیان بەو هۆزانە راگەیان کە نیازی هیرش کردنە سەر شاری مەدینەیان هە یە نەخشەیان بۆ داریژ تووە، هەر هۆزیك دژی ئیسلام موسلمانان بوایە ئەوان دە چوونە لای هانیان ئەدان ، ئەیان ووت : قورەیش رەزامەندی لەسەر داوە خۆی ئامادە کردووە بۆ ئەم جەنگە ، هەروەها چوونە لای (عوینەی کوری حیصنی کوری بەدر) کە سەردای نەوەی فەزارە بوو ، هەروەها لەنیو سەرۆکی غتفان چوونەلای (حاریثي کوری عە وف ) لە نە وە ي موررە ، (ابو مسعوودی کوری روخەیلە ) سەرۆکی ئەشجەع ، (سفیانی کوری عبدالشمس ) نەوەی سلیم ، (طلحە ي کوری خویلدي ) سەرۆکی نەوەی الاسد...
بەلی سەرۆك و فەرماندە ئەو هۆزانە هەموویان رازی و شادومان بوون بە قسە کانی جوولەکە کانی (خەیبەر ) بۆ یە هەموویان خۆیان ئامادە کرد بۆ هیرش کردنە سەر شاری مەدینەو موسلمانان ، ئەوەبوو جەند بەندیکی ریکەوتنیان بەست ئەمانەبوون :

١- پیویستە هۆزە کانی غتفان سوپایەکی (٦٠٠٠ ) هەزار کەسی ئامادە بکەن بۆ ئەمە هەلمەتە بەیەکەوە .

٢-جوولەکەی (خەیبەر ) بەرانبەر بەو کارەی غتان ، بەرهەمی سالیکی خورمای و و هەموو دارخورما کانی (خەیبەر ) بدەن بە هۆزە وتیرەکانی (غطفان ) .

ئ

به لی قورەیش به سەرۆکایەتی (ابو سفیان ) توانی (٤) هەزار جەنگاورە یان سەرباز کۆ بکاتەوە ،بەلام به وپەری چەك تفاقیەوە کەلەلە لایان جوولەکە خەرجی و موسروفی سوپای قورەیش هەموو الاحزابی گرتبووە ئەستۆ ،ئەوە بوو سوپای قورەیش لە لاحزاب بەتنها (١٥٠٠) ووشتریان پی بوو بۆ بارکردن و سەر برین ، هەروەها (٣٠٠ ) ئەسپ سواریشیان پی بوو . هەروەها سوپای ئەسپ سوارە کان (خالیدی کوری ولید ) فەرماندەی بوو ، ئالای قورەیش درایە دەستی (عوسمانی کوری ئەبو تەلحەی عەبدەری ) فەرماندی گشتی سوپای قورەیش بی گومان (ابو سفیان بوو ) هەروەها هەلگرتنی ئالای جەنگی درایە دەستی (نەوەی عبدالدار )، هەروەها لە هەر نەوە کانی قورەیش و شاری مککە ، هەر (٥) پیاو دەهاتن خۆیان هەلدە واسی بە کەعبە و پەیمانیان دەدا تا تاقە پیاویکیان مابی پشتی یەکتر بەردنەدەن و بە کژ سوپای ئیسلام و محمد ﷺ دا بچن ..!!

بەلی هۆزی (غتفان ) (٦٠٠ ) هەزار جەنگاور یان سەربازیان ئامادە کرد ، بەلام (غتفان ) وەك قورەیش یاسای دابەشکردنی کاروباری جەنگی نەبوو ، هەر بۆیە نەیان توانی فەرماندەی گشتی سوپاکەیان دا بنین ، هەر بۆیە هیزەکانی غتفان لە ژیر فەرماندایەتی چوار فەرماندە بوو :

١-نەوەی (فەززارە ) کە فەرماندەکەیان (عوینەی کوری حیصن ) بوو (١٠٠) سوار چاکی هەبوو .

٢-نەوەی (الاسد ) کە فەرماندەیان (تەلحەی کوری خوە یلید ) بوو .

٣-نەوەی (ئەشجە ع ) کە فەماندە کە (مسعوودی کوری روخەیلەی کوری نووەیرە ) بوو .

٤-نەوەی (موررە ) کە فەرماندە (حاریسی کوری عەوف ) کە (٤٠٠) سەد جەناگاور یان سەرباز هەبوو.

٥-نەوەی (سلیم ) ئەوانیش (٧٠٠) جەنگاوەر یان هەبوو .

بە لی بە گشتی سوپای قورەیش و سوپای (غطفان ) لە (١٠٠٠٠) هەزار جەنگاورە پیك هاتبوو ، لە جەنگی الاحزاب یان جەنگی خەندەق ، بیگومان ئەوان بیلانیان دانا بۆ دوا رۆژی ئیسلام لەناوبردنی ئیسلام موسلمانا بۆ کۆتایی هەتا هەتایی ، بەلام ئەمە نەخشەیە نەخشەی زالم ستەمکارانە ئەمەنەخشەی کافرانە ئەمەنەخشەی فاسق و جوولەکەکان هەر گیزاو هەرگیز بە ئاواتە ناگەن کە ئیسلام لەسەر رووی زەوی بسرنەوە ، هەلبەتە دابەزین و سە رکەوتنیش دەبیت ، بەلام ئیسلام هەردەمینی لەرقی چاوی دوژمنانی لە کۆتایشدا هەر ئەو ئیسلام سەرکەوت و سەرفرازە لە رقی چاوی دوژمنانی ئیسلام ...!!!

ێ

## پێنچەم : هەواڵگەری یەکانی دەوڵەتی مەدینە هەواڵی سوپای الاحزابیان پێ گەیشت :

بەڵێ دزگای هەواڵگەری دەوڵەتی مەدینە و سوپای ئیسلام ، لە و پەری وریایی دابوون لەدوژمنانی ، چاودیری هەموو جمودۆڵەکانی دوژمنیان دەکرد ،هەروەها جموجۆڵەکانی جوولە کەکان کۆدکردنەوەی سوپایی لاحزاب ،بەڵێ بە وردی چاودیری جموجۆڵەکانی جولەکەیان دەکرد لە ( خەیبەر ) دا ، کە چۆن دەر جون بە ئاراستەی شاری مککە ،لە گەڵ ئەو زانیاریانەش کە بەدست هات کە جوولەکە جۆن پیلان دادەریژیت بۆ هیرش کردنە سەر شاری مەدینەو لە ناو بردنی سوپای ئیسلام ،هەروەها کە پیغەمبەری خوا ﷺ کە ئەو هەوال زانیاریانە ی پیگەیشت ، خیراو بە پەلە کەوتە خۆئامادە کردن بەرانبەر دوژمنانی ئیسلام ،بەڵی بە پیویستی زانی کە شیوازیکی زۆر چاك بۆ بەرگری کردن لە شاری مەدینە پەیرەو بکات ، بۆ ئەم مەستە بانگی هەموو فەرماندە هاوەلانی کرد لە سوپای ئیسلام دا ، وە هاوەلانی لە ئەنصارەکان و کۆچ کەران ، هەروەها توویژو گفت وگۆی لە گەڵ دا کردن راویژی پی کردن کە چون بەرگری لەشاری مەدین دا بکەن ، بۆ ئەم هەولە نەزۆکەی دوژمنانی ئیسلام کە پیلان دانەر نەخشە کیش جوولەکەی ناپاك و قورەیش و ( غتفان ) بوون ، بەڵی بیگومان وە نەبی دەولەتی مەدینە لە م هەموو رووداو وانەدا بی ئاگابووبی ، کە لە شاری مککە و شی نجد و شاری خەیبەر بی ئاگابی لەو هەموو پیلانەی کە بۆ لە ناو بردنی دەولەتی مەدینە دائەریژن ، چونکە هەوالگەی دەولەتی مەدینە لە ژیر سایەی ئالای ئیسلام دا بە پیشەوایەتی پیغەمبەری ئیسلام ﷺ یەك جار چاو کراوەو ورياو گور جووگۆڵ بوون ، هەموو زانیاریەکیان پی دە گەیشت ،هەر لە پیلانەکەی خەبیەر و بەرەو شاری مککە دواتر ریکەوتن لە گەڵ غتفان لە نجدا ، هەر هەموویان پی گەیشت ، بەڵی هەموو هەوالە کەیان زانی ، وەك ریکەوتنە لە گەڵ جوولە کە لە هۆزەکانی غتفان و قوریش دا ، هەروەها ناوی فەرماندە کانی سوپای الاحزابی شیان زانی ، هەروەها ژمارەی سەربازەکانی سوپای الاحزاب ، ژمارەی ووشترو ئەسپە کانیش ، بەڵی هەوالگەری دەولەتی مەدینە کاتی دیاری کراوی هیرشی دوژمنی شیان زانی ، هەر بۆیە دەولەتی مەدینە کەوتە ئامادەکاری بۆ بەرگری کردن لەشاری مەدینە لەغەزای الاحزاب دا ،ئەوە بوو سوپای ئیسلام لە مەدینە دا خۆی کۆ کردەوە و ، بە پیشەوایەتی پیغەمبەری خوا ﷺ، دەستیان بە وتویژ کردن و یان راویژ کردن کرد ، لە گەڵ پیغەمبەری خوا ﷺ کە جۆن بەرگری بکەن لەشاری مەدینە بۆ ئەم مەبەستە سەلمانی فارسی نەخشەو پیلانیکی سەربازی هەبوو بە ئەم جەنگە ..!؟

ێ

## شەشەم : نەخشەی سەربازی سەلمانی فارسی لە جەنگی خەندەق دا :

بۆ ئەم مەبەست پێغەمبەری خوا ﷺ کۆ بونەوەیەکی ساز کرد ، ئەوە بوو هەموو فەرماندە و هاوەلە کانی پێغەمبەر ﷺ لە نصارەکان و کۆچ کەران ئامادە بوون ، بۆ بەر گری کردن پاریزگاری کردن لە پایتەختی ئیسلام ، ئەوە بوو پێغەمبەرو ( صلی الله علیه وسلم )فەرماندەکانی سوپای ئیسلام ئەوە یان لە لا روون و ئاشکرا بوو کە سوپای الاحزاب ( ٣ ) بە قدرە ) سوپای ئیسلامە ، واتا : سوپای الاحزاب بە ( ١٠٠٠٠ ) هەزار سەر باو چەك تفاقی ریك سوپای ئیسلام بە ٣٠٠٠ ) هەزار موجاهید ، بە باشییان زانی کە سوپای ئیسلام نەچیتە دەروە بەرگری لەشاری مەدینە بکە چونکە لە دەروە توانای ئەو هەموو سوپا زۆرو گەورەیەکە ناگرن لە رووی سەربازیەوە ، ئەوە بوو ناوچەی باکووری مەدینەیان هەلبرژارد تا بیکەنە هیلی بەرگری لە سوپای دوژمن ، لە هەمان کاتدا هاتنە سەر ئەو بریارەی کە سوپای ئیسلام توانای خۆراگری نیە لەدەشتی پان و بەرین دا ، وەك دەشتی ( بەدر ) دا تا لەگەل سوپایەکی وەها گەورە جەنگ بکەن ، بەلی موسلمانەکان خەریکی بیرکردنەوە بوون یان هۆیەکی کاریگە ر بیت بۆ بەرگری کردن لە دەولەتی مەدینەدا ، بەلی ( خوای گەورە )ش نەخشەیەکی زۆر جوان لە وەلاتی فارسەوە ، پیاویك کە لە وەلاتی فارس هاتوو بۆ رزگار کردنی دەولەتی مەدینە ئەویش سەلمانی فارسی بوو ، کە یەکیك بوو لە دانیشتوانی کۆبوونە وە کە ، هەورەها یەکیك بوو لە فەرماندە کانی سوپای ئیسلام ،ئەوە بوو پرۆژەکەی سەلمانی فارسی زۆر کاریگەرو ناوازە بوو، پێغەمبەر و ﷺ هەموو ئەم نەخشەو پیلانەی سەربازی و پرۆژە جوانەکەی ( سەلمانی فارسی ) یان بەدل بوو ، کە لەو کاتەدا بە بیری هیچ عەرەبیکی دوورگە دا نەدەهات ، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پەسەندی کرد و دوعای خیری شی بۆ کرد ، ئا لەو کاتەدا موسلمانەکانیش یەك جار دل خۆش بوون بە پرۆژە جوانەی ( سەلمانی فارسی ) ، بە نەخشە پرۆژەکەی سەلمان بریتیە بوو ، لە هەلکەندنی عەفریك یا خەندەقیك ، هەموو ئەو ناوچانەی کە دەکری سوپای دوژمن زەفەری پی ببات و هیرش بکات ، هەروەها ئەم خەندەقەش یان ئەم قول کردنی زەویە وەك عەفر ، بەر لە گەیشتنی سوپای الاحزا ب دروست بکریت ...

ئ

**هەروەها بۆ بەرگری کردن لە شاری مەدینەدا سوپای ئیسلام و فەرمانده کانی لەسەر ئەم خالانە ریکەوتن:**

١-سوپای ئیسلام لەناوشارد بمیننەوە هەر لەویدا بەرگری لەشاری مەدینەدا بکەن .

٢-لە لای باکوری شاری مەدین بکەنە هیلی بەرگری سەرەکی سوپای ئیسلام ،کە ئە کەویتە پیش (چیای سەلع ) بە مەرجی ئەم چیایە بکەویتە پیشتی سوپای ئیسلام .

٣-سوپای ئیسلام ، بەدیاری کردنی نەخشەکەی سەلمانی فاری خەندەقیك هەلکەنن ،کە ببیتە بەربەستیك لە نیوان خۆیان و سوپای الاحزاب .

٤-موسلمانەکان لە ناو شاری مەدینەدا ، ژن مندال و پیرو پەکەتەکانیان بخەنە ناو قەلا سەختەکان بۆ ئەوەی بپاریزرین لەدەستی سوپای الاحزاب ، نەوەك دوژمنی سەر سەختی ئیسلام هیرش بکاتە سەریان بە تایبەتی جوولە کەکانی (نەوەی موصتلق ) نەوەی (قوریظة ) .

٥- پیویستە سوپای ئیسلام هەمووشەوەیك پاسەوان و چاودیری کردنی مەدینەو گەران و دەوریەی هەبیت بۆ جموجۆلی دوژمن نەوەك لە ناکاو هیرشی بە فراوان بکاتە سەر شاری مەدینە .

**بەلی ئەم پرۆژەی سەلمانی فارسی بۆ یەکەم جار بە کارهینرا لە جەنگی الاحزاب دا ، کە لە میژووی عەرەبی دا، وینەی نەبوو ، بەلی ئەم خەندەقە کە لی درا هەر چوار دەورەی شاری مەدینە نەبوو ، بەلکو تەنها لەو شوینانە لی درا کە دوژمنا توانای هەبوو بە سواری ئەسپ پیادە بیتە ژوورەوە ، وە لە شوینی چیاکانە و گردە کان سەرنگەریا لی دابوو تیر هاویژەکانی تیدا دانا بوو بۆ بەر گری کردن و پاسەوانی ،بەلی هەریەك لە زانایانی ئیسلام وەك : (واقیدی ) لە مغازی (٢/٤٤٤) ، (ابن سعد ) طبقات ابن سعد (٢/٦٦) ، (ابن هشام ) في السر النبوية (٣/١٠٩)، (ابن کثیر ) في بداية والنهاية (٤/١٢١). هیناویانەوە دەلین : سەلمان فارسی ووتی : ( يا رسول الله انا اذا كنا بأرض فارس وتخوفنا الخيل ، خندقنا علينا فهل لك يا رسول الله ان نخندق ؟! فأعجب رأي سلمان المسلمين ). واتە: ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیمە لە وەلاتی فارس دا کاتیك ، کە لە ئەسپ سواری دوژمن دەترساین ، لەو شوینەوە کە دوژمن دەتوانی لییەوە بی خەندەقمان لی دەدا ، ئایا فەرما نمان پی ناکەی خەندەقیك لی بدەین ؟! موسلمانان سەر سام بوون بەو پیشنیارەی سەلمانی فارسی وە پیغەمبەر خوا ئەم پیشنیارەی سەلمانی بە کردار هەلسەنگاندو پی زۆر چاك بوو بە لیدانی خەندق ..!!**

ی

هەروەها (ابن هشام ) لە سیرە النبویە (١٠٦/٣)- (١٠٩/٣ )، (ابن کثیر ) في بدایة والنهایة (١٢١/٤ ).

هیناویەتەوە دەلی : کۆچ کەران ووتیان : (سلمان منا ) واتە : سەلمان لە ئیمەیە ، ئەنصارەکان ووتیان : (سلمان منا ) واتە : سەلمان لە ئیمەیە ) بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (سلمان منا اهل البیت ) واتە : سەلمان لە بنەمالەی ئیمەیە ..!!هەروەها بی گومان ئەو خەندەقەی کە لی درا ، لەشاری مەدینە هەموو بە هیزو بازوی خۆ ماندو کردنی موسلمانان بوو ، بە تەئکید کاریکی زۆر سەخت و ماندوو بوونیکی زۆری پیوە دیارە بوو ، هەروەه پیغەمبەری خوا ﷺ خۆشی لەگەل هاوەلانی دا بەژداری کردن یارمەتی هاوەلانی دا لە هەلکەندنی ئەم ەخەندەقە دا بە دەوری مەدینە بی گومان ئەو شوینانەی کە دوژمن زەفەری بۆ دەبرد توانای هیرش کردنی هەبوو خەندەقیان لی دا ، بەلی ئەم خەدەقە بە (زراع ) باسك پیوانەیان کرد هەربە شی کیان دایە تیرەو هۆزەکانی شاری مەدینە وە ئەنصارە کان و کۆچ کەران ، لە ئەنصارەکان وە (اوس و خەزرەج ) بەلی موسلمانا زرۆ دل خۆش بوون لە هەلکەندی ئەم خەندەقە بۆ پاراستنی شاری مەدینە ، بەلام ئالەم کاتەدا مونافیقە کان و دوو رووە کانی شاری مەدینە پی یان نا خۆش بوو ، موسلمانان سەر کەوتن بەدەست بینن خۆیان دە دزیەوە لە هەلکەندنی ئەم خەندەقانە ، هەروەها (خوای گەورە ) ش لەبارەی هەلوستی ئیمانداران وموسلمانان ، و ە ئەم مونافیقانە و دوو رووانە ی شاری مەدینە کە بەروالەت خۆیان بە موسلمان دادەنا بە لام لە ناخەوە دل پیس و دل رەش و ناپاك و بۆگەن بوون ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُولَئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَنْ لِمَنْ شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٦٢) لَا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنْكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ النور ٦٢-٦٣ .واتا:بە راستی ئیمانداران ئەوانەی کە باوەریان هیناوە بە خواو بە پیغەمبەرەکەی و هەر کاتیك کۆدەبنەوە لە خزمەتیدا بۆ کاریکی گرنگ و پیویست کە هاریکاری دەویت ، نارۆن خۆیان نادزنەوە ، هەتا مۆلەت نەخوازن ، بەراستی ئەوانەی کە مولەت لی دەخوازن هەر ئەو کەسانەن ،کە باروویان بە خوا پیغەمبەرەکەی هەیە ، هەر کاتیك بۆ کاریکی تایبەتی خویان دوای مۆلەتیان لی کردیت ، ئەوە مۆلەتی ئەوانە بدە کە دەتەویت و دوای لی خۆش بوونیشیان لە خوا بۆ بکە ، بەراستی خوا لی خۆشبوو میهرەبانە..!!

ئ

ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر، نەکەن بانگی پێغە مبەر بکەن ، وەك ئەوەی خۆتان لەنێوان یەکتر دا بانگی یەك دەکەن و چونکە دەبێت قەدری پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەتی بێت ، بێ گومان خوا دەزانێت بەوانەی کە خۆیان پەنهان دەکەن و خۆ دەدزنەوە لە کارو فەرمان ، دەبا ئەوانەی کە سەر پێچی لە فەرمانی دەکەن ، بترسن لەوەی کە تووشی تا قی کرنەوەیەکی سەخت ،یان تووشی سزایەکی بە ئێش بن ..!!

ئ

## حەوتەم : ڕۆلی پیغەمبەری خوا ﷺ چەند موعجیزە یەك له كاتی جەنگی الاحزاب :

١-كاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ هاتنی سوپای الاحزابی پی گەیشت ، فەرمانی كرد بە ژن و مندالەكان بچنە ناو قەلاكانی (بنی حارث ) بۆ ئەوەی لەویدا سەلامەت و پاریزراو بن ، چونكە سەلامەتی ژن و مندالای هاوەلانی پیغەمبەر كاریگەری زۆری هەیە ، لەسەرووری موجاهیدان دا ، ئەوان مال ومندال یان سەلامەت بیت ، زیاتر بەرگری دەكەن و ئیمان دامەزراو تر دەبن ، هەر بۆیە مەترسی دوور خستەوە لە سەر ژن و مندال و پیرو پەكەوتە دا .

٢-یەكیك لە بەهیز بوونی بەرگری كردن لەشاری مەدینەدا بەهیز بوونی مجاهیدەكان یان هاوەلانی ، ئەوە بوو كە پیغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی سەرپەرشتی كاروبارەكانی دەكرد ، هەروەها بەدەستی پیرۆزی خۆی خەندەقی هەلدەكەندو بەژداری لە هەلكەندی ئە خەندەقەی دە كرد ،هەروەك لە (ابن اسحاق ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت " من گویم لەو بارەیە بوو كە دەی فەرموو: ( لەرۆژی الاحزب دا لە كاتی هەلكەندنی خەندق دا ، پیغەمبەر م ﷺ بینی خۆلی دەگواستەوە ، تەنانەت خۆل بیستی سگی دا پۆشی بوو ، )البخاری كتاب المغازی غزوە الاحزاب رقم ( ٦، ٤١ ) .

٣-پیغەمبەری خوا ﷺ بەژداری لە ناخۆشی و نارەحتی هاوەلانی نی دەكرد ، بەلكو خۆی ناخۆشی نارەحەتی و سەختیەكانی هەلدەگرت ، لە جیاتی هاوەلانی دا ، هەروەها لە غەزای الاحزاب دا ئازرای برسیەتی دەبینی ، بەردیكی لەسگی خۆی بەستووە لە بەر ئازاری برسیەتی دا ).

٤-بەرزكردنەوەی وورەی موجاهیدانی جەنگی الاحزاب ، لە كاتی هەلكەندنی خەندق دا ، نارەحەتی زۆری تیدا بوو ، لەم وەرزەدا زۆر سارد بوو ، وە رەشەبایی بەهیز توند بوو ، بارو دۆخی بژیوی برسیەتی و كەم درامەتی ئازوقەو خۆراك لە و پەری خراپی دا بوو ، بیجگە لە مەترسی هیرشی دووژمنانی سوپای موشریكان الاحزب ، هەر بۆیە پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) لەگەلیاندا خۆلی دە گواستەوە و دل خۆشی دەدانەوە وورەی بەرز دەكردنەوە و ، شعری یان هوناوەی ( عبدالله كوری راوحە ) یان دەگوتەوە ..

اللهم لو لا انت ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا

فانزلن سكينة علينا وثبت الاقدام ان لاقينا

ان الا لي قد بلغو علينا وان ارادوا فتنة ابينا

البخاری كتاب المغازی غزوە الاحزاب رقم ( ٦، ٤١ ) .

ئ

**هەروەها لە ( انسی کوری مالك ) – خوا لی رازی بیت – هاتووە دەلی : هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )لەرۆژی خەندەق دا ئەیان ووت :**

**نحن بايعوا محمدا على الاسلام ما بقينا ابدا**

**یان دە یان ووت :**

**اللهم الخير خير الاخرة فاغفر للانصار والمهاجرة**

**رواه المسلم كاتب الجهاد والسير باب غزوة الاحزاب ( ١٤٣٢/٣ ) رقم ( ١٢٩ ).**

**٥-مولەت پی دانی هاوەلانی پیغەمبەر ﷺ لە کاتی خەندەق لی دان دا ، بە هاوەلانی خۆی ئەوانەی کە ئیمان و دامەزراوی راستەقینەیان هە یە ، بە پیغەمبەر و ( صلی الله علیەوسلم ) بەخوای گەورە ، کە دوای مولەتیان دەکرد بۆ کارەکانیا هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُولَئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَنْ لِمَنْ شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ **النور ٦٢ .**

**واتا:بە راستی ئیمانداران ئەوانەی کە باوەریان هیناوە بە خواو بە پیغەمبەرەکەی و هەر کاتیك کۆدەبنەوە لە خزمەتیدا بۆ کاریکی گرنگ و پیویست کە هاریکاری دەویت ، نارۆن خۆیان نادزنەوە ، هەتا مۆلەت نەخوازن ، بەراستی ئەوانەی کە مولەت لی دەخوازن هەر ئەو کەسانەن ،کە باروەیان بە خوا پیغەمبەرەکەی هەیە ، هەر کاتیك بۆ کاریکی تایبەتی خویان دوای مۆلەتیان لی کردیت ، ئەوە مۆلەتی ئەوانە بدە کە دەتەویت و دوای لی خۆش بوونیشیان لە خوا بۆ بکە ، بەراستی خوا لی خۆشبوو میهرەبانە..**

**٦-دابەش کردنی موجاهیدانی سوپای ئیسلام لەلایەن پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ پاسەوانی و شەونخۆنی کردن و ، ئیشکگری ، بەلی پیغە مبەری خوا ﷺ هاوەلانی دابەش کرد ، بۆ جەند دەستەو کۆمەلیك بە مەبەستی بەرگری کردن ، لە هەر کەسیك بە یەویت بپەریتەوە لە خەندەقەکەدا ، لە راستی دا موجاهیدان بە پیشەوایەتی پیغەمبەری خوا ﷺ توانیان هەموو هیرشەکانی سوپای لاحزاب بشکینی بە سەر شۆری بگەرینەوە شوینی خۆیان ..**

**٧-ئەو بەردەی کە زۆر رەق بوو بۆ هاوەلان نەدەشکا :**

ێ

له (جاربری کوری عبدالله ) – خوا لی رازی بیت – یەکیك لەو موعجیزانەمان بو دە گیریتەوە دەلی : لەو شوینەی ، کە ئیمە زەویمان هەلدەکەلاند گەیشتینە شوینیك کە زۆر رەق و سەخت و بەزەحمەت بوو بۆ مان نەدەشکا ، چووینە لای پیغەمبەری خوا ﷺ گوتمان ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسيلم ) ! ئەو شوینە زۆر رەق و سەختە ، نازانین چۆن هەلکەنی نین و ناکریت لەوشوینەش بگوازینەوە ؟! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەندیك ئاوم بۆ بهینن ، ئاوە کەمان بۆ هینا و دوعای بەسەردا خویندو بەسەر ئەوشوینە رەقەی دا داکرد ، دوای دەستمان کرد بە هەلکەندنی ، سویند بەو کەسەی کردوویەتی پیە پیغەمبە ر ئەو شوینە زۆر بە ئاسانی هەلکەندرا وەکو لمیکی لیك هەلوەشاوەی لیهات ). ابن هشام فی السیر النبویه (١٠٥/٣).

٨-بەرکەتی خورما بە دوعای پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم )

له (ابن هشام ) – خوا لی رازی بیت – هەمان سەرچاوە ابن هشام فی السیر النبویه (١٠٥/٣) بۆ مان دەگیریتەوە دەلی : ( کچی بشیر کوری سعد ) کە (خوشکی نعمانی کوری بشیر ) بوو ، دەلی : یەکیك لە رۆژەکانی غەزای خەندەق دا ، دایکم هەندیك خورمای لە گوش کرد پی دام و ووتی : رۆلە ئەمە ببە بۆ باوکت و خالت واتە: (عبدالله ی بن رواحه ) با جەمی نیوەرۆی پی بخۆن ، ئەلی : منیش رۆیشتم و بەلای پیغەمبەری خوا دا ﷺ تیپەریم ، ئەویش بانگی لی کردم و لی پرسیم ؟! کچە کەم یان رۆلە کەم ئەمە چیە پیتە ؟! ئەلی منیش ووتم : خورمایە دایکم پی داوم بۆ باوکم و خالم ببەم بۆ ئەوەی جەمی نیوەرۆ بخۆن !! پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی بۆم بینە !!

ئەلی ، منیش خورماکەم بۆ برد و لەدەستی موبارەکەیم کردن ، دوایی ئەو لەسەر پەرۆیەکی رۆکردن و دوعای بەسەردا خویندو فەرمووی : موسلمانینە ! هەموو وەرن لی بخۆن !! ئەوەی لەسەر هەلکەندنی خەندەق بوو ، هەموو هاتن ، هەر کەس و بە ئەندازەی خۆی لی خوارد ، خورماکە هەر وەك خۆی مایەوە هیچ کەمی نەکرد ..!!

ئ

**٩-بەرکەتی بەرغەکە یان کاورەکەی ( جابری کوری عبدالله ) – خوا لی رازی بیت - :**

هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا کە ( ابن هشام ) لە ( جابری کوری عبدالله ) دا –خوا لی یان رازی بیت - دە گیریتەوە دەلی : ئیمە بەرغیکی یان کاوریکی بچوکۆلەمان هەبوو ، قەلەویش نەبوو ، بە هاوسەرکەشم ووت : کە هەندیك لە جۆ بە کووتە بیکە بە نان ، بەرغەکەشم سەر بری و بۆ پیغەمبەرمان ﷺ برژاند ، کاتی ئیوارە کە پیغەمبەر ﷺ خەندەقی بەجی هیشت گەرایەوە تاکو کەمیك ئیسرحەت بکات ، ئەلی منیش پیم ووت : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه و سلم ) خواردنیکم بۆ ئامادەکردی ، وە دوام لی کرد کە بیتەوە مالمان ، بەلام دەم ویست بە تەنها بیتەوە بۆ ئەوەی خواردنەکە بەش بکات ، کە پیم ووت : ئەویش فەرمووی : باشە . یەکسەر بەیەکیك لە هاوەلانی ووت :کە بانگ لە هاوەلاکان بکات هەموویان بین بۆ مالی ( جابر ) ئەو هات خەلکە کەش لە گەلی هاتن ، دانیشتن ئەیمەش خوردنەکەمان هینا پیشی ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( بسم الله ) دوعای کرد و دوای بەرکەتی لە خواردنەکە کرد ، ئینجا دەستی کرد بە خوردن هاوەلان ئەوەی بانگی کردبوو لە گەلی بوون هەر هەمووی دەستیان بە خواردنەکە کرد ، دوای ئەوانیش خەلکیکی دیکە هاتن کە خەریکی هەلکەندنی خەندق بوون ، هاتن و لی یان خوراد ، بەو شیوەیە ئەو خواردنە کەمە دوای دوعای پیغەمبەر ﷺ بەشی خەلکە کەی کرد و کۆمەل کۆمەل نان یان دەخوارد دەرۆیشتن )..!

ابن هشام في السير النبويه (٣/١٠٥-١٠٦).

**١٠-گاشەبەردەکەی شکاند بە چەکۆش یان شتیك وەك چەکوش یان سی بلیسە لی بەرز بۆ وە :**

لە ( سلمانی فارسی ) یەوە بۆ مان دەگیریتەوە دەلی : لە کاتیك دا خەریکی هەلکەندنی خەندقە کە بووین ، تووشی گاشە بەردیکی زۆر گەورە بووین ، هەر چەند چەکوش یان شتیك کە بەرد بشکینی ، ئەلی لیمان ئەدا لەبەردەکەدا هەر دە قوزیەوە نەدەشکا ، ئەلی ئیمە گیرمان خواردبوو بەدەستی ئەو گاشە بەردەوە هیلاو ماندووی کردبووین ، بۆ مان نەدەشکا ببوە بەربەست لیمان ، ئە لی ئیمە ش هانامان بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ برد ، بۆئەوەی ریگە جاریەك لەم گاشە بەردە بکەین ، سەلمان ئەلی : پیغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هینا بۆ لامان ، چەکوشەکە یان شتیك وەك چەکوشە کەی لی وەرگرتم چووە ناووخەندەقەکە ، سی جاران دای وەشاندو سی بلیسەی لی بەرز بۆوە ، لە گەل هەر بلیسە یەدا ، دەی فەرموو: ( الله اكبر ) دوایی پرسیارم لیکرد ، لە بارەی ئەو سی بلیسانەوە ، ئەویش فەرمووی : بۆچی ( سلمان ) تۆش بینیت ؟! سلمان ئەلی ووتم : بەلی . ئەویش فەرمووی : بلیسەی یەکەم ( یەمەن )..

ئ
بە لی دەر کەوت ئۆمەتی من ئەوەی دەگرن ، لە بلیسەی دووەم دا شام ولای رۆژئاوام لی دەرکەوت (ناوچەی رۆما ) ئۆمەتی من ئەویش دەگرن ، لە بلیسەی سی یەم دا لای رۆژهەلات و (ناوچەی فارسم لی دەرکەوت . کە ئومەتی من ئەویش دەگرن ، کە ئۆمەتی من ئەو سی شوینە ئازاد یان فتح دەکات ،

لەدواییی هندیك لە دل نەخۆش پیس بۆگەنەکان و مونافیقەکان و دوو رووەکان دەیان ووت : محمد وعدو پەیمانی داوە کۆشکە کانی رۆماو فارسمان پی دەدا ، کەچی ئیمە ناویرین بچین دەست بە ئاو بگەیەنین..!! ابن هشام فی السیر النبویە (٣/١٠٥-١٠٦).

ئ

## هەشتەم : تەواو بوونی خەندەق :

بەلی دریژی ئەو خەندەقە ( ٥ ) هەزار بال بوو ، بەلام قولایی خەندەق لە ( ٧ ) بال زیاتر نەبوو ، پانایشی لە ( ٩ ) بال کەمتر نەبوو ، ئەوەبوو بۆ هەر ( ١٠ ) کەس لە هاوەلانی پیغەمبەر ( ٤٠ ) بالی بۆ دیار کرا ، بۆ ماوەی یەك مانگ خەریکی هەلکەندنی ئەم خەندەقە بوون ، تەواو بوونی خەندەقە کە لەلای باکووری مەدینە و ،هەروەها بوونی سی ناوچەی بەردەلان لە هەرسی لایەکەی تری شاری مەدینە ، هەروەها بوونی دارو درخت خانووبەرو بوونە قەلایەکی سەخت لە رووی هەر سوپایە ك ئەگەر بیەویت بیتەناو شاری مەدینە کە ری لە ئەسپ سواری و پیادە دەگرت ئە گەر بیەویت بیتە ناو شاری مەدینە ، هەروەها بوونی هەرسی ( حەررە ) یەکیان لە باشوورەوە ، ئەوەی تریان ( حەررە ی وەبرە ) لە خۆئاواوە ، وە ( حەررەی واقم ) لە خۆرهەلاتەوە ، بەر بەستیکی سروشتی بوون کە نە ئەسپ سواری نە پیادە نەیان ئەتوانی بەناو ئەو بەردە رەشە نووك تیژانەدا بە ئاسانس هاتوو چۆ بکەن ، ئا بەم شیوەیە مەدینە بووە قەلایەکی زۆر سەخت بۆ سوپای الاحزاب کە نەیان ئەتوانی وا بە ئاسانی داگیری بکەن و تالانی بکەن ...!!!

بەلی کاتیك خەندەق تەواو بوو ،( ٣٠٠٠ ) هەزار لە موجاهیدان لە ئەنصارەکان و کۆچ کەران ، بەجل بەرگی سەربازی لە پشتی خەندەقە وە وەك پاسەوانیك بۆ پاراستنی شاری مەدینە وەستان بەرانبەر سوپای الاحزاب ، پیغەمبەری خواش وەك پیشە وایەتی ئەم موجاهیدانە لە گەل یان دابوو ، هەروەها موجاهیدەکان دوو ئالایان پی بوو ئالای کۆچ کەران درایە دەستی ( زیدی کوری حاریسە ) وە ئالای ئەنصارەکان درایە دەستی ( سعدی کوری عوبادە ) وە فەرمانیش درا هەرچی ژن مندال و پیرو پەکەوتە هەیە بچەن قەلاکانەوە ، لە هەمان کات دا دوریەی موجاهیدەکان بەدەوری شاری مەدینەدا ئەسورانەوە بەدەنگی بەرز خەریکی ووتنی ( لا اله الا الله ) و ( الله اکبر ) بوون ، نەوەك دوژمن لە ناکاو دەست بوەشینی یان هیرش بکات ، ئەمەش بۆ ترس و دلە راو کی بوو لە دلی دوژمنانی سوپای الاحزاب ، بی گومان دە بیت هەموو کەس لەم ووتانە بترسیت ئەگەر بیەویت ستەم و زلم داگیر کاری بکات ، هەر بۆیە وەك سامیك بۆ دوژمن ئەمەیان ئەووت تا کوو وورەی خۆیان پی بەرز بیتەوە ،بە ووتنی : ( لا اله الا الله ) و ( الله اکبر ) هەروەها ترسیش لە دلی دوژمن دا گیرسینن ، بەلی هەروەها هیزی تایبەت بۆ پاسەوانی شار و پاریزگاری کردن لە ژن و مندالە کان کرایە بە دوو بەشەوە ئەویش ( زیدی کوری حاریسە ) ئەوەی تریان ( مەسلەمەی کوری ئەسلەم ) سپیردرا ..!!

ئ

## نۆههم : ، هاتنی سوپای الاحزاب :

بهلی نهخشه كهی كه له شاری مككه داریژار بۆ داگیر كردنی شاری مهدینه ، دوای ئهوهی سوپای الاحزاب ئاماده كرا به چهك و تفاقی زۆرهوه ، فهرمانده كانی قورهیش و سوپای الاحزاب فهرمانیان دا سوپا بهری كهویت بۆ شاری مهدینه ،كه گهیشتنه ناوچهی ( غتفان ) ئهوه بوو له گهل هۆزهكانی هاوپهیمانیان له ( غتفان ) ( ٦٠٠٠ ) ههزار له سهربازیان ئاماده كرد به فهرماندهیاتی سهرۆك هۆزهكانی غتفان كهله پیش دا باسمان كرد ،ههروهها قورهیش و هۆزهكانی شاری مككه ' ( ٤٠٠٠ ) سهر بازیان ئاماده كرد بوو ، سوپای قورهیش به فهرماندهیاتی ( ابو سفیان ) سوپای غتفان به فهرماندهیاتی چوار سهرۆك هۆزهكان وهك ( بنی فهززاره ) ( بنی الاسد ) ( بنی ئهشجهع ) ( بنی مورر ) یان ( بنی سلیم ) بهلی ئهمانه له ( مر الظهران ) به سوپای قورهیش گهیشتن ، ههروهها جووله كه قورهیش و سوپای الاحزاب ، ریكهوتبوون كه جوولهكهش به سوپای بهشداری له جهنگی الاحزاب دا بكهن ،ئهوه بوو ( حویهیی كوری ئهختب ) كه سهرۆكی نوینهری جوولهكه بوو ، كه له هاوپهیمانیه كهیان له مككه بهستیان له گهل قورهیش و ههروهها له گهل هۆزهكانی غتفان ، ههروهها جوولهكه بهلینی به فهرماندهكانی الاحزاب دابوو ، كه قناعهت به جوولهكهكانی ( بني قوريظة ) بكهن ، كه ئهگهر سوپای الاحزاب هیرشی كرد ، ئهوانیش له پشتهوه دهست له سوپای ئیسلام بوهشینن ..!! بهلی ئا بهم شیوهیه ( ١٠٠٠٠ ) ههزار سهربازی قورهیش و غتفان هاوپهیمانیان كرد له گهل جووله كهكانی (( بني قوريظة ) كه ئهوانیش ( ٩٠٠ ) سهربازی جوولهكه ده بوون ، بۆ كاتیكی سفر و دیاری كراو ئاماده كرا بوون ، ههروهها ژمارهی موسلمانهكان كه ( ابن حزم ) دهر بریوه له كتیبی ( جوامع السيره ) دا له ( ٩٠٠ ) موجاهید تیپهری نهدهكرد له كاتیك دا كه ژمارهی موونافیقه كان ههر زیادی دهكرد و دهكشانهوه لهم جهنگهدا خۆیان دهدزیهوه تا كو بهشداری ئهم جنگه نهكهن ، بهلی ئهمه زۆر راسته ، بهتایبهتی دوای ئهوهی كه دوو رووهكان خۆیان دهدزیهوه له كاتی تهنگانهدا ، چونكه له بۆ صولحی حودیبیه و نه بۆ جهنگی خهیبهر موسلمانهكان خاوهنی ( ٣٠٠٠ ) ههزار نهبوون ، خۆ ئهگهر موجاهیدانی جهنگی الاحزاب ( ٣٠٠ ) ههزار سهر باز بوونایه ئهوا پیویستی بهخهندهق نهدهكرد.( خوای گهوره زاناتره ) ئهوه بوو پیغهمبهری خوا ﷺ دووپیاوی لههاوهلانی نارد بۆ ههوال و زانیاری كۆ كردنهوهی سوپای الاحزاب بهر لهوهی بگهنه سنوورهكانی شاری مهدین ، ئهویس ( سولهیت ) و ( سوفیانی كوری عهوف ) ئهوانیش بهری كهوتن بۆ ههوال و زانیاری كۆ درنهوهی ئهم سوپاگهورهیهی الاحزاب ، بهلی ئهوان تووشی دهوریهكی سوپای الاحزابوون ، ئهوانیان گرتوو ، ههر دووكیان شههید كرد ، ئهوه بوو موسلمانهكان به ههر چۆنیك بوو تهرمی دوو شههیدهكهیان هینایهوه ، بهلی پیغهمبهری خوا ﷺ ههر دوو شههیدهكهی له گۆریك بهیهكهوه ناشت ..!!

ێ

بەلی دوای ئەوە سوپای الاحزاب گەیشتە شاری مەدینە ، سوپای قورەیش لە ( مجمع الاسیال ) لە نیوان ( جرف ) و ( زغابە ) سەر بازگەیان دورست کرد ، هەروەها سوپای ( غتفان ) لە ( ذنب نقمي ) لە لای خۆرئاوای ئوحود سەربازگەیان دروست کرد ، هەروەها سەرۆکی جوولەکە کە ( حویەیی کوری ئەختب ) لە نیوان سوپای قورەیش و سوپای غتفان هاتوو چۆی دەکرد ، بۆ گەرم کردنی ئەم جەنگە دژی موسلمانان ،نەخشەیان دارشت هەر لە باکووری شاری مەدینەوە هەتا خۆرهەلات ، هیرشی بەهیز بکەنە سەر شاری مەدینە ، هەروەهاش ( ٩٠٠ ) سەربازی جوولەکەکانی ( بني قوریظة ) کەو تبوونە بەشی باشووری مەدینە لە دوای سوپای ئیسلام دا بوون ، ئەوان ئامادەی سەعاتی صفر بوون ، لە پشتەوە دەست بوەشینن لە سوپای ئیسلام دا ، هەر چەندە خۆ ( بني قوریظة ) پەیمانی ئاشتی لەنیوانیان دابوو ، کە بەیەکەوە بەرگری لەشاری مەدینەدا بکەن لەگەل موسلمانەکان ، بەلام ئەوان هەمیشە ناپاك و خیانەت کار بوون ، چاوەری سەعاتی صفریان دەکرد ، کە شەر گەرم بوو ، ئەوان هیرش بکەنە سەر موسلمانەکان لە پشتەوە ، ئیتر جوولەکە گوی بە پەیمان و وعدی خۆیان نادەن ، چونکە هەمیشە ناپاکی ئابروو چوون سەر شۆری مەبەستیانە ، بەلی کاتیك فەرماندەکانی سوپای الاحزاب گەیشتنە سەر خەندەق زۆر سەر سام بوون بە م نەخشە جوانەی سوپای ئیسلام ، کە بۆ خۆ پاراستنی خۆیان ئەنجامیان دابوو ، کە لەوەو پیش شتی وەهایان نەبینی بوو ، و بەلی خەندەق ئەو ١٠٠٠٠ هەزار سەربازی سوپای الاحزابی قول بەست کرد ، تاکو نەتوانن دەست لە سوپای ئیسلام بوەشینن ، بەلی فەرماندە کانی سوپای الاحزاب چوونە لای ( حویەیی کوری ئە ختب ) تاکو نەخشەی هیرش کرد بکیشن بۆ سەر مەدینە ، بەلام چیان بینی ، ئەوە نەخشە جوانەی سەربازی ئەو تاکتیکەسەربازیەی ( سەلمانی فارسی ) یان بینی کە هر گیز عەرەب ئەو نەخشەی نەبینی بوو لە پیشدا ، ئەوە بوو خەدەق ٢٠٠٠ مەتر بوو ، قولایی ٤ مەتر بوو ، پانی ٣ مەتر بوو ، هەتە بەر چاویان سەرەرای ئەوەش کە موجاهیدە گیان فیدا کان شەو رۆژ پاسەوانی ئەم خەندەقە بوو لە پشتەوە دا ، بەلی فەرماندەکانی سوپای الاحزاب هیچیان بوو نەکرا ، بەرانبەر بەم خەندەقە ، بەلام بەریاریان دا کە ئابلوقەی شاری مەدینە بدەن واتە گەمارۆیان خستە سەر شاری مەدینە بەدەوری خەندەق دا هەر کە هەلیکیان بۆ برخسیت دەست بە هیرش کردن بکەن ، لە هەمان کات دا موسلمانەکان زۆر ئازاریان جیشت بە دەست ماندووبوون وشەو نخونی و برسیەتی و بەرگەی ساردو سەرمایان ئەگرت کە دیارە ئەم سالە زۆر ساردو سەرما بووە ، موسلمانە کان بە کەمی تفاقی خۆیان بەرگەی ئەم هیرشەی دوژمنانی ئیسلامیان گرت ، ئەوەتا ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾ **الاحزاب ٢٢** .

ێ

## ده یەم: ئازارو نارەحەتی موسلمانان لە جەنگی الاحزاب :

بەلی بی گومان سوپای ئیسلام بە ژمارە زۆر کەم بوون ، لەبەردەم سوپای الاحزاب دا ، چونکە ئەوان لە ۱۰۰۰۰هەزاریش زیاتر بوون ، بۆیە ناچار بوون ئەگەر بە ئازارو نارەحەتی ماندوو بوونیش بیت ،لە بە ردەم ئەم سوپا گەورەیە ی الاحزاب خۆ راگر بن، چونکە هەموو حیسابی کیان کرد بوو ، هەر چی هەول و ماندو بوونی خۆیان هەبوو ، ئا لەم جەنگە دا خستیانە گەر بۆ ئەوەی بەسەر ئەو سوپا گەورەیەی الاحزاب دا سەر بکەون ، بەلام سوونەتی خوای گەورە بوو ، ئەگەر زەحمەت و نارەحەتیان تووش نەبیت ئا ئەوا ئەم سەر کەوتنە گەورە بەدەست نایەت ، یەکیك لە نارەحەتیەکان موسلمانان لەم کاتەدا ئەوە بوو ، هەلوەشاندنەوەی عهد و پەیمان لە لایەن جوولەکەکانی (بني قوريظة ) ، دوا تریش ئەو ترس و لەرزە ی موسلمانا کە بەشەو رۆژ پاسەوانیان ئەکرد کە نەدەبا دوژمن دزە بکاتە سەر شاری مەدینە ، هەورەها ئەو سەرماو سۆلەی زستان کە بەسەریان دا هات سەرەرای ئەوە ش ئا لەم سالە دا گرانی و برسیەتی بەر پا ببوو ، لە لایەکی تریشەوە ئەو کەسانەی کە بەس بە روالەت موسلمان ببوون ، دل یان رەش و پیس بوو ، حەزیان دەکرد موسلمانە راستەقینەکان ئەوانەی باوەر دار و دامەزراو بوون ، هەموویان تیا بچن ، بۆ هەر لە م کاتەدا ئەوان واتا مونافیقە کان و دوو رووە کان ترس و دلەراوکی یان بلاو دەکردەوە لە دلی موسلمانان دا هەمیشە خەریکی پرو پاگەندی درۆ و دەلەسەبوون ،باوەریان وا بوو کە لەم کاتەدا لە ناو چوونی دەلەتی مەدینەو موسلمانان نزیك بووە، هەر بۆیە ئەو مونافیقانە سامیان نەما لە موسلمانان ترسیان شکا ، بە ئاشکراو پرۆ پاگەندو قسە و ووره رووخاندنی موسلمانانیان دە کرد ، بەلی یەکیك لەو کە سە مونافیقانە کە گالتەی بە پیغەمبەری خوا ﷺ موسلمانان دە کرد ، ئا لەو کاتەی کە پیغەمبەری خوا ﷺ بەردەگەورە کەی شکاند لە ناو خەندەق دا ، باسی ئەوەی کرد کە فتح کردنی وەلاتی رۆما و فارس یەمەن دا بە موسلمانەکان ، ئەویش لە ناو سەر بازگەی موسلمانان دا وەستا گالتەی بە موسلمانان دەکرد دەی ووت : محمد مژدەی ئەدانی گە نجینەکانی کیسری و قەیصەر بۆ موسلمانان بیت ، ئەی ووت : کەچی هیچ کام لە ئیمە ناویرن دەست بە ئاو بگەیەنی ، هەروەها لە م بارەیە قورئانی پیرۆز دەفەرموویت : ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا﴾ الاحزاب ١٢ . واتا : کاتیکیش دوو رووەکان و ئەوانەی دل یان نەخۆشی گومانی تیدا بوو دە یان ووت : بەلینی خوا پیغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەلەتاندن بوو ، هیچ تر نەبوو..!؟

ئ

کەواتە لەم جەنگە دا سوپای ئیسلام و موسلمانان بەرنگاری سی دوژمنی سەر سەخت بوونەوە ، ئەویش یەکەم : سوپای الاحزاب ، دووەم : جوولەکە کان بە تایبەتی جوولە کەی (بني قوريظة ) سی یەم : موناڤیقەکان دوو رووەکان کە ئەوانیش لە ناو موسلمانان و ناو شاری مەدینە بوو ، بەلی سەرە رای گرانی سەختی ئەم سالە و سەرماو سۆلە ی زستانی سەخت ، سەرەرای نفسی شەیتانی نەعلەتی کەلە هەموو دوژمنیك دوژمنتر بوو..!!

بەلی موناڤیقەکان بەوەش نەوەستان کە ترس و لەرز بلاو بکەنەوە ئەم جارەش کەوتنە ئەوەی کە خەلکی لە سوپای ئیسلام دا خۆیان بدزنەوە لەناو سوپا دا بکشینەوە ، بەو نیازەی کە پشتی خەندەق چول بکەن ، ئالەم کاتەدا ناسکەدا یەکی تر لە موناڤیقەکان کە لە ناو سوپای ئیسلام دا بوو ، بەناوی جەند خزمیکی خۆی کە داوی لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لە ناو سوپای ئیسلام بکشینەوە ، مۆلە تیان پی بدا بە بیانووی ئەوەی کە مالە کانیان چول کراوە بچن پاریگاری لە مالەکانیاندا بکەن ، لە راستی دا بۆ پاراستنی مالە کانیانە نەبوو ، بەلکو نیازیان وا بوو ترس ولەرز بلابکەنەوە لە ناوسوپای ئیسلام دا ، ئەو موناڤیقەش ناوی (ئەوسی کوریی قەیصیی ) بوو لە نەوەی حاریسی کوری حاریس بوو ، ئەوە بوو قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە دەربارەی درۆکردنی ئەو موناڤیقانە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿وَإِذْ قَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ الاحزاب ١٣ . واتا : کاتیکیش هەندیك لە موناڤیقە کان یان دوو رووە کان ووتیان : ئەی خەلکی مەدینە یان (یثرب) ئەمە هیچ شوینی ئیوە نیە ، بگەرینەوە ناو شار دەستەیەکیش لەوان مۆلەتیان لە پیغەمبەر دەخواست و دەیان ووت : مالە کانمان بەدەرەوەیە گوایە دوژمن بە ئاسانی دەتوانیت هەلکوتیتە سەری ، لە راستیدا وانیە ، ما لە کانیان بەدەرەوەنین ، دوژمن ناتوانیت زەفەریان پیبەریت ، تەنها راکردنیان مەبەستە و هیچی تر ..!!

ئ
بەلی سات بەسات بارودۆخی سوپای ئیسلام و موسلمانان ناسك تر دە بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ هەستی دەكرد كە چ زەحمەتیەك لەسەر شانی هاوەلەكانی تی ، بەتاییەتی ئەنصارە كان چونكە لە سەر خاك ئاو مال حالی خۆیان بوون ، چۆن گیریان خواردووە بەدەست سوپایەكی ئەوا گەورە دا كە هەموو نیمچە دوورگەی عەربی لیان كۆ كردۆتەوە ، هەر بۆیە بە چاكیان زانی هەلویست وەر بگرن و بیریك بكەنەوە بۆ ئەم مەترسی زەحمەتیە كە بۆ یان دروست بوو ، بەهۆی سوپای الاحزاب ، لەو لاشەوە لە جوولە كەكانی ( بني قوريظة ) دەترسان نەوەك لە پشتەوە دەستیان لی بوە شینن و هیرش بكەن ، بەلی ئەگەر بیرك لە حالی خۆیان نەكەنەوە ئەوا ئەم هیزانە دەولەتی مەدینە لە ناو دەبن چونكە زۆر داخ لە دل بوون بەرانبەر بە ئیسلام لە لایەك قورەیش و غتفان لە لایەكی تریش جوولەكە و مونافیقە كان ..!!

ێ

## یانزەم : تێکدانی ڕیزەکانی سوپای الاحزاب و ڕێکەوتن لە گەڵ غەتفان :

بەڵی لێرەدا لێهاتووی پێغەمبەری خوا لە ڕووی ووتوێژو گفتو گۆ گرد بۆ مان ڕوون دەبێتەوە ، کاتێك هەڵسا بە هەڵبژاردنی هۆزەکانی غەتفان بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا ڕێك بکەوێت و صولحیان لەگەڵ دا بکات ، لەسەر هەندێك ماڵ و بەرووبووم کە بیان داتە هۆزەکانی سوپای غەتفان ، چونکە هۆزەکان و سوپای غەتفان زۆر ترین ژمارەی سوپای الاحزابیان پێك دەهێنا ، چونکە پێغەمبەر ﷺدەی زانی ئەوان زۆرن و وەنەهاتوو بۆ دەست بەسەرداگرتنی فەرمانڕەوایەتی شاری مەدینە ، ئەوان تەنها ماڵ سامانیان مەبەستە ،ئاما نجیان دەست بەسەر داگرتن نیە ، هەر بۆیە هەوڵی نەدا پەیوەندی بکان لە گەڵ قورەیش و جوولەکە چونکە ئەوانە مەبەستیان بوو پێغەمبەر بکوژن و ئیسلام لەناو ببەن کۆتایی بە دەوڵەتی مەدینە بهێنن ، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە فەرماندایەتی سوپای ئیسلام د ا نێردراوی نارد بۆ هۆزەکانی غەتفان بە تایبەتی ئەوەی فەززرا ئەوەی موررە کە دوو فەرماندەی ئەم دوو هۆزە بوون ئەوانیش ( عویەینی کوری حصن ) فەزاریی ( حاریسی کوری عوفی ) موررەی ، ئەوە بوو لە تاریکی شەودا یەکێك لەهاوەڵە کانی خۆی نارد ، تاکو پیان ڕابگەیێنی پێغەمبەر ﷺ پی خۆشە لە فەرماندایەتی خۆی دا لە پشتی خەندەق چاوی بەم دوو سەرۆك هۆزە بکەوێت ، چونکە پێغەمبەر باش دەی زانی ئەوانە چاویان لە ماڵ بەرووبوومە نەك داگیرکردنی شاری مەدینە، تەنها مەبەستیان تالان کردبوو هۆزەکان غەتفان ، بەڵی شاندەکەی غەتفان هاتن لە فەرماندایەتی سوپای ئیسلام دەستیان کرد بە ووتوێژو گفتو گۆ کردن و کۆ بوونەوە و دانوسان کردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان مەرجیان ئەوە بوو لە بەرانبەر شەرنەکردن یان جەنگ نەکردن لەگەڵ سوپای ئیسلام دا وە جیا بوونەوەیان لە سوپای الاحزاب بە سەرکردایەتی سوپای قورەیش ،مەرجیان ئەوە بوو کە ساڵێك نیوەی بەرووبوومی مەدینە بدرێتە بە سوپای غەتفان ، لە بەرانبەریش دا ئەوان جەنگ لە گەڵ سوپای ئیسلام دا ناکەن و لە سوپای الاحزاب دەکشێنەوە ، پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیەوسم ) ڕازی بوو بە سی یەکی بەرووبوومی مەدینە بدرێتەبە غەتفان ، نەك نیوەی بەرووبووم ، ئابەم شێوەیە پەیمانەکەیان نووسی لە نێوان خۆیاندا و بەلام پێش ئەوەی پەیمانەکە ئیمزا بکەن ، پێغەمبەر ﷺهەر دوو ( سعدی ) بانگ سەرۆکی هۆزی خەزرەج سەرۆکی هۆزی ئەوس ، ئەوانیش ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺئایا ئەوە ( خوای گەورە ) فەرمانی پی کردووی ..؟!

ئ

که هەر دەبی جی بەجی بکەی ، یان مەبەستت بەرژەوەندی ئیمەیە ؟! ئەویش فەمووی : مەبەستم تەنها بەرژەوەندی ئیوەیە چونکە هەموو عەربی ناوچەکە لیتان کۆ بوونەوتەوە لەیەك کەوانەوە تیرتان تیدەگرن ، پیم باش بوو هەندیکیان لە کۆل ئیوە بکەمەوە ،ئەوانیش ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیمە کاتی خۆی لەسەر کوفرو شریك بووین ، ئەوان تەماعیان لە بەرو بوومی ئیمە نەکردوە بە پارە یان بە میوانداری نەبی ، سویند بە خوا جگە لە شمشیر هیچیان نادەینی ، دوای ئەوەی ، کە ( خوای گەورە ) ئیمەی بە هۆی تۆ و ئیسلامە عزیز کردوە ، پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی : من لەبەر بەرژەوەندی ئیوەم بووە ، مادام لە خۆتان رادەبینن لی گەرین . ابن هشام فی السیر ( ٣/١٠٧-١٠٨ ). بەلی دیارە پیغەمبەری خوا ﷺ مەرجی تری دانا بوو لە ریکەوتنەی غتفان و سوپای ئیسلام ، ئەویش رەزامەندی نەوەی ئەوس و خەزرەج بوو ، چونکە ئەوان لە شاری مەدینە دا ئەو باخ و دار خومایانە هی ئەوان بوون ، دەبیت پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پرسیان پی بکات و راویژیان پی بکات ، چونکە سی یەکی بەروبومی مەدینە یان ئەنصارە کان دەدریتە غتفان لە جیاتی ئەوەی ئەوان واز لە سوپای الاحزاب ئەهینن و هیرشی سەربازی ناکەنە سەر شاری مەدینە ، وەك ئەوە وا بوو لە نیوان خراپ و خرابتر ، پیغەمبەر ﷺ خراپەکەی هەلبژارد ، ئەویش بە اشتهادی خۆی نەك ئەوەی کە وەحی بیت لە لایەن خواوە فەرمانی پی کرا بیت ، تەنها ویست ئەم جەنگە خویناویە و ئەوترس و دل راوکیەی لەسەر موسلمانەکان نەمینی ،بە لام هەردوو فەرماندەی ئەنصار کە هەردوو ( سعد ) ( سعدی کور موعاز )سەرۆکی ئەوس ( سعدی کور عوبادە ) سەرۆکی خەزرەج ، بانگ کرد پیش ئەوەی ریکەوتنەکە ئیمزا بکە ، ئەوانیش ووتیان ئایا ئەوە لەلایەن خوا وەیە واتەخوای گەورە فەمانی پی کردووی ، پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ئەگەر خوا فەرمانی پی کردبمایە ، ئەوا پرسم پی نەدە کرد و ریکەوتنەکەم ئیمزا دەکرد ، بەلام من لە چاکەی ئیوە وادەکەم کە دوژمن وا لە هەموو عەرب هاتۆتە سەر تان دەمەویت دووری بخەمەوە ، بەلی هەردوو ( سعد ) ووتیان ئەگەر رادەر برینە و لە لایە ئیمەیە ، ئەوا هچیان پی نادەین لە شمشیر زیاتر ، مەبەست ئەوەنیە ئەوان لە فەرمانی پیغەمبەرەکەیان یاخی بوون یان جی بەجی ناکەن ، بەلکو پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پرس راویژی پی کردن چونکە ئەوە مال وسامانی ئەوانە پیغەمبەر ﷺ ریکەوتنی لەسە ر کردووە ، هەر وەها غیرەت و جوامیری مەردایەتی ئەنصارەکانیشی تاقی کردەوە، لەلایەکی تریش مەرج نیە هەمووشتیك پیغەمبەری خوا ﷺ زانیاری لەسەر هەبیت ، چونکە ئەویش وە مرۆڤە کان تووشی هەلەی سەربازی دەبیت ، علم و زانستی و غیبی تەواو تەنها لەلای خوای گەورە یە ...

ێ

بەلی بی گومان ئەو ووتویژە گفوتو گۆیە لە گەل غتفان ئەمەش تاقی کردنەوەی خوای بوو بۆ موسلمانەکان بۆ خیرەت جوامیریان مەدرایەتیان بەتاییەتی ئەنصارەکان ، ئەم مەردایەتی لە ناو سوپای ئیسلام دا بلاو بۆوە هیزو وورەی زیاتریان هاتەوە بەر بەرانبەر بەم هەلویستی ئەو دوو قارەمانە کە بە پیغەمبەر( صلی الله علیه وسلم یان ووت ..!!

بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) غیرتی ئەو دوانەی بینی ، کە سەردارانی ئەنصارە کان بوو ، کە چۆن بەریکەوتن نی غتفان نارازین ، ریکەوتنەکە نووسرا بەلام ئیمزای لەسەر نەکرا نووسراوەکەش ( عوسمانی کور عففان ) نووسی بووی ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ وازی لە رایەکەی خۆی هیناو چووە سەرای ئەو دووسەردارەی ئەنصار ، کە هەردوو ( سعد ) ی ئەوس و خەزرەج بوون ،وە پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( انت وذاك ) .

لیرەدا ( سعدی کوری موعاز ) دەستی دایە ریکەوتنە نوسراوە کە کە دراندی رووی کردەهەردوو سەرکردەی غتفان ، بە تورەیەوە هاواری بەسەردا کردن ، بەگەرینەوە شوینی خۆتان تەنها شمشیرمان هەیە بۆ تان ، ئەوانیش بی دەنگ گەرانەوە شوینی سەرکردایەتی خۆیان ، بەلی دراندنی ئەو نوسراوە لە لایەن ( سعدی کوری موعاز ) ئەو هیوایە نەهیشت کە باری سەرشانی سوپای ئیسلام کەم بیتەوە و بەلام ، غیرەت هیزو مەدرایەتی دا بەسوپای ئیسلام تاکو بەرگری بکەن و خۆ راگرین لەسەر خەندەقە کانیاندا بۆ پاراستنی شاری مەدینە، هەروەها ( سعد ) سەلماندی کە وا لە ناو سوپای ئیسلام مرۆڤی وا بەغیرەت کە چی ژیان و مردنیان لا یەکسانە،هەندیك لە زانایان سیرە ووتیانە : کە بەراستی پیغەمبەری خوا ﷺ نەی ویستووە کە ئەم ریکەوتنە لەگەل غتفان دا بکات ، هەر ویستیەتی هیزو غیرە وت بتەوی عقیدەی موسلمانان بە ئەنصارەکان کوچ کەران تاقی بکاتەوە ، تا بزانی تا چ رادەیەك ئامادەی پاراستنی شاری مەدینەن ، تا چەند ئارامی و خۆراگریان لایە ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەرکەوت کە ئەنصارەکان دەست کەوتنی ئاینی ئیسلام یەك جار بە نرخ ئەزانی ، لە هەموو لایەك تەنگ بە سوپای ئیسلام درا بوو ، لەلایەك مونافیقە کان لەلایەك جوولەکەی نەوەی قوریصە لەلایەکیتر هەلوەشاندنەوەی ریکەوتن لە گەل غتفان ، لەلایەکی تریش سوپاگەورەکەی الاحزاب ، بۆیە لە شەوی ساردو سەرماو سۆلە دا موسلمانەکان مەردانە خۆیان راگرد بەرانبەر بە دوژمنانی تەنانەت لە هەرشوینکی خەندەق بۆشایی هەبوایە ، ئەوا پیغەمبەری خوا ﷺ ئیشکگری بۆ دەکرد ...

ئ

بەلی  لەم سەردەمەدا هەندیك بەناوی ئیسلام یان بە نۆكەری جوولەكە یان بە  پیلاو ماچ كردن و دەست ماچ كردن یان كرۆنوش بردن بۆ دوژمنانی ئیسلام ، یان كە سانیك كە بە ناوی ئیسلام كە خۆ پەرستی دەكەن خۆیان بەگەورە دەزانن ، فشە باز و زەلیل بەرانبەر بەدوژمنانی ئیسلام ، ترسنۆك ئەیانەویت سپی رەش بكەن رەش سپی بكەن ، ئەوانەتەنها سەر شۆری و ریسوایی نامەدری بۆیان ئەمینیتەوە ، چونكە ئەوانە بەناوی ئیسلام خواوە درۆ لەگەل خەلك ئەكەن ئەلین ئیمە چاكسازی دەكەین نەخیر خۆیان خرا پەكاری لەسەر زەوی دەكەن ، هیچ غیرەتیان نیە ،نەزان و جاهیل و خۆبەگەورە زانن ، كە چی سەننگی یەك پووشكەیان نیە ،بەلی ئەم ئیسلام كە سانیكی خاوەن عقیدەیەكی پاك دامەزراوی دەویت كە بەرانبەر دوژمنانی وەك پولا بوەستیت ،سەر شۆر نەكات بۆ هیچ كەسكیك كە بی ریزی بەئاینەكەی دەكات ، نەخیر ئەوانەمونافیق و فاسق و تاغووتی ئەم سەردەمەن ، كە بەناوی ئیسلامەوە هاتوون ، كەچی ئەم خرا پە كاریە لە م ولاتانەدا دەكریت كەس گوی پی نادەت ، ئەوەی ئیسلام ئەیەوەی وەك ئەم دوو سەكردەی ئەنصارەكانە كە چەندە جوامیرانە بەرانبەر بە غتفان وەستان و هیرشیان بۆ بردن لەسەر مافەكانی خۆیان ، بەلی ئیسلام ئاوا هاتووە ئاوا پیگەیشتووە ، كەچی ئیستا هیچ حوكمیكی ئەم ئیسلام لە جیهانەدا جی بەجی ناكریت ، ئیسلامیان وەك پەراویز كردن بەلاناوە لەبەر بەرژەوەندی خۆیان بۆ ژیانی دونیان كە چی نازانن ، ئەم دونیایەی كە تیدا نە یەك ك شەو رۆژیكە و دەروات ، چوۆن لە دەرگایەك دیتە ژوورەوە ئەواش دەچیتە دەرەوە ، بەلی دونیا هەر وایە ، بۆ كەس نامینی ،ئەوەی ئەمینی كارو كردەوەكان مانە لە پاش خۆ مان سوود بەخش دەبیت بۆ ئەو دونیا هەتاهەتایی و نەبراوە ، بی گومان هەموو موسلمانیك دە بیت غیرەت و جوامیری و مەردایەتی لە خۆ دا بەدی بكات یان وەك ئەو هاوەلانەی پیغەمبەری خوا ﷺ كە جەند بەجوانی و مەردانە ئەو  ئیسلام یان بە ئیمە گەیاند و ئیمەش دە بیت بە مەردانە  پاریزی گاری لی بكەین بە تایبەتی لە حوكە شەرعیەكان و پیرۆزیەكانی ئاینی ئیسلام ،بەلی خۆ میژووی جوان .. شارستانی جوان ..كۆمەلگای بە خیرت و جوامیرانە .. یاسا ..ماف .. نرخ ..ریز .. پیاوەتی .. غیرەت .. سەربەرزی و .. وا بەئاسانی نەیایەتە دی ، یان بەدەست هینانی قیامەت و بەهەشت ئاوا ئاسانیە ، ئەوانە هەر هەمووی غیرەتی دەویت و خۆراگری ئارمی دەویت ئیمانیكی پاك بیگەردی دەویت دوور لەخروافیات شەخص پەرستی ، بەلی بی گومان فیدا كاری كۆلنەدان و قوربانی ئەویت ، بەلام ئایا ئەوانەی ئەم سەردەمە ئەم رەوشتانەیان تیدایە كە بەرگری لە ئیسلام بكەن ..!؟

ئ

بی گومان نەخێر ئەوانە هەر خەریکی کۆکردنەوەی پارو مال سامانن بگرە بە مەلاکانی شیانەوە ، لە خزمەتی تاغووت دان ، لە خزمەتی جوولەکە و مونافیقەکان دان ، مەلاکانی ئەم سەردەمە هەندیکیان نەبیت خاون هەلویستی جواننە ئەگینا ئەوانی تر ریژەیان زۆرە تەنها مەبەستیان بازرگانی کردن بە ئاینە پیرۆزە ..!!کەی رە وایە لە وەلاتیکی بەناو ئیسلامی کە ریژەی ١٠٠/٩٠ دانیشتوانی موسلمان بیت ، ئەو هەموو بی ریزیە بە موسلمانان دا بکریت ، ئازادی ئاینی لی زەوت بکریت بگرە ئازادی تاکە کەسیش لە مەترسی دا بیت ، خۆ لە وەلاتانی غیرە ئیسلام ئازادیەکە زیاتر وە لیرەدا بەناو ئەوان لەدار و کفر دان ئیمە لەدار وئیسلام دان ، بەلام پیچەوانەبۆ وەتەوە ،هیچ جیاوازیەکیان نیە لە گەل دار و کفردا ، بی گومان ئەوانەی ئەم سەردەمە وەك قورەیش وان وەك جوولەکەکان وان وەك مونافیقە کان وان ، هیچ جیاوازیەك بەدی نایەت ، چونکە هەمان شریك و کوفر دژایەتی کردنی موسلمانان ئەجام ئەدان ، جا سەرەرای ئەوەش وەك مونافیقەکان خەریکی بازرکانی کردنن لەگەل جوولەکەدا یان هاوپەیمانی جوولەکە دە کەن ، بەبی شەرمانە ، هەموو رەوشتەکانی جوولەکەو مونافیقە کانی سەردەمی پیغەمبەریان ( صلی اللە علیەوسلم ) لە خۆ گرتووە ، لەدژایەتی ئاینی ئیسلام دا ، ئا ئەواتا هەندکیان بەناوی علمانیات و یان بەناوی مافی مرۆڤ ویان بەناوی ئازادی تکەکەس لە دەربرین دا ، کەچی گەر دەر برینەك لەدژی ئەوان دا بکریت ئەوا خیرا دەکوژن یان زیندانی دە کەن ، کەچ ی ئاسایە قسەی نەشیاو بەئیسلام بووتریت ، تەقیە سەریان دەیت ، بەلام لە بەرانبەر ئیسلام دا بی دەنگ کەم بینان ، بلاوە بوونەوەی ئیلحاد لەم سەردمەدا ئەوان هینایەنە ئەم وەلاتە بەناو ئیسلامیە ، کەچی فەزەیان لی وەنایەت ئەوا ئیلحا بە ئاشکرا لە ناو ئەو کۆمەلگایەدا بلاو بۆتەوە ،یان ریخراوی ماسۆنیك یان ردەزگای موساد یان تەبشیر کردنی موسلمانان لەلایەن گاورە کانە وە کەئیستا باوە ، کە گە نجانی ئەم وەلاتە ئەکەن بەگاور بەناوی جیاجیا و ، هەروەها ئەمەهۆیەکەی دیارە ، هەمووی برسی کردنی ئەم میلەتە یە ، کە هیچ کارو کاسبیەك نیە کە گە نجان بیکەن هەر خەریکی بەشتی بی وودەئەم ریخراوانەش ئیش لەسەر ئەم گە نجە کەم عقیدە یان کەم ئیمانەنە دەکەن دەیان کەن بە گاور ،یان بە ئیلحاد و چونکە هەندیکیان بۆ بژیوی ژیان فیرو دەدرین هەندیکی تریش بۆ هەواو ئارەزووی ژیان فیرو دەخۆن بەم دەزگاو ریخراوە بیانیانە کەلەم وەلاتەدان بۆ فساد کردنی کۆمەلگادا ..!!هیواداریم دلسۆزانی ئیسلام بەسەرابی ئەم دەسەهەلاتە هەلنەخەلەتین .. هیوادرام هەولبدەن پیاوی کە نجانی قیامەتی پی بگەیەنن .. ئەو کەسانەی کەهەلپە ناکەن .. دونیا ویست نین .. بە زەلیلی و نۆکەری دوژمنایی ئیسلام ناچنە پیشەوە و رازی نابن .. راستی یان ئەویت لە پیناوی خوا دا خۆ یان بەخیت بکەن ،ژیانیان تەنها بۆ رەزامەندی خوا بیت .. ؟!

ئ

## دووانزه : شكاندنى پەيمان و عهد لە لايەن جوولەكەی (بني قريظة )

بە لى : (حيى ابن أخطب ) يەكيك بوو لە جوولەكەكانى (خەيبەر ) بۆ شارى مەدينە دە چى بۆ لاى سەردارى (بني قريظة ) كە ناوى ( كعبى كورى الاسد القريظي ) بوو ، ئەو سەرۆك هۆزى (بني قريظة ) دواى لى دەكات كە پەيمان عهد بەلين لە گەل پيغەمبەرى خوا ﷺ بشكينى پاشگەز بيتەوە لە پەيمان بەلينەكەی كە بە موسلمانان و پيغەمبەرى خواى ﷺ دوە كەهەر دوژمنيك بيتە سەر مەدينە ئەوان بەرگرى لى بكەن و مەدينە لە دوژمنانى دەرەكى بەيەكەوە بپاريزين هيچ دوژمنيك نەتوانى هيرش بكان ، بەلكو بە موسلمانەكان و جوولەكە كانى (بني قريظة ) بەرگرى لى بكەن بەلى كاتيك ئەو ناپاكەی (خەيبەر ) كە (حيى كورى أخطب ) هاتە لاى سەردارى (بني قريظة ) كە ( كعبى كورى الاسد القريظي ) بوو ، (حيى كورى أخطب ) پى دەلى : لە پەيمانەكەت پاشگەز ببەوە هيچ پەيمانيك لە نيوان ئيوە محمد دا نەمينى پەيمان تان بشكينن ، بەلام ( كعب ) دەلى : من تا ئيستا هيچ بى پەيمانيم لە محمد نەبينيوە (حيى كورى أخطب ) وازى لى ناهينى زۆر هەولى بۆ دەدا داكۆكى لە قسە كەی دەكات پى دەلى : ئيمە سوپايەكى زۆر مان كۆكردۆتەوە، ئەگەر تۆ لەگەلمان بيت بەيەك جارى كۆتايى بە دەولەتەكەی محمد دەهينريت لەشارى مەدينەدا ،وە بەيەكجارى هەموويان لەناو دە بەين ، بەلى بى گومان لە كۆتايى دا بەم درۆ و قسە لوسانەی خۆی باوەر و قناعەت بە (كعب كورى الاسد ) دەكات ، كە پەيمانەكە بشكينى هەلبوەشيتەوە ، بەلى دواى ئەوەی (كعب ) پەيمانى لە گە ل پيغەمبەر شكاند موسلمانان زۆريان پى ناخۆش بوو ، چونكە تا ئەو كاتەش ئەلين (بني قريظة ) هەر روو بەرووی سوپاى الاحزاب بوون بەرگريان لە مەدينە دەكرد ، ئيتر ئەم كارەی (كعب ) موسلمانانى كردە دلەراوكى ترس بيمە چونكە موسلمانان لە پشتەوەی سوپا ئەمين نەبوون ، نەوەك (بني قريظة ) هيرش بكات لە پشتەوە سوپاى ئيسلام ، هەروەك (خواى گەورە ) دەفەرموويت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا (٩) إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا (١٠) هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾ الاحزاب ٩-١١ . واتا : ئەى ئەوانەی ئيمان و باوەرتان هيناوە يادى نيعمەتى خوا بكەنەوە لەسەرتان (مەبەست لە جەنگى خەندەق كە خواى گەورە بە فرياو هاناى ئيمانداران هات ) كاتيك سەربازانى كوفر و هاتنە سەرتان ئيمەش رەشەبايەكى بەهيز و سەربازانيكمان ناردەسەريان كە نەتاندە بينين ، خواى گەورە بينابوو بە هەول كۆششتان چۆن پاسە وانيتان دەكرد ،چۆن ئەو چالە قوول و دريژەتان هەلكەند ..هتد . كاتيكيش دوژمنان لەسەرو خوارتانەوە هاتنە سەرتان ، كاتيكيش چاوە كان ئەبلەق بوون ، دلەكان گەشت بوونە گەورە ، گومانى جۆراو جۆرتان دەبرد بەبەلينەكانى خواى گەورە بەسەر كەوتنى ئيمانداران ..!!

ئ

لەویدا ئیمانداران تاقی کرانەوە و تووشی تەنگانە و سەختیەکی زۆر توند و بەهێز بوون ، تووشی دلە لە رزەیەکی زۆر سەخت کران ..!!

بەلی کاتیك کە پیغەمبەری خوا ﷺ هەوالی پەیمان شکاندنی عهد و بەلینی ( بني قريظة ) زانی و پی گەیشت ، یەکسەر هەردوو هاوەلی بەریزی سەرداری هەردوو تیرەی ( ئەوس ) و ( خەزرەج ) بانگ کرد کە ( سعدی کوری موعاز ) ، ( سعدی کوری عبادە ) پی راگەیاندن هەردوو کیانی نارد بۆ لای سەردارانی ( بني قريظة ) سەبارەت بەم پەیمانەی کە لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ بەستویانە بۆچی لی پاشگەز بوونەوە پەیمانەکەیان هەلوشاندەوە ،بەلام کاتیك ئەم دوو هاوەلە بەریز چوونە لایان ( بني قريظة ) هەلویستیکی زۆر نامەردانەیان نواند بەرانبەر بە پیغەمبەر ﷺ موسلمانان دا .

بەلی ( بني قريظة ) پیان ووتن : پیغەمبەری خوا ، یان رسول الله کی یە ؟! ئیمە هیچ پەیمانیکمان لەگەل محمدا نیە .. ئیوە چی تان لە دەست دیت بیکەن ..!! وە ئیمەش چیمان لەدەستبی دەیکەین ..؟!

بەلی ئەو دوو هاوەلە بەریزە دەگەرینەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ هەوالە کەی بۆ پیغەمبەر ﷺ دەبەنەوە و هەوالە کەی پی دەلین ئەمە هەلویستی نامەردانەی ( بني قريظة ) بوو ، ئابەم شیوە ناشرینە وەلامیان داینەوە ، یان هەوالەکەی بە رمز پی دەلین : ( عضل والقارة ) ، چونکە پیشتر پیغەمبەری خوا ﷺ لە بەر هەستیاری بارودۆخەکە پی ووتبوون ، ئەگەر پەیمانیان نەشکاند بوو ، ئەوا بەدەنگی بەرز هەوالە کە بینەوە لە ناو موسلمانان دا دەنگتان بەرز بیت ، بەلام ئەگەر نامەرد بوون و پەیمانیان شکاند بوو ، ئەوە بەشیوەیەکی رمزی یان نهینی هەوالە کەم پی رابگەیەنین ..!! ئەم قسەیەش وە چۆن هەردوو هۆزی (( عضل والقارة ) پەیمانیان شکاندو جەند هاوەلیکیان شەهید کرد ، بەلی ئەوانیش ئاوا پەیمانیان شکاندەوە مەبەست ( بني قريظة ) بوو ، بەلی کاتیك کە ئەم هەوالە یان بە پیغەمبەر ﷺ ووت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( الله اكبر ابشروا يا معشر المسلمين ) واتە: خوا گەورە ترە لە هەموو شتیك ، مۆژدە تان لی بیت ئەی کۆمەلی موسلمانان ..!!

ابن هشام فی السیر النبویە ( ٣/١٠٧-١٠٨ ).

ئ

بەلی پەیمان شکاندنی (بني قريظة ) بۆ پیغەمبەر موسلمانان یەکجار کاریکی قورس و سەخت گران بوو ، چونکە لە پیشەوە دوژنی سەر سەختی ئیسلام هە بوو ، ئەویش سوپای الاحزاب بوو و بە هەموو هۆزەکانی دورگەی عەرەبی وەك هۆزی قوریش تیرەکانی قورەیش هەروەها هۆزەکانی غتفان وەك هۆزی فەززرا و موررە و ئەشجەع و بنی سلیم ، ئەمانە لە پیشەوە وەستا بوون بۆ پەلاماردانی موسلمانان و شاری مەدینە کە دا گیری بکەن دەست بە تالان و کوشتن و برین بکەن ، لە لایە کی تریشەوە لە ناوە خۆی شاری مەدینە دا ، دوو کۆمەلی تر هەبوو کە دژ بە موسلمانان دەوەستانەوە کاریان بۆ دوژمنانی شاری مەدینە دەکرد ، ئەوانیش جوولەکە و مونافیقەکان بوون ، بەلام بەشکاندی پەیمان لە لایەن (بني قريظة ) ئەوا جەنگ کە یەکجار سەخت گران بوو ، چونکە ئەوان لە پشتەوە ی خەندق بوو ، واتا لە نزیك قەلاکانی نەوەی حاریسە بوون کە ژن و مندالان و پیرو پەکەتەکان لەوی دابوون لە ناو قەلاکان بوون ،هەر بۆیە بۆ موسلمانان ئەم پەیمان شکاندنە زۆر سەخت گران بوو ، چونکە دە ترسان جوولەکەی ناپاك و نامەرد لە پشتە هیرش بکاتە سەر ژن و مندالەکان وپیرو پەکەتە کان ،چونکە هەموو مرۆڤیك مال مندالی لا شرینە دەیەویت کەس دەستی بۆ نەبات ئازاریان نەدات ، هەر بۆیە موسلمانەکان بەمە زۆر دل گران بوون ،هەر بۆیە جوولەکەی نامەدر بەم پەیمان شکاندنە روو بەرووی موسلمانان بوونەوە و دەستیان کرد بە هەرەشەو گورەشە کردن لەموسلمانان ،وە چالاکیان زیاتر کرد دژ بە موسلمانان و سوپای ئیسلام ،بەلی موسلمانەکانیش هەوالیان دایە (بني قريظة ) بەوەی کە لەدواوە دەست لە ژن و مندالە کانیان بوەشینن ، ئەوا تۆلەیان لی دەکەنەوە ئەم کارەیان لەسەر تەواو نابیت ، کاتی خۆی دادیت بۆ هیرشی گشتی سەر جوولەکە ، بەلی بیگومان جوولە کەی ناپاك نامەرد و سەر شۆر ، دەستیان بە هەرەشەو گورە شە کرد لە موسلمانان ، بی گومان هیچ شتیك ئەوەندی هەرەشە و گۆرەشەی جوولەکە موسلمانەکانی ئازار نەدا لەم کاتە ناسکەدا ، بەلی پیاویك بەناوی ( نجدان ) لە (بني قريظة ) بە سواری ئەسپیکەوە هاتە خوار قەلاکانی بنی حاریسە کە ژن مندالە کانی موسلمانەکانی تیدا بوو ، بەلی ئەم پیاوە بەژنەکانی دەووت : دابەزنە خوارەوە لای من ، ئەوە چاك بۆتان ، بەلی ئافرەت کانیش شمشیرەکانیان هەلدەسووراند بۆ ئەوەی بریسك بداتەوە بۆ سوپای ئیسلام هاوەلان دا ...

ێ
چونکە قەلاکانی بنی حاریسە لە خەندەق دوورنەبوون بەلکو نزیك بوون ،ئافرەتەکانیش ئاماژەیان ئەدا بۆ سوپای ئیسلام کەوا مەترسیان لەسەرە ، بەلب هاوەاتنب پیغەمبەر لە ناو سوپای ئیسلام لە خەندەق کە ئەمەیان بینی وا شمشیر بریسك ئەداتەوە کەپیشتر پیان ووت بوون ئەگەر مەترسیتان هاتە سەر بە بریسکەی شمشیر ئاگادارمان بکەنەوە ، ئەوە بوو هاوەلان بریسکەی شمشیریان بینی بەدەستی ئافرەتەکانی ناو قەلاکانی نەوەی حاریسە ، یەکسەر کۆمەلیك لە موجاهیدان هاوەلان ، هاتن و هەلمەتیان دا ، کە یەکیك لە موجاهیدە کان پیاویکی ئەنصاری بوو لە نەوەی حاریسە بوو ناوی ( ظفري کوری رافیع ) بوو ، ئەویش ووتی : ( نجدان ) وەرە پیشەوە بۆ زۆران بازی شەرە شمشیر کردن ،بەلی ( نجدانی ) (بني قریظة ) هاتە پیشەوە ئەویش هەلمەتی دایە کوشتی بە حەقی خۆی گەیاند و سەری بری سەرەکەی برد بۆ لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )

بەلی جوولەکەی ( بني قریظة ) هەر بەوەوە نەوەستان کە هیرش بکەن سەر ژن ومندالان و بە دیل گرتنیان ، بەلکو هەولیاندا هیرش بکەنە سەر دایکانی ئیمانداران ئەو ژنانەش کەلەگەلیان دا بوون ، بەلی ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەکانی و صفیەیی پوری لە قەلایەك دانان کە قەلای ( حسانی کوری ثابت ) بوو هەروەها ناوی قەلاکەش ( فاریع ) بوو ، ( حسان ) خۆشی لەوی بوو ،

( صفیه ) ئەلیت : جوولەکە یەك بەلاماندا تیپەریی و ، بەدەروی قەلاکەدا ئەسووڕایەوە ، ئەوە بوو ( بني قریظة ) چوو بوونە حالەتی جەنگەوە ، پەیوەندی نیوان خۆیان و پیغەمبەری خوا یان ﷺبری بوو ، کەسیش لەوی نەبوو بەرگریمان لی بکات ،چونکە پیغەمبەری خوا ﷺ هاوەلانی لە بەرەکانی خەندەق بوون لە جەنگ دا ، ئەگەر کەسیك بهاتایە سەر مان نەیان ئەتوانی واز لە دوژمنی پیشەوەیان بهینن ئتر بین بۆ لای ئیمە ..!! صفیه ئەلیت : پشتوێنەکەم توند بەست و دەستم دایە کۆلەکەیەك و ، لە قەلاکەوە بۆی دابەزیم بە کۆلە کەکە ئەوەندەم لی دا هەتا کۆشتم ..!! لە روایەتیکی تردا ئاوا هاتووە کە ( بزار ) دەگیریتەوە دەلی : ئەو جوولەکەیە سەرکەوتووە سەر قەلاکە ، ئەو قەلایەی دایکانی ئیماندارانی تیدا بووە ، کە صفیه لە کوشتنی ئەبیتەوە ، سەری ئەبریت و سەرەکەی بەسەر قەلاکە فریدەدات و بەسەر ئەو جوولەکانەی ( بني قریظة ) کە بەسەر دەوری قەلاکە دابوون ، ئەوانیش کە ئەم دیمەنەیان بینی ترس ولەرزیان لی نیشت و ، وەها بە بیریان دا هات کە دەبیت سوپایەکی بەهیز بۆ پاسەوانی ئەو ئافرەتانەدا دانرابیت و پاریزگاریان لی بکات بیا پاریزیت ،بەلی جوولە کەی ( بني قریظة ) بە خۆیان دە ووت ، دەبوایە بمان زانیایە کە مال مندالەکانیان بەتنها بەجی ناهیلین ..!!ئیتر ئەوە بووکە بلاوەیان لی کردوو ئەو شوینەیان چۆل کرد گەرانەوە قەلاکانیان ..!!

ێ

بەلی ئەم کارەی جوولەکەی (بني قريظة ) هەرچەندە کاریکی هیچ وپووچ بوو کاریکی نامەدرانەی نامرۆڤانەبوو ، بەلام ئەم بەوە هۆی ئەوەی موسلمانەکان زیاتر پاریزگاری لە قەلاکان بکەن کە ژن مندالە کان پیر پەکەوتەی تیدا بوو ، ئەم کارەی سوپای ئیسلام بووە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی پاسەوا نەکانی یان موجاهیدە کانی بەرەی پیشەوە کە خەندەق بوو ، هەر لە هەمان کات دا سوپای لاحزاب و بت پەرستان بەمەیان زانی لە هەمولایەکەوە تەنگ یان بە سوپای ئیسلام چنی هەرەشە گورەشەیان دەکرد و هەولیان ئەدا لە خەندە بپەرنەوە ، هەر بەم بۆنەیەشەوە موسلمانەکان ناچار بوون شەو رۆژ بخەنە سەر یەك شەو نخونی بکە لەبەرەی پیشەوەی جەنگ دا و ئەمشەکاریکی ئەستەم گران بەئازارو هیلاك و ماندووکەر بوو لەم کاتەدا ،چونکە بە هیچ شیوەیەك دەفتیان نەدەدا موسلمانەکان و سوپای ئیسلام تۆزیك بحەسیتەوە هەردەم گوشاریان دەکردنە سەر ، بەلی ئەوانیش هەر لە ئامادە باشی دا بوون بەچەك و کەرەسەی جەنگیەوە چاویان لەراست دوژمن دانەخست ، بەرگەی ئەو هەموو ئازارانەیان ئەگرت ، ئەوە بوو لەو شەوە سامانکە تاریکە سەختانەدا پیغەمبەر ﷺ هاوەلە کانی نەیان توانی (نویژی نیوەرۆ عەصرو مەغریب و عیشا ) لە کاتی خۆی دا بکەن ، بەرادەیەك کە موجاهیدان دەنگیان لی بەرز بوویەوە کە نویژیان نە کردووە ، پیغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم ) دەی فەرموو : ( ولا انا والله ما صليت ! ) هەتا ئەوە بوو (خوای گەورە ) بت پەرستانی پیچایەوە ..!! لە دوا جار دا بت پەرستانی سوپای الاحزاب کتیبەیەکی زۆر بەهیزیان نارد بەرەو مەنزلی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەو رۆژە تاکوو ئیوارەیان شەو جەنگیان لە گەلدا کردن ، ئیتر کاتی نویژ دا هات کتیبەکە نزیك بووە لیان ، کەس لە هاوەلان نەیان توانی وە ك پیویست نویژە کان لەکاتی خۆی دا جی بەجی بکەن ، تا ئەوە بوو لەگەل هاتنی شەو دا کشانەوە ، ئا لەم کاتەدا هەندیك لە خەلکە کە دەستیان بە نیفاق کردن کرد و و تووشی نیفاق بوون ، قەسەو باسی نابەجیان دەکرد ، جا کە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بینی وا ئە خەلکە بەلاو نارەحتی زۆری بۆ هیناو ، دەستی کرد بە مژدەدان بۆ خەلکەکە..!! ئەی فەرموو (والذي نفسي بيده ليفرجن عنكم ما ترون من الشدة ، واني لأرجو ان أطوف بالبيت العتيق آمنا وان يدفع الله إلى مفاتيح الكعبة وليهلكن الله كسرى و قيصر ولتنفقن كنوزهما في سبيل الله ). واتە :مژدەی دا کە موسلمانان لە و نارەحەتی یە رزگاریان ئەبیت و ، هیواشی خواست کە بەدلیکی ئارامەوە تەوافی مالی خوا بکات و ، خوایش کلیلەکانی کەعبە ی پیشکەش بکات ، کیسری و قەیصەریش لەناوبەریت ، گەنجینە کانیان بە دەستی موسلمانەکان لە پیناوی خوا دا خەرج بکریت ..!!

# قورئانی پیرۆز باسی جەنگی (الاحزاب ) دەكات

**١-قورئانی پیرۆز باسی كۆمەلیك دەكات كە هیرشیان كردە سەر موسلمانان ئەویش (الاحزاب ):**

**(خوای گەورە )دەفەرموویت :** ﴿وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾ **الاحزاب ٢٢ . واتا : كاتیك ئیمانداران ئەو هەموو دەستە و گرۆهانیان بینی ووتیان : ئەمە ئەوەیە كە خوا و پیغەمبەرەكەی بەلینی پی داوین . كە ئاوا دژایەتی ئاینەكەی دەكریت و كافران و دوو رووەكان نەخشەو پیلان دەكیشن بۆ ریشەكەن كردنی دیارە كە خوا و پیغەمبەرەكەی راستیان فەرموو لە پیش هاتنیدا و بی گومان ئەو دژایەتی باوەر و ملكەچی نەبیت هیچی تری بۆ زیاد نەكردن واتە سوور تر بوون لەسەر ئیمان ..!!**

**٢-كاتیك جوولەكە ووتیان : بە بت پەرستانی قورەیش ئاینی ئیوە باشتر لە ئاینی محمد (صلى الله عليه وسلم ) .**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا (٥١) أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ وَمَنْ يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا﴾ **النساء٥٢**
**واتا: ئایا نەتروانیوەتە ئەوانەی كە بەشیك لە كتیبی ئاسمانی پیدراوە كەچی لەگەل ئەوەشدا باوەریان بەفالچی و جادووگەرو بت و پەیكەرو شەیتان هەیە .. دەربارەی ئەوانەی كەبی باوەرن ئەلین : ئەوانە چاكترو ورییازی راستتریان گرتووە ، تا ئەوانەی كە ئیمان و باوەریان بە ئاینی ئیسلام هیناوە..!!**

**٣-دەربارەی موسلمانان و مونافیقان كە لە ئیش كارەكانی خەندەق خۆیان بە بیانویك دەدزیەوە لەئش و كارو جەنگ كردن دژی سوپای الاحزاب .**

**(خوای گەورە ) دەفە رموویت :** ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُولَئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَنْ لِمَنْ شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ لَا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنْكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾**النور ٦٢-٦٣ .**

ێ

واتا: بێ گومان ئیماندران و (موسلمانانی راستەقینە) ئەوانەن و کە ئیمانیان بە خواو پیغەمبەری خوا ﷺ هەیە وە هەر کاتیك لە خزمەت پیغەمبەردا بن بۆ ئیشیك کە موسلمانانی لەسەر کوببنەوە ناڕۆن، ئەو ئیش وکارەش بەجێ ناهێلن، هەتاکو مۆڵەت لە پیغەمبەری خوا ﷺوەر نەگرن وئینجا ئیش کاریکیان هەبێ جێ بەجێ دەکەن، ئا ئەوانە بروایان بە خوا و پیغەمبەری خوا هەیە، هەر کامیکیان مۆڵەتی لێ وەرگرتی بۆ ئیش کارەکانیان مۆڵەت بدە، بانگ کردنی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ یەکیکتان وەك بانگ کردنی هەندیکتان بۆ هەندیکتان تەماشا مەکەن، لیرەدا ووشەی (دعاء) بەمانای بانگ کردن دیت، نەك پارانەوە، خوا ئەوانەدەناسی خۆ دەشارنەوە و خۆ لەیەك دەگرن یان خۆیان لەشت دەگرن بۆئەوەی دیار نەبن، لە پیغەمبەر ﷺو موسلمانان.

پاشان دەفەرمووی: با ئەوانەی، کە بێ فەرمانی پیغەمبەر دەکەن، بترسن کە فیتنەو بەلایەکیان لە دونیادا تووش بێ، یاخود لە دوا رۆژدا تووشی عەزاب و ئەشکە نجە بن، دیارە مەبەستی ئەوانە بووە، کەئیمانیکیان هەبووە، بەلام ئیمانەکەیان لاواز بووە، ئەگەرنا موناف‌یقەکان پیش ئەوەی لەسەر ئەو شتە گچکەو ئەمانە عەزاب بدرین، لەسەر ئەسلی (نیفاق) و کوفرەکەیان عەزاب و سزا دەدرین..؟!

٤- پەیمان شکاندنی (بني قريظة)، و ناردنی سەربازی خوا ئەویش رەشەبایەکی بەهیز بوو بۆ سوپای الاحزاب و بت پەرستان، کە لەو رۆژە دا سوپاکەیان پەرتەوازە بوو چاویان نەبینی لەراست موسلمانان:

(خوای گەورە) دەفەروویت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾ **الاحزاب ٩-١١.**

واتا: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەرتان هیناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان (مەبەست لە جەنگی خەندەق کە خوای گەورە بە فریاو هانای ئیمانداران هات) کاتیك سەربازانی کوفر و هاتنە سەرتان ئیمەش رەشەبایەکی بەهیز و سەربازانیکمان ناردەسەریان کە نەتاندە بینین، خوای گەورە بینابوو بە هەول کۆششتان چۆن پاسە وانیتان دەکرد، چۆن ئەو چالە قوول و دریژەتان هەلکەند ..هتد.

ێ

كاتيكيش دوژمنان لەسەرو خوارتانەوە هاتنە سەرتان ، كاتيكيش چاوە كان ئەبلەق بوون ، دلەكان گەشت بوونە گەورە ، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بەبەلینەكانی خوای گەورە بەسەر كەوتنی ئیمانداران ..!!

لەویدا ئیمانداران تاقی كرانەوە و تووشی تەنگانە و سەختیەكی زۆر توند و بەهیز بوون ، تووشی دلە لە رزەیەكی زۆر سەخت كران ..!!

٥-قورئانی پیرۆز باسی هەلویستی نامەردانەی مونافیقەكان دەكات لەناو موسلمانان لە رۆژانی جەنگی الاحزاب دا :( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا وَإِذْ قَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِمْ مِنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِنْ قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْئُولًا قُلْ لَنْ يَنْفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِنْ فَرَرْتُمْ مِنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ وَإِذًا لَا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا قُلْ مَنْ ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُمْ مِنَ اللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً وَلَا يَجِدُونَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنْكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنْظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَى عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُمْ بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ أُولَئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا يَحْسَبُونَ الْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا وَإِنْ يَأْتِ الْأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُمْ بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنْبَائِكُمْ وَلَوْ كَانُوا فِيكُمْ مَا قَاتَلُوا إِلَّا قَلِيلًا﴾ الاحزاب ١٢-٢٠

واتا : كاتيكيش مونافیقەكان یان دوو رووە كان و ئەوانەی دل یان نەخۆشی گومانی تیدا بوو دە یان ووت : بەلینی خوا پیغەمبەرەكەی تەنها بۆ هەل خەلەتاندن بوو، هیچی تر نەبووە ..؟! كاتیكیش هەندیك لە مونافیقەكان یان دوو رووە كان ووتیان : ئەی خەلكی (یثرب) ئەم هیچ شوینی ئیوە نیە ، بگەرینەوە ناو شار ، دەستەیەكیش لەوان مۆلەتیان لە پیغەمبەر دەخواست و دە یان ووت : مالەكانمان بەدەرەوەیە گوایە دوژمن بە ئاسانی دەتوانیت هەلكوتیتە سەری ، لەراستیدا وانیە ، مالەكانیان بەدەروەنین دوژمن ناتوانیت زەفەریان پی ببات ، تەنها خۆدزینەوە راكردنیان مەبەستە و هیچ تر ..؟!خۆ ئەگەر سوپای دوژمن لە چوار لاوەی مەدینە دا بچوونایەتە سەریان ، لەوە و دوا داوای جەنگیان لیبكرایە دژی موسلمانان ، ئەوە دەچوون بەدەمیەوە ، تەنها كەنیك نەبیت وەلامەكەیان دوا نەدەخست ..؟!! سویندبەخوا بەراستی زووتر ئەوانە پەیمانیان بە خوای گەورە دابوو پشت هەلنەكەنن لە كاتی بەرنگاری دوژمندا ،بی گومان بەلینیك بەخوا درا بیت لیی دەپرسریتەوە ..؟! پیان بلی : ئەی پیغەمبەر ﷺ هەرگیز راكردن سوود بەخش نابیت بۆ تان ئەگەر هەلبین لە مردن ، یان لە كوشتن ئەو سا تەنها كەمیك نەبیت دوا نا خرین و رابواردن و ژیانتان زۆر كەم و وە كۆتایە ..؟!!

ێ
پیان بلێ : کێ هەیە پە ناتان بدات لە خواو بتانپاریزێت لە تۆلە سەندنەوەی ئەگەر بییەوێت ناخۆشییە کتان بۆ پێش بهێنێت ، یا خودی کێ هەیە دەتوانێت بەری میهرەبانی و سۆزی بگرێت ، ئەگەر بیەوێت بەزەیی ورەحمەتی خویتان پێ ببەخشێت ، ئەوکات ئیتر ئەوانە جگە لە خوا کەسیان دەست ناکەوێت پشتیوانیان لێ بکات و سەریان بخات ..؟! بەراستی خوا ئەو کەسانە دەناسێت کە کۆسپ و تەگەرە دورست دەکەن لەئێوە ، ئەوانەی بە براکانیان دەڵێن وەرن بۆ لای ئێمە خۆتان بدزنەوە لەسوپای ئیمانداران ،ئەوانە تەنها کەم نەبێت خۆیان ناخەنە ناو تالوکەی جەنگەوە یان گیژاوی جەنگە وە ..؟! بەرانبەر ئێوە دەست نوقاوو بێ هیمەتن !! جا کاتێك ترس وبیمی جەنگیان بۆ دێت ئەوە دەیانبینێت ، تەماشات دەکەن ، چاوەکانیان دەسوریتەوە و ئەبلەق دەبێت وەك کەسێك لە ترسی مەرگ بێ هۆشی بەسەردا هاتبێت و جا کاتێك ئەو ترس وبیمە نەما ، زمان درێژەکانیان ئازارتان دەدن بەقسەی رەق و ناخۆش ، لەکاتێك دا ئەوان چاوبرسی و بە هەڵپەن بۆ پارە ، ئا ئەوانە باوەریان نەهیناوە بەو هۆیەوە خوا کردەوەکانیان پووچ کرنەوە ، ئەو کارەش هەمیشە بۆ خوا ئاسانە ..!! ئەوانەوادەزانن کە هیشتان سوپای لاحزاب و دەستەو کۆمەڵەکان نەرۆیشتوون ، ئەگەر سوپای الاحزاب هات وئاوات دەخوازن بریا لە ناو عەرەبە بێ بیابان نشینەکاندا بوونایەو لەوێوە هەواڵی ئێوە یان بپرسیایە !! خۆ ئەگەر لەناو ئێوەدا بوونایە تەنها کەم نەبێت جەنگیان نەدە کرد ..؟!

٦-ئینجا قورئانی پیرۆز باسی ئیمانداران کە ئەوانەی عهد وبەڵێ نیان بەخوای گەورە داوە :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا﴾ الاحزاب ٢٣ . واتا: مەردانیکی زۆر هەن لەئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا ، راستیان کرد لەسەری ژیان و پابەند بوون پیوەی و لایان نەدا لێ و جا هەیانە پەیمانەکەی جێ بەجێ کردو مرد و شەهید بوو لەسەری ،(مەبەست لە غەزای بەدر و ئوحود غەزاکانی پیشتر کرابوون ) بەشی یەکەم ، هەشیانە چاوەروانە ( ئەوەش بەشی دووم ئەوانەی (غەزای الاحزاب ) بوو چاوە روانی مردن وشەهید بوونە لە پیناوی خوا دا ، بەهیچ شیوەیەك گۆران و لاری رووی تێ نە کردوون ..!!

ئ

٧-قورئانی پیرۆز باسی سزاو تۆڵەی موونافیقە کان دە کات و ،وە تێکشکاندنی سوپای الاحزاب دەکات و ، گەڕانەوە بەسەر شۆڕی خۆیان پیچایەوە گەڕانەوە بۆ مەنزلگەی خۆیان :

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِنْ شَاءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾**الاحزاب ٢٤-٢٥** .واتا : تا ( خوای گەورە ) پاداشتی راسگۆیان بەهۆی راستیە کەیان بداتەوە ، هەروەها سزاو تۆڵەی مونافیقەکان یان دوو ڕووەکانیش بدات و ئەگەر بیەویت ، یان تۆبەی پەشیمانیان لی وەر دەگریت ، چونکە بەراستی خوا هەمیشە و بەردەوام لی خۆشبوو میهرەبانە ..!! هەروەها ( خوای گەورە ) کافران و بت پەرستانی سوپای الاحزابی تێکشکاند و گەڕانەوە دواوە بەخۆیان و قینەو بوغزیانەوە ، هیچ جۆرە خەیریکیان دەست نەکەوت ، هەر خوا خۆی ئیمانداارانی لەجەنگ پاراست هەر خۆشی بە باو باران سوپای تایبەتی الاحزابی کافرانی تێکشکاند ، جا هەمیشە بەردەوام خوا بەهێزو بەدەسەلاتە ..!؟

ئ

## پیاویکی مەرد بەناوی ( نعیمی کوری مسعوود ) توانی گەمارۆدانی سوپای الاحزاب لەسەر سوپای ئیسلام دا هەڵگری :

بەڵی بیگومان بیست و دوو رۆژو بیست و دوو شەو ، سوپای الاحزاب ئابلوقەی سوپای ئیسلام دا ، بەڵی سوپای ئیسلام و موسلمانان رۆژ بەرۆژ بەرەو نارەحەتی و برسیەتی و کزو لاوای دەچوون ، چونکە ئەوان بە و سوپا کەمەی هەیا بەرگەی ئەو ژمارە زۆرەی سوپای الاحزابی نەدەگرت ، هەر چەندە بە ئیمانیکی بەهیزو دامەزراوە و صبر ئارام گرتن توانیان ئەو ماوەیە بەرگری لە شاری مەدینە بکەن ، بەڵی لە لایە کی تریشەوە سوپای جوولەکە ( بني قريظة ) کە لە ناوەوە هەرەشەو گورە شەیان دەکرد و جار بەجار بەشیوەیەکی نامەردانە سەر شۆرانە پەلاماری سوپای ئیسلام ئافرەتانی ناو قەلاکانی نەوەی حاریسی یان ئەدا ، هەروەها موسلمانان هیچیان بۆ نە مایەوە کە ئەوە نەبیت چونکە هیچ چارەیەك نەما بوو ،ئەوە بوو دوایان لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد کە دوعا نزایان بۆ بکات بۆ بکات دەرگای خیریان بۆ بکاتەوە لە دەست سوپای الاحزاب رزگاریان بکات ،ئەویش فەرمووی : ( اللهم استر عوراتنا ،وامن روعتنا ) بەڵی بی گومان ئەوە بوو ( خوای گەورە ) دوعاکەی گیرا کرد ، ئەویش بە هیدایەت دانی تاقە پیاویك ،کە ناوی ( نعیمی کوری مسعوود ) لە نەوەی ( ئە شجەع ) بوو سەر بە سوپای غتفان ، دەبیت ئەو پیاوە چەند زیرە ك و لی هاتوو بیت ؟! دەبیت ئەوە پیاوە چەندە بەغیرەت مەردانەبیت ؟! دەبیت ئەو پیاوە چەندە خاوەن شانس و الاقبال بیت ؟! وا ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەرەشەی لە ناو چوونی لەسەر ، خۆ هیشتان ئەو پیاوە تاقە نویژیکی نەکردووە ؟! هیشتان موسلمان نەبووە ، وا بیری کردەوە بەفریای سوپای ئیسلام هاتوو و رزگاری کردن لە گەمارۆدانە ، بەڵی ئەمەش حیکمەتی ( خوای گەورە ) بوو کە بە فریای ئەم سوپا بچکۆلەیەی ئیسلام هات ، بەڵی ( نعمی کوری مسعوود ) پیاویکی ناودارو ناسراو بەمتمانەبوو لە نیمچە دوورگەی عەربی دا و بە تایبەتی لە ناو هۆزەکانی غتفان دا ، هەروەها لە ناو سوپای الاحزابیش دا راویژیان پی دەکرد سەنگ خۆی هە بوو لە رای ریك و پەسەند کەلك وەر ئەگیرا ...

ئیتر ئەوە بوو بە حیکمەتی ( خوای گەورە ) شەویك لە دوا شەوەكانی ئابلوقە دانی سوپای الاحزاب بۆ موسلمانەكان ،ئەوە بوو دلی خورپەی كرد بۆ ئیسلام دلی نەرم بوو ، ( خوای گەورە ) هیدایەتی دا ، دلی بە ئیمانی تەواو ئاشنابوو ، لە و كاتە ناسكە دا نوری ئیمانی گەشەی كرد ، بەلی ئەم گەشە كردنەی ئیمانی لای هیچ كەس باس نەكرد ، پیاویكی پیاوانە بوو خاوەن سەلیقە بوو ، بە بی دەنگی یەوە لە ناو سەربازگەی الاحزاب دا خۆی لە سوپا كە دزیەوە ، رووی كردە بەردەم خەندە لە شەویكی زۆر تاریك دا ، كەس پی نەزانی ، ئەوە بوو بە هەر شیوەیەك بوو ، خۆی گەیاندە خیوەتگەی سوپای ئیسلام و خیوەتگەی پیغەمبەری خوا ﷺ بەلی ئەمەش ئەو پەری ئازایەتی ئەو پیاوە دەسەلمینی ، وا دیارە لەم تاریكەی شەو ملائیكەتی ( خوای گەورە ) لە گەلی دا بوون وبۆ رزگار كردنی موسلمانان ، ئەوبوو چوولای پیغەمبەری خوا ﷺ لەویدا راگەیاند كە ( خوای گەورە ) هیدایەتی داوە دلی پر بووە لەئیمان ، بەلام لە لای خۆی بەنیهنی هیشتبوویەوە ، هەروەها (نعیمی كوری مسعوود ) بە پیغەمبەری خوای ﷺ ووت : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )من موسلمان بووم ، خزمانیشم نەیان زانیوە موسلمان بووم ،هەر چیت پی خۆشە فەرمان بدە بەسەرم دا ؟!

هەروەها پیغەمبەرﷺ فەرمووی : ( انت رجل واحد فخذل عنا إن استطعت ،فإن الحرب خدعة ) واتە : تۆ تاقە پیاویكی ئەگەر توانیت دوژمنان لی دوور بخەیتەوە ، چونكە جەنگ هەل خەلەتاندن و فرو فیلە ..!! هەروەها لە ریوایەتیكی تردا ( نعمی كوری مسعوود ) داوا ئەكان كە پیغەمبەرﷺ ماوەی بدات كە ئەگەر پیویست بوو شتانیك بلی كە وا نەبن ،واتە : ( دۆربكات ) بی گومان لە كاتی ناچاری دا بۆ خزمەتی ئیسلام دە كریت پیاو درۆ بكات بەلام بۆ بەرژەوەندی ئیسلام بیت نەك بۆ ژیانی دونیایی ، هەروەها پیغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ( قل ما بدا لك فانت فی حل ) بەلی پیغەمبەرﷺ ماوەی دا ،كە هەر شتیك بكان بۆ بەرژەوەندی سوپای ئیسلام ، بەلی ئیتر ماوەی دا كە سوپای الاحزاب تیك و پیك بدات و پەرتەوازە یان بكات ...

بەلی بی گومان (نعیمی کوری مسعوو) بە پەل هەستاو رووی کردە ناوچەی (بني قريظة ) چونکە ئەوان پەیمانیان شکاند بوو لەگەل ئیسلام ، لە هەمان کاتیش دا چوو بوونە پال سوپای الاحزاب ، هەرەشە بوون بۆ سوپای ئیسلام ، بەلی (نعیمی کوری مسعوود ) ئەوانی بە باش زانی کە فیلیان لی بکات و هەلی یان خەلەتینی ،چونکە (نعیم ) پیشتر لە لایەن جوولەکە کانی (بني قريظة ) ناسراو بوو ، هەروەها پیشتر (نعیم ) هابووە شاری مەدینەلە سەردەمی نەفامی دا ، کە هیشتا ئارەق و شەراب حرام نەکرا بوو لە مەدینەدا ، ئەو چووبووە یەکیك لە مەی خانەکانی ئەوان ،وە باسی تیپەر بوونی کاروانیکی قورەیش کردبوو ، بەلی دیارە یەکیك لە موسلمانەکان لەوی بوو ، ئەویش هەوالە کەی کاروانەکەی قورەیش بە موسلمانان راگەیاند ، دواتر سریەی (زیدی کوری حاریسە ) چووە سەر کاروانەکەی قورەیش کەلە شام دا دەگەرانەوە دەستیا بەسەر دا گرت ، ئەو هەلمەتەش ناونرا سەریەی زیدی کوری حاریسە .

بەلی (نعیم ) چووە لای قەلاکانی (بني قريظة ) بەلام موسلمان بوونی خۆی ئاشکرا نەکرد بوو ، بۆ هیچ کەسیك لە موشریك جوولە کەکان ، بەلی (نعیم ) دەستی کرد نەخشە کەی خۆی کە بەتەما بوو سوپای جوولەکە الاحزاب لی جیا بکاتەوە پەرتەوازەیان بکات و ناکۆ کی بخاتە نیوانیان ، (نیعم ) ووتی : ئەی (بني قريظة ) ئیوە دەست تایەتی من بۆ ئیوە چاك دە زان و من کیم چۆنم بۆتان ، ئەوانیش هەموین پشگیری قسەکانی (نعیمی کور ی مسعوود ) یان کرد ، ووتیان :راست دەکەیت بەلام بەلای ئیمەوە تۆ هیچ تاوانبار نی ، هەروەها (نعیم ) دەستی کرد بەکارەکەی خۆی ، ئەویش ئەوە بوو کە گومان دوو دلی بوو لە نیوان سوپای الاحزاب سوپای جوولەکەی (بني قريظة ) ، تاکو بەم هەنگاوە ریکەوتنوو هاوپەیمانی جوولە کەو سوپای الاحزاب تیك بدات ، ئەوە بوو (نیعم ) وای خۆی لە قەلەم ئەدا کە خەمی جوولەکەی(بني قريظة ) یەو ئەو یەکیکە لەوان بۆیە هاو سۆزیان بۆ دەنوینی و پالپشتی ئەوان دەکات،

هەروەها (نیعم ) ووتی : ئەو وەلاتەوەلاتی خۆتانە ئەم شارە شاری خۆتانە مال و مندالتانی تیدایە ، ئیوە ناتوان بەجی بهیلن برۆ لەم شارەدا ، هەروەها ئەوا سوپای قورەیش و سوپای غتفان ، هاتن بۆ داگیر کردنی ئەم شارە چەنگ لە گەل موسلمانەکان دەکەن خۆ وەلات و شاری خۆیان نیە ئەگەر سەر کەوتن بەسەر موسلمانەکان ئەوا تلانی دەکەن دەرۆن ، خۆ ئەگەر سەرنەکەوتن بەسەر موسلمانەکان ئەوا ئیوە بەجی دەهیلن و دەگەرینەوە وەلاتی خۆیان دواتر موسلمانەکان لە ناوتان دەبات ، بەلی (نیعم ) ووتی : ئەگەر (قورەیش ) و (غتفان ) هەلیان دەست کەوت ئەوا دەستی خۆیان دە وەشینن ، ئەگەریش نا ئەگەرینەوە ، هەروەها ووتی : ئیوە بەتەنها جارەیەموسلمانەکان ناکەن ..!! ئەوە بوو ترس و دلە راوکیەکی زۆر ی دروست کرد لە نیو دلی (بني قريظة )دا ...

هەروەها ئەوانیش واتەجوولەکەی (بني قريظة ) ووتیان : ئەی چی بکەین ، ئەویش ووتی : واچاکە (٧٠) پیاو لە سوپای غتفان لەلای ئیوە بیت بە بارمتە بۆ ئەوەی کە ئەوان جەنگ لە گەل ئیوە دا بکەن دژی موسلمانەکان نەوەك لە پەیمانەکەیان پاشگەز ببنەوە ، ئەوە بوو (نعيم ) دوا گورزی خۆی وەشاندە لە جوولەکەکانی (بني قريظة ) ، بەلی جوولەکە زۆر گەمژەو نەزان کال فام بوون کە هەمیشە هەروان ناپاك خیانەت کارو ترسنۆکن ، ئەوان بیریان کردە ئەوان توانای هیرش کردنە سەر قەلاکانی نەوی حاریسە یان نەبوو ، کە ژن مندال پیر و پەکەوتەی موسلمانانی تیدا بوو ، جا چ جای ئەوە هیرش بکەن سەر سوپای ئیسلام ، هەر بۆیە نا جار بوون بە قسەی (نعيم ) بکەن ..!!

بەلی جوولەکەی (بني قريظة ) خۆیان خستە ئەو جەنگەوە بەبی ئەوەی بیر لە داهاتووی خۆیان بکەنەوە ، هەروەها سوپای الاحزابیش سوپایەکی بی سەرو بەر بوو ، لەبەر ئەوە بەچاکی بروایان بەقسەکانی (نعيم ) کرد ، بەمەش جوولەکەسوپاسی (نعيم ) یان کرد بۆ ئەم هەلویستەی کە بۆی نواندون ، بەلی (نعيم ) قوناغی یەکەم نەخشەکەی جی بەجی کرد ، بۆ ناکۆکی نیوان جوولەکە سوپای غتفان ، بی گومان (نعيم ) هەر لەویدا خیراو بەپەلە خۆی گەیاند فەرماندە گشتی سوپای الاحزاب تاکو قورناغی دووەمی نەخشەکەی جی بەجی بکات ، لە پیشەوە دوای کرد لە گەل فەرماندەی گشتی سوپای الاحزاب بەسەرۆکایەتی (ابو سفيان ) کەفەرماندەی سوپای قەرەیش بوو ، لە هەمان کاتیشدا فەرماندەی گشتی سوپای الاحزاب بوو ، ئەوە بوو (نعيم ) لەگەلی کۆ بۆوە و لەگەلی دانیشت و دیارە سوپای الاحزاب هیچیان نەیان زانی (نعيم ) موسلمان بوو ، ئەویش هەوالی دانی کە بۆ کاریکی گرنگ هاتووە ، کەلە بەر خاتری سەلامەتی خۆیان وسوپاکەیان هاتووە ، بی وای نیشاندا کە لە خەمی سوپای لاحزاب دایە ، بۆئەوە هاتووە هەوالی (بني قريظة ) پی راگەینی ، هەروەها (نعيم ) بە (ابو سفيان ) ی ووت : خۆشتان چاك دەزانن من دۆستی ئیوەم دوژمنی محمدم ،ئەوانیش پیان باوەر کرد ، چونکە ئەوان دەیان زانی ئەو وەك ئەوان بت پەرستە ، نەشیان زانی کە ئیستا خوای گەورە هیدایەتی داوە موسلمان بووە ، بەلی کە (نعيم ) زانی قورەیش متمانەی پیدەکەن ، دووبارە وەك ئامۆژگاری دەستی بەقسان کرد دەربارەی جوولە کەکانی (بني قريظة ) بەلی ئەو تە باسی ئەوەی کە جوولە کە پیلانیان هەیە دژی سوپای الاحزاب واتە قورەیش و غتفان ، باسی کرد کە جوولەکە (بني قريظة ) دوای (٧٠) پیاو لە قورەیش غتفان دەکەن لەجیاتی ئەو پەیمانەی نیوانیان هەروەها بۆ ئەوەی دل نیا بن کە سوپای الاحزاب دەوربەری شاری مەدینە چۆل ناکات جوولەکە بەجی ناهیلن ، تاو بەتەواوەتی موسلمانەکان لە ناو بەرن ..!!

ئ

هەروەها (نعيم ) شتيكى تريشى بەسوپاى الاحزاب ووت ئەوەشى بۆ زياد كرد ووتى : بيستوومە جوولەكەى(بني قريظة ) كە پيمانيان شكاندبوو، لەگەل محمد ، ئيستا كەسيان ناردوە لەم كارە پەشيمان بونەتەوە ، هەروەها جوولەكە ئامادەى خۆى نواندە لە گەل سوپاى ئيسلام دژى سوپاى الاحزاب جەنگ بكەن ..!! هەروەها (نعيم ) بەقورەيش غتفانى ووت ئايا ئيوە رازين كە كشانەوەى لەم جەنگ (٧٠ ) پياوتان لەلايەن جوولەك لەملى بدريت ..!! هەروەها دواتر ئامۆژگارى سوپاى الاحزابى كرد پى ووتن : ئەگەر جوولەكە داواى پياوى لى كردن ئەوان بەفيلن تاقە پياويكى نەدەنى ..!! دواى ئەوەى (نعيم ) قوناغى نەخشەى دووەمى جى بەجى كرد ، دواتر خيراو بە پەلە دەستى بە قوناغى نەخشەى سى يەم كرد ، ئەويش بە پەلە خۆى گەياندە لاى خزمانى لە سوپاى غتفان ،هەمان باسى بۆ قورەيش كرد ئەواش بۆ غتفانى كرد ، دواتر هەر دوو سوپاى قورەيش غتفان ، بايەخى باشيان بەم قسانەى (نيعم ) دا ئەوە بوو خەم وخەفەتكى زۆر و رق قينەيەكى زۆريان بوو بۆ جوولەكەى (بني قريظة ) هەلگرت . دواى ئەو كە هەردوو سوپاى قورەيش غتفان باوەريان بە (نعيم ) ، دواتر هەستان بەناردنى كۆمەلى لە پياوانى خۆيان بۆ لاى جوولەكەى (بني قريظة ) بە پياوەكانيان ووت : بە جوولەكەى (بني قريظة ) خۆيان ئامادە بكەن لە رۆژى شەممە دەست دەكەين بەهيرش كردن بۆ لەناو بردنى سوپاى ئيسلام ، بەلام جوولەكە بەراستەخۆ نەويران بلين بارمەتەمان لەلا دا بنين ،بەنا راستەخۆ ووتيان : ئيمە لەرۆژى شەممە دا جەنگ كوشتار ناكەين چونكە حرام كراوە لەئاينى ئيمەدا ، دواى ئەو بەرە بەرە هاتە سەر باسە سەرەكيەكە ،چونكە ئەوان ترسيان لەدل دا بوو تاكو كۆتايى سوپاى لاحزاب لە گەليا ندا نەمينيتەوە ، دواتر جوولەكەى(بني قريظة ) بەناچارى ووتيان : بە نيونەرانى سوپاى الاحزاب ئيمە جەنگ ناكەين لەگەل محمد تاكو (٧٠ ) پياو بە بارمتە دانەنين ، چونكە ئيمە دەتر سين نەوەك ئيوە پشتمان تى بكەن ..!! دواتر بگەرينەوە مەنزلى خۆتان ..!! كاتيك نيونەرانى سوپاى الاحزاب ئەمەيان لەدەمى سەرۆكەكانى جوولەكەى (بني قريظة ) بيست وە بەبى وەلام گەرانەوە فەرماندەى گشتى سوپاى الاحزاب ، هەروەها وەلامى جوولەكەى (بني قريظة ) بە فەرماندەكانى سوپاى الاحزاب ووت ،ئەوانيش هيچ گومانيا لە ناپاكى كردنى جوولەكە نەما ئەوان واتە جوولەك خەريكى خيانەت ناپاكى كردن لە گەل سوپاى الاحزاب دا ،فەرماندەكان ئەوە شيان باس كرد كە ديارە جوولەكە نيازى وايە (٧٠ ) پياوە بداتەدەست سوپاى ئيسلام هەر هەموويان بكوژن ، بەمەش لەبەرانبەر پەيمان شكاندنيان لە گەل موسلمانەكان خۆيان پاك بكەنەوە ..!!

ى

دیاره سوپای الاحزاب دووباره نوینەرایان نارد بۆلای جوولەکەی ( بني قريظة ) بۆ ئەوەی لەگەل سوپای الاحزاب دا جەنگ بکەن دژی موسلمانان ، سوپای الاحزابیش هیچ بارمتەیەکی لە لای جوولەکە دانانی ، ئەوە ئەوانیش دووباره هەمان وەلامیان دانەوە بۆ سوپای الاحزاب ، کە جوولەکەی ( بني قريظة ) بە هیچ شیوەیەك بی بارمتە جەنگ ناکات لەگەل موسلمانەکان ، هەروەها ( حوویەیی کور ئەخت ) کە سەرۆکی جوولەکەی ( بني نضير ) بوو زۆر هەولی لەگەل جوولەکەی ( بني قريظة ) دایە بۆ ئەوەی ریسەکەی لی نەبیتەخوری لە گەل سوپای الاحزاب دا جەنگ بکەن دژی سوپای ئیلام ، بەلام جوولەکەی ( بني قريظة ) هەر لەسەر داواکەی خۆیان سوور بوون ، بەشیمان نەبوونەوە لەم قسانەی خۆیان بەرانبەر بە سوپای الاحزاب ..!

بەلی بی گومان ئە و پیاوە وەك فریشتە وا بوو هات و فەریای موسلمانان کەوت لەم کاتە تەنگانە کاتیك بوو کە هەموو نیچەدوورگەی عەرەبی و جوولەکە موناﻓیقەکانی شاری مەدینە لیان کۆ ببونەوە کە لە ناویان بەرن تەفرە توونایان بکەن ، بەلام هەمووکات ( خوای گەورە ) پال پشتی موسلمانان دەکات لە کاتی تەنگانەدا فریایان دەکەوتی بەهۆکاریك بیت یان کەسیك بیت یان هەر شتیك ببیتە هۆی سەرکەتنی موسلمانان ، بەلی ئەو شیرە پیاوە مەردە ( نعیمی کوری مسعوود ) توانی نەخشە و پیلانەکانی بۆ دوژمنانی ئیلام داریژیت موسلمانان رزگار بکات لەدەستی موشریك بتپەرستان و ناپاك خیانەتکارو موناﻓیقان ، بی گومان بۆ هەوی بەتەوازەیی سوپای الاحزاب ، بەهۆی تیك چوونی نیوان سوپای الاحزاب و جوولەکەی ( بني قريظة ) ، بەلام بیهقی لە دلائل نبوە دا دەلی : جوولەکە( بني قريظة ) پاش ئەوەی پەیوەندیان تیك چوو لەگەل سوپای الاحزاب دا ، ئەوە بوو پەیوەندیان بە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد تاکو لەگەلیاندا ریك بکەون بەمەرجی جوولەکەی ( بني نضير ) بگەرینەوە بۆ شاری مەدینە ، بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم داوایەی جوولەکەی ( بني قريظة ) بشت گویی خست دایە دواوە ..!! بەلی کاتیك پەیوەندیە کانی نیوان جوولەکە سوپای الاحزاب تیك چوو ە فەرماندە کان هاتنە سەر ئەو بریارە هەریەکەیان بگەرینەوە وەلاتی خۆیان گەمارۆی سەر شاری مەدینە هەل بگرن ..!!

## سی رووداوی گرینگی غەزای الاحزاب یان خەندەق

**یەکەم: کوشتنی ( عمرو بن عبد ود )**

بەلی کۆمەلیك لە کافرانی سوپای الاحزاب ، لە شونیکی تەسك پەرینەوە لەوە خەندەق ، کە ( عمرو بن عبد ود ) یشیان لەنیوان دا بوو ، بۆ ئەوەی هیرش بکەن سەر سوپای ئیسلام ، ئەوە بوو ، ( علی کوری ئەبو تالیب ) – خوا لی رازی بیت – بەتەنها بۆ ( عمرو بن عبد ود ) چوو ، ئەوە بوو کەوتنە جەنگ کردن لە گەل یەك دا ، کە جۆرە شیوازیکی جەنگ کردن بوو ، لەم سەر دەمە دا ، کە بەتەنها بۆ یەکتر ئەچوون ، واتە نەفەر بەنەفەر دە کەوتنە زۆران بازی و شەرە شمشیر کردن ، بەلی ئەم دوو پیاوە بەیەکەوە شەریان کرد و هەردوو کیشیان هەر لە نەوەی قورەیشی بوون ، لەسەر ئەنجام دا ( علی کوری ئەبو تالیب ) لی هاتە دەست شمشیریکی لیدا ( عمرو بن عبد ود ) ی کوشت ، هەر چەندە لەو سەردەمەدا لە نیوان نەوەی قورەیش ( عمرو بن عبد ود ) پیاویکی ئازاو ناوداری قورەیش بوو ، بۆ جەنگ کردن ، بەلام لە کۆتایی دا ( علی ) بەرسەر ( عمر ) سەرکەوتوو کوشتی . ابن هشام فی السیر النبویه ( ٣/١٠٩-١١٠ ).

**دووەم : هلکرندی بایەکی توندو بەهیز ، وە دابەزینی فریشتەکان بۆ یارمەتی دانی موسلمانان :**

بەلی بۆ گۆمان هۆیەکی دیکەی تیك شکاندنی سوپای الاحزاب ، ئەوە بوو کە بایەکی بەهیزو توند هەلکی کرد ، ئەوەش بەفەرمانی ( خوای گەورە ) بوو ، ئەوە بوو کە هەموو بارگە و بنە چادرەکان ویان خیوەدگەکانی سەربازگەی سوپای الاحزابی تیك دا ، هەروەها ئەم بایە بۆ هۆی ئەوە کە چاویشیان بە تەواوەتی نەبینی ، هەروەها فریشتەکانیش بە فەرمانی ( خوای گەورە ) ترسیان خستە دلی سەربازانی سوپای الاحزاب ، هەرودك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾ **الاحزاب ٩** .

واتا : ئەی ئیمانداران یان ئەوانەی کەباوەرتان هیناوە ، یادی نیعمەتی ( خوای گەورە ) بکەنەوە لەسەرتان ( مەبەست جەنگی الاحزاب یان خەندقە ) کە ( خوای گەورە ) بە فریایی ئیمانداران هات ، کاتیك سەربازانی کوفر هاتنە سەر تان ، ئیمەش رەشەبایەکی بەهیزو سەربازانیکمان ناردەسەریان ( مەبەست فریشەکانی ( خوای گەورە ) بوو ، کە نەتان دەبینین ، خوای گەورە بینا بوو بە هەول کۆششتان ( چۆن پاسە وانی تان دەکرد ، چۆن ئەو چالە قوول و دریژەتان هەلکەند ..هتد .

ابن هشام فی السیر النبویه ( ٣/١١٣-١١٤ ) .

ئ

## سی یەم : ناردنی (حذیفە ي كوری یمان ) بۆ ناردنی بارو دۆخی سوپای الاحزاب :

بەلی پاش ئەوەی سوپای الاحزاب لیك هەلوەشایە وە بە هۆی ( نعیمی كوری مسعوود كوری عامری الغتفانی ) بە یەكجاری باوەریان بەیەكرت نەما لە نیوان سوپای قورەیش و غتفان وجوولەكەی ناپاك دا ، ئەوە بوو وورەیان رووخا ترس لەرز كەوتنە دلی دوژمنانی سوپای ئیسلام ،لە كۆتایی دا بریاریاندا گە بگەرینەوە ئەو شوینەی كە لیوە هاتوون هەریەكەو بۆ شوینی خۆی بگەریتەوە ، ئەمەش بە هۆی حیكمەت دانایی پیغەمبەر ﷺ صبرو خۆگری ئارامی موسلمانان لە رۆژەكانی غەزای الاحزاب دا ،یان بەهۆی ئەوە پیاوە مەردە كە (نیعمی كوری مسعوود ) بوو كە توانی سوپای الاحزاب پەرتەوازە بكات و هەلیان بوەشینیتەو ، یان ناردنی بایەكی بەهیزو فریشتەكانی ( خوای گەورە ) یان هەلكەندین خەندەق بەدەوری مەدینە دا ئەوش لەلایەن ئەو ئیماندارە دامەزراوەدا ئەویش (سلمانی فارسی )بوو ، ئەمانە هەر هەمووی هۆكار بوون بۆ گەرانەوەی سوپای الاحزاب ،بۆ شوینەكانی خۆیان و هەلوەشاندنەوەیان لە گەل یەكتر دا ئەوە بوو سەرئە نجا ناچار بوون پاشەكشە بكەن لەم جەنگە راكەن بی ئە نجام بگەرینەوە ..!!هەربۆیە پیەمبەری خوا ﷺ لە كاتە دا ناسكەدا پی خۆش بوو هەوالی سوپای الاحزاب لە نزیكەوە بزانیت ، كە چی دەكەن بە تەمایی چین ،چونكە بارودۆخە كە یەكجار سەخت بوو شەویكی یەكجار تاریك بایەكی بەهیزو سەرمایەكی بەهیز بوو ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەلەكانی خۆی فەرمووی : ئایا كامتان لە ئیوە دەتوانیت هەوالی سوپای الاحزابم بۆ بهینی لە قیامەتدا ببیتە هاوریم..!! ئەم شیوازەی سی جار دوو بارە كردەوە بەلام كەس بە دەنگیەوە نەهات ، چونكە بارودۆخەكە زۆر هەستیار بوو ، بایەكی زۆر سارد و بەهیزو توند و شەویكی زۆر تاریك و سامناك بوو، كەس لە خۆی رانەدە دیت ، لە سەر ئە نجام دا پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( قم یا حذیفة فأتنا بخبر القوم ولا تذرعهم علی ) واتە : هەلسە ئەی حوزیفە هەوالی ئەوانم بۆ بهینەوە ،مەیان شلە ژینە لە دژم . (حذیفە ي كوری یمان ) دەلی : منیش رۆیشتن دەتووت بە ناو ئاوی گەرمدا دەرۆم ، بینیم (ابو سفیان ) پشتی خۆی دایە ئاگرە كە ، منیش تیریكم خستە ناو كەوانەكەم و ، ویستم تی بگرم ، بەلام قسەی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم )م بیركەوتەوە ، كە فەرمووی : مە یان رووژین، یان هاریان مەكە ، ئەگەر تیرەكە م بهاویشت بایە ئەوا دەم پیكاو دەم كوشت ، ئیتر گەرامەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ دەتووت بەناو ئاوی گەرم ریدەكەم ، بەلام كاتیك گەرامەوە لای پیغەمبەر ﷺ زۆر سەرمام بوو ، ئینجا باسەكەم بۆ پیغەمبەر گیرایەوە و ، ئەویش عەبایەكی زیادی هەبوو نویژی لەسەر دەكرد ، ئەو عەبایەی لەبەرم كرد ، منیش تاكو بەیانی خەوتم ، ئەو كاتە پیغەمبەری خوا ﷺ پی فەرمووم : (هەلسە ئەی خەو خۆش یان خەو گران ).رواه مسلم كتاب جیهاد والسیر باب غزوە الاحزاب (١٧٨٨).

# غەزای (بني قريظة ) و ڕووداوەکانی

### یەکەم :جوولەکە پەیمانی نیە :

بەلی بی گومان غەزای (بني قريظة ) لە سالی پینچەمی کۆچی دا ڕوویدا پاش گەرانەوەیان لەغەزای الاحزب ،یان غەزای خەندق دا ، پاش ئەوەی ٢٢ڕۆژ سوپای الاحزاب بە پالپشتی جوولەکەی ناپاك گەمارۆی شاری مەدینەیان دا ، چونکە جوولەکەی (بني قريظة ) پەیمانیان یان عهدیان بەستبوو ، لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ کە هەر دوژمنیکی دەرەکی بیتە سەر شاری مەدینە ئەوە بە موسلمانەکان و جوولەکەکانی شاری مەدینە بەرگری لەم شارە بکەن دژی دوژمنی دەرەکی ، بەلام ئەوان ناپاکیان لە پەیمانەکە کرد ، بە هاندانی (حيى كورى اختب ) کە سەرۆکی جوولەکەکانی (بني نضير ) بوو ، کە لە پیش دا باسمان کرد ئەوانیش دەستیان تیکەل کردبوو لە گەل دوژمنە کانی شاری مەدینە ، لە لایەن پیغەمبەری خوا ﷺ دەر کران لەشاری مەدینە ، ئەو بووە هاندانی ئەوەی کە جوولەکەی (بني قريظة ) لەگەل موسلمانان ناپاکی بکەن ،نەك تەنها بەرگریان لە شاری مەدینە دا نەکر د ، بەلکو بوونە چاو ساغ و ری نیشاندەر و سوپای الاحزاب بۆ داگیری کردنی شاری مەدینە ، هەروەها هەولیشیان دا دەست لە سوپای ئیسلام بوەشینن هەلکوتنە سەر قەلاکانی (بنی حاريسه ) کە ژن و مندال و پیر و پەکەوتەی تیدابوو ، لەویدا بوون کە پاراستنی خۆیان لە جەنگ سوپای الاحزاب کە لە هەموولایەك دا گەمارۆی شاری مەدینەی دا بوو ، بەلی جوولەکەی (بني قريظة ) بەپی ئەم پەیمانەی نیوانیان کەلە گەل موسلمانەکان بەستبوویان دە بوایە وەك موسلمانەکان بەرگری لەشاری مەدینە بکەن کاتیك سوپای الاحزاب هاتە سەر شاری مەدینە ، بەلی دە بوایە جوولەکە بەشیك بیت لە سوپای ئیسلام ، بەلام جوولەکەی (بني قريظة ) نامەرد بوون ،بە وینەی (بنی قینقاع ) و (بني نضير ) لە جیاتی دەستی دۆستایەتی دریژ بکەن ، ئەوە بوو کەوتنە ئەوەی دەستی نا پاکیان دریژ کرد بۆ سوپای ئیسلام و موسلمانان ، بەلی لە جیاتی ئەوەی کۆمەك و پیشتیوانی و هاوکاری موسلمانان بکەن ، لەم کاتە ناسکە دا ، چونکە موسلمانان لە نارەحەترین کات دا بوون بەرانبەر بە سوپای الاحزاب دا ، جوولەکەی (بني قريظة ) لەم کاتە ناسکە دا هەلویستی ئەوان شکاندنی پەیمان بوو ، بەراینبەر بە موسلمانەکان ، وە دەر برنی ئاشکرایان کرد بۆ پالپشتی دوژمنانی شاری مەدینە و داگیر کەرانی شاری مەدینە دا ، بی گومان جوولەکە لایان یەقین بوو کە ئەم جارە موسلمانەکان نەجاتیان نابی لەدەست ئەم سوپا گەورەی الاحزاب ، بۆیە پالپشتی دوژمنانی ئیسلامیان کرد چوونە بەرەی دوژمنانی ئیسلام ...

ێ
بی گومان ئەوە كاریكی یەكجار نامەدرانە بوو كە جوولە كەی (بني قريظة ) ئە نجامیاندا ، جگە لەوەش هیچ ناپاكی بی پەیمانی و درۆ كاریكی نەشیاوایان نەبینی بوو ،لە پیغەمبەری ئیسلام و موسلمانان دا ، بەلام ئەوان ئەو كارە قیزە ونەیان و ئەو نامەردیەیان ئە نجام دا ، بەلی بەو مەرجەی كە سەرۆكی جوولەكەكانی (بني قريظة ) كە ناوی (كەعبی كوری الاسد ) بوو بە ئاشكرا دەری بری كە جوولەكە جگە لە راست گۆیی پەیمان و وەفایی هیچی تری نەبینیوە لە پیغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانەكان دا ، ئەمەش لە كاتیك دا كە (حويە ی كوری ئەختب ) سەرۆكی (بني نضير ) ئەو پیاوە نامەدرە و ترسنۆكە هەلگیر سینەری خۆش كردنی ئاگری سوپای الاحزاب بوو، لە هەمان كاتیش دا چوو بووە بەردەم قەلاكانی جوولەكەی (بني قريظة ) تاكو باوەر قەناعەتیان پی بكات تاكو لە پەیمانەكەیان پاشگەز ببنەوە لە گەل پیغەمبەر ﷺ موسلمانان دا ، تاكو جوولەكەی (بني قريظة ) ببتە پالپشتی سوپای الاحزاب ، بەلی بی گومان هەر واش بوو ئەوانیش وەك :جوولەكەی (بنی قینقاع ) و (بني نضير ) نامەردی و ناپاكی و خیانەتیان ئە نجام دا ، بەلی ئا بەم شیوەیە پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر هەولی لەگەل دان تاكو جوولەكەی (بني قريظة ) لەم پەیمان شكاندنەدا پاشگەز نەبنەوە لە پیمانەكەیان لانەدەن ، ئەوە بوو جەند پیاویكی نارد بەسەرۆكیایەتی (سعدی كوری موعاز ) لە ئەنصارە كان كە سەرۆكی نەوەی (ئەوس ) بوو ، ناردی بۆ لای جوولەكەی (بني قريظة ) تاكو ئامۆژگاریان بكەن ، لەو هەلویستە نامەردانەی جوولەكەی (بني قريظة ) بۆ ئەوەی لە پەیمانیان لانەدن ،چونكە بۆیان بە خراپ و ناپاكی دەشكیتەوە ، باجی قورس دەدن ، ئەگەر ئەم كارە نامەدانە بكەن ، بەلام ئەم ئامۆژگاریە ی (سعدی كوری موعاز ) یان بشت گویی خست زۆر بەنامەردی وەلامیان دایەوە ، بەردەوام ئەوبن ئەوان پالپشتی سوپای لاحزاب دەكەن ،تازە موسلمانان تی چوون ..!! بەلی جووكەی (بني قريظة ) هە تا ئەوە شیان ووت : ئیمە نە محمد دە ناسین ..!! نە پیمانیشمان لەگەل دا بەستووە ..!! ،بەلام دواتر دەستیان كرد بە هیرش كردن بۆ سەر قەلاكانی ژن مندال و پیر پەكەتەی موسلمانان، لە هەمان كاتیش دا چەك تەقەمەنی و خواردنیان بۆ سوپای الاحزاب دە برد ، بەلی ئەوە بوو بە نهینی خۆاركیان دە برد ئەوە بوو ٢٠ ووشتر باری خۆراك و كەرەسە جەنگی كەوتنە دەست موسلمانان ، كە لە لایەن جوولەكەی (بني قريظة ) رەوانەدەكران بۆ سوپای لاحزاب ، چونكە جوولەكەی (بني قريظة ) لایان یەقین بوو، كە سوپای الاحزاب شاری مەدینە داگیر دەكات و موسلمانان كۆتایی یان دیت ، بۆ یە پی یان خۆش بوو ئەوانیش بەشداربن لەو ناپایەك و نامەردیە كە ئە نجامی دەدەن بەرانبەر بە پیغەمبەر(صلى الله عليه وسلم ) و موسلمانان ..!!

ئ

ئەوخیانەتەی جوولەکە لە یاسایی مرۆڤایەتی دا بە ( خیانة العظمی ) لە قەلەم ئەدریت ..!!

یان بەدووژمنی چەك هەلگرتوو لەقەلم ئەدرین ..!! وە بەئاشکرا دەریان بری کە دوژمنی موسلمانان هیچ پەیمانیکیان نیە لە نیوانیاندا ..!!کەواتە جوولەکەی ( بني قريظة ) دوژمن نەبیت ئەی کی دوژمنە ..!!

دووەم : فەرمانی ( خوای گەورە ) بۆ جوولەکەی ( بني قريظة ):

بەلی کاتیك سوپای الاحزاب کشایەوە جوولەکەش چوونەوە نیو قەلاکانی خۆیان ، لە ترسی موسلمانان و سوپای ئیسلام هەل ئەلەرزین وچونکە زۆر ترسنۆ کو نامەرد بوون ، ئەیان زانی چ تاوانیکی بی وینەیان ئە نجام داوە ، کە بریتی : بوو لە خیانەت و ناپاکی کردن لە پیغەمبەر ﷺ و سوپای ئیسلام ،هەروەها تیاچوونی کۆمەلگای ئیسلامی لە شاری مەدینەدا ، رووخاندنی ئاینی ئیسلام بۆ هەتا هەتایی ، بی گومان ئەشیان زانی سزاکەیان لەبەر گەورەیی تاوانەکەیان یەکجار گەورەیە ..!! خۆ لە هەمان کاتدا پیغەمبەری خوا ﷺ ئەیزانی ئەوان تاوانیکی زۆر گەورە یان ئە نجام داوە دەبیت بەر سزای خۆیان بگەن ، بالام پی باش بوو پشویەك بداتوە بەر موسلمانان و سوپای ئیسلام ، چونکە تازە سوپای الاحزا پاشەکشەی کردووەبۆ شوینەکانی خۆیان گەراونەتەوە ، ئەوانیش ٢٢رۆژ لە گەمارۆی سوپای الاحزاب دا بوون ، پیویستیان ئەوە بوو بۆ کەمیك پشوو بدەن بەحەسینەوە لەم ئازارو ماندو بوون و هیلاکیەی سوپای الاحزاب کە خستبویە سەر موسلمانەکان کە گەمارۆیەکی زۆر سەخت بوو ، لە هەمووالایەك ئابلوقە درا بوون ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ وای بە چاك زانی کە بۆ ماوەیەك پشوو بدەن دواتر هیرش بکەن سەر قەلاکانی جوولەکەی ( بني قريظة ) ، بەلام ( خوای گەورە ) بەم پشوودانە رازی نەبوو ، بی گومان حیکمەتی تیدایە ، فەرمانی بەهیزو توند و بە پەلەی و خیرایی ناردە سەر پیغەمبەر ﷺ و موسلمانەکان و سوپای ئیسلام ، کە پشوو نەدات بە خۆی هاوەلانی چەك دانەنین ، هەتاکو هەلمەت بەرنە سەر قەلاکانی جوولەکەی ( بني قريظة ) ، چونکە کاریکی زۆر نامەردانە یان ئە نجام داوە ..!!

ی

٧ (ابن هشام ) له سیره دا دەلی : ئەو شەوەی كە كافرانی سوپای الاحزاب ، گەمارۆیی سەر شاری مەدینە یان بەرداو رۆیشتنەوە شوێنەكانی خۆیان ، بۆ سبەی نیوەرۆكەی (جبريل ) (عليه السلام ) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پی فەرموو: ئایا ئێوە چەكتان داناوە ..؟!

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بەلی .

(جبريل ) (عليه السلام ) فەرمووی : فریشتەكانی خوا هێشتان چەكیان دانەناوە ، منیش لە سەر داوای ئەوان هاتمەوە لات ،(خوای گەورە ) فەرمانت پی دەكات ، كە هەر ئێستا بچی بەرەو جوولەكەی(بني قريظة ) كە تیرە یەك بوون لە (٣ ) تیرە جوولەكەی شاری مەدینە ، كەلە دەوروبەری مەدینە دا ما بوون ، منیش ئەوە دەرۆم ترسیان دەخەمە نێو دل و شوێنە كانیان لە بن پی دەلە ر زێنم ..!!

ابن هشام فی السير (٣/١١٥-١١٦ ) صحيح البخاری (٤١١٧-٤١١٩ ).

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یان چوو ، بە هاوەلانی فەرموو : (لا يصلين أحد العصر الا في بني قريظة ) . واتە : هیچ كامێكتان با نوێژی عصر نەكات مەگەر لە لای (بني قريظة ) بكریت ، مەبەستی ئەوە بوە پەلە بكەن بۆ ئەوەی كاتێك بگەنە ئەوەی كە نوێژی عصر مابی لەوی بیكەن ..!!

هەروەها (بيهقي ) لە خاتوو (عائيشه ) –خوا لی رازی بێت – ریوایەتی كردووە ، دەفەرمووی : كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای ئەو بووە ، دەلی : لەماله وە بووین پیاوێك سەلامی لیمان كرد و ، پێغە مبەری خوا ﷺ هەستایە سەر پی ، منیش بەدوای هەستام ، ئەبینیم پیاوێك وا بەسر ئەسپێكەوە و پێغەمبەریش ﷺ شانی بەسەر ئەسپەكەدا داداوە و قسەی لەگەل دا ئەكات ، خاتوو( عائیشە ) ئەفەرمووی : منیش گەرامەوە دوا ، كە پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە ووتم : ئەو پیاوە كی بوو كە قسەت لەگەلدا كرد ..؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (بمن تشبهينه ..؟! ) فەرمووی : بەلای تۆ لە كی ئەكات ..؟!

ئەلی منیشم ووتم : لە (د يحيەی كلیبی ) ئەكات ..!!

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : (ذاك جبريل عليه السلام ، أمرني أن أمضى إلى بني قريظة ) . واتە :ئەوە جبريل بوو، فەرمانی بەسەرمد دا تا بچمە سەر (بني قريظة ) .

ئ

هەروەها (ابن اسحاق) – خوا لی رازی بیت – ریوایەتی کردووە دەلی : کە پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەمارۆی خەندەق دا رۆژی لی بوویەوە ، لە خەندەق گەرایەوە بەرەو شاری مەدینە ، موسلمانەکانیش چەکیان دا نا بوو ..!! کە کاتی نیوەرۆ هات ، (جبریل)،(جبریل علیه السلام) هاتە خزمەتی پیغەمبەری خوا ﷺ و میزەریکی لە ئیستەبرەق دروست کراوی لە سەر نا بوو ، سواری ئیستریک بوو بوو کە کەل و پەلە کە ی بەسەریەوە بوو و ، قەدیفەیەکی ئاوریشمیش بەسەر ئەودا درابوو ، فەرمووی : ئایا چەکت داناوە، ئەی پیغەمبەری خوا ..؟! ئەویش فەرمووی : بەلی .

جبریل فەرمووی : هیشتان فریشتەکان چەکیان دانەناوە و هەر ئیستا لەراونانی سوپای الاحزاب گەرانەتەوە ..!! (خوای گەورە) فەرمانت بەسەر دا ئەدا کە هیرش بکەیتە سەر (بني قريظة) ، وامنیش دەچمە لەسەریان دل یان دینمە لەرزین ..!!

بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەم فەرمانە بە پەلەیەی (خوای گەورە) کە بە جبریل (علیه السلام) رەوانەی کردبوو ، ئەوە بوو هیچ جاری نەما بۆ حەسانەوەی سوپای ئیسلام ، خیرا فەرمانی کرد ، بەرەو قەلاکانی جوولەکەی (بني قريظة) هیرش بکەن و بکەونەری بی حەسانەوە و بە پەلە ..!!

بی گومان ئەفەرمانەی پیغەمبەری خوا (صلی الله وسلم) لە شیوەی کتابیك یان مەرسوومیك دا بە( بیلالی کوری رەباحی ) گەیاند تا بۆ موسلمانان و سوپای ئیسلام بخوینیتەوە و پی یان راگەیەنی ، ئەوە بوو (بیلال) فەرمانەکەی خویندەوە و بەناو موسلمانان دا ، هەر کەس و گویی لە فەرمانەبوو، دە با نویژی عصر لە ناوەنزلی جوولەکەی (بني قريظة) دا بکات ، چونکە فەرمانەکە زۆر بە پەل و خیرا بوو ، نەدە با راوەستا و بحەسینەوەو چەکیان دانین ، بەلی ئەمە فەرمانی خوای گەورە یە دەبیت بە زووترین کات جی بەجی بکریت و ئە نجام بدریت ..!! بەلی بەم فەرمانە دوای نیوەرۆ یەکم رۆژی گەرانەوەی سوپای ئیسلام بوو لە غەزای خەندە ق دا ، بە پەل و خیرا موسلمانان فەرمانی پیشەواکەیان جی بەجی کرد و ، بە پەلە هەلمەتیان دایە چەکەکانیان و ، هەروەها موسلمانان و سوپای ئیسلام دەستە لەدوای دەست خۆیان گەیاندە قەلاکانی جوولەکەی (بني قريظة)، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ بە پەل و خیرا خۆی پیچایەوە قەلغان و جلی جەنگی وە درع کەرەسە جەنگی بەست وە رمی بەدەستەوە گرت ، پاشان سواری ئەسپەکەی بوو ، فەرمانیش بە (ام مكتوم) دەکرد کە لەماوەی دەرچوونی ئەو ببیتە ئەمیری شاری مەدینە ...!!!

ئ

هەروەها ئـالای سوپای ئیسلامی دایە دەستی ( علی کوری ئەبو تـالیب ) ، کە ئەم ئـالایە هەر ئەو ئـالایە بوو کە سوپای ئیسلام لە غەزای خەندەق بەدەستیانەوە بوو ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە ( علی کوری ئەبو تـالیب ) کە لە پیشەوەی سوپا دابگاتە نیو قەلاکانی جوولەکەی ( بني قريظة ) ، بەلی ئەویش بە خۆی بە سریەکەی خۆی گەیاندە نیو قەلاکانی جوولەکەی( بني قريظة ) و ئـالای سوپای ئیسلامی لەویدا چەقـاند ، بەی جوولەکەی ( بني قريظة ) زانیا کەوا سوپای ئیسلام هیرشی بۆ سەر ئەوان دەست پی کردووە ، چونکە ماوەی نیوان شاری مەدینە قەلاکانی جوولەکە نزیك بوون لەیەك دا ، موسلمـانان بەدەست دەستە چوون بۆ مەنزەکانی جوولەکەی ( بني قريظة )

بەلی هەندیك لە موسلمانان لە ریگادا نویژی عصریان ئەنجام دا ،نەوەك نویژەکەیان دوا کەویت ، هەندیکی تریشیان زۆر بەپەلو خیرا رۆیشت بەرەو مەنزلی ( بني قريظة ) لەویدا نویژی عصر یان ئەنجامدا ، بەلام کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەوالەی زانی گەلیی لە هیچ کەس یان نەکرد ، بەلکو دانی بەراستی هەردوو هەلویست دانا ، وە فەرمانی نەدا هیچ کامیان نویژەکە دووبارە بکەنەوە ،ئەمەش بەلگەیە کە ئیسلام ئـاینیکی پاك بیگەرد ، هەرچی دەکات لە پیناوی رەزامەندی ( خوای گەورە ) و پیغەمبەرە کەیەتی ،هەر بۆیە ئـاینیکی گشت گیرە هەموو کەسیك دەتـاوانیت شوینکەوتووئەم ئیسلامە بیت ، بە ینەتی باش بانگەوازی بۆ بکات و ، فەرمانەکانی بەچاکی جی بەجی بکات و وە دووریش کەویتەوە لە قەدەغەکراوەکانی ئەم ئـاینە پیرۆزە کە ئـاینی پیغەمبەرانە ( عليهم السلام )..؟!!

ئ

### سی یەم : گەمارۆدانی یان ئابلوقەدانی جوولەکەی ( بني قريظة ) لەلایەن سوپای ئیسلام :

بەلی کاتیك دەستە یەك لە سوپای ئیسلام گەیشتنە نیو مەنزل و قەلاکانی جوولەکەی ( بني قريظة ) بە فەماندەی شیری خوا ( علی کوری ئەبو تالیب ) ، جوولەکە زۆر بەبی شەرمانە دەستیان دایە جنیو دان سووکایەتی کردن بە ئیسلام و موسلمانان بەگشتی ، وەك سەگ ئەرشانەوە بەو دل دەروون پیسەی کە هەیان بوو ، تا ئیستا هیچ سیرە نووسیك ئەو جنیوانەی جوولەکەی نەنووسیتەوە ، چونکە ئەوەندە قیزەون بوون ، لەگەل ئەوەشدا موسلمانان بەرەوشتیکی بەرز و بی دەنگ وەلامیان نەدانەوە ، جگە لە ( علی کوری ئەبوو تالیب ) ئەو وەلامەی دانەوە ، چونکە زۆر جنیوی پیسیان بە پیغەمبەر و ( صلی الله علیه وسلم ) و هاوسەرانی و موسلمانان دا ، ئەویش ووتی : ئەوا شمشیر لە نیوا نمان دایە ..!! بەلی چونکە ( علی کوری ئەبو تالیب ) هەلگری ئالای سوپای ئیسلام ، ئالاکەی لەدەست دا بوو ، ئەوە ئەم وەلامەی دانەوە ..!!

ی

بەلی كاتیك ( علی كوری ئەبو تالیب ) كە بینی وا پیغەمبەری خوا ﷺ دوا ووە لە گەل دەستەیەك لە موسلمانان وادیت بەرەو مەنزلی جوولەكەی ( بني قريظة ) ، بەلی ( علی كوری ئەبو تالیب ) خیرا لەشوینی بنكەی سەرەكی سوپای ئیسلام گەرایەوە دواوە ، بۆ ئەوەی نەهیلیت پیغەمبەری خوا ﷺ لە مەنزل قەلاكانی جوولەكەی ( بني قريظة ) زیاتر نزیك بیتەوە ، چونكە ئەوان زۆر بی شەرمانە جنیویان ئەدا هەرەشەیان ئەكرد ، ( علی كوری ئەبو تالیب ) نەی ویست پیغەمبەری خوا ﷺ گویی لەم جنیوە قیزەونانەی جوولەكەی ( بني قريظة ) بیت ، چونكە بە بیستنی خەمبار دەبوو ..!!

بەلی ( علی كوری ئەبو تالیب ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ نەكەیت لەم پیسانە نزیك بیتەوە ..؟!!

هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( لعلك سمعت منهم لی أذی ) واتە : لەوانە یە دەربارەی من شتی ناخۆش بیستبی ..؟!

( علی كوری ئەبو تالیب ) ووتی : بەلی . ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم .

پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( لو رأوني لم يقولوا من ذلك شيئا ) واتە : ئەگەر بم بینن هچی لەوەم پی نا لین ..!!

بەلی دواتر پیغەمبەری خوا ﷺ زیاتر بەرەو پیشەوە چوو لەقەلاكانی جوولەكەی ( بني قريظة ) زیاتر نزیك بوویەوە ..!!

بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوندە نزیك بوویەوە كەقسەی یەكتریان دە بیست ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ بانگی كردە چەند فەرماندەیەكی جوولەكەی ( بني قريظة ) كە لەسەر قەلاكانیان دەر كەوتبوون ، فەرمووی ( يا إخوة القردة وعبدة الطاغوت و هل أخزاكم الله وأنزل بكم نقمته ..؟! واتە : ئەی براكانی مەیموون و ، تاغووت پەرستان ..!! ئایا ( خوای گەورە ) سەر شۆری كردن و ، غەزە بوو عەزابی خۆی باراندن بەسەر تان دا ..؟!

ێ

بەڵی ئیستا وا سوپای ئیسلام لە بەردەم قەلاکانی ئەوان وەستاوە گەمارۆیان داون ، بە نیازی ئەوەی سزای ئەونا پاکانە بدەن کە زۆر نامەردانە خیانەتیان کردو لە پاشانیش دا ئیستا لە بەردەم موسلمانان دا جینو قسەی ناشرین بە پیغەمبەر وموسلمانان ئەدان ، بەلام لە دواتر دا هیچ جارەیەکیان نەمابوو بەس خۆ بەدەستەوەدان نەبیت ، هەر بۆیە لەبەردم پیغەمبەری خوا ﷺسەریان شۆر کردو نەرمیان نواند ، چونکە لە دەست موسلمانان و سوپای ئیسلام دەربازیان نەدەبوو ، بەلی لە پاشان دا دەستیان کرد بەقسەی لوس دل نەرم کردن پارانەوە ، لە پیغەمبەری خوا ﷺ بەو ئاواتەی کە پیغەمبەری خوا ﷺسزایان لەسەر هەلگری یان سووکی بکات ، بەلی ئەگەر خوینەری بەریز سەیری رەوشت و سیفاتی جوولەکە بکە کە چۆن قورئانی پیرۆ بە روونی وصفی کردن ، ئەوەمان بۆ دەر دەکەویت ، کە کاتیك جوولەکە دەستی هەبیت زۆر زالم ستەمکارانەو بی بەرەیی و بی ویژدانی رەفتار دەکات گویی بەهیچ شتیك نادات .. ئا ئەواتا بەرانبەر برا موسلمانە کانی شاری فەلەستینی ئیستا چ جۆرە تاوانیك لەبەر چاوی هەموو خەلکی جیهان ئە نجام ئەدات ، بی ئەوەی بەقسە هیچ کەسیك بکات ، بەلام کاتیکیش بواری نەبوو کە بی دەست و لاواز بیت ، ئەوا وەك سەگ لوورە لوور دەکات و دە پاریتەوە دە کەویتە پیلاو ماچ کردن ، بەلی ئەمەیە سروشتی جوولەکەو سەگەکانی جوولە لە هەمووجیهان چونکە ئەوانە برای مە یموون یان کویلەی تاووتن ..!!

بەلی جوولەکەی( بني قريظة ) دەستیان کرد بە پارانەوە لوورە لوورە کردن بەشیوەیەکی لاوازو بی هیز خۆیان نیشاندا ، ئەوا شیان لەبیر خۆ بردەوە کە دەستیان هەبوو لە گەل سوپای لاحزاب چون پەلاماری ژن مندالان و پیر کەوتە هاوەلانیا ئەدا ، ئەواشیان بیر چوو چۆن یارمەتیان ئەنارد بۆ سوپای لاحزاب ئەوەشیان لەبیر چوو چۆن داریژەری نەخشەی هیرش کردنە سەر شاری مەدینە بوون ، هەر وا ئەوشیان لەبیر چوون کە چۆن جنیویان بە پیغەمبەرﷺو موسلمانا ن ئەدا ، هەروەها داریژەری نەخشەی هەموو پیلانیك بوون لەدژی ئیسلام لەنیمچە دوورگەی عەرەبی دا و هەروەها پە یمان شکاندنیشیان لەبیر چوو ، ئەیان ووت : ئیمە محمد ناناسین ..!! پە یمانیشمان نیە لەنیوواندا ..!!

ئ

**چوارەم : نەخشەی دەرباز بوونی بۆ جوولەکەی(بني قريظة)لە لایەن (عمر ی کوری سووعدا ) کە سەردارێکی جوولەکەبوو :**

بەلی ئەوە بوو کە لە کاتی گەمارۆدان یان ئابلوقەدانی سوپای الاحزاب بۆ سەر شاری مەدینە جوولەکەی ناپاکی (بني قريظة ) ئەمە یان بە هەل زانی بۆ دەست وەشاندن و ناپاکی کردن و خیانەت کردن لە موسلمانان دا ، ئەوە بوو پەیمانی نیوان خۆیان و پیغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانانی شاری مەدینەیان ، هەلوەشاندەوە ، چۆنکە تەماع گیر بوون بۆ لەناو بردنی سوپای ئیسلام و موسلمانان ، بەلام چەند کەسێك لە سەردارانی جوولەکە کە چوار سەرکردە بوو ن ، لە ناویاندا ( عمر ی کور سووعدا ) تیدا بوو ، ئەوە بوو زۆر هەولیان دان کە پەیمان نەشکینن لەگەل محمد و موسلمانان دا بە قسەی ( حویەی کوری ئەختب ) ی سەرۆکی جوولەکەی ( بني نضير ) نەکەن چونکە ئەو مەبەستی گلاوی خۆی دەسە پینی بەسەریان دا ، بەلام جوولەکەی (بني قريظة ) بەقسەی ( حویەی کوری ئەختب ) یان کردو پەیمانیان شکاند چوونە پال سوپای الاحزاب ، ئە چوار سەردارەی جوولەکەش ئامادە نەبوون بەشداری لەو کۆ بوونەوەیە بکەن و رازی نەبوون بەپیمان شکاندن لە گەل موسلمانان دا ، لە ناویاندا (عمری کوری سووعدا ) ئەو پیاوە جوولەکەیە ئامادە نەبوو بەشداری بکات و پەیمان بشکینی ، وە بە ئاشکراش دەری بری کە ئەوان لەسەر پەیمانی خۆیانن ، هەر ئەوە بوو لەم چوار سەردارەی جوولەکە (٣)یان موسلمان بوو ، هەروەها (عمری کوری سووعدا ) موسلمان نەبوو ، بە لام لەسەر ئاینی خۆی مایەوە و پەیمانی نەشکاندن لە گەل پیغەمبەری خوا ﷺ، بەلی ئەو جوولەکەی ریگا جاریە کی بۆ قەومەکەی دۆزیەوە بەوەی کە ئەوان موسلمان بن بەلکو لەو سزایەی موسلمانان رزگاریان بکات ،ئەو نخشەی بۆ دانان و رزگاریان بکات ، تاکو شوینی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بکەون ، وە موسلمان بن ، بەتایبەتەی ئەوان لە لایان روون بوو کە ئەو پیغەمبەری خوایە ﷺ وە خۆیان بە چاوی خۆیان ببینن ، بەلی کاتیك (عمری کوری سووعدا ) کە هەوالی کشانەوەی سوپای الاحزابی بیست ، یەکسەر چووە لای خزمەکان لە (بني قريظة ) دەستی کرد بە کۆ بوونەوە لەگەل یان هیشتان سوپای ئیسلام دەوری قەلاکانی ئەوانی نەدا بوو ، بەلی (عمری کوری سووعدا ) داوای کۆ بوونەوەی بە پەلەی لیان کرد ، لەم کۆبوونەوەیەدا هەموو سەرکردەکان (بني قريظة ) ئامادە بوون ، لە سەرتا دا (عمری کوری سووعدا ) لومە سەر زنشتی زۆر چاکی کردن لە سەر ئەو کارە نەزانەی کە ئە نجامیاندا شکاندنی پەیمان و خیانەت کردن و ناپاکی کردن لە گەل موسلمانان هیرش کردنە سە رقە لاکانی نەوەی حاریسە کە ژن ومندال پیر و پەکەوتەی یتدا بوو …

ئ

هەروەها وەلامدانەوەی نارشینی جوولەکە کە ( سعدی کوری موعاز ) چووە لایان ، هەروەها ( عمروی کوری سووعدا ) لۆمەی ئەوەشی کردن کە چون بەقسەی ( حویەی کوری ئەختب )یان کرد کە سەرۆکی جوولەکەی (بني نضير ) بوو ، پیشی ووت: ئیوە چۆن هەلخەلەتان بە قسەی ئەم نا پاکە و ئەم شەیتانە ، پاشان ( عمری کوری سوعدا ) وەك شارازا و زانایەکی جوولەکە تەوراتی بۆ روون کردنەوە و ، وە پی ووتم : هەر کۆمەل هەر کەسیك دژایەتی محمد ﷺ بکات ..!! ئەوا سەر ئەنجام زیانی پی کەوتووە بەسەر شۆری گەراوەتەوە ..!! هەروەها پی ووتن : سویند بە تەورات ، هەر کۆمەلیك چاکە کار بن خوای گەورە ئەمەی ، واتە : پیغەمبەر ﷺ زال کردووە بەسەریاندا ..!! دوای ئەمەشی هینایەوە بە نموونە : وە جوولەکی (بنی قینقاع ) و ( بني نضير ) لە چ خۆشی دەسەهەلاتیك و پایە داری دا بوون ..!! کە چی بەهۆی ناپاکی خیانەت کردنیان بە زەلیلی و سەر شۆریەوە وەلاتیان بەجی هیشت ..!!هەروەها ( عمری کوری سووعدا ) دوای لە خزمانی خۆی کرد ، کە بچەنە سەر ئانی ئیسلام و تاکو خوینی خۆیان بسینەوە ، وە شوین حەق بکەون . بەلی پی ووتن : خزمینە !! خۆتان بەچاوی خۆتان بینیتا جا بەگویم بکەن ..!! وەرن باشوینی محمد بکەوین و ، وە زاناکانمان مژدەی هاتنی محمد یان پی داوین ..!! پاشان بەجەنگ کردن بەدیل کردن و ترساندن ، رووی کردە ( کەعبی کوری ئەسد ) سەرۆکی ( بني قريظة ) پی ووت : بە و تەوراتەی لە ( تور سینا ) هاتەو خوارەوە سەر ( موسی ) علیه السلام ، واتە : موسلمان بوون پەیەداریە و شەرفی دونیایە ..!! بەلی لەو کاتەی کە ( عمری کوری سووعدا ) ئەم قسانەی یان ئەم ئامۆژگاریانەی بۆ جوولەکەی ( بني قريظة ) دەکرد پیشەنگی یان سەرتایی سوپای ئیسلام بۆ سەر قەلاکانی( بني قريظة ) بەدیار کەوت ، هەروەها ( عمری کوری سووعدا ) سوپای ئیسلامی بینی و قسەکانی بری وە پی ووتن : ئا ئەمەیە کە پیم ووتن ..؟! بەلام لە دوا جار دا هەولیکی تری لەگەل دان بۆ ئەوەی رزگاریان بکات ، ئەوە بوو پی ووتن : ئیوە دژایەتی محمد تان کرد و ، منیش لە غەدرەتان بەشداریم نەکرد ، جا ئەگەر ناچنە سەر ئاینەکەی بەلام لەسەر یهوودی یان جوولەك بمینەوە جزیە بدەن ..!! دە بخوا نازانم ئایا لیتان وەر دەگرین یان نا ..؟! بەلی ( بني قريظة ) ئەم رایەشی دا یە لاوە بەقسەی ( عمری کوری سووعدا ) یان نەکرد ئینکاریان کرد ، بیگومان ئەمەیە سیفاتی جوولەکەو مونافیق هەر چەندە ئامۆژگاری بکریت ئەوا رشتر ئەبیت لە سەر تاوانەکەی و سوور تر ئەبیت لەسەر ستەم کاریەکەی ئینکارت و عیناتر ئەبیت لە سەر هەلویستە کانی ..!! بەلی ( بني قريظة ) بەو پەری سەر شۆیەوە ووتیان : دان نانین بە سەرانەیەك یان جزیەك کە عەرەب لیمان بسینیت ..!! کوشتن لەوە چاکتر ..؟!!

ئ

بەلی (عمروی کوری سووعدا )دەستی لە قەومەکەی شۆرت خۆی لیان دا بری ، بەشەو لە ناو قەلاکانی ئەوان چووە دەرەوە کە تووشی پاسەوانانی سوپای ئیسلام بوو ، گرتیان و بردیانە لای ئەمیرە کەیان کە ( محمد ی کوری موسلمە ) ی ئەنصاری بوو ، بەلام کە بردیانە لای ( محمدی کوری مەسلمە ) ( عمری کوری سووعدا ) ناسی و وە پیشتریش هەوالی مەردانەی ئەو پیاوەی بیستبوو ..!! بەلی درمانی دا کە ئەو پیاوە بەر بدەن بە ئازای بسوریتەوە ، هەرچەندە لەسەر ئاینی خۆی مابوو موسلمان نەبوو بوو ، ئەو شەوە لەمەزگەتی پیغەمبەر ﷺ مایەوە دواتر بەیانی رۆیش کەس نەیزانی رووی خۆی لەکوی نا و چی بەسەرهات ..!! کە ئەم باسە بە پیغەمبەر گەیشت ﷺ فەرمووی : ( ذاك رجل نجاه الله بوفائه ) واتە : ئەو پیاوە بەهۆی بە پەیمان نەشکاندنەکەی ( خوای گەورە ) رزگاری کرد .. بەلی لە سەرتادا جووکەی ( بني قريظة ) بەرگریان لە خۆ کرد و ، دژی سوپای ئیسلام،دوای تیپەر بوونی ( ٢٥ ) رۆژ بەسەر گەمارۆدانیان دا ، بەلام دواتر بەرە بەرە ترس و لاوازی بەسەریان دا هات ، بەلی جوولەکە زۆر بیتاقەت بوون ، چونکە دەیان زانی کە هەرگیز موسلمانان وازیان لی ناهینن بەرانبەر بە تاوانانەی کە کردیان دژی سوپای ئیسلام و ئەو خیانەتەگەورەیەی بەرانبەر بە شاری مەدینە دا کردیان ، شایانی باسە لە ناو قەلاکانی جوولەکەی ( بني قريظة ) ئاو خۆراکیکی زۆر هەبوو ن ، کە بۆ ماوەیەکی زۆردا لیان نەئەبرا و پەکیان نەئەکەوت ..!! بەلام جوولەکە ئەوندە وورە رووخاو ترسنۆك بوون ئەژنۆیان شکا بوو بەرانبەر بەسوپای ئیسلام دا ، هەر زوو کەوتنە بیر کردنەوەی ئەوەی کەچۆن خۆیان بەدەستەوە بدەن و ، وەخۆیان لەسەر برین رزگار بکەن ..!! بەلی لە سەرتای درووست بوونی نەوەی جوولەکەدا هەر وابوون و ترسنۆك بی غیرەت و سەرشۆر و زەلیل بوونە .. ئەوا لەسەردەمی پیەمبەراندا هەر وابوون ، بەردەوام حەزیان بە تاوانی فیزەون جاسووسی فتنەو ئاشووب بووە لەنیوان گەلا نە قەومەکانی تر دا ، ئەوئیستاش وادە بینین فتنەی هەر گەورە لە ژیر سەری جوولەکەدا یە لم جیهانەدا خۆشی لی بی بەری دەکات ، بەلی ئەوان داریژەی نەخشەی فیزەونی جیهانن ، بۆ هەر سەردەمیك نەخشیەك یان پیلانیکیان بە دەستەوەیە بۆ قتل و عام کردنی گەلانی جیهان ئەوانەی لەژیر سیبەری جوولەکەدانین ، پیلانیا هەیە بۆ لەناو بردنیان ئاژاوەناوەنەو برسی کردنی ئەو گەلانە ، بەتاییەتی لە هەر وەلاتیکدا دزگایەکیان هەیە بەناوی دەزگای ( موساد ) کە دەزگایەکی جاسووی صهیونی یهودی جوولەکەیە و لە تەواوی جیهاندا خەریکی فتنەو ئاژاوە نانەوەن و دەرست کردنی شەر شۆرن ، هەروەها دووبەرەکی ناکۆکی دروست دەکات ، بەیارمەتی ئەو نۆکەرانەی هەیەتیان لە تەواوی جیهاندا ، بەلی ئیستا جهیانیان کۆنترۆك کردووە هیچ وەلاتیك حکمی ئیسلامی تیدا بەرپا ناکریت مەگەر بە ریژەیەکی کەم نەبیت ئەوا لەژیر هەیمەنی جوولەکەدایە ،بەلام بە ئیزنی خوا ، ئەم ناپاکانە کۆتایان پی دەهینریت ئالای ئیسلام لە بیت مقدس ئەشەکیتەوە ..!!

ێ

**پێنجەم : ( ٣ ) ڕیگا چارە بۆ ڕزگار کردن یان لە ناوچوونی ( بني قريظة ):**

بەڵی لەم کات یەکجار ناسکەدا سەرۆکی جوولەکەی ( بني قريظة ) هەموو سەرکردەکانی کۆ کردەوە کۆ بوونەوەی لەگەڵ دا کردن ( ٣ ) ڕیگا خستە بەردەم ( بني قريظة )، بەلام هەندیك ئەلێن: ئەم ( ٣ ) ڕیگایە ( حویەی کوری ئەختب ) بووە کە سەرۆکی ( بني نضير ) ، کە ئەو کاتە بە قەدەری ( خوای گەورە ) لە ناو قەلاکانی ( بني قريظة ) دا بۆ پالپشتی کردنی خزمانی لەوی بوو ، وە ووتراویشە سەرۆکی ( بني قريظة ) بووە ، کە ( کەعبی کوری ئەسد ) بووە ، شایانی باسە ( کەعبی کوری ئەسد ) پیاویکی ژیر بووە ، لە سەرتادا نەپی خۆش بوو دەرگا لە سەرۆکی ( بني نضير ) کە ( حویەی کوری ئەختب ) بکاتەوە و نەپەیمانیش بشکینی لە گەڵ موسلمانان دا ، بەلام بەهۆی پی داگیری هەندیك لەجوولەکە کان و پی داگیری ( حویەی کوری ئەختب ) رازی بووە ، بەڵی لە سەرتادا ( کەعبی کوری ئەسەد ) پی ووتن : من لەسەرە تا دا رازی نەبوو م کە پەیمان بشکینم لەگەڵ موسلمانان دا ، چونکە موسلمانا بەراستی بە پاکی لەگەڵ ئیمەدا جوولانەوە پەیمانیان نەشکاند ئەوا ئیمە بووین پەیمان شکینی مان کرد ، هەروەها بە هەموویانی ووت : کە ئەو ئەیزانی بەم چارە نووسە ئەگەن ..!! باشان بە ( حویەی کوری ئەختب ) ی ووت: چ بەلاو ناخۆشی شووم هەیە تۆ هیناوتە سەر سەرمان ..!! پاشان ( کەعبی کوری ئەسد ) یان ( حویەیە کوری ئەختب ) ( ٣ ) ڕیگای بو دانان بۆ خۆ ڕزگار کردن لەم تەنگەژەیەی یان لەم گەمارۆدانەی تیدانە ..!!

**یەکەم :** بەڵی ( کەعبی کوری ئەسد ) ئەوەی بەبیر ( بني نضير ) دا هینایەوە کە یەکیك لە زاناکانیان بەناوی ( ابن خراش ) وە پی ووت: کە لە شاری مەدینەدا پیغەمبەریك پەیدا دەبیت ، وە دواشی لی کردوون بینە شوین کەوتوی ئەو پیغەمبەر ..!؟ بەمەش ئەبنە ئیمانداری هەر دوو کتیبی ( تەورات و قورئان ) .

هەروەها ( کەعب ) ووتی : دە بە خوا بۆتان دەر کەوتووە کە پیغەمبەر و خوا ڕەوانەی کردووە و ، ئەو پیغەمبەرەیە کە سیفاتی لە ( تەورات ) هەیە ، بەس ئیوە تەنها حەسوودی بەخیلی بردنە بە عەرەب لە موسلمان بوون قەدەغەی کرودووین ، چونکە لە نەوەی ئیسرائیل هەلنەکەوتووە ..!! دەی وەرن شوینی بکەون تا سەر مال و مندال تان ڕزگار بکەن ..!؟

بەڵی ڕیگای یەکەمی ( کەعبی کوری ئەسد ) بریتی: بوولە موسلمان بوونی ( بني قريظة ) ، بەلام بەقسەیان نەکردوو رازی نەبوون ، ووتیان : هەر گیز دەست بەرداری تەورات نابین بەهیچیشی ناگۆڕینەوە..!!

٧٧٤

ئ

دووەم : بریتی بوو لەوە ی هەرچی ژن و منداڵ وپیر وپەککەتەیان هەیە ، کە توانای جەنگ کردنیان نینە ، هەر هەموویان بکوژن یان سەر برن ..!! تەنها ئەوانە بمیننەوە کە توانای جەنگ کردنیان هەیە ..!! ئەوکاتە بەیەك هەڵمەت لەقەڵاکانیان بێنە دەرەوە و هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان ، یان سەرکەون یان لە ناو بچن ..!! جا ئەگەر تیدا بچن هەموویان بکوژرێن ئەوا ژن ومنداڵیان لەدوا بەجێ نامینی تا خەمیان لێ بخۆن ..!! ئەگەریش سەرکەوتن ئەوا ژن ومنداڵ دەبێتەوە ..!! بەلام ( بني قريظة ) بەریگای دوومیش رازی نەبوون ، بە ترس ولەرزە وە ووتیان : ئەو ژن و منداڵانەمان بکوژرین ..؟! جا دوای ئەوان ئیمە ژیانمان بۆ چیە ..؟!

سی یەم : بریتی بوو لەوەی کە شەوی شەمە لە ناکاو دا هەڵمەت بەرنە سەر موسڵمانەکان ، وە دەستیان لی بوشێنن ، چونکە موسڵمانەکان وادەزان ئیمە لەشەوی شەمە جەنگ ناکەین ، وە لەوە بی خەم بن ئیمەش هێرشیان ئەکەینە سەر ..!!بەلام ( بني قريظة ) بە ئەم پێشنیارەی سی یەمی ( کەعب کوری ئەسد ) دیش رازی نەبوو ، ووتیان : ئە تەویت رۆژی شەمە مان لی تیك بدەی ..؟! ئیتر ( کەعبی کوری ئەسد ) دەستی لە قەومەکەی شۆردن و و وە کۆتای بەکۆبونەوەکەی هیناو ووتی : هیچ پیاویکتان لەو رۆژە لەدایك بووە شەویك بە مەردانە سەری نەناوەتەوە ..!!بەلی لەم ( ٣ ) پێشنیارە هیچیان بۆ نەکرا و بە لکو هاتنە سەر ئەوەی کە هەولبدەن کە پێغەمبەری خوا ﷺوازیان لی بهێنی ..!! ئەوە بوو هەندیك پیاویان رەوانەکرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺکە پیان راگەیان هاتینە سەر ئەوەی کە وەك : ( بني نضير ) لەشاری مەدینەدا بچنە دەروە کۆچ بکەن و مەدینە بەجی بهیلن ..!! ئەم پێشنیارەش لە سەرداریکی ( بني قريظة ) بووە ، کەناوی ( نبباس کوری قەیس ) بوو..!! بەلام پێغەمبەری خوا ﷺئەم پێشنیارەی وەر نەگرت و قبولی نەکرد وەك: ( بنی نضیر ) لە شاری مەدینەدا دەر بچن ، چۆنکە بارودۆخی ( بني قريظة ) جیاواز تر بوو لە بارودۆخی ( بنی نضیر ) ، هەروەها بە نوینەرەکەی ( بنی قریظة ) ووت : هیچ شتیك تان لی وەرناگری جگە لە خۆ بەدەستەوە دانیان و ، بە بی هیچ مەرجیك ..؟! نوینەرەکەی ( بنی قوریظة ) خالی گەرایەوە هیچ بەدەست نەهینا..!! بەلام دووبارە ( بنی قوریظة ) نوینەرەکەیان ناردەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنیاریکی تریان کرد ، ئەویش بریتی بوو لەوەی کە ژن منداڵ پیرو پەکەوتەکان بێنە دەرەوە لە قەلاکانیان خۆیا بەدەستەوە بدەن و ئەوان لەشاری مەدینە دەر بچن واتا کۆچ بکەن بەبی پیاوەکانیان ، هەروەها پیاوەکانیش لە ناو قەلاکانیان دا خۆیان بکوژن و گیانی خۆیان دەر بکەن .!! موسڵمانەکانیش هەرچی مال وسامان وموڵك کەرەسەیان هەیە بۆ خۆیان بیت ..!! بەلام پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بەمەشە رازی نەبوو، قبولی نەکرد .. دووبارەی کردووە کە دەبی بەبی مەرج خۆیان بەدەستەوە بدەن ..!!

ێ

**شەشەم: چوونی ( ئەبو لوبابە ) بۆ لای (بنی قوریظة ) :**

**بەلی بەم شیوەیە هەموو ریگاکان لە بەردەم جوولەکەدا داخران تەنها دوو ریگا نەبێت :**

**یەکەم : جوولەك دەرگای قەلاکانیان بکەنەوە ، هەلمەت بدەن و هیرشی مان و نەمان بخەنە سەر موسلمانەکان ، وە جەنگیکی سەرو مالی لە گەل موسلمانان دا بکە ..!!**

**دووەم: تەسلیم بە فەرماندە گشتی موسلمانان بن ، بەبی هیچ مەرجیك و پەیمانیك ..!!**

**بەلام خۆ دیارە پشنیاری یەکەم دەبێت پیاوی جەنگاور مەرد بیدات ، نەکو مردوو ، چونکە جوولەکە هەمیشە ترسنۆ کو مردووبوون ، تەنها دەستیان هەبایە فیلی خۆیان و خیانەتی خۆیان ئەکرد ، وەك سەگ دەر شانەوە ، بەلام بەدلنیایەوە هەنگاوی یەکە بە جوولەکە ناکریت ئەمەیان پشت گویی خست ..!!**

**کەواتە ئەو ریگایەی کەلەبەردەم جوولەکەدا ماوە ئەویش ریگای خۆ تەسلیم بوونە بەبی مەرج و پەیمان ، بەزەلیلی و سەر شۆری دەبێت خۆیان تەسلیمی فەرماندەکانی سوپای ئیسلام بکەن ، جا جوولەکەی(بنی قوریظة ) بەو هیواو ئاواتە بوون کە ئەوانیش وەك (بنی قینقاع ) و( بني نضير ) خۆیان تەسلیم بکەن و شاری مەدینە بەجی بهیلن کۆچ بکەن ، بەلام پیشتر ووتمان بارودخی جوولکەی (بنی قوریظة ) لەگەل ئەوانی تر زۆر جیاواز بوو ، ئەوانە هیرشیان کردە سەر موسلمانان دەستی دوژنیان هینا سەر شاری مەدینە قەسەی ناشرینیان بە پیغەمبەری خوا ﷺ ووت ، هەروەها هەولیاندا ژن ومندالی موسلمانان بکوژن لە قەلاکانی نەوەی حاریسە نزیك بوونە وە ، خۆ شیان دەر دەبری لەگەل سوپای الاحزاب ، هەروەها پالپشتی داری ئابووری سوپای الاحزاب بوون ، وتمان چەند ووشتریك لە خۆراك کەرەسەی جەنگی کەوتە دەستی موسلمان لە کاتی جەنگی خەندەق دا و کە هی جوولەکەی (بنی قوریظة ) بوون بۆ سوپای الاحزایان رەوانەکردبوو ..!! بەلی تاوانی سزای جوولەکەی (بنی قوریظة ) زیاتر بوو لەوانی تر دا هەر بۆیە (خوای گەورە ) فەرمانی بەپیغەمبەری خوا ﷺ کرد کەچەکیان دانەنین هیرش بکەنە سەر جوولەکەی (بنی قوریظة ) بەلی بی گومان بەفەرمانی خوای گەورە بوو ، هەر بۆیە دەبێت تاوانەکەیان گەورە تر بیت لەوانی تر وەك (بنی قینقاع) و ( بني نضير ) هەرچەندە ئەوانیش تاوانیان کرد دژ بەموسلمانەکان ، بەلام (بنی قوریظة ) دەستی دوژمنی دەرەکی گرت هینایە سەر شاری مەدینە و ئەمەش لە یاسای شەرعی و یاسای عروفی بە خیانەتی گەورە دادەنریت لە هەر گەلیك دابیت یان لە هەر ولاتیك دەبیت سزاکەی تەنها کوشتنە ..!!؟**

ئ
بەلی دوای بی چارە بوونیا هاتنە سەر ئەو پێشنیارە کە دوا لە پێغەمبەری خوا ( صلی علیە وسلم ) بکەن کە ڕیگا بدات کە ( ئەبو لووبابە ) هاوپەیمانیان بدات ، کە بێت بۆ لایان ڕایژی پی بکەن ..!!

چونکە دۆستایەتی لەگەل جوولەکەی ( بنی قوریظة ) دا هەبوو و ئەوانیش متمانەیان پی ئەکرد .. بەلی ئەوە بوو پیەمبەری خوا ﷺ ماوەی دا کە بڕوات بۆ لای ( بنی قوریظة ) ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ بانگی لی کرد فەرمووی : ( إذهب إلی حلفائك فإنهم أرسلوا إلیك من بین الاوس ) واتە : بڕ بۆ لای هاپەیمانەکانت لە ناو ئەوس دا بەدوای تۆیان ناردووە ..!!

( ئەبو لوبابە ) چووە ناو قەلاکانی جوولەکەی( بنی قوریظة ) دا ، هەر کە چووە ژوورەوە ژن مندال و پیرەکان هاتنە بەردەمی لە تاو گەمارۆدانیان دەستیان کرد بە گریان ، بەلام لەو دەچی ئەمەیان بەدەست یان بەفیل ڕیك خستبی تاکاریك بکەن ،( ابو لوبابە ) بەزەیی و ڕەحمیان پی بکات ..!! بەلام ( خوای گەورە زانا ترە ) ، بەلی ( ابو لوبابە ) لەگەل یاندا دانیشت و پرسیان پی کرد ئایا ؟! لە بەرژەوەندی ئەوان دایە، کە بەبی مەرج تەسلیم بن ..؟! بەلی ڕاویژیان بە ( ابو لوبابە ) کرد ئایا ئەو حوکمەی پیغەمبەری خوا ﷺ وەر بگرن ..؟!! ئایا لە خۆیان بی خەم بن ؟! ئالیرەدا هەلەکی گەورە لەدەستی ( ابو لوبابە ) دەرچوو ..!! ئەویش ئەوە بوو وەلامی دانەوە ووتی : بەلی . لەهەمان کات دا دەستی بۆ ملی برد ، واتە : سەربڕین سەر ئەنجام تانە ..!! یان تەسلیم بن ئەکوژرین ..!! بەلام هەرکات ئەم ووشەیەی لەدەم دەرچوو خیرا هەستی بەخۆ کرد ، کە هەلەیەکی گەورەی کردووە یان چ تاوانیکی گەورەی کردووە ..!! دەرهەق بە پیغەمبەری خوا ﷺ و بە ئیسلام و بە موسلمانان ..!! بەلی ( ابو لوبابە ) زۆر شلەژاو هەستی بەتاوانیکی زۆر گەورە کرد ، ئەوا بوو ( کەعبی کوری ئەسد ) سەری کرد هەستی کرد ، وا ( ابو لوبابە ) ڕنگی تیك چووە هەستی بە پەشیمانی کردووە ، ئەوە بوو لی پرسی ؟! بۆی وە شلە ژاوی ڕەنگت تیك چوو ، ئەویش ووتی : بەخوا ناپاکیم لەگەل خوا وپیغەمبەر ﷺ دا کرد ، مەبەستی ناپاکیەکەئەوە کە بە جوولەکەی ڕاگەیاندووە ئەگەر خۆتان بەدەستەوە بدەن یان بەدەستەوە نەدن هەر چارە نووستان مردن و لەمل دانە ..؟!بەلی دونیا لە ( ابو لوبابە ) هاتەوە یەك چکاریکی خراپی کردووە ، خیرا و بەپەلە قەلاکانی جوولەکەی ( بنی قوریظة ) جی هیشت گەڕایەوە لای سوپای ئیسلام ...

ئ

بەلام لە شەرمان و شەرمەزاری دا نەچووە لای پیغەمبەری خوا ﷺ بەلکو بەچاوی پر لە فرمیسکەوە چووە مەزگەتی مەدینە ، تاکو دەرونی خۆ پاك بکاتەوە ، هەر لەویدا بریاری دا خۆ بەیەکیك لە کۆلەگەکانی مزگەوتەکەی مەدینەدا هەلبواسیت یان ببستیتەوە ، یان ئەوتا ئەمریت و یان ئەواتا ( خوای گەورە ) تەبەکەی لی قبول دەکات، ئەوە بوو دوای نویژی بەیانی ( پیغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتەلای ..!!بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ سەری لە دواکەتنی ( ابو لوبابە ) سور ما ، تا ئەوە بوو هەوالە کەی پی گەیشت ئەویش فەرمووی : ( أما أنە لو جاء نی لاستغفرت لە فاما إذ قد فعل ما فعل ، فما أنا بالذي أطلقە من مکان حتی یتوب اللە علیە ) واتە : ئەگەر بهاتایە بۆ لای من دوای لی خۆش بوونم بۆ ئەکرد ، بەلام کە ئاوەهای کردووە ، ئەوا من ناتوانم بەری بدەم ، مەگە ر خوا خۆی تەوبەی لی وەر بگری ، ئیتر ئەوە بوو بۆ ماوەی ( ١٧ ) شەو مایەوە ، ژن و مندالە کانی دەهاتن دەستیان ئەکردەوە بۆ دەست نویژ شووتن و خوردن خواردنەوە ، بەلام تا دە هات بیستن و بینینی لەدەست ئەدا کز ئەبوون ، ئەوە بوو ماوەی ( ١٧ ) شەوی پی چوو..!! دواتر ماوەی تاقی ردنەوەی لەلایەن ( خوای گەورە ) تی پەراندو تەوبەی لی قبول کرد ، پیغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی کردیەوە ..!!هەروەها ( ابن اسحاق ) دەلی : توبە وەرگتنەکەی ( ابو لوبابە ) لە بەرە بەیان دا بوو ، هاتە خوارەوە ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ کە لەمای ( ئەم سەلەمەی ) هاوسەری دا بوو ..!! هەرو ها ( ئوم سەلەمە )—خوالی رازی بیت – دەفەر موویت : لەبەرە بەیاندا گویم لی بوو پیغەمبەری خوا ﷺ پی دەکەنی ..!! ئەلی ووتم : بەجی پیدەکەنی کە خوا هەموو تەمەنت بکاتە پیکەنین ..؟!! ئەلی : پیغەمبەریش فەرمووی : ( تیب علی ابی لبابە ) واتە : تەوبە لە ئەبو لوبابە وەرگیرا ..!! ئەلیت : ووتم : ئەی مژدەی نەدەمی ، ئەی پیغەمبەری خوا ؟! فەرمووی : بەلی . ئەلیت ": ئوم سەلەمە لەدەرگاری ژوورەکەی دا وەستا ، ئەمەش پیش ئەوەی ئایەتی حیجاب بیتە خوارەوە و ، ووتی : ( ابو لوبابە ) مژدە بیت ( خوای گە ورە ) تەوبەی لی وەرگرتی ..!! ئەلیت : خەلکەکەش هەلمەتیان دا تا لی بکەنەوە بەری بدە ن ، ووتی : نا بەخوا مەگەر پیغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی پیرۆزی خۆی بەرم بدات ، بۆ نویژی بەیان پیغەمبەر هات و کردەیەوە .. هەروەها لە خۆشیا کە ( خوای گەورە ) لی خۆش بوو ، ( ابو لوبابە ) ووتی هەموو سەروەت سامانەکەم دەکەمە صەدەقە ، بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سی یەکی لی بکە صەدەقە ..!!

ئ

هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزەی قوئان لەو بارەیە وە هاتە خوارەوە ، كە ( خوای گەورە ) دەفەر موویت : ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ **التوبە ١٠٢**

**واتە : بێ جگە لەوانە كەسانێكی تریش هەن كەدان بەگوناهو هەلەكانیاندا دەنێن و كرداری چاك و كرداری خرا پیشیان تێكەل كردووە ئەمانە نزیكە خوا تەوبەیان لێ وەربگرێت ، چونكە بەراستی خوا لێ خۆش بوو میهرەبانە ..!! هەر وەها ئەم ئایەتی ( خوای گەورە ) ئامۆژگاری بۆ سەرجەم موسلمانان دەكات كە نەكەن خیانەت لەخوا و پێغەمبەرەكەی دا بكە ..!! كە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ **الانفال ٢٧ . واتە : ئەی ئەوانەی باوەرتان هێناوە : خیانەت مەكەن لە خواو لە پێغەمبەرﷺ بەوەی كەم تەرخەمیتان لە فەرمانبەرداریاندا و هەروەها خیانەتیش مەكەن لە ئەمانەت و سپاردەكانتان كە پێتان دەسپردرێت ، لە كاتێكدا كە ئێوە دەزانن ئەو كارو خیانەتە ..!!**

## حەوتەم : خۆبەدەستەوە دانی جوولەکەی ( بني قريظة ) بڕیارە یەکلاکەرەوەکەی ( سعدی کوری موعاز ):

بەلی ئەوە بوو گەمارۆدانی جوولەکەی ( بني قريظة ) ٢٥ رۆژی پی چوو ، سوپای ئیسلامیش لە خەندەق دا گەرا بۆوە و مانوویان نەحەسابۆوە ، زۆر ماندو هیلاك و برسی بوون ، جوولەکەی ( بني قريظة ) دەستی دەستیان بە سوپای ئیسلام و موسلمانان دەکرد خۆیان بەدەستەوە نەئەدا ، ئەوە بوو ، فەرماندەی سوپای موسلمانان کەئالای سوپای ئیسلام بەدەست ( علی کوری ئەبو تالیب ) بوو ، لەگەل ( زوبیری کوری عەوام ) دا هەردوو کیان بەدەنگی بەرز هاواریان کرد ، بەخوا سویندیان خوارد ، کە ئەوی حمزەی مامی پیغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەسەری شەهید بوو ، ئیمەش لە پیناوی دا شەهید ئەبین ..!!

کە جوولەکەی تر سنۆك و ئەم هەرشەیان بین و ، وا بەبەرچاویشیان کتیبە کانی ئیسلام جمو جۆل ئەکەن بۆ پیشەوەی قەلاکانی ( بني قريظة ) وە خۆیان بۆ هیرشی گشتی ئامادە دەکەن ، هەروەها جوولەکەی بی شەرم ترسنۆك دوایان کرد کەوا هیرش نەکەن خۆیان تەسلیم بکەن بە سوپای موسلمانان ، بەخوا زۆر سەیرە .. لەم سەردەمەدا جوولەکەو هاوشیوەکانی جوولەکە بوونەتە شیری دونیا ، بەلام چ شیریك شیری فەراوی کە هەرکات سوپای ئیسلام یەکی گرت وە ك بەفر ئەم بەناو شیرانە دەتوینەوە وەك سراب وا ئەبن . ئەوا ئیستا مونافیق و جاسووسەکانی ئیسرائیل وا دەسەهەلاتیان هەیە بەلام بەخوا رۆژی ئیسلام دادیت بۆ ئەمانە کە چۆن دەبیت بەسزایی خۆیا بگەن دوارۆژی خۆیا لەم جیهانەدا دەبیتە بە قیصەری یان کونە مشك ،بەلی ترسنۆکانە ووتیانك با هیرش بوەستیت ئیمە خۆمان تەسلیمی سوپای ئیسلام دەکەین ، بەلی ئامادەبوو خۆیا بەدەستەوە بدەن بەحوکمی پیغەمبەر صلى الله عليه وسلم رازی بن ، بەبی هیچ مەرجیك ، بەلی ئەوە بوو جوولەکە هاتنە دەرگای قەلاکانیانەوە ، هەموو چەك و کەرەسەی جەنگیان فریدا خۆیان دا بەدەستەوە ،خیرا و بە پەلە سەربازانی سوپای ئیسلام دەرەیا گرتن و لە لایەك دا کۆیان کردنەوە ، پاشان پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی دا هەرچی تەمەنی بالغ بووە جیابکریتەوە لە ژن و مندال وپیرو پەکەوتە دا ، واتە ئەوانەی تەمەنیان شیاو بوو بۆ جەنگ کردن قول بەست بکرین .. ئەمەش بەسەرپەرشتی ( محمد ی کور مەسلە)بوو ، ژن مندال پیرو پەکەوتە بەسەر پەرشتی ( عبدالله کوری سلام ) سپیردرا ، ئەوە بوو هەمووپیاوەکان بە فەرمانی پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خرانە بەدیخانەیەکی تایبەتەوە ، ئەوە بوو نزیکە ( ٨٠٠ ) پیاو دە بوون ، لەمالی ( اوسامەی کوری زید ) زیندانی کران ، ژن مندالیش لە شوینك دا بوون کە ، وەك میوان خانە وابوو بۆیان ، کەلە مالی ( کچی حەرسی نەجاری ) بوو کەهەمیشە بۆ میوانی شاری مەدینە تەرخان کرا بوو ، ئەو ژن و مندالانەش نزیکەی ( ١٠٠ ) کەس دەبوون ..!!

ێ

بەلی لە پێشد ا باسی ئەوەمان کرد کە جوولەکەی ( بني قريظة ) نەوەی ( ئەوسی ) ئەنصاری هاوپەیمانیان لەگەل یەك دا هەبوو ، کاتێك ئیسلامیش هات قەدەغەی ئەو هاوپەیمانیەتی ئەوانی نەکرد ..!! بەلی نەوەی ( ئەوس ) کە بینیان وا دۆستەکانیا یان هاوپەیمانەکەیان خرانە زیندان و دەست بەسەر کران ، چەند پیاویکیان هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ تاکو قەسەیەکی بەسوود چارونووسی جوولەکەی هاوپەیمانیان بکەن ، چونکە ئەوان وەفایان هەر بۆ مابوون ، بەلی کاتی پیاوماقولانی نەوەی ( ئەوس ) گەیشت بەخزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ دوایان کرد کە سزای ئەو جوولەکانە سووك بکات ..!! هەروەها ئەوە یان هیناوە بیر پیغەمبەری خوا ﷺ کە چۆن تکایە ( عبدالله کوری ئوبەی ) وەرگرت بۆ جوولەکە ی ( بنی قینقاع ) کرد تاکو سزایان سووك بکات ، چونکە ئەو کاتە جوولەکەی بنی قینقاع ) هاوپەیمانی نەوەی ( خەزرەج ) بوون ، دوایان کرد ئەگەر هیچ نەبیت یان ئەواتا ( بني قريظة ) لە شاری مەدینەدا دەر بکریت و نە کوژرین ..!! بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ بەشیوەیەکی جوان و حەکیمانە وەلامی دانەوە نەهیشت نەوی ( ئەوس ) دەلیان بشکیت ، ئەوە بوو چارەنووسی جوولەکەی ( بني قريظة ) دایە دەستی سەردارانی نەوی ( ئەوس ) ئەویش ( سعدی کوری موعاز ) بوو ، بەلی نەوی ( ئەوس ) بە بریارەی یان ئەو وەلامەی پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر پی خۆشحال بوون ، چونکە چارە نووسی هاوپەیمانیە کەیان کە تۆتە دەستی سەرۆك هۆزی خۆیان ئەویش ( سعدی کوری موعازە ؟ ) بەلی هیوایان هەبوو کە ( سعدی ) سەرداری هۆزەکەیان سزای هاوپەیمانیەکەیان واتە ( بني قريظة ) کەم بکاتەوە ، کەچی بریارەکەی ( سعد ) ریك بە پیچەوانە بوو بۆ نەوەی ( ئەوس ) چونکە بەم شیوەیە نەبوو کە ئەوان بەتەمای بوون ..!!

بەلی هەر کە نەوەی ( ئەوس ) ئەم هەوالە یان بیست کەوا کاریکی وا گەورە کە تۆتە دەست سەردارەکەیان بە پەلە خیرا گەرانەوە شاری مەدینە ئەم هەوالەیان بە ( سعدی کوری موعاز ) راگەیاند ،چونکە ( سعد نەهاتبووە غەزای ( بني قريظة ) بەهۆی زامداری برینەکەیەوە لەخەندەق بریندار بوو کە دەماریکی خۆینی برابوو ، لەمەزگەوتی پیغە مبەر ﷺ تیمار دەکرا ، پیغەمبەری خوا ﷺ بەهۆی خۆشەویستی بۆ ئەم هاوەلە بەریزە هینابوویە ناو مەزگەوت بۆ تیمار کردن ، هەروەها ئافرتیك تیماری برینەکە دەکرد کە زۆر شارە زابوو لەم بوارە دا بە ناوی ( روفەیدە ) ، ئەوەبوو خزمانی لە نەویە ئەوس دا خۆیان گەیاندە ( سعد ) بۆ ئەوەی پی بلین بریارەکە لەدەست تۆ دایەو ،وە جوولەکەی ( بني قريظة ) هاوپەیمانی نەوەی ( ئەوس ) دەبیت سزاکەیان لەسەر سووك بکەیتەوە ...

ێ
بەلی هەوالەکەیان بە ( سعد ) گەیاند بۆ ئەم مەبەستە ش دەبێت بچێت بۆ ئەو شوێنەی کە گەمارۆی ( بني قريظة ) درابوو ، ئەوە بوو خزمانی ئەسپەکەیان بۆ هێنا بۆ ئەوەی بکەوێتە ڕێ ، بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش کەوتە ڕێ خزمانی لەدوایەوە بوون ، هەروەها پیان ئەووت : دەبێت بەزەییت بێت بە هاو پەیمانەکەمان جوولەکەی ( بني قريظة ) ( سعد )یش بەخزمانی ووت : ئەوە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ( سعد ) لەبەر ڕەزامەندی ( خوای گەورە ) گوێ بە گلەیی هیچ گلەیی کارێك نادات ..!! بەلی ( سعد ) لە بنکە سوپای ئیسلام نزیك کەوتەوە ، هەروەها پێغەمبەر فەرمانی بەسەر ئەو موسلمانانە کرد کەلەدوروبەری دا بوو فەرمووی : قوم الى سيدكم ) ئەوانیش هەستانەوە بەریز وەستان ، هەتا گەیشتە بەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە ( سعد ) دانیشت پێغەمبەری خوا ﷺ پێ فەرموو : ( قد امرك الله ان تحكم فيهم ) واتە : ( خوای گەورە ) فەرمانی داوە تۆ حوکمیان بۆ دەر بکەیت ..!! ، بەلی ( سعد ) دەیزانین خزمانی ئەوەیان پێ خۆشە کە سزایی ( بني قريظة ) سووك بکات ، هەر لەبەر ئەمە پێخۆش بوو هەموو لایەك بە بڕیارەکە ڕازی بن ..!! هەر بۆ ئەم مەبەستە لە نێوان سوپای ئیسلام دا وەستاو ، وە بەتایبەتی ڕووی لە هۆزەکەی خۆی کرد کە هۆزی ( ئەوس ) بوو ، پێ ووتن : بەبەین و پەیمان بە خوا ئەدەن کە حوکم و بڕیار بەو شێوە ئەبی کە من دەری ئەکەم ..؟! ووتیان بەلی . پاشان وە ك پرس ورا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لەویش کردو ئاماژەی بۆلای ئەو کرد ، هەروەها ووتی : ئەکەسەش کەوا لێرە دایە ئاماژەی بۆ ناو خیوتەکە کرد ..!! فەرموی ( نعم ) پاشان ئاماژەی بۆ جوولەکەی ( بني قريظة ) کەلە لایەکی شوێنەکە دا بەند کرا بوو ..!! وووتی ئایا ئێوەش بەحوکمی من ڕازین ؟! ووتیان : بەلی . هەروەها دوای ئە ووتوویژە لە کۆتای دا ( سعد ) بڕیاری چارە نووسی جوولە کەی دەر کر د ئەوانیش گوێیان بۆ شل کردبوو ..!! بەلی بێگومان ( سعد ) بڕیارەکەی دەرکرد کە هەرچی پیاوە تەمەنی بالغە ئەوا بەشمشێر لەملی بدرێت ؟!! بکوژرێت ..؟!! هەرچی ژن منداڵیشیان هەیە بەدیل دەست بەسەر بگرێت ، ماڵ سەر وەت سامانەکانیشیان بۆ موسلمانان بێت ..!! دوای ئەوش یە ئیجتهادی خۆ بڕیاری دا خانووە کانی ( بني قريظة ) بدرێت بە کۆچ کەران چونکە ئەوان خانووە کانیا لەلایەن کافرانی مککە داگیر کرا بوو ،ئەمەش تاکو باری سەر شانی ئەنصارەکانی شاری مەدینە سووك بکات ..!! بلی کاتی ( سعد ) ئەم بڕیارەی دەکرد هۆزی ( ئەوس ) هیچ نارازیەکیان دەر نەبری چونکە پێشتر پێ ڕازی بووبون ..!! هەروەها جوولەکەی ( بني قريظة ) ئەوانیش هیچ وورتەیان لێوە نەهات چونکە پێشتر بی مەرج تەسلیم ببوون ..!! بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە حوکمە کەی ( سعدی کوری موعاز )بوو ، فەرمووی : ( حكمت فيهم بحكم الله من فوق سبع سموات ) واتە : ئەو حوکمە دەرت کرد بۆیان حوکمی خوا بوو لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە ...

ئ
بەلی پاش ئەوەی کە (سعدی کور موعاز ) بریارەکە ی دا حوکمە کەی درە کرد بۆ جوولەکەی (بني قريظة ) بۆ کوشت نیان هەر هەموویان لە ملیان بدریت و بریارەکە جی بەجی کرا ، ئەوە بوو سعدیش وای ئەوەی کارەکەی خۆی تەواو کرد گەرایەوە بۆ شاری مەدینە دوای ماوەیەك بە هۆی برینەکەیەوە (سعد ) دەگاتە کاروانی شەهیدانی بەدر و رەجیع و بئر معوون و ئوحود شەهیدانی خەندق بە کاروانی شەهیدان دەگات وەفات دەکات ، هەروەها لە صحیح بوخاری دا هاتووە کە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : إهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ ) واتە : بۆ وەفاتی سعدی کوری موعاز هەرشی خوا هەتە لەرز ..!! لە فەرموودەیەکی (ئەنسی کوری مالك ) هاتووە کە فەرمووی : کاتی کە جنازەکەی سعدی کوری موعاز هەل گیرا ، مونافیقان ووتیان جنازەکەی چەند سووکە ، بەلام پیغەمبەری خوا فەرمووی : ( ان ملائیکە کانت تحملە ) واتە : فریشتەکان هەلیان گر تبوو ..!!

جی بەجی کردنی بریارەکەی (سعدی کوری موعاز ) دوای ئەوەی سوپای ئیسلام گەرانەوە بۆشاری مەدینەدا، هەروەها پیغمبەری خوا ﷺ خۆشی گەرایەوە ناوشاری مەدینەدا ، لە مانگی ذولحج سالی پینچەمی کۆچی دا بوو ..!!

ئ
## هەشتەم : جی بەجی کردنی بریارەکەی ( سعدی کوری موعاز ) :

بەلی دوای ئەوەی کە ( سعدی کوری موعاز ) ئەم بریارەی یان ئەم حوکمەی دەرکرد بۆ جوولەکەی ( بني قريظة ) ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە سوپای ئیسلام کرد ، کە بگەرینەوە ناو شاری مەدینە ، پاشان پیاوەکانی ( بني قريظة ) حوکمی کوشتنیان یان لەمل دانیان بۆ دەرچوو، ئەمەش لە سالی پینچەمی کۆچی بوو ،ئەوە بوو کە ( محمدی کوری مەسلمە ) پیاوەکانی ( بني قريظة ) هینایەوە بۆ شاری مەدینە ، هەروەها ژن و مندالە کانیش ( عبدالله ی کوری سەلام ) کاری ئەوانی لەدەست دا بوو، پاشان فەرماندرا کە چالیکی قول هەلکەنن بۆ جستەو لاشەی ئەو خیانەت کارانە لە پاش کوشتنیا، کە تیدا فریدەنە ناو ئەو چالانە ، شوینی ئەو چالانە ئیستا لە بازاری ( مناخ ) لەشاری مەدینەیە ، هەروەها شوینیکیش بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ ئامادەکرا ، پاشان حوکمی کوشتنیان جی بەجی کرا ، ئەوە بوو یەك لەدوای یەك دستە لەدوای دستە، لەملیان ئەدراو ئیعدام دەکران و سەر ئەبران ، هە تاکو یەکیکیان نەما نە کوژریت و ئیعدام نەکریت ، هەروەها لە السير النبويه ( ابن هشام ) ئاوا هاتوو دەلی : ژمارەی کوژراوەکانی ( بني قريظة ) لە نیوان ( ٦٠٠- تا ٧٠٠ ) یان ( ٨٠٠-تا ٩٠٠ ) پیاو بووە ، بە تەنها ئافرەتیکیان لی دە کوژریت ، ئەویش چونکە لە کاتی گەمارۆدانی قەلاکانی ( بني قريظة ) ئەو ئافرەتە بەردیکی گەورەی هەلگرت و فریدا بەسەر سەری هاوەلیکی بەریز یەکسەر شەهید بوو ، هەر بۆیە لە تۆلەی ئەو هاوەلە بەریز کە شەهید بوو، بەدەستی ئەو ئافرەتە ، تەنها ئەو ئافرەتی لە تۆلەی ئەم شەهیدە دە کوژریت ، بەلام ئەوانی تر هەر هەموویان وە میوانداری خزمەت دە کران ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَأَنْزَلَ الَّذِينَ ظَاهَرُوهُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَارَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَأَرْضًا لَمْ تَطَئُوهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا﴾ **الاحزاب** ٢٦-٢٧ . واتا : ئەوانەی پشتگیری قورەیشیە کانیان کرد لە خاوەنی کتیبە ئاسمانیە کان ، لە جوولەکە کانی (( بني قريظة ) خوای گەورە لە قەلاکانیان دایگرتن ، ترس و وبیمی ریدایە دلیان ، تا وایان لیهات دستە یەکتان کوشتن و دستە یەکیشتان بەدیل گرتن ..!! سەرەنجام هەرچی زەوی و زارو مال و خانوو سامانیکیان هە بوو خوا بە خشی بە ئیوە ، هەروەها شوینی تریش کە هیشتا تا ئیستا پییدا نە رۆشتوون ، هەمیشە و بەردەوامیش خوا دەستی بەسەر هەموو شتیکدا دەروات ، بە پشتیوانی خوای گەورە رۆژیك دیت ، پیلان گیران سەر شۆر و ریسوا دەکات وە هەرچی سامان و مالیك کە بە خیانەت و فیل بەدەستیان هیناوە ، دەدریتەوە بە خاوەنەکانی ... جا ئەو رۆژە ئەم ئایەتانەی سورەتی ( الاحزاب ) ٢١ - ٢٧ دەلیی ئەو ساتە هاتووەتە خوارەوە ..!!

ئ

بەلی ئەم جوولەکە ناپاکانە هەر هەموویان بەشەویك کوژران ئەوەی سەرپەرشتی ئەو کوشتنەی گرتە ئەستۆ ( علی کوری ئە بو تالیب ) و ( زوبیری کوری عوام ) بوون ..!!

بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ خۆی لەوی ئامادە بوو، کاتیك لە مل یان ئەدرا ، ئەوە بوو یەکیك لە سەرۆکە ناودارەکانی ( بني نضير ) کە لە کاتی گەمارۆدانەکە لە لای سەرکردەکانی ( بني قريظة ) بۆ هاندانیان لەوی ، پاشان کە خۆیان تەسلیم کرد ئەویش لە گەلەوان بەدیل گیرا ، ئەویش ( حویەی کوری ئەختب ) ی سەرۆکی جوولە کەی ( بني نضير ) بوو ، ئەو پیاوە هۆکاری ئەو هەموو فتنەو ئاژاوە ئاشووبە بوو کە هینایە سەر شاری مەدینە ، پیاویکی ناپاکی خیانەت کاری دەروون پیس بوو ، ئەوە ئەویان هینا پیش بۆ ئەوەی لە ملی بدەن کۆتایی پی بەهینن ، بەلی ئەوە ئەو رۆژە بوو کە ئەو ناپاکە چی چاندبوو هەردەبیت ئەوەش بدووریتەوە ،بەلی هەلویستی ناپاك هەر دەبیت بەم شیوەیە دەر ئە نجامەکەی بدریتەوە ، بەلی ( حویەی کوری ئەختب ) هینرا پیشەوە بۆ سەر برینی ، ئالە م کاتەش هەر دژایە تی خۆی رق قینە هەبوو بەرانبەر پیغەمبەر ﷺ و موسلمانان دا ، بەلی کاتی پیغەمبەری خوا ﷺ سەیری کرد ئەویش ووتی : بەخوا لۆمەی خۆم نەکردووە لەسەر دژایەتیت ،بەلام هەر کەسیك پشتی ری خوا بەر بدا خواش پشتی ئەو کەسە بەرئەدات ..!! شایەنی باسە ئەو پیاوە ناپاکە خراپە ( صفيەی کچی حویەی کوری ئەختب ) لە م پیاوە خراپە بوو ، بەلی ( صفيە کچی حویەی کوری ئەختب ) ئە ئافرەتە بەریزە بووە ، بە هاوسەری پیغەمبەری خوا ﷺ بەلام لەدوای فتح کردنی ( خەیبەر ) کە میردەکەی کوژرا پیغەمبەری خوا ﷺ مارەی ئەکات و ئەبیتە دایکی ئیمانداران وە ئەچیتە ریزی ئافرەتەموسلمانە پایەدارەکان ..!!

بەلی لە سەردەمی پشووەکان چەندین کەسی ئازاو چاونەترس بەغیرت و مەردانە هەبوون ، بەلام لە کاتی ئیستا کە کاتی سیاسەت بە مانایەکی تر سیاسە مانای درۆ کردن ، یان نیفاق کردن دوو رووی کردن ، بەلی لە پەنای سیاسەتی ئیستا دا جەندی پیاوی بی غیرەت درۆزن مونافیق نامەدر هەلکەوتووە و بەناوی سیاسەتی درۆکردن و نیفاق کردن لە گەل خەلکی سادەدا ، بەلام هەر هەمووی لە پیناوی بەر ژەوەندی خۆیانە نەك خەلك میلەت ، درۆ دەکەن تاکو شوین پی خۆیان بکەنەوە لە ناو میلەت دا ، خۆیان بە جوامیرۆ مەردان حیساب دەکەن ، لە راستی دا هەمووی درۆ فیل تەلکەیە کە دی کەن ...

ئ

بەلی ئەو جۆرە پیاوانە خۆیان حەشارداوە لەراستی دا وەك ریوای وان لەناو پیستی مەردان یان وەك گورگ وان لە ناو پیستی مەر دا ،ئەی فەرمان رەوایەتی و حوکم رانی ئەوا دەکریت ، خەلکی خۆت برسی بکەی لە پیناى دۆستایەتی کردن لە گەل جوولەکە دا ، یان ئەوە کە رۆژئاوایەکان لیت رازی بن ، خەلکیش وەلات بەجی بەهیلی روو لەولاتانی دەروە بکات لەبرسا ، یان لەترسی ئەوە نەوك بوختان و ملك ومال سامانەکەت لی زەوت بکەن ، یان کاتیك قسەبکەی دەت خەنە زیندانەکان هەزار ناو ناتۆرەت لی دەنین حەیایت ئەبەن بەدرۆکردن ، تاوای لی دیت بەخۆت باوەر ناکەی دەلی دەبیت من وام نەکردبیت ، کەی سیاسەت ئاوا دەکریت ، تەنها لەسەر کۆمینت یان لایك کردن یان شتی کی زۆر سادە زیندانی بوختانی زۆر گەورەت بەسەردا دەکریت لەم سەردەمەدا ،ئەی ئەم زولمە تا کو سەر بەدەوام ئەبیت ، ئەی ئەوە نەی چارەنووسی ( حویەی کوری ئەختب ) بەچی گەیشت ئەو پیاوە وهەزاران پیاوی تری کە خیانەت کار بوون ، دەبیت دەرئە نجامەکەیان هەر وا بیت ، بە سزایی خۆیان بگەن ،ئەوانەی زولم ستەم دەکە وانەزانن هەر بەردەوام ئەبن لەسەر زولم ستەم کردن ، دە بەخوا حەقی کەس لەسەر کەس نامینی بەسزای خۆی دەگات ...!!! بەلی دواتر نۆبەی سەرۆکی ( بني قريظة ) هات بۆ کوشتنی ، شایەنی باسە ( کەعبی کوری ئەسد ) پیاویکی زۆر زیرەك بەسەلیقە بوو ، پی ناخۆش بوو کە پەیمانیان شکاند لە گەل موسلمانان زۆریش پی داگری کرد کە ئەو پەیمانە نەشکینن ، هەروەها زۆریش پەرۆش بوو بۆ قەمەکەی خۆی ، ( کەعب کوری ئەسد ) حەزیشی ئەکرد کە موسلمان بیت ، بەلام بەهۆی ئەو پیاوە نامەردە کە ( حویەی کوری ئەختب ) بوو وە ك شیتان چووە لای قەمەکەی دل سارد کرد نەهیشت پەیمانەکە یان بە تەواوی بپاریزن، ئەوە بوو بووە هۆی پەیمان شکاندیان ئەو کارە ساتەی کە بەسەریان دا هات ،بەلی ( کەعبی کوری ئەسد ) پیاویکی هیمن لەسەر خۆ بوو، کاتیك هینایان بۆ ئیعدام کردنی ، پیغەمبەری خوا ﷺ پی فەرموو : ( یا کعب !! ) ووتی : بەلی . ئەی ابو القاسم !! فەرمووی : ( ما انتفعتم بنصح ابن خراش لكم و كان مصدقا بی اما امركم باتباعی وان رايتمونی تقرونی السلام ؟ ) سوودت لە ئامۆژگاریەکانی ( ابن خراش ) وەر نەگرت کە ئەو تصدیقی منی کرد بوو ، ئەی فەرمانی پی نەدان کە شوینم بکەون و ، گەر منتان بینی سەلامم لی بکەن ..؟! ( کەعب ) ووتی : بەلی ، ئەی ( ابو القاسم ) ! بە تەورات وایە گە ر جوولەکەش بەوەیان دانە نا بایە کەمن لە شمشیر ترساوم ، شوینت ئەکەوتم ..!!

ئ

بەلی کەعبی جوولەکش بەش بەش حالی خۆی غیرەت و وەفایی لایە ..!! بەلی بیگومان هەر هەموو پیاوەکان سەریان پەرا بەسزای و حەقی خۆیان گەیشتن ، بەلام تەنها ئافرەتیکیش ئەویش لەگەل پیاوەکان لەملی درا و سەری پەریندرا ، ئەویش ناوی (مەزینە ) بوو،ئەوویش ئەوە بوو لە سەر قەلاکانی (بني نضير ) بەردیکی گەورەی هەلدایە خوارەوە بەسەری موسلمانیکی بەریز کەوت سەری شەق کرد و شەهید بوو، بە ناوی (خلادی کوری سویدی ) ئەم ئافرەتە کوشتی ، ئەویش کە ناوی (مەزینە ) بوو ،بەلام دەلین پیاویکیش لە(بني قريظة ) رزگاری بوو و بەناوی (ریفاعەی کوری سەمەوئەلی قریظی ) ئەو پیاوە کە تازە بالغ ببوو پەنای بردە بەر ئافرەتیکی نەوەی نجار ، ئەویش چووە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ووتی : دایك و باوکم بەقوربانت بن (ریفاعە ) بە من ببخشە ، چونکە ئەو پیاوە کە نویژ دەکات و ، گوشتی ووشتر ئەخوات ، ئەوویش بەخشی بەو . ئەو ئافرتەش کە لە نەوەی نەجار بوو بە ناوی (سەلمای کچی قیس ) بوو ..!!

هەروەها دەست کەوتەکانی (بني قريظة ) ئەمانە بوون :

١-هەزار و پیچ سەد شمشیر .

٢-دووهەزار رم .

٣-سی سەد درع .

٤-پینج سەد قەلغان .

کە ئەو شتانە سەر ژمیر کران بەفەرمانی پیغەمبەری خوا ﷺ دابەشکرا بەسەر موسلمانان دا ، هەروەها ئەو ژن مندال و کەسانەی کە نەکوژران ئەوانیش بە فەرمانی پیغەمبەر ﷺ دابەش کران ، بەلام فەرمانی کرد کە هیچ موسلمانیك بۆی نیە دایك لە کورەکەی جیابکاتەوە یان کور لەدایکەکەی خۆی یان خزم و کەس کار لیك جیا بکرینەوە بەبی رەزامەندی ئەوان ، هەتا وەك خوشك و خوشك براو برا بەیەکەوە بوون ، لیك جیا نەکرانەوە ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتیکی لەو ئافرەتانەی (بني قريظة ) ی مارە کرد کردیە هاوسەری خۆی ،ئەویش بەناوی (ریحانەی کچی زید کوری عمر ) بوو ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کرد پاشان دوای لی کرد موسلمان بیت ، ئەوویش موسلمان بوو ، دوای ئەوش رەزامەندی نواند کە شووی پی بکات ، ئەلین : ریحانە پیش کۆچی پیغەمبەر ﷺ ئەو کۆچی دوای کردووە ، بەوە بەیەکیك لەدایکانی ئیمانداران –خوا لی رازی بیت – ...

ى

لەراستی دا ئەگەر یەكێك بەبی وورد بوونەوە خۆی سەیر ئەم حوكمەی (بني قريظة) بكات زۆر سادە و بەئاسانی تی دەگات ، كەوا ئەوان زولم ستەمیان لە موسلمانا كرد ، لە هەمان كاتیش دا ستەمیان لەخۆشیان كرد ، بەو كارە نارەوایەی كە ئە نجامیاندا بەوەی كاری زۆر بی رەوشتانەبوو یان كاریكی زۆر نامەردانە بوو كە دەرحەق بە موسلمانان كردیان ، هەر دەبێت حوكمی خۆیان ئەوا بدریت ، لەراستی دا ئەو حوكمەی كە (سعد) لە پیناوی دادوەری و عەدالەتی( خوای گەورە ) و پیغەمبەر صلى الله عليه وسلم و موسلمانان دا دەری كرد ، خۆ لەبەرژەوەندی خۆی دانە بوو ، بەلكو (سعد) دۆستی (بني قريظة ) و بەلام كارەكەیان ئەوندە گەورە وخیانەتكاری بوو و خۆ ئەگەر لە گەل هاوپەیمانیكی تریش ئەو خیانەتەیان بكردایە ، (سعد) هەر ئەم حوكمەی ئەدا ، چونكە ئەوتاوانانە لەگەل هەر میلەتیك یان كەسیك بكریت هەردەبیت حوكمی ئەوا بدریت ، خۆ ناش كریت گول باران بكرین ئەوتاوانانەیان لەسەر بچی ..!! بەلی بی گومان كاتیك (سعد ) ئەم حوكمەی دا پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانی بەم حومە دانا فەمووی ئەم حوكمە حوكمی خوایە پی رازیە..!! چونكە (خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾النجم ٣-٤ . واتا : قسەو گوفتاریشی (ئەوەی كە قورئانە ) لە ئارەزوو بازی و هەواو هەوەسەوە نیە ..!! ئەمەی كەرای دەگەیەنیت تەنها نیگاو وەحی خوای یە ..!! هیچ موسلمانیك ناتوانیت بەلی بم حوكمە رازی نیم ..!! چونكە ئەم حوكمە حوكمی خوای ، پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بی فەرمانی خوا لە خۆیەوە هیچ حوكمیك دەرناكات ، بەلام پیویستەئەمە بەچاكی روون بیتەوە بۆ هەموو خەلكی جیهان ..!! جوولەكە بەدریژایی میژوو جگە لە غەدرو زلم و ستەم ناپاكی و خیانەت هیچیانلی نەهاتوو..!! تەنها ئەم كارانەیان لی شیوای تەوە ، هەركە جوولەكە هاو شیوەكانی جوولەكە دەستیان هەبوو ، نەدینیان هەیە و نەئیمان ،نە پیمانیان هەیە ونە بەلین ، نەرەحمیان هەیە و نەویژدان ، نەعەیایان هەیە و نەشەرم ، ئی بی گومان قیمی مرۆڤایەتیش هەر ئەم رەوشتانەیە كە مرۆڤ هەیەتی ، ئەگەر ئەوانەی نەما دەبیتە درندە و ئاژەلی كیوی تەنها بۆ كوشتن شیاون .بەلی جوولەكە پە یمانیان لەگەل موسلمانان دا هەبوو ، بۆ ماوەی چوار سال دا و بەلام لەم ماوەیە دا موسلمانا تەنها وەفایی چاكەیان لەگەل دا ئەكردن لەچاكە زیاتر هیچیان پیشان نەدان ، بەلام ئەوان هەر كە هەلیان بەدەست هیناو سوپای الاحزاب هات ، بالادەست بوون ، خۆیان لە پە یمانەكە دزیەوە پە یمانەكەیان شكاند و سەرەرای پە یمان شكاندن ناپاكی خیانەت دەست بۆ دریژ كردنی دوژمنی دەری ، ئەوانە بەخیانەتی گەورە هەژمارە دەكرین ...

ئ

بەلی پەیمانیا شکان خستیان بەر پی خۆیان ، ژەهری نامەردیان نۆشی لەم کاتە ناسکەی موسلمانان دا ، هەر وەها دەستیان کرد بە گالتە کردنی بە پیشەوای مرۆڤایەتی رۆشنایی چاومان ﷺ ووتیان ئیمە محمد ناناسین ..!! بەگالتەوە ، تۆ ئەگەر سەیر هەر وەلاتیك لەم وەلاتانەی جیهان بکە ی بە پی یاساکانیان هەر کەسیك یان هەر دەستەیەك یان کۆمەلیك و خیانەت لە وەلات و نیشتیمانیان بکەن ، دەستی دەرکی دریژ بکەن ، رایکیشن بۆ وەلاتی خۆیان ئەمانە سزاکانیان جی دەبیت ، ئەگەر لەناو وەلاتی خۆت لەگەل دوژمن دەست هەبی بۆ داگیر کردنی وەلات و نیشتیمان ، ئەبی حوکمەکەی لەم سەردەمە جی بی ..؟!!یان سزاکەی جی بیت ..؟! بی گومان لە کوشتن زیاتر یان شیاو تر هیچی تر نیە ..!! بۆ هەر وەلاتیك کە دەستی خیانەت بکەویتە ناوی ..!!

بەلی جوولەکە لە جەنگی الاحزاب یان خەندەق ( ٣ ) تاوانی گەورە یان ئە نجام دا ئەمە بەسە بۆ ئەوەی شیاوی کوشتن ببن :

یەکەم :لە ژیرەوە پەیوەندیان بە دوژمنەوە کرد ، نهینی سەربازی زانیاری سەربازی یان دایە دەستی دوژمنی دەرەکی کە بۆ داگیر کردنی شاری مەدینە هات بوو ..؟!

دووەم : دەستی یارمەتیان دریژ کرد ، بۆ دوژمنی دەرکی ،وەك هاریکاری کردنی سەربازی لە رووی خۆراك وچەك و کەرسەی جەنگی بە چەند ووشتریك یارمەتیان بۆ دوژمنی مەدینە نارد ..؟!

سی یەم : لەم دوو تاوانەی سەرەوە گەورەتر ، لەم کاتەناسکە دا چەکیان دژی سوپای ئیسلام بەرز کردەوە لەناوەوەی شاری مەدینە ، واتا لە پشتی سوپای ئیسلام چەکیان بەرز کردەوە ، شمشیرەکانیان دەرهینا ، پەلاماری ژن و مندالانی سوپای ئیسلاماندا لە پشتەوە ، لەقەلاکانی نەوەی حاریسە دا ..؟!

بی گومان ئەوە بە خە نجەری خیانەت هەژمار دەکریت ،یان وە ئەوە وایە بلی خە نجەری لە پشتم داوە ، هەریەك لەم تاوانانە ، لەکاتی تەنگانەدا دوژمن هیرشی کردبیتە سەر شارەکە ، دەبیت سزایەکی چی بیت ، یان شیاوی چ سزایەك بن ؟!، بی گومان جگە لە کوشتن و سەربرین .!؟، چ سزایەکی تریان هەیە ..؟!

ئ
باشه ئايا به چ ياسايەكى جيهانى  و نيو دەولەتى ئەمانه له كوشتن دەر بازيان دە بيت ..؟! لەلايەكى تريشەوە خۆ جوولەكه دوژمنى پيشەوەى جەنگ نەبوون تاكو لى خۆش بوونيان بۆ دەرچيت يان بەديل گيرا بان يان سوپايەكى دەركى بونايه ، نەخير جوولەكه لەناوەوە دوژمنى سەرسەختى ئيسلام بوون ، ئەوان دوژمنى ناوە خۆ بوون ، بى گومان له هەموو عرف حادەتى جيهان وا باوە ،كه دوژمنى ناوەخۆ مەترسى دار ترله دوژنى دەرەكى ..؟! خۆ ئەگەر سەير ميژوو بكەين زۆريك لەكافران دريغيان نەكردووە بەرانبەر بەموسلمانان لەكوشتن وبرينيا ، هۆلاكۆ ى نامەدر ، حەربى صليب له ئەندەلوس ،  هيرشيما ئەمريكا ، دانيشتوانى شارى ناكازاكى كه جەند بى تاوان بوون ، يان هيرۆ شيما خەلكى زۆريان كوشت  بەبۆمبى ئۆتۆمى ، ئەى فەرماندە ى گاورەكان خاچ پەرستان له فەلەستين ، كەناوى ( ريچاد ) بوو جەندين كەسى بى تاوانى كوشت كەژمارەيان ٣٠٠٠ هەزار بوو كوشتى ، هەروەها جوولەكه  له كتابەكەى خۆيان دا هاتووە كه ( تەوراتە ) له ( سفر التثنية ) دا يە  دەلى : كه ئەگەر  دەستيان رۆى بۆيان هەيە هەموو پياوانى دوژمنيان بكوژن ببنە خاوەنى ژن و مندال و مال سامانيان ..؟!

غزوە(بنى قريظة ) لباشميل (١٥١-٢٦٨ ) ، الرحيق المختوم (٣٢١-٣٢٦ ).السير النبويةلابي شهبة (٢/٤٠٦-٤١١ ).

ئ

## چەند ڕووداویکی گرنگ دوای غەزای الاحزاب و غەزای (بني قريظة )

### یەکەم: کوژرانی ( سلامی کوری ابی الحقیق )

بەلی (سلامی کوری ابی الحقیق ) یەکیك بوو لە جوولەکەکانی (بني نضير ) هەروەها نازناوی (ابو رافع ) بوو ، دوای ئەوەی بە پیلانی جوولەکە کە ویستیان پیغەمبەری خوا ﷺ بکوژن بەم هۆ یە بوو کە جوولەکەی (بني نضير ) لە شاری مەدینە دا ، دەر کران ،هەندیکیان چوونە وەلاتی شام ئەوانی تر چوونە (خەیبەر) ، بەلام ئەوانەی کە لە (خەیبەر ) دا بوو ، دەستیان کرد بە پیلان گیرا نەخشە دانان بۆ لە ناو بردنی دەولەتی مەدینە ، ئەوە بوو کە سوپای الاحزاب یان هینا بۆ سەر شاری مەدینە ، ئەو جوولەکەیەش (سلامی کوری ابی الحقیق ) یەکیك بوو لەوانەی کە داریژەری هینان ی سوپای الاحزاب بوو، ئەوە بوو سوپای قورەیش سوپای غتفانیان هینا بە (١٠) هەزار سەر باز بۆ گەمارۆدانی شاری مەدینە ، سەر ئە نجام (خوای گەورە ) بە هانای موسلمانان هات و رزگاریانی کرد لەم سوپا گەورەیەی الاحزاب ، دوای ئەوەی جوولەکەی (بني قريظة ) شیان موسلمانان هاندا بۆ پە یمان شکاندیان و هیرش کردن و خیانەتی گەورە یان ئە نجامدا ، پاشان هەردوو سەرکردەی (بني قريظة ) ، (بني نضير ) (کەعبی کوری ئەسد ) و ( حویەی کوری ئەختب ) لەمل یان درا سەر بران ، ئیتر لەدوای کوشتنی ئەوانە (سلامی کوری ابی الحقیق ) مایەوە بووە سەرۆکی جوولەکەگانی (خەیبەر ) سەرۆکی هەموو جوولەکەی ناوچەکە ، (سلامی کوری ابی الحقیق ) دوو برای هەبوو ، یەکیکیان ناوی (کینانە ) بوو ، کە هاوسەری (صفیەی کچی حویەی کوری ئەختب ) بوو ، پیش ئەوەی ببیتە موسلمان و ببیتە هاوسەری پیغەمبەری خوا ﷺ ببیتە دایکی ئیمانداران ، هەروەها براکەی تریشی ناوی (رەبیع ) بوو ..!!بەلی کاتیك (بني نضير ) ناپاکیان کرد هەولی کوشتنی پیغەمبەری خوا ﷺ پیغەمبەر چاوپۆشی لی کردن لە حەقەکەی خۆی تەنها لە شاری مەدینە دەری کردن ، (حویەی کوری ئەختب ) ئەوەی لەبەر چاو نەبوو ، کە نەی کوشت بە دەری کرد لەشاری مەدینە ، چووە (خەیبەر ) بەلی ئەم چاکانەی پیغەمبەری خوا ﷺ لەبەر چاو نەبوو ، کاتیك چوونە (خەیبەر ) دەستیان کرد بە ناپاکی گەورە ،وە پیسی چەپەلەیە کانی خۆیان هەل رژاند ، جا کاتیك (حویە ی کوری ئەختب ) کوژا ، (سلامی کوری ابی الحقیق ) یش چووە (خەیبەر ) دەستی تیکەل کردن لە گەل بت پەرستانی دوورگەی عەرەبی دا ، بەتایبەتی قورەیش ، بەنیازی ئەوە بوو لەدژی موسلمانەکان هانیان بدا تاکو جەنگی کی تر وەك جەنگی الاحزاب دووبارە بەرپا بکەن ، جا بۆ ئەم مەبەست هەر کاتیك جوولەکەی ناپاك درەفتیم بقۆزیتەوە دریغی ناکات لە خراپە کاری هیچ گویی پی نادات دژی موسلمانەکان ئە نجامی دەدات ..!!

ئ
شایانی باسە (خوای گەورە) دوو هۆز لەئەنصارەکانی کردە خزمەتی ئیسلام ئەویش هۆزی ( ئەوس ، خەزرەج ) بوون ، بەلی کاتیك هۆزی (ئەوس) (کەعبی کوری ئەشرفی) جوولەکەیان کوشت ، هۆزی (خەزرەج) ووتیان : بەخوا نابی هۆزی (ئەوس) بەم کارە پیشمان بکەون بۆ خزمەت کردنی پیغەمبەری خوا ﷺ کەو تنە بیر کردنەوە کە چ پیاویکی تر کە وەك (کەعبی کوری ئەشرف) دژایەتی پیغەمبەری خوا ﷺ دە کات و ئەوانیش وەك هۆزی (ئەوس) بی کوژن ..!! بەلی بیریان کردەوە کە (سلامی کوری ابی الحقیق) دژایەتی پیغەمبەر ﷺ ئیسلام دەکات ، ئەوە بوو لەو کاتەدا (سلامی کوری اب الحقیق) لە (خەیبەر) ئەژیا لە قەلاکەی خۆی ..!!

هۆزی (خەزرەج) هاتن پرسیاریان لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد بۆ کوشتنی ئەو پیاوە ناپاکە و ئەو پیاوە قین لەدرە بەرانبەر بە ئیسلام ..!! هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ وای بەچاك زانی هەتا زوو ئەو ناپاکە بکوژریت ، چونکە وا خەریکە دووبارە هیزی دووورگەی عەرەبی لە بت پەرستان کۆدەکاتەوە بە سەر شاری مەدینە لەدژی موسلمانان دا ، بەلی ئا لەو کاتەدا جوولەکە دوژمنیکی سەر سەختی موسلمانان بوون لە (خەیبەر) دا کە نزیکەی دوو میل دوور بوو لە شاری مەدینە ، بەلی هۆزی (خەزرەج) داوایان کرد بچن سەرۆکی جوولەکە لە کۆشکەکەی خۆی لە (خەیبەر) دا لە ناو شوینی خەوتنی بکوژن ..!! بی گومان ئەم کارە پارتی زانیە ئەمەی ئەسەلماند بۆ هەموو نیمچە دووورگەی عەرەبی ، کە موسلمانان دەستیان ئەگاتە هەموو شوینك ئەگەر بیا نەویت ..!! هەروەها جوولەکەش دەبیت باش تیبگەن هیچ شوینیك نیە کە تیدا ئۆقرە بگرن و دەستی موسلمانانیا پی دەگات ، کی بیستوویەتی کە سەرۆکیك لەناو کۆشکەکەی خۆی دا بیت پاسەوانی هەبیت و دەرگای لەسەر خۆی داخست بیت ، کە سانیك لەدوورە وە بیت بۆ کوشتنی هەلمەتی بدەنی بیکوژن ، دواتریش بە سەلامەتی بگەرینەوە ،

بەلی هۆزی (خەزرەج) پینج کەس بوو بۆ ئەم هەلمەتەی کوشتنی سەرۆکی جوولەکەی (خەیبەر) کە لە کۆشکەکەی خۆی دا بوو:

١-(عبداللە ی کوری ئونەیسی جوهەینی ).

٢-(مسعوودی کوری سینانی ئەسلەمی ).

٣-(عبداللە ی کوری عەتیك )

٤-(حاریسی کوری رەبیعی ، ابو قتادەی ئەنصاری ).

٥-(خوزاعی کوری ئەسوود ).

ئ

ئەم پێنچە کەسە دوای ڕاوێژ کردن لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو خەیبەر بە ڕێ کەوتن ، (عبداللە کوری عتیك) بووە ئەمیری ئەم چوارەی تریان ، پێش دەر چوونیان پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری کردن کە ، نە ژن و نە منداڵ نەکوژن ..!؟ ئەم هەڵمەتە لەمانگی ڕەمەزان ساڵی شەشەمی کۆچی دا بوو ..!! بەڵێ دوای چەند ڕۆژێك ئەو پێنج پیاوە گەیشتنە (خەیبەر) ، بەڵێ (خەیبەر) بازاڕێکی گەورەی هەبوو ، بۆ کڕین فرشتنی دانەوێلە و خورما و جۆ گەنم ، بۆ هەموو کەسێك دەیتوانی سەردانی ئەو بازارە بکات ،بەڵام پێنج کەسە ئەنصاریە خزرەجی یەکە ئەمەیان پێ نەکرا ، چونکە جوولەکەی (بني نضير) چەند مانیگ بوو لە شاری مەدنیە دەر کرا بوون ، چونکە ئەوانیان ئەناسی ، بەلام شتێکی تر کاری بۆ ئاسان کردن کە (عبداللە ی کوری عتیك) ئەمیریان ، زمانی جوولەکەی ئەزانی ..!! بۆیە هاوەڵە کانی خۆی شاردەوە ، خۆی تێکەڵی هەندێك جوولەکە کرد ، توانی بەزمانی ئەوان قسە یان لەگەڵ دا بکات ،بۆ ئەوە زانیاری وەر گرێت لەسە رسەرۆکی جوولەکە (سلامی کوری ابی الحقیق) ..!! پێش ئەوە ش ئەم نەخشەیان دارێژ تبوو بۆ هەڵمەت بردنە سەر کۆشکی (سلامی کوری ابی الحقیق):

١-هەر هەموویا بەشەو بچنە سەر کۆشکەکەی ٢- دوای چوونە ژوورە وە دەستیان بگات کلیکلە کانی کۆشکە کە ٣-لەشوێنی ئاژەڵەکان خۆیان بشارنەوە تاکو بەشێکی زۆر شەو بڕوات ، پاسەوانەکان بخەون ئیجا هەڵمەت بەرن بۆ کوشتنی ٤- لە نیوە شەودا هەڵمەت بەرن بۆ ژووری نوستنی (سلامی کور ابی الحقیق) ٥-ئەو ژوورانەی خەڵکیان تیدا خەوتووە یان پاسەوان ،هەر هەموویان لەسەر دا بخرێت ٦- دوای ئەوە بەچکەی شاراوەی ژێر جەڵکانیان هەڵمەت بەرن ژوورە کەی لێ بکەن دۆزەخ ٧-لەسەر ئەمەش ڕێکەوتن هەر هەموویان خۆیان بخەنە ژوورەکەوە ٨-هیچ کەسێکی تر نەکوژن جگە لە (سلامی کوری ابی الحقیق) .

بەلام شتێکیان لەبیر چوو دوای کوشتی ئەو ناپاکە جۆن لە هەیوانەکە یان ساڵۆنەکە دەربازیان ئەبێت ، مەبەستیان لە گەڕانەوەی خۆیان نە بوو ،چونکە بەیعەتی مردنیان دا بوو ، نەوەك کارەکەیان لێ ببێتە خوری ، بێ گومان هەڵمەتی ئاوا پێویستی بە پیاوی مەردو ئازاو چاو نەترس هەیە یان ئیمانێکی دامەزراو بە خوا بە پێغەمبەرکەی ، بۆ هاوڵان هەموو کات بۆ ئەم ئیسلام ڕوحی خۆیان پێشکەش کردووە ،بیعەتی مردنیان داوە بەئیسلام ، لەبەر دوژمنانی ئیسلام هەر گیر ز هەرگیز چاویان نەنوقاندوە سەریان هەمیشە بەرز بوو بەرانبەر دوژمنای ئیسلام ، مێژوو شاهیدی ئەدا لە چەند سەدەی ڕابردوو دا هەمیش ئازاو خۆڕاگر بوونە بەرانبەر بەدوژمنای ئیسلام ..!!؟

ئ

له روایەتی ئیمامی بوخاری دا هاتوو دەلی : کاتیك موسلمانان ئەگەنە ( خەیبەر ) ( عبدالله ی کوری عتیك ) ئەمیریان ، فەرمانی بەسەر دان ئەوان لەجی خۆیاندا بمینەوە ، تاکو خۆی بچی هەوال و زانیاری وەرگریت و بزانی کە ووتی : لە شوینی خۆتان دابنیشن تا سەیر بکەم ..!!( عبدالله ی کوری عتیك ) ئەلی : هەولم دا بچمە ناو کۆشکەکە ، ئەوە بوو گویدریژیکیان وون کرد بوو ،بە شورایەکەوە لە کۆشکەکە دەرچوو بوون ، دوای ئەگەران ، منیش ترسام بم ناسن ..!! هەر بۆیە سەرو لاقم دا پۆشی هەر وەك دەست بە ئاو بگەیەنم ..!! پاشان دەر گاوانەکە بانگی کرد ، بەر لەوەی دەرگا دا بخەم کی دیتە ژووره وە ..!! لەریوایەتیکی تر دا هاتووە ،بانگی ( عبدالله ی کوری عتیك ) ئەکات ئەی بەندەی خوا وەرە ژووره وە ئەمە وی دەرگادا بخەم ..!! ( عبدالله ی کوری عتیك ) ئەلی : من چوومە ژوورەوە ناو کۆشکەکە ،خەلکە کەش چوونە ژوورەوە دەرگا دا خرا ، کلیلەکانی دەرگای بە شتیك دا هەلواسی ، منیش لە شوینی بستنەوە گودریژەکەدا بووم خۆم شاردبۆوە ،( سلامی کوری ابی الحقیق ) لە کۆشکەکەی خۆ میوانی هەبوو ، لە لای ئەو نانی ئیوارەی ئەخوارد ، بە قسە کردنی ئەوان بەشیکی شەو رۆیشت ، پاشان گەرانەوە مالی خۆیان ، کە دەنگە دەنگ نەما جم جۆلم نەبیست ، هەستام بۆکلیلەکان و دام گرتن و دەرگای قەلاکەم یان کۆشکەکەم کردەوە ، ووتم : ئەگەر پیان زانیم منیش لەسەر خۆ بۆی دەر ئەجم ، ( عبدالله ی کوری عیتك ) ئەلی : دوای ئەوە چووم دەرگای ژوورەکانیام لە دەروە داخست لە سەریان ،هەرچی دەرگایەکەم دەکردەوە لە ناوەوە لەسەر خۆم ، ووتم : ئەگەر پیشم بزانن ناگەنە من ، من ( سلامی کوری ابی الحقیق ) ئەکوژم ..!! ( عبدالله کوری عتیك ) ئەلی : کە گەیشتمە لای ( سلامی کوری ابی الحقیق ) ، ئەبینم وا لە ژووریکی تاریك دا لە ناو خاو خیزانی دا ، نەم ئەزانی لەچ شوینیکی ژوورەکەیە ..!! ئەلی : ووتم : ( سلام یان ابو رافیع )؟!! ئەویش ووتی : ئەوە کی یە ؟! ( عبدالله ) ئەلی : بووە دەنگە دەنگ ، منیش خۆم هەلدا سەری دامگرت بەشمشیر ، سەریشم سورما لە لیدانی شمشیرەکە هیچی پی نەکرد ، هاواری لی بەرز بۆوە ، منیش لە ژوورەکە چوومە دەرەوە بەلام دوور نەکەو تمەوە ..!! پاشان وە ئەوەی کە فریایی بکەوم دەنگی خۆم لی گۆری بە ( عیبری ) پیم ووت: ئەوە چیە ؟! ئەویش ووتی : دایکت تیاچی .. پیاویك هاتە ژوورەوە بەشمشیر لی دام ..!! ئەلیت منیش شمشیرەکەم خستە سەر وورگی خۆم دا بەسەری دا هەتا چرقەی ئیسکەکانی هات ، دوای ئەوە شمشیرەکە لە پشتەوە دەرچوو ، ئیتر زانیم کوشتوومە ..!! ( عبدالله ی کوری عتیك ) ئەلی : یەك بەیك دەرگاکانم کردنەوە ، بەسەر سامیەوە هاتمە دەرەوە هەتا گەیشتمە لای قادرمەیەك ئەم ویست بیمە خوارە وە و ، بەسەریەوە پیم خلیسکا کەوتم ، پیم دەرچوو ، منیش خیرا بەستم ، بەشەلە شەل هاتمە لای هاوەلەکانم، پیم ووتن ، دەرچن مژدە بیت بە پیغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من لیرە نا جوولیم هەتا دەنگی ئافرەتی شیوەن کەر ببیستم ..!!

ئ

کەله شیری بەرەبەیانی خویندی شیون کە رلەسەر شووراکە وەستا و هەوالی مردنی (سلامی کوری ابی الحقیق) گەورە جوولەکە دا بەخەلکە کە .. ئیتر منیش فریای هاوەلە کانم کەوتم بەر لەوەی کەبچنە خزمەتی پیغەمبەر ﷺ مژدەم دایە و بۆم باس کرد .. پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ئادەی لاقت دریژ بکە ، کە دریژم کرد دەستی پیا هینا ،هەر وەك هەرگیز ئازاری نەبووبی ..!!

ێ

## دووەم : سریەی ( محمدی کوری مسلمە ) :

دوای تەواو بوونی جەنگی الاحزاب و بنی قریضة ، ئەم سریەی کە بریتی بوو لە ( ٣٠ ) ئەسپ سوار یەکە م سریە بوو ، دەرچوو بەرەو ( قرطاء ) بەلای ( ضریة ) ناوچەی ( بکرات ) خاکی ( نجد ) تیپەری ، ماوەی نیوان ( ضریة ) و شاری ( مەدینە ) ( ٧ ) شەو ریگا بوو ، دە شەو لە مانگی محرم سالی ( ٦ ) کۆچی کەوتنە ری بەرەو هۆزی ( بکر بن کلاب ) کە دایان بەسەریاندا هۆزەکە هەلهاتن ، سریەکەی موسلمانان مەرو ووشترو مالاتەکەیان کەوتنە دەست ، لە مانگی محرم یەك شەو ما بوو ، کە گەیشتنەوە شاری مەدینە ، هەروەها ( ثمامة کوری اثال ) گەورە پیاوی بنی حنیفە یان لەگەل خۆ دا هینا بوو ، کە بە نیازی بوو بە فە رمانی موسلەمەی درۆزن پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) شەهید بکات .بەلی موسلمانە کان ، ئەو پیاوە یان گرتوو بوو هینا بویانە ناوشاری مەدینە یەکیك لە پایەکانی مەزگەوت بەستبوویانەوە ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : چیت ئەویت ؟ ئەویش ووتی : چاکەم پییە ئەگەر بم کوژی خاوەن خوینم هەیە ، خۆ ئەگەر بەرم بەدەی سوپاس گوزارت دەبم ، ئەگەر مال و سامانت ئەویت ،دوا بکە چەندت ئەویت پیت ئەدریت !! پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەچی هیشت ، بەلام جاریکی تر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیەو سلم ) بەلای دا تیپەری و هەمان شتی پی فەرموو ، ئەویش وەك جاری پیشوو وەلامی دایەوە ، پاشان جاری سیەمیش وەلامەکەی دووبارە کردەوە ، ئینجا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( ثمامة ) بەربدەن و بەرە لای بکەن ، بەلی بەرەلایان کرد چوو بۆ باخە خورمایەکی نزیك مەزگەوت خۆی شۆرد ، پاشان هاتەوە موسلمانان بوو ، ووتی : وەلاهی لە هەموو دونیا داکەسیك نەبوو لە تۆ زیاتر رقم لی بیت ، وە ئیستاش دەم چاوو رووی تۆ بەلامەوە لە هەموو دونیا خۆشەویسترە ، وەللاهی هیچ ئاینیکیش لە دونیا دا نەبووە بە ئەندازەی ئاینە کەی تۆ رقم لی بیت ، ئیستا بووە خۆشەویسترین ئاین لەلام ...

ئ

کاتیکیش ئەسپ سوارەکانی تۆ من نیان گر بە نیازی عومرە بووم ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )مژدەی پیدا و ، فەرمانی پی کرد عومرە کەی بکات ، کاتیك ( ثمامة ) هات بۆ مککە قو رەیش پی یان ووت : ( ثمامة ) لە ئاینی باپیرانت هەلگەراویتەوە ، ئەویش ووتی : نەخیر وەللاهی لەگەل محمد ( صلی الله علیه وسلم ) دا بووم موسلمان بوو م ، سویند بەخوا لە ( یمامە ) وە یەك دەنکە گەنم ناگاتە لای ئیوە هەتا پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانم پی نەدات ،لە ( یمامە ) وە گەنم دەهات بۆ شاری مککە ، بەلی ( ثمامة ) گەرایەوە وەلاتی خۆی ریگەی گرت لە ناردنی گەنم بۆ شاری مککە ،تاکو قورەیش بیزارو ماندوو بکات ، دواتر قورەیش نامەیان نووسی بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە بەر خاتی خزمایەتی نامە بنووسیت بۆ ( ثمامة ) تاکو ریگە بدات گەنم و دانەویلە بروات بۆ شاری مککە ، بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانی ( ثمامة ) دا تاکو ریگە بدات گەنم دانە ویلە بچیت بۆشاری مککە ..!!

ئ

## سی یەم : غەزای ( بنو لحیان ):

بەلی ( بنو لحیان ) ئەو هۆزە بوون کە خیانەت و نا پاکیان کرد لە (١٠) هاوەلە موسلمانەکەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە رووداوی ( الرجیع ) دا شەهیدیان کردن ، بەلی ئەم هۆزە بوو دەستیان لەم رووداوە دا هەبوو بۆ شەهید کردنی ئەو پۆلە موسلمانە کە هیچ تاوانیکیان ئەنجام نەدا بوو ،بەلی ئەم هۆزە شوین و مەنزلگایان لە حیجاز دا بوو ، بەرەو سنوری مککە ، هیشتا بگرەو بەردەی نیوان موسلمانەکان و قورەیش و هۆزە ( الاعرابیە ) کان لە گەرمەدا بوو ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) زۆر پی باش نەبوو بچنە ناوەوەی دوژمن واتە نزیك ببنەوە لە سنوری قورەیش و الاعرابیە کان ، بەلام کاتیك جەنگی الاحزاب کۆتایی هات ، وورەی دژمن دابەزی بوو ، بەسەر شۆری گەرانەوە مەنزلی خۆیان ،هیچ جموجۆلیکیان نەما بوو ، تا رادەیەك ملکەچی ئەمری واقع بوون ، بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە م کاتەدا پی باش بوو تۆلە ئەو شەهیدانەی رووداوی ( الرجیع ) بکاتەوە ،لە ( بنی لحیان ) لە مانی الربیع الاول لە سالی (٦) کۆچی دا بە دوو سەد موجاهیدەوە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) چووە دەرەوە ، ( ابن ام مکتوم ) بەسەر شاری مەدینە دا جیهیشت ، وای نیشاندا کە بەروە شام دەرۆن پاشان بە خیرای رۆیشتن تاگەیشتنە ناوجەرگەی ( غران ) کە دۆلیکە لە نیوان ( امج )و ( عسفان ) دا ، ئەو شوینەی هاوەلە کانی تیدا شەهید بوون ، لەویدا نزای لی خۆش بوونی بۆ کردن ، (بنو لحیان ) بە مەیان زانی بەرەو شاخ رایان کرد ، کەسیان دەست نەکەوت ، دوو رۆژ لەویدا مانەوە ، بە هەر چوار لادا سریەیان بەلاوە پی کرد ، کەسیان دەست گیر نەکرد ، ئینجا رۆیشتن بەرەو ( عسفان ) پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دە ئەسپ سواری نارد بۆ ( کراع الغمیم ) تا قورەیش بەر گویی بکەویت ، پاشان گەرانەوە بۆ شاری مەدینە و چواردە شەویا پی چوو ..!!

ئ

**چوارەم : سریەی ( عکاشە ی کوری محصن )** : بە ( ٤٠ ) کەسەوە دەر چوون بەرەو ( غمر ) کە کانیاویکی ( بنی ئەسەد ) بوو ، هۆزەکەیان لەوی بوو ، چاویان بە م سریەیە کەوت رایان کرد ، سریەکەی موسلمانان دوو سەد ووشتریان دەست کەوت گەرانەوە بۆ شاری مەدینە ...!!

**پینچەم : دووبارە سریە ی ( محمدی کوری مسلمە )**: بەرەو ( ذي القصة ) لە مانگی رەبیع الاول یان رەبیعی الثاني لە سالی ( ٦ ) کۆچی دا بوو ، بەلی کوری مەسلمە لە گە ل ( ١٠ ) موجاهیدی سەربازی سوپای ئیسلام بەرەو( قصە ) مەنزلی ( بني ثعلبة ) بەریکەوتن بەلام ئەوان پیشتر بە هاتنی ئەم سریەیان زانی بوو، بۆسەیان بۆ دانان لەکاتی نووستنیان بەسەریان دا دان هەر هەموویان تیدا شەهیدبوون جگە لە ( محمد ی کوری مسلمە ) ئەو بریندار بوو ، دواتر بە برینداری خۆی گەیاندەوە شاری مەدینە ..!!

**شەشەم : سریە ی ( ابی عبیدە ی کوری جراح )**: بەرەو ( ذي القصة ) کەوتە ری لە مانگی رەبیعی دوومدا بوو ، وە لەسالی ( ٦ ) کۆچی دا ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم سریەی نارد بەدوای شەهید بوونی سریەکەی ( محمدی کوری مسلمە ) ، بەلی ئەم سریەیە ( ٤٠ ) موجاهید بوون ، رۆیشتن گەیشتنە شوینی رووداوەکەی سریە کەی ( محمدی کوری مسلمە ) بەلام ئەم سریەیە بەشەو بەری دەکەوتن بەرۆژ خۆیان حەشاردەدا تاکو دوژمن هەستیان پی نەکات ، لەگەل بەرە بەیاندا بەسەر ( بني ثعلبة ) یان دا دا ، نا چاریان کردن را بکە بەرەو شاخ و کیوەکان ، پیاویکیان لی گرت هەر لەویدا موسلمان بوو ، ووشترو مەر مەلاتەکی زۆریان لی دەست کەوتن لەگەل خۆیان دا هینایانەوە بۆ شاری مەدینە ..!!

**حەوتەم : سریەی ( زیدی کوری حاریسە )** : بەرەو ( جموم ) لە مانگی ربیع دووەمی سالی ( ٦ ) کۆچی دا بەری کەوتن بەرەو ( جموم ) ئاویکی ( بنی سلیم ) بوو ، لە ( الظهران ) لەم هەلمەتەدا ( زیدی کوری حاریسە ) ژنیکی هۆزی ( مزینە ) گرت ، کە ناوی ( حلیمە ) بوو ، شوینی ( بنی سلیم )ی نیشاندان ، بەسەریان دادان دیل و ووشتریکی زۆرو مەرو مالاتیکی زۆریان دەستکەوت ، کاتیك ( زیدی کوری حاریسە ) گەرایەوە شاری مەدینە ، دەست کەوتەکانی هینایەوە ، ژنە کەی بنی مزینە شی لەگەل دا بوو ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئازادی کرد و دواتر بەشووی دا ..!!

ئ

## هەشتەم: سریەی (زیدی کوری حاریسە ) :

بەرەو (عیص ) لە مانگی جمادی الاولی سالی (٦) کۆچی دا بوو ، بە (١٧٠) ئەسپ سوارو ووشتر ، بەریکەوتن ، لەو سریەیە دا مال و سامانیکی زۆری قورەیش دەستی بەسەر دا گیرا ، سەرۆکی کاروانەکەی قورەیش (ابو العاص ) ی زاوای پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) کە هاوسەری (زینب ) ی کچی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بوو ، بەلی (ابو العاص ) دەربازی بوو ، هاتە لای (زینب)ی هاوسەری کە کچی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بوو ، هانانی بۆ برد ، کە دوای مال و سامانەکەی بۆ بکات لە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) ئەویش هەوالی نارد بۆ پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) پیغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم ) بە خەلکی ووت مال و سامانەکەی بۆ بگەرینەوە بۆ (ابو العاص ) بی ئەوەی زۆری بکات لە هیچ کەسیك ئەوانیش دایانەوە و (ابو العاص ) گەرایەوە بۆ شاری مککە و مال و سامانەکەی خەلکی لا بوو کە سپاردەی ئەویان کرد بوو ،دایەوە بەخەلکی شاری مککە خاوەنەکانیان شاد بوون بە مال و سامانەکەی کەلە لای (ابو العاص) بوو ، دواتر موسلمان بوو پاشان کۆچی کرد ، دوای ئەوەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) (زینب ) ی کچی بە پیی نیکاحی یەکەم پیدایەوە کە (٣) سال و نیوی خەیاند ، چونکە هیشتا ئایەتی حەرام کردنی ژنی موسلمان لە کافران نە هاتبوو ، خوارەوە ..!!

## نۆیەم : دیسان سریەی (زید کوری حاریسە ): بۆ (طرف ) یان (طرق ) لە جمادی الاخرە ی

سالی (٦) کۆچی دا بوو ، (زید کوری حاریسە ) بە (١٥ ) موجاهیدی سەربازی سوپای ئیسلام دەر چوون بۆ (بني ثعلبة ) کە گەیشتنە سەریان دیسان رایان کرد ، لەوە ترسان کە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) خۆی بەسەری دادابن ، بەلی (زید ) لە م هەلمەتەدا (٢٠ ) ووشتری دەست کەوت ، چوار شەوی پی چوو ..!!

## دە یەم : دیسان سریەی (زیدی کوری حاریسە ): بەرەو (وادی القری ) لە رجب ی سالی (٦)

کۆچی بوو ، (زیدی کوری حاریسە ) (١٢ ) موجاهیدی لە گەل دا بوو ، بە پیادە بەری کەوتن بەرەو (وادی القری ) بۆ ئەوەی بزانن جمو جۆلی دوژمن جۆنە لەویدا ، پاشان خەلکی (وادی لقری ) بۆسەیان بۆ دانان هیرشیان کردە سەریان (٩) کە سیان لی شەهید کردن ،(٣) سیان رزگاریان بوو ، (زید) یەکیك بوو لەو رزگار بووانە.

ئ

## یانزەم : سریەی ( عبدالرحمن بن عوف ) بۆ ( دومه الجندل ):

( الواقدی ) له مغازی ( ٢/٥٦٠-٥٦١ ) دە گیریتەوە ، کە لە مانگی شەعبانی سالی ( ٦ ) کۆچی دا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە ( عبدالرحمن بن عوف ) ی فەرموو : (( تهجز فأني باعثك في سرية في يومك هذا أو من غد إنشا الله )). واتە : خۆت ئامادە بکە ، چونکە من بەسرییە کەوە ئەمرۆ یان بەیانی دەت نیرم پەنا بە خوا )) بە لی بەم شیوەیە فەرمانی پی کرد ، کە بەری بکەوی بەرەو ( دومه الجندل ) بەمەبەستی بانگ کردنیان بۆ ئیسلام ،وە ئە نجام دانی کاری سەربازیش ، ئینجا پیش ئەوەی ( عبدالرحمن بن عوف ) بەری بکەویت ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) داینیشاند و میزەرەکەی سەری هەلەوەشاندەوە هەر بەخۆی عەمامەیەکی رەشی لەسەری ناو ، پی فەرموو : (( إعز بسم الله وفي سبيل الله فقاتل من كفر بالله لاتغل ولا تغدر ولا تقتل وليدا )). ئیتر ( عبدالرحمن ) رۆیشت تا گەیشتە ( دومه الحندل ) سی رۆژ لەوی مایەوە ، خەلکە کەی بانگ کرد بۆ ئیسلام بەلام کەمیان موسلمان بوون ، دواتریش گەرایەوە بۆ شاری مەدینە، با ئەوەش لە بیر نەکە ( عبدالرحمن کوری عوف ) یەکیك بوو لە عشر المبشر یان لە دە کەسە مژدە دەرەکە ..!!

## یانزەم : سریەی ( کرز بن جابر الفهری ):

بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم سریەی لە مانگی شەوالی سالی ( ٦ ) کۆچی دا بوو ،سریەکەی بە فەرماندەی ( کرزی کوری جابری الفهری ) نارد بەرەو هۆزی ( عکل ) هۆزی ( عرینه ) کە ئەم دوو هۆزە هەردووکیان هۆزیکی الاعرابی یان دەشتە کی بوون ،بەلی ئەم دوو هۆزە لە سەرەتاوە لەلای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) خۆیان بە موسلمان نیشاندا بوو ، ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەلام ئیمە بە ژیانی نیو شاری رانە هاتووین ، ئەگەر ئیمە بینە ناو شاری مەدینە هە موومان نەخۆش دەکەوین ، هەر بۆیە دوات لی دەکەین چەند ووشتریکمان بدەیتی بۆ ئەوەی لەگەل خۆمان دا بیان بەین لەوی لەلای خۆمان بەخیویان دەکەین ، بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) چەند ووشتریکیان پی دەدات ، وە شوانیکیان لەگەل دا ئەنیری ، وە دەفەرمووی : شیرە کەشیان بخۆن خۆشتان بە میزەکەی دەرمان بکەن ،چونکە میزی ووشتر دەر مانە بەکاردەهینریت بۆ هەندیك نەخۆشی پیست ، هەروەها لە صحیح الخاری دا هاتووە ،وە لە ( المصابح المنیر فی تهذیب تفسیر ) ابن کثیر ( ٣٧٣-٣٧٤ ) هاتووە ،بەلی دوای ئەوەی کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ووشترکان تەسلمیان دەکات و لە شاری مەدینە دوور دەکەونەوە ، ئەوان نا پاکانە شوانەکە دەکوژن ! جستەشی ئەشی وین ..!!

ی

بەلی بەشیوەیەکی زۆر ناشرینانە هەردوو چاوی دەر دەهینن ، هەر دوو دەست پی دە برن ! بەلی کاتیك کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم هەواڵە دە بیستیت یەکسەر سریەی ( کرزی کوری جابر الفهری ) بۆ ئەو ناپاك و نمەك حرامانە رەوانەدەکات ،بەلی موسلمانان بەفەبماندەیاتی ( کرز ) بەدوایان دا دەکەون دەیان گرن ،دەیان هینەوە لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پیغەمبەریش ( صلی الله علیەوسلم ) بانگی ئیسلام یان بۆ دەکات ئیسلامیان پی رادەگەیەنی ، دوایان لی دەکات موسلمان بن ، بەلام موسلمانان نابن ، دواکەی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) رەت دەکەنەوە ، پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) لە تۆلە ی ئەم شوانە بەستەزمانەو ناکی درندانەی کە کردیان بەرانبەر بەم شوانە ، هەروەها بانگی کردن بۆ ئیسلام رەتیان کردەوە ، ئیتر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە توند ترین شیوە سزایان دەدات ، هەر وەك چون رفتاریان کرد بەران بەر بەشوانە بی تاوانەکە ، وەك ئەو سزایان دەداتەوە و تۆلەی شوانەکەی دەکاتەوە ..!!هەر بۆیە ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی لە سورەتی المائدە ناردە خوارەوە کە دەفەرموویت : ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ المائدە ٣٣-٣٤ . واتا : بی گومان پاداشتی ئەوانەی کە شەر دەکەن دوژمنایەتی خواو پیغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەول دەدەن بۆ بلاو کردنەوەی فساد و بەد رەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە : ئەوانەیان کە خەلکیان کوشتووە ، دەبیت بکوژرین ،ئەوانەش کە خەلکیان کوشتوە ریگری جەدەیی و دزی شیان کردووە دەبیت لە خاچ بدرین ، ئەوانەی تەنها جەردەی دەکەن ، دەست قاچیکیان بە پیچەوانەوە ببردریت ، ئەوانەی کە مەترسیان لی دەکریت و ئەوە دوور بخرینەوە لە ولات ، ئەو سزایانە خەجالەت و سەر شۆری بۆیان لەدونیا قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورە یان بۆ هەیە ..

جگە لەوانەی کە تۆبە یان کردووە پیش ئەوەی دەستی ئیوەیان بگاتی و ئەوە بزانن کە بەراستی خوا لی خۆشبوو و مهرەبانە وئەلبەتە ئەگەر مافی خەلکیان بەسەرەوە نەبیت ..!!

ێ

پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) سزای ئەوانەی دا لە بەر ئەم هۆکارانە :

١-شوانەکەیان کوشت بەشیوەیەکی دراندانەو بی هۆکار جستەیان شیواند.

٢-لەبەر ئەوەی لەدین هەلگەرانەوە بە درۆ ببوونە موسلمانان .

٣-لەبەر ئەوەی بەنیازی ئەوە بوون ناپاکی و فیل و خیانەت لە پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) بکەن.

٤-دەبیت سزابدرین بۆ ئەوەی هۆزی دیکە یان خەلکی دیکەش فیر نەبی ، بەدرۆ موسلمانان بیت و دواتر نیازی وابیت خەنجەر لە پشتی موسلمانان بدات .

٥-چونکە ئەوان دزیان کرد فیل یان کرد کەسیکی بی تاوانیان کوشت ،هەلگەرانەوەش لەئیسلام .

ێ

## ڕووداوی بوختان بۆ خاتوو ( عائیشه ) یان ( حادثة الأفك )

بەلی مونافیقه کانی شاری مەدینه هه ستان به درۆ و دەله سەو بوختان کرد ، بۆ خاتوو ( عائیشه ) تەنها بۆ لەکەدار کردنی صومحەی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) خاتوو عائیشه هاوسەری ، پاش ئەوەی مونافیقه کان سەرکەوتوو نەبوون له هاندان و تحریك دانی پەیوەندی نیوان موسلمانان به تایبه تی کۆچ کەران و ئەنصاره کان ،هەروەها ئاژاوه نانەوه لەنیوان هه ردوو هۆزی ( ئەوس و خەزرەج ) سەر کەت و نەبوون ئەم جاره هه ستان به بووختان کردنی بۆ خاتوو عائیشه ،بەلی مونافیقه کان ئەم رووداوه ناخۆشه یان هینا بەسەر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و خاو خیزانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ، زۆر بەی زانایان ئەلین ئەم رووداوه له غەزای ( بنی مصطلق ) روویداوه ، که له دوای دا باسی ده کەین ، جۆن ئەم غەزایه روویداوه ، هەروەها له صحیحی بوخاری مسلم دا گیراویانەتەوه ، له صحیحی بوخاری دا ئاوا هاتووه ، ( عائیشه ) ( رازی خوای لی بیت ) دەفەرموویت : کاتیك پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەر چوو بایه بۆ غەزا یان بۆ هەر شوینیکی دوور تیر پشکی دەکرد له نیوان خیزانەکانیدا ، کامیان ناوی دەر چوو بایه له گەل خۆی دا دەی برد ،جا له غەزای ( بنی مصطلق ) ناوی من دەر چوو پاش دابەزینی ئایەتی حیجاب بۆ یه من هەر له ناو کەژاوەکەم دا بووم هەلده گیرام و داده به زینرام ، له پاش تەواو بوونی غەزاکه ، گەراینەوه تاکو نزیك بووینەوه لەشاری مەدینه ، وه له وەستانیك دا من بۆ هەندیك له کاری خۆم دوور کەوتمەوه ، کەویستم بگەریمەوه بینیم ملوانکەیه کم هەبوو لیم وون بووه ، ئیتر منیش بۆی ده گەرام ، له و کاتەدا سوپای جووله ی کرد و ئەوانەی کەژاوەکەی منیان هەلده گرت وایاندەزانی من هەر له کەژاوه کەدام ، چونکه ئافره تان لەو سەردەمەدا ئەوەنده قورس نەبوون ، لاشەیان لاواز بوو نانمان بەکەمی ده خوارد ، هەر بۆیه هەلگرانی کەژاوه که ، هەستیان به سووکی کەژاوەکه نەکرد ، کەژاوەکەیان خسته سەر ووشتره که و بەریکەوتن ، منیش ملوانکه کەم دۆزیەوه دوای ئەوەی سوپا بەریکەوتبوو ، کاتیك گەرامەوه جیگاکەی خۆم کەسی لی نەما بوو ، بۆ چوونیشم وا بوو ئەوان به نەبوونی من له کەژاوەکەدا دەزانن ،وه دەگەرینەوه بۆ لام ، ئیتر هەر له و کاتەدا دانیشتم خەو بردمیەوه و خەوتم ، ( صوانی کوری موعه تتەلیش ) له دوای سوپاکه وه ری دەکرد شەو گەیشته جیگاکەی من تارمایی ئادەمیزادیکی بینی خەوتبووه ، که نزیك بوویەوه من ناسی ، چونکه پیش دا به زینی ئایەتی حیجاب منی بینی بوو ...

ێ
ئیتر منیش بە دەنگی (إنا الله وانا إليه راجعون ) ی صفوان بە ئاگا هاتمەوە ، منیش روومەتی خۆم دا پۆشی و سویند بەخوا گویم لە ووشەیەکی نە بوو جگە لەوە ی ووتی : (إنا الله وإنا إليه راجعون ) ئینجا ووشترە کەی دانیشاند لە سەر دەستی منیش سواری بووم ، ئیتر هەر اری دە کیشاو رۆیشتین لە گەرمای نیوەڕۆ گەیشتینە لایان ، ئیتر ئەوەی کە تیا چوو لەو مەسەلەی مندا تیا چوو ، سەری ئەو هەموو بوختان و درۆ دەلەسەیش (عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) بوو .

بلاو بوونەوەی پروپاگەندەی رووداوی (حادثة الافك) لە شاری مەدینەدا ، عائیشە دەفەرموویت : بەلی کاتیك گەراینەوە شاری مەدینە یەك مانگ من تەندروستیم باش نەبوو ، خەلكیش زۆر باسی قسەی بووختان جیە کانیان دەکرد ، وە منیش بی ئاگا بووم لە و باس و خواسە ، ئەووش دەیخستمە گومانەوە ئەو رووخۆشیەی لە پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەمبینی لە کاتی نەخۆشیدا هەستم پی نەدەکرد و بەلکو دەهاتە لام سەلامی لی دە کردم و دەی فەرموو: چۆن بووی ؟ ئینجا دروۆیی ئەوش دەیخستمە گومانەوە ، کاتیك لە نەخۆشیە کەم چاك بوومەوە ، لە گەل (ام مووسیتەحدا ) چووین بۆ ئەو جیگایەی پیویستی خۆما نمان تیادا ئە نجام دە دا ، دەریش نە دە چووین شەو بۆ شەو نەبیت ، پیش ئەوەی کە جیگای تایبەت بۆ ئەو مەبەستە لە نزیك مالە کانمان دروست بکریت ... کاتیك گەراینەوە لە گەل (ام مووسیتەحدا ) پینا یە بە کراسەکەی و کەوت ووتی : بە د بەخت بیت میستەحی کورم ، منیش ووتم : ئایا قسە بە کەسیك دە لیت کە ئامادەی جەنگی بەدر بووە ؟ ئەویش ووتی : ئەی بی ئاگا نەت زانیوە چی ووتووە ؟! منیش ووتم چی ووتوە ؟! ئیتر ئەویش باسی ئەوانەی بۆ کردم کە هەلساون بە هەلبەستنی بووختانە کە ، ئیتر منیش ئەوەندەی تر نەخۆش کەوتم ..!! کاتیك گەرامەوە مالەوە پیغەمبەری خوا هاتە ژوورە کەم سەلامی لی کردم ووتی : چۆنی ؟! منیش ووتم : ئایا ریگەم دەدەیت بچمە لای باوك و دایکم ؟! دەفەرموویت : مەبەستیشم ئەوە بوو دلنیا بم لە هەوالکە لە ریگەی ئەوانەوە ، بە دایکم ووت : خەلکی باسی چی دەکەن ؟! ئەویش ووتی کچە کەم ئارام بگرە و دان بە خۆدا بگرە ..!! سویند بە خوا کەم جار هەیە ئافرەتیك جوان بیت خاوین بیت ،تاکو قسەی لەسەر نەکریت ..!! دەفەرموویت : منیش ووتم : پاکی بۆ خوا ، کە واتە خەلکی لەم بارەوە قسەیان کردووە ، ئیتر ئەو شەوە تاکو رۆژ بوویەوە من هەر دە گریام ...!!

ئ

بەلی راویژی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هەندیك لە هاوەلانی سەبارەت بەدوا كەوتنی وەحی ، پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كە بینی وەحی دواكەوت ، بانگی (علی كوری ابو تالیب) و (ئوسامەی كوری زید) كرد ، دوای روا بۆچوونی كرد كە لە خاتوو (عائیشە) جیا بیتەوە ، بە هۆی ئەم بووختانەوە ، بەلام (ئوسامەی كوری زید) باسی پاك و بی گەردی خاوینی خاتوو (عائیشە) ی كرد ، ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خاتوو عائیشە هاوسەری تۆیە سویند بە خوا لە چاك زیاتر هیچی ترمان لی نە بینیوە ..!! بەلام (علی كوری ابو تالیب) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ریگەت لەسەر تەسك نەكراوە تەوە ، ئافرە تی تریش زۆرن ، ئەگەر پرسیار لە كەنیزە كیش بكەیت قسەی راستت بۆ دەكات ، مەبەستی (علی) ئافرەتەكانیش خاتوو (عائیشە) باش دەناسن كە چۆن رەوشتیكی جوانی بی هاوتایی بی وینەی هەیە ..!!

دەفەرموویت : پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردی بە دوای (بەریرە) دا و فەرمووی : ئەی (بەریرە) ئایا شتیكت بینیوە بتخاتە گومانەوە ، (بەیرە) ووتی : نەخیر سویند بەو كەسەی تۆی بەراستی رەوانە كردووە هیچ شتیكی خراپم لی نەبینیوە ... ئینجا پیغە مبەر (صلی الله علیه وسلم) چووە سەر مینبەر و فەرمووی : ئەی كۆمەلانی موسلمانان ،كی پاساوم بۆ دە هینیتەوە لە دژ كەسیك كە ئازاری داوم قەسەی بە یەكیك لە خیزانەكانم ووتوە ..؟! سویند بەخوا جگە لە چاكە هیچم لە خیزانم نەبینیوە ، ئینجا ئەوان باسی پیاویكیان كردووە ،ئەویش جگە لە چاكە هیچ دەربارەی نازانم و هیچ كاتیكیش لە گەل خۆم نەبیت نەهاتووە تەلای خیزانم ، ئیتر (سعدی كوری موعاز ئەنصاری) هەلساو ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) من پاساوت بۆ دەهینمەوە ، ئەگەر ئەو كەسە لە (ئەوس) خۆم لە گەردنی دەدەم ، ئەگەر لە برا (خەزرەجیە كان) بیت فەرمانم پیبكە جیبەجی دەكەین ..!!

دەگیرنەوە دەلین : لە كاتەدا سەرۆكی هۆزی (خەزرەج) (سعدی كوری عوبادە) كە پیشتر پیاویكی چاكە كاریش بوو ، بەلام دەمارگیری پالی پیوە نا ئەو قسانە بكات ، هەلساو بە (سعدی كوری موعازی) ووت درۆت كرد سویند بە خوا ناتوانیت بی كوژیت ، ئینجا (سعد بن حضیر) كە ئامۆزای (سعدی كوری موعاز) هەلساو بە (سعدی كوری عوبادەی) ووت : تۆ درۆ دەكەیت سویند بە خوا دەبیت بی كوژین و ، وە تۆ پیاویكی مونافیقیت و بەر گری لە مونافیقە كان دە كەیت ، ئیتر لەم كاتەدا هەر دوولا لە یەكتر هەلسانەوە و خەریك بوو شەر و فتنە هەلگیر سیت ، پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەر لە سەر مینبە ربوو ، هەر هەولی ئەدا ئارامیان بكاتەوە تاكو ئارام بوونەوە ..

ئ

خاتوو ( عائیشە ) دەفەرموویت : منیش هەر دەگریام و خەوم لی نەدەکەوت ، باوك و دایکیشم هاتنە لام دوو رۆژو شەویك بوو هەر دە گریام و نەدەخەوتم ، فرمیسك ووشك نەدە بوونەوەو ، ئەوانیش ئەترسان گریان جەرگەم ببریت ، دفەرموویت : ئەو کاتەی ئەوان واتە : ( باوك و دایکی ) لام بوون ئافرەتیك لە ئافەرتانی ئەنصاریە کان هاتە لام و ئەویش لەگەلم دا دەستی بەگریان کرد، هەر لەم کاتەدا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هاتە ژوورەوە و و سەلامی کرد و پیشتریش لەلام دانەدە نیشت لەو کاتەوە ئەو قسە کرا بوو ..

بەلی یەك مانگ بەسەر ئەو قسەو باسەی رووداوی بوختان یان ( حادثةالافك ) تیپەری بوو ، بەبی ئەوەی وەحی دابەزیت ، دەفەرموویت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە لە لام دانیشت شایە تمانی هینا و فەرمووی : ( اما بعد ) من هەوالی ئاو هاو ئاو هام پی گەیشتووە ، جا ئەگەر تۆ بی تاوانی ( خوای گەورە ) خۆی پاکت دە کاتەوە ، ئەگەر گوناهیکیشت ئە نجام داوە ، دوای لی خۆشبوون بکە و بگەریرەوە ( خوای گەورە ) لی خۆش دەبیت ،کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) قسەی تەواو کرد ، هەستم کرد یەك دلۆپە فرمیسك نەما ، بە باو کم ووت : وەلامی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بدەرەوە ، ئەویش ووتی بە خوا نازانم چی وەلام بدەمەوە ؟! بە دایکم ووت : وەلامی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بدەرەوە ،ئەویش هەر وای ووت :

خاتوو ( عائیشە ) دەفەرموویت : منیش هیشتان کچیکی مندال بووم قورئانی پیرۆزم زۆر لە بەر نەبوو ، پیم ووتن : سویند بەخوا چاك دەزانم ئیوە ئەم قسە تان بیستووە و باوەریشتان پی کردووە و ئەگەر بلیم من بی تاوانم ، خوایش دەزانیت من لەو کارە پاك و خاوینم ، ئیوە باوەرم پی دەکەن ، سویند بە خوا قسەکەی باوکی یوسف دەکەم : ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾یوسف١٨.

دەفەرموویت : رۆیشتم بۆ سەر جیگاکەم چاك دەم زانی کە پاك و خاوینم و ، ( خوای گەورە ) پاك و خاوینم رادە گریت ، بەلام سویند بە خوا هەر گیز وام نەدەزانی وەحی دادەبەزینیت و بخوینریتەوە و خۆیشم بەلای خۆمەوە لەوە بی بایەخ تر بووم کە ( خوای گەورە ) لەبارەی منەوە قسەیەك بکات بخوینریتەو بەلکو ئومیدم وابوو پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) خەونیك ببینیت ( خوای گەورە ) تیایدا پاك و خاوینم بکاتەوە ..

ێ
خاتوو ( عائیشه ) دەفەرموویت : سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە شوێنە هەڵنەسا ، تاکو ( خوای گەورە ) وەحی بەسەردا دابەزاند و بارێکی نائاسایی بەسەردا هات و وەکو دنکە مرواری تك تك ئارەقەی دەرژاند ، کە ئێمە لە زستانیشدا بووین .

خاتوو ( عائیشه ) دەفەرموویت : کاتێك باری ئاسایی بوویەوە ، خەندەیەکی کرد و یەکەمین وشەی ئەوە بوو فەرمووی : (( يا عائشة اما الله عز وجل فقد برأك )) واتە : ئەی عائیشه ( خوای گەورە ) پاك و خاوێنی تۆی ڕاگەیاند ، دایکم ووتی هەلسە بۆ لای ، منیش ووتم : نەسوێند بەخوا هەڵناسم بۆ لای و ، سوپاسی کەس ناکەم لە ( خوای گەورە ) زیاتر ..!!

ئیتر ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتانەی دابەزاند :

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١١) لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنْفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُبِينٌ (١٢) لَوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ (١٣) وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٤) إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ مَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ (١٥) وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُمْ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ (١٦) يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَنْ تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (١٧) وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١٨) إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (١٩) وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ **النور ١١-٢٠.**

**گرینگ ترین ئەو حوکمانەی لە ئایەتەکانی ( حادثة الأفك ) وەر دە گیرێت :**

١- پاکو خاوێنی خاتوو ( عائیشه ) لەو بووختانەی بۆی کرا ، بە ئایەتێك کە تا ڕۆژی قیامەت دە خوێنرێتەوە ، ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ **النور ١١.**

٢-حیکمەتی ( خوای گەورە ) وای دەخواست کە چاکە و پاداشت لە نێو نارەحەتی و خراپە وە سەرهەلبدات ، چونکە تاقی کردنەوەی خێزانی ( ابو بكر صديق ) ( خوا لێ ڕازی بێت ) بەم بووختانە چاکەی ئەوانی تیا بوو ، پاداشتی زۆریان لەسەر صبرو ئارامی گرتنیان وەرگرت ، کە ( خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ **النور ١١ .**

ێ

٣- پەرۆشی لەسەر ناوبانگی ئیمانداران و و گومانی چاکە بردن بە یەکتر لە نیو یەکتر دا ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنْفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُبِينٌ﴾النور١٢.

٤-بە درۆ خستنەوەی ئەوانەی بووختانیان کرد یان بووختان چیە کان ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ لَوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾النور ١٣ .

٥-ئاشکرا کردنی سۆزو بەزەیی ( خوای گەورە ) بۆ ئیمانداران و کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ النور ١٤.

٦- پیویستی دلنیا بوون لە هەوال پیش بلاوکردنەوەی لە خۆتەوە شت هەل نەبەستی تا دلنیا نەبیت ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُمْ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾النور ١٦ .

٧-قەدەغەکردن و دووبارە کردنەوەی ئەم گوناهە گەورەیە کە بووختانە ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَعِظُكُمَ اللَّهُ أَنْ تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾النور ١٧-١٨ .

٨-قەدەغەکردنی بلاو بوونەوەی هەوالی نابەجی بلاو بوونەوەی خرپە لەناوئیماندراندا ، کە

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾النور ١٩ .

٩-روونکردنەوەی چاکەی ( خوای گەورە ) لەگەل بەندە ئیماندارەکانی و سۆز بەزەیی لەسەریان ئەووشی دووپات کردووە تە وە ، کە دەفەرموویت : ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾النور ٢٠.

١٠-قەدەغەکردنی شوینی پی هەلگرتنی شەیتان کە موسلمانان بەرەو هیلاکی هەلدیر دەبات ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَنْ يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾النور ٢١ .

## هاوسەر گیری پیغەمبەر ( ﷺ ) لە گەل ( زینب کچی چحش )

بەلی هاوسەر گیری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە گەل ( زینب کچی چحش ) هەندی حوکم و وانەو پەند لە خۆ دە گریت ، بەلی ( زینب کچی چحشی کوری ریئابی کوری یەعمودی ئەدسەدی )، کە دەکاتە خوشکی عبدالله ی کوری چحش ، دایکی ( زینب ) ( ئومە یمەی کچی عبدالمطلب ) کە دە کاتە پووری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کەواتە ( زینب ) کچی پوری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بوو ، وە دە کاتە خوشکی ( حمزەی کوری ابو تالیب ) کەدە کاتە مامی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) واش دە گیرنەوەی دەلین ( زینب ) خۆی ناوی ( بررە ) بووە ، بەلام پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ناوی ناوە ( زینب ) هەروەها نازناوی ( أم الحكمى ) هە بووە .. چونکە چاکەو صەدەقەی زۆری هەبووە کە ( عائیشە ) داکی ئیماندارارن دەلی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( اسرعكن لي لحقا بي اطولكن يدا ، قالت : فكن بتطاولن ايتهن اطول يدا ، قالت فكانت اطولنا يدا زينب لانها كانت تعمل بيدها وتصدق )) . رواه مسلم في فضائل الصحابة ١٩٠٧/٤، رقم ( ٢٤٥٢ ). واتە : یەکەم کەس لە ئیوە پاش مردنم پیم دەگات ، ئەو کەسەیە کە خیرو چاکە زۆر دەکات ، عائیشە دەفەرموویت : خیزانەکانی خۆیان هەلدە نا کامیان چاکەیان زۆر ترە ، جا لە هەموویان چاکە کار تر ( زینب ) بووە ، چونکە بەدەستی کاری دەکرد وصەدەقەشی دەکرد ، هەروە ها ( عائشە ) ( خوا لی رازی بیت ) ستایشی کردووە وە وتویەتی کەسم نەبینیوە ئەوەندی ئە و چاکە کار بەلام تووڕەیەکی تیادابوو زوو لی پاشگەز دەبوویەوە..

بەلی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ویستی جیاوازی چینایەتی لە ناو ببات و نەهیلیت ، بۆ ئەوەی هەموو خەلکی یەك سان بن ، چونکە لەسەردەمی نەفامیدا جیاوازی چینایەتی هەبوو ، ئەویش بەندەی کۆیلە و بەندەی ئازاد ،یان بە کور کردن هەبوو ، بەلام ( زیدی کوری حاریسە ) یەکیك بوو لە بەندە کۆیلە کان ، دواتر پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) خۆی ئازادی کرد ، ئە چینایەتیە نەهیشت لە نیو موسلمانەکان ، لە هەمان کاتدا بەندەی خۆی بوو ، کە ئازادی کرد ، وە هەروەها کردبووی بە کوری خۆشی ، هەر بۆیە بەباشی زانی کە ئافەرتیکی ئازاد بەریز خاوەن رەوشتی بەرز خاون نەسەبی چاك لە ( زیدی کوری حاریسە ) مارە بکات ، ئەویش ( زینب ی کچی چحش ) بوو ، کە دە کاتە کچی پووری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەر بۆ ئەوەی جیاوازی چینایەتی لە ناو بچیت ...

ئ

له هەمان کات دا ئەم جیاوازیە چینایەتیە ئەوەندە رەگ دار بوو، له ناو کۆمەلگای عەرەبی دا زۆر ببە ئەستەم ریشە کیش دە کرا ، بەلام پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) توانی بەم کردارە جوانە ، ئە م چینایەتیە نەهلیی کەم بیکاتەوە بەجۆریك کە هەرگیز عەرەبی لەو سەردەمدا بیری لی نەدە کردەوە ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ بە پیشەنك بۆ نەوەی داهاتوودا ، بەلی کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) خوازبینی ( زینب ی کچی چحشی ) کرد بۆ ( زیدی کوری حاریسە ) لەم کاتەدا ( زینب ی کچی چحش ) رازی نەدە بوو..؟! پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دوای لی کرد رازی بیت ، تاکو ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابە زاندە خوارەوە ،کە دەفەرموویت : ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا﴾ **الاحزاب ٣٦** .

واتا: بۆ هیچ پیاویك یان ژنیك ئیماندار نیە کاتیك کە پیغەمبەرە کەی ( صلی الله علیه وسلم ) بریاری شتیك بدەن یان کاریك بدەن ، ئەوان سەر پشك بن لە ئە نجامدانی ئەو کارە ، چونکە ئەوەی سەرپیچی بکات لە فەرمانی خوا و پیغەمبەرەکەی ﷺ ئەوا ئیتر بە ئاشکراو و گومراوە سەر لی شیواوە ..!!

ئینجا لە دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ( زینب ی کچی چحش ) بە ( زیدی کوری حاریسە ) رازی بوو ، هەر وەها ووتی : سەرپیچی فەرمانی خواو پیغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) ناکەم ، وە بە ( زیدی کوری حاریسە ) رازیم شووی پی بکەم ..!!تفسیری التبری ( ١/٢٢ ) .

بەلام ( زیدی کوری حاریسە ) تا ئەو کاتەش بە ( زیدی کوری محمد ) ( صل الله علیه وسلم ) ناو دە برا ، چونکە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە کوری خۆی دانا بوو .

ئیتر لە و کاتەدا ( زید کوری حاریسە ) ( زینب ی کچی چحشی ) مارە کرد ، مارەیەکەشی ، لە ( ١٠ دینارو ٦٠ درەهەم و سەر پۆشیك و ٥٠ مەست لە خۆراك ١٠ مست لە خورما ) بووە.

ئ

بەلی دوای مارەکردن ویستی ( خوای گەورە ) وەها بوو ( زید ی کوری حاریسە ) و ( زینب ی کچی چحش ) پیکەو نا تە با بن لە گەل یەکتری لە رووی ژن و میردایەتی هاوسەر گیریان ، هەر بۆیە ( زیدی کوری حاریسە ) بریاری دا کە لە ( زینب ی کچی چحش ) جیاببنەوە ، بەلام پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم هەوالەی زۆر پی نا خۆش بوو ،هەولی زۆری لە گەل دان کە لەیەکتر جیا نەبنەوە و فەرمانی پی دە کردن ، لەخوا بترسن ، بەلام ئەم کیشەیە تی پەری پاش تیپەر بوونی یەك سال – وەك ( ابن کثیر ) دەفەرموویت : ( ناکۆکی زیادی کرد لە نیوانیان دا لە یەکتر جیا بوونەوە ، لە کاتیك دا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەر ئامۆژگاری دە کردن کە ئەو کارە ئە نجام نەدەن ). تفسیر ابن کثیر ٣/٤٨٩ .

بەلی لە دوای دا حیکمەتی هاوسەر گیر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لەگەل ( زینب ی کچی چحش ) کەدەکاتە کچی پووری خۆی ، ئەم مەسەلەیە زۆر حیکمەتی تیدا بوو ، یەکەم بە کور کردن یان ( التبنی ) زۆر رە گی کیشا بووە لە ناو کۆمەلگەی عەرەبی دا ، لە دل و دەروونی خەلکیدا ریشە کیش کردنی زۆر ئاسان نەبوو ، هەر لە سەرە تای ئیسلامیش دا لە شاری مککە زۆر باو بوو ، هەروەها لە سەرتای کۆچ کردنیش بۆ شاری مەدینە ، بەلام ( خوای گەورە ) فەرمانی ئاوا بوو، کە ویستی ئەم مەسەلەیە نە هیلیت ، بەکور کردنی خۆ ، بە تەنها بەناوی باوکی راستەقینەی خۆی بانگ بکریت ، هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾ **الاحزاب ٤** .

واتا : ( خوای گەورە ) دوو دلی دروست نەکردووە لە دەروونی هیچ کە سیکدا ، دوو بیرو باوەر جی نابیتەوە ، کەواتە هاوسەرانیشتان کە بەدەم پییان دەلین : ئیوە لەجی دایکمانن ) بەو قسەیە ناینە دایکتان ئەوانەش بە کوری خۆتانی دەزانن لە کاتیکدا راستیە کەی وا نیە ، حەق ویژەو هەر ئەو ریبازی راست و دروست ،نیشانی بەندەکانی دەدات ..

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ **الاحزاب ٥** .

واتا : ئەو کورانە بە ناوی باوکی خۆیانەوە ناویان بەرن و بانگیان بکەن ئەوە پەسنەندە لای خوا ، ئەگەر باوکی تان نەدەناسی ، خۆ برای ئاینی تانن ،سەر بە ئیوەن لە ئیوە و ئەگەر دوور لە سوو کایەتی ) هەلە یەکتان کرد ئەوە قەیناکات ، بەلام ئەگەر لە دلتاندا ، نیە تیکی ناپاك هەبیت بۆ سووکایەتی پی کردنیان ئەوە لیپرسینەوەی دەبیت ، هەمیشە و بەردەوامیش خوا لی خۆشبوو میهرەبانە لە هەلە کانتان دەبووریت ، ئەگەر لی پەشیمان بنەوە..

ئ

هەروەها لە ( عبداللە ی کوری عمرە ) وە دەلی : کە بانگی ( زید ) یان هەر بەو شیوەیە دەکرد کە ( زید ) ی کوری محمد ( صلی اللە علیه وسلم ) تاوکو ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی نارده خواره وه ﴿ادْعُوهُمْ لِآَبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ﴾ الاحزاب ٥ . رواه البخاری فی التفسیر ٣/٢٧٦ .

هەروەها لەم فەرموودەیە ی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) دا هاتووە ریگری یان قەدغەکردنی ئەوەی کوریك خۆی بە کوری کەسیك بزانیت جگە لە باوکی راستەقینەی خۆی ..!! پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) دە فەرموویت : (( ومن ادعى الى غير ابيه او انتمي الي غير مواليه فعليه لعنة الله والملائكة والناس اجمعين و لا يقبل الله منه يوم القيامة صرفا ولا عدلا )) . رواه مسلم ( ١٣٧ ) . واتە : هەر کەسیك کەسیکی تر جگە لە باوکی خۆی بە باوکی خۆی بزانیت و یان خۆی بداتە پال کەسانیکی تر جگە لە سەر پەرشتیارانی ، نە فرینی خوا و فریشتە کان و هەموو خەلکی لەسەر بیت ، ( خوای گەورە ) نە فەرزو نە سوننەتی لی قبول دەکات ..!!

بی گومان ئاینی ئیسلام هۆیەکی تری داناوە ،بۆ نەوەو رەچەلە کو نەسب و حسب ئەویش ئەمەیە کەلەریگایی هاوسەرگیری کردن و نیکاحیکی پاو بیگەرد بیت ، واتە : مەرجەکانی هاوسەر گیری تەواوی تیدا بەدەی بکریت ، لە ریگای شەرعی ئاینی ئیسلامەوە بیت ، دوور بیت لە داوین پیسی و بەد رەوشتی نی کاحی نا دروست ، لە ریگەیەوە باوکایەتی راستەقینە بەدی دەکریت کە باوك کوری خۆی دەناسیتەوە کوریش باوکی خۆی دەناسیتەوە ، لە ئیستا دا دیارە ولاتانی رۆژئاوا بەم دیاردەیە دەنالینن وا خەریکە کۆمەلگایەکانیان ویران دەبیت کەس کوری خۆی نەناسیت کور باوکی خۆی نەناسیت ، ئەمەش بە هۆی ئە نجامدانی بەد رەوشتی و داوین پیسی ، دوور کەوتنەوەیان لە هاوسەرگیری شەرعی کە خوا و پیغەمبەرەکەی فەرمانیان کردووە ، دەبیت بەشیوازیکی شەرعی هاوسەر گیری ئە نجام بدریت ..!!

هەروە ك ئەم فەرموودەیە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) کە دەفەرموویت : (( الولد للفراش وللعاهر الحجر )) واتە : هەر مندالیك دیت بەرهەمی پەیوەندی نیوان ژن و میردە لەسەر جیگای شەرعی ، بەلام هاتنی منال بە ریگەی تر دەبیتە مایەی بەرد بارانی ئەو کەسە کە منالە کەی دە هینیت )).

ئ
هەر وەها ( خوای گەورە ) دەفەروویت : ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا﴾ **الاحزاب ٣٧** .

واتا: تۆ ئەی محمد ( صلى الله عليه وسلم ) کاتی بەو کەسەی کە ( زيد ) ە وە خوا نیعمەتی ئیمانی پی بەخشیوە ، تۆش نیعمەتی ئازادیی و پەروەردەت لە نزیکی خۆتەوە پیداوە دەلیت : هاوسەری خۆت بهیلەرە وە لای خۆت ك ( زينب ) بە لە خوا بترسەو ( تەلاقی مەدە ) وە شتیك لە دل دەروونی خۆتدا دەشاریتەوە کە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات ، لە خەلکی دەترسیت ، لەبەر ئەوە کاتی ( زيد ) خواستی بوو بە هاوسەری پاشان ریك نە کەوتن و جیابوونەوەی تەلاق کەوتە نیوانیان ، ئیمە ( زينب ) مان لە تۆ مارە کرد ، بۆ ئەوەی هیچ جی پی لیژ بوون و دلتەنگییە ك بۆ ئیمانداران دورست نەبیت ، لە هینانی هاوسەرانی بە ناو کوریان کاتیك کە پیشتر هاوسەر و حەلالیان بوون ، فەرمانی خواش دەبیت جی بەجی بکریت ..!!

بەلی ئەمەش پلە یەکی شانازی و سەر بەرزییەکی گەورە بو بۆ ( زينب ) کە خۆی پی هەلدەنا لەسەر هاوسەرە کانی تری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کە دەی فەرموو : ئیوە هەمووتان کەس و کارەکانتان بە شووی داون ، بەلام من ( خوای گەورە ) لەسەر حەوت ئاسمانەکانەوە کردوومی بە هاوسەری پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) . رواه البخاری فی الباب التوحيد و وكان عرشه و على الماء٣٨٨/٤.

لەوانەشە ئەم ریز و پلە و پایە بۆ ( زينب ) وەکو پاداشتیك بیت بۆی ، کاتیك گویرایەلی فەرمانەکانی خوا و پیغەمبەرەکەی بوو ،بۆ شوو کردن بە ( زيد ) ،چونکە بی ئەوەی حەزی پی بکات و فەرمانەکەی جی بەجی کرد .

ئیتر لەم هاوسەر گیریە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە گەل ( زينب ی کچی جحش ) معجیزە یەکی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) روویدا ئەویش ئەوە یە کە ، ( ئەنسی کوری مالیك ) بۆ مان دە گیریتەوە دەفەروویت : (( کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) خیزانی گواستەوە ، دەلیت : دایکم خواردنیکی دورست کرد و میش لە مە نجەلیك بردم ووتم : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دایکم سەلامت لی دە کات ، ئەم خواردنەی بۆ نار دوویت و دەلیت هەر چەندە کەمیشە بۆ بەریزتان ...

ئیتر پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پێی فەرمووم : داینێ ، ئیجا پێی فەرمووم : فلان و فلانم بۆ بانگ بکە و هەر کەسێکیش چاوت پێکەوت لە ڕێگا بانگی بکە ، ئیتر ( ئەنسی کوری مالیك ) ( ٣٠٠ ) کەسی بانگ کرد ، مال و مەزگەوت پڕ بوو لە خەڵکی ، پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : با ١٠ کەس١٠کەس بە یەکەوە کۆببنەوە ، هەر یەکەو لە پێش خۆیەوە نان بخوات ، ئیتر پاش ئەوەی هەموویان تێر بوون ، خواردنەکەم بەرز کردەوە نازانم سەرەتا زۆر تر بوو یان پاش ئەوەی خەڵکەکە لیان خوارد زۆر تر بوو ،ئینجا کەسانێك لە مالی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) مانەوە قسەو گفتوو گۆیان دەکرد ، پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )دانیشت و خێزانیشی ڕووی لە دیوارەکە بوو ، دەر چوو بۆ لای خێزانەکانی و گەرایەوە هەر دانیشتبوون ، ئەوانیش هەستیان کرد قورسن لەسەر پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەر چوون هەموویان ، ئینجا پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هات پەردەکەی داخست و چووە ژوورەوە ، زۆری پێنەچوو هاتە دەرەوە و ، ئەم ئایەتە پیرۆزەی ( خوای گەورە ) هاتە خوارەوە دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنْكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَنْ تَنْكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمًا﴾ الاحزاب ٥٣ . واتا : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ، مە ڕوون بۆ سەردانی مالە کانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) مەگەر مۆڵەتتان بدرێت و مۆڵەت بخوازن ، ئەگەر مۆڵەت دران بۆ نا نخواردنێك چاوەڕێی پێگەیشتنی مەکەن ئەگەر پێنەگەیشتبوو ،مەبەست ئەوەیە کە زوو مەچن کە هێشتا خواردنەکە پێنەگەیشتووە ، بەلام بانگ کران ئەوە بچنە ژوورەوە ، خۆتان بە گفتو گووە سەرگەرم مەکەن ، چونکە ئەو کارەتان پیغەمبەر ئازار دەدات ، هەر چەندە شەرمتان لیدەکات و دوای چوونە دەرەوەتان لی ناکات ، بێ گومان خوا شەرم لە ڕاگەیاندن حەق و دروستی نا کات خۆ ئەگەر دوای شتێکی پێویستان لە خێزانەکانی پیغەمبەر کرد ، لە پشتی پەروەردە داوای لی بکەن ، ئا ئەو جۆرە رەفتارە چاکتر و پاکترە بۆ دلی ئێوە و ئەوانیش ، بێ گومان هیچ کات بۆ تان نیە ئازارو دلتەنگی بۆ پیغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) پێش بینن ، هەر گیز بۆ تان نیە هاوسەرانی دوای خۆی بە هیچ جۆرێك مارە بکەن ، چونکە ئەو کارەتان لای خوا زۆر گەورەیەو زۆر نا بەجێیە ،چونکە ئەوان دایکتانن ، دایکیش لەرۆلەی حەرامە ..!! بەلی لە پاش دابەزینی ئەم ئایەتە ئیتر پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) خێزانەکانی داپۆشی واتا : ئایە تەحانی حیجاب دابەزی ، بەلی خێزانەکانی خۆی داپۆشی لە خەلکی . رواه البخاری فی التفسیر ٩٢/٦ رقم ٤٧٩٠ .

ئ

## هاتنه خوارەوەی ئایە تەکانی حیجاب یان پەردە

ووشەی ( حیجاب ) کە ئیستا بە مانەای پۆشاکی ئافرەتان بە کاری دە هینین ، بەلام حیجاب بە مانای پەردە دیت لە زمانی عەرەبی دا ، هەر وەها لە قورئانی پیرۆز دا ئەم ووشە یە هاتووە بە مانای پەردە ، دە بوویە خیزانە کانی پیغەمبەری پەردە لە نیوانیان بیت کاتیك قسە لە گەل پیاواندا بکەن ، کە پیشتر وانە بوو ، هەروە ك ئەو کاتەی کە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ( زینب کچی چحشی ) گواستەوە خەلکیکی زۆری کۆ کردبوونەوە بۆ ئاهەنگی گواستنەوەکەی نان خواردنیان لە مالی پیغەمبەری خوا دا ( صلى الله عليه وسلم ) گفتو گوکردنی ئیمانداران لە گەل یەکتری لە مالی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دا ، هەروەها لە صحیحی بوخاری دا هاتووە کە رۆژیك ( عمری کوری ختاب ) – خوا لی رازی بیت – گوتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) چاك و خراپ دینە مالە کە تەوە ، ئەگەر فەرمان بکەی بە دایکی ئیماندارانەوە ،کە پەردە بگرن یان نیوان خۆیان و ئەو کەسانەی دینە لات پەردە هە بیت ، لە پشت پەردە نەبیت قسە لە گەل پیاوە کان دا نەکەن ، واتە : پیشتر موسلمانان ژمارەیان کەم بوو بەلام ئیستا زۆرن چاك و خراپ دینە مالە کەت ، خەلك پۆل پۆل دینە مالەکەت جەندین جۆریان تیدایە هەیانە نەزان یە یانە ژیرو عاقل هەشیانە مونافیق ....هتد با ئەوانەخیزانەکانی تۆ نەبینن ..؟! صحيح البخاري ( ٧٤٢٠ ) .

هەروەها هەندیك لە دەروون پیسە مونافیقە کان ووتیان ئەگەر محمد مرد ئیمە دەبیت ژنەکانی مارە بکەین ، لە سەر ئەم قسەیە ئەم ئایە تە دا بەزی لە سورەتی الاحزاب دا کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :

﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَنْ تَنْكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمًا﴾الاحزاب٥٣

. هەر گیز بۆ تان نیە هاوسەرانی دوای خۆی بە هیچ جۆریك مارە بکەن ، چونکە ئەو کارەتان لای خوا زۆر گەورەیەو زۆر نا بەجییە ،چونکە ئەوان دایکتانن ، دایکیش لەرۆلەی حەرامە ..!!

ی
بەلی ئەمە فەرمانی قورئانی پیرۆزە بۆ دایکانی ئیمانداران بوو لەبەر ئەوەی کە ئەوان پایە دار ترن ، بۆیە باوکان و کوران و خزمان بە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) یان وت : ئیمەش لە پشتی پەردەوە قەسەیان لە گەل بکەین ؟ ئەوە بوو ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە : کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ وَاتَّقِينَ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ الاحزاب ٥٥ .واتا :ئافرەتان چاو پۆشیان لی دە کریت قەیناکە با باوانیان بیانبینن ،یان کورەکانی خۆیان ، یان براکانیان ،یان برازاکانیان ،یان خوشکە زاکانیان ویان ئەو ئافرەتانەیان کەئیشیان بۆ دە کەن لە مالدا ،یان ئەو کەسانەی کەلە مالە کانیاندا دەژین ، لە خوا بترسن ئەو سنوورانەی کە بۆی داناون مەیشکینن ، بیگومان شایە تە بەسەر هەموو شتیکەوە ..!!

هەروەها ئیمامی ( ترمزی )و ( بەززار ) لە ( عبدالله کوری مسعوود ) وە –خوا لی رازی بیت – تخریجی کردووە ، کە دەفەرمووی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( إن المرأة عورة ، فإذا خرجت من بيتها استشرفها الشيطان ، وأقرب ما تكون من رحمة ربها وهي في قعر بيتها )). واتە : ئافرەت عورەتە ، کە لە مال دەر ئەچیت شەیتان دەری ئەخات و ئەی رازینی تەوە و و نزیك ترین کاتیشی کە لە رەحمەتی خواوە نزیك بیت ، ئەو کاتەیە کە لە ناو جەرگەی مالە کەی دا بیت .

هەروەها ( بەززار ) لە ( ئەنسی کوری مالیك ) وە تخریجی کردووە – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ئافەرتان هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) و ووتیان :ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پیاوان بە جیهاد لە پیناوی خوا دا پیشی ئیمە یان دا یتەوە ، ئایا کردەوەیەکیش هەیە کە ئیمە ئە نجامی بدەین تا بگەینە پایە و پلە ی ئەوانەی کە لە پیناوی خوادا جیهاد دەکەن ..؟! پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( من قعدت منكن في بيتها فإنها تدرك عمل المجاهدين في سبيل الله تعالى )). واتە :بەلی هەرکام لە ئیوە ئافرەتان لەمالەکەی خۆی دا بە حەیا و حورمەت دابنیشی ئە وا پاداشتی ئە گاتە پاداشتی ئەوانەی کەلە پیناوی خوادا جیهادیان کردوو ..!!

ئ

## ماره كردنی ( ام حبيبه )

بەلی بە پی بۆ چوونی ( ابن كثير ) ، پيغەمبەری خوا ( صلی الله عليه وسلم ) دايكی ئيمانداران خاتو ( رمله ی كچی ابو سفيانی كوری حربی كوری ئومەيەی كوری عبدالشمس ) ماره كرد ، كه دايكيشی ناوی ( صەفيەی كچی ابوالعاصی كوری ئومەيەيە ) پيش هاتنی وەحی بە ( ١٧ ) سال لە دايك بووە ، ئەوە بوولە سەرە تادا ( ام حبيبه ) هاوسەری ( عبدالله كوری چحش ) بووە ، ( عبدالله ) كوری پۆری پيغەمبەر ( صلی الله عليه وسلم ) بووە ، ئەم هەردوو بەريزە واتە ( عبدالله و أم حبيبه ) دوای موسلمان بوونيان كۆچيان بۆ حەبەشە كرد ، لەويدا كچكيان ئەبيت ناوی دە نين ( حبيبه ) هەر بۆ يە پی ئەووترا ( ام حبيبه ) ووتراويشە ئەو كچە پيش كۆچ كردن بۆ حەبەشە لە دايك بووە ، لە پاشاندا ( عبدالله ی كوری چحش ) ئەبيتە گاور يان نصرانی ، هاوسەرەكەی لە سەر ئاينی ئيسلام ئەمينيتەوە ، لە دوای ئەوەش ( عبدالله ی كوری چحش ) ئەمری .. ديارە ئەم ئافەرتە كچی ابو سفيانی سەر گەورەی قورەيش بووە ، بگرە گەورەی هەموو دوورگەی عەرەبی بوو ، ئەم ئافرەتە پايە بەرزو خاوەنە عە قل ژيرە وازی لە باوكی هينابەدوای ئاينی راستی حەق كەوت كۆچی بۆ حەبەشە كرد لە سەر ئەم ئاينە پيرۆزە ، هەر لە حەبەشەدا ميردەكەی هەلگەريتەوە لە ئيسلام و دواتر دە مری ، بی كە س ئەمينيتەوە بەلی ئەمە ئەو پەری لی قەوماويە ، شاينی ئەوەيە كە هاوسەريكی گونجاو بۆ خۆی هەلبژيريت خوای گەورە بەقسمەتی بكات ، بەلی كاتيك حەدی تەواو بوو دوای مردنی ميردەكە ، پيغەمبەری خوا ( صلی الله عليه وسلم ) نامەی بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە رەوانەكرد ، نووسی تا لی ماره بكريت ، ووتراويشە بۆ ئەم كارە ( عمری كوری ئومەيەی ضمري ) ناردووە ئينجا نەجاشی كارە كەی بۆ ئە نجام داوە ، لە بری پيغەمبەری خوا ( صلی الله عليه وسلم ) بەلی ( ٤٠٠ ) دينار مارەيی داوە ، بەلی ( خاليدی كوری عاص ) كە ئامۆزای ( ام حبيبه ) بوو بۆی ماره بريوە ..

( ام حبيبه ) لە حەبەشە مايەوە هە تاكو لە سالی ( ٧ ) كۆچی دا لە گەل موسلمانان دا گەرانەوە بۆ شاری مەدينە، بەلی ( ام حبيبه ) دايكی ئيمانداران لە سالی ( ٤٤ ) كۆچی دا لە شاری مەدينە كۆچی دوای كرد ..!!

ئ

## فەرز کردنی( حەج ) ی مالی خوا

بە لە سالی (٥) کۆچی دا بەپیی بۆچوونی زۆریك لە زانایانی ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ال عمران ٩٧ . واتا : جا (خوای گەورە ) بریاری داوە لەسەر خەلکی (حەج ) بکەن و سەردانی (بیت الحرام ) بکەن بە تەنها ئەوانەی کە توانای دارایی و تەندروستیان هەیە ..!! بەلی بە بۆچوونی ئیمامی شافعی فەرز کردنی (حەج ) لە سالی (٦) کۆچی دا بووە ، هەروەها فەرز بوونی (حەج ) بە ئایەتەکانی قورئان سوننەت بە ئیجمعا چەسپاوە و ثابت بووە ، بە رادەیەك کە یەکیك لە رووکنە کانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، پیویستە هەموو موسلمانیك ئاگاداری بیت ، ئەوەی توانای دارایی هەیە توانای تەندورستی هەیە دە بیت ئە نجامی بدات ، بەلی ئەوە بوو کە إبراهیم پیغەمبەر لە گەل اسماعیل ی کوری (سلاوی خوا یان لی بیت ) (کەعبەی پیرۆزیان ) دروست کرد ، پاشان (خوای گەورە ) فەرمانی پی کردن کە لەسەر کیوی (ابو قوبەیس ) لە شاری مککە دا بووەستی ، خەلك بانگ بکات بۆ (حەج ) إبراهیم سەری سورما فەرمووی : ئەی پەروەردگارم جا دەنگی من بە کوی ئە گات ؟!

(خوای گەورە )ش فەرمووی : ئەی إبراهیم !، تۆ جار بدە منیش ئەم دەنگەی تۆ دە گەیەنم ،إبراهیم جاری دا و فەرمووی : ئەی خەلکینە ! (خوای گەورە ) (حەجی ) لەسەر تان فەرز کردووە ، دە بین حەج بکەن ، ئەوە بوو (خوای گەورە ) دەنگی ابراهیمی گەیاند بەوانەی کەلەپشتی پیاوان و ولەرحمی دایکان ،وە لە جیهانی (ذر ) دان پیش ئەوەی بن ، لە و رۆژەوە تا ئاخر زمان (خوای گەورە ) کیی ویستبی حەج بکا ، هەر هەمووی یان وەلام ئەدەنەوە و ئەلین : (( لبيك اللهم لبيك ،لبيك لا شريك لك لبيك . إن الحمد والنعمة لك والملك ،لا شريك لك ))بەلی بی گومان حەج حیکمەتی زۆری هەیە بۆ بەندەی موسلمان ، یەکیك لەو حیکمەتانەی حەج ئەوە بریتیە لە کۆبوونەوەی سالانەی موسلمانان لە سە رتا سەری جیهاندا ، لە هەموو گۆشەیەکی سەر زەوی موسلمانا ن رووی تی دەکەن ، لەدوای بەدی هینانی کاروباری حەج کردن لە خۆشی و ناخۆشی موسلمانانی سەر زەوی ئاگادار دە بەن ، هەروەها موسلمانان بە پی توانا یارمەتی موسلمانان دەدەن نەخشە بۆ باش کردنی کاروباری موسلمانان دەدریت لە ناوە خۆیاندا بە پی توانا ،هەر وەها یەکیکی تر لە حیکمەتەکانی (حەج ) ئەوە یە دە بیتە پاکردنەوەی دل دەروونی موسلمانان لە هە موو گۆشەیەکی سەر زەوی دا ئەوانەی فەرزەی حەجیان بە جی هیناوە بە نیەتیکی پاك و اخلاصیکی پك بۆ خوا ،چۆنکە ئەو کەسەی کە بچیتە ئەم شوینە پیرۆزە هەست بە دەلیك فرەوان رووحیکی پاك و بیگەرد دەکات ، وە ئەوەیە دل بفری لە خۆشی دا ...

ئ

هەروەها ئەم شوینە پیرۆزە هەموو یەك جل و بە رگیان لەبەر  دا پۆشیوە هەر ئەلی شوینی مەیدانی مەحشەرە ، بەلی بی گومان ئەم شوینە شوینی تقوا و دوعاو پارانەوەی موسلمانان بۆ خۆ پاکردنەوەیان،

بەلی بی گومان ئەم شوینە شوینی یەکسانی مرۆڤەکانی سەر رووی زەویە چونکە لەم شوینە دا هەر هەموویان یەك داوایەان هەی لە خوای پەروەردگار ئەویش لی خۆش بوونیانە پارانەوەیان لە ( خوای گەورە )دا ئیتر ئەم شوینە شوینی تەوحید و یەکتاپەرستیە ، بەهیچ شیوەیەك پەرستن بۆ دار بەردن ناکریت تەنها لەم شوینەدا پەرستن بۆ خوای پەروەردگار دا ئەکریت تەنها دوعاو پارانەوەکانیان بۆ ( خوای گەورە ) یە هەروەك ( عمری کوری ختاب ) –خوا لی رازی بیت – وە ئەوەی بیری موسلمانان بخاتەوە کە نەکەن بت پەرستی تیکەل بە ئیسلام بی گەرد بکەن ، ئەی فەرموو : بەردە رەشکە ! من ئەزانم تۆ بەردیت نە زیانت لایە و نە کلك، واتە : ( نە نفع ت هەیە نە ضر ) خۆ ئەگەر لە بەر ئەوە نەبوایە چاوم لی بوو پیغەمبەری خوا ماچی دەکردی ماچم نەدە کردی .السیره النبویه لابی شیبه : ٢/٢٩٤ –٣١٨ .

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار ئا لەم کاتەی موسومی حەجە یان فەرزەی حەجە من لە نووسینەوەی ژیانی رۆشنایی چاومان دا گەیشتمە ئەم شوینە کە فەرز کردنی ( حەجی ) مالی خوا یە ، ئیتر ئیستا لە ١/ذو الحجة ١٤٤٣هجري کە دە کاتە رۆژی پینچەشمەی ٢٠٢٢/٦/٣٠ زاینی دا ، لە کاتی نووسینی ژیانی رۆشنایی چاوماندا ، هەروەها گەیشتنی بە رووداوی فەرز کردنی ( حەج ) لە لایەن ( خوای گەورە ) وە کەل لە سالی ( ٥ ) ی کۆچی دا بووە بەلام ئیمامی شافعی دەفەرموویت: لە سالی ( ٦ ) کۆچی دا بووە فەرز کردنی حەج ..!!

## غەزای ( بني المصطلق ) و رووداو کانی

بەلی بی گومان بابزانین کە ( بني المصطلق ) کین ؟! کەی ئەم غەزایە روویدا هۆکارەکەی چی بوو ؟ بەلی ( بني المصطلق ) تیرەیەك بوون لە هۆزی خوزاعە وە ( بني المصطلق ) یش باپیریانە کە ناوی ( جذيمة بن سعد بن عمرو بن ربيعة بن حارثة بن عمر بن عامر ماء السماء ) بووە . حديث القران غزواة الرسول ٣١١/١ .

**هۆکارەکانی ئەم غەزایەی ( بني المصطلق ) :**

أ- پشتگیری کردنی ( بني المصطلق ) بۆ هۆزی قوریشی دوژمنی ئیسلام و دوژمنی شاری مەدینە ، وە بەشداری کردنیان لە جەنگی ئوحودا .

ب-زالبوونی ( بني المصطلق ) بەسەر هیلی و سنووره سەرەکیە کان بۆ شاری مککە ، بۆیە ببوە بەر بەستیکی بە هیز بۆ سوپای موسلمانان بۆ شاری مککە . بە مانای ئەوەی هەر چالاکیە کی سەربازی هەبوویە ئەوان هەوالە کەیان دە گەیاندە قورەیش لە شاری مککە ریگریان دە کرد لە چالاکیە سەر بازیە کانی سوپای ئیسلام .

ج- پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەوالی پی گەیشت لە هەوالگەریە کانی سوپای ئیسلام ، کەوا هۆزی ( بني المصطلق ) هیزی زۆر کۆدەکەنەو بۆ هیرش کردنە سەر سوپای موسلمانان ، بە سەرکردایەتی ( الحارث بن ابي ضرار ) بۆیە هەر بۆیە دەر چوون بۆ رووبە روو بوونەوەیان و بە یەکگەیشتن لەسەر ئاویك ( المرسيع ) پی دە ووتریت لە ناوچەی ( قديدی ) لای روخی دەریایی سوور ،وە شکستی گەورەی پی هینان .

بەلی بی گومان کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەوالی جموجۆلی ( بني المصطلق ) زانی هەلسا بە ناردنی ( بريده بن المصيب الاسلمي ) بۆ دلنیابوون لە نیازی ( بني المصطلق ) دا، بەلی کە ( بريده بن المصيب لاسلمي ) چوو بۆ هەوال زانی نیان هەوالە کە بە باشی بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بهینیتەوە ، کاتیك چوو بۆ ناو هۆزی ( بني المصطلق ) وای بۆ دەر خستن هاتووە بۆ یارمەتی دانی هۆزەکەیان ، هەر بۆیە لە هەوالە کەدا بە تەواوی دلنیا بوو ، کە لە رۆژی دووشەمەی لە دووی شەعبانی سالی پینچەمی کۆچی دا پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە شاری مەدینە دەرچوو لەگەل سوپای ئیسلام دا ، کە ( ٧ ) هەزار جەنگاوەرو ( ٣٠ ) سوار بوون ، بەرەو لای ( بني المصطلق ) چوون ...

ئینجا لە بەر ئەوەی ئەوان بانگەوازی ئیسلامیان پێ گەیشت بوو ، لە جەنگی ئوحدیش دا بەشداریان کردبوو ، هەر بۆیە وەك لە بوخاری داهاتووە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە نا کاو هەڵمەتی کردە سەریان سەربازە کانی ( بني المصطلق ) یان کوشتن ژن ئافەرتەکانی شیان بە کۆیلە گرتن و یەکیك لە ئافرە تانەی( بني المصطلق ) ( جویرة بنت حاریثة ) بە کۆیەلە دەستی بەسەر داگیرا ، کە ئەویش یەکیك بووە لە دایکیانی ئیمانداران _خوای گەورە لی رازی بیت - ..!! بەلی لەم غەزایە دا مونافیقە کان رۆلیان هەبوو لە ئاژاوە نانەوە نیوان موسلمانان ، دروست کردنی فیتنە وئاشووب لە نیوانیان دا بە تایبە تی کۆچ کەران و ئەنصارە کان، بەلی مونافیقە کان بە وە نەوەستان بوختان بۆ دایکانی ئیمانداران بکە ، قسەی نەشیوا هەلبە ستن بۆ خاو خیزانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئەوەی کە سایەتی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لکەدار بکەن لە جیهانی عەرەبی دا بە تایبەتی دوورگەی عەربی ،هەروەها هەولیاندا موسلمانان لە نیوان خۆیان متمانە بە یەکتر نەکەن ، بەلی لە غەزایە دا کە ژمارەیەکی زۆر لە مونافیقە کان لە گەل پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەر چوون بەلام نەك بۆ جیهاد کردن بەلکو بۆ ئاژاوە نانەوە فیتنە ئاشووب لە نیوان موسلمانان ، لە هەمان کاتیش دا بۆ دەست کەوتەکانی جەنگی بەژداریان کرد ،بۆ بەدەست هینانی تەماعی دونیا ،ئەوە بوو سوپا گەیشتە سەر ئاوی ( المسریع ) مونافیقە کان رق کینەی دلی خۆیان هەلریژت ،ئە و ژەرەی لە نیو دلیان بوو ئاشکرایان کرد ، هەولیاندا ئاژاوە بنینەوە لە نیوان کۆچ کەران و ئەنصارە کاندا ،جەنگیکی دەروونیان بەر پاکرد ،لەریگەی ئەو درۆ هەلبەستانەی کە دروستیان کرد ..!! بەلی ( زیدی کوری ئەرقەم ) کە شایەد حال بوو ئەم رووداوە مان بۆ دە گیریتەوە دەفەرموویت : گویم لە ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) بوو دەی ووت : هیچ خەرج مەکەنە سەر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) تاکو بلاوە دەکەن لە دەورووبەری ، وە بشگەرینەوە و سەر بەرزو سەر شۆرە دەر دەکات ، ( زید ) ئەلی منیش ئەوەم بۆ ( سعدی کوری عبادە ) ی مامم باسکرد ، پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) مونافیقە کانی بانگ کرد ،ئەوانیش سویندیان خوارد ، کە قسەی وایان نەکردووە ، هەروەها پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) منی بە درۆ خستەوە و باوەری بە ئەوان کرد ، منیش زۆر خەمبار بووم لە مال دانیشتم وئینجا مامم پی ووتم : خوای گەورە ئایەتی دابەزاندووە کە دەفەرموویت : ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾المنافقون ١ . واتا: ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کاتیك ناپاك دوو رووە کان دین بۆ لات و دەلین : ئیمەشەیەتی دەدەین کە تۆ پیغەمبەری خوایت !! لە حالیکدا کە خوا خۆی چاك دەزانیت کە تۆ پیغەمبەر و فرستادەی ئەویت ،لە هەمان کاتدا خوا شایە تی دەدا کە ئەو ناپاك و دوو رووانە درۆزنن ..!! ئیتر مامم ووتی : ( زید ) خوای گەورە باوەری پیت ئەکرد ئەی ( زید ) . الحديث القران ٣١٧/١ .

ئ

ئینجا له پاش هەولیکی تری مونافیقه کان بۆ ئاژاوه نانەوه له نیوان کۆچ کەران و ئەنصاره کان مونافیقه کان سەرکەوتوونەبوون تیدا ، دواتر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بریاری گەرانەوەی دا بۆ شاری مەدینه ، له کاتیدا پیشتر لەم جۆره کاتەدا جمو جۆلی نەدەکرد ، ئیتر ( أسید کوری حضیر ) هاته لای پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) وه لی پرسی بۆچی لەم کاتدا بەری دەکەویت ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ؟! پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ئەی نازانیت ؟! ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) چی ووتووه ؟! دەلیت که بگەرینەوه شاری مەدینه سەر بەرزمانسەر شۆر دەردەکات ، ئەویش ووتی : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) خوا تۆ سەر بەرزی و دە توانی ئەو دەر بکەیت چونکه ئەو سەر شۆره . ئینجا ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) چاو پۆشی لی بکه ، سویند به خوا ( خوای گەوره ) تۆی بۆ ئیمه هینا ، کەس و کارەکەی خەریك بوون تاجه کەیان ریکدەخست بۆ سەرۆکایەتی ، ئەو رۆژه شەو رییان کرد و هەندی له رۆژی دووەمیش تاکو رۆژگەرم بوو ، خەلکانیکیش لایان دا خەوتن ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەم کارەی کرد بۆ ئەوەی قسەو باسه کەی دوینیان له بیر بچیت ، ئینجا سورەتی( المنافقون ) هاتەخوارەوه ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کردی به گویی ( زیدی کوری ئەرقەم ) دا فەرمووی : ئەم گوییه بوو ( خوای گەوره ) بەو قسانەی بیستی ئایەتی دابه زاند .

السیره النبویه لابن هشام ۳/۳۱۹-۳۲۰ .بەلی هۆکاری ئەمه بوو که پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) به شمشیر وەلامی ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلولی ) نەدایه ، یەکەم : و بۆ ئەوەی پاراستنی یەکر ریزی موسلمانان که تووشی پەرتەوازیی و فتنه و ئاشوب نەبن ، هەر وەك ئەم فەرموودیەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ( عمری کوری ختاب ) ( خوا لی رازی بیت ) که دەفەرموویت : (( فیکیف یا عمر أذا تحدث الناس محمدا یقتل اصحابه ) .السیرة النبویة الصحیحة ۲/٤۰۹ . واتا :چۆن بیت ئەی عمر ئەگەر خەلکی باس لەوه بکەن محمد هاوەلانی خۆی دە کوژیت ؟! بەلی ئەو ئەو پەری پاراستنی یەك ریزی موسلمانەکان له م کاتەدا ، دووەم بەلی روو بەروو ی پیلانەکانی سەرۆکی مونافیق نەبۆوه به شەمشیره ، چونکه ئەو لەم کاتەدا شوینکەوتووی زۆری هەبوو ، له ناو سوپایی ئیسلام دا خۆیان حەشاردا بوو ، ئەوه بوو لەم کاتەدا پیشنیاریان کرد بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) که ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) بکوژن و له ناوی بەرن ئەم مونافیقه ناپاکه ،ئەوه بوو پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەر رازی نەبوو به کوژتنی ئەم ناپاکه ،دواتریش پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : پیت چۆن ئەی عمر ؟! سویند به خوا ئەگەر لەو رۆژەی پیت وتم بمکوشتایه کەسانیك لەسەری به دەنگ دەهاتن ، ئەر ئەمرۆ فەرمانیان پی بکەیت خۆیان دەی کوژن ، عمر ووتی : بەلی به خوا دەزانم فەرمانی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) له فەرمانی من پیرۆز تره . السیره النبویه لابن شهبه ۲/۲۵۷ .

ئ
بەلی (عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) کوریکی ئیمانداری هەبوو بە ناوی (عبدالله ) کاتیك ئاگادار بوو لە رووداوە کان دابە زینی قورئانی پیرۆز لە سەر مونافیقە کان بەتایبەتی باوکی ، هاتە لای پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) پیم گەیشتوو دە دەویت (عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) بکوژیت ، کە دە کاتە باوکی ، بەهۆی ئەوەی پیت گەیشتووە دەربارەی ناپاکی کردنی و ئاژاوە نانەوەی لەنیو موسلماناناندا ، هەروەها کورەکە ی (عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلولی ) فەرمانم پی بکە خۆم دەی کوژم سەریت بۆ دە هینم ..!! سویند بە خوا هەموو تیرەی خەزرەج ئەزانن کەس نەبووە لەمن باشتر بۆ باوکی ..!! ئینجا من ترسم هەیە فەرمان بە کەسیك بکەیت بی کوژیت و ، منیش توانام نەبیت تەماشای بکوژی باوکم بکەم ، بە ناو خەلکی دا ری بکات بی کوژم ئەو کاتەش پیاویکی موسلمان و ئیماندارم کوشتووە ..!! بە پیاویکی بی ئیمان و دەچمە دۆزەخەوە ، ئەو کاتە پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : نەرم نیان دە بین لەگەلی و هاوەلی چاك دەبین بۆ ئەوەی تاکو لەگەلمان دا بیت . السيره النبويه لابن هشام ٣٢١/٣ . بەلی بی گومان بۆ ئەم غەزایەی (بني مصطلق ) زۆر لە مونافیقەکان هاتبوون وەك لەسەروە دا باسمان کرد تەنها بۆ تەماعی دونیان دەست کەوتەکانی جەنگی ،ئاژاوە نەنەوە لەنیوموسلمانان هاتبوون ، کاتیك سوپای ئیسلام بەریکەوت تاکو لە کوتو پەر بدەن بەسەر (بني مصطلق ) لەریگادا پیاویکیان دەست گیر کرد کە گومانی لیدە کرا سیخوری بکات بۆ دوژمن هینایانە خزمەت پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کە پرسیاری لی کرا ؟ دەرکەوت لە پیاوانی (حاريثي کوري ابو ضيرار) ئەم پیاوەی بۆ سیخوریی ناردووە ، تاکو هەوالی سوپایی ئیسلام بزانیت ، دوای ئەوەی پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) پی راگەیاند کە موسلمان ببیت ، ئەوویش رازی نەبوو ، ئیتر ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی کرد بە (عمری کوری ختاب ) لەسەری بدری ملی بپەریت ، هەروەها دەنگوباسی هەلمەتی موسلمانان کوشتنی سخورەکەی (حاريثي کوري ابو ضيرار) گەیشتە سەرۆکی (بني مصطلق ) ترسیکی زۆر گەیشتە دلنیانە هەرچی عەرب هەبوو هەموویان سەرسام بوون ، دواتریش بلاوەیان لی کرد ، سوپای ئیسلام لە سەر هیرش و هەلمەتی خۆی بەردەوام بوو ، هە تا گەیشت ناوچەی (قوديده )لە سەر رووخی دەریایی سورە ، لە نا کاو دا گەیشتە مەنزلی (بني مصطلق ) لەسەر ئاویك بە ناوی (المسريع ) سوپا لەوی دا خستیان ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) بەر لەوەی جەنگ روو بدات فەرمانی کرد بە (عمری کوری ختاب ) بانگیان بکات بۆ ئیسلام بوون ، تاکو خوین وسامانیان و مال منداليان سەلامەت بیت ، چونکە ئەوان لە کۆ کردنەوەی سوپا دا بۆ هیرش کردنە سەر موسلمانەکان دەست پیش خەریان کرد بوو ...

ئ

ئەوە بوو (عمرى كورى ختاب) بەرانبەرايان وەستا بانگى (بني مصطلق) تاكو بلێن : (لا إله الا الله) تا خۆتان سمانتتان پاريزراوە بێت ،كەچی ئەوان مليان نا بە كوفر كردن و بە جەنگ رازی بوون ، پاشان هەر دوو سوپا دەستيان كرد بە تير وەشاندن لە يەكتری ، دواتر (پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی هەڵمەت كردنی دا بە سوپای ئیسلام بۆ هێرش كردنە سەر (بني مصطلق) ، بەڵی سوپای ئیسلام هەڵمەتی برد وە شێرو پەڵنگ چواردەوەری (بني مصطلق) دا هیچیان لی دەر باز نەبوو ، بەڵی سوپای (بني مصطلق) دوای ئەوەی كە (١٠) كەسيان لی كوژا هەر هەموويان خۆيان تسليم كرد ، هەموويان بە ديل گيران ، پاشان دەستيان بەسەر سەروەت مال وسامانەكەيان دا گرت بوو بە غەنيمەت بۆ سوپای ئیسلام ، هەرچی ئەسپ ووشترو مەرو مالات و سامانيان هەبوو هەموويان هيناو لەگەل ژن و منداڵە كانی شيان ، بەلام لە غەزايە دا تەنها پياويك شەهيد بوو ئەويش (هيشامی كوری صەبابە) بوو ، هۆكاری شەهيد بوونی پياويكی ئەنصاری شەهيدی كرد كە نەی دە ناسی ..!! دروشمی سوپای ئیسلام لە رۆژەدا ئەمە بوو (يا منصور ! أمت أمت) بوو . بەڵی دەست كەتەكانی ئەم غەزايە يەكجار زۆر بوون ، (٢٠٠٠) هەزار ووشتر (٥٠٠) هەزار سەر مەر ، ژن و منداڵی ديل (٧٠٠) كە س بوون ، وتمان يەكيك لە ژنە كان خاتوو (جويرەی كچی حاريس) بوو كە سەرۆكی (بني مصطلق). بەلام ديلە كان هەنديكيان بەبی بەرانبەر بەردران هەنديكيش هەر لەويدا فديان پی دان بەرە لا كران ، بەلام خاتوو (جويرە) كە كچی سەرداری (بني مصطلق) ئەويش بەديل گيرا ، كەوتە دەست (ثابت ي كوري قيس) خاتوو (جويرة) پی خۆش نەبوو چونكە كچی سەرداری يان سەرۆكی (بني مصطلق) خاوەن پلە و پايەی بەرز بوو لە ناو هۆزەكەی دا ، كەچی ئيستا وا بۆتە كەنيزەك و بەديل گيراوە ، هەر بۆيە بە (مكاتبە) لە (ثابت ي كوري قيس) ريكەوت تاكو بريك پارەی بداتی خۆی ئازاد بكات ، پاشان ديتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەڵی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من (جويرەم) كچی سەرداری(بني مصطلق) ئاگاشت ليە كە تووشی چ بەلايك بووين ، بەر (ثابت ي كوري قيس) منيش بە (المكاتبە) لە گەڵی دا ريك كەوتم ، هاتووم بۆ ئەم (مكاتبەی) دوای يارمەتييت لی دە كەم .لە سيرەی ابن هشام ٢٩٥/٢ ، بەشيوازيكی تر هاتووە ، بەڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم هەڵويستە ی بەهەڵيكی چاك دان تاكو (بني مصطلق) لە بە كافر بوون بە ديل گرتن رزگاريان بكات ، ئەوە بو كە خاتوو (جويرە) دوای ئازاد كردنی لی كرد ، پێغەمبەری خوا پی فەرمو : (فهلك فی من ذلك ؟) واتە : ئايا لەوە چاكترت ناوی ؟ ئەويش ووتی : ئەوە چيە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی : (أقضي عنك كتابتك و أتزوجك) واتە : پارەی مكاتبەكەت بۆ بدەم مارەت بكەم . ئەويش ووتی : باشە ..!!

ئ

ئەم دەنگ باسە لە ناو خەلكى مەدینەدا بلاو بۆیەوە ووتیان چۆن دە بیت مالى خەزوورانى پیغەمبەرى خوا (صلى الله علیه وسلم ) ببنە كویلە و كەنیزەك ؟!! هەر كەسە و لە راستە خۆیە وە هەرچى دیلى لەلا بوو ئازادى كرد ..!! خاتوو عائیشە ریوایەتى كردووە (خواى لى رازى بیت ) دە فەرموویت : بە مارە كردنى خاتوو (جویرە ) لە (بني مصطلق ) (١٠٠) خاو خیزان ئازاد كران ،بەراستى هیچ ئافرتیك شك نابەم فەر بەرەكەتى بۆ كەس و كارى لە و زیاتر بووبیت ..!!دواتر (بني مصطلق ) ئەم رفتارە جوانەى پیغەمبەرى خوا یان (صلى الله علیه وسلم ) بینى لە گەل موسلمانەكان كە كردیان لە گەلیاندا هەر هەموویان بەویستى خۆیان موسلمان بوون ..!!

ئ

## ریكەوتنی حودیبیه یان صلحی الحدیبیه

بەلی صولحی حدیبیه ریكەوتننامەیەك بوو لە نیوان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و نیونەرو فەرماندە كانی كافرانی قورەیشیە بت پەرستەكانی شاری مككە ، كە فەرماندە نوینەری قورەیش بە سەرۆكایەتی ( سهیل بن عمر ) بوو ، وە لە شوینیك ئەو ریكەتنە مۆركرا یان بەسترا ، پی دە ووترا ( الحدیبیه ) كە دە كەویتە نیوان شاری مككە و شاری مەدینەدا ..!!

ئەم ریكەوتنامەیە لە مانگی ذو القعدة ي سالی ( ٦ ) كۆچی دا روویدا ، كە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) خۆی ( ١٤٠٠ ) لە هاوەلانی لە گەل دا بوون ، بەرەو شاری مككە بەریكەوتن بە نیازی ( عومەر ) كردن ، وە هەر لە شاری مەدینەدا بە نیازی عومرە بە ریكەوتن ،بۆ ئەوەی قورەیش بزانن كە ئەوان نەهاتوونە بۆ جەنگ كردن بەلكو هاتوونە بۆ سەردانی مالی خوا و ( عومرە ) كردە.

بەلی هۆگاری ئەم ( عومرە ) كردنەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەوە بوو ، كە شەویك لە خەونی دا بینی چۆتەوە شاری مككە ، لە هەلگ هاوە لە بەریزەكانی ئیحرامیا پۆشیوە بەرەوە شاری مككە ری دەكەن ، بی گومان خەونی پیغەمبەران وەحی خوای گەورە یە كە لە خەوەكەی دا دەبینی ، ئیتر ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) مژدەی دا بە موسلمانان ئەوانیش زۆر پیخۆش حال بوون ، چونكە ماوەیەكی زۆر بوو ئەوان لە شاری مككە دا دابرا بوون ، بۆ تەواف كردن بەدەوری كەعبەی پیرۆز دا بە تایبەتی كوچكەران كە لەم شارە پیرۆزە دا لە دایك ببوون ، جا كاتیك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئاگاداری كردنەوە ،ئەوانیش خۆیان ئامادە كرد ،دیارە ئیمانداره دامەزراوە كان هەر هەموویان پی خۆشحال بوون ، چونكە تامەزرۆی ئەم رۆژە بوون ، بەلام موناڤیقە كانی شاری مەدینەو دەوروبەری ، چونكە ئیمانیان لاواز بوو ، زۆر لایان قورس و گران بوو ، هەر بۆیە پی دل گران بوون ، بەم هەوالە ی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) كەوتنە برو بیانوو هینانەوەو خۆ دزینەوە لەم هەوالەی كە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پی راگەیاندن ، چونكە پیان وابوو بت پەرستانی قورەیش ناهیلن عومرە ئە نجام بدەن ، تووشی جەنگیكی ناهەموار دە بن ، بەلام ئەم جەنگە لە شوینیكی دوورە و ئەو پەری مە ترسی تیدا روودەدات ، بیانویان دە هیناوە كە مال سامانیان بەشی ئەم گەشتە ناكات ، بەلام لەراستی دا خۆیان دە دزیەوە لەم سەفەردا لە گەل پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ هەر هەموو كات موناڤیق پیشە و رەفتاری خۆ دزینەوەیە ترس دلە راوكییەتی ، لەجەنگ ،بی گومان موناڤیق لە هەموو شتیك دە ترسیت تەنها لە سیبەركە خۆشی ...

ئ

هەر بۆ یە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوەو کە دەفەرموویت : ﴿سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَا يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ قُلْ فَمَنْ يَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًا بَلْ كَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ الفتح ١١ . واتا : ئەو عەرەبە کۆچەرییانەی لەریکەوتنەکەی ( حودیبیە ) بە جیمان و بەشداری یان نەکرد کاتیك زانیان ئیوە بەرەو غەزای خەیبەر دەرۆن کە خوا بەلینی سەرکەوتن و دەسکەوتەکانی جەنگی پیدابوون دین بۆ لات و دەلین : مال منداڵمانئیمەی سەرقال و خەریك کرد و کاتمان نەبوو بیین لە گەلتان ، لە بەر ئەوە داوی لیخۆش بوونمان بۆ بکە لای خوا ، ئەوەی بەزمان دەیلیین لەدلیاندا نی یە ، پییان بلی : باشە ، کی دە توانیت بەری دەسەلاتی خوا بگریت ، ئەگەر بیەویت زیانیکتان پی بگەینیت یان سوودو قازانجیکتان بۆ پیش بهینیت خۆ خوا بەتەواوی بەئاگایە لە کارو کردەوە کانتان ..!!هەروەها قورئانی پیرۆز ئاشکرای دەکات کە چۆن بە تەمای تیاچوونی موسلمانە کان بوو : کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ بَلْ ظَنَنْتُمْ أَنْ لَنْ يَنْقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ وَظَنَنْتُمْ ظَنَّ السَّوْءِ وَكُنْتُمْ قَوْمًا بُورًا﴾ الفتح١٢ . واتا: نەخیر پاساوو بە هانە کە تان وانیە ، بەلکو لەراستیدا ئیوە واگومانتان دەبرد ،ئیتر هەرگیز پیغەمبەروئیمانداران ناگەرینەوە بۆ ناو کەسو کاریان و تیا دەچن ، ئەو گومانە بردنە لەدل و دەروونتاندا رازینرابۆوە و چەسپی بوو ، بەراستی گومانی خراپ و ناقولاتان بردوو ، ئیوە هەمیشە هۆزو تاقمیکی بی کەلك و بی خیرن ..!!بەلی خەونەکەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە بینی ئەوە بوو بە خۆی بە هاوەلانی چوونە کەعبەی پیرۆز ، وە کلیلە کانی کەعبەی وەرگرتووە ، وە تواقی عمرەیان ئە نجامداوە ، هەندیکیان سەریان تاشیوە ، هەندیکیش کورتیان کردبۆوە ، بۆیە پیغەمبەری خوا ئەم خەون بینیە بۆ هاوەلە کانی گیرایەوە ، ئەوانیش یەکجار دل خۆش و کامران و دلشاد بوون بەم هەوالە ی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەلی ئەوانەی کە ئیمانیکی دامەزراو راستەقینەیان هەبوو، گەیشتنە ئەو حقیقەتەیکە دەبیت ئەم سال عومرە ئە نجام بدەن ، بەروە کەعبەی پیرۆز بەری بکەون ئەم سەفەرە بکەن ، بۆ ئەم مەبەستە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە هاوەلانی راگەیاند کە جار بدەن لە ناو شاری مەدینەو دەوربەری کە ئەم سال نیازیان وایە ( عومەرە ) ئە نجامد بدەن ، وایشی دەر بری کە بۆ ( عومەرە ) دەچیت دوور لە داگیر کردن و جەنگ وشەر ، بەنیازی ئەوەی بچیتە کەعبەی بپیرۆز و نیازی ئاشتی هەبووە لە گەل کافرانی قورەیش دا .هەرچەندە دەشی زانیا کە قورەیش نیازیان پاك نیە ، بەردەوام ناپاکی دەکەن ، وە بیانوو دە گرن تاکو شەر بە موسلمانەکان بفرۆشن ، هەر بۆیە وای بە چاك زانی موسلمانەکان کۆ بکاتەوە ، جار بدا و دەشتە کیەکانی دوورەواتە ( الاعرابیە کان ) ئاگادار بکاتەوە ، تاکو هەموویان بین بۆ ( عومەرە ) کردن لە گەلی دا ، بەو هیوایەش کە قورەیش براو بکات ئەوان بۆ ( عومرە ) کردن دین نەك بۆ جەنگ و شەر کردن ...

ئ

ئەوە بوو دەشتەكیە كیان یان لاعرابیە كان كە هە بەدم ئەم جاردانە یان بانگەوازیە نەهاتن ، تەنها كەمیكیان نەبیت ،هەروەك لە ئایە تەكانی پیشتر دا خوای گەورە باسی ئەم مونافیقانەو الاعرابیە كان دەكات ، ئەوە بوو لەرۆژی دووشەمەو لە مانگی ذو العقیدة سالی ( ٦ ) كۆچی دا بەری كەوتن ١٤٠٠ ) كەس بوون ،( ٢٠٠ ) سورایان لە گەل دا بوو ، كە گەیشتە ذو الحلیفة ، كە نزیكە ی ( ١٠ ) میل لە مەدینە دوور بوو ،لەوی دا پیغەمبەری خوا ( صلى الله علیه وسلم ) كاروانەكەی وەستاند و ( ئیحرامی ) بۆ خەلكەكە بست بۆ ( عومرە ) كردن ،چونكە بەلای خەلكە كە ئاشكرای كرد ، ك بۆ ( عومرە ) دە رۆن نیازی كوشتاور جەنگیان نیە ، هەروەها لە پیش دەر چوونی لە شاری مەدینە ( نومەیلی كوری عبدالله لەیسی ) كردە ئەمیری شاری مەدینە لەدوای خۆی بۆ كاروباری شاری مەدینە ، وە ابن ام مكتوم بۆ پیش نویژ كردن كردە ئیمامی شاری مەدینە ، ئەوە بوو لە مالەوە خۆی شۆرد و سواری ولاغەكەی بوو كە پی دە ووترا ( القصواء) ..!!

بەلی بەریكەوتن كە گەیشتنە ( ذولحلیفة ) كة ( ١٠ ) میل لە مەدینە دوور بوو ، لەوی وەستان نیوژی نیوەرۆی بۆ موسلمانان كرد ، هەروەها ( عمری كوری ختاب ) و ( سعدی كوری عوبادە ) وایان بەچاك زانی كە پیغەمبەری خوا ( صلى الله علیه وسلم ) هاوەلانی پر چەك بكات ، نەوەك قورەیش هیرش بكەن ، بۆ ئەم ناردی بۆ مەدینە هەرچی چەكیان هەبوو هەر هەموویان هینا، ئەوەبوو پیغەمبەری خوا ( صلى علیه وسلم ) یەكیك لە ووشتر بەناوبانگە كانی هینا بوو لە گەل خۆ ، ئەویش ئەم ووشترە بوو كە لە جەنگی بەدر دا بووبە دەست كەوتی موسلمانەكان ، كە وشترەكەش وشتری ( ابو جهل ) بوو ،كاتیك بەری كەوت رووی كردە قیبلە رۆیشت بە چوار ووشە ( تلبیە ) ی فەرموو : (( لبیك اللهم لبیك ، لبیك لا شریك لە لبیك ، إن الحمد والنعمە لك والملك ،لاشریك لك )). بەلی بۆ ئەم ( عومرە یە ) چوار ئافرەتیان لە گەل دا بوو ، كە ئەمانە بوون : ( ام سلمە ) دایكی ئیمانداران ، ( ام عمارە ) ، ( أم منیع ) ، ( ام عامیر ) بوون . هەروەها كۆمەلیك لە مونافیقە كان هاتن ، بە تایبەتی ئەو دوو مونافیقە گەورەیە ،ئەوویش ( عبدالله ی كوری ئوبەی كوری سەلول ) ، ( جددی كوری قەیسی كوری صەخری خەزرەجی ) ئەمانەش تەنها بۆ ئاژاوە گیری هاتبوون ...

ێ

بەلی دە بیت موسلمانە کان لە فرو یل قورەیش بی ئاگانەبیت ، هەرچەندە ئەوان بۆ شەر نەچوو بوون تەنها بۆ مەبەستی ( عومرە ) کردن چوو بوون ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )دوو کاری گرینگی ئە نجام دا ، ئەویش ئەوە بوو :

یەکەم : فەرمانی بەسە ر ( بوصری کوری سفیانی کەعبی ) دا کە سەرداری خوزاعە بوو ، تا بچیت لە ناو قورەیش دا هەوال بۆ موسلمانە کان کۆ بکاتەوە ، بزانیا نیازی قورەیش جیە ؟! وە هەلویستی قورەیش چیە و ، پاشان بگەریتەوە لایان ، ( بوصری ) رۆیشت هەوالە کەی کۆ کردە وە کە گەرایەوە کاروانی موسلمانان گەیشتبووە ناوچەی ( عوسفان ) .

دووەم: پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەر لە ناوچەی ( ذولحلیفة ) کۆمەلیك لە سوار چاکی بە تواناى هەلبژارد تا پیش کاروانی موسلمانان بکەویت بۆ هەوال کۆ کردنەوەی قورەیش ،ئەم کۆمەلە سوار چاکە لە ( ٢٠ ) سوار چاك پیك هاتبوون.

بۆ بەیانی رۆژی سی شەمە گەیشتنە مەلەل بۆ رۆژی چوارشمە گەیشتنە ( رەوحاء) ، لەویدا تووشی پیاویك بوون بە ناوی ( ئەصرم ) کە لە بنی ( نهد ) بوو ، کە مەرو مالاتی پی بوو ، پیغەمبەری خوا بانگی کرد بۆ ئیسلام کەچی بەدەمیەوە نەهات ، دوای ئەو شری نارد بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پیغەمبەریش شیرە کەی وە رنەگرت ..!! فەرمووی : (( لا أقبل هدیه مشرك ))

بەلی کاتیك قورەیش زانی بە هاتنی کاروانی موسلمانان بۆ کەعبەی پیرۆز ، زۆریان پیناخۆش بوو ، چونکە ئەوانە زۆر بەیان خزم و کەس کاریان بوون ، وا بەشیوەیە کی جوان پەروەردە کانە لەسەر ئاینە تازە کەیان ، وا بیریان دە کردوە ئەوانەی لە نیو مککە دان ، روو بکەنە ئەم ئاینەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە چەندین سال بانگەوازی بۆ دە کات جیهاد و تیکوشانی بۆ ئەم ئاینە ی ئیسلام دە کات ...

ئ

هەر بۆ یە بە پەلە کۆبوونەوەیە کیان ئە نجام دا لە پەرلەمانی قورەیش لە ( دار الندوه ) دا تاکو لە نیوان خۆیان دا لەسەر پیلانیك ریك بکەون بزانن چی بکەن ؟! لە ئە نجامدا ریکەوتن لەسەر سی پیاو ئەوانیش وە ك نوینەری قورەیش یان وە لژنەیەك بیت چی بە چاك بزانن ئەوە بکەن ، وە بریاری لەسەر بدەن ، کە ئە سیانەش ئەمانە بوون :( سوهیلی کوری عمری عامیری ) ،صفوانی کوری ئومییە جوممەحی ) ،

( عکریمەی کوری عمری عامیری ) ، ئەوە بوو ئەم سی کەسە نەخشەیەکیان داریژت بۆ بە کژ داچوونەوەی کاروانی عەمرە کارانی موسلمانان ، ئەگەر موسلمانەکان ویستیان بین بۆ شاری مککە ، ئەگەر بە شەرو جەنگیش بوو نەهیلن بین بۆ ناو شاری مککە کەعبەی پیرۆز .بەلی نەخشە کە بەم جۆرە بوو ، ١-هەر قورەیشیەك تواناى شەر کردنی هەیە خۆی ئامادە بکات بۆ جەنگ .٢- دوای یارمەتی و کۆمەکی لە هۆزی ( أحابیش ) و ( ثقیف ) بکریت بۆ یارمەتی دانی قورەیش .٣- کۆمەلیکی زۆر پارە کۆ بکەنەوە بۆ کرینی کەرەسەی جەنگی بۆ ئەم شەرە .٤-خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ بەر لەوەی موسلمانەکان بگەنە ناو شاری مککە . ٥- کاتیك سوپای قورەیش لە مککە دەر بچیت بۆ ریگری کردن لە کاروانی موسلمانەکاندا ،ئەوان ژن مندالە کانی شیان لە گەل خۆ دا ببەن .٦- هیزکی زۆر لە سوارچاکی پیکەوە بنین .٧- کۆمەلیك پیاوی ووریا لەسەر ریگاکانی شاری مککە دا بنین بۆ هەوال زانیاری کۆ کردنەوە لە کاروانی موسلمانەکاندا .

بەلی قورەیش توانی هۆزی ( احابیش ) بکاتە کۆمەکی خۆی ، ئەوە بوو سوپای قورەیش لە ناوچەی ( بلدح ) لە خۆر ئاوای شاری مککە دا دابەزیی و ژن مندالیشیان لە گەل هینا ، ئەوە بوو ( خالید ) بە ( ٢٠٠ ) سوار چاکەوە لە ( کراع الغمیم ) وەستان و ، بریاری دا کە بە هیچ شیوەیە ك نەهیلی موسلمانەکان تیپەر بن .

بەلی لە دوای دا قورەیش ( بشر بن سفیان الكعبی ) دە نیرن و ،بریاردەدن کە بەهیچ شیوەیە نەهیلن موسلمانە کان بینە نیو شاری مککە و ( عمرە ) بکەن ، ئەوە بوو پغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( يا ويح قريش ! لقد أكلتهم الحرب ماذا عليهم لو خلو بيني وبين سائر العرب فان هم أصابوني كان الذي أرادوا ، وان أظهرني الله عليهم دخلو في الاسلام وافرين ، وإن يفعلوا ، قاتلوا وبهم قوة )) .السرة النبوية لابن هشام ٣/ ١٦٢-١٦٣ . واتە : قورەیش بی قەزابن ، جەنگ خواردنی لە نیو برد چ دەبی ، ئەگەر لە من و لە باقی عارەبان بگەرین ، ئەگەر بەسەر مدا زال بوون ئاواتیان هاتۆتەدی ، ئەگەر خوا سەریخستن ئەوە لە گەلدا بکەن لە کاتیدا ، کە هیز پیزیکیان بە بەرەوە ماوە ..!!

ی
بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ ئەوەی تووشی جەنگ و کوشتار نەبی لە گەل قورەیش دا ، کە بەرەو رووی موسلمانەکان هاتوون دەیانەویت جەنگ و کوشتار بکەن ،دە پرسی کی هەیە ؟! بە رییەکی دیکەی جیا لەو ریگایە سەرەکیە بزانی ، واتە گۆرینی ریگای خۆیان نەوەك قورەیش بەرنگاریان ببیتەوە ،چونکە ئەوانە بۆ شەر و جەنگ نەهاتوون تەنها بۆ ( عومرە ) کردن ، ئەوە بو پیاویك لە ( بنی أسلم ) ووتی ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) من بەریگایەکی تر دە زانم ، ریگایە کی زۆر سەخت شاخ و گرد چۆم بوو ، دوای ئەوە موسلمانەکان بەم ریگایە دا دەرۆن زۆر سەختی دە بینن، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە هاوالانی فەرموو : (( قولوا نستغفر الله ونتوب إليه )) پاشان فەرمووی : (( والله انها للحطة التي عرضت على بني اسرائيل فلم يقولوها )). السيرة النبوية لابن هشام ١٦٣/٣ . واتە : سویند بە خوا ئەوەی ، کە ئیستا جی بەجی تان کرد ، ئەوە کە ووتم بلین : داوای لی خۆش بوون لە خوا دە کەین ، بۆ لای ئەویش دە گەرینەوە ، واتان ووت : ئەوە هامان بە بنی اسرائیل ووت نەیان ووت : وەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ نَغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ﴾ البقره ٥٨ . واتا : یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتیك ووتمان : بچنە ئەم شارە وە، کە ( قودسە ) جا هەرچی حەزی لیدەکەن لەوی لە هەرجییە کی بەرفراوانی و خۆشی بیخۆن ،لە دەروازەی شارکە بەریز و کرنوشی پیزانینەوە بچنە ژوورەوە و بلین : خوایە لە تاوانە کانمان ببوو رە ، ئەو کاتە ئیمەش لە هەلە و تاوانە کانتان دە بوورین ،ئیمەش پاداشتی چاکەکاران لەئایندە دا زۆر بە زیادەوە دەدەینەوە ..!!

پاشان قورەیش دە ستیان کرد بە ناردنی چەند وەفدیك یان نیردراویك کە ئەمانە بوون :

١-یەکەم وفد یان نیردراو ناردیان لە شاری مککە لە تیرەی ( خوزاعە ) بوو بە سەرۆکایەتی ( بدیل کوری وەرقاء ) بەلی ئەچیت بۆ لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەلی : ئەی محمد بۆ چی هاتوویت ؟! پیغەمبەری خواش ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : وەك چۆن دە بینن کەوا ئیمە ( ئیحرامان ) بەستووە مەرو ووشترمان پیە و هاتووین بۆ ( عومرە ) کردن ، چەکیشمان پی نیە ..!!

بەلی ( بدیل کوری وەرقاء) دە گەریتەوە هەوال بە قورەیش دەدات ئەلی : محمد بۆ جەنگ و شەر نەهاتووە، بەلکو بۆ سەردانی کردنی مالی خوا یان ( عومرە ) کردن هاتووە .السيره النبويه لابن هشام ١٦٣/٣.

ێ

٢-دوای قورەیش وفدی دووەم دەنێریت بۆ لای پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەویش پیاویکە بەناوی ( مكرز كوری حفص ) چاوی بە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دە کەویت ، پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی :( هذا رجل غادر ) واتە : ئەمە پیاویکی پەیمان شکینە ، دوای پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) وەك چۆن قسەی بۆ بە ( دیل ) کرد ئەواش بۆ ئەوی کرد ، گەرایەوە لای قورەیش هەلویستی پێغەمبەری( صلى الله عليه وسلم بۆقورەیش گێرایەوە . هەمان سەرچاوە ...

٣-جاریکی تر قورەیش وفدی نارد بۆ لای پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەویش ( الحليس کوری علقمه ) بوو ، گەورە پیاوی هۆزی ( أحابيش ) بوو ، کاتیك پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئە م پیاوە دە بینی دەفەرمووی : ئەو پیاوە لە قومیکە کە زۆر ئەهلی طاعة و عیبادە تن ،وە موسومی حەج بە گەورە دە گرن ، هەر بۆیە قوربانیەکانی مەرو مالات بۆ بەردەمی برد تاکو بیان بینی ، کە چوۆن گەردنبەدیان لە مل دایە نیشانەکراون بۆ قوربانی سەربرین ، تا وەکو ئەم پیاوە بزانیت ئەوان بۆ ( عومرە ) هاتوون ، بەلی ( حلیسەکوری علقمه ) هەر ئەم مەرو مالاتە ئەبینی ، پیش ئەوەی بگاتە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەگەریتەوە بۆ لای قورەیش دەلی : محمد و هاوەلانی هاتوون بۆ ئەوەی ( تعظیم ) ی کعبەی پیرۆز بکەن چۆن جەنگی لەگەل دا دەکەن ؟! قورەیشیەکانیش پی دەلین تۆ پیاویکی دەشتەکی خیلە کی پیاویکی نەزانی بۆیە هەر قسە ی تیدا مەکە ..!! ( حلیسەکوری علقمه ) لیان توورە دەبیت دەلی : ئەی قورەشیە کان سویند بەخوا لەسەر ئەوە پەیمانمان بە یەکەوە نەبەستووە ، ئایا ؟! ریگا لە یەکیك دە گرن دەیەویت بیت بۆ ( عومرە ) بکات و مالی خوا بە گەورە بزانیت ؟! سویند بەخوا یان دەبیت وازی لی بهینن ،یان دەبیت ( أحابيش ) لیتان هەلگەریتەوە ، ئەوانیش پەشیمان دەبنەوە لەو قسەیە کە پیان ووتوە هەر چۆنیك بیت رازی دەکەن . السيره النبويه لابن هشام ١٦٥/٣ .

ئ

٤-ئینجا ئەم وەفد دەنێرن بۆلای پیەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەویش پیاویکی (ثقفي) بوو بەناوی (عروه بن مسعود ثقفي) بوو کە بەمەبەستی هاتنی پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوالانی بۆ شاری مککە ، بەلی ئەم پیاوەش بۆی دەر کەوت کەنیازی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەنها سەردانی کردنی مالی خوایە بۆ مەبەستی (عومرە) هاتوون ، هەروەها ئەم پیاوەش گەرایەوە بە قورەیشی ووت : (يا معشر قريش أني قد جئت كسرى فب ملكه وقيصر في ملكه والنجاشي في ملكه ، وإني والله مارأيت ملكا في قوم قط مثل (محمد) في أصحابه ، ولقد رأيت قوما لا يسلمونه لشيء أبدا فررا رأيكم). واتە: ئەی کۆمەلی قورەیش ! من چوومە لای کیسری ! لە بارەگای خۆی ، وە چوومە لای قیصر لە بارەگای پادشایەتی خۆیدا ، وەچومە بۆ لای نەجاشی لە بارەگای پادشایەتی خۆیدا ، سویند بەخوا هیچ پادشاو دەسەلاتداریکم نەبینیوە لە نیو قەومەکەی خۆیدا وە کو محمد بی لە نیو هاوەلانیدا ، کە هیندە ریزو خۆشەویستی هەیە لەلایان ، بەهیچ شیوەیە ك پشتی بەرنادەن و تسلیمی کەسی ناکەن ، واتە : نەچن خۆتان تووشی جەنگ و شەر و کوشتار نەکەن لە گەلی دا جا بریاری خۆتانی لەو بارەوەیە بدەن .السيره النبويه لابن هشام ٣/١٥٥-١٦٦.

ئ

**بەلی ئینجا پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوو وفد یان نیردراوی خۆی ئەنریت بۆ لای قورەیش :**

١-وفدی یەکەم (خراش کوری أمیە الخوزاعی) دە نیری بۆ شاری مککە ، بۆ ئەوەی تیان بگەینی بۆ جەنگ و کوشتار نەهاتوون ، لە هاتنیاندا تەنها بۆ مەبەستی (عومرە) کردن هاتوون ، وە هیچی دیکە نیە ، بەلام (خراش کور امیە خوزاعی) کە دەگات شاری مککە، پیش ئەوەی قسە ی لە گەل دا بکەن ، ووشترە کەی بنی ئەوکوژن ، دوای نیازیان وایە خۆشی بکوژن ، بەلام لەم کاتەدا هۆزی (أحابیش) رزگاری دەکەن.

٢-وفدی دووەم پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیەویت (عمری کوری ختاب) بنیری ، بەلام (عمر – خوا لی رازی بیت) دەلی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە تیرەی من واتە : (بنی عدی) کەسیکی وا لە مککە نیە ، ئەگەر قورەیش بیانەوەیت بم کوژن یان ئازارم دەن کە س نیە لە تیرەی من بەرگریم لی بکات ، بۆ خۆشت چاك دە زای کە من لەسەر کافرانی قورەیش زۆر توندم ، هەر بۆیە پیشنیازم وایە کە (عوسمانی کوری عفان) رەوانە بکەیت ،چونکە تیرەکەی ئەو (بنی أمیە) ژمارەیان زۆرە لە شاری مککە ، ئەوانیش بەرگری لی دەکەن ، هەروەها پیغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پیشنیازەکەی (عمر) پە سەند دەکات و ، (عوسمانی کوری عفان) ئە نیری بۆ لای قورەیش لە شاری مککە ..!!

ئینجا (عوسمان) – خوا لی رازی بیت – ئە چیت ، تیرەی (بنی امیە) وەك خزمانی خۆی پیش وازی لی دەکەن ، ریزی لی دەگرن ، دوای لی دە کەن تەوافی کەعبە بکات !؟ ، ئەویش وئەلی چۆن تەوافی کەعبە بکەم تا پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەی کات ، ئەویش ئەلی تەنها بۆ ئەوە هاتووم و کە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیەویت بیت بۆ شاری مککە بۆ جی بەجی کردنی (عومرە) ، هەر بۆیە دواتان لی دەکەم ریگەی لی مەگرن بۆ ئە نجام دانی (عومرە) کەی ، دواتر دەنگو باس وا بلاو دە بیتەوە لە کە کافرانی قورەیش (عوسمان) یان کوشتووە ، پیغەمبەر و موسلمانانیش ئەم هەوالەیان بیست ، هەربۆیە پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاوالانی کۆدەکاتەوە پیان دەفەرمووی : پە یمانم پیدەدن ، واتە : بیعتی مردنیا لی وەردەگریت ، ئەگەر کافرانی قورەیش (عوسمان) یان کوشتووە ئەوا جەنگ و کوشتاریان لە گەل دا بکەن ، یان ئەوە تا لە ناویان دە بن یان ئەوە تا هەموویان شەهید دە کرین ، بەلی بیعەتی مردن بە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەدەن ...

ئ

ئا ئەوە تا ( خوای گەورە ) لەم بارەیەوە دەفەرموویت : ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ **الفتح** ١٨-١٩ . واتا : سویند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازیی بووە لەو باوەڕدارانەی کاتێك پەیمانیان لە گەڵدا بەستیت لەژێر درەختە کەدا خوا خۆیشی ئاگادارە بوو بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە لە نیاز پاکی و دڵسۆزی هەر بۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بە مژدەی سەرکەتنێکی نزیك دانەوە .. هەروەها بەڵینی چەندین دەستکەوتی زۆری پێدان ، کە لە ئایندە دا دەستیان دەکەویت و وەری دەگرن ، خوا هەمیشە بەردەوام بالادەستە بەسەر خوانە ناسە کانداو دانایە و دەزانیت چ کاتێك ئیمانداران سەر دەخات ..!!

بەلام لە دوای دا هەوال دەنگوباسی بە پیغە مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دە گات ، کە ( عوسمان ) شەهید نەبووە زیندووە ، بەلام ئەو بیعەتە بیعەتی مەرگ یان مردنی پی دە وتریت ، واتە شەر کردن لەگەل دوژمندا تا مردن . صحيح البخاري ٤١٦٩ . هەروەها ( جابری کوری عبدالله ) - خوا لی رازی بیت – دە فەرموویت : پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) رۆژی حودەیبیە پی ووتین : ( انتم خير أهل الارض ) . رواه البخاري ٤١٥٤ .

بەلی دوای ئەوەی قورەیش زانیان کە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) سورە و پی داگری دەکات لەوەی دە بیت هەر ئم ( عومرە ) یە بکات ئەم هەوالەشیان زانی کەوا هاوالانی بیعەتی مردنیا بە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) داوە ، یان ئەوە تا جەنگ و کوشتاریان لە گەل دا دەکات ، ئەوە بوو قورەیش ( سهیل کوری عمرو ) کە مرۆڤیکی عاقل و ژیرو بوو بۆ قورەیش ، ئەو رەوانەی لای پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەکەن ، وەك ئەوەیە کە ( ابن هشام لە السرە النبويه ) بۆمان دە گیریتەوە ، کاتیك پیغەمبەری خوا ( سهیل ) دەبینی کە پیاویکی قسە بەدەستی قورەیشە ، دەفەر موویت : (( قد اراد القوم الصلح حين بعثوا هذا الرجل )) . واتە : قورەیش دەیەویت صولح بکات ، بۆیە ئەم پیاوەیان ناردووە ، پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەمیشە عادەتی وابووە ، کە قسەو ووتاری گەشبینانەی ووتەوە ، هەر بۆیە کە ( سهیل ) ئەبینی دەفەرمووی : ( قد سهل أمركم ) واتە : ئیشە کەتان ئاسان بوو..!!

السيرەالنبويه لابن هشام ٣/١٦٨ .

ئ

**هەروەها لە بەسەرهاتی ریکەوتنامەی صولحی الحودیبیە لە البخاری و مسلیم ریوایەتیان کردووە :**

**کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بانگی ( علی کوری ئەبو تالیب ) ی کرد ، کە ریکەوتنەکە یان پەیمانەکە یان صولحە کە بنوسیت ، پی فەرموو : ( بسم الله الرحمن الرحیم ) ، بەلام ( سهیل ) رازی نەبوو ، ووتی : من نازانم ( الرحمن ) کیە !! بەلکو بنووسە : ( باسمك اللهم ) بۆیە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بە ( علی ) فەرموو : وەك ئەو دەلی وای بنووسە ، ئینجا ( علی ) نووسی ( هذا ما کاتب علیه محمد رسول الله ) واتە : ئەو شتیکە محمد پیغەمبەری خوالەسەری ریکەوت ، بەلام دیسان ( سهیل ) رازی نەبوو ، گوتی : ئەگەر زانیبامان تۆ پیغەمبەری خوای شەرمان لەگەل نەدە کردی ، بۆیە دە بیت بنووسری ( محمدبن عبدالله ) پیغەمبەریش فەرمووی : من پیغەمبەری خوام هەرچەندە بە درۆشم بزانن ، دەی ( علی بنووسە : ( محمد بن عبدالله ) ووشەی رسول الله رەش بکەوە ( علی )یش نارازی بوو بەوەی رەشی نەکردەوە ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) خۆی رەشی کردەوە .السیرە لابن هشام ١٦٩/٣ .صحیح البخاری ٤١٨١ .**

**بەندە کانی صولحی الحدیبیە :-**

**١-موسلمانەکان ئەم سال ناچن بۆ ( عومرە ) کردن بۆ شاری مککە ، ئەگەرساڵیکی تر بینەوە ( ٣ ) رۆژ لە شاری مککە دەمینەوە ، چەك و شمشیرە کانیا لە پشت دەبیت نابیت قورەیش بەهیچ شیوەیەك ریگری بکات.**

**٢-بۆ ماوەی ( ١٠ ) سال شەرو جەنگ و کوشتار دەوەستیت لەنیوان قورەیش وموسلمانەکاندا ،بۆ ئەوەی خەلکی تیدا بە ئەمینی بسورینەوە دەست لەیەکتر دەپاریزن .**

**٣-هەرکەس وکۆمەلیك بیەویت هاپەیمان بیت لە گەل ( محمد ) ئەوا بۆی هەیە ،وەلەگەل قورەیش بەهەمان شیوە ، هەر هۆزیك دەچیتە هەرلایە کیانەوە ،ئەوا دەبیتە بەشیك لەوان ،بۆیە هەر دوژمنکارییەك بکریتە سەر ئەوانیە دینە نیو هاوپەیمانی هەریە کیکیان ئەوە دوژمنکاریە بۆ سەر ئەو لایەنە.**

**٤- هەر کەسیك بەبی فەرمانی گەورە کەی بچیتە لای ( محمد ) دە بیت بگەرینەریتەوە بۆلای قورەیش ، بەلام هەر کەسیك لەلای محمد بچیتە لای قورەیش ئەوا ناگەریندریتەوە .**

**ئینجا دوای ئەوەی صولحە کە تەواو بوو هۆزی ( خوزاعە ) هاتە نیو هاوپەیمانیتی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە ( بنی بکر ) بووە هاوپەیمانی قورەیش ..!!**

ئ

بەلی دوا بەدوای ریکەوتنی صولحی حدیبیە ئەوە بوو ، موسلمانان نیگەرانی خۆیان دەر بری ، چونکە ئەوا تەنها بۆ ( عومرە )کرد هاتبوون نەك بۆ شەر کوشتار کردن ، ئا ئەوە تە کافرانی قورەیش ریگری دەکات ناهلیت موسلمانان توافی کەعبی پیرۆز بکەن ، ئەوە بوو ( عمری کوری ختاب ) – خوا لی رازی بیت– وەك نوینەری موسلمانان چووە لای ( ابو بکر صدیق ) – خوا لی رازی بیت – پی فەرموو: ئایا ئەو پیغەمبەری خوا نیە ؟! ئەویش ووتی : بەلی. پیغەمبەری خوایە . فەرمووی : ئایا ئیمە موسلمان نین ؟! ووتی : بەلی . فەرمووی : ئایا ئەوان کافر نین . ووتی : بەلی . فەرمووی : ئەی بۆچی ئیمە لە ئاینی پاکی ئیسلام تنازول دە کەین نەرمیان لە گەل دا دەنوینین ؟! ( ابو بکر صدیق ) فەرمووی : ئەی عمر شوین کەوتووی پیغەمبەرکەت بکە ، من شایەدی ئەدەم کە ئەو پیغەمبەری خوایە. ( عمری کوری ختاب ) فەرمووی : منیش شایەدی دەدەم کە پیغەمبەری خوا یە .ئینجا ( عمری کوری ختاب ) دواتر چووە لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پی ووت : ئەی پیغەمبەری خوا ! ئایا تۆ پیغەمبەری خوا نیت ؟! فەرمووی : بەلی . ووتی : ئایا ئیمە موسلمان نین ؟! فەرمووی : بەلی . ووتی : ئایا ئەوان کافرو موشریك نین ؟! فەرمووی : بەلی . ووتی : ئەی بۆچی ئیمە لە ئاینەکەمان تەنازول دە کەین ؟! پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( انا عبدالله ورسوله لن أخالف أمره ولن یضیعني ) واتە : من بندەو رەوانەکراوی خوام وسەرپیچی لە فەرمانی ناکەم لە فەرمانی دەر ناچم ..!! بی گومان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەفەرمانی خوا ئەم ریکەوتنەی لەگەل قورەیش بت پەرست ئە نجامدا بۆ بەرژەوەندی موسلمانان ،کە بۆ سالانی داهاتوودا بەرهەمەکەی بە بدوورنەوە بە چاك پوختی دەرکەوت ، ئەویش بوە هۆی سەرکەوتنیکی یەکجار گەورە ، فتح کردنی مککە. بی گومان دواتر ( عمری کوری ختاب ) زۆر لە و هەل ویستەی خۆی پەشیمان بوو ،بۆی دەرکەوتوە ، کە نیگەرانی خۆی هاوەلانیشی لە جیگای خۆی دا نەبووە ،هەر بۆ یە ( عمری کوری ختاب ) لە دوای دا بەبەردەوامی دە پاریەوە لە خوای گەورە کە دوای لی خۆش بوونی لی دە کرد ، بەردەوام لە نویژە کانی دوعای لی خۆش بوونی لە خوای گەورە دە کرد خیرو چاکە و صدقەی زۆر دە کرد ،بۆئەوەی کە خوای گەورە لی خۆش بیت ،بەرانبەر ئەم هەلویستە کە کردی ،بۆ پیغەمبەرکەی ( صلی الله علیه وسلم ) بەلی ( عمر ) زۆر پەشیمان بۆوە لە م رەفتارەی کە کردی ،بەلام خۆ ( عمر ) مرۆڤیکی ئاسایی بوو ، نەیدەزانی کە دواتر چی روودەدات ، ئەوە پیغەمبەری خوایە ( صلی الله علیه وسلم ) لە ریگای وەحی دەرئە نجامی ریکەتنەکە بینی بوو ، بەلام ( عمر ) بۆ ئەوەی بەرگری لە ئاینەکەی بکات لەبەر مەردایەتی و دلسۆزی خۆی بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم کارەی ئە نجام دا ، ئەوە بوو کە هیشتان نەگەرا بوونەوە شاری مەدینە هەر لەریگا دابوو سورەتی فتح هاتەخوارەوە ..!!السیر النبویە لابن هشام ٣/١٦٩ .

ئ

بەلی بی گومان لە کاتی گەرانەوەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و موسلمانان بۆ شاری مەدینە لە نیوان ریگای شاری مککە و مەدینەدا سوورەتی ( الفتح ) بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هاتە خوارە وە ، کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لەم بارە یەوە فەرموویە تی : (( أنزلت علی اللیلة سورة لهي أحب إلی مما طلعت علیه الشمس )). رواه البخاري ٤١٧٢-٤١٧٧. واتە : ئەم شەو سورەتیکم بۆ هاتە خوارەوە ، کە لام خۆشەویستە لە هەرچی رۆژی لە سەر هەلهاتووە ، پاشان ئەمەی خویندەوە ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا﴾ الفتح ١ . واتا : ئیمە سەرکەوتنیکی ئاشکرامان بۆ هیناوە دی .

لە پاشاندا هاوەلان ووتیان : پیرۆژە موبارکەو بە سەرو دلی خۆش ، ئەی بۆ ئیمە چی هەیە ؟!

( خوای گەورە ) ئەمە ئایەتەی ناردە خوارەوە دەفەرموویت :﴿ لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَكَانَ ذَلِكَ عِنْدَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ الفتح ٥ . واتا : ئەمەش هەموو بۆ ئەوەی ، تا ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان بخاتە ناو بە هەشتیکەوە کە چەندەها رووبار بە ژیری درەخت و ببە بەردەم کۆشك و تەلارەکانیدا دەروات ، هاوری لەگەل ژیانی نەمریدا ، هەروەها بۆ ئەوەی کەچاو پۆشی لە هەلە و گوناهەکانیان بکات و ئەم بەلینە لەلایەن خواوە دەستکەوت و سەر فرازیەکی زۆر گەورە و بی سنوورە بۆ ئیمانداران ..!!

ئینجا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانی بە هاوەلانی کرد با ئحرام کردن بشکینن سەری خۆیا بتاشن مەرو مالات سەر ببرن ،( ٣ ) جار ئەم ووتەیە دووبارە کردەوە بەلام کەس هەلنەساو جی بەجی نەکرد ، لە دوای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) چووە لای ( ام سلمە ) دایکی ئیمانداران ،باسەکەی بۆ گیرایەوە ئەویش ووتی : بی ئەوەی قسە لە گەل کەس بکەیت حیوانەکەی خۆت سەر ببرە ، سەری خۆت بتاشە ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وای کرد ، هاوالانیش چاویان لەو کرد ، بەلام پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ووشترە کەی ( ابو جهل ) سەر بری کە ناوی ( قصواء) بوو ، کە ئەلقەیەکی زیوی لە لووتی ووشترەکە بوو،ئەوەشی بۆیە کرد تا رقی کافرانی قورەیش هەلسینی .لابن هشام ٣/١٧١.

لیرەدا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) زۆر ریزی لە ( ام سلمە ) ی خیزانی گرتووە راویژی پی کردووە ،کە زانی قسە کەی راست وباشە ، بەقسەی کردو چارە سەری کیشەکەشی کرد ..!!

ێ
دوای ئەوە هەر دوولا لە نووسینی پەیمانی حودیبە بوونەوە ،لەو کاتە دا ( أبا جندل ) کە کوری ( سهیل ) بوو ، بەدەست بەستراوی لەشاری مککە هەلهاتبوو ، گەیشتە لای موسلمانان ،( سهیل ) دوای لە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) کرد کە ( اباجندل ) پی بداتەوە ، پیغەمبەریش ( صلی اللە علیە وسلم ) وەك دەست پیکی پەیمانەکە جی بەجی بکریت ( ابا جندل )ی داوە بە ( سهیل ) ، دواتر پیغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) فەرموو : ( ابا حندل ) صبر بگرە ( خوای گەورە ) بۆ تۆ ئەوانەی وەك تۆن دەرگای خیر دە کاتەوە ، ئیمە لە گەل ئەوان پەیمانمان بەستووە نابی پەیمان شکینی بکەین .رواە احمد .

دواتر هەندیك ئافرەت لای پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) کەلە لای کافرانی قورەیش هاتبوون موسلمان بوو بوون ، کەس و کاریان داوایان کردن کە بیان گەرینەوە ، بەلام پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) رازی نەبوو ، چونکە لە بەندەکانی پەیمانەکە تەنها ناوی پیاوان هاتبوو نەك ئافرەتان. هەروەها ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنْفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنْفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنْفَقُوا ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾**الممتحنة** ١٠ .

واتا :ئەی ئەوانەی باوەرتان هیناوە کاتیك ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دین بۆ لاتان تاقیان بکەنەوەو بەوردیی پرسیاریان لی بکەن سەبارەت بە کۆچ و هۆی هاتنە کەیان ،خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان ، جا ئەگەر زانیتان باوەر دارەن ، ئەوە مەیان گیرنەوە بۆلای میردە بی باوەرەکانیان ، نە ئەم ئافەرتە حەلالی ئەو بی باوەرانەن ، نە ئەو بی باوەرانەش حەلالن بۆ ئەم ئافرەتانە ئیماندارانە، ئەو مارەیەی کە میردە کانیان خرجیان کردووە بۆیان بگیرنەوە ،ئیتر هیچ رەخنەیەکیش لەسەر تان نیە ئەو ئافرەتە مارە بکەن کاتیك مارەییان بدەنی ، ئافەرتانی کافر مەهیلنەوە لای خۆتان ، واتە مارەیان مەکەن ، ئیوەش ئەی ئیمانداران ئەگەر مەسرفیکتان کردووە لە ئافرتیکی کافردا دوای بکەنەوە ، ئەوانیش ئەگەر مەسرەفیکیان کردووە لە ئافرتیکی ئیماندار دا با دوای بکەنەوە ، ئا ئەوە حوکم و فەرمانی خوایە ، کە خۆی فەرمانرەوایی دەکات لە نیوانتاندا ، ( خوای گەورە ) ش هەمیشە زانا و دانایە ..!!

ێ

بەڵی باسی ( ابو بصير ) كاتێك پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) گەڕایەوە شاری مەدینە ، ئەوە بوو ( ابو بصير ) لە شاری مككە ،موسڵمان بوو كافرانی قورەیش زۆر ئازاریان دەدا ، چەنگیان پێ هەڵچنی بوو ، هەر بەم هۆیەوە هاتە شاری مەدینە ،لە دەست كافرانی قورەیش خۆی رزگار كرد ، ئەوە بوو لەدوای هاتنی ( ابو بصير ) بۆ شاری مەدینە قورەیشە كافرەكان دوو پیاویان رەوانەی شاری مەدینە كرد ،بۆ لای پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ هێنانەوەی ( ابو بصير ) ئەوە بوو لە ئە نجامدا پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە سەر رێكەوتنی ئەم پە یمانە كە مۆر كرابوو ، هەر پیاوێك لە كافران بێتە شاری مەدینە دە بێت تسلیم بكرێتەوە ، پێغەمبەریش بۆ ئەوەی پە یمانەكە نەشكێت ، ئاوای كرد ، ( ابو بصير ) داوە بە دوو پیاوە قورەیشیە كە ، ئەوە بوو ( ابو بصير ) لە گەڵ دوو پیاوە قورەیشیەكە گەڕانەوە بۆ شاری مككە ، لە رێگا دا بوون ، تا گەیشتنە ( ذو الخليفة ) ئەوە بوو ( ابو بصير ) بە شێوەیەك شمشێرەكەی لە یەكێكیان وەردەگرێت و دەی كوژێت ، ئەوە پیاوەی دیش رادەكات ، خۆی دەگەێنیتەوە شاری مەدینە ، ئەم مەسەلەیە بۆ پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) باس دەكات ، ئەلی ( ابو بصير ) دەگەڕێتەوە شاری مەدینە، بەلام ( ابو بصير ) دەیزاینی ئەگەر بگەڕێتەوە شاری مەدینە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) تسلیمی دەكاتەوە ، ئەویش نەگەرایەوە رۆیشت لەنزیك دەریا سور مایەوە ،دواتر ( ابا جندل ) پەیوەندی بە ( ابو بصر ) دەكات ، ئینجا خەڵكیكی تریش بە هەمان شێوە نایەن بۆ شاری مەدینە لەبەر ئەو پە یمانەی كەلە صولحی حودیبیە موسلمانەكان بەستبوویان ،لەم شوینە خۆیان حەشاردەدن ، ئەوەی لە شاری مككە موسلمان بایە ئیمانیكی راستی قینەی هەبوایە بە هەمان شیوەی ( ابو بصير و أبا جندل ) یان ئەكرد ، بەم پیە كۆمەلیكی زۆر لە موسلمانان لە نزیك دەریای سوور كۆبوونەوە ، هەر كاروانیكی قورەیش بەویدا تیپەری بایە ، دەیان گرت و نەفەر كەیان دە كوشت ،هەر بۆیە قورەیش دوایان لە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كرد كە ئەوانە بهێنیتەوە لای خۆی و ، پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) بەدوای ئەم كۆمەلە موسلمانەدا دەنیری ئەوانیش دینەوە ناو شاری مەدینە ..!!

ئ

ئاشکرایە کەصولحی حودیبیە یان پەیمانی حودیبییە ڕووداویکی گرنگی میژووی ئاینی ئیسلام بوو ، چونکە دەرگای خیرو بەرکەت و فەرەوانبوونی کردەوە ، ئەوە بوو بووە بە سەرتای گەشە کردنی دەلەتی ئیسلامی لە شاری مەدینە دا ، هەرچەند موسلمانەکان لەروالەتدا نەگەیشتنە مەبەستی خۆی ، بەلام دەرگای خیر کرایەوە بەسەر موسلمانانداا ،بەلام وەك ئەوەی کە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) ئاماژەی پی کرد و کە ( خوای گەورە ) زانا و دانایە بەوەی ڕوودەدات ، وە بە وەش کە ڕووی نەداوە ، بەلی ئەم پەیمانەی حودیبیە بە سەرکەوتنیکی یەکجار گەورە سەرفرازی بۆ موسلمانان هینایەوە ،کە سورەتی ( الفتح ) مژدەی سەرکەوتنی بە موسلمانەکان دا ، هەرواش بوو ،چونکە ئەم سالە ( ١٤٠٠ ) کە سی لە گەل دا بوو ، بەلام بە ماوەی دووسالی تر ئەوە بوو ( فتح ) ی شاری مککە کراو موسلمانان بە ( ١٠٠٠٠ ) کەسەو هاتن فتحی مککە یان کرد ، بەلام ئەم صولحە بووە مایە هیوەرکردنەوەی ئەمن وئاشایشی وە دوورگەی عەرەبی لە کەش هەوایەکی ئارام دا ئەژیا لەم ماوەیە دا ، بەلی هەر ئەم پەیمانە بوو ، کە قورەیش دانی نا بە دەولەتی ئیسلام لەشاری مەدینە ، هەروەها لە هەمان کاتدا شارەزا بوونی کافرانی قورەیش لە کاتەدا لە موسلمانەکانی شاری مەدینە، هەربۆیە لە دوای ئەم صولحە پۆل پۆل و کۆمەل کۆمەل ودەستە دەستە دەهاتنە ناو ئاینی ئیسلامی پیرۆز دا هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا﴾ النصر ١-٢ . واتا: کاتی یارمەتی و کۆمەکی خوا دیت ،شاری مککە ڕزگار دەکریت و دەرگای ئازادی والا دەکریت ،خەلکیش بینی پۆل پۆل دەچنە ریزی ئاینی خواوە ..!!

هەروەها لەدوای ئەم پەیمانە ئەوە بوو قورەیشیە کان کافرە کان پەرتەوازە بوون کۆمەلگای قورەیش پەرتەوازەییانتیدا دەرکەوت ، وە کاری گەری ژیانی موسلمانان لەسەرکافرانی قورەیش و بت پەرستاندا ،

بەلی هەر ئەم پەیمانە بوو ، کە موسلمانان توانیان کە ئاوریك لە ( خەیبر ) بدەنەوە کە ببووە مەلبەندی خیانەتکاران و مونافیقەکان جوولەکەی داخ لە دل سینە پیس ، کە سالە ها سال بوو ، هەموو پیلانیکی قیزەون خیانەتکار کاریکی خراپە بکرابایە ، ئە وا سەرچاوەکەی لە ( خەیبر ) وە بوو ، شوینی پیاو خراپان نەخشە و پیلان داریژەرانی دژ بە ئیسلام بوو ، بەلی ئەم سەرکەوتنەی پەیمانی حودیبیەیە جیاوازی نەبوو، لە گەل ئەم سەرکەتنانەی کە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) لە غەزاکانی دا سەرکەوتنی بەدەست دەهینا ، بگرە زۆر باشترو چاکترو سەرفەراز تربوو ،بۆ دەولەتی ئیسلام لەمەدینەدا،

چونکە بناغەی بە دولەت بوونی مەدینە لە صولحی حودیبیە چەسپا و دامەزرا..!!

# بەشی : دووەم

نامە نووسین بۆ پاشاکانی جیهان

فتح کردنی ( خیبر )

ڕووداوەکان و غەزاو سریەکانی دوای فتح کردنی ( خیبر )

غەزای ( موتە )و ڕووداوەکانی

سریەی ( ذات سلاسل ) و سریە ی ابوقتادة بۆ ( خضرة )

# نامە نووسین بۆ فەرمانڕەواو پاشاكانی جیهان

بەلی بەستنی ریكەوتنی پەیمانی حودیبیە قۆناغیكی گرینگ و نوی بوو لە میژووی سەرهەلدانی بانگەوازی ئیسلام و دەولەتی ئیسلام لە مەدینە ، چونكە لە پیشدا باسمان كرد كە لە دوورگەی عەرەبی دا سی هیزی زۆر بەهیز و بە چەك تفاقەوە هەبوون ، وەك قورەیش و هاپەیمانەكان ، هیزەكانی غەتفان و هۆزەكانی دەوربەری ، هەروەها هۆزەكانی جوولە كە بە تایبەتی بنی ( نضیر ) و ( بني قريظة ) بني ( قينقاع ) هەروەها جوولەكەكانی ( خیبر ) كە مەلبەندی پیلان گیری و خیانەت خیانەتكاری بوو ، سەنتەری هەموو جوولەكەكانی دەورو بەری شاری مەدینە بوو ، هەر پیلانیك بكراوبایە وە ئەنجام بدرابایە ئەوا لە سەنتەری پیلان گیرانەوە كە ( خەیبر ) بوو ، بەلی دوای گەرانەوەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە پەیمانی حودیبیە ، لە كۆتایی سالی ( ٦ ) شەشەمی كۆچی دا یان سەرەتایی سالی ( ٧ ) حەوتەمی كۆچی دا ، بەلی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بانگی پاشا و میرە كانی جیهانی كرد بۆ بانگەوازی ئیسلام نامە نووسین بۆ پاشاو كاربەدەست میرە كانی جیهان ،بانگی كردن بۆ سەر ئیسلام ، بەلی كاتیك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هاتە سەر ئەوەی كە نامە بنیری بۆ پاشاكانی جیهان ، رۆژیكیان هاتە نیو هاوەلانی خۆی فەرمووی : (( يا أيها الناس ! إن الله قد بعثني رحمة وكافة ،فلا تختلفوا على كما اختلف الحواريون على عيسى ابن مريم )). واتە : خوای گەورە منی بە رەحمەت بۆ سەر هەموو مرۆڤ رەوانە كردووە ، جا با ئیوەش دەربارەی من ناكۆكیتان یان مشت مرتان تی نەكەوی ، وەك حیواریەكانی عیسی كوری مەریم كە ناكۆ كیان لی كەو تەوە ..!! هاوەلانیش ووتیان : ئەی پیغە مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) حیواریەكان ناكۆكیان چۆن تی كەوت ..؟! ئەویش فەرمووی : (( دعاهم إلى الذي دعوتكم إليه ،فأما من بعثه مبعثا قريبا فرضي وسلم وأما من بعثه مبعثا بعيدا فكهر وجهه وتثاقل )) . واتە : بانگی كردن بۆ ئەوەی كە من ئیوەم بۆی بانگ كردووە ،جا هەر كامیان بۆ شوینیكی نزیكی رەوانە كرد، ئەوا پیی رازیی بوو و ، رۆیشت ، هەر كامیشیان بۆ شوینیكی دووری رەوانە كرد ، ئەوا رنگی دەم چاوی هەلگەرا و بە كاریكی گرانی زانی ئەنجامی نەدا ..!! بەلی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پاشان باسی بۆ هاوەلانی كرد ،كە بەنیازە نامە بنووسیت بۆ ( هیرەقل ، و كیسرا ، و موقەو قەس ، و نەجاشیی ) وە جگە لە وانە نامە ی نووسی بۆ گەلیك لە سەر هۆزو میرە كانی دەروبەری دوورگەی عەربی ،بۆ ئەوەی بانگی هەموان بكات بۆ ئیسلام بینە سەر ریبازی حەق راستی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ،بەلی بۆ ئەمە هاوەلان رەزامەندیان نواند ،كاتیك كە دەستی كرد بەنامە نووسین بۆ پاشاكان پیان ووت : بی مۆر كردنی نامەكان وەلامی هیچ نامەیەك نادەنەوە ، هەر بۆیە مۆری لە نامەكان دا ..!!هەر بۆیە پیغەمبەری

ئ

خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەگوستیلەیەکی زیوی دروست کرد نووسی : ( محمد رسول الله ) لەسەرەوە ( الله ) لە ژێرەوە ( رسول ) لە دوای ئەویش ( محمد ) ،ئەم مۆری پێغەمبەری خوا بوو( صلى الله عليه وسلم )..!!

هەروەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) : (( إني أتخذ خاتما من ورق ونقشت فيه : محمد رسول الله فلا ينقشن احد على نقشه )) رواه البخاري ( ٥٨٧٢، ٥٨٧٤-٥٨٧٩ ) و مسلم ( ٢٠٩٤ )

واتە : من ئە نكوستیلە یە كی زیو دەكەم بە مۆر یان ختم ، ئەو دەستە واژەیە تیدا هەلدە كەنم ، كە تیدا نووسرابیت ( محمد رسول الله ) با هیچ كەس لە ئیوە لە سەر ئەو شیوازە نەخشە سازیە هەنەكەنیت ..!!

بەم شیوەی ئەم وینەیە بوو کە نووسینە کە هەلکەندرا بوو، لە شیوەی ئەنگوستیلەی زیو ...!!



ی

## یەكەم : پیغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ ( نەجاشی ) پاشای وەلاتی حەبەشە :

بەلی با لە پیشەوە لە بیرمان نەچیت ، لە ماوەی پیغەمبەرایەتی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دوو پادشا فەرمانرەوایی وەلاتی حەبەشەیان كردووە ، كە ئیستا وەلاتی ( اثوبیا ) یە پایەتەختی ( ئەدیس ئەبابەیە ) دانیشتوانی ئەمم وەلاتە لە سەر ئاینی نصرانین واتە ئاینیی مەسیحی یان گاورن ........!!

بەلی ووتمان دوو پاشا فەرمانرەوایی حەبەشەیان كردووە ، یەكیكیان لە و كاتە دا كە كۆچی یەكەمی حەبەشە ئەو كاتەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە شاری مككە دا ، كۆمەلیك موسلمان كۆچیان كرد بۆ حەبەشە لەبەر زولم و ستەمی ئازاردانی قورەیشە كان ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ( جعفري كوری أبو طالب ) ی كردە ئەمیری ئە م كۆمەلە موسلمانە كە كۆچیان كرد بۆ وەلاتی حەبەشە ، دوای لە نە جاشی كرد كە بیان حەوینیتەوە ، دوا شی نەكرد كە نەجاشی موسلمان بیت ،چونكە پیش كۆچ كردن بە گونجاوی نەزانی دوای موسلمان بوون لە پاشایان بكات ، تەنها دەستی دۆستایەتی بۆ دریژ كردن ، واش دەردەكەویت ئەم نەجاشیە ئیمان و باوەر چۆتەدلیەوە ، چونكە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نویژی غاییی لە سەر كردووە ، بەلی پاشای دووەمی حەبەشە ئەو نەجاشیە بووە كە پیغەمبەری خوا نامەی بۆ ناردووە كە موسلمان بیت ، كە ناوی ( اصحمەی كوری ا بجر ) بووە هەندیك دەلین : لە سالی شەشەمی كۆچی دا بووە یان سەرەتایی سالی حەوتەمی كۆچی دا بووە ، یان هەنیكی تر دەلین :لە سالی نۆهەمی كۆچی دا بووە لە كاتی گەرانەوەی سوپای ئیسلام لە غەزای تەبووك ، كە دوای لی كردبووە موسلمان ببیت ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نامە كە دەنیری بە ( عمري كوری ئومییە ی ضمري ) بووە . بەلام كاتیك عمر دەگاتە وەلاتی حەبەشە دە گیرنەوە دەلین : ئەو كات پاشای حەبەشە واتا نەجاشی دووەم كە ناوی ( اصحمەی كوری ا بجر ) بووە ، بەلی كاتیك ( عمر ) گەیشتە لای نەجاشی ئەو خەلكانەی خۆی دە چوونە لای نەجاشی بە شیوەیەكی چەمانەوە وەك كرنوش بردن یان خۆ چەمانەوە دە چوونە لای ،چونكە دەرگای چوونە ژوورەوەی لای پاشا زۆر بچووك بووە ، وایان دروست كردبوو كە هەرچی بیتە لای پاشا دەبیت خۆی بچە مینیتەوە ، هەروەك زالم دەستە هەلات دارانی ئیستا كە ئەگیرنەوە ئەوانیش وایان كردووە دەرگای دیوەخانەكانیان بچووك كردووە ئەوەی سەردانیان دەكات دەبیت خۆی بچە مینیتەوە ، وەك ئاغاو پاشا و میرە كان سەرۆكەكانی ئەم وەلاتانە یان سەرۆك عەشیرەتەكان زۆر خەلكی تری وایان كردووە ،چاویان لە نەجاشی پاشای حەبەشە كردووە ، چونكە ئەوەندە خۆیان بەگەورە زانیوە ئەوەی بچیت لایان دە بیت خۆی بچە مینیتەوە ، باب و باپیران مان ئەمەیان گیراوەتەوە لە میرە كوردەكان ئاغاو كیخواكان سەرۆك عەشیرەتە كان ،ئەمانە ئەوەندە خۆیان بەگەورە زانیوە بیریان لەم كارە قیزە ونە كردۆتەوە ، بەلام گەورەیی هەر بۆ رب العالمین زاتی ( الله ) یە خوا پەنا مان بدات ...!!!

ئ

بەلی کاتیك (عمر) ئەو خەلکانەی بینی کە دە چوونە ژوورە وە لە دەرگا بچووکە کەی پاشایی حەبەشە بۆلای نەجاشی ، ئەوەندە بچووك بوو خۆیان دەچەماندەوە کاتیك دەچوونە ژوورە وە بۆ لای ، بەلام (عمری کوری ئومییە ضمري) بە شیوە یەکی تر چووە ژوورە وە بۆ لای پاشایی حەبەشە ، ئەویش پشتی خۆی تی کردووە وە بلین پشتا و پشت چووە ژووە وە بۆ ئەوەی خۆی بۆ نەچەمینیتەوە ، پشتی تیکر بۆ ئەوەی بە گەورە نەزانی کە ئەو بەندەیەکی خوای گەورە یە چۆن دە بیت کرنووش سووجدەی بۆ بەرەن ، بەلی ئەم هەلویستەی (عمر) حەبەشیە کانی تووشی راچەلکاندن کرد تووشی شۆکی کردن ..!! بەلی کەوتنە بیری کردنەوەی ئەوەی کە چۆن بی کوژن ..؟! ووتیان ئەمە بۆ چی وە کو ئیمە نەهاتە ژوورە وە ..؟؟!! هەروەها نەجاشی پرسیاری لی کرد ئایا چشتیك ریگری بووە ئەوا وە ئەوان نەهاتیە ژوورەوە ..؟! (عمر) ووتی : ئیمە ئەم شیوازە یان خۆچە مانەوەیە بۆ پیغەمبەرکەمان نا کەین ..!! بۆ هەر کەسیکمان بکردایە ئەوا پیغەمبەرەکەمان شایستە تربوو، چونکە پیغەمبەرە کەمان لی قەدە غەی کردوون کە جگە لە خوا سووجدە یان کرونووش یان خۆچەمانەوە بۆ کەسی تر نەبەین ..!! هەروەها نەجاشی ووتی وازی لی بینن راست دە کات ..)) . **اخرجه : الطبراني في (الاوسط) (٣٨٩) ، و ابن ابي شيبة (٣٧٧٨٣)**.

ئەمەش دەقی نامە کەیە کە لە (ابن اسحاق) وە گیراویەتەوە هاتووە – خوا لی رازی بیت – بەدوو ریگا هاتووە یەکە م : (حاکم) گیراویەتەوە :

دەلی : ئەم نامەیە لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ نەجاشی :

(( بسم الله الرحمن الرحيم : هذا كتاب محمد رسول الله إلى النجاشي الأصحم عظيم الحبشي : سلام على من اتبع الهدى و ىمن بالله ورسوله وشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له لم يتخذ صاحبة ولا ولدا ، وأن محمدا عبده ورسوله ادعوك بدعاء الله ، فإني أنا رسول الله فأسلم تسلم ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ال عمران ٦٣ .

فان فعليك الم النصارى )). **اخرجه الحاكم (٢/ ٦٢٣)**. واتە : بەناوی خودای بەخشەندە و میهرە بان ئەم نامەیە لە محمد نیردراوی خوداوە بۆ نەجاشی (ئەصحمەی گەورەی خاون شکۆ ی حەبەشە) سلام لەو کەسەی کە شوین و ریگای هیدایەت دەکەویت ، باوەر بە خوا پیغەمبەرەکەی بهینی ، وە شایەتی بدە کە هیچ پەرستراوەیك نیە بە حەق تەنها (الله) نە بیت وتاك و تەنهایە ، و هیچ هاوبە شی نیە هاوسەرو منداڵیشی نیە ، وە شایەدی بدە کە محمد بەندەو پیغەمبەری رەوانەکراوی خودایە ، بانگە وازت دەکەم بۆ لای خودا ، من نیر درا و پەیامبەری خودام موسلمان بە سەلامەت دە بیت ، دواتر ئەم ئایەتەی سەرەوەی

ێ
خويند بۆ (ئەصحمەی) پاشای حەبەشە ..!!وە هەر وەها فەرمووی ئەگەر پشت هەل بکەیت و موسلمان نەبیت ، ئەوا تاوانی نصراکانی یان گاوەرکانی ژیر دەستی خۆ لە ئەستۆی تۆ دا دە بیت ..!!

دووەم : طبري گیراویەتەوە : دەلی : پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) (عمری کوری ئومییە ضمري) نارد بۆ لای نەجاشی (ئەصحمەی ) پاشای حەبەشە ، کە لە نامە کەیدا بۆی نووسی بوو : (( سلم انت فاني احمد اليك الله الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن ، واشهد ان عيسى ابن مريم روح الله وكلمته القاها الى مريم البتول الطيبة الحصينة فحملت بعيسى : فخلقه الله من روحه ونفخه كما خلق آدم بيده ونفخه ، وإني ادعوك إلى الله وحده لا شريك له ، والمولاة على طاعته وان تتبعن و تؤمن بالذي جائني ،فاني رسو ل الله ... ودع النجير فاني ادعوك وجنودك الى الله ،فقد بلغت ونصحت فاقبلوا نصحي ،والسلام على من اتبع الهدى )). اخرجه : الطبراني في التاريخ (٦٥٢/٢ )

واتە : سلاو لە تۆ و موسلمان ببە من سوپاس و ستایشی (خوای گەورە ) دەکەم کە خاوەنی ئەم ناوە و سیفەتەکانەیە (الملك ، القدوس ، السلام ، المؤمن ، المهيمن ) وە شایەتی دەدەم کە عیسی کوری مەریم _سلاوی خوای لی بیت - وە (روح ) و (کلمه ) خودا بەخشیویەتی بە مەریمی داوین پاك و رەوشت بەرز ، خۆ پاریزی کردە دووگیان بە عیسی – سلاوی خوای لی بیت - خوای گەورە دروستی کرد لە (روح ) خۆی بە هۆی فورپیدا کرنی ،فریشتەو بە فەرمانی خوا ، هە ر وەك ئادەمی دروست کرد بەدەستی خۆی و فوی پیدا کرد ، من بانگەوازت دە کەم بۆ لای خودایەکی تاك و تەنها و بی شەریك و هابەش ، وە بۆ سوور بوون لەسەر خۆشەویستی پشتیوانی کردن ، لە سەر گویرایەلی فەرمانەکانی دوات لی دە کەم ، کە شوینی ئەم بانگە وازە بکەویت ، وە باروەت بە وپەیمامە هەبیت کە من هیناومە ، وە دلنیابە من نیردراوی خودام ...دەست هەلگرە لە خۆ بە گەور زانین و ستەم کردن ، تۆش و سەربازەکانیشت بانگ دە کەم بۆ لای خودا ..!! ئەوە من پەیمای خۆم پی راگەیاندو ریگای هیدایەتم بۆ رۆشن کردنەوە ئیوەش ئامۆژگاری و رینمایی خوا وەر بگرن رەتی مە کەنەوە ، وە سلاو لە و کە سەی کە شوین ریگای هیدایەت دەکەویت ، نەجاشی لەوەلامدا : ئەم نامەی بۆ پیغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم ) نووسی : بەناوی خوای گەورە و میهرەبان ، بۆ محمد پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لە نەجاشی (ئەصحەمی کوری ا بجر ) سلاوی خودای خاوەن بەزەیی فەرو بەرەکەت لە تۆ بیت ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لە خودا یەکەوە کە بیجگە لە خۆی هیچ پەرستراویك بە حەق بوونی نیە ، ئەو خودایە کە منی رینمۆیی کرد بۆ ئیسلام و هیدایەتی دم پاشان ، نامە کەت گەیشتە لام ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لەویدا تیدا باست کردووە عیسی ئەوەندەی تویکلە دەنکی خورما زیاتری باس نە کردووە لەوەی تۆ فەرمووتە : لەوە تیگەیشتین کە ناردوتە بۆ لامان ئیمە ئامۆزا کەت و هاوەلانیمان لە نزیك خۆمان داناوە

نیشتەجیمان کردوون ...!!!

ێ
شایەتی دەدەم بە پەری راست گۆیانەوە و لە ناخی دلەوە کە تۆ پێغەمبەری خودایت ، وە بەیعەتت پی دەدەم وە کورە مامەکەشت دەکەمە وەکیل بۆ بەیعەت دان و لەسەر دەستی ئە و موسلمان دەبم ،ملکەچی فەرمانەکانی پەروەرگاری جیهانیان دەبم ، وە السلام علیك ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )

هەروەها ( خالید سەید علی ) لە کتابەکەی دا (رسائل النبی ) ص١٤ . دەڵی : وینەی دەقی ئەو نامەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نەجاشی ناردوویەتی لە ( اسکوتلاند ) هەیە لە لای رۆژ هەلات ناس (د.م . دنلوب ) پاشان نەجاش دوو خوفی رەشی بەدیاری بۆ پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لەگەل نامە کە دا ، خوف وە گۆری وایە لەپی دە کرێت لە چەرم پێستە دروست دەکرێت ..!

هەر لە بارەوە لە ( بورەیدە ) – خوا لی رازی بیت – بۆ مان دە گرتەوە دەلی : نەجاشی دوو خوفەی رەشی سادەی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەویش لە پی کردن و دەست نویژی کرد و مەسحی لەسەر کردن بی ئەوەی لە پی کاتەوە یان داینی و قاچی بشوات )).اخرجه : ابو داود برقم (١٥٥) . هەروەها لە عائشەوە – رخوا ل رازی بیت – دەفەرموویت : (( نەجاشی خشلی رازاندنەوەی بەدیاری بۆ پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) رەوانەکرد ، کە ئەنگوستیلەیەکی زیری تیدا بوو ، کە نەقش و هەلکەندنی حەبەشەی تیدا بوو ، پێغەمبەری خوا هەلی گرت وا پی جوان بوو ، بەلام خۆی حەزی پی نەکرد یا خود لە پەنچە کانی دە کرد پاشان بانگی ئومامەی کچی ئەبو العاصی کرد کە کچی زەینبی کچی بوو فەرمووی : (( تحلى بهذا يا بنية )) واتە : کچم بە ئەمە خۆت برازینەوە ...!! اخرجه : ابو داود برقم (٤٢٣٥)، و ابن ماجه برقم (٣٦٤٤) ئا بەم شیوەیە نەجاشی موسلمان بووە ، چونکە پێغەمبەری خوا نویژی غائیبی لەسەر کردووە بەلام ( خوای گەورە ) زانا ترە ، بەلی نەجاشی بە وە کیلی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە حەبەشە دا ( ئوم حبیبە ی کچی ئەبوو سفیان ) بوو،لە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) مارە کرد ، چونکە ( عبداللە ی کوری جحش ) لە گە ل کۆچ کەران چوو بوو بۆ حەبەشە هاوسەرەکەی کە ( ئوم حبیبە ) بوو لە گەلی دا بوو، بەلام دواتر ( عبداللە ی کوری جحش ) لە حەبەش ئاینی خۆی گۆری چووە سەر ئاینی نصرانی دواتری ، بەلی ( عبداللە ی کوری جحش ) دەکاتە کوری پوری پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کە دەکاتە کوری ئومەی کچی ( عبدالمطلب ) بەلی ئەم پیاوە لە حەبەشە بووە بە نصرانی یان گاور دواتریش بەهۆی نەخۆشی مرد ، پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نەجاشی کرد بە وە کیل ( ئوم حبیبەی ) هاوسەری ( عبداللە یکوری جحشی ) لی مارە کرد .......!!

هەروەها روودانی ئەو هاسەر گیریە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لەگەل ( ئوم حبیبە ) بەلی ( ئوم حبیبە ) خۆی بۆ مان دە گیریتەوە کە بیهقی لە دلائل النبوە دا بۆمان باس دەکات ،وە لە ( ئوم حبیبە )وە – خوا لی رازی بیت – دە فەرموویت : (( دوای کۆچی هاوسەرەکە م هەستیکی ناخۆشم لە وە لاتی حەبەشەدا بۆ دروست بوو ، هەستم بە غەریبیە کی زۆر دە کرد هەتا دوای نیردراوە کەی نەجاشی ، کە

ئ
خزمەت كاریکی ئافرەت بە ناوی (ئەبرهە ) کە تایبەت بوو بە جل بەرگی رازاندنەوەی نەجاشی ، هاتە لام دوای روخسەتی هاتنە ژوورە وەی لی کردم ، منیش فەرموو م لی کرد ، ئەویش ووتی : نەجاشی یان پاشا من ی ناردووە کە بەتۆ بلیم کە پیغەمبەری خوا لە ریگا ی نامەکەیەوە بە پاشای یان بە نەجاشی راگەیاندوە پاشا داخوای لە تۆ بکات بۆ پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) بۆ هاوسەر گیری ژیان ، بەلی پاشا منی ناردوە بۆ خەزمەتت بۆ ئەوەی ئەم داخوازیە پەسەند بکەیت ، (ئوم حبيبە ) ئەلی : منیش لە خۆشیان ووتم : خودا مژدەی خۆشیت بداتی ئە ی (ئەبرهە ) وتیشی پاشا پی ووتومە یەکی بە وەکیلی خۆت دەست نیشان بکە ، وە ك سەر پەرشتیار بە شووت بدا وە کەسی خۆت کارە کە جی بەجی بکات ..؟!

(ئوم حبيبە ) ئەلی : منیش ناردم بەدوای (خالیدی کوری سعدی کوری عاص ) خزمیکی نزیکی من بوو ، باپیرم برای پابیری بوو ، کردم بە وەکیلی خۆم ، وە لە خۆشیان دوو بازن و دووخرخال ئەنگوستیلە کە هەمو و زیو بوون بە دیاری پیشکەشی (ئەبرهەم ) کرد ئەو ئافرەتەی ئەم هەواڵە خۆشەی پیدام ، لە خۆشیان شادی بەختەوەی کەوتە هەموو گیانم ، کاتیك وەختی عیشا داهات ،نەجاشی میواندار ی بەم بۆنەیەوە ساز کرد ، بانگی (جعفری کوری عبدالمطلب ) - خوا لی رازی بیت – وە بانگی ئەو موسلمانانەیشی کرد کە لەوەلاتی حەبەشە بوو کۆچیان کردبوو ، نەجاشی لە میوانداریە کە دا ووتاریکی بۆ دایە ووتی : (( الملك ، القدوس ، السلام ، المؤمن المهيمن ، العزيز ، الجبار )) شایەتی دەدم کە جگە لە خوا هیچ خوایەکی تر نیە بە حەق و محمدیش بەندە و نیردراوی خودایە ، ئەو هەر ئەو کەسەیە کە عیسی کوری مەریم مژدەی هاتنی داوە پاشان : نەجاشی ووتی : پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) نامەی بۆ نووسیوم کە تیدا داخوازی (ئوم حبيبە ی ) کچی ئەبو سفیانی بۆ بکەین ،منیش وەلامی داوا کاریە کەی پیغەمبەری خوام داوە ﷺ بە دەم داوا کاریە کەی چووم ، ئەوە (٤٠٠) سەد دیناریشم کردە مارەیی (ئوم حبيبە ) پاشان پارەکەی خستە بەردەم خەلکەکە ، دوای ئەوە (خالیدی کوری سعیدکوری عاص ) فەرمووی : سوپاس ستایش بۆ خوای گەورە کە شایستە پیدا هەلگوتنە وە دوای لیخۆش بوونیش هەر لە ئەو دەکەین وە شایە تمان بەیەکتا پەرستی خودا و پیغەمبەریەتی بەندایەتی محمد (صلی اللە علیە وسلم ) دینین ، کە خودا ئەوی بە هیدایەت دە رو ئاینیکی راست و دروست ناردوە بۆ ئەوەی سەری بخات بە سەر هەموو ئاین و بەرنامەکانی تردا گەر چی موشریکانیش پیان ناخۆش بیت ..!!

پاشان : ووتی :ئەوە وەلامی داخوازیەکەی پیغەمبەی خوام (صلی اللە علیە وسلم ) دایەوە بەدەم دواکەشی دە چین ، وە هەرچیەك پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) بیەویت بۆ جی بەجی دەکەین و وە (ئوم حبيبە ) ی کچی ئەبوسفیانی لی مارە دەکەین ،و ە پیشکەشی بیت (خوای گەورە ) ئەم هاوسەرگیریە لە پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) پیرۆز بکات ، نەجاشی پارەی مارەیەکەی دایە دەستی (خالیدی کوری سعید کوری عاص ) ئەویش قبولی کرد ، ئەوە بوو پاش ئەمە خەلکە کە هەستان ویستیان برۆن ،

ئ
نەجاشی ووتی : فەرموون دانیشن لە سوونەتی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دا ئەوە یە دەبیت نانی هاوسەرگیری ژن هینان یان مارە کردن نان بخوریت و پاشان نانیان خوارد بلاوەیان لی کرد )).اخرجه : البیهقی فی الدلائل النبوه ( ٤٦٢/٣ ) .

بەلی لە پیش دا ووتمان ( نەجاشی )ناوی ( ئەصحمەی کوری ا بجر ) بەخۆی نەجاشی ناویکی سەرکردە یان سەرۆك یان پاشا یان کاربەدەست بووە لە ناوچەی حەبەشە دا چونکە لە و کات لە وەلاتی حەبەشە هەر سەرۆك کیك یان پاشایەك یان کاربەدەستیك فەرمانرەوایی وەلاتی حەبەشەی بکرد بایە پیان دەووت نەجاشی هەر بۆیە ئەو نەجاشەی سەردمی کۆچی یەکەم جیاواز بووە لە نەجاشەی دووەم ، نەجاشی دووەم دوای نەجاشی یەکەم دیتە سەر تەختی پاشایەتی ،بەلام نەجاشی یەکەم ،بەدەم بانگەوازیەکەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیەوسلم ) چووە و موسلمان بوونی خۆی راگەیاندووە ، چونکە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نامەی بۆ رەوانەکردووە بۆی نووسیەوە کە باوەری پی بهینی موسلمان ببیت ئەویش بەدەم دواکەی پیغەمبەر چووە ، موسلمان بووە ، لە هەمات کاتیش دا چەندین دیاری بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ناردووە ، هەروەها بۆتەوەکیل ( ئوم حبیبەی ) لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) مارە کردووە ، بەلی ئەمەش جەند رای جیاواز لەسەری هەیە ، ئەلین : لە سالی شەشەمی کۆچی دا بووە هەندیکی تریش ئەلین : لە سەرتایی سالی حەوتەم دا بووە ، یان ئەلین : لەدوای پەیمانی حودیبیە یان دوای غەزای ( خەبیر ) بووە ،بەلی ئەو نەجاشی یەکەم ە ناوی ( ئەصحمەی کوری ئە بجر ) بووە موسلمانیش بووە ، لە دوای ئەو نەجاشی یەکی تەریش پاشایەتی وەلاتی حەبەشەی کردووە بەلام پیغەمبەری خوا نامەی بۆ ئەویش ناردووە ،هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەوالی مردنەکەی زانی ،ئەویش بە هاوەلانی راگەیان کە نویژی بەکۆمەلی غائیب لەسەر کرد ،بەلام نەجاشی دووەم بەدەم بانگەوازیەکەی پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نەهات موسلمان نەبوو ، ئەوەی هەیە نەجاشی یەکەم موسلمان بووە نویژی غائیبی لەسەرکراوە ، بەلی ووتراوە نەجاشی دووەم نامەکەی پیغەمبەری خوای ( صلی الله علیه وسلم ) دراندوە بەدەم داواکەی نەهاتووە ..!!

اخرجه : مسلم ( ١٧٧٤ ) ، اخرجه : ابو عبید ( الاموال ) ( ٦٢٥ ) ،وابو یعلی ( ١٥٩٧ ) .

ئ

## دووەم : پێغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ مەقەوقەسی پادشای وەلاتی مصر

بەلی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نامەی نووسی ناردی بۆ پاشای مصر و ئەسکەندەریە نارد ، کە ناوی ( جوريجي كوری متى ) بووە لە لایەن دەولەتی بیزنطیني كراوە بەفەرمانرەوایی وەلاتی مصر لەم سەردەمەدا ، ئەمەش لە كتابی ( رحمه اللعالمين ) دا هاتووە ج ١/ص١٧٨ ، وە مقەوقەس گەورەو پاشای قبتیەکانی مصر بووە ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ ئەم كارە نامە ناردنە ئەم كارەیە سپارد بە هاوەلی بەریز ( حاطبي كوری بەلتەعەی ) بۆ ئەم نامە بردنەی بۆ وەلاتی مصر هەلبژارد ، بەلی نیردراوی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەریكەوت بۆ وەلاتی مصر بۆلای مەقەوقەس پاشای قبتیەكانی مصر ، بەلی ( حاطبي كوری بەلتەعەی ) بە مە قەوقەسی پاشای مصری ووت : پیش تۆ پاشایەك هەبووە لەم وەلاتەی مصر دا ، بانگەشەی خوایەتی دەكرد، ( خوای گەورە ) كردیە پەندی دونیا ئاخیرە ، مەبەستی ( فیرعەنی ) مصر بووە سەردەمی موسى ( عليه السلام ) تۆلەی لی سەندەوە و تۆش ئەی مەقەو قەس پەند وەرگرە ، باكەس پەند لە تۆ وەرنەگریت ، بەلی مەقەو قەس موسلمان نەبوو بەلام ریزی لە هەلگری نامەكەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) نا .. اخرجه : البيهقى فى دلائل ٣٩٥/٤ ، و ابن هشام ٢٠٦/٤ . بەلی ئەم نامەیە كە ابن قيم لە زاد المعاد هیناویەتە وە ئەمەش دەقی نامە كەیە كە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ مەقەو قەسی پاشا ی مصری ناردووە

(( بسم الله الرحمن الرحيم ، من محمد عبدالله ورسوله اله المقوقس عظيم القبط سلام على من اتبع الهدى اما بعد : فاني ادعوك بدعاية الاسلام ، اسلم تسلم واسلم يؤتك الله اجرك مرتين فان توليت فان عليك اثم القبط ،﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ ال عمران ٦٤ .واتە : بەناوی خوای بەخشندە میهرەبان لە محمد بەندە پەیام بەری خوداوە ، بۆ مەقەوقەسی پاشای قبتیەكان ، وە سلاو لەو كەسەی كە شوینی ریگای هیدایەت دەكەویت وپاشان ، من بانگەوازیت دە كەم بە بانەگەوازی ئیسلام ، موسلمان ببە سەلامەت دەبیت ، موسلمان ببە ( خوای گەورە ) دوو جا پاداشتت دەداتەوە وە ئەگەر پشت هەلكەیت و وەلامی بانگەوازە خوایە كە نەدیتەوە ئۆبالی تاوانی قبیتیەكان لە ئەستۆیە وە ..ئیجا ئەم ئایەتی سورەتی ال عمران تەواو كەری نامەكەی پیغەمبەری خوایە ( صلى الله عليه وسلم ) . ابن قيم زاد المعاد ٦١/٣ .

ئ

( حاطبي كوری ابو به لته عه ) دەفەرموويت : لەو بارەيەوە پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) منى نارد بۆ لای مەقەوقەس پاشای مصر ، به نامەی پيغەمبەری خودا چوومه لای ميوانداريەكی زۆر چاك وباش و شايستەی لی كردم ، له نزيك خۆيان مامەوە ، پاشان ناردی به شوينم دا ،هەرچی پياوی ئاينی نصرانی به تاريقەكان هەبوو هەر هەمووی كۆ كردەوە ئينجا ووتی : من دە مەويت چەند قسه يەكت له گەڵ دا بكەم زۆريشك پی خۆشه ليم تی بگەی گويم لی بگری ..؟! ئەويش واتا : ( حاطبي كوری ابو به لته عه ) ووتي : ئامادە م بۆ گوی گرتن ، مەقەوقەس ووتی : دەی دەنگ و باسی هاوەلە كەتم بۆ باس بكه ئايا ئەوە هەر بەراستی پيغەمبەری خودايه ..؟! ( حاطب ) ئەلی ووتم : بەلی . بەدلنياييەوە ئەو پيغەمبەری خودايه ..!! مەقەوقەس ووتی : ئەمە چۆن پيغەمبەريكه ..؟! وە چۆن بەم شيوەيه دەبيت له كاتيك دا خزم كەسه كانی خۆی دەريان كردووە له ناو شارەكەی خۆی بۆ شاريكی كی تر وە هيچ نزايەكی يان دوعايەكی خراپی لی نەكردن بۆ ئەوەی له ناو بچن ..؟! ( حاطب ) ئەلی منيش ووتم : ئايا تۆ شايەتی نادەی كه عيسى ( عليه السلام ) كوری مەريم و پيغەمبەری خودايه ، ئەی چۆن دەبيت له كاتيك دا كه ئومەتەكەی خۆی يان گەلەكەی خۆی ويستيان بی گرن و له خاچی بدەن ..؟! ئايا عيسى ( عليه السلام ) پارايەوە له خودا كه گەلەكەی له ناو بچيت ..؟! هەتا ئەو كاتەی ( خوای گەورە ) عيسى كوری مەريمی له ناو گەلەكەيدا بەرز كردەوە بۆ لای خۆی ..؟! پاشان مەقەوقەس ووتی به ( حاطبي ) تۆ دانا ژيرو ليهاتووی ديارە له لای كەسكی دانا و ژيرو ليهاتووە هاتووی ..؟! ).اخرجه : بيهقى فى دلائل ٣٩٦/٤ .

بەلی له گيرانەوەيە كی تردا هاتووە ( مەقەو،قەس ) دەلی: له پەيمای ئەو پيغەمبەر وورد بوومەوە تەوە سەرنجم داوە وبينيومە، كه فەرمان ناكات به كاری خراپە ريگريش ناكات له كاری چاكە وە ساحيريكی گومراكارو فالچەيەكی درۆزن نيە ،وە من نيشانەی پيغەمبەرايەتی تيدا بەدی دەكە م به تايبەتی له ئاشكراكردنی شته شاراوەكاندا يان شته ناديارەكاندا ، وە هەولدان لەبارەی شته ناديارو غيبەكانەوە بەووردی سەرن دەدەم بيركردنەوە لەم بارەيەوە ، بەلی ( حاطب ) پاشان نامەكەی پيغەمبەری خوای ( صلى الله عليه وسلم ) ی لی وەر گرتم و ، خستيه ناو دەفريكەوە ،مۆری كرد ، دايه كەنيزەيەكی ئافەرتی خۆی ئينجا بانگی نووسەريكی تايبەتی خۆی كرد ، كه نامەيەكی بەزمانی عەرەبی نووسی بۆخزمەت پيغە مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كه ئەمەی خوارەوە دەقی نامەكەی مەقەوقەسە ..................!!!!

ئ

( بەناوی خوای گەورە و میهرەبان بۆ محمدی کوری عبدالله  لە مەقەوقەسی پاشای قبتیەکان ، سلاوت لی بێت ، پاشان من نامەکەتم خوێندەوە ، وە تێگەیشتم لەوەی کەتیدا باست کردووە، وە بانگەوازی بۆ دەکەیت ، وە دەشزان کە پێغەمبەرێك ماوە ،وە بەڕێوەیە ، وەمن وای بۆی دەچم کە لەوەلاتی شام دەربکەوێت ، من ڕێزم لە نێردراوە کەت گرت ، وە دوو کە نیزە کیشم بەدیاری بۆ ناردووی کە لە ناو قبتیەکا پلە پایەی تایبەتیان هەیە ، لە گەل جلە بەرگ و ولاغیکیشم بەدیاری بۆ ناردووی بۆ ئەوەی سوودی لی ببینی ، وە سلاوت لی بێت ). ئەوە بوو مەقەوقەس موسلمان نەبوو لەمە زیاتریش هیچ هەلویستکی تری نەبوو ). ابن قيم زاد المعاد ٣/٦١ .

هەروەها هەندیك لەزانایانی سیرە ووتیانە وەك (العمری)  دەلی : دەقەکانی ئەو نامەیەی کە بۆ مەقەوقەس نێردراوە دوو نامەن هەروەها وەلامەکانی مەقەوقەسیش دوو وەلامەن ، بەلام لە ڕیگەیەکی ڕاست دورستەوە پشت ڕاست نەکراوە تەوە ..!!سيره النبويه الصحيحه )لاكرام ضياء العمري ٢/٤٥٨.

واش باسکراوە  دەقی نامەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مۆزەخانەی (توب قابی) لەشاری ئەستەمبول لە تورکیا پاریزراوە  لەسەرەتاس سەدەی (١٩) لەنزیك ئەچەیم لەشاری سعیدی مصر دۆزاوەتەوە . خالد سعيد علي . (رسائل النبی ) ص ٤٥ .

بەلی مەقەو قەس هەندیك دیاری ناردووە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ئەمانەی خوارەوەن :

لە (خاتوو عائیشە )وە – خوا لی رازی بێت – دەفەرموویت : (( مەقەوقەس فەرمانرەوەی ئەسکەندەریە مصر ، کەلدانیك و بووخوریکی بۆنخۆشی شامی و ئاوینە وشانەیە کی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ). اخرجه : الطبراني في الاوسط (٧٣٠٥) .

لە (بوریدە ) – خوا لی رازی بێت – دەفەرموویت : (( مەقەو قەسی قبتیەکان دوو کەنیزەی وخوشکی یەکتر وە ولاغیکی وەك دیاری پیشکەشی بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کرد ، وە یەکیك لە کەنیزە کەکانی مارە کرد کردیە بە هاوسەری خۆی ، کە (ابراهیم کوری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لەو کەنیزەکەبووە ، کە نیزەکەی تریش ی بەخشەیە  هاوەلیکی بەرێزی خۆی کە (حساني کوري ثابت ) دە کات دایکی عبدالرحمن کوری حسان کوری ثابت ) اخرجه : الطبراني في الاوسط (٣٥٤٩ ) .

وەلاغەکە یان ئیسترەکە بەلك بوو ، ناوی (دلدل ) بوو ، لە ناو نیچەدوورگەی عەرەبدا وینەی نەبووە ،

بەلی هەر لەم بارەیەوە لە (ئەبو (صەعصەع ) – خوا لی رازی بێت – دە فەرموویت : (( مەقەوقەس فەرمانرەوایی مصر ئان ئەسکەندەریە ،لە سالی حە وتەمی کۆچی دا ، ماریە قبتی و خۆشکەکەی کە ناوی

ئ

سيرين بوو ، له گه‌ل هه‌زار مسقا ل زير بيست پارچه جل به‌رگ و ولاغيك وه گويدريژيك به ناوى ( عه‌فير ) ياخود ( يه‌عفور ) وخزمه‌تكاريك به ناوى ( مه‌ئبور ) نارد بۆ پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم )

به‌لى پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ماريه و خوشكه‌كه‌ى كه‌ناوى ( سيرين ) بوو به‌ديارى له مه‌قه‌وقه‌سى پاشاى مصر وه‌رگرت ئه‌وه بوو له ( ذولحجه ي ) سالى هه‌شته‌مى كۆچى دا ماريه منداليكى به‌خشى به پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كه ناويان لى نا ( ابراهيم ) ، به‌لام ( ابراهيم ) ته‌مه‌نى مندالى بووه ساليك شه‌ش مان خواى گه‌وره ئامانه‌ته‌كه‌ى بۆ خۆى برده‌وه كۆچى كرد كه‌واته هه‌ر له منداليه‌وه هه‌موو كوره‌كانى پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وه‌فاتيان خواى گه‌وره ئه‌م ئامانه‌تى له پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وه‌رگرته‌وه تا له‌ژياندا مابووه ..؟!

به‌لام له ناو ئه‌م ديارەيانه كه‌سيكى تريش له گه‌ل ئه‌م دوو كه‌نيزه كه بوون ئه‌ويش كه ناوى ( مه‌ئبور ) بووه ئه‌و ئه‌ندامى نيرينه‌ى نه‌بووه خۆى خه‌ساندبووه ، له گه‌ل ئه‌م دوو كه‌نيزه‌ك به‌ديارى پيشكه‌ش به پيغه‌مبه‌رى خوا كرا بوو ( صلى الله عليه وسلم ) به‌لى پيغه‌مبه‌رى ( ماريه ى كچى شه‌معونى ) كرده هاوسه‌رى خۆى كوريكى بوو به ناوى ( ابراهيم ) .

تيبينى / ئه‌گه‌ر سه‌يرى ده‌قى نامه‌كان بكه‌ين بۆ م( ه‌قه‌وقه‌س )و ( هيرقل ) نيردراوبوو له هه‌ردوو ده‌قه‌كه ووشه‌ى ( عبدالله ) هاتووه ، چونكه ئه‌و دوو پاشايه نصرانى بوون يان گاور بوون ، ئه‌وان عيسى كورى مه‌ريه‌ميان به خوا ده‌زانى ، پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆيه ووشه‌ى به‌نده‌ى خواى به‌كار هينابوو بۆئه‌وه‌ى كه بزانن ( عيسى ) ش به هه‌مان شيوه به‌نده‌ى خوايه نه‌ك كورى خوا ..؟! والعياذ بالله )

به‌لام ئه‌وه‌ى نه‌جاشى به‌ناوى خوى ( احمد ) نووسى بووى چونكه له كتبه‌كه‌يان دا هاتووه هه‌ره‌هاش ده‌شى زانى نه‌جاشى موسلمان ده‌بيت ، به‌لام ئه‌وه‌ى بۆ پاشايى مه‌جووسه‌كان واته : كيسرا ى فارس نيردرابووه لى نوورابوو ( انى رسول الله ) من په‌يام به‌رى خودام ، چونكه فارسه كان خۆرو يا رۆژو ئاگريان ده‌په‌رست ، ئه‌وان باوه‌ريان به خوا نه‌بووه ، هه‌ر بۆيه ده‌قى نامه‌كان جياواز بووه بۆ پاشاكانى جيهان ...........؟!!

## سی یەم : پیغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ کیسرا پادشای وەلاتی فارس

بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نامەی نارد بۆ پادشای فارس بە ( عبدالله ي كوري حوذافه ي سه هه مي ) فەرمانی پیدا بگەینتە فەرمانرەوای وەلاتی بەحرین ئینجا ئەویش بنریت بۆ پاشای فارس بۆ لای کیسرا ، دەلین : کاتیك پاشای فارس نامە کەی پیغەمبەری خوای ( صلی الله علیه وسلم ) پی گەیشت و بەر لە کردنەوەی یەك سەر دراندی و پارچە پارچەی کرد ، هەروەها ( ابن مسیب ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) نزای خرا پی لی کردن بەوە ی کە خودا مولك و دەسەلاتیان پارچە پارچە بکات )). اخرجه : البخاری برقم ( ٤٤٢٤ ) ،و احمد ( ٢٤٣/١ )

بەلی ناوی ( کیسرا خەسورەی پەرویزی دووەم و کوری هورموزی چوارەم و ) بوو ، کە دەکاتە کورازی کیسرای یەکەم کە ( نۆشیروان ) بوو..!!

لە ( ابن مسیب ) – خوا لی رازی بیت - بۆمان دە گیریتەوە دەلی : (( پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ کیسرای فارس و قەیصری روم و ، نەجاشی حەبەشە ، یەك جۆر نامەی نووسیەوە واتە ناوە رۆکی نامە هەمان ناوەرۆك بووە کە ئەمە دەقە کەیەتی ( بسم الله الرحمن الرحیم ) بۆ ( کیسرا یان قەیصر یان نەجاشی ) ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ال عمران ٦٤ . بەلام کیسرا بەر لە کردنەوەی نامە کە یەك سەر دراندی پارچە پارچەی کرد پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( خودا خۆی و نەتەوەکەی پارچە پارچە بکات ) .اخرجه : ابن ابی شیبه فی ( المصنف ) برقم ( ٣٧٧٨٢ ).

تیبینی / ئەمە راو بۆ چوونی ئەم هاوەلە بەریزیە – خوا لی رازی بیت - بەلام ( خوای گەورە ) زانا ترە ، بەلام بەرای من ئەگەر سەیری ئایەتەکە بکەین ئاماژە بە ئەهلی کتاب دەکات واتە : نەجاشی و هەرقل یان قەیصری روم ئەوانە گاور بوونە یان نصرانی بوون ، ئەوان خاون کتاب بوون ،هەر بۆیە بۆ ئەوان دروستە گونجاوە بە پی ئایەتی ٦٤ ال عمران ، بەلام بۆ کیسرا پاشای فارس ناگونجیت ،بە هەمان دەق نامە نووسرابیت ، چونکە پاشای فارس خاونی کتاب نەبوونە ئەوان رۆژو ئاگریان دەپەرست جگە لە خوای گەورە ، هەربۆیە دەقی نووسراوە کە یان نامە ( طبري ) لە ( ابن اسحاق ) بۆمان دە گیریتەوە .

( خوای گەورە زاناترە )..........................................................................

ئ

له (طبراني ) يەوە له (ابن اسحاق ) گێراويه تەوە ئەويش له (زيدى كورى حبيبه )وە –خوا لێ يان رازى بيت – دەفەرمووێت : (( پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) عبدالله كورى حوزافەى سەھەمى ) نارد ... بۆلاى كيسراى پاشاى وەلاتى فارس ئەم نامەيەى بۆ نوو سى بوو (بسم الله الرحمن الرحيم ، من محمد رسول الله إلى كيسرى عظيم فارس .. سلام على من اتبع الهدى ، وآمن بالله ورسولة ، وأدعوك بدعاء الله فاني انا رسول الله الى الناس كافة لانذر من كان حيا ويحق القول على الكافرين ،فاسلم تسلم فان ابيت فان إثم المجوس عليك )) .واتە : بەناوى خواى بەخشندەو ميهرەبان له محمد پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) بۆ كيسرا پاشاى وەلاتى فارس ،سلاو له كەسەى كه شوێنى رێگاى هيدايەت دەكەوێت وە باوەر به خودا و پێغەمبەرەكەى دە هێنێت ، بۆ بانگەوازى خوداى گەورە بانگت دەكە م كه من پێغەمبەرى خودام بۆ گشت خەلكى جيهان بۆ ئەوەى خەلكى زيندو خاوەن هۆش بيدار بكەمەوە وە بەلێنى خوداش بۆ بى باوەران ديتەدى موسلمان به سلامەت دەبيت ، وە ئەگەر پشت هەلكەيت وە بەدەم بانگەوازە كەوە نيت ئەوا ئۆبالى تاوانى ئاگر پەرستەكانى ژێر دەسەلتى خۆت له ئەستۆ دەبيت . كاتيك نامه كەيان بۆ كيسرا خويندەوە يەكسەر دراندى پارچە پارچەى كرد ، ووتى : چۆن بەم شويەيه نامەم بۆ دە نووسيت له كاتيكدا ئەو لەژێر دەسەلاتى منه . بەلى كيسرا نامەكەى بۆ خويندرايەوە زۆر توره بوو ،چونكه خۆى زۆر به گەورە دەزانى و بەفيزو دەمارگيريەوە ، بەلى كيسراى بى حورمەت و بى رەوشت خۆبه گەورە زان و لووت بەرز ووتى : چۆن دەبيت بەندەيەكى ژێر دەستى من ناوى خۆى له پيش ناوى منەوە دەنووسيت ..؟! كاتيكيش هەواله كه گەيشتە پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) ئەويش نزاو دوعاى لى كرد كه مولك دەست دەسە لاتى پارچە پارچە بكات كه فەرمووى : (( مزق الله مولكه )) به لى هەر واش بوو دوعاكەى پێغەمبەرى خوا قبول بوو يان گيرا بوو ، ملك و دەسەلاتى تەر تونا بوو بازنه زيرەكانى كەوتە دەست هاوەلى بەريز سوراقە، بەلى كاتيك نامەكەى پێغەمبەرى خواى (صلى الله عليه وسلم ) دراند پارچە پارچەى كرد ، ئەويش خيرا نامەيەكى بۆ پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) رەوانەكرد ، بۆ (بازان ) كه فەرماندەى يەكى سوپاى فارسە كان بوو لەوە لاتى يەمەن دا ، له نامەكەى ئەمەى نووسى بوو بۆ (بازان ) ووتبووى : من هەوالت پى دەدەم كه كەسيك پەيدا بووە شتيك دەليت هيچى لەو بارەيەوە نازانم ، كه بانگەشەى پێغەمبەرايەتى دەكات ، به دواى دا بنيرە پى راگەيەنە باله مالى خۆى دانيشى و بەهيچ شيوەيەك نەچيتە ناو خەلكەوە وە ئەو بانگەوازەش بلاو نەكاتەوە ، يا دەست هەلگرى لەو كارە ئەگەر نا كەسى وە هاى بۆ ئەنيرم خۆى كەس و كارى هۆزەكەى له ناو ببەن تەفر و تونايان بكەم ،ئينجا دووكەسى جەربەزەو بەجەرگ ئازا ى لاى خۆت بنيرە بۆ لاى ئەو پياوەى كه لەوەلاتى حيجاز دايه يا بهينن بۆ لام ..!!

ێ

پاشان ( بازان ) کەسیکی خۆی ناسراو بوو بە ( بابویە ) نارد که نووسەریکی کارنەمەی وەلاتی فارس بوو ، وە لەگەل ( بابویە ) کەسیکی تریشی نارد بەناوی ( خور خسرو ) نامەیەکی نووسراوی پیدا بگەین دەستی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە فەرمانیشی پیکردن کە لەگەل خۆیان بیهینن بۆ لای کیسرای پاشای فارس ، بەلی بە ئەو پیاوەی کە ناوی ( بابویە ) پی ووت : برۆ بۆ ئەو شارەی کە ئەو پیاوی تیدا نیشتەجیە مەبەستی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و شاری مەدینە بووە ، بەلی ئەو دوو پیاوە ( بابویە ) و ( خوخسرو ) بەریکەوتن تا گەیشتنە وەلاتی حیجاز لەویدا گەیشتنە شاری ( طائیف ) ئەو دوو پیاوە چاویان کەوت بەکەسانیکی قورەیش کە لە دەروازەی شاری ( طائیف ) نیشتە جی بوون ، ئەو دوو پیاوەش پرسیاریان لە قورەیشە کان کرد کەلە دەروازەی شاری ( طائیف ) بوون ، دەربارەی ئەو پیغەمبەری وەلاتی حیجازو شاری مەدینە کەئیستا لە شاری مەدینە نیشتە جیە ، ئەوانیش ووتیا : بەلام ئیستا ئە پیاوەی کە باسی دەکەن وا لە شاری مەدینە نیشت جیە ، لە کاتیك دا ئەو دووپیاوە هەوالی پیغەمبەری خوایان دەپرسی لە قورەیشە کان ، ئەوانیشە واتە قوریشە کان زۆر دل خووش شادو مان کامەران بوون بە م هەوالە دەنگ وباسەی ئەو دووپیاوەی کیسرا پاشای فارس ، بەلی قورەیشە کان هەندیکیان بەوانی تریان ووت : مژدەتان لی بیت ئەم جارەیان محمد ( صلی الله علیه وسلم ) کەوتۆتە داوی کیسرای پاشای فارس و لەدەستی رزگاری نابیت ، ئەوە بوو هەوالیان بەم دوو پیاوە دا ئەوانیش رۆیشتن بەرەو شاری مەدین چوونە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، بەلی ( بابویە ) کەوتە قسە کردن لە گەل پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ووتی : شاهی شاهان پادشای پادشایان کیسرا فەرمانرەوای فارس ،بۆ خزمە ت پادشای یەمەن ( بازان ) ئەو کاتە یەمەن لەژیر دەسەلاتی فارسە کاندابوو ، بەلی ئە و دووپیاوە ووتیان : کیسرا فەرمانی بە پادشای یەمەن ( بازان ) کردووە کە بەدوای تۆ دا بنیری لەگەل خۆی دا بدابات بۆ لای پادشای فارس کیسرا و هەروەها ( بازان )یش ئیمە هەردووکمان رەوانەکردوە بۆ لای تۆ کە ئەم هەوالە ت پی رابگەیەنین ، بەلی : ( بابویە ) ووتی : بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەگەر بەقسە مان بکەیت ، لەگەل مان بیت ، ( بازان ) پاشای یەمن نامەیەیان شتیك دەنووسیت بۆ کیرا پادشای فارس ، کە بە قازا نجی تۆ تەواو دەبیت هیچ دەست دریژی ناکات سەر تۆ بەمەبەستی ئازاردانت ، بەقسەمان بکە ، وە ئەگەریش بە قسەمان نەکەیت ، و پشت هەلکەیت ،ئەوا ئۆبالی خۆت لەسەر خۆت ، ئەوا خۆت هۆزو گەلە کەت شارەکەی تیدایت لە ناو دەبات و لە ناو دەچیت ،دلنیابە وەلاتەکەت شارە کەت کاول دەبیت ..!! بەلام قسەی کیسراو پادشای فارس و ، قسەی ( بازان ) نی پادشای یەمەن وە قسەی ئەو دوو پیاوەی کە ( بازان ) بە نیردراو رەوانەی کردبوون ( بابویە ) و( خورخسرو ) تەواو تەواو پیچەوااانەبوون ئەوە بوو وەلاتی فارس یەمەن و کەوتە ژیر دەستی سوپای ئیسلام بەراستی ئەو ن ملك دەسەلات و پەلە پایەیی پادشایەتیان لەدەست دا وەلاتیان بووە وەلاتیکی

ێ

کاول ویران دواتر سوپای ئیسلام فتحی وەلاتی فارسی کرد بە سەرکردایەتی یان بەخلیفایەتی ئەمیری موسلمانان عمری کوری ختاب وەلاتی فارس هەر هەموو کەوتە ژیر دەسەلاتی سوپای موسلمانان .......!!

بەلی ئەو دوو پیاوەی کە پادشای یەمەن رەوانەی کردبوون بۆ لای پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەردووکیان بەریشی تراشراوەوە بە سمیلی گەورەوە هاتبوون خزمەت پیغەمبەری خوا (صلى الله عليەوسلم) هەر بۆیە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەزی نەکرد سەیریان بکات ، پاشان رووی تی کردن و پی فەرموون ((ویلکما من امرکم بهذا ..؟!)) واتە : قوربەسەرتا مال ویران بن کی ..؟! ئەو فەرمانەی پی کردوون ..؟! ئەوانیش ووتیان : پەروەردگارمان گەورەمان واتە: کیسرا ..!! ولعیاذ باللە . فەرمانی پی کردووین بەم کارە ..!! پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ((لكن ربي قد امرني باعفاء لحيتي لقص شاربي)) واتە: پەروەدگار فەرمانی پی کردووم بەهیشتنەوە ریشم و کورت کردنەوەی سمیلم .. ئینجا دواتر فەرمووی : ((ارجعا حتى تأتي غدا)) . واتە برۆ تاکو بەیانی وەرنەوە ..!! بەلی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چاوەری وەحی بوو کەلە ئاسمانەوە بیتە خوارەوە ،چونکە چارەنووسی خۆی هوزە گەلکە لە ژیر دەستی ئەو زالمەی پادشای یەمە ن فارس دایە ، لە خۆ یەوە بریاری چارنووس ساز نادا تاکو وەحی خوای بۆ رەوانە نەکریت ،بەلی ئەمە کاریکی زۆر مەترسی دارە پادشایە کە نیوەی هەموو خاکی سەرزەوی لەژیر دەستی دایە وە ئیمبرتۆری سەر زەویە ، دەبیت فەرمان لە خوای گەورە وەرگریت ، چاوەری وەحی خوا بکان ئینجا بریا بدات کە چۆن وەلامی کیسرا بدریتەوە ،چونکە ئەو بریاری شەری داوە لەگەل موسلمانان لە وەلاتی حیجازو شاری مەدینە، هەربۆ یە ئەمەش نیشانەی پیغەمبەرایەتی دەسەلینی کە پیغەمبەری خوا ، قورئانی پیرۆز ووتەی خوایە ، ئەو تەنا بەندەیەکی خوایە هیچ لە شتە نادیارەکان یان پەناهەکان یان غەیب نازانی ، تەنها ئەوە نەبیت کە بەوەحی یان ئیلهام نەبیت بۆی رەوانەدەکریت ، بەلی ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : برۆن بەیان سەردانم بکەنەوە بۆ وەلامەکەی من ، پاشان وەحی هاتەخوارەوە لە ئاسمان دا کە تیدا باسی وەلاتی فارس دەکات و ، دەربارەی دەنگ باسی پادشافارس کیسری ، کە (خوای گەورە) شیرو کوری کیسرای زال کردوە بەسەر کیسرا داو لەو شەوەی رابدوو لە فلان کات لە فلان مانگ دا ، کورە کەی خۆی شیرو توانی یەتی بەسەر باوکی دا زال بیت واتەکیسرا کوشتوویەتی ، دواتر بۆ بەیانی بانگی ئەو دووپیاوەی کردەوە هەوالە کەی پی راگەیاندن دەربارەی مردنی کیسرای پاشا فارس ،کە کورە کەی خۆی کوشتووەتی ..!!

فی راوية ابي بكرة : ((ان رجلا مناهل فارس اتي النبي (ﷺ) فقال : رسول الله (ﷺ) : ((ان ربي قد قتل ربك)) واتە: (خوای گەورە) پی راگەیاندم کە خوایە کەی ئیوە باسی دەکەن مردووە . صحيح البخاري برقم (٢٧٠٤) الترمذ ي برقم (٢٢٦٢) والنسائي :٨/٢٢٧ وغيرهم ...

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) بە دوو پیاوە کەی فەرموو : (( اذهبا الى صاحبكم الذي تزعمون انه ربكما فاخبراه ان ربي قتل الذي يزعم انه ربه )). واتە : بڕۆنەوە بۆ لای فەرمانڕەوایەکەتان واتە: (بازان ) هەوالی پی بدەن کە ئەو کەسەی کەئیوە بە خودای خۆتانی دەزانن ئەوە خودای من کوشتوویەتی کە بانگەشەی خودایەتی دە کرد بۆ خۆی ، ئەوانیش ووتیان : تۆ دەزانی چی دە لیت ..؟! وا ئیمە لیرە ماینەوە و لەسەر وەلامی تۆ وەستاوین ، لەوەش بچووك ترمان پی قبول ناکریت ، ئەوەش بنووسین لە سەر زاری تۆ وە بە پادشا رادە گەنین ..؟ فەرمووی : ( بەلی ) فەرمووی : فەرمایشتە کین نووسی کەلە چ کاتیك و چ رۆژیك و چ مانگیك دا روویداوە ، وە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( اخبراه ذلك عني وقولا له : ان ديني وسلطاني سيبلغ ملك كسرى وينتهي الى منتهى الخف والحافر وقولا له : انك ان اسلمت اعطيتك ما تحت يديك وملكتك على قومك من الابناء )). واتە : ئەوەی لەمنەوە پی رابگەیەنن و پیی بلین : واتە : (بازان ) ئەو ئاین و دەسەلاتەی من بەم زووانە دەگاتە گشت ئە و شوینانەی کە ملك زەوی کیسرایە ، کە پیگەیشتووە لەیدا کۆتای دیت و سم نالی پی ناگات وە هەالیشی پی بدەن ئەگەر موسلمان بیت ئەوە هەرچی لەژیر دەسەلاتیەتی پی دەدینەوە وە دیکەینەوە فەرمانڕەوا ی سەر نەتەوەکەی ..!! دواتر لە خزمەتی پیغەمبەری خوا رۆیشت ، هەتا گەیشتنە لای پادشای یەمەن (بازان ) هەوالەکەیان پی راگەیاند ، ئەویش ووتی : ولالاهی ، ئە وە قسەی پادشا نیە من وای بۆ دەچم کە پیغەمبەری خودا بیت ، بەلی ( بازان ) ووتی : دەی با چاوەری بکەین لەوەی کە ئەو پیاوە واتە: پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویە تی ، ئەگەر راست دەرچوو ئەوا قسەی ئاسایی نیە بەلکو پیغەمبەریکی نیردراوە لە خوداوە ، وە ئەگەریش راست دەرنەچووە ئەوا هەمان هەلویستی پیشوومان دەبیت ، بەلام وا ریکەوت کە هیشتان (بازان ) هەلنەستاو لە قسە کانی نەبوویەوە ، هەوالی مردنی کیسرای پادشای فارسی پی گەیشت و کە لە لایەن نیردراویك نامەیەکی هینا لەلایەن پادشای نوی یان پادشای تازە کە کورەکەی کیسرا بوو ، بە ناوی (شیرو ) بەلی نامەکەی لابوو بۆ پادشای یەمنی هینا نیردراوەکە لە لایەن (شیرو ) ئەویش واتە: (بازان ) نامەکەی خویندەوە هیشتان لە قسەکانی نبوویەتەوە و نامەکەی (شیروی ) کردەوە تیدا ... نوسرابوو من کیسرام کوشتووە واتە : باوکی خۆم ، ئەم کارەشم تەنها لەبەر تۆلە سەندنەوەبووە لەبەر فارسە کان ،چونکە خوینی پیاو ماقولان و پیاوە گەورەکانیان بە فیرۆ درا بوو ،وە بی هوودە دە کوژان ،سوپاکەشیان لە ناو وەلاتی خۆیان تونتر کردبوو گیریان خواردبوو، بەدەست بەند کراوان ، واتە: بە شیوەیە کی کیشەیەکی وا لە ناو وەلاتی فارس سەری هەلدا بووە هیچ کەسیك بۆی چارەسەر نەدەکراو ، یەکەم جار لەنیو خیزانی کیسرا روویدا ، کور باوکی خۆی کووشت .....؟!

ئ

بەلی ئەوەیە کە هەر کاتیك کیشەو تەماعی دونیا لە نیو خیزانی فەرمانرەواکانی وەلاتان دا روویدا ئەوا خۆیان گە ل و نەتەوەکەشیان لە ناو دەچن و ، توشی هیلاك و لی قەومان سەرگەردان سزای خواو سزای خەلك دەبنەوە نموونەی ئەو فەرمانرەوایانەش زۆرن لە میژوودا ، هەر وەها وا خەریکە وەلاتەکەی خۆشمان وای لی بیت کور باوك براو براو ئامۆزاو ئامۆزا لە سەر کورس دەسەلات خریکە دەبیتە کیشەو شەرو دەمەقالی بەربەرەکانی یەکتر بۆ ئەوەی دەسەلات لەیەکتری بسینەوە و کوشتاری یەکتری بکەن یان جاسووسی لەسەر یەکتر بکە بۆ دەسەلات و فەرمانرەوایی کورسی و مال وسامان و تەماعی ژیانی دونیادا ، خەریکە وەلاتەکەمان ویران کاول دەبیت لە سەر بەربەراکانی یەکتری ، دژایەتی ئاینی ئیسلام و خوا پیغەمبەرەکەی ، هەروەها هیچ شوینیك لە وەلاتەنەماوە کە تیدا تۆی خرا پە کاری فسادی تیدا نەچینن ، ئەوە تا جەندە شوینیا ن کردوو بە شوینی بەناو گەشتیاری بەلام بۆ بی رەوشتی دیسکو مەلهاو شوینی داوین پیسی کردوویانە، بەلی وەلاتیان ویران کرد کە لە سەدا نۆ هەتی دانیشتوانەکەی موسلمانە دابو نەریتیکی کوردانەی بەرەوشت بەرزیەوە هەیەتی وا خەریکە نامینی بەناوی ئازای تاکە کەسی یان ئازادی بیرو را، بەلی وەلات بەم شیوەیە سەرگەردان دەبیت کومەلگا بەرەو بەردرەشتی دەروات سوپا ی وەلات ئیرادەی دەشکیت خەلك و میلەت نە متمانە بە فرمانرەوایەتی و حوکم رانی دەکە نەبەسوپای وەلات ،ئەوەیە ویران کردنی هەموو فرمانرەوایەکی نادادپەروەر تەنا بۆ خۆی مال خیزانی بیت ،لەدواتریش کیشە دەکەویتە ناو مالە کانی فرمانرەوایانی ئەو وەلاتەی خۆمان ، بۆ یە دەبی ئاوریك لە میژوو بدەینەوە بۆ ئەوەی پەندی لی وە وەربگرین ، بەتایبەتی حوکم رانانی ئەم وەلاتەی خۆمان ، کەچۆن کیسرا ئیپراتۆریەتی نیوەی جیهانی بەدەست بوو ..؟! چۆن رووخا ..؟! چۆن تەفر تونا بوو ..؟! بەزارانی وەك و کیسرا لە میژوودا هەن ، بەلام ئامۆژگاریم بۆ سەرکردەکانی ئەم وەلاتە ئەوەیە دەست لەناودەست برایانە و دۆستانە لەگەل یەکتر فرمانرەوایەتی ئەم وەلاتە بکەن ، یان بگەرینەوە بەروە دادپەروەی خودای گەورە وە ئامۆگاریەکانی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەگەر دەست بە قورئان سوونەتت وە بگرن ئەوا بە پشتیوانی خوا سەرکەتوو دەبن لە هەموو بەلایەك کەبەسەریان دەیت ، وە ئەگەر پشت لە هیدایتی ئیسلام پیغەمبرکەی بکەن ئەوا سەرئە نجامیان وە کو کیسرا کورەکەی چاوریتانە ،ئایا ئیوە لە کیسرا ملك مال سەربازو بەرفراوانی زەوی دەسەلاتی لەرۆژئاواوە بۆ رۆژهەلات لەبەردەستی دابووە ئیوە زیاتر تان هەیە ..؟! کەچی ئەویش لەناو چوو بە کافری موشریکی گەرایەوە بۆ لای ( خوای گەورە )،یان ئیوە عاقل ترو بەهیز ترن هۆشمەند ترن ..؟! نەخیر وانیە هەرگیز ئیوە هۆشمەند ترنین ..!! بی گومان سەرئە نجامی هەموو ستەمکارو زالم تاوانکاریك ( سوءخاتم ) یە سەرئە نجامی زۆر خراپ دەبیت .......؟!

ێ
بەلی (شیرو) پادشای فارس نووسراوی بۆ پادشای یەمەن (بازان ) رەوانەکرد ، کە باوکی من نەماوە من ئیستا شوینی کورسیەکەی ئەوم گرتووە تەوە جا دەبیت گویرایەلی فەرمانبەردای من بیت ، لەژیر فەرمانی من دەر نەچیت ، هەروەها بە ووردی سەرنجی ئەو پیاوە بدە کە باوکم واتە : کیسرا ، نامەی بۆ نووسی بوو ، هەروەها هیچ هەلویستکم نیە لەبارەیەوە هەتاکو فەرمانی منت پی دەگات ،بەلی کاتیك نامەکەی شیرو ) گەیشتە لای (بازان ) بە جوانی خویندیەوە ، ئەویش ووتی : بەراستی ئەو پیاوە پیغەمبەری خوایە ئینجا (بازان ) موسلمان بوو ، لە گەل ئەوفارسانەی کە لەوەلاتی یەمەندا لەگەلی دا بوون ، هەرلەم بارەی ئەو دووپیاوەی ك (بازان ) بۆ لای پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) رەوانەکردبوو وەك (بابویە ) خوسرو ) دەربارەی پیغەمبەری خوا باسیان بۆ (بازانی ) پادشای یەمن کرد ، ئەوانیش ووتیان : قەسەم لەگەل هیچ پیاویك نەکردووە ئەوندەی ئەو پیاوە سەنگین و بوو بیت لە لام ، بەدلنیایی ئەو پەری هیمن و ئاسایشەوە لە نیوانیادا دەهاتوو دەچوو بی ئەوەی لەهیچ شتیك بترسیت ، بی ئەوەی پاسەوانی هەبیت ، بەهیچ جۆریك دەنگیان هەلنەدەبری وە قسەیان لە قسەی نەدەکرد ، لە خزمەتی دا بی دەنگ دانیشتبوون ..!! اخرجه : الطبراني في التاريخ ٢/٦٥٤-٦٥٧ .والبيهقي في الدلائل النبوة ٣٩٠/٤ ، ابو نعيم في الدلائل ٢٤٠-٢٤١ .

بەلی ئەوە بوو کیسرا لە ناو چوو هیچ کیسرایەکی تر لە دوای نەهات هەر وەك پیغەمبەری خوا دەفەرموویت : (( ...اذا هلك كسرى فلا كسرى بعد )) . اخرجه : البخاري ٣١٢١ ، ومسلم ٢٩١٩ .

ئەوە بوو فارسەکان وەلاتیان لی تیك چوو بارودۆخیان زۆر خراپ بوو ، دووچاری شکست و داروخانیکی وە ها هاتن کە کارەسات لە دوای کارەسات بەسەریان دا هات ، هەر لە دوای ئەمانەشەوە ئافرتیك بووبەفرمانرەوای فارسەکان و دەسەلاتی گرتە دەست ،لەو بارەیە لە (ابو بکرصديق )وە – خوا لی رازی بیت - دەلی : وە کاتیك کیسری مرد پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( من ولوا بعده )) واتە : کی هاتە جیگای بۆ فرمانرەوایی ..؟! پی ووترا کچەکەی (پووران ) بۆتە جینشینی و چۆتە سەرتەختی باوکی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( لن يفلح قوم اسندوا امرهم الى امرأة )). اخرجه : (٢٠٤٠٢ ) . واتە : هیچ گەل نەتەوەیەك میلەتیك سەرکەو توو نابن ئەگەر کاروباری وەلاتیك بەدەستی ئەو ئافرەتەوە بیت ..؟!واش باس دەکریت (دەقی ئەو نامەیە بۆ کیسرا نیردراوە لە لای کەسیکە لە وە لاتی لبنان بە ناوی (هنری فرعون ) . بروانە : (رسائل النبى )خاليد سيدعلى ص ٥٥ .

ئ

شایەنی باسە لەم کاتەی کە (شیرو کوری کیسرا ) هۆکاری کوشتنی باوکی بۆ ئەوە گەرانەدەوە کە سوپای فارس لە بەردەم سوپای روم دا سەرنەکەوت و تووشی رووخان و شکست ببو و لە ناوە خۆیان سوپا گەلەیی لە کیسرا دەکرد چونکە هۆکاری سەرنەکەتنیان بۆ ئەو دەگەراندەوە ، هەر بۆیە ، لە ناو کەس خیزانی کیسرا شۆرش کووتەتا دروست بوو لەسەر کیسرا ، سەر ئەنجام (شیرو ) یان (قوباد ) توانی زال بیت بەسەر باوکی دا کوشتی ، وە لە شوینی باوکی کە ناوی (پەرویز ) بوو دە بیتە پادشای فارس دیتە سەرتەختی پاشایەتی دەسەلاتی لە باوکی دەسینی دەی کوژیت ..؟! بەلی رووداویی کوشتنی کیسرا یان (پەرویز) باوکی (شیرو )یان (قوباد )، لە شەوی سی شەم ی مانگی جمادی سالی حەتەمی کۆچی دا بووە ، ئەمەش هەر ئەم شەوە بووە کە دووپیاوە کەی پاشای یەمەن واتە: (بازان ) لە شاری مەدینە بوون پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) پی فەرموون : کە بۆ بەیانی وەلامتان دەدەمەوە ، ئەوە بوو شیرو لەم شەوەدا باوکی خۆی کوشت ، ئەوە بوو لە پیش دا باسمان کرد ، بەلی کیسرا بە ئاماژەی قوبادی کوری کە ناز ناوی (شیرو ) بووە ، لە سالی ٦٢٨ زاینی دا کوژا ، دوای ئەو ئیتر دەلەتی فارس پارچە پارچە بوو بەش بەش بوو ، (شیرو ) یان (قوباد ) تەنها شەش مان لەسەر تەختی باوکی دا فرمانرەوایەتی فارسی کرد ، بەلی لە ماوەی (١٤) سال دا نزیکەی (١٠ ) پاشا هاتە سەرتەختی پاشایەتی فارس لە دوای (پەرویز )و ( شیرو ) ی کوری تا ئەو کاتەی کە پاشا یەك هاتە سەر تەختی پاشایەتی وەلاتی فارس ئەویش ناوی (یەزیدی گورد ) کاری گرتە دەست فرمانرەوایەتی کرد ، ئەویش دوا پاشایی ئیپراتۆریەتی فارس بوو ، بەلی بە هەلاتنی ئەو پاشایە یان راکردنی ئەم ئیمپراتۆریەت رووخاو تووشی دارمان هات ، ئەوە ئیپراتۆریەتەی کە (٤٠٠ ) سال یان چوار سەدە حوکمی پاشایەتی فارسیان دەکرد ، بەلی لە دوای نزیکەی هەشت نۆ سال لەفەرمایشتە کانی پیغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم ) یان فەرموودەکانی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) واتە لە سالی ٦٣٧ زاینی دا ،تیك چوونی رووخانی دەلەتی فارس هاتەدی و ئیتر ئەو ئمپراتۆریەت بەرەو رووخاندن دەچوو ، ئیتر ئەوە بوو ئەم ئیمپراتۆریە رووخا لە سەر دەستی سوپای ئیسلام و ئەوەی لەژیر دەسەلاتی فارس دا بوو هەر هەمووی بوە بە موسلمان فتحی وەلاتی فارس کرا لە سەر دەمی خلیفە عمری کوری ختاب – خوا لی رازی بیت – چووتە بازنەکەی کیسرا کە تەدەستی سووراقە و (عمری کوری ختاب ) پیشکەشی سوراقەی کرد ، هەروەها یەکیك لە زاناکانی ئیسلامیش لەم وەلاتەدا هەلکەوت ئەویش ئیمانی (ابو حنیفە ) بوو - خوا لی رازی بیت - هەروەها (خوای گەورە ) لە هەموو هاوەلانی پیغەمبەر(صلی الله علیه وسلم ) رازی بیت ، خوا لەوانەش رازی بیت ئەگەر بە گەردیلە یەکیش خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان کردووە ، لە کۆتایی (خوا ی گەورە زانا تر ).

ئ

## چوارەم : پیغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ هیرقل قەیصەری وەلاتی رۆم

پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاوەلی بەریزی خۆی کە (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) -خوا لی رازی بیت - کە نامەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بدات بە فەرمانرەوایی وەلاتی شام لە شاری (بوصرا) ئەویش بدات بە دەستی پاشای قەیصری رۆم ، بۆ ئەوەی بانگەوازی پەیمامە کەی خۆی بەگەیەنیت بە م دەسەلاتی رۆم ، وە موسلمان بین ،بەم ئایەینەی کە بۆی هاتووە لە لایەن (خوای گەورە)وە ) بەلی بی گومان مەبەستی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بلاو بۆونەوەی ئاینە کەی بوو لە هەموو سەر زەمین راگەیاندنی بانگەوازی ئیسلام بە هەموو جیهاندا بلاو بیتەوە ، بۆ هەر کەسیك و کۆمەلیك یان هۆزیك یان میلەتیك کە بەدەم بانگەوازیە کەیەوە بین ، چونکە پەیامیکی خوایە و حەق باتل لیك جیا بکریتەوە ، بەلی ئەم پەیامەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە کۆتا پەیامە ئیتسا لە هوو جیهاندا بلاو بۆتەوە هیچ شوینیك نەماوە ئەم بانگەوازەی پی نەگات وە هیچ حجە یەك یان بیانویك نەماوە بۆئەوەی بلین ئەم پەیمامەمان پی نەگەیشتووە ئەمەش بەهۆی زانستی تەکنەلۆجیا و تۆرە کانی گەیاندو ، هەروەها کۆمەلی لە بانگەوازکارانی ئەم ئاینە پیرۆزە لە سەرتاسەری جیهان کە بەکۆمەل لە ئاینە جیاجیاکان دینە نیو ئاینی پیرۆزی ئیسلام ،بەلی لە (ابن عباس)وە – خوا لی رازی بیت – دەلی : (( پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەی نووسی بۆ قەیصری رۆم واتە : (هیرقەل) تیدا بانگی کردووە بۆ موسلمان بوون ، وە بۆ ئەم کارەش هاوەلی بەریزی (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) – خوا لی رازی بیت – هەلبژراد ، وە نامەکەی پیدا ناردووە ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پی کردووە ، کە بیداتە دەستی فەرمانرەوای (بوصرا) لەوە لاتی شام ، بۆ ئەوەی بیگەیەنیتە دەستی (هیرقل) یان قەیصری رۆم ، (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) فەرمانە کەی جی بەجی کردوو دایە دەستی فەرمان رەوایی (بوصرا) لەوەلاتی شام ، (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) ئەویش گەیاندیە دەستی قەیصری رۆم ...)) .

اخرجه : البخاری (٢٩٤٠) ، والبیهقی فی الدلائل ٤/٣٧٧.

ئ

بەلی ئەوە بوو ( دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی ) هەستا  بە هلگرتن و گەیاندین ئەم نامەیە ی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەویش مژدەی بەهەشتی پیدا ، بەلی لە ( ئەنسی کوری مالیك )وە –خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (( من ينطلق بصحيفتي هذه الى قيصر وله الجنة ؟! )) فقال رجل من القوم وهو ( دحية الكلبي ) : وان لم أقتل ؟! قال : (( وان لم تقتل ))فانطلق الرجل به ....)) . اخرجه : ابن حبان ( ٤٥٠٤ ) اسناد صحيح . واتە : هەرکەسیك نامەی من بگەیەنیتە لای قەیصر بە هەشتی بۆ هەیە لە پاداشتیدا ، کەیسك لە ناو خەلکە فەرمووی : ئەو کەسە ( دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی ) بوو ئەگەر نەش کوژریت ؟! فەرمووی : ئەگەر نەش کوژریت ..!! ئەوە بوو ئەو دکەسە نامەکەی برد ... !! دەلین : ناردنی ئەم نامەیە لە مانگی موحەرمی سالی حەوتەمی کۆچی دا بووە ، لە هەمان کاتدا لە گەل گەیشتنی نامە کەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ قەیصری رۆم ، کاروانیکی بازرگانی قورەیش بۆ وەلاتی شام دەرۆیشتن بۆ فەلەستین ،بۆ بازرگانی کردن نیان لەوە لاتی شام ، ئەوە بوو بە قەدەری خوا ئەوانیش لە کور کۆ بوونەوەی کە فەرمانرەوایانی قەیصری رۆم ، کە بۆ تاوتیکردنی ئەو نامەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە لەلایەن ( دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی ) نار درابوو بۆ قەیصری رۆم ، هەر لەم کاتەدا ( هیرقل ) قەیصری رۆم دوای کرد ، کەبازرگانە قورەیشە کان بینەخزمەتی ، کەسەرۆکی بازرگانە قورەیشە کەش ، ( ابو سفیان ) بوو ، بەلی ( هیرقل ) بە نیازی ئەوە بوو کە پرسیار لە قورەیشە کان بکات دەر بارەی ئەو پیغەمبەرە کە لە وەلاتی ئەوان دا هەلکەوتووە کە بانگەوازی ئاینیکی تازە دە کا ، ئەش لیت من پیغەمبەری خودام ،وە کۆتا پیغەمبەرم ، بەلی لەم بارە دوو گیرانەوە هەیە یە کیکیان ئیمانی بوخاری ئەوەی تریان ( ابن اسحاق ) ، بەشیکوەیە کی ریك پیك کۆیان کردۆتەوە وریخستنی هەردووکیان وە باس کردنی روو داوە کە ، بەلی پیغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەیامی خۆی گەیان د بە ( هیرقل ) ی ئمپراتۆریەتی قەیصری رۆمان ، بۆ ئەوەی ئەو حەقەی کەلەلایاەتی بەم فەرمانرەوایەی نیوە جیهان رابگەیەنی بۆ ئەو کات کە دوو ئیمپراتۆریەتی زل هیز هەبوون لە جیهاند ئەویش ئیمپراتۆریەتی ساسانەیەکان کە فارسە کان سە رکردایەتیان دە کرد پاشاکەیان ( پەرویز ) یان ( کیسرا ) بوو ، ئەوەی تریان ( هیرقل )ی قەیصری یان ئیمپراتۆریەتی رۆم بووە لە وەلاتی شام ئەورووپای ئیستا دا ، بەلی ئیمە ئەم رووداوە باس دەکەیت کە ئیمامی بوخاری وە ابن اسحاق بۆ مان دە گیرنەوە – خو الیە یان رازی بیت ..!!

ئ

بەلی لە (ابن اسحاق )وە – خوا لی رازی بیت - دەلی :( زوهری لە عوبید الله ی کوری عبدالله ی کوری عوتبەی کوری مسعو، وە ئەویش لە عبدالل کوری عباس ) وە - خوا لی یان رازی بیت - بۆی گیرامەوە دەفەرمووی : (( (ابو سفیانی کوری حەرب ) بە دەمی خۆی بۆی گیرامەوە و فەرمووی : ئیە هۆزیکی سەرقالی بازرگانی بووین ، وە بازرگان بووین ، جەنگ هەراش تەنگی پی چنی بووین ، کە گەمارۆی دا بووین لەوەی دەر بچین ، هەتا کو هەرچی مال سامان مان هەبوو ، هەمووی فەتاوبووە یان لە نا چوو بووە بۆ جەنگ کردن لە گەل موسلمانەکان ،ئەوە بوو کاتیك ریکەوتنی حودیبیە یان پەیمانی حودیبیە هاتە پیشەوە لە گەل پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دوای ئەوە بارودۆخەکە ئاسایی بۆ وە هیمن و ئاسایشی لەناوچەکە دا بر پا بوو ، چونکە پیشتر بەم جۆرە نەبوو ، منیش وەك بازرگانیك رۆیشتم بەرەو وەلاتی شام بۆ بازرگانی کردن ، بەلی بازرگانیە کەشمان لە وەلاتی شام بوو لە شاری (غەزای ) وەلاتی فەلەستین ، کە رۆیشتین هەتا گەیشتینە ئەوە ی ، ئەوەش لە سەروو بەندی زال بوونی قەیصری پادشای رۆمەکان بەسەر ئەم ناوچەیە دا زال بوون ،چونکە پیشتر لەلایەن فارسە کانەوە ئەو ناچەیە داگیر کرابوو، دواتر کە تەوە دەستی رۆمەکان و ، توانیا لە ژیر رکیفی فارسە کان دەربهینی بخە نەوە ژیر دەستی خۆیان ، چونکە ئەوان خاوەنی خاچ پەرستن بوون یان خاوەنی کتاب بوون لەسەر ئاینی گاورە کان ، بەلی کاتیك ئەم هەوالە گەیشت (هیرقل ) خۆی لە شاری (حمص ) لەوەلاتی شام ،واتە : -حمص ئیستا ی سوریا - دا نیشتبوو ، ئەویش بەریکەوت بۆ ئەم هەوال یان لای ئەم نیرداوەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لە وەلاتی فەلەستین لەشاری (ایلیاء ) بەزمانی عبری یان جوولە کەکان واتە : شاری قودسی ئیستا ، بەلی بەریکەوت بۆ ئەوەی نویژی سوپاس گوزاری بکات و کە پیشتر لی داگیر کرابوو ، بەدەم ئەم هەوالەش هاتبوو ، وە چەندی فەرش رایەخی بۆ بەردمی بۆ رایەخرا بوو بۆ خۆشی دەر برینی بەرسەری دا بروات ، کاتیك گەیشت (ئەلیاء) کارە کانی خۆی تەواو کرد لە بەجی هینانی نویژو پارانەوە پیاوە ئاینەکان و خانەدانەکانی رۆمیش لە خزمەتی دا بوون )). اخرجه : التبرانی فی التاریخ (٦٤٧/٢ ) والبیهقی فی اللائل (٣٨١/٤ ).

ئ
بەلی ( ابن ناتور ) کە ئەو کات فەرمانرەوایی شاری ( ایلیاء ) واتە : ( قودسی ) دە کرد کە ( هیرقل ) قەیصری رۆم کردبوویە پیاوی گەورەی ئاینی و فەرمانرەوای گاورە کان یان ( نصرانیە کان )ی وەلاتی شام ، لە رۆژە دا کاتیك ( هیرقل ) هاتە شاری ( ایلیا ء) یان شاری ( قودس ) رۆژیکی بەدو شوم بوو، زۆر غەمبار بوو چاوەکانی هەلبری بەرەو ئاسمان هەندیك لە بەتاریقەکان ووتیان : بەشیوەیەکی ئاسایی نت بینین شیوا دیاری ، ئەویش ووتی : بەلی راستە ، بەلی ( ابن ناتور ) دەلی : هیرقل زۆر بە خەفەت باریەوە سەیری ئەستیرەکانی ئاسمانی دەکرد کاتیك پرسیاریان لی کرد لەو بارەیەوە لە وەلامدا ووتی : من ئەمشەوە کاتیك سەیری ئەستیرەکانی ئاسمانم کرد و سەرنجم دا و پادشایەکی خەتەنە کراو دەرکەوت ، لەناو نەتەوەکاندا کی خەتەنە دەکریت و خەتەنەکردن پەیرە و دەکات ..؟! ئەوانیش پییان ووت : قوربان هیچ کەس خەتەنە ناکات تەنها جوولە کەکان نەبیت ، ئەوانیش ئەوەند جیگای مەترسی نین بۆ تۆ ئەوەندش بایەخیان نیە نامەیەك بنووسە بۆ گەورەی شارەکان با هەرچی جوولە کەیەك هەیە لە ناوندا بیان ،ئەوان لەسەر ووی جی بەجی کردنی ئەو فەرمانەدابوون ، کە پیاویکی ( عەرەب ) هاتە خزمەت ( هیرقل ی قە یصری رۆم ) کە پاشای غەسان ناردبوویە خزمەتی کە ئالوگۆری دەنگ وباس هەبوو لەنیوانیاندا دەرگاوانەکە ووتی : ئەی خاوەن شکۆ کەسی لە عەرەبە کان هاتووە، لەوانەی سەرقالی مەرو مالاتن دەیەویت قەسەت بۆ بکات دەر بارەی رووداویکی سەر سوور هینەر ..!! کە لە ولاتی خۆیدا روویداوە تۆش پرسیاری لی بکە لەو بارەیەوە کاتیك پیاوە عەرەبە کە گەیشتە خزمەتی بە ورگیرە کەی خۆی ووت : پریساری لی بکە ئەو دەنگو باسە چیە کە لەوەلاتەکەیدا بلاو بۆ تەوە ..؟!

ئەویش پرسیاری لی کردووە ووتی : کە سیك لە ناو هۆزی قورەیش دەر کەتووە لە ناوە خۆماندا بانگەشەی پیغەمبەرایەتی دەکات خەلکانیك شوینی کەو توون و هەندیکیشیان دژایەتی دەکەن لە نیوانیشیاندا چەندین شەور شۆر و جەنگ بەرپا بووە ،لە زۆر شویندا لە وە تی خۆماندا دەرمان کردووە ، هەر لەسەر پەیامی خۆیاندا بەردەوامن و کاتیك ، کاتیك ئەو هەوالەیان پی دا ئەویش ووتی بزانن خەتەنە کراوە یاخو نا جلە کانی لەبەر دا کەن کە سەیرایان کرد خەتەنە کرابوو ، ئینجا هاتنەوە خزمەت پادشا و ووتیان : قوربان خەتەنەکراوە ،وەپریاریشیان لی کرد لەبارەی عەرەبە کانەوە ووتی : ئەوان خەتەنە کردن لە ناویاندا باوە ئینجا ( هیرقل ) ووتی : ئە پادشایە ئەم ئوممەتە کەسەری هەلداوە جلو بەرگی وبۆشاکی پی ببخشن بابراوات لە لامان ...)) . **اخرجه : البخاری ( ٤٥٥٣ ، ومسلم ( ١٧٧٣ )، التبرانی فی التاریخ ٦٤٧/٢ ، والبیهقی فی الدالائل النبوە ٣٨١/٤ .**

ی

بەلی هە لەم ساتەوەختەدا (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) بە نامە ی پیغەمبەری خودا هاتە خزمەت (هیرقەل ) ی قەیصری رۆم ، هەر لە م بارەوەیەوە لە ( ئەنسی کوری مالیك )وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( ئەوە بوو بەردنی نامەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) هاو کات بوو لە گەل هاتنی هیرقەل بۆ شاری (ایلیاء) یان شاری قودس ، کە چەندین فرش و رایەخی بۆ فرش کرابوو ، بۆ ئەوەی بەسەریدا بروات نامەکەی خستە سەر فەرشە کەوە سلاویکی ریزلی نانی لی کرد ، کاتیك قەیصر گەیشتە لای نامە کەی هەلگرت ، پاشان بانگی گەورە پیاوانی ئاینی کرد واتە بتاریقە کانی دەروبەری ، کە نامەکەی بۆ بخونیتەوە ، و فەرمووی : زانیاری من دەبارەی ئەو نامەیە هەر وەك زانیاری تۆیە ، ئەوە بوو قەیصەر بانگی کرد : کی خاوەنی ئەم نامەیە کە دلنیابیت کە پاریزراوە ، ئەوە بوو کەسەکە هاتە خزمەتی واتە : (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی ) ..)) **اخرجه : ابن حبان (٤٥٠٤ ) ،زاد المعاد (١٢١/١) وصحيح البانى فى فقه السير (٣٨٦)** .

ئەمەش دەقی نامەکەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کە بەدەست (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) بۆ (هیرقل ) پادشای رۆم یان قەیصری رۆم :(( بسم الله الرحمن الرحيم ، من محمد عبدالله ورسوله الى هرقل عظيم الروم ، سلام على من اتبع الهدى . اما بعد .. فاني ادعوك بدعاية الاسلام ،اسلم تسلم يؤتك الله اجرك مرتين فان توليت فان علك ثم الأرريسيين . پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی ال عمران ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ ال عمران ٦٤ .

ئەم گیرانەوە وادە دەکەویت کە فرمانرەوای شاری (بوصرای )وەلاتی شام یان سوریای ئیستا ، کە (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی) ناردوەتە شاری (ایلیاء ) یان شاری قودس یان وەلاتی فەلەستینی ئیستا ،کە زانیو یەتی (هیرقل ) یان قەیصری رۆم ،سەردانی ئەم شارەی کردووە ، هەروەك لە گیرانەوەیەکی تر دا (ابو سفیان ) دەلیت : (دیحیە ی کوری خلیفەی کەلبی)هاتە خزمەت فرمانرەوای شاری (بوصرا ) وەلاتی شام ئەویش ناردیە خزمە ت (هیرقل ) قەیصری رۆم ... بەلام لە گیرانەوەیەکی (ابن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : کاتیك قەیصری رۆم نامەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ پی گەیشت و بۆی خویندراویە وە ووتی : برۆن کەسیکی ئەم هۆزەم بۆ بینن کە خزمی خاوەنی ئە نامەیە بیت یان ئەو کەسەبیت کە خۆی بە پیغەمبەری خودا نازەند کردووە ، یان بانگەشەی پیغەمبەرایەتی دەکات ، بۆ ئەوەی پرسیاری لی بکەم دەبارەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ...)) .**اخرجه : البخارى (٢٩٤٠) والبيهقى فى الدلائل**

ئ

النبوه ٣٧٧/٤. هەر لە (ابن عباس )وە - خوا لی رازی بیت – لە (ابو سفیان) ئەوە بۆ مان دەگێڕێتەوە ، دەڵی: (( ئەوە بوو بانگی سەرۆکی پۆلیسە کان یان جەندرمەکانی کرد بوو ، پی ووتبوو : کە دەروە و ناوەوەی وەلاتی شام هەمووی بۆم سەراو بن دەکەیت ، هەتا کو کە سیکی خزمی ئەو پیغەمبەرەم یان ئەو پیاوەم بۆ دینی کە بانگەشەی پیغەمبەرایەتی دەکات ، تا کو پرسیاری لی بکەم لە بارەی کەسایەتی پلە و پایەی لی دەکەین ، (ابو سفیان ) دەڵی : وللاهی من هاوریکان لە ناو شاری غەزە دا بووین خەریکی کارو باری خۆمان بووین ، لە نا کاودا سەرۆکی پۆلیسە کان یان جەندرمەکان هەلیان کووتایە سەرمان ...)) .

اخرجە : التبرانی فی التاریخ (٦٤٧/٢ ) .

سەرۆکی پۆلیسە کان پرسیاریان لی کردین ئیوە کین ..؟! ئیمەش وەلاماندانەوە ... ئەوانیش ووتیان ئیوە خزم کەسی ئەو پیاوەن کە لە وەلاتی حیجاز دا دەرکەوتووە ..؟! ئەلی ووتمان : بەلی . ئەوانیش ووتیان : فەرموون با برۆی بۆ خزمەت پادشای قەیصری رۆم ، (ابو سفیان ) ئەلی ئیمەش لەگەلی یاندا رۆیشین ، هەموومانیان را پیچ کرد بۆ خزمەت پادشا ی قەیصری رۆم ، هە تا کو گەیشتینە شاری (ایلیاء ) واتە : شاری قودس ، کە چووینە ژوورەوە بۆ لای کەبینیمان دانیشتووە لەسەر تەختی پاشایەتی و ، تا نجی پاشایەتی لەسەری ناوە دەدرەوشیتەوە ، وە گەورە پیاوانی رۆم بتریقە کانی رۆم بەدەوریە وە دانیشتووە ..)) . اخرجە : البخاری (٢٩٤١) . بەلی (بو سفیان ) دەگێڕیتەوە دەڵی : (( ئیمەش لەبەردەمی دا دانیشتووین ، بانگی وەرگیرەکەی کرد ، (ابو سفیان ) دەلی : وەللاهی هیچ پیاویکم نەبینیوە وە ئەوەی کەخەتەنە کراوە ، مەبەستی (هیرقل ) قەیصری رۆم بوو ، ئەوەندەی ئەو پیاوە ژیرو دانا بیت کاتیك گەیشت خزمەتی بانگی وەرگیرە کەو کرد ووتی : ئیوە لە خزم و کەسی ئەم پیاوەن ..؟! ئیمەش ووتمان : بەلی . ئەویش ووتی : کیتان لە رووی نزیکی خزمایەتی و رەچەلە ك و نەژادەوە لە هەمووتان نزیك ترە لە و پیاوەی کەبانگەشەی پیغەمبەرایەتی دەکات ..؟! (ابو سفیان ) ووتی : من لە هەموویان نزیکترم لەرووی خزمایەتی رەچەلە ك نەژادیەوە ، پادشا ووتی : خزمایەتی نیوانتان چیە ...؟! ابو سفیان ووتی: ئەو کوری ماممە ، لە ناو ئەو ئەو کاروانەی ئیمەدا ئەوروژە هیچ کەسیك لە نەوەی عبدالمناف نەبوو تەنها من نەبیت ،قەیصر یان پادشا ووتی : ئەم پیاوەم بۆ نزیك بخەنەوە ، هاوەلە کانیشی با نزیك بن لە دواوەی ئەو پیاوە رایان بگرن ..)). اخرجە : البخاری (٧) . (ابو سفیان ) دە لی : قەیصری رۆم ووتی : بە وەرگیرەکە من پرسیاری لی کەدەم دەربارەی ئەم پیاوە ، ئەگەر درۆی لەگەل کردم ئیوەشە بەدۆی بخەنەوە ،(ابوسفیان ) ئەلی : وەللاهی ئەو ئەگەر لە شەرم ترسان نەبوایە هاوریکانم بەدرۆم بخەنەوە لەوکاتەی پرسیاری لی دەکردم لەبارەیەوە درۆم بەدەمەیەوە دەکرد بەلام شەرم و ئابرووچون لەترسی ئەوەی بەدرۆم بخەنەوە وام کرد بەراستی وەلامی پادشا ی قەیصری رۆم بدەمەوە ..؟!

ئ

ئەمەش دەقی ووتوویژی نیوانا ( ابو سفیان ) و ( هیرقل قەیصری رۆم )

هیرقل : نەژادو بنەماڵەی لە ناوتان چۆنە ..؟!

ابو سفیان :خاوەنی نەژادو بنەماڵەیە لە ناو ماندا ..!!

هیرقل : ئایا کەسیکی تر لە پیش ئەم پیاوە وە قسەیەکی وا کردووە ..؟!

ابو سفیا : نەخیر ..!!

هیرقل : ئایا لە باوبا پیرانیەوە کەسیان خاوەنی ملك و دەسەلات و فەرمانرەوایی بوونە ..؟!

ابوسفیان : نەخیر ..!!

هیرقل : ئایا پیاو ماقوڵان و گەورە پیاوان و دەولەمەند شوینی کەوتوون یان لاوازەکان وهەژاران ..؟!

ابوسفیان : لاوازە کان هەژاران ..!!

هیرقل : ئایا زیاد دەکەن یان کەم واتە : لە( زیاد بووندان یان لە کەم بوون ) ..؟!

ابوسفیان : زیاد دەکەن بە بەردەوام ..!!

هیرقل : ئایا کەسیان هەیە دوای موسلمان بوونی هەڵگەریتەوە پیشت لە ئاینەکەی بکات لەم کاتەدا ..؟!

ابوسفیان : نەخیر . هەر هەموویان ئیمانیکی دامەزراویان هەیە ..!!

هیرقل :ئایا غەدر ئەکات ..؟!

ابوسیان : نەخیر . لە ئیستادا پە یما نمان لە نیواندایە وە نازانین چی تیدا ئەکات ..!!

هیرقل : ئایا جەنگ شەرتان لە گەلدا کردووە ..؟!

ابوسفیان : بەلی .

ئ

هیرقل :سەر ئەنجامی جەنگ و شەرەکانتان چۆن بووە ..؟!

ابوسفیان: جەنگ و شەر لەنێوانەدا بە نۆرەیە ، دەستمان لێ ئەوە شێنێ و دەستی لێ ئەوەشێنین ..!!

هیرقل: چ فەرمانێکتان بەسەر دا ئەکات ..؟!

ابوسفیان : محمد ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : ( خوا بەتاك تەنها بە پەرستن و ،هیچ شتێك مەکەنە هاوتای و هاوبەشی ، واز لە بیر برچوونی باو و باپیراتان بهێنن ،فەرمانمان بەسەردا ئەدا كە نوێژ بکەین ،راسگۆ بین ، داوێن پاك بین و ،وە صیلە ی رەحم بەجێ بهێنین ..!!

دواتر هیرقل : بە وەرگێرەکەی ووت : کە بە ( ابو سفیان ) بەڵێ چ وەڵامێکی دایتەوە بۆی شی کردوە

هیرقل : ووتی : تۆ ئەوە ت باس کرد کە خاوەنی نسب و نەژادو رەچەلە کە لە ناوتاندا ، هەروەها پێغەمبەرانیش لە ناو قەومەکەیاندا خاوەنی نسب نەژادو رەچەلە کن ..!!

هیرقل : ووتی : پرسیاری ئەوەم لێ کردی ئایا لەووو پێش کەسێکی تر ئەم قسەی کرووە واتەبانگەشەی پێغەمبەرایەتی ..؟! تۆش ووت : نەخێر ، منیش ئەم ووت: شوێن و ووتەی بانگەوازی پێش خۆی کەوتووە .

هیرقل : ووتی : پرسیارم لێ کردی دەربارەئەوەی کە لەباوباپیرانی کەسیان خاوەنی دەسەلات مولك پاشایەتی بوو ..؟! تۆش ووت: نەخێر . خۆ ئەگەر لە ناو باوباپیرانی کەسێکان خاوەنی دەسەلات ملك پاشایەتی بایە ، منیش ئەم ووت : دە بەخوا ئەویش بۆ خۆی بەدوای دەسەلات ملك پاشایەتیەوەیە ..!!

هیرقل : ئەڵێ : پرسیارم لێ کردی ..؟! پێش ئەمە هیچ درۆتان لێ بیست بوو ..؟! تۆش ووت : نەخێر .

دەی منیش ئەوە بە منطق نازانم و ناگونجێ ..!! کەسێ لە گەل خەلکی دا دەست لە درۆ هەلگرێ لە گەل ( خوای گەورە ) دەست بە درۆ بکات ..!!

هیرقل : ئەڵێ : پرسیارم لێ کردی دەربارەی ئەوەی ئایا پیاوماقول و یان پیاوە گەورە کان و خانەدانەکان بەدوای بانەگەوازیەکەیەوە چوون یان لاوازەکان بێ دەسەلات و هەژارەکان ..؟! تۆش ووت : لاوازەکان و هەژارەکان شوێنی کەوتوون ..!! ئەوانەش شوێن کەتنی پێغەمبەرانن ..!!

اخرجه :البیهقی فی الدلائل النبوه ( ٢٣٨٤ ).

ئ

هیرقل : ئەلی : پرسیارم لی کردی دەربارەی ئەوەی ژمارەیان زیاد دەکات یان کەم دەکات ..؟! تۆش ووت : ژمارەیان لە زیاد بوون دایە ..!! دەبخوا کاری ئیمانیش هەر ئەوەی زیاد دەکات هەتا تەواو دەبیت ..!!

هیرقل :ئەلی : پرسیارم لی کردی ئایا کەسی هەیە دوی موسلمان بوونی پشت هەل بکان پاشگەزبیتەوە یان هەلبگەریتەوە ..؟! تۆش ووت : نەخیر کە س نیە ..!! دە بخوا ئیمانیش وەها یە بەدامەزراوەیی یان گەشاوەیی تیکەل بە دل دەبیت ..!!

هیرقل : ئەلی : پرسیارم لی کردی ئایا : غەدر دەکات ..؟! تۆش ووت : نەخیر . دەبخوا پیغەمبەرانیش غەدر ناکەن ..!!

هیرقل: ئەلی : پرسیارم لی کردی ئایا چ فەرمانیکتان پی دەدات ، تۆش ووت : ( خوا بەتاك تەنها بە پەرستن و ،هیچ شتیك مەكەنە هاوتای و هاوبەشی ، واز لە بیر برچوونی باو باپیراتان بهینن ،فەرمانمان بەسەردا ئە دا کە نویژ بکەین ،راسگۆ بین ، داوین پاك بین و ،وە صیلە ی رەحم بەجی بهینین ..!!هیرقل ووتی : جائەوەی تۆ ئەلیت : راست بیت ،ئەوا ژیر ئەم دوو پی یەم دە بیتە مولکی ئەو پیاوە کە تۆ باسی دەکەیت ، دەبخوا ئەشم زانی کە رەوانە کە کری ، نەشم نازی لە نا ئیوە دا هەلدە کەویت ، خۆ ئەگەر بزانم ئەی گەمی ،ئەوا هەولم ئەدا بەخزمەتی بگەم ، گەر لە زمەتیشا بوومایە ئەوا ئاوم بەسەر پی دا ئەکرد ..!!

پاشان فەرمانی نووسراوەکەی پیەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هینا و بۆ ئامادەبووانیان خویندەوە ،دەنگی پیاوەگەورە کان بتریقەکانری رۆم بەرز بویەوەو بووە بە بۆلە بۆل رەخنە گرتن لە پادشای قەیصەری رۆم هیرقل ، ئەوە ئەبوو سیفان پیاوەکانیان بردە دەروە ،

( ابوسفیان ) ئەلیت : کاری محمد ( صلی الله علیه وسلم ) گەورە بوو ە ، ئەوتا پادشای رروٌم لی ئەترسی ؟!

لەدوای دا ( ابو سفیان ) ووتی بەلامەوە یەقین بوو کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) سەر ئەکەویت ، تا ئەوە بۆ ( خوای گەورە ) ئیسلامی خستمە نیو دلمەوە ..؟!

اخرجه : البخاری : ( ٢٦٨١ )ومسلم ( ١٧٧٣ ) ، واحمد ( ٢٣٧٠ ) ، وابو داود ( ٥١٣٦ )، والترمزی ( ٢٧١٧ ).

ئ
لە گێڕانەوەیەکی ( ابو سفیان ) دا دەلی : (( هیرقل نیوچاوانی ئارەقەی لی دەهاتە خوارەوە لەو نارەحەتیە دووچاری ببوو بەهۆی نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بۆی نووسی بوو کاریگەری زۆری خستە سەری )).
اخرجه التبرانی فی الکبری ( ٧٢٧٤ ) وابو نعیم فی الدلائل برقم ( ٢٣٩ ) .

هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تریشەوە کە ( هیرقل ) نامەکەی پێغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) ی خویندەوە ، ووتی : ئەم نامەیە لە دوای سلیمان پێغەمبەروە کەسی گوییستی نەبوو کەتیدا نوسراوە ( بسم الله الرحمن الرحیم ) .. )) اخرجه ابی شیبه فی المصنف برقم ( ٣٧٧٨٢ )

پاشان ئەوە بوو هیرقل نامەیەکی نووسی بۆ هاورەیەکی خۆی لە رۆمەکان ، کە هاو شانی بوو لە زانست زانیاری ، بەلی هیرقل بەرکەوت بەرەو ( حمص ) لەو سوریا ئیستا دا ، هەر لەویدا وەلامی نامە کەی خۆی هاتەوە لە لایەن هاوریکەیەوە دەربارەی بیرو بۆچوونی لە سەر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بی گومان ئەویش هەمان راو بۆچوونی هیرقل ی هەبوو ، لە هاتنی پیغەمبەریك وە ئەو پیغەمبەرەش ئەو کەسەیە کە چاوری دەکریت ، وە هیچ گومانی تیدانیە کە ئەو کەسە ئەو پیغەمبەرە یە شوینی بکەوە وە باوەری پی بهینە ..!! هیرقلیش : ئەم بانگەوازەی خۆی بەگویی گەورە پیاوان و بتریقە کانی ئیمپراتۆریەتی رۆم دا گەیاند ، لەسەر بینایە کی بەرز لەسەر شیوەی قسەر دروست کرا بوو ، لە شاری ( حمص )ی سوریای ئیستادا ، فرمانی دا دەرگاکانی داخست پاشان لەسەر شوینکی بیناکە یان قەسرە کە دەرکەوت ووتی: ئەی خەلکانی رۆم یان ئەی گرۆی رۆم ، ئایا سەرفرازو سەرکەتنتان دەویت ..؟! وە دە تانەوەیت ریگای راست بگرن و ئەم دەسەلات و مولکە تان بۆ بمینیتەوە ئەوە شوینی ئەو پیغەمبەرە بکەون ..!! بەلی هەر کە ئەم باسە یان بیست وەك کەر کیوی یان وەك گارانی جیل و مەر ،هەلیان کوتایە سەر دەرگاکان بینیان وا داخراون ، بەلی کاتیك هیرقل ئەم هەلچوونەوە ئەم شیوەی وەك را پەرین و رەخنە گرتنەی بینی لی یان بی هیواو بوو لە باورە پی هینانیان بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، هەروە ها هیرقل ووتی : بیان هینەوە و ، وتیشی من لەو بارەیەوە ئەم قسانەم کرد ویستم تاقی تان بکەمەوە بزان تاچ رادەیەك سورن لەسەر ئاینەکەتان ،منیش ئیستا دلنیا بوون بە چاوی خۆم بینیم ،ئینجا هەموو کەو تنەوە کرنوش بردن بۆی رازامەندیان نیشاندا بەرامبەری )).

اخرجه : البخاری ( ٤٥٥٣ ) والنسائی فی الکبیر ( ١١٠٦٤ ) .

ئ

هەروەها لە گێرانەوەیەکی تری (ابن اسحاق) – خوا لی رازی بێت - دا هاتووە دەڵی : (( هیرقل فەرمانی کرد کە گەورە پیاوانی رۆم کۆببنەوە لە کۆشکی پاشایەتی ، وە فەرمانی کرد دەرگاکانی کۆشك هەر هەمووی دابخەن ، پاشان خۆی لەترسی گەورەپیاوانی رۆم چووە سەر بەرزایەکی ناو کۆشکەکە ، بۆ ئەوەی بەسەریاندا بڕوانێت لیشیان دوور بێت نەوەك لەبەر ئەم هەواڵە پەلاماری بدەن ،ئەویش واتە : هیرقل ووتی : ئەی گۆری رۆمەکان من نامەیەکی (احمد)م پی گەیشتووە ، وەڵلاهی ئەوە پێغەبەرەیە کە ئیمە چاوەڕێمان دەکرد وەباسی ئە لە کتێبە کەماندا هاتووە بەکات وە بە نیشانەکانی دەیناسینەوە موسلمان بن وە شوێنی بکەون ئاینە کەتا لە دوا رۆژا سەلامەت دەبێت ، بەڵی کاتێك هەر ئەمەیان بیست هەڵیان کوتایە سەر دەرگاکان و وەك یەك را پەرین و کاتێك سەیریان کرد دەرگاکان لەسەریان دا خرا بوون هیرقل ترسا لیان و ووتی : بیان گێرنەوە بۆ لای من ئەوانیش گەڕانەوە ئەویش پی ووتن : ئەی گرۆی رۆمەکان من ئەو قسانەم بۆیە بۆ ئیوە کرد بۆ ئەوەی تاقیم کردنەوە بزانم چۆنن لە دەستگرتن بە ئاینەکەتانەوە ،وە بەڕاستی ئەوەی لە ئیوەم بینی دڵخۆشی کردم ئەوانیش کەوتنە کرنوش بردن بۆی پاشان دەرگای کۆشکەکەیان لی کردنەوە ورۆیشتنەوە دەروە ...)). **اخرجە : التبرانی فی الکبیر (٧٢٧١)والبیهقی فی الدلائل (٣/٣٨٤ ) والترانی فی التاریخ (٦٤٨/٢ ) و زاد المعاد (١٢١/١ .**

لە گێرانەویەکی تر دا لە (ئەنسی کوری مالیك) – خوا لی رازی بێت – دا هاتووە دەڵی : ((... هیرقل بە (دوحیە کوری خلیفەی کوری کەلبی) ووت : من ئیستا دەرۆم بۆ شاری (حمص) لە وەلاتی سوریای ئیستادا ، وەرە لام لەوی ، کاتێك گەیشتینە ئەوی ، پیاوماقولانی رۆمەکان هاتنە خزمەتی قەیصری رۆم هیرقل ، ئەویش فەرمانی کرد دەرگاکانی کۆشك دا بخەن ، پاشان فەرمانی کرد بە چار لیدەریك یان بانگ دەریك کە بانگ بکات قەیصەری رۆم یان پادشای رۆم هیرقل ، بە شوێن محمد (صلی الله علیه وسلم) کە وتووە ..!! وە موسلمان بووە وە دەست بەرداری ئاینی گاور یان نصرانی بووە ، سەربازەکانی وپیاوماقولانی هێرشیان بۆ هیناو ، خۆیان پر چەك کرد و ، دەرەوەی کۆشکەکەیان گرت ،ئینجا فەرمانی بە نێردراوەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرد ، واتە : (دوحیە کوری خلیفەی کوری کەلبی) پی ووت : خۆت دەیان بینی ئەم خەڵکەکەمە ..!! بەڕاستی من دەترسم لە وڵاتەکەم ، پاشان فەرمانی کرد ك بانگ دەریك یان جار لیدەرەکە ، بانگەوازی بکاتەوە ، کە هیرقل یان قەیصری رۆم لە ئیوە رازیە کە ویستی تاقی تان بکاتەوە تا بزانن چۆن ئارامگرن لەسەر ئاینەکەتان ئیستاش بگەرینەوە ئەوانیش بڵاوەیان لی کرد ،هیرقل یان قەیصر نامەیەکی نووسی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیەوسلم) من موسلمان بووم چەندین دینار پارەی نارد بۆ خزمەتی ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ...!!!

ئ

بەلی کاتیك پیغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) نامەکەی هیرق یان قەیصری رۆمی خویندەوە ، فەرمووی : ((كذب عدوا الله ليس بمسلم و هو على النصرانية)) . واتە : درۆ دە کات دوژمنی خوا ، ئەو هیشتان گاورە یان نصرانیە ..!! وە پارە کەشی دابەش کرد ..!! .زاد المعاد ١/١٢١ .

بەلی وای بۆ دەچیت کە هیرقل لەبەر مولك زەوی پان بەرین و دەست هەلات و کورسی پاشایەتی تەماحی دونیا ، موسلمان نەبوو بیت ، هەر بۆیە لە خەلکەکەی خۆی ترسا ، نەوەك لە دەست هەلاتی دوور خنەوە ،بی گومان هیرقل باوەری بە پیغە مبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) هینا بوو ، وە باش دەی زانی کە ئەو پیغەمبەری خودایە و کۆتا پیغەمبەرە ، هەر وەك یهود و نصرانیە کانی ئیستا ئەوانیش باش دەزانی کە کۆتا پیغەمبەرە ، بەلام لە بەر تەماحی دونیا شوات و زینەتی دونیان خۆشی شادیە حەرام کراوەکانیان ، دان بەم راستیە دانانین ، تەماحی دونیا چاوی کویر کردن ، هەروە (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ال عمران ٧١ .ئەی خاوەنی کتیبەکان بۆچی ؟! بەرگی بەتال و ناحەقی دەکەن بەبەری حەق و راستیدا دەشارنەوە لە کاتیکدا خۆتان چاك دەزانن کە حەق و راستی کامە یە ..؟!

بەلی بی گومان هیرق دانی نا بەم راستیە لەبەرچاوی هەموو خەلك بەلام دواتر ترسا و پەشیمان بوویەوە ، چونکە تەماحی دەسلات و مولك زۆری دونیا خۆشیە کانی پاشایەتی خۆی چاوی کویر کرد و باوەری بەراستی نەهینا ، ئەگینا ئەیزانی کە پیغەمبەری خوا ، هەروەك یوهود نصرانیە کانی ئیستا یان مونافیقە کان ، کەبەر بوونە تە گیان ئەم خەلکە هەژارە لەسەرانسەری دونیادا ، کەچی ئەشزانن مردن هە یەو حەق ..؟! لە دوارۆژدا لی پیچینەوە هەیە وحەقە، هەروەها دۆزەخەیش هەیە و ئاگریکی زۆر بەتین کە (٧٠) بەقەد ئاگری دونیا بەتین و بەهیزە بە گرو بە گلپەیە ..؟! بەلام بەردەوام زلم و ستەم لە ئاینە پیرۆزە خەلکە موسلمانە هەژارەکان دا دەکەن ، بەلام هەموو زالم ستەم کاریك خاتیمەی خیر نابیت ، سوء الخاتمە دەبیت شەرئە نجامی زۆر دژوارو ناخۆش دەبیت ، ئەوەی دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکات سەرئە نجامی روون ئاشکرایە کە لە دونیادا ریسوا سەر شۆر دەبیت .. !! وە لە قیامەتیشدا ریسوا سەر شۆر ئازاریکی بەئیش ژان چاوریەتی بۆ هەمیشەیی لە نا ئاگری دۆزەخ دا ئەمینتەوە .................!!!

ی
بەلام هیرقل پارزگاری لە نامەکەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کرد و زۆر بەریزە وە پاراستی هەروەك لە ( سوهيل ) وە – خوا لی رازی بیت – دەلی : (( هیرقل نامەکەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە ناو لوولەیەکی زیردا هەلگرت ، وەك ریزو گەوریە ك بۆ پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وە بەردەوام قەیصر دوای قەیصر بە میرات لە یەکتریا وەردەگرت )). فتح الباری: ١/٦٠ .

هەروەها ( خالید سید علی ) ئەلی ئەو نامەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )هیرقل قەیصری رۆم رەوانەکرا ، مەلکی ئوردن ( مەلیك حسین ) کریویەتی لە مۆزەخانەی بەریتانیا ،ئەگەریتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زاینی واتە سەردمی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) .

بەلی باسیکی کورتی فرمانرەوایی هیرقل ، کەلە م سەردەمەدا واتا لە سالی ٦٠٢ زاینی دا جیهان دوو ئیمپراتۆریەتی زل هیزی بەخۆیەوە دەبینی ئەوی ئیمپراتۆریەتی ساسانیە کان کە کیسری یان پەرویز ی فارس فەرمانرەوایی دەکرد ئەو بەشەی رۆژ هەلاتی ئاسیاو تا کو رۆژ ئاوای ئاسیا ، ئەوبەشەی تریش کە هیرقل یان قەیصری رۆم فرمانرەوایی دەکرد ، ئەویش چەند هەریمیکی ئاسیا و ئەورویا کیشوەری ئەفریقا دا گرتبوو ، هیرقل لە خیزانیکی یونانی لە دایك ببوو ، دواتر فارسە کان هەلمەتیان دایە بەشیکی زۆری خاکرۆمیە کان لە سالی ٦٠٢ زایینی دا، ئەوە بوو ،ئەو کاتە هیرقل ئە قرتاجیە بوو ،وە لە سالی ٦١٠زاینی دەسەلاتی رۆما ی گرتە دەست بووە بە قەیصری رۆما ، تا ئەوە بوو قورئانی پیرۆز هەوالی سەرکەتنی رۆمەکانی راگەیان بەسەر فارسە کاندا ،کە ( خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿الم (١) غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾الروم ١-٥ . بەلی ئەوە بوو هیرقل بە هیزیکی زۆرە و هەرچی وەلاتی هەبوو لەدەستی دا بوو لە فارسە کانی ساندەوە تەنانەت چووە ناو چەرگەی ئیپراتۆریەتی ساسانیەکان ناوچەرگەی فارس ، سەرکەوتنیکی زۆر گەورەی بەدەست هینا هەروەك قورئانی پیرۆز باسی دەکات کە ، ئەوە بوو موسلمانەکان لە جەنگی بەدری گەورە دا سەرکەتن هەروەها رۆمەکانیش بەسەر فارسەکان سەرکەوتن لەسالی ٦٢٦ زایینی دا بووە ، بەلام هیرقل واتە قەیصری رۆم لە سالی ٦٢٩زاینی دا کە دەکاتە سالی حەوتەمی کۆچی هاتۆتە شاری ( ایلیاء) یان شاری قدس نامەکەی پیغەمبەری خوای ( صلى الله عليه وسلم ) پی گەیشتووە ..!

ئ

## پینچەم : پیغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ پادشای عمان

له (عمری کوری شعیب )وه ئەویش له (عمری کوری عاصه ) وه - خوا لی یان رزای بیت — دەلی : پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) منی نارد بۆ لای (جفیر) و ( عبید ) کورانی الجلندی که هەردووکیان برا بوون پاشای عومان بوون ،له بنی (ئەز د بوون ) دەقی نامەیه که ئەمەیە (( بسم الله الرحمن الرحیم : من محمد عبدالله الی جفرو عبید ابني الجلندی ، سلام علی من اتبع الهوی ، اما بعد : فاني ادعو کما بدعاية الاسلام ،اسلما تسلما فاني رسول الله الی الناس کافة لانذر من کان حیا ویحق القول علی الکافرین فانکما ان اقررتما بالاسلام ولیتکما ،وان ابیتما ان تقرا بالاسلام ،فان ملککما زئل وخیلی تحل بساحتکما وتظهر نبوتي عل ملککما )) . واته : بەناوی خوای پەخشندەو میهرەبان له محمدی بەندەی خوداوه بۆ جفیرو عبیدی کورانی الجلندی و سلاو لەو کەسەی که شوینی ریگای هیدایەت دەکەویت ، پاشان من به بانگەوازی ئیسلام بانگتان دەکەم ، موسلمان بن ، سلامەت دەبن من پیغەمبەری خودام بۆ خەلکی جیهان بەگشتی بۆ ئەوەی هەموو کەسیکی خاوەن هۆش و ژیر بیداربکەمەوە وه وادەبیمنەجی بۆ سەر بی باوەران ، ئیوە ئەگەر موسلمان بن ئەوا دەبنەوه دەسەلاتداری ناوچەکەی خۆتان ، وه ئەگەر پشت هەلکەن و دان به ئیسلام دا نەنین ، ئەو مولك دەسلاتان له بەین دەچیت ئەسپ سوارە کانی من دەگەنە سەرتا و پیغەمبەرایەتی منتان بۆ دەردەکەویت و بەسەر دەلەته کەتان فەرمانرەوای دەکات . وه له گیرانەوەیه کی تر دا هاتووه (هەردوو پادشا که هەر دوو کیان موسلمان بوون . واته : پادشاکانی عومان ) له گەلیاندا خەلکی زۆر موسلمان بوون و سەرانه جزیه یان دانا لەسەر ئەوانەی که موسلمان نەبوون )). اخرجه ابن هیشام فی السیره النبویه (٢٢٨/٤ )و التبرانی فی الکبیر (٨/٢٠ ) .

هەروەها پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( لکن اهل عمان لو اتاهم رسولي ما سبوه ولا ضربوه )) اخرجه : ابن حبان (٧٣١٠ ). واته : بەلام ئەگەر خەلکی عمان نیردراوی من بچوایه لایان قسەیان پی نەدەوتن ولییان نەدەدان ..!!

ئ

## شەشەم : پیغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ بنی زوهیر

ئەم نامەو بانگەوازە روونکردنەویەك بوو بۆ یەكیك لە هۆزەكانی ( هوذیل ) كە لە پیش دا باسمان كرد كە لە رووداوی ریجع دا بەشداریان كرد ، عوكل ئەویش بنی زوهیری كوری ئوقیس بوون ، بەلی لە ( عبدالله ی كوری شوخەیرە ) وە – خوا لی رازی بیت –دەلی : ئیمە لە مەربەدی ( بصره ) بووین پیاویكی سەرو قژی ئالۆسارم بینی ناوی ( نمری كوری تلب ) بوو پارچەیەك چەرمی بەدەستەوە بوو ، پیمان ووت : دەلی خەلكی بادیە ی ؟! ووتی : بەلی . وە فەرمووی : ئەم نامەیە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ نوسیووم ، ووتمان : ئەو پاچە پیست لەناودەستدا یە بمان دەری ..؟! ئەویش فەرمووی : ئایا كەسیكتان تیدایە بخوینیتەوە ..؟! ووتم : واتە ( عبدالله كوری شوخەیر ) من دەی خوینمەوە فەرمووی ها لیم وەرگرە كە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆی نوسیووم ، ئیمەش لیمان وەرگرتوو خویندامانەوە بینمان تیدا هاتووە : (( بسم الله الرحمن الرحيم و من محمد رسول الله الى بني زهير انكم ان شهدتم ان لا إله الا الله وان محمدا رسو الله واقمتم الصلاة واتيتم الزكاة واديتم الخمس من الغنيمة وسهم النبي ( ﷺ ) والصفي وفارقتم المشركين فانتم ءمنوا بأمان الله وأمان رسوله ... )) .

واتە : بەناوی خودای پەخشندەو میهربان لە محمد پیغەمبەر خوداوە بۆ بنی زوهیر ئیوە ئەگەر شایە تمان بینن كە جگە لە خودا هیچ پرستراویك بە حەق بوونی نیە و محمدیش پەیام بەری خودایە یان نیردراوی خودایە ، و نویژ بە چاكی بكەن و زەكات بدەن پینج یەك لە غەنیمەت دیاری بكەن لە گەل بەشی پیغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم ) و هەرژان ، وە لە موشریكەكان جیاببنەوە و پشتیوانیان نەكەن ئەوە ئیوە لە ئاسایشدا ئەبن مسۆگری دەكەن ، بە ئەمانی خودا پیغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم )

ئ

## حەوتەم: پیغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ بنی (بەکری کوری وائل)

لە (ئەنس کوری مالیك )وە – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەی نووسی بۆ بنی بکری کوری وائل (( من محمد رسول الله الى بكر بن وائل ان اسلموا تسلموا )) واتە: لە محمد پیغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ بنی بکری کوری وائل ، ئەگەر موسلمان بن سلامەت دەبن .

اخرجه : التبرانی فی الصغیر (٣٠٧).

## هەشتەم : پیغە مبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ (بنی جوزەیمە)

لە (بان اسحاق )وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( لەکاتی دانووستانی پەیمانی حودیبە (ریفاعەی کوور زەیدی جوزایمی) هات خزمەت پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وە کۆیلەیەکی پیشکەش بە پیغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) کرد پاشان موسلمان بونیکی راستە قینەو خواناسانە موسلمان بوو ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەیەکی بۆ هۆزەکەی واتە: ( هۆزی جوزەیمە ) لە نامە کەدا هاتبوو : (( بسم الله الرحمن الرحيم ) هذا كتاب من محمد رسول الله لرفاعة بن زيد اني بعثه الى قومه عامة ، ومن دخل فيهم يد عوهم الى الله والى رسوله ، فمن اقبل منهم ففي حزب الله ورسوله ،ومن ادبر فله أمان شهرين )) .واتە : بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ، ئەم نامەیە لە محمد ی پیغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ریفاعەی کوری زەیدی جوزامی ناردوومە بۆ ناو هۆزەکەی بەگشتی ، هەرکەسیك بیت ناویانەوە لەگەلیاندا بیت بانگەوازی بکەن بۆ لای خودا و پیغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) وە هەرکەسکی لەوانە قبولی کرد ئەوە دیتە نا کۆمەلی خودا و پیغەمبەرکەی (صلى الله عليه وسلم) وە هەر کە سکیکیش پشتی هەکردوو موسلمان نەبوو ئەوا تا دوو مانگ لە ئاسایشدا دەبیت ، کاتیك ریفاعە گەرایەوە ناوهۆزەکەی ەبدەم بانگەوازەکەیوە هات و موسلمان بوون ، پاشان رۆیشتن بۆ مەدین لە گەر مەسیری (حرە الرجلان) لەویدا نیشت جی بوون ...).

اخرجه التبرانی فی الکبیر (٤٥٦٢).وابن هشام فی السیر (٢٠٦/٤).

ئ

## نۆیەم : پیغەمبەری خوا ﷺ نامەی نارد بۆ ( منذيري كوری ساوی ) حاكمي بحرين

بەلی ناوچەی بەحرین لە کات دا بی دەوتراو (الاحساء) ئەوکاتە زۆربەی دانیشتوانی بەحرین لە هۆزی بنی (عبدالقيس) و (بكر بن وائل ) و (تيميم ) بوون ،( منذيري كورى ساوى )كارەبەدەست و فرمانرەواو حاكمى بحرين بوو ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) (علائى كورى حةضرمي ) هەلبژارد بۆ هەلگرتنی ئەم نامەیەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) تاكو بۆ سەر ئاینی ئیسلام بانگیان بكات ، جا ئەوە بوو (علائى ) نامەكەی گەیاند بەدەستی حاكمی بەحرین ، ئەویش خویندیەوە موسلمانان بوونی خۆی راگەیان ، هەروەها بۆ دانیشتوانی بەحرینیشی خویندەوە هەندیکی زۆر موسلمان بوونیان چووە دلیەوە هەندیك موسلمان نەبووە ، چونكە دانیشتوانی بەحرین لە كاتدا خەلكی ئاگر پەرست و مجووس جوولەكە ی تیدا بووە ، هەربۆیە ،( منذيري كورى ساوى ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) وەلامی نامەكەم بۆ بنیرەوە لەم باریەوە چی بكەم من موخەلكی كی زۆر موسلمان بووین ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) وەلامی دایە وە و كە بار هەر خۆی كاربەدەستی بەحرین بی بیت وە كەسیش بەزۆر موسلمان نەكان ، باجوولە كەو مەجووسیش جزیە بدەن .. ئەمەش دەقی نامەی دوومی پیغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم ) بۆ حاكمی بحرين : (( بسم الله الرحمن الرحيم ،من محمد رسول الله الى منذر بن ساوي ،سلام عليك ،فاني احمد اليك الله الذي لا اله الا هو ، واشهد ان محمدا عبده ورسوله . اما بعد... فاني اذكرك الله عزوجل ،فانه من ينصح فا نما ينص لنفسه ،وانه من يطع رسلي ويتبع امرهم فقد اطاعني ،ومن نصح لهم فقد نصح لي ، وان رسلي فقد اثنوا عليك خيرا ، واني قد شفعتك في قومك ،فاترك للمسلمين ما سلموا عليه ، وعفوت عن اهل الذنبو ،فاقبل منهم وانك مهما تصلح فلن نعزلك عن عملك ،ومن اقام على يهودية او مجوسية فعليه الجزية )).

اخرجة : ابن حبان (٦٥٥٣ ) و ابن كثير في الدبداية والنهاية (٢٦٨/٤ ) وا في كتاب (اعلام السائلين عن كتب سيد المرسلين ) لابن طولون ص ٦٦-٧٠ -١٠٦.

ئ

## غەزای ( ذي قرد یان غابه )

ئەم غەزایە لەدوای ریکەوتنامەی حودیبیە و بەر لە روودانی غەزای خەیبەر روویداوە ،وە بە پی راسترین بۆچوونی زانایانی سیرە ی میژووی ئیسلام هەروەها یەکەم غەزایە کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دوای پەیمانی حودیبیە ئەنجامی داوە ، وە هۆکاری روودانی ئەم غەزایە ئەم بووە ،کۆمەلیك لە هۆزەکانی ( غطفان و فوزارة ) ،هەلیان کووتایە سەر مەرومالاتەکانی شاری مەدینە ، وە میگەلیك لە ووشتری ئاوس و شیردەر کە هی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بوو ،ئەم میگەلە ووشترەیان بردە پیشە خۆ بردیان بە تالان کە لە ناوچەیەك بوو پی دەووترا ( غابه ) شوانی مەرو مالات ووشترە کەشیان کوشت و ژنەکەشیان بە دیل گرت ، هەروەها ( سلەمەی کوری ئەوکوەع ) ئەم رووداوەی زای یەکەسەر خەلکی شاری مەدینەی ئاگادار کردوە ، هەر خۆشی شوینی ئەم دوو هۆزە ستەم کارە کەوت کە شوانە کەیان کوشت مەرو مالاتەکایان دزی بەتالان برد ، هەورەها کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لەم روو داوە ئاگادار کرایەوە ، بە پەلە فەرمانی بە هاوەلانی دا کە بەدوای ئەم دوو هۆزە زالم و ستەم کارە بکەون ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە گەل ( ٥٠٠ ) هاوەلی بەریز بەدوای ئەم دوو هۆزە کەوتن ، هەتاکوو هەموو مەرو مالاتەکەیان لە دەستی ئەو جەتە و دزو تالان جیانە رزگار کرد ، بە تایبەتی ئەو ووشترەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە لە ناو ووشترە کان بوو ، بە ( عضباء ) ناسراو بوو . لە ریوایەتیکی ( سلمەی کوری ئە رکوع ) وە – خوا لی رازی بیت ) دا هاتووە کە پالەوانی ئەم غەزایە بوو ، دەفەرموویت : ( پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) میگەلیکی ووشتری لە گەل خۆی بە ( رباح ) ناردە دەروە بۆ لە وەرگا ، وە منیش ئەسپەکەی ( ابو طلحه ) پی بوو ، کە رۆژمان کردوە سەیر دەکەین ( عبدالرحمن فرازی ) بە سەر میگە ووشترە کانی مەدینەی داوە ، هەر هەمووی داوەتە پیش خۆی ، شوانەکەشی کوشتووە ، منیش ووتم : ( رباح ) ئەو ئەسپە ببە و بگەینە بە ( ابو طلحه ) و وە هەوالە کەش بدە بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پاشان من لە سەر گردیك بووم رووم لە شاری مەدینە کرد سی جار هاوارم کرد ( یاصباحاه ) پاشان چوومە دوای شوین پی ئاسەواری هۆزی فەزارە کە مەرو مالات ووشترە کانیان بە تالان برد بوو ، وە هە تیرم تی دەگرتن خۆم دەشاردەوە دەم ووت :

( أنا اب الاکوع ... والیوم یوم الرضع ) بەردەوام بووم لە تیر هاویشتن و ، وە بریندار کردنیان ، هەر کە ئەسپ سواریکیان بیویستایە بگەریتەوە دواوە دە چوومە ژیر درەختیکەوە تیرم تی دە گرت ، وە دەم گە راندەوە ،تاکو خۆیان کرد نیوان تەنکە بەری شاخیك ، وە چوومە سەر شاخەکە بۆیان بەردم بەسەردا بەردەدانەوە ، بەم شیوەیە بەردەوام بووم تاکو ووشتر نەما لە میگە ووشترەکە ی پیغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) بەر پیشە خۆمی نەدەم ، ئەوان وازیان هینا بەلام منیش هەر بەدوایان کەوتم ، تیرم تی دە گرتن

ئ

تاكو سى تووره‌گه‌يان لى به‌جى ما ، هه‌رجيه‌كيشيان به‌جى ده هيشت من هه‌لم ده‌گرته‌وه و كۆم ده كرده‌وه ، قۆمه‌ته به‌ردم هه‌لده چنى يان كۆده كرده‌وه تاكو پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بيناسنه‌وه، ئه‌وان رايان كرد تا گه‌يشتنه شوينيك بۆ ناخواردن ، منيش له سه‌ر گرديكه‌وه دانيشتم ، چواركه‌سيان بۆم سه‌ركه‌وتن ، منيش ووتم : ئيوه من ده‌ناسن ؟! من ( مسله‌مه‌ى كورى ئه‌ركوع ) م هه‌ر يه‌كيكتان بيت ده‌ى كوژم ، كه‌ستان من نابينن ، له ترسان رۆيشتن ،منيش له شوينى خۆم له جولام تاكو ئه‌سپ سواره كانى پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) گه‌يشتنه ناو درخته‌كانه‌وه ، يه‌كه م كه‌س ( ئه‌خرم ) بوو به دوى ئه‌و دا ( قتاده ) بوو ، وه ئه‌وه‌ى تريش ( ميقداى كورى اسود ) بوو هاتن ، ( ئه‌خرم ) و ( عبدالرحمن فه‌رزاى ) بوو به شه‌ريان ئه‌سپه كه‌ى ( عبدالرحمن فه‌رزاى ) بريندار بوو ، عبدالرحمن فه‌زارى كوشتى ،ئينجا چووه سه‌ر ئه‌سپيكى تر ( قتاده ) فرياى كه‌وت كوشتى ، ئه‌وانى تر هه‌ر هه‌موويان رايان كرد ، ئيمه‌ش به‌دواياندا منيش به پى رام ده‌كرد ، تاكو رۆژئاوا بوو له‌شوينيك لاياندا ، ئاويكى تيدا بووه پى ده ووترا ( ذي القرد ) بۆ ئه‌وه‌ى لى بخۆنه‌وه ، زۆر تينوويان بوو ،له سه‌ر ئاوه كه هه‌لم برين و نه هيشت يه‌ك قومى لى بخۆنه‌وه ، كاتى خه‌وتنان دا هات ، پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئه‌سپ سواره كانى پيگه‌يشته‌وه ، منيش ووتم ئه‌ى پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئه‌وانه ئيستا تينوو ماندوو شه‌كه‌تن ، ئه‌گه‌ر ( ١٠٠ ) پياوم له گه‌لدا بنيرى زين هه‌موو ئه‌سپه كانيان لى ده ستينى م په‌ت ده خه‌مه مليانه‌وه ، ئه‌ويش فه‌رمووى : ئه‌ى ( ابن الاكوع ) زال بوويت به‌سه‌رياندا وازيان لى بهينه ، پاشان فه‌رمووى : ئيستا له ( غطفان ) تۆز ده‌كه‌ن . هه‌روه‌ها پيغه‌مبه‌رى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) له‌م غه‌زايه دا فه‌رمووى : ( چاكترين ئه‌سپ سوواره‌كا نمان ( قتاده ) بوو، وه باشترين پياده كا نمان ( سلمه ى كورى ئه‌ركوع ) بوو ، دوو به‌شى پى به‌خشيم ،به‌شى پياده و به‌شى سوارچاكيك ، وه‌له‌سه‌ر ووشتره كه‌ى خۆى كه ناوى ( عضباء ) بوو له پشتى خۆيه‌وه داى نام و گه‌راينه‌وه بۆ شارى مه‌دينه ، له‌م غه‌زايه دا ( ابن ام مكتوم ) كرده ئه‌ميرى مه‌دينه له‌دواى خۆيدا ، هه‌روه‌ها ئالاى سوپاكه‌شى به‌دده‌ستى ( ميقدادى كورى عمر )وه بوو .

صحيح البخارى باب غزوات ذات ذي قرد ( ٦٠٣/٢ ،ومسلم باب غزوة ذي قرد ( ١١٣/٢-١١٤-١١٥،زاد المعاد ( ١٢٠/٢ )

ئ

## فتح كردنى خەيبەر و ڕووداوەكانى

## يەكەم : ميژوو و هۆكارى فتح كردنى خەيبەر

بەلى (ابن اسحاق ) – خوا لى رازى بيت – دەفەرموويت :(فتح كردنى خەيبەر لە موحەرەمى سالى حەوتەمى كۆچى دا بووە ). ابن هشام فى السير النبويه ( ٢١١/٣ ) و ( ٤٥٥/٣ ) .

هەروەها (واقيدى ) – خوا لى رازى بيت ) دەفەرموويت : ( لە مانگى سەفر يان لە مانگى رەبيع يەكەمى سالى حەوتەمى كۆچى دا بووە ، پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم پاش گەورانەوەى لە پەيمانى يان ريكەوتنى حوديبيە ).المغازى ( ٦٣٤/٢ .

هەروەها (ابن سعد ) دەفەرموويت : ( ئەو پى وايە لە جمادى يەكەمى سالى حەوتەمى كۆچى دا بووە ) . طباقت ابن سعد ( ١٠٦/٢ )

هەروەها پيشەوا (الزهرى ) و (مالك ) و (ابن حجر ) يش ئەو بۆ چوونەى (ابن اسحاق ) يان پى پەسەندە كە لە موحەرەمى سالى حەوتەمى كۆچى دا روويداوە ).تاريخ دمشق لابى عساكر ( ٣٣/١ ) و سيره النبويه الصحيحه ( ٣١٩/١ ).

هەروەها (سلمەى كورى ئەركوع ) – خوا لى رازى بيت – دەفەرموويت : (( وەللاهى سى رۆژ ماينەوە لە شارى مەدينە ، دوا يگەروانەوەمان لە غەزاى (ذي القرد ) يان غەزاى (غابە ) ئينجا لە گەل پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) بۆ فتح كردنى خەيبەر )). اخرجه : مسلم ( ١٨٠٧ ) ،وابو داود ( ٢٧٥٢ ) والبيهقى فى الدلائل النبوه ( ١٨٢/٤ ).

هەروەها لە (موسى كورى عوقبە ) دا – خوا لى رازى بيت – دەفەرموويت : (كاتيك پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) هاتەوە بۆ شارى مەدينە لە دواى ريكەوتنى حوديبيە بيست ( ٢٠ ) رۆژ يان كەمتر لە ( ٢٠ ) رۆژ لە شارى مەدينە ماينەوە ، دواى ئەوە رۆيشتين بۆ فتح كردنى يان غەزاى خەيبەر ،وە (خواى گەورە ) هەر لە ريكەوتنى حوديبيە بەلينى فتح كردنى خەيبەرى بە پيغەمبەرى خوا گەياند بوو ، كە (خواى گەورە ) دەفەرموويت : ﴿وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَذِهِ وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنْكُمْ وَلِتَكُونَ آيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا﴾الفتح ٢٠ .

اخرجه : البيهقى فى الدلائل ( ١٩٤/٤ ) و زاد المعاد لابن قيم ( ١٤٧/٢ ).

ئ

بەلی فتح کردنی خەیبەر سەر کەوتنیکی یەکجار گەورە بوو ،بۆ سوپایی ئیسلام ، هەروەها دریژ ترین جەنگی موسلمانەکان بووە لە م غەزایە دا ، چونکە جوولە کەی نیمچە دوورگەی عەرەبی پی ریشە کیش کراو لە رەگ ریشە دەرهینران ،دوا قەلای جوولە کە بوو لە خەیبەر ، بەلی لە دوای فتح کردنی خەیبەر ، فەدەك (وادی القری ) و تیمائیش خۆیان دا بە دەستەوە ،ە هەر چەند پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دوای کۆچ کردنی بۆ شاری مەدینە ، زۆر بەنەرمی و بەچاکە کردنی وە ریز گرتن لە جوولە کەکەان هەلسوکەوتی لە گەلدا دەکردن ، بەلام جوولە کەی نامەردو خاوەنی سیفەتە قیزەونەکانبوون ، هەر خەریکی پیلان گیری و ناپاکی خیانەت کردن ، دوو روویی نیفاق فسق و خراپە کاری و درۆکردن بوون ،ئەوە بوو یەکەم ناپاکی کردن جوولە کەی (بنی قینقاع ) ئەنجامیاندا کە دژی ئافرەتی موسلمان ویستیان سووکایەتی پی بکەن ، ئەوە بوو ئەوان بەبی دەنگ لە شاری مەدینە دەر کران ، دواتر جوولە کەی (بني نضیر ) ئەوانیش پیلانیان دان بۆ کوشتنی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دواتر بە پشتیوانی (خوای گەورە ) پیغەمبەر و مسلمانان لەو پیلانە ئاگادار کرانەوە ، هەروەها ئەوانیش دوور خرانەوە لەشاری مەدینە بۆ خەیبەر ، بەلام دوو بارە جوولە کەی ((بني نضیر ) کە تنەوە پیلان گیری لە دژی سوپایی ئیسلام و موسلمانان دا لە خەیبەر دەستیان تیکەل کرد لە گەل سوپای ئەحزاب دا کە سوپایەکی گەورە بوو لە (١٠٠٠٠ ) سەرباز پیك هاتبوو بۆ داگیر کردنی شاری مەدینە ،کە لە هۆزەکانی قورەیش عفتان فەرزا پیکا هاتبوون ، هەر جوولە کەی (بني نضیر ) بە مەش نەوەستان جوولە کەی (بني قوریظة ) شیان لە موسلمانان هاندان ، جوولە کەی (بني قوریظة ) پەیمانیا شکاندوو دەستیان بە خیانەتی کردن کرد ئەوە بوو سەری یەك بەیەکیان قرتاندن سەرۆکی (بني قوریظة ) ملی پەریندرا ، کە ببیتە دەرس بۆ هەموو ناپاکانی جوولەکە ، بەلام پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) و مسلمانەکان چاك دەیان زانی جوولە کەکانی خەیبەر راوەناستن هەرکاتیك دەستیان هەبی دەست لە سوپای ئیسلام دەوەشینن ، چونکە خەیبەر مەبەندی پیلانگیرو خیانە ت خیانەتکاری بوو، هەر کاتیك بۆیان بگونجیت سوپایەکی تر وەك سوپای ئەحزاب دەهینە سەر شاری مەدینە بۆ لە ناو بردنی یەکجارەکی ئیسلام و ریشە کیش کردنیان ، وە مسلمانان ئەواشیان ئەزانی کە کۆتایی هاتنی سوپای ئەحزاب برینی کلکی مارەکە کە (بني قوریظة ) بووە بەلام هیشتا سەری مارەکە مابوو ئەوی خەیبەر بوو، بەلی لەم کاتەدا کە موسلمانەکان هەردوو دەستی قورەیشیان بری بوو بەهۆی ریکەوتنی حودیبیە ، بە مەش لە هیرشی سوپای قورەیش بی خەم ببون ، بەلی هۆکاری فتح کردنی خەیبەر ئەوە بووە کە سەری مارەکە پان بکەونەوە ئەویش جوولە کەی خەیبەر بوو، دوای پەیمانی حودیبیە ، هەلمەتیکیان بردە سەر خەیبەر بۆ لە ناو بردنی جوولە کەناپاکە کان خیانە تاکەرەکانی خەیبەر ، ئەمەش لە مانگی موحەرمی سالی حەوتەمی کۆچی دا بوو .....................!!

ئ

## دووەم : باسیکی کورتی خەیبەر :

خەیبەر لە دیرن زەمانەوە شوینی خۆش میرگیکی دل رفین بووە پر بە پیت و بە رەکەت بووە ، هەروەها دە کەویتە رۆژ هەلاتی شاری مەدینە ، بەلی شاری خەیبەر شاریکی پر لە میوە هاتووە دانەویلە و بەرووبوومی کوشتووکالی بووە ،شوینیکی ستراتیجی بوو ، کە دە کەویتە نیوان وەلاتی حیجاز و وەلاتی شام کاروان سەرایی بازرگانەکان بوون کە دەچوونە وەلاتی شام ،هەروەها شونیك بوو پر لە دارخورما میگی جوان و دلرفین ، وەمیوە جۆراو جۆری لی بوو ،ئەوە بوو لە شوینك کاتی فتحی خەیبەر کرا موسلمانەکان زیاتر لە (٤٠٠٠٠ ) هەزار دار خورمایان ژمارد ،بەلی خەیبەر دە کەویتە باکوری رۆژهەلاتی شاری مەدینەوە ، کە نزیکەی (٧٠ )میل دوور بوو لە شاری مەدینە ، ئە گیرنەوە هۆی هاتنی جوولە کە بۆ وەلاتی حیجاز و شاری خەیبەر ئەوە یە ك لە سەردەمی موسی (علیه السلام ) دا بووە کە لە گەل عەمالیقە کان جەنگی کردووە ، ئەجەنگەش لە سفر تثنیة تورات دا هاتووە ،هەربۆیە هاتوونە نە وەلاتی حیجاز ، هەندیکیش بەو هۆیە دەگەرینەوە هاتنی جوولە کە بۆ وەلاتی حیجاز کە ئاگادر بوونە بە هاتنی پیغەمبەری ئاخر زمان ، کە لەو شوینەی کە درا خورمایی لیە ، ئەوە بوو هەندیك لە شاری (تیماء ) مانەوە هەندیکی تریش لە شاری (خەیبەر ) وەهەندیکی تریشان هاتنە شاری مەدینە ، بەلی لە دوو کاتدا جوولە کە هاتوونە تە وەلاتی حیجاز ئەوەیە یەکەم لە سالی ١٢٠٠ پ ز . ئەوەی دووەمیش لە سالی (٧٠ ) زایینی دا واتا دوای هەلکیشانی پیغەمبەر عیسی (علیه السلام ) دوای ئەوەی دەولەتی رۆما بت پەرست فەلەستینی داگیر کرد ،








بەلی دوای ئەوەی کە ئیسلام هاتە شاری مەدینە جوولەکەی خەیبەر هەر وەکو جوولە کەکانی شاری مەدینە پە یمانیاندا و دلنیایی یان دا بە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بەلام دواتر تا سالی چوارەمی کۆچی بی لایەن بوون و بی دەنگ بوون ، ئەوە بوو دوای دەرکردنی جوولەکەی (بني نضير ) کە خۆیان گەیاندە شاری خەیبەر ، وەکسەرۆکە شەیتانەکەیان (حویەیی کوری ئەختب ) کەوتە پیلانگیری دژی دەولەتی مەدینە موسلمانەکان ،هەروەك ئەوانیش لە خیانەت پیلان گیری خۆی بەشداری پی کردن واتە جوولە کەکان شاری خەیبەر لە پە یمانەکەیان پەشیمان بوونەوە دەستی بە خیانەت کردن کرد .......!!

ێ

بەلی (بني نضير ) زۆر دە لە مەند بوون کە چوونە شاری خەیبەر ، هەرچی کەل پەلی بەنرخ زیر زیو هەیەن بوو بردیان لە گەلە خۆ دا ، دە گیرنەوە دەلین باری (٦٠٠ ) ووشتر دە بوو ، هەروەها (سەلامی کوری ابی الحقيق ) یەکیك بوو لە دەولە مەندەکانی جوولەکە ، کە لە پیشەوە باسمان کرد جۆن کوشتیان ، ئەگیرنەوە دەلین :خەلکانیك تووشی (سەلامی کوری ابی الحقيق ) دە بن ئەلین ئە پیست پر لە زیر هەیە بۆ چیتە ، ئەوەی ئامازەی بۆ دەکات ئەلیت :بۆ بەرز کردنەوەو نزم کردنەوەی زەوی ئەو سامانەم ئامادە کردووە ،مەبەستی زیر زیوە کەی بوو ، چونکە ئەوەندە دەولە مەند بووە ، کەچی ئەو هەرەشەیی (سەلام ) لووت بەرزیەکی یەك جار لە خۆبایی بوو ، کەچی هیچ لە مال و سامانەکەی فریایی نەکەوت سەرئە نجامی مردن بوو بەدەستی پالەوانانی ئیسلام ، بەلی کاتیك (بني نضير ) کەیشتنە شاری خەیبەر خۆیا زال کرد بەسەر ئەم شارە دا ،بەلی چونکە (بني نضير ) خۆیان لە هەموو جوولە کەیە لە پیشتر ئەزانی دەیان ووت ئیمە لە نەوەی هاروون (عليه السلام ) برای موسی (عليه السلام ) ین ،هەروەها جوولەکەی (بني نضير ) شارەزا بوون لە فرو فیل خیانەت کردن تەلەك بازی هەر بۆیە خۆیان کرد خاوەنی شاری خەیبەر ، وەك سیاسەت مەدارەکانی ئیستا بەناوی خەلك دینە دەست هەلات دواتر خەلك پشت گویی ئەخەن نابەنەخاوەنی خەلك ، تەنها مەبەستیان دەسلات وەرگرتنە ومال سامان کۆ کردنەوەیە دینە دەسەلات ،خەلکی ساویلکە هەژار فردەدن بۆ مەرامە بۆ گەنەکەی خۆیان ، هەروەك لە سالانی رابردوو بینیمان گە چۆن بە ناو گۆران خەلکی فیر دا لە سالی ٢٠٠٩ دا دواتر هاتنە دەسەلات دەستیان بە زولم ستەم کردن کرد ئای جەن خیانەتیکی گەورە بوو لە ناو بەناو حزبە کوردیە کان کە کردیان بۆ گرتنە دەسەلات خەلکیان لەبیرکرد و وا ئەزانن وا بەسەریان دەچیت میژوو ئەوان لەبیردەکات یان قەلم میژووی پر لە خیانەتی ئەوان لە بیر دەکات یان ئەوەتا میژوو خیانەتی بەرهەم صال کە بۆ پۆست خیانەتی لە هاوری کانی کرد یان ئەو کەسانەی کەدەنگیان پی دا کردی ئەوش لەبیر دەکریت ،وە چەندی کەس کرۆپ حزب کۆمەل خیانەتیان کرد لە خەلکی هەژار یان ئەوتا کۆمەلی ئیسلامی ناوی ئیسلامی لە کۆمەل کردەوە بۆ ئەوی دەنگ زیاتر بینی دواتر ئە نجامەکەی دیار بوو کەیەك کورسی پەرلمانیان هینا ،ئەوا بەئیسلام مەوە جوان بوون ، کاتیك پاشگری ئیسلامیان نەهیشت دواتر ئەوە بوو تەنها یەك کورسیا پەرلەمانیان هینا لە سالی ٢٠٢١ بۆ پەرلەمانی عیراق ، ج ریسوایەکیان بە خۆوە بینی ،من هیچ باوەرم بەساسەت نیە باوەریشم بە حزب نەیە هەرگیزاو هەرگیز ،چونکە هەمیشە بۆ بەرژەوەندی خۆیان کار دەکەن هیچ کان لە گەل فەقیر هەژاران دانین وە باوەریشم هیچ کات بە پەرلەمانیە ئەویش بۆ کۆکردنەوەی مال سامان بەرژەوەندیتاکەکەسیە نە خەلکی هەژار ،ئەوەیە کە جوولە کەی (بني نضير ) کردیان لە شاری خەیبەر سەر خۆیان شارکەشیان خوارد ئەوش هۆکاری بی پەیمانی بی وعدی خیانەتکاری لە دەولەتی ئیسلام و دواتریش لە خەیبەر ، ئەوانەی خۆمانیش هەروا بی پەیمان بی وعد و خیانەتیان لە خەلك کرد بۆیە سەر ئە نجامیا بەم شیوەیە دەرچوو فەرمانرەیی یان بووبە قیزەونترین فەرمانرەوایی جیهان ناو چەکەدا ..!!

ێ
بۆیه میژوو هیچ كات بەزەیی ان پی ناكات له نووسینەوی دا ئەمەش من بۆ میژوو دەنووسم له كاتیك خیانەت وبی وعدی درۆ فروفیل تەلاكەبازی له ناو هەر میلەتیك پەیدا بووە سەر ئەنجامی وەك خەیبەر دەبیت ، بەلی كاتیك جووله كەی (بني نضير ) له شار ی مەدینه دەرباز بوون له كوشتن نەچوون خەریكی ژیانی رۆژانەی خۆیان بن خەریكی كارو كاسبی بن ، بەلام به پیچەوانەوە خەریكی پیلان گیری بوون كاره قیزەونەكانیان بوون ، بەلی شاری خەیبەریان گۆری بۆ مەلبەندی ئاژاوە گیری و دژایەتی دەوله تی ئیسلام له مەدینه ، هەروەك گۆران چۆن سەنگەری خۆی گۆری بۆ دژایەتی كردنی خەلكی برسی هەژاری ئەم كوردستانه، خۆ جوولەكەی خەیبەر له كاتی هاتنی سوپای ئەحزاب بوو مەدینه ، ئەوان دەیان توانی سوپایەكی (١٠٠٠٠) جەنگاوری ئامادە بكه له خەیبەر دا له گە ل (بني نضير ) بەلام چونكه سیفات پیشەی هەمیشەیی جووله كەئەوەیه كه ترسنۆكن ناویرن به خۆیان جەنگ بكەن دژی موسلمانەكان ،ئەوە تا توانیان به پیلان گیرو نەخشە كیشی سوپای ئەحزاب هاندەن بۆ سەر شاری مەدینه ،بەلی پیلان دا ریژەو نەخشە كیشی سوپای ئەحزاب جوولەكەی خەیبەر بوون ، چونكه مەلبەندی خیانه ت كردن وبی پە یمانی رو فیل تەلاكەبازی كاری خراپ بوون ، هەروەك ئیسا دەبینین كه جوولەكه كانی دەوله تی ئیسرائیل كه چۆن جنگ و شەركانیان له خۆ دوور خستەوە به دەولەتانی تر دەكەن ، ئەوتە بەرانبەر به برا موسلمانه فەله ستینەكانیش ناویرن ئەونده تر سنۆكن ، دەولەتانی زل هیز جەنگه كەیان بۆ دەكەن ، هەموو كەرسەیه كی جەنگی پیشكەتنیان هەیه تەنانه ناویرن بەرانبەر فەلەستینەیەكان روو بەروو بنەوە ، ئەوتا له ناو سوپا كەشیان جەندی هیز كرپی بیگانەی ئیسرائیل هە ن بۆ جەنگ كوشتار كردنی موسلمانان ،له هەموو وەلاتیكدا دەزگای موسادی ئیسرائیلی داناو بۆ جاسووس كردن بەسەر موسلمانان و تەواوی جیهان دا ، لەگەل ئەوش ئەونده ترسنۆك ،بی پە یمان خیانەتكارن ، ئەو وەلاته پیشت به ئیسرائیل ببەستیت وەلاتەكه ویران دەبیت ، تووشی هیلاكەت سەرگەردانی دەبیت ، نموونەی سالی ٢٠١٧/١٠/١٦ كه خەلكی كوردستان پشتی به ئیسرائیل بەست جیمان بەسەر هاتوو نیوەی خاكی كوردستان له دەست درا ، بەلی دەزگای موسادی ئیسرائیلی له هەر وەلاتیك دا بیت ئەو وەلاته تووشی برسیه و قەیرانی ئابووری قەیرانی سیاسی حوكرانی و قەیرانی خیانەت كرد بی پە یمانی بی متمانەی دەبیتەوە له لایەن خەلیكی ئەم وەلاتەوە ، به كورتیه كەی تووشی دارمان دەبیت تووشی رووخان و ئاژاوەو فتنه دەبیت له هەموولایەكەوە ،جای تكا كارم پشت به جووله كه نەبەست هەرگیزاو هەرگیز چونكه خاوەنی بەلینی خۆیان نەبوونه له گەل پیغەمبەری ئازیز ئازدارو رۆشنای چاوان و پیشەوای مرۆڤایەتی ، ئایا خاوەنی بەلین دەبن له گەل ئیوە دا كه نۆكەرایەتی جووله كه دەكەن ..................................؟!

ئ

## سی یەم :خۆ ئاماد کردن بۆ فتح کردنی خەیبەر

بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وەك كاری هەمیشەیی ویستی نەخشەو پیلانیكی وورد داریژێ بۆ فتح كردنی شاری خەیبەر ، ئەویش ئەوە بوو ، هۆزە عەرەبە كانی وەك ( غطفان ) ( نجد ) سەقال و مشغول بكات تاكو هاوكاری پیشتوانی جوولە كەكانی شاری خەیبەر نەكەن ، ئەوە لە لایەك لە لایەكی تریشەوە تاكو تیروانین لە مەبەستی سەریكی خۆیان بگۆرن بۆ غەزا و جەنگ كردن لە گەل جوولە كەكانی خەیبەر ، لە ( ابو هوریرە )وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) سریە یەكی ( ١٠ ) كەسی نارد لە مەدینەوە بەروە ناوچەی بۆ هەوال زانین و جموجۆلە كانی هۆزەكانی ( نجد ) ئەم سریەی بە سەرۆكایەتی ( ئیبانی كوری سعدی كوری عاص ) وە دوای گەرانەی لە فتح كردنی خەیبەر ( ئیبان كوری سعد كوری عاص ) لە گەل هاوەلە كانی گەرانەوەی شاری مەدینە ).اخرجه : البخاری ( ٤٢٣٨ ) ، و ابو داود ( ٢٧٢٣ ) . بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە گەل هاوەلانی دا بە سوپا خەنچیلانەكەی ئیسلام دەرچوو بۆ شاری خەیبەر بۆ فتح كردنی ، لە ( ابن قیم ) – خوا لی رازی بیت – لە زادالمعادا هاتووە دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەرچوو بۆ غەزای خەیبەر بە ( ١٤٠٠ ) پالەوانانی سوپای ئیسلام ، كە لە سەربازانی ئیسلام ( ٢٠٠ ) یان ئەسپ سوار بوون ،وە هەندیك لە ئافرەتی ( نەوەی غیفاریان ) لە گەل دا بوو رۆیشتن ، وە لە ئافرەتیكی ( بنی غیفارە ) وە دەگیرنەوە كە ناوی ( ئومیە كچی قەیس ) بوو ، چووە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە گەل هەندیك لە ئافرەتانی نەوەی غیفارە ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا دەمانەویت لە خزمەتدا بەشداری بكەین بەروە ئەو شوینەی كە بۆی دەچیت كە بەروە و خەیبەر دەرۆیشت ، لەویدا ئیمە بریندارە كانی موسلمانان تیمار دەكەین ،وە هاوكاریان دەكەین بە پی توانامان ، پیغەمبەری خوداشﷺفەرمووی لەسەر بەرەكەتی خودا بەشداری بكەن )).

اخرجه ابن هشام فی السیر ( ٢٢١/٣ ) ، والبیهقی فی الكبیر ( ٤٠٧/٢ )، والترمزی ( ١٦٢٠ ) ، وابن سعد فی تبقات ( ٢١٤/٨ ) ، و ابن قیم فی زاد المعاد ١٥٣/٢ . وەلە فەرموودیەكی تر دا هاتووە كە ژمارەی ئافرەتەكانی بەشداری فتح كردنی خەیبەریان كردووە ژمارەیان ( ١٦ ) ئافرەت بووە.

اخرجه : احمد ( ٢٧١/٥ ) ، والنسائی فی الكبیر ( ٨٨٧٩ ) ، والتبرانی فی الكبیر ( ١١٠/٢٥ ) والبیهقی فی الكبیر ( ٣٣٣/٦ )

ێ
بەلی ئەوە بوو لە دوای پەیمانی حودیبیە سوپای ئیسلام خۆی ئامادە کرد بۆ فتح کردنی خەیبەر ، هەروەها ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی سورەتی فتح ی دابە زاند بۆ موسلمانەکان بۆئەوەی دل یان بداتەوە کە ئەو شوینە دلرفینە ئەو میرگە خۆشە فتح دەکریت ، کە مەبەست شاری خەیبەر بوو، ئەوە بوو ئایەتەکە دابەزی کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَذِهِ وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنْكُمْ وَلِتَكُونَ آيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا﴾**فتح ٢٠** .بەلی خوای گەورە مژدەی بە موسلمانەکاندا کە خەیبەر بو میرگە سەوزەکانی باخەکانی دەبیتە دەست کەوتی موسلمانان ، بەلی کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمانی دا ە خۆیان بۆ فتح کردنی خەیبەر ئامادە بکە ، ئەویش واتە : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیەو سلم ) خۆشی شادی دل خۆشی بەختەوەری زۆر پیوەدیار بووە لە بە ردابەزینی ئەم ئایەتی خوای گەورە کە مژدەی سەر کەوتنی و فتح کردنی شاری خەیبەری پیدا بوو ، ئەویش رووی کردە موسلمانان ، چونکە ئەوانیش ئەیانزانی کە ئەوە فەرمانی خوایە دەبیت فتحی خەیبەر بکریت ، ئەوەی کەل سالی پشوودا خۆیان ئامادە کرد بۆ عومرە کردن کە (١٤٠٠) کەس بوون بەلام دواتر پەیمانی حودیبیە لی کەوتەوە عومەرکەیان ئە نجام نەدا ، بەلام ئەو ە بووە هۆی فتح کردنی خەیبەر لە سالی دا هاتوودا ، ئەوە بوو کەلە سالی رابردووئەم ئایەتەی خوای گەورە هاتە خواروە کەدەفەرموویت : ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾فتح ١٨ . ئەوبوو ئەوانەی لە ژیر درختەکەدا پەیمانیان دا بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە سەرو مال یان لە گەلی دا دەبن ، هەروەها خوای گەورە ش ئەم بەلینەی پیدان لە سالی داهاتوو دا کە دەست کەوتی یەکجار گەورە بەدەست دەهینن ، بەلام لە لایەکی تروە لەشاری مەدینە موناڤیق دوو روو ، دەشتە کەیە ئیمان لاوازەکان ، بەدەم بانگەوازی پیغەمبەری خوا ﷺ ن چوون ، هەریەکەیان بۆ خۆی حوزیك یان بیان ویەکیان ئەدۆزیەوە بۆ خۆی کە خۆی پی بدزیتەوە نەچیتە ئەم جەنگەی خەیبەر ،بەلام هەندیك لە دوو روو موناڤیەق کان ئیمان لاوازەکان بەشداریان کرد لەم هەلمەتەدا ،چونکە ئەیانزانی خوای گەورە بەلینی بە پیغەمبەری خوا ﷺداوە ، ئەوان هاتن بۆ دەست کەوت مال سامان نە بۆ جیهاد کردن لە پیناوی خوای گەورە فتح کردنی شاری خەیبەر سەر کەوتنی موسلمانەکان بەلکو بۆ تەماعی دونیا بەشداریان کرد ......؟؟؟!!!

ئ

بەلام ( خوای گەورە ) پیش ئەوە نیازی ناپاکی موونافیق دوو روو ئیمان لاوازەکانی ، لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئاگادار کردەوە پیش ئەوەی رۆژیك غەزای خەیبەر بیتە پیشەوە ، قورئانی پیرۆز زووتر هاتە خوارەوە فەرمووی ئەوانە دوا دە کەن کە بین بۆ بەشداری کردنی لە فتحی خەیبەر دا بۆ دەست کەوت مال و سامان ، تۆش ئەی محمد ( صلى الله عليه وسلم ) پی یان بلی : نا بیت ئیوە بین لە گەل ماندا بەشدار بن ، چونکە ( خوای گەورە ) وە های فەرمووە ، کەچی پیتان ئەلین : ئەوا حەسوودیمان پی دەبەن .

بەلی هەرواش بوو ، کە( خوای گەروە ) دەفەرموویت : ﴿سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انْطَلَقْتُمْ إِلَى مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَنْ يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ قُلْ لَنْ تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِنْ قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾الفتح ١٥

بەم ئایەتەی کە دابەزی تەنها ئەوانە بەشداری بکەن کە لەژیر دەختەکەی پەیمانی حودییە دا پەیمانیان بەستبوو کە ( خوای گەورە ) دەفە رموویت : ﴿: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾الفتح ١٨ .

بەلی لە کاتیکدا لە شاری مەدینە دا ، موسلمانان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ غەزای خەیبەر ، لە هەمان کاتیکشدا هەندیك لە جوولەکە لەشاری مەدینە مابوونەوە ،لەژیری سیبەرییەری فرمانرەوایی دەولەتە خنچیلانەکەی ئیسلام دا بوون ،بە ئەمان و ئاسایشیەکی زۆر جاك پاریزگاریان لی دە کرا ، ئەوە بوو موسلمانا خۆیان بۆ ئەم جەنگە ئامادە دەکرد ، ئەوانیش رق و قینەلە دل بوون پیان ناخۆش بوو موسلمانان فتحی خەیبەر بکەن ،ئەوان زۆر دولەمەند بوون لەشاری مەدینەدا تەنانەت قەرزیان لەلای موسلمانە کانیش هەبوو، بۆئەوەی رق خۆیان بەتال بکە نەوە ، دوای قەرزەکانی خۆیان کرد لە موسلمانان لەرقی ئەوەی کە خۆیان ئامادە کردووە بۆ فتح کردنی خەیبەر ، ئەوە بوو ، ئەوە بوو یەکیك لە جوولە کەکانی شاری مەدینە قەرزای لە لای هاوەلەکی بەریز بوو بەناوی ( عبدالله کوری ئەبو دەردای ئەسلەمی ) ئەویش خۆی ئامادە دەکرد بۆ غەزای خەیبەر ،ئەوە بوو جوولە کەکەش هات بۆلای کە ناوی ( ئەبو شەحەم ) بوو ، هەندیك جۆی دا بووە ( عبداللەی کوری ئەبو دردا ی ئەسلمی ) بە دوو درهەم ، کاتیك بیستی ئەویش ئەجیتە غەزای خەیبەر هات و داوی قەرزە کەی خۆی کردووە لەم هاوەلە بەریزە ، ئەویش نەی بوو بیداتەوە پی ووت : چاوەریم بکە تا لە غەزای خەیبەر دە گەریمەوە ، ئینجا قەرزەکە ت پی دەدەمەوە ، کە خوای گەورە بەلینی بە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) داوە کە فتحی خەیبەر دەکەین ان شا الله ،

ئ

وە ( عبدالله ی کوری دردا ئەسلەمی ) یەکیك بوو لە هاوەلە بەریزانەی کەبەشداری پە یمانی حودیبیە ی کردبوو ،کە خوای گەورە بەلینی پیدا بوون ، کاتیك جوولە کەکە ئەم هەوالە ی لی بیست یەکسەر چاوی چووە پشتی سەری حەسوودی دای گرت وەکو پیشەیی هەمیشەیان ،ووتی : وا ئەزانن جەنك شەر کردن لە گەل خەیبەر دا وا ئاسانە وە ك جەن کردن لە گەل دەشتە کیە کان وایە ..؟!!مەبەستی هۆزە عەرەبە کانی ناوچە کە بوو ..!!هەروەها جوولە کە کە ووتی : بەتەورات ( ١٠٠٠٠ ) هەزار شەر کەری لە خەیبەر دایە ..!!

هەروەها ( عبدالله ی کوری دردا ئەسلەمی ) ووتی : ئەی دوژمنی خوا تۆ وا لە پەنای ئیمەدای لە پاریزگای و ئەمن ئاسایشی ئیمەدای ، کەچی تۆ وا بە دوژنە کەمان ئەمان ترسینی ..؟! دە بە خوا ئە م قسانەی تۆ ئەگەینمە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) . بەلی کاتی ( عبدالله ) هەوالە کە دەگەینی بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەویش بی دەنگ دەبیت ، دوا تریش جوولە کە کە دوای قەرزە کەی دە کاتەوە ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمان بە ( عبدالله ) دەکات کە قەرزەکەی بداتەوە ، ئەویش قەرزەکەی دەداتەوە ،ئەویش دوو کراسی هەبوو یەکیکیانی فرشت بە سی درهەم ، دوو درهەمی داوە بە جوولە کە کە ، تەنها یەك کراس لەبەرئەکات بۆ غەزای خەیبەر ، وە( سەلەمەی کوری ئەسلم ) ئەویش کراسکی دەداتی ، هەروەها بەدوو کراس ئەکەویتەری بۆ فتح کردنی شاری خەیبەر ، بەلام لە دوی فتح کردنی خەیبەر هەندی دەست کەوتی بەدەست دەکەویت لە دوای دابەش کردن بەسەر موسلمانان دا ....!!!!

بەلام جوولە کەی شاری مەدینە بەوە نەوەستان کە خۆیان بە لایەنگیری شاری خەیبەر بزانن ، بەلکو هەولی ئەویاندا کە سیخوری جاسووی بکەن بۆ سەرکردەکان خەیبەر ، وەك پیشەیی هەمیشەیان لە رابردوو لەئیستادا ،ئەوە بوو بەدەستی خۆیان نەبوو بەلام بە قسەی ئەوان کە زۆر شارە زان لە پیلانی ژیر بەژیری نەخشە کیشی فرو فیل وتەلەکەبازی ،کە ئیستاش نۆکەرەکانی هەمان سیفاتی جوولە کەیان هەیە بۆ نەخشەگیران ریکەوتنی ژیر بەژیری خۆیان ،ئەوە بوو جوولە کەی شاری مەدینە ئەعرابیە کی بنی ئەشجەعیان بەکری گرت و ، ناردیان بۆ لای فەرماندە و سەرکردەکانی شاری خەیبەر ، دەربارەی زانیاری سیخوری جاسووی لەسەر سوپای ئیسلام سوارچاك و پیادەی ئیسلام ، بەلام ( خوای گەورە ) وەهای هینایە پیشەوە ئەم سیخورە بکەویتە دەست سوپای ئیسلام ،لەلایەکی تریشەوە شاری مەدینە زۆر موناڤق دوو رووی تیدا بوو لەوانەسەرۆکی موناڤیقە کان ، ( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) کەجوولە کەی خەیبەری ئاگادر کرد موسلمان دین بۆ خەیبەر نەترست چونکە چەك تفاقیان کەمەو سە پاکەشیان ژمارەیان کەمە ،جوولەکەی خەیبەر ئەم هەوالە یان پی گەیشت خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگە و لە قەلاکانیادا بمینەوە بەرگری لە خۆیان بکەن ژن ومندالە کانیشیان بردە قەلاکانی دواوە ،قەلای پشەوە تەنها جنگاوەری تیدابوو ...!! غزوه خيبر لباشميل ص٨٤-١٠١ .

ئ

هەروەها پیغەمبەری خودا ﷺ لە کاتی رۆیشتنی بۆ غەزای خەیبەر نویژی سوونەتی دەکرد وە لەسەر پشتی کودریژەکەیەوە سوار ببوو رووبەرووی خەیبەر ........... هەروەها لە (ابن عمره) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرمووی : (( پیغەمبەر خودام ﷺ بینی لەسەر پشتی کودرژەکە ی سوار ببوو بەرەو خەیبەر دەرۆیشت روگەش کەتبووە پشتەوە )).اخرجه مسلم (٧٠٠)

بەلی پیغەمبەری خوا زۆر پەنای دەگرت بە خوای گەورە لە کاتی خەم وخەفەت باری جەنگ شەور شۆرو ناخۆشی دا ،بەلی لە ریگای چوونە خەیبەر نزاو پارانەوەی دەکرد ، لە (ئەنس )وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( من خزمەتی پیغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) دە کرد هەر کاتیك ئیمەدا بەزینایە لە شوینیك خۆم گویم لی بوو دەی فەرمو (( اللهم إني أعوذبك من الهم والحزن والعجز والكسل والبخل والجبن وضلع الدين وغلبة الرجال )). واتە : خوا یە پەنات پی دەگرم لە دل تەنگی و خەفە ت وە لە بی دەسەلاتی و دەستەوسانی وە لە تەمەلی وەلە ترسنۆکی ، وە لە پشت چەمانەوە بە هۆی قەرز داری ولە زال بوونی ناپیاو بەسەرماندا . اخرجه : البخاری (٦٣٦٣) ،ومسلم (١٣٦٥) والنسائی (٢٧٤/٨).

لە (ابن اسحاق )وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( کە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە شاری مەدینە دەرچووە بەرەو خەیبەر ریگای شاخی (عصر ) گرتە بەر پاشان پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) بە سوپایەکەیەوە هەت گەیشتە دۆلیك بە ناوی (رەجیع ) لەویدا لایاندا کە دەکەویتە نیوان خەیبەر و غتفان لەویدا مابوونەوە تاکو هۆزەکانی غتفان لە جیگای خۆیاندا بمینەوە نەچن هاوکاری جوولە کەکانی شاری خەیبەر بکەن ،چونکە لەوە و پیش بەلینیان دابوو پشت گیری یەکتر بکەن وە هاوپە یمانەیەتی یەکتر بکەن ، ئەگەر پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) هیرشیان بکاتە سەر ، هەر بۆیە کاتی بیستیان کە پیەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) هیرشی دەکاتە سەر شاری خەیبەر ، خۆیان کۆ کردە وە بۆ روو بەروو بوونەوەی موسلمانانەکان ،وە دەرچوون بەرووەو خەیبەر بۆ پشتیوانی کردنی جوولە کەکانی خەیبەر رۆیشت ، هەتاکو ماوەیە یان قۆناغیك رۆیشت ،دواتر گویان لە دەنگی موسلمانەکان بوو ، ئەوە بوو ترسیان لی نیشت نەوەك پیغەمبەری خودا بدات بەسەر ژن مال و مندالە کانیاند هەریە کەیان زۆر ترسی لی نیشت ،هەر لە بەر ئەم ترسە بوو و گەرانەوە چوونە وە سەر مولك مال سامانی خۆیاندا ، بەمەش پیغەمبەری خوا دەست والا بوو بۆ هیرش کردنە سەر خەیبەر )).اخرجه : ابن هشام فی السير (٣٨٠/٣) ،والتبرانی فی التاريخ (٩/٣ ) ، وابن كثر في بداية ولانهاية (٢١٢/٤) .

ئ

## چوارەم : خەیبەر خۆی ئامادە ئەكات بۆ رووبەروو

بەلی كاتیك هەوالی هیرش كردنە سەر خەیبەر گەیشتە سەركردەكانی شاری خەیبەر ، كەلە لایەن سوپای ئیسلامەوە هیرشی دە كریتەسەری ،خیرا ئەوانیش كۆ بوونەویە كی گەورەیان ساز كرد بە ئامادە بوونی هەمووسەركردەكانی شاری خەیبەر ، ئەوانیش (٣) راو بۆچوونیان هەبوو، بۆ رووبەروو بوونەوە بەرگری كردنی لەشاری خەیبەر ، یەكەم: سوپای خەیبەر لە قەلاكانیان بمینەوە لە پشت شووراكانیان بەرگری بكەن ،تاكو سوپای ئیسلام نا جار بكەن بكشینەوە ، چونكە لەبەر سەختی بەرزو بلندو مەحكەمی قەلاكانیان نەتوانن بینە پیشەوە هیرش بكەن بۆ ناوقەلاكانیان ، دووەم : كۆمەلە یەكی تر لە جوولە كەكانی خەیبەر راو بۆچونیانوەها بوو ، لە ناو قەلاكانیان بینە دەروە بە هەمووچەك دارەكانیانەوە ، خیوتەگا لە دەشتەكان دروست بكەن وەخیوتگای سەربازی رووبەرووی سوپای ئیسلام ببنەوە ، نەك لە قەلاكانیان خۆیان حەشار بدەن سەر كز بكەن موسلمانە كانیش هیرش بكەنە سەریان ، بەلام راو بۆچوونی سی یە: زۆر جیاواز تر بوو لە هەردوو رایەكەی تر ، ئەوان پیان وابوو هەر ئیستا هیرش بكەن سەر شاری مەدینە ، لە هەردوو رایە كە جیاواز تر چونكە ئەوانیش هیزو سوپایەكی گەورەیان هەیە ، بەلی بەلام رای دووەم یەكیك بوو لە سەركردەكانی خەیبەر كە بەناوی (حاریس ) یان (ابو زینب ) كە ناز ناوی بوو ، ئەورایەی حاریس بەهیز بوو ، بەلام لە لایەن فەرماندە سەربازیە كانی جوولە كە پشت گویی خرا ، هەر هەموویان پشتی رایە یەكەمیان : گرت كە لەناو قەلاككانیاندا بمینەوە بەرگری بكەم بەبیانووی ئەوەی قەلاكانیان زۆر سەخت بەهیزن و مەحكەم بەتینن ، هەرواشە بەراستی قەلاكانیان زۆر بەهیزن بلند وبەرز بوون ،وەك لەوینەكەی سەروە دا دیارە ، دیارە راو بۆچوونی سی یەمیش راو بۆ چونیی سەرۆكی داخ لەدلی جوولەكە بوو ئەویش بەناوی (سەلامی كوری میكشم ) بووە لە (بني نضير ) بوو ، پی وا بوو ئەوان هیرش بكەنە سەرشاری مەدینە رووبەرووی سوپای ئیسلام بنەوە ، بەل (سەلامی كوری میكشم ) فەرماندەی سوپای خەیبەر بوو (بني نضير ) دا خ لە دل خیانەتكاور بی پەیمان دوو روو مونافیق و فاسق فیل بازل ، لە كۆبوونەوەیەك دا لە گەل جوولە كەكانی خەیبەر باسی ئەوە دەكات ، گوایە (حویەیی كوری ئەختەب ) هۆكاری ئەوە بووە كە جوولەكەی (بني نضير ) لەشاری مەدینە دەر بكرین و هەر وەها ئەویش پیلانی كوشتنی پیغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم ) دا رشتبوو ، هەر ئەویش بوو هۆی تیاچوونی (بني قوريظة ) بە هۆی ئەوە بووە كە پەیمانی پی شكاند ، لەو كاتەدا كەجوولە كە ویسیانەبەسەر پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دا بدەن بەلام (سەلامی كوری میكشم ) رازی نەبووە ، ئەو پیاوە هەرچەند فەرماندو سەرۆكی جوولە كەبوو ، بەلام زانایەكی لی هاتوو بوو لە ئاینی جوولەكە دا ، لە دواتریش دا جوولە كە تووشی نەهاتەنی بوون ، هەروەها (كینانەی كوری ابی الحقيق ) ووتی ئیستا كاتی گلەیی نیە بە (سەلامی كوری میكشم )ووت : بەلام سەلام ) ووتی : محمد (صلى الله عليه وسلم ) دەستی لە

ئ

جوولەکەکانی مەدینە بەتال بوو ، وەچی بەجوولە کەی (بنی قوریظة ) کرد ئاواش لە ئیوە دەکات ، ئەوانیش ووتیان : ئەی چارە چیە ..؟! ریگا چارە یەك با دابنین ..؟! ئەوانیش ووتیان : هەرچی جوولەکەی خەیبەر هەیە بەرەو رووبان دا ئەنین رووبەرووبان دە بینەوە ، هەروەها لە گەل جوولەکەی (تیماء ) و (فەدەك ) و (واد القری ) لە گەل خۆماندا ئەبەین بۆ بەرگری و رووبەروو بونەوەی سوپای ئیسلام ، وە داوی پیشتوانی و کۆمەکی لە هیچ عەرەبیك ناچە کە ناکەین ، خۆ بینی تان لە کاتی سوپای ئەحزاب دا (غەتفان ) چی پیتان کرد ، ئیوە بەلین خورمای خەیبەر تا پیدان کەچی پەشیمان بوونەوە ، پشتی ئیوەیان باو دوای لە مەدینەکرد هەندی خورمای ئەوس خەزرجیان پی بدات ، بەلام (سەلامی کوری میکشم ) زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە جوولەکەی خەیبەر هیرش بکەنە سەر سوپای ئیسلام ، تەنانە هەموویان هاتنە سەر راو بۆچوونی (سەلامی کوری میکشم ) هەر بۆیە سەلام ووتی : ئەو پیاوە هەتا ملی نەگرن جەنگ ناکات ،واتە (پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) ، بەلام کینانەی پادشای خەیبەر بە قسە کانی (سەلام ) رازی نەبوو ، ئەوە بوو سوپای ئیسلام هەر هەموو قەلاکانیان فتح کرد ..........!!

بەلی دوای ئەوە جوولە کە وایان بە چاك زانی دوای کۆمەك هاوکاری لە هۆزە عەرەبەکان وەربگرن ، وەك (نجد ) و (غەتفان ) و (ئەسد ) ئەوانیش بەلینیا پی دان کە بەشداری و هاوکاری و کۆمەکی جوولە کەی خەیبەر بکەن ، سەرۆکی (نجد ) فەرماندە کەیان (هەزی کوری قەیسی وائیلی ) بوو یەکیك بوو لە فەرماندە دیارەکان ، هەروەها (غەتفان ) و (ئەسد ) سەرۆکیان (عویەنیە کوری حیصن ) تولیعەی کوری خوەلیدی ) ئە سدی ) بە (٤٠٠٠) هەزار جەنگاورە بەشداریان کرد ، کۆمەکی جوولە کەیان کرد ، بەلی ژمارەی سوپای جوولە کە دە گونجیت کە ژمارەیان لە (١١) هەزار جەنگاوەر زیاتر بیت ، سوپای ئیسلامیش ژمارەی پالەوانەکانی (١٤٠٠) بوونە ،بەلام هۆزی (موورە )هۆزیك بوو لە هۆزەکانی غەتفان بەشداری نەکرد کۆمەکی جوولە کەی خەیبەری نەکرد ، ئەمەش بە ئامۆژگاری (حاریسی کوری عەوفی ) مررەی سەرۆکیانەوە بوو ،جا بەوەش نەوەستا چوو لای سەرۆکی هۆزی فەزارەش کە (عوینەی کوری حیصنی فەرزای )بوو ئامۆژگاری ئەویشی کرد ،خۆ نەداتە داوی سوپای موسلمانان دە بەخوا محمد (صلی الله علیه وسلم ) بەسەر رۆژ هەلات و رۆژ ئاواد زال ئەبیت ، هەر واش بوو ، ئیستا هیچ شوینك نەماوە بانگەوازی ئیسلامی پینەگات واتا هیچ بیانویەك یان حجەیەك نەماوە بۆئەوەی بلین ئەم ئاینەمان پی نەگەیشتووە ، یان هیچ حجەیەك بۆ جاهیلی نەزانی نەماوە ئەمەش بە هۆی ئەوەی کە ئاینەکە لەسەرتاسەری جیها بلاوەبۆتەوە بەهۆ هۆی فتح کردنی وەلاتان و ئەم گەیاندنەی تەکنەلۆجیاو پیشکەوتنی تۆرە کۆمەلایەتیە کان ئیسلام بە هەموو جیهاندا بلاوە بۆتەوە یان ئەو هەموو بانگ خوا زەی ئیسلام کە رۆژانە پول پول دینە ناوئیسلام .

ئ

هەروەها ( حاریسی کوری عەوفی موررى ) بە ( عوینی کوری حصینی فەزارى ) ووت دەبەخوا من گوویم لە ( ابو رافیع کوری سەلامی کوری اب الحقیق ) بووە ئەوان ئەم هەوالەیان پیدام بەخۆیان ،ووتیان : ئیمە چاوەریمان دەکرد ئەو پیغەمبەر لە نەوی هاروون بیت ، بەلام لە ناو عەرب دا دەرچووە ، هەر بۆیە ئیمە حەسوودی بە محمد ( صلی الله علیه وسلم ) دەبین ،بەوەی لە نەوەی هاروون دا دەرنەچووە ، جا جوولە کە گورایەلیم بۆناکەن دووجار لە لایەن ئەوەوە تووشی کوشتار ئەبین ، یەکیك لە مەدینە دا روویدا ئەوەی تریش لە خەیبەر ، ( حاریسی کوری عەوفی ) ئەلی بە ( سەلامی کوری ابی الحقیق ) ووت : ئەو دەبیتە خاوەنی هەموو زەوی ..!! ئەلی ئەویش ووتی : بەلی . بە و تەوراتەی بۆ موسا هاتووە ، پیشم خۆش نیە جوولە کە بەم قسە یە بزانن دەر بارەی ئەو ..!! غزه لباشمیل : ١٠٢- ١٠٩ .

بەلی لەگەل ئەوشدا کە سوپای ئیسلام بەریکەوت بۆ خەیبەر ، هەر زوو سەرۆکی مونافیقەکان کە( عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) بوو ، هەوالی گەیاندە سەرکردەکانی جوولەکەی خەیبەر ، کەوا محمد ( صلی الله علیه وسلم ) هیرش دەکاتە سەرتان بەلام، یەسوپایەکی کەمەوە ژمارەیان زۆر کەمە وەچەك و تەفاقیان کەمەو ، وە هیچ مەترسن ، چونکە ئیوە ژمارەتان زۆر ترە چەك تفاقی باشتر هەیە ، هەروە ها سوپایەکی کەمی پەرتەوازەی لایە مەترسن ، ئەوە بوو سەرکردەکانی خەیبەر ( کنانەی کوری ای الحقیق ) یان نارد بۆ لای هۆزەکانی غەتفان و هۆزی ئەسدو نەجد هۆزی فەزارە و هۆزی موررە ،بۆ پشتوانی کردن و کۆمەکی سوپای خەیبەر ،بەلی ئەوانیش مەرجیان بۆ جوولە کەی خەیبەر دانا لەبەری بەشداری کردن و کۆمەکی کردنیان ، دەبیت بەروبوومەکانی خەیبەر لە میوە خورما یان بدەنی ..!! لەراستیدا ئەگەر کۆمەلیك یان سوپایەك بۆ خوا جیهاد بکات لە پیناوی خوا تی کۆشان بکات ، ئەوا هیچ هیزیك یان هیچ سوپایەك بەگەی ناگریت ، هەرچەند بە ژمارەش زۆر بن وەك ئەوەی لەغەزای بەدر دا روویدا یان ئەوەی لە غەزای ئەحزابدا روویدا ، جەنگ شەر کرجن بە ژمارەی زۆری سوپا نیە، بەلکو بە پیشەوایەکە کە سەرکردەی بکات ،یان پیویستی بە کەسیکی زانا دانا ژیرو هوشیارو بەصەلیقەی چاکە، لە هەموو هونەرەکانی جەنگی شارەزابیت ،وە لە هەمان کاتدا ئیمانیکی یان ئیرادە باوەریکی بەهیز بەتیەوی دامەزراوی هەبیت ، بەلی ئەو هەموو رەوشتەجوانانە ش لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەدی دەکریت بەلکو زیاتریش کە ئیمە درکی پیناکەین ،( خوای گەورە زاناترە ) بەلی دەبینی ژیر کەو تن سەرکەوتنی هەر میلەتیك یان ئوممەتیك یان وەلاتیك لە دەستی سەرکردەکەی دایە ، جا ئەوەی کەژیرو هۆشمەند زانا بیت ، ئەوا میلەتە ی بەختەوە سەرکەوتن بەدەست دەهینی ، بەلام ئەو میلەتەی سەرکردەی جاهیل و نەزان و ساویلکە بیت بە قسەی باق وبریق هەلپەریت ، ئەوا میلەتەکە تووشی مال ویرانی دەبیت ،ژیانی خۆی و میلەتەکەش لە ناو دەبات ، وە ك لە رېردوو دا سەرکردەکانی وەلاتان ، فیرعەونی نەزان خۆبە گەورە زان جاهیل ، ابو جهل چۆن خۆی سوپاکەی بردە دۆزەخەوە ، پادشای فارس پەرویز چۆن خی

ێ

میله تەکەی ویران کردو وەلاتی فارسی کرد کاول کاری لەدوای خۆی دا شەر ئاژاوە و کوشتن وبرین دروست بوولە ناو خییزانی ئیمپراتۆریەتی فارس دا ، ئەوە بوو کور باوکی خۆی کوشت ، بۆ کورسی دەسەلات ، هەروەها نەمانی دەولەتی عباسیەکان کە بەهۆی سولتانە جاهیل نەزانەکانیانەو بوو هەر خەریکی باخ باخات دروست کردنی کوشك تەلارەکانیانەو بوو ،ئا گایان لە خەلکی هەژارو برسی دەولەتەکیان نەمابوو کە بەم هۆیانەوە بوو کە مەغولەکان ئەم دەلەتەیان رووخاند و سەرکەوتن بەسەر عباسیە کاندا ، یان دەلەتی عوسمانیە کان کەبۆماوەیەك بوونەئیمپراتۆریەتی جیهان ، ئەوانیش بەهۆی نەزانی سولتانەکانیان خۆ بە گەرەزانی سولتانەکان هەندیکیان لەسالی ١٩١٤ ، کۆتایان پی هات بوونە بە دولەتیکی بچووك نەمانی دەسەلاتی عوسمانی ، بەلی سەرکردە دەبیت وەك پیشەوایی فەقیر هەژاران بیت ، نەوەك پیشەوای مال وسامان دەسەلات کۆکردنەوەبیت ، لە پیناوی خودا دا میلە تەکەی بپاریزی پیشەوایەتی بکات چاو نەترس بیت ، پشت بەنای بەخوای گەورە بیت ، نەوەك ئەوانەی ئیستا پشت پەنایان بە جوولەکەی خیانەتکارە ، یان بە ولاتانی زل هیزی دونیا ، ئەوویان لەبیر چووتەوە کە چەندەها ئمپراتۆر هەبوو ئیستا ئاسەواریشیانە ماوە ، بەلی ئەگەر بۆ میژوو بگەرینەوە سەرکردە گەمژەکان زۆرن خۆیان نەتەوەکەیان لەنا بردووە ، وە ك هیتلە ر لە سالی ١٩٤٦ ، کە خۆی ئەلمانیان لە ناوبر د ، کە وەلاتەکەی بووە بەدوو بەش ئەلمانیا رۆژ هەلات و ئەلمانیا رۆژئاوا ، چەندی سەرکردەی تر وە صدام حسین کە خۆی دا بە پەتی سیدارو میلەتکەشی دایە دەستی بیگانە تا ئیستا کوشتارو ئاژاوە لەم وەلاتە بەردەوامە میلەتەکەی لە دوی خۆشی هیچ خیر و خۆشی نەبینیوە، ئەمەش سەرکردەی گەمژە و گیل نەفام نەزان و جاهل تەنها بۆ بەرژەونجی خۆی وای کرد بە س بۆئەوەی لە دەسەلاتدا بمینیتەوە ، یان محم قەزافی خۆی وەلاتەکەی ویران کرد ،یان بشار اسدا ئەوییش وەلاتەکەی خۆی ویران کرد ، چەندەها سەرکردەی تر لە میژووداا هەن وە ئیستاش بەردەوامن لە گەمژەیی خۆیان هیچ گویی بەمیلەتەکەیان نادەن تەنها بیر لە پر کردنی قاسەکانی خۆیان دەکەن ، بەلام دواتر سەرئە نجامیان وەك ئەوانەدەبیت کە باسمان کردن ،بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) تا کۆتایی دونیا پیشەوامانە هەرچەندە ئەو نەماوە بەلام قورئانی پیرۆز کە کەلامی خوایە فەرمووودەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە ناو ماندایە ، ئەگەر دەست بگرین بە قورئان وسوونە تەکانی پیغەمبەری ئازدار پیشەوای مرۆڤایەتی رۆشناچاو مان ئەوە پشت بەخوا سەرکەوت دەبیت ،بەلام بەخوا قەسەم پشت لە قورئان سوونەت بکەین پشت لە فەرمانەکانی خوا بکەین یان فەرمووودەکانی پیغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) ئەوا چارە نووسمان زۆر خراپ دەبیت دوا رۆژیکی رەرش چاوەریمانە پەنا بەخوا ..............................؟!!

ئ

## پێنجەم : سوپای ئیسلام بەرەو خەیبەر نزیك بوونەوە

بەلی سوپای ئیسلام بە رەوە خەیبەر نزیك بوویەوە ، ئەوە بوو لە ریگاد پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دوای یەکیك لە هاوەلانی کرد ، کە ( عامیری کوری ئەرکوع ) بوو تاکو بە دەنگیکی خۆش دەنگ بەرز کاتەوە ، چونکە ئەوە دەبیتە چالاك بونی سوارچاکان و ووشترەکان ،بەلی بەم دەنگە خۆشە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) زۆر دل خۆش بوو بە ( عامری کوری ئەرکوع ) هەروەها پی فەرموو ( یرحمك الله ) بەلی شعرە کەی ( عامری کوری ئەرکوع ) ئەمە بوو :

ولله لولا الله ما اهتدینا .................. ولا تصدقنا ولا صلینا

فأنزلن سکینة علینا ..................وثبت الاقدام إن لاقینا

بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە هەرکەسیکی فەرموو بایە ( یرحمك الله ) ئەوا ( خوای گەورە ) رحمی پی دەکرد پلە ی شەهیدی پی دەبەخشرا ، هەربۆیە ( عمری کوری خەتاب ) فەرمووی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئایا واجب بوو ، واتا شەهید بوونیە کەی ..؟! وە ناکری دلی ئیمەشی پی خۆش بکەیت ..؟! بەلی هەر واش بوو پلەی شەهیدی بە ( عامری کوری ئەرکوع ) بەخشرا ..!!ئەوە بوو لە گەل جوولە کەیەکی خەیبەر کەوتنە شەرە شمشیر کردن ، ویستی شمشیریك لە قاچی جوولە کە کە بدات بەلام لە بەر کورتی بەژنی جوولە کەکە شمشیرەکە بە قاچی خۆ ی کەوت زۆر زامدار بوو بە هۆی زامداریە کەیەوە وەفاتی کرد پلەی شەهیدی بەدەست هینا ، پاشان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە هاوەلانی فەرموو : (( اقدموا باسم الله )) واتە : برۆنە پیشەوە بەناوی خوا ، ئەوە بوو ( خوای گەورە ) چاوی جوولە کەی خەیبەری لە ئاست سوپای ئیسلام کویر کردبوو ، ئەوە بوو کاتیك سوپای ئیسلام گەیشتە خەیبەر ، شەو بوو ، هەر ئەوەش بوو سوپایی ئیسلام لەبەرە بەیان زوو هیرشی کردە سەر قەلاکانی خەیبەر ، بەلی شایەنی باسە کاتیك جوولە کەی خەیبەر هەوالی بیستی هیرشی سوپای ئیسلامی زانی بوو بۆ سەر خەیبەر ، هەموو رۆژیك بە رلە رۆژهەلاتن واتە لە کاتی بەیانی زوو یان فجر ، سەرکددرە کانی یان فەرماندە کانی خەیبەر هەلدەستان سەرژمیری سوپای خەیبەریان و سەربازە کانیان دەکرد ، وە سەربازەکانیا بەسە ردەکردەوە جل وبەرگی یان سەر بازیان دە پۆشی قەلغانیا هەلدەگرت ، ئەوە بوو بە قدرەتی ( خوای گەورە ) ئەو بەیاینەی کە سوپای ئیسلام هیرشی کردە سە ر خەیبەر هیچ کام لە کارانەیان ئە نجام نەدا ، بەلکو هەر لە خەو دا بوون ، هیرشی سوپای ئیسلام چووە سەر قەلاکانیان بە دەنگی ( الله اکبر ) بە خەبەر هاتن ، ئەمەش وای کرد کە بەم سوپا زۆرەی خەیبەر کە ژمارەیان لە سوپای ئیسلام زۆر تر بوو چەك تفاقیانیش زۆر تر بوو ، بەلام ئەم هیرشە وای کرد کە ترس توقین لە ناو سوپای خەیبەر دا بەچەسپیت لە ترساندا زیرە بکەن ، و وورەی سوپای خەیبەر بە یەکجاری دابەزی ..؟!!

ئ

بەلی کاتیك سوپای ئیسلام گەیشتە قەلاکانی یان شووراکانی خەیبەر و سوپا دا بەزی وە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوای کرد کە خواردن بهینن ئەوەی پیانە کۆی بکەنەوە ،بۆ ئەوەی سوپای ئیسلام نان بخوات ،تاکو ئامادەباش بیت بۆ هیرش کردنە سەر قەلاکانی خەیبەر ، وە لە (سویدی کوری نعمان) وە (خوا لی رازی بیت) دەلی: (لە گەل پیغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) بووم لە خەیبەر هە تاکو چوونە (صبهاء) کە دە کەویتە رۆژئاوای خەیبەری نویژی عصری لەویدا کرد ، پاشان دوای کرد خوادرنە کەیان بۆ بهینن ، کەچی هیچیان پی نەبوو ، تەنها قاوەت نەبیت ، فەرمانی کرد بیکەن بە تریت یان تیکوشە بە زمانی خۆمان ،ئەوەی خواردی ئیمەش خواردمان پاشان هەستا بۆ نویژی مەغریب یان نویژی شیوان ئاوی لەدەم وەردا ئیمەش بە هەمان شیوە پاشان نویژی کرد دەست نویژی تازە نە کردەوە )).
**اخرجه : البخاری (٤١٩٥) ،والنسائی (١/١١٨) ،وابن ماجه (٢٤٩٣) والترانی فی الكبير (٦٤٥٥).**

لە گیرانەوەیە کی تردا کە (بنی فەزاررە) لە و هۆزانەبوون هاتبوو بۆ کۆمەك وپشتیوانی کردنی جوولەکەی خەیبەر ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی نامە بەریکەوە ئاگاداری کردنەوە ،کە هاوکاری کۆمەك پیشتوانی خەیبەر مەکەن ، ئەگەر ئەوان جییان بهیلن ئەوا لە خەیبەر دا ئەوی ئەوی بۆ ئەوان دەبیت ، بەلام ئەوان پشتیان هەکرد گویان بە داواکاریەکەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەدا )). **اخرجه : البيهقی فی الدلائل النبوه ٤/ ٢٤٨ .**

پاشان پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل هاوەلانی دا بە شەو گەیشتنە خەیبەر ، لە (ئەنەسی کوری مالیك)وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەیشتە خەیبەر لە شەودا ، کاتیك گەیشتنە دەروبەری خەیبەر شەو بوو ، خەلکەکەی خەیبەر هیچ پی یان نەدە زانی ..!! بەلام پیغەمبری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەر هیرشی بکردایە سەر هەر شوینیك نزیك نەدەبۆ وە هەتاکو بەرە بەیان ئەگەر گویی بیستی دەنگی بانگ بووایە دە وەستا ئەگەرنا بەرەو پیش دە چوو ، لە دەرو بەری شاری خەیبەر سوپای ئیسلام یان پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بارگەیان خست ،ئەو شەوە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەویدا بوو تا کو بەرە بەیانی مایەوە هیچ کەس نەیزانی بەهاتنە کەیدا وە لەویشدا دەنگی بانگیان بەبیست )).**اخرجه البخاری (٦١٠) ، (٤٢٩٧) ، ومالك (٣٧/١) والنسائی (٤٦٨/٢)، والمسلم ((١٣٦٥) ، والترمزی (١٥٥٠) .**

بەلی هەرکە بەیانی بۆوە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نویژی بەیانی بە هاوەلانی کرد، وە لە (ئەنسی کوری مالیك) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( کە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) غەزای خەیبەری کرد نویژی بەیانیمان بە تاریکی کرد، لە دەرەوەی شاری خەیبەر و ئینجا پیغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بە سواری رۆیشت ئینجا (ئەبو تەلحە) وە منیش لە دوای (ئەبو تەلحە) سوار

ئ

بوو م ، پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ڕۆیشت و نزیك بووە لە دەروازەكانی یان قەلاكانی شاری خەیبەر ، بە جۆریك لە پێغەمبەری خوا نزیك بووم ، كە چۆكم بە ڕانی پیرۆزی كەوت ،ولە چكی ئیزارەكەی سەر ڕانی لاچوو بە جۆریك سپییایی ڕانی پێغەمبەری خودام ( صلى الله عليه وسلم ) بینی )).اخرجه :مسلم (١٨٠٢). ((وە كاتیك بەیانی بوویە وە ، جوولە كە كانی خەیبەر بە خاخەناس و بیل قازمەوە كەرەسەی هەلكەندن هاتنە دەرە وە بۆ سەر كارە كانیان ))اخرجه : البخاری (٤١٩٧ ) ، كاتیك پێغەمبەری خوایان ( صلى الله عليه وسلم ) بینی بە سوپاكەیەوە ،زۆر ترسان و بە ڕاكردن چوونەوە ناو قەلاكانیان ووتیان وللاهی ئەوە محمد و سوپاكەیەتی وا هات )). ابن كثیر في البداية والنهاية (١٨٤/٤). هەروەها پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ((...( الله اكبر ) (الله اكبر ) خربت خیبر أنا اذا نزلنا بساحة قوم فساء صباح المنذرین )). اخرجه البخاری (٤١٩٧) ، والنسائي (٤٠٤٨ ). واتە : (الله اكبر ، الله اكبر ) خەیبەر ویران بوو وە كاول بوو ، ئیمە بۆ هەر خەلكیك بچینە مەیدانەوە (خوای گەورە ) خراپیان بەسەر دینیت ، یان سزایەكی ترسینەریان بەسەر دینی ، بەلی هەر واش بوو سوپای خەیبەر و خەلكەكەی زۆر ترسان تۆقیان چوو كەچاوین بە سوپا خنچیلانەكەی ئیسلام كەوت ، هەروەك ل ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە شاری خەیبەری دەروانی تەماشای دەكرد دواتر نزا دوعای لی كردن ،هەروەك لە ( مروان ئەسلەمی ) كە لە باوكیەوە ئەویش لە باپیریەوی –خوا لی یان ڕازی بیت – دە لی : دەرچووین لە گەل پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەرەو خەیبەر هەتاكو نزیك بوونە لیمان دەركەوتن ، پێغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم ) بە خەلكە كەی فەرموو : ( وقفوا ) فوقف الناس فقال : (( اللهم رب السموات السبع وما اظللن ، ورب الارضین السبع وما اقللن ، ورب الشیاطین وما أظللن ، فانا نسألك خیر هذه القریة وخیر أهلها وخیر ما فیها ، ونعوذبك من شر هذه القریة وشر اهلها وشر ما فیها ، اقدموا بسم الله الرحمن الرحیم )).اخرجه : التبراني في الكبیر(٢٩٧/٢٢ ) ،والبیهقي في الدلائل النبوة (٢٥٢/٥ ) . واتە: ڕواوەستن خەلكینە ، خەلكەكەش ڕاوەستان ، پاشان فەرمووی : خودایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەكان و ئەوەی بەسەری بۆ دەكات پەروەردگاری حەوت چینەكەی زەوی و ئەوەی هەلیگرتووە پەروەردگاری شەیتانەكان ئەوەی گومڕایان كردوون ، دوای خیرو چاكەی ئەم ئاوەدانیەت لی دەكەم چاكەی خەلكەكەی وە ئەو چاكەیەی كە تییدایە وە پەنات پی دەگرم لە خراپەی ئەم شارە و خراپەی خەلكەكەی و خراپەی ئەوەی تییدایە بەناوی خوای گەورە و میهرەبان ،بەریكەون ...!!!

ئ

## شەشەم :دەست پی کردنی هیرش کردنە سەر خەیبەر

بەلی دوای ئەوەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (عمری کوری خطاب) راسپارد و کردیە فەرماندەی سوپای ئیسلام ،هاوەلی بەریز (بوریدە) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (ئابو لوقەی یان گەمارۆیی خەیبەر مان دابوو ، (ابو بكر صدیق) بوو بە فەرماندە ئالاكەی وەرگرت بەلام بۆی فتح نەكرا گەرایەوە پاشان بۆ رۆژی دواتر (عمری کوری خطاب) بەرەو خانوو قەلاو كۆشكە كانیان رۆیشت روو بەرووی شەریكی زۆر سەخت بۆوە ، كە زۆر بەهیز تر بوون لە شەرەكەی یەكەم جار لەگەل (ابو بكر صدیق) كردیان ، زۆر نەبرد (عمری کوری خطاب) سوپاكەی دوو چاری شكست بوونەوە ،گەرایەوە بۆیان فتح نەكرا ، خەلكەكە ئەو رۆژە دووچاری برسیەتی ماندویەتی زۆر بوون ). اخرجه :احمد (٥/٣٥٣) الطبراني في الكبير (٦٣٠٣) ، والنسائي (٨٤٠٣) ، والبيهقي في الدلائل النبوة (٤/٢٠٩)

بەلی لە پاش ئەم بەرپەرچ دانەوەی جوولە كە لە قەلا كانیان سوپای ئیسلام گەرایەوە بۆی فتح نەكرا ، ئەوەبوو جوولە كەكان هاتنە دەروە لەقەلاكانیان دوایان لە سوپای ئیسلام فەرماندە كانی كە شەری مەیدانی بكە لە دەرووی قەلاكانیان ، لە (سەلەمەی کوری عمری کوری ئەركوەع) – خوا لی رازی بیت – ( كاتیك گەیشتینە خەیبەر سەركردەیەكی جوولە كە هاتە دەروەو كە ناوی ((مرحب) بوو شمشیرەكەی بە لووت بەرزی و فیزەوە رادەوە شاند ئەم چەند دیرە شعرەی دەووتەوە :

قد علمت خیبرا انی مرحب            شاكي السلاح بطل مجرب

اذ الحروب اقبلت تلهب

سەلەمە دەلیت : مامم بۆ چووە دەرەوە كە ناوی (عامر) بوو شمشیرەكەی كورت بوو شاعیریش بوو بە شعریك وەلامی دایە وە ووتی :

قد علمت خیبرا انی عامر            شاكي السلاح بطل معامر

پاشان هەردووكیان دەستیان بە شەر و شەرە شمشیر كرد ، شمشیر كەی (مرحب) بە قەلغانەكەی (عامر) كەوت ، وە (عامر) ویستی شمشیرێك لە ژیرەوە ل قاچی (مرحب) بدات بەلام شمشیرەكەی كورت بوو ، نووكە كەی هەلگەرایەوە بەر خۆی كەوت ، وە كلاوی ئەژنۆی گرت و پی شەهید بوو ، سەلەمە دەلیت : رۆیشتم گەیشتمە چەند كەسیك لە هاوەلانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیان ووت : كارەكەی (عامر) بەتال بوو خۆی كوشت سەلە مە ش دەلیت : منیش چوومەخزمەت پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە گریانەوە ووتم : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كردەوەكانی (عامر) ی مامم پووچ بووە تەوە واتە : بەتال بووە تەوە خودا وەری ناگریت ..؟! پیغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی

ێ

: (( من قال ذلك )) واتە : کێ ئەوە ی ووت ..؟! ئەڵێت منیش ووتم : کەسانێك لە هاوەڵانی بەڕێزت ، پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( كذب من قال ذلك بل له اجره مرتين ، وجمع بيت اصبعيه انه الجاهد قل عربي مشي بها مثله )). اخرجه : البخاري ( ٤١٩٦ ) ومسلم ( ١٨٠٧ ) . واتە : ڕاست ناکان ئەوەی وا بلێت ، بەڵکو دوو پاداشت وەردەگرێت ، پاشان دوو پنچەی دەستی بردە لای یەك فەرمووی : ئەو جیهاد تی کۆشانە ،کەم کەس هەیە لە ناو عەربدا بەڕێگای ئەو دا بڕوات ،وە هاو شێوەی ئەو بێت لە پاداشتدا...!!

بەڵی ئەو ڕۆژە خەڵکەکە تووشی ماندوو بوون برسیەتی زەحمەتی نارەحەتی زۆر بوون وە بێ ووچان شەڕیان دەکرد لە ( سەلەمەی کوڕی عمری کوڕی ئەرکوع ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەفەرموویت : (( كان ( علي بن ابي طالب ) تخلف عن رسول الله ( ﷺ ) في خيبر وكان رمدا ، فقال انا اختلف عن رسول الله ( ﷺ ) فلحق به فلما بتنا الليلة التي فتح خيبر قال رسول الله ( ﷺ ) (( لأعطين هذه الراية غدا رجلا يحب الله ورسوله ويحبه الله ورسوله ليس بفرار ، ولن يرجع حتى يفتح الله علي يديه ، في راوية اخرى قال بريدة : وفبتنا طيبة أنفسنا ان الفتح غد قال عمر : فما أحببت الأمارة الا يومئذ قال سلمة : فبات الناس يدركون ليلتهم أيهم يعطاها ، فلما اصبح الناس وعدوا الى النبي ( ﷺ ) كلهم يرحوا أن يعطاها ... وفي راوية ( فلما اصبح رسول الله ( ﷺ ) الغداة ثم قام قائما فدئ باللواء والناس على مصافهم ... ) ) اخرجه : احمد ( فضائل الصحابة ) برقم ( ١٠٠٩ ) ،البخاري برقم ( ٣٧٠١ ) ،( ٤٢١٠ ) و مسلم ( ٢٤٠٤-٢٤٠٦ ) واحمد ( ٣٣٣/٥ ) ،و ابو داود ( ٣٦٦١ ) و الطبراني في الكبير ( ٥٨٧٧ ) و البيهقي ( ١٠٦/٩ ) ،وابن حبان ( ٦٩٣٢ ) .

واتە : ( علی کوڕی ابی تالیب ) لەو ڕۆژەی خەیبەر دوا کەوت لەگەڵ پێغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم ) ووتی : من چۆن دوا دەکەم لە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پاشان پێ گەیشتمەوە کاتێك ئەو شەوە هاتە پێشەوە کە بەیانی خەیبەرمان فتح کرد لەویدا ماینەوە بۆ حەسانەوە پێغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم )ف رمووی : بەیانی ئەم ئالایە دەدەمە دەست کەسێك کە خودا و پێغەمبەرەکەی خۆشی دەوێت ، وە خوداو پێغەمبەرەکەشی ئەویان خۆش دەوێت ، پشت هەڵناکات ، وە ناگەڕێتەوە دوا وە هەتاکو ( خودای گەورە ) لەسەر دەستی ئەو خەیبەر ئازاد دەکات یان فتح دەکات ، لە گێرانەوەیەکی تر دا ( بوریدە ) – خوا لێ ڕازی بێت – دە لێت : ئەو شەوە بەدڵنیاییەوە نووستین بێ گومان بووین لەوەی بەیانی خەیبەر فتح دەکرێت ، ( عمری کوڕی ختاب ) - خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : هیچ کاتێك حەزم لەو بەرپرسیاریەتە نەکردووە تەنها ئەو ڕۆژە نەبێت ، لەبەر فەرموودەی کەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) و ە ( سەلەمە ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : خەڵکە کە ئەو شەوە نووستن لەبیر ئەوە دا بوون کە ئالاکەی دەبێت بدرێت بە کێیان هەر کە بەیانی بۆیەوە خەڵکە کە بەرەو لای پێغە مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ڕۆیشن هەریەکەیان بە هیوای ئەوە بوو ئالاکەی پێ بدرێت بە مەبەستی بەدەست هێنانی

ئ
ئه شكۆمەندیه . وه له گێرانەوەیەكی تردا ( كاتێك بەیانی داهات پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەستا سەرپێ دوای ئالاكەی كرد خەلكەكەش بەریز وەستان . له گێرانەوەیه كی تردا ( پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئالاكەی گرتبوو بەدەستەوە رای دەشەكاند پاشان فەرمووی : كی ئەم ئالایه وەردەگرێت و حەقی دەدات ..؟! ( زوبێری كوری عوام ) – خوا لی رازی بێت ) هاته پێش ووتی : من . ئەویش فەرمووی : تۆ بكشێیەوە دواوە !!،دوای ئەوە كەسێكی تر هەستا ووتی : من . دیسان فەرمووی : تۆش بكشێیەوە دواوە !! دوای ئەویش كەسێكی تریش هات و ووتی : من . ئینجا فەرمووی : ( الذي كرم وجه محمد لأعطينها رجلا لايفر بها ) ) اخرجه : ابزار ( ١٨١٥ ) و ابن ابي شيبة في ( المصنف ) ( ٣٨٠٤٩ ). واته سوێند بەو زاتەی كه ریزی محمد گرتووه به پێغەمبەرایەتی ئەو ئالایه دەدەمه دەست كەسێك راناكات و دوچاری شكستی ناكات . بەلی دوای ماوەیه ك بەم شێوەیه مایەوە پاشان فەرمووی : كوا ( علی كوری ابی تالیب ) ..؟ ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) چاوی دەهێشێت ، ئەویش فەرمووی : بانگی بكەن بۆم ، پاشان به ئیمەی فەرموو: برۆن بیهێن بۆ لام ). اخرجه : ابزار ( ١٨١٥ ) و ابن ابي شيبة في ( المصنف ) ( ٣٨٠٤٩ ). له گێرانەوەیەكی تردا له( سەلەمه )وه – خوا لی رازی بێت- ده لیت : ( پاشان منی نارد بۆلای علی چاوی دەهێشا ئازاری هەبوو ، چوومه خزمەتی و هێنام من چاو ساغی بووم چونكه ئەو چاوی به ئازار بوو هەتا كو بردمه خزمەتی پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) .رواه مسلم ( ١٨٠٧ ) .

له گێرانەوه یەكی تردا ( علی كوری ابی تالیب ) خۆی دەی گێرتەوە دەلیت : ( كاتێك گەیشتمه خزمەت پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) چاوم ئازاری هەیه ، وه دا هاتەوە و چاوه كانی بۆ كردمەوە ،تفی پیرۆزی تی كرد ). اخرجه : ابزار ( ١٨١٥ ) و ابن ابي شيبة في ( المصنف ) ( ٣٨٠٤٩ ). وه له گێرانەوەیەكی تردا هاتووه دەلیت :( بۆی پارایەوە و چاك بۆوه بەشێوه یەك دەتووت هەرگیز ئازاری نه بووه ).اخرجه : البخاری ( ٤٢١٠ ) و ابن ماجه ( ١١٧ ) الطبراني في الاوسط ( ٢٢٨٦ ) . پاشان فەرمووی : (( اللهم اذهب عنه الحر والبرد )) . واته : ی خوای پەروەردگار سەرماو گەرما مان لەسەر لابەدەیت .دەلیت : دوای ئەو رۆژه نەسەرما بوو نەگەرما بوو . پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئالاكەی دایه دەست ، وه پی فەرموو : (( اذهب فقاتل حتى يفتح الله عليك ولا تلتفت )) واته : برۆ پشت هەلنەكەیت تا خوای گەوره لەسەر دەستی تۆ فتحی ده كات و ئاوریش نەدەیتەوە . له گێرانەوەیه كی تردا( علی ) رۆیشت به خۆشحالیەوە پاشان بۆ ساتێكیش پشتی هەلنەكر ، ( علی ) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لەسەر چ شتێك شەر له گەل ئەو خەلكه بكەم واته : مەبەستی جووله كەی خەیبر بوو . شەریان له گەل دا بكەم هەتاكو وه ئیمەیان لی دیت ..؟! اخرجه : مسلم ( ١٨٠٧ ).

ێ
پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (( انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم ثم ادعهم الى الاسلام ، واخبرهم بما يجب عليهم من حق الله فيه ( في راوية ) قاتلهم حتى يشهدوا ان لا اله الا الله وان محمدا عبده ور سوله ، فاذا فعلوا ذلك منعوا منا دمائهم واموالهم الا بحقها وحسابهم على الله ، فو الله لان يهدى الله بك رجلا واحدا خير لك من ان يكون لك حمر النعم )). اخرجه : البخاري (٤٢١٠) .

واتە : لەسەر خۆ برۆ هە تا بۆیان دەچیتە مەیدان پاشان دەنگیان بکە بۆ موسلمان بوون و پییان رابگەینە بەوەی کەلەسەریان پویستە لە مافی خودا بەسەریانەوە ، لە راویەتیکی تردا دەفەرمووی : شەریان لە گەل بکە هە تاکو شەیە تمان دەهینن ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوا خوین و مالیان لە ئیمە حەرام دەبیت ، تەنها ئەوە نەبیت کە بەحەقی خودا دە کەویتە سەریان لیپرسینەوەشیان لە سەر خودایە ، سویند بە خودا ئەگەر لەسەر دەستی تۆ یەکەسیان خودا هیدایەت بدات باشترە بۆ تۆ لە میگەلە ووشترە سوورە کان .

واتە : پاداشتی موسلمان کردنی یەکیك لە جوولە کەکانی خەیبر باشتر لە میگەلە ووشترە سوورە کان ، کە بە ناو بانگترین جۆری ووشتر بوونە لەم سەردەمدا ، کە نایاب ترین ووشتر بوونە .لە گیرانەوەیە کی تردا (علی کوری ابی تالیب ) دەلیت : منیش زۆر بە خیرایی و گورجی رۆیشتم ترسام لەوەی کە پیغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم ) ریگە چارە نەخشەو پیلانیکی تر دا بنیت بۆ فتح کردنی خەیبر ،ئەلیت : رۆیشتم هەتاکو گەیشتمە خەیبەر شەرم لە گەلدا کردن ) .اخرجە: البزار (١٨١٥) و ابن ابی شیبە (٣٨٠٤٩ ) و ابن حبان (٦٩٣٤ ).

بەلی قەلاو کۆشکەکانی شاری خەیبرە دابەش ببون بۆ دوو بەش بەشیکیان لە (٥) قەلا پیك هاتبوو بە ناوە کانی (قەلای الناعم ) و (قە لای الصعب بن المعاذ ) و (قە لای الزبیر ) ئەوانە کەو تبوونە ناوچەی (النطاة ) وە دوو قەلاکەی تریش وەك (قەلای ئوبەی ) و (قەلای نزار ) کە تبوونە ناوچەی (الشق ) وە بەشی دووەمی قەلاکان پیان دەوترا ( الكتيبە ) کە لە (٣) قەلا پیك هاتبوون ئەوانیش ئەمانە بوون (قەلای قموص ) کە گەورترین قەلای خەیبر بوو ، وە (قەلای بنی ابی الحقیق ) وە (قەلای الوطیح والسلالم ) بەشی یەکەمی قەلاکان کە (٥) قەلا بوون ، بەشەر فتح کرا ، بەلام بەشی دووەمی کە(٣) قەلابوون ئەوان بەئاشتی فتح کراو پیك هاتن ، بەلام پیلانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە هیرش کردنە سەر قەلاکانی خەیبر بریتی بوو لە مشغول کردن و سەرقالی کردنی هەندیکیان بەهیزی بچوك بچوك وە چرکردنەوەی هیرشیش بۆ سەر قەلاکانیان بە هیزی سەرەکی هەتاکو بە تەواوە تی دەستی بەسەر ئەو قەلایەدا دە گرت پاشان هیرشە چروپرەکەی دە گواستەوە بەرەو قەلایەکی تر دا )). اخرجە: الطبراني في الكبير (٦٣٠٣ ) والبيهقي في الدلائل النبوة (٢٠٩/٤ ) وابن هشام في السيرة برقم (٨٥٥ ).

ئ

( ابن هيشام ) ( رحمه الله ) دەلێت : یەکەم قەلا موسلمانەکان هێرشیان کردە سەری قەلای ( ناعم ) بووە ، بە سەر کردایەتی فەرماندەی موسلمانان( علی کوری ابی تالیب ) وە دەفەر موویت : ( ئالاکەی سو پای ئیسلامی وەرگرت و ، ئینجا دەرچووە بە شێوەیەکی گرچوو گۆل و ریك پیك ، هەلی کوتایە سەریان من لەدواوە بووم بە شوینی ئەودا دەرۆیشتم هەتاکو ئالاکەی بردە قەلاکەو لە سەر کۆمەلە بەردیکی کۆ کراوە چەقاندی جوولەکە یەك سەری دەرهینا و سەیری کرد لەسەر قەلاکە و ووتی : تۆ کیت ؟ ئەویش ووتی : من ( علی کوری ابی تالیب ) جوولە کەکە ووتی : سەر دەکەون سویند بەوەی دابەزیوە سەر ( موسی ) ( علیە السلام ) ...). اخرجە : الطبرانی في الکبیر ( ٦٣٠٣ ) والبیهقي في الدلائل النبوة ( ٢٠٩/٤ ) ، و ابن هشام في السیر برقم ( ٨٥٥ ). پاشان ( مرحب ) سەرکردەی سەربازی جوولەکە کاندوای دابەزینی یەك بەیەکی کرد بۆ مەیدان بۆ جاری دووەم لە موسلمانەکان ، لە ( سەلەمەی کوری عمری ئەرکوع ) دەلێت : ( مرحب ) هاتە دەرەوە بەلوت بەرزییەوە . وە لە گێرانەوەیە کی تردا ( بوریدە ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : ( مرحب ) لەگەل علی کەوتنە شەرە شمشیر کردن ئەوە بوو ( علی ) شمشیریکی دا بەسەریدا ،چووە ناو ددانەکانی هەموو ئەوانەی لە مەیدانی جەنگەکە دا بوون ، گویی بیستی هاواری بوون سەری لە لاشەری جیا کردوە کوشتی ). لەگێرانەوەیەکی تردا لە ( ئوم سەلمەوە ) – خوالی رازی بیت – دەلی : بەشداری غەزای خیبرم کردووە ،دەلێت : گویم لەگیر بوونی شمشیرەکە بوو لەددانەکانی ( مرحب ) . اخرجە : البخاری ( ٤٢١٠ ) ومسلم ( ١٨٠٧ ) والنسائی ( ٣٠/٦ ) والطبراني في الکبیر ٢٥١/٢٣ برقم( ٦٢٢٥ ) و ابن ابي شیبة ( ٤٥٨/١٤ ) وفي صحیح ابي داود ( ٢٢١٣ ) و احمد في مسند ( ٣٥٣/٥ ) و البزار ( ١٨١٤ ). لە گێرانەوەی تردا لە( البزار ) وە کە دەلی : ( علی کوری ابی تالیب ) – خوا لی رازی بیت –خۆی دەی گیریتەوە دەفەرموویت : ( خودا ( رحب ) کۆشت بەدەستی من وە سوپاکەشی تیك شکاو شپرزە بوون وە ریان کردە ناو قەلاکانیان وە دەرگای قەلاکانیان لە سەر خۆ داخست وە خۆیان تیدا کەپ و مات کرد ، وە کە گەیشتنە دەرگاکە زۆری پی نەچوو خۆیان پینەگیرا شەکستیان خوارد هەتا ( خوای گەورە ) فتحی کرد )

. اخرجە : البزار ( ١٨١٥ ) و ابن ابی شیبە ( ٣٨٠٤٩ ) و کما قال السیوطي ( کنز العمال ) ١٢٧/٤ .

ئ

لە راستیدا موسلمانانیش تووشی بەرگرەیەکی یەکجار بوونە ،کاتیك هێرشیان کردە سەر قەلاکانی جوولەکەی خەیبەر بەتایبەتی قەلای ( ناعم ) هەر لەم قەلایەش بوو کە هاوەلی بەریز ( محمودی کوری سەلمەی ئەنصاری ) تیدا گەیشتە کاروانی شەهیدانی ریگا ئیسلام ،کە لە لایەن ( مرحب ) کە دەستا ریکی فریدە سەری لە قەلاکەوە ، دەستار ئەو بەردەیە کە گەنم جۆی پی وورد دەکریت بۆ ئارد ، بەلی ئەوە بوو بەم دەستارە دای بەسری شەهیدی کرد ، بی گومان گە مارۆ دانی قەلای ( ناعم ) ( ١٠ ) رۆژی خەیاند بۆ فتح کردنی ) بەلی دواتر بۆ رۆژی ( ٣ ) یەم دا کە ئالای سوپا کەوتە دەست ( علی کوری ئەبی تالیب ) ئەوە بوو لە کاتی گەمارۆدانی ئەم قەلایە کە قەلای ( ناعم ) بوو ئەوانیش کەسیکان هەبوو ، کە ناوی ( مرحب ) ئەوە بووە ئەو پیاوە ( عامری کوری ئەرکوع ) شەهید کرد ، پاشان لە دوای فتح کردنی قەلای ( ناعم ) ئەوە دواتر گەمارۆی قەلای ( الصعب ) یان داو پاش ( ٣ ) لە ئابلوقە دانی خواردن ئاودا فتح یان کرد ، دواتریش چوو بەرەوو قەلای ( القلعە الزبیر ) ، گە مارۆیان دان ئاویان لی برین بۆیە ناجار بوو کە بینە خواروە بۆ شەر کردن دواتریش ئەوانیش شکستیان خوارد و قەلاکەیان فتح کرا ، ئینجا دواتر رۆیشتن بەرەو قەلاکانی ناوچەی ( الشق ) قەلاکانیان فتح کرد تا کو گەیشتنە قەلای ( الیسلام ) ئەوویشیان گەمارۆ دا بۆ ماوەی ( ١٤ ) رۆژ لە کۆتاییدا دوای ریکەوتن و ئاشتیان کرد . الواقدی ( ٢/٦٥٧ ) .

هەروەها لە ( ابن اسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بەرە بەرە نزیك دەبۆوە لە مال سامان سەروە تەکانی جوولەکەی خەییەر قەلا بە قەلا فتحی دەکرد ، وە یەکەم قەلا فتحی کرد قەلای ( ناعم ) بوو، هەر لە لای ئەم قەلایەش بوو کە هاوەلی بەریز ( محمودی کوری ئەسلمەی ئەنصاری ) شەهید بووە کە دە کاتە برای ( محمدی کوری ئەسلمەی ئەنصاری ) کە ( مرحب ) دەستا ریکی هاویشتە خوارە دای بە سەریدا شەهیدی کرد ، پاشا کەقالای ( ناعم ) قەلای ( قموص ) ئازاد کرا کە قەلای کورانی ( ابی الحقیق ) بوو پیغەمبەری خوا لەم قەلایە دا دەست کەوتیکی زۆری دەست کەوت بە تاییەتب جاریە لەوانەش کە ( صفیە کچی حوییی کوری اخطب ) کە لە دوایدا پاش نووسینی کیتابە بوو بە هاوسەری پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ،وە جارییە کانی لە خەییەر دا دەست یان بەسەر دا گیرا بەناو موسلمانانە کانیان دا بلاو کردنەوە دروشمی هاوەلان یان موسلمانان لە خەییەر دا ئەم دروشمە بوو ( ئەی سەر کەوتوو بکوژە بکوژە ) .اخرجه : ابن هیشام فی السیر النبویه ( ٣/٣٨١ ) وا ابن کثیر في البداية والنيهاية ( ٤/٢٢١ ).

ئ

بەلی دوای فتح كردنی قەلاكانی خەیبەر ، دانیشتوانی ( فەدەك ) ترسان و بەپەلە هاتن بۆ داوا كردنی ئاشتی ریكەوتن لە گەل موسلمانەكان ، بە مال سامانیانەوە هینایان بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) رازی بوو لە سەر داوا كاریە كەیان ، بۆیە ناوچەی( فەدەك ) تەنها بۆ پیغەمبەری خوا بوو ( صلی الله علیه وسلم ) چونكە ئەسپ وكاروانی تیا بەكار نەهینرا ،هەر لە پاش ( فەدەك ) سوپای ئیسلام ( وادی القری ) یان گە مارۆ دا ، كە بریتی بوو لە كۆمەلە گوندیك لە نیوان خەیبەری ( تیماء ) ئینجا ئەوانیش خۆیان بەدەستەوە دا ، موسلمانەكانیش مال و سامانیكی زۆریان لەوی دەست كەوت ،وە زەوی دارخورماكانیان دایەدەست خودی جوولە كەكان وەك خەیبەر لە گەل ئەوانیش ریكەتن ، ئا بەم شیوەیە خەیبەری قەلاكانی و وە ناچە كانی دەور بەری فتح كران ، هەروەها كوژراوی جوولە كە لە خەیبەر دا بووە ( ٩٣ ) كەس ، هەروەها ئافرەت مندالە كانی شیان بەدیل گیران ، لەو ئافرەتانە خەیبەر كە كەوتە دەست موسلمانەكان دایكی موسلمانی ( صفیه كچی حوییىنی كوری ئەختب ) بووە دە دواتر دەبیت هاوسەری پیغەمبرەی خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە دایك موسلمانان ، وە بە پیی ریوایەتی ( ابن اسحاق ) ) دەلین : لە جەنگی خەیبەر دا موسلمانەكان ( ٢٠ ) كەسیان لی شەهید بوو ، بەلام بە پی ریوایەتی ( الواقدی ) دەلیت : ( ١٥ ) كەسیان لی شەهید بووە .

رواه مسلم برقم ( ١٣٦٤ )و ،تاريخ خلفه ٨٥ص ، المغازى الواقدى ( ٦٩٩/٢ ) ، و زاد المعاد ( ٣٥٤/٣-٣٥٥ ) ، السيره النبويه ضوء المصادر الاصلية ( ٥٠٤ ) ، صحيح مسلم كتاب النكاح ( ١٠٤/٢ ) ،النسائي ( ٦٠/٤ ) ، والبيهقي في الدلائل ( ١٥/٤-١٦ ) ،و زاد المعاد ( ٣٢٤/٣ ) ،السيرة النبوية الصحيحة ( ٣٢٧/١ ) ، الواقدي الغازي ( ٧٠٠/٢ ) .

ئ

## حەوتەم : بەرسیەتی سوپای ئیسلام لە کاتی گەمرۆدانی قەلای ( الصعبي کوري معاذ )

بەلی لە دوای فتح کردنی قەلای ( ناعم ) و ( قەلای ) ( قموص ) گەمارۆیان خستە سەر ( الصعبي کوري معاذ ) کە ماوەی زۆری پی چوو بۆ فتح کردنی خەلکەکەی ناوقەلاکەش دووجاری برسیەتی تینویەتی هات لە گەل موسلمانەکانیش کە ئەمانەیان دە خوارد لە باتی خواردن :

١-( خواردنی گژو گیاو بەروبوومی میوە کالەکی پی نەگەیشتووە )

لە ( ابو قلاب ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : ( پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) گەیشتە خەیبەر ، خەلکی بە پەلە بۆ بەرو بوومی پی نەگەویشتووی سەوزە و میوە دەچوون ، لە بەر سا دووچاری لە رز تا گرنت بوو ، وە سکالایان بردە لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەویش فەرمانی پی کردن کە ئاو بکە نە ناو کوندە کانیان بۆ ئەوەی سادر بیت ، پاشان لەدوای هەردوو بانگی بەیان بە خۆتانی دا بکەن ، وە لەگیرانەوە یەکی تردا لە دوای نویژی شویان و خەوتنان دا ، وە ناوی خوداشی لەسەر بهینن ، دەلیت: ئەوە مان کرد کە فەرمانی پی کردین ، بە شیوە یەك چالاك بووین دە ووت لە کوت زنجیر کوردووینەوە ) .

و البیهقی فی الدلائل ( ٤/٢٤٢ ) .

٢-( خواردنی سیرو پیاز )

لە ( ابو سعید خدری ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : ( ئیمە وامان دانەنا بوو ، کە خەیبەر بەو ماوە زۆرە فتح بکریت ، ئەو فتح کردنە دریژەی خەیان ، خەلکە کەش دووچاری برسیەتی بوونەوە کەوتینە خواردنی سیر زۆرمان لی خوارد پاشان چووینە بۆ مەزگەوت لە جیگەیەدا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆنی کرد فەرمووی : (( من أكل من هذه الشجرة الخبيثة فلا يقربنا في المسجد ، فقال الناس : حرمت فبلغ ذلك النبي ( ﷺ ) فقال : (( ايها الناس انه ليس بي تحريم ما احل الله لي ولكنها شجرة اكره ريحها )).

اخرجه : احمد ( ٣/١٢ ) والبخاري ( ٨٥٣-٨٥٦ ) ومسلم ( ٥٦٥ ) .واتە : ئەوەی لەم بەروو بوومە ناخشەی خواردوە واتە : ( سیر و پیاز ) با نزیك مەزگەوتە کان مان نەکەویت ، خەلکە کەش کە تنەە قسە کردن و ووتیان : ئایا حرام بووە حەرابم بووە ، وە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیەو سلم ) فەرمووی : خەلکینە بۆم نیە ئەوەی خوای گەورە حەلالی کردووە من لیتانی حەرام بکەم بەلام بۆنە کەی لام زۆر ناخۆشە ، یانی مەکروهە .

ئ
٣-( خواردنی کەری مالی )

لە ( عبدالله کوری ئەوەفی ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : دووچاری برسیەیتی زۆر بووین لە خەیبەر دا ئیمە لە گەل پیغەمبەری ( صلی الله علیه وسلم ) دا بووین لە دەورو بەری خەیبەردا چەند کەریکمان بەردەست کەوت ، خەلکە کە چونکە پیویستیان پی بوو لە بەر برسیەتی سەرمان بری ختمانە سەر ئاگر مە نجەلە کان قولپە قولپی دەهات لە کاتەدا بانگ بیژی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بانگی کرد کە دەست لەو مە نجەلانە هەلگرین و هیچ شتیك لە گۆشتی ئە کەرانە نە خۆین ).اخرجه : البخاری ( ٤٢٢١ ) و مسلم ( ١٩٣٨ ).

هەروەها ( ابن اسحاق ) دە لیت : ( بنی سەهم لە هۆزی ئەسلەم هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ووتیان : وەللاهی ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) زۆر ماندو هیلاك شەکەتین هیچ شتیکمان نیە بۆ خواردن بی خۆین ، لە کاتەش دا هیچ شتیك لەلای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دا نەبوو ، کە پیان بدات ، ئینجا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆیان نزای کردو پاریەوە فەرمووی : (( اللهم انك عرفت حالهم وان ليست بهم قوة وان ليس بيدي شيء اعطيهم اياه فافتح عليهم اعظم حصونها عنهم غناء واكثرها طعاما وودكا )). اخرجه : ابن هيشام في السيرة ( ٣٨٣/٣ ) والطبراني في التاريخ ( ١٠/٣ ) والبيهقي في الدالائل ( ٢٢٣/٤ ) ، وكما البيقهي في السنن ( ٣٠٩/٦ ) . واتە : خودایە خۆت دەزانیت حالی سوپای موسلمانان چۆنە ،هیچ هیزیان تیدا نەماوە منیش ئیستا هیچم لەبەردەست نیە بیان دەمی خودایە گەورە ترین قەلایان بۆ فتح بکەیت کە زۆر ترین خورادەمەنی و چەوری تیدایە بۆ یان .

لە پاشاندا خەلکە هیرشیان بردە سەر قەلای ( الصعب بن معاذ ) خوای گەورە پشتیوانی کردن فتحی قەلاکەیان کرد ، بیگومان لە خەیبەر دا هیچ قەلایەك بە ئەندازەی ئەو قەلایە خوردن و کۆشت و چەوری تیدا نە بوو پاشان جوولە کە کان بەروە قەلای ( ئوبەی ) رایان کرد چوونە ناوقەلاکە خۆیان تیدا قایم کرد ، وە پیاویك لە قەلای ( ئوبەی ) هاتەدەروە دوای مەی داینی یەك بەیکی دە کرد لە موسلمانان دا .

لە ( محمدی کووری مەسلە مەی ئەنصاری ) یەوە دەلیت : کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) رووی سوپاکەی کردە ناوچەی ( الشق ) لە غەزای خەیبەر دا پیاویکیان لە نا قەلاکە هاتە دەرەوە هاواری دەکرد کی بۆم دیتە مەیدان ئەوە بوو ( ابو دوجانەی ئەنصاری ) بۆی چووە مەدیان کە پەرۆکیەکی سووری لە ناو چەوانی بەستبوو ، وە ك پالە وان بۆی چوو شەمشیری لی وەشاند قاچە کانی پەراند ، ئینجا کەوتە سەری کوشتی کەل و پەلی کرد ، دواتر شمشیرە کەی قەلغانەکەی هینایەوە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وەك دەست کەوتی جەنگ ). اخرجه : البيهقی ی السنن الكبرى ( ٣٠٩/٦ ).

ئ

پاشان له ناو قه‌لای (ئوبه‌ی) شه‌ریكی خویناوی روویدا له نیوان سوپای ئیسلام و جووله كه كانی ناو قه‌لاكه دواتر سوپای ئیسلام توانی قه‌لاكه فتح بكات ، ئه‌وه بوو جووله كه كان شكستیان هینا روویان كرده ناو قه‌لای (نزار) . له (ابن اسحاق) – خوا لی رازی بیت – ده لیت : كاتیك پیغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) یه‌ك له‌دوای یه‌ك قه‌لاكانی جووله كه‌ی خه‌یبه‌ری فتح ده كرد ، ئه‌وان هه‌رچی مال سامانیكیان بۆ كۆ كردبویه‌وه ده‌یان برد بۆ قه‌لاكانی (الوطيح والسلام) وه پیغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ماوه‌ی چه‌ند شه‌وه‌ی گه‌مارۆی دان). اخرجه : ابن هيشام فی السير (٣/٣٨٣).

به‌لی پیغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) له رۆژانی فتح كردنی خه‌یبه‌ر دا به تایبه تی له كاته‌كانی به‌یانیان دا هه‌ر نویژی ده كردو هه‌ر دوعای بۆ سه‌ركه‌وتن به‌سه رجووه‌كه‌كانی خه‌یبه‌ردا داده‌كرد ، هه‌روه‌ها دوای سه‌ركه‌وتنی له خوای گه‌وره ده كرد بۆ موسلمانه‌كان له جه‌نگی خه‌یبه‌ردا ،له (سوهه‌یبی رومی) خوا لی رازی بیت – ده‌لیت ئه‌وه بوو پیغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم)ده‌ی فه‌رموو: ((أني ذكرت نبيا من الانبياء اعجب بامته وكان اعطى جودا من قومه فقال : من يقوم لهؤلاء ؟ فاوحي الله اليه ان اختر لقومك احدى الثلاث اما ان اسلط عليهم عدوا من غيرهم او الجوع او الموت فاستشار قومه في ذلك فقالوا : انت نبي الله كل ذلك اليك ضرلنا فقام الى صلاته وكانوا اذا فزعوا الى الصلاة فصلى ماشاء الله ، فقال اي رب اما عدوهم من غير والجوع فلا ولكن لاموت فسلط عليهم الموت ثلاثة ايام فمات منهم سبعون الفا فهمي الذي ترون ان اقول : ((اللهم بك اقاتل وبك اصاول وبك احاول ولا حول ولا قوة الا بالله )).رواه البخاري (٤٢٠٦) و ابو داود (٣٨٩٤).

واته : به زیره‌كی خۆتان هه‌ستان پی كردم ..؟! ووتمان به‌لی . فه‌رمووی : من یادی پیغه‌مبه‌ریك له پیغه‌مبه‌ره‌كانی خودام كردووه كه سه‌رسام بوو به زۆری ژماره‌ی شوینكه‌وتوه‌كانی و زۆری ژماره‌ی سه‌ربازه‌كانی له گه‌لی دا خۆی له كاته‌دا ووتی : كی ؟ ده‌توانیت به‌رنگاری ئه‌مانه ببیته‌وه به سه‌رسامیه‌وه ؟ له‌به‌ر ئه‌وه خوای گه‌وره لیپیچینه‌وه‌ی له گه‌ل دا كردنو وه‌حی بۆ ناردن كه بۆ قه‌ومه‌كه‌ت یه‌ك له‌م شتانه هه‌لبژیره یان دوژمنیكی ده‌ره‌كی زال ده‌كه‌م به سه‌ریاندا یان به برسیه‌تی و گرانی ده‌یان كوژم یا خود ده‌یان مرینیم ، ئه و پیغه‌مبه‌ره‌ش راویژی به گه‌له‌كه‌ی كرد له‌و باره‌وه ئه‌وانیش ووتیان تۆ پیغه‌مبه‌ری خودایت هه‌موو ئه‌وانه مایه‌ی زیانن بۆ ئیمه ده‌یگیرینه‌وه بۆ لای تۆ خۆت سه‌ر پشك به ئه‌ویش هه‌ستا ده‌ستی به نویژ كردن كرد هه‌ر شتیك رووی تیده‌كرن بیه‌نایان ده‌برد به نزاو نویژ كردن ئه‌وه‌ندیه‌ی خوا ویستی نویژی كرد ئینجا فه‌رمووی ،ئه‌ی په‌روه‌ردگار دوژمنی ده‌ره‌كی و گرانی برسیه‌تی یه كه‌یان له‌سه‌ر لاده به‌لام ملكه‌چین بۆ مردنه كه خوای گه‌وره ش بۆ ماوه‌ی (٣) رۆژ مردنی نارد سه‌ریان خه‌فتا هه‌زاریان مردن ئه‌و ئه‌و چرپه‌چرپه‌ی له‌منیشتان بیست یان بینی ئه‌وه بوو ده‌لیم : ئه‌ی خوا یه به پشتیوانی تۆ ده‌جه‌نگم وه به شتیوانی تۆ هه‌لمه‌ت ده‌به‌م وه به پشتیوانی تۆوه هه‌ول و ته‌قه‌لا ده‌ده‌م وه هیچ گۆران و به هه‌ولدانیك زو هیز و توانایه‌ك به حه‌ق نیه ته‌نها توانا و هیزی تۆ نه‌بیت .

ئ

بەلى هەل لە غەزاى خەيبەر دا پیغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ریگە ى نەدا هیچ ژن و مندال پیر و بە کەوتەیەك بکوژریت ، لە سەر موسلمانانانى قەدەغەکرد ، هەروەك لە ( کەعبى کورى مالیکە وە ) دە گیرنەوە – خوا لى رازى بیت - دەلیت : پیغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پە یمانى لى وەر گرتین و راى سپاردین کە کەلە غەزاى خەیبەر بووین هیچ زژن مندالیك نەکوژریت ).اخرجه : اسحاق بن راهويه ، وقال الحافظ في المطالب العالية ( ١٩٦٩ ).

ئ

## هەشتەم :چۆنیەتی فتح کردنی قەلاکانی خەیبەر

لە پێشدا باسمان کرد کە شاری خەیبەر و دەوروبەری لە چەند قەلایەکی تیدا بوو ، کە لە هەشت قەلا پیك هاتبوون ، (٥) قەلا دەکەیتەو بەشی یەکەمی خەیبەر ، کە سەخسترین قەلا بوون ، ئەوانەی تریش کە (٣) قەلابوون دە کەویتە بەشی دووەم خەیبەر ، کە لەم مانەی خوارەوە پیك هاتبوون :

١-قەلای (ناعم ) یەکەم قەلا بوو ، فتح کرا ، کە سەرکردەی جوولە کەی تیدا کوژرا بەناوی ( مرحب ) لە گەل برا کانی دا ، کە ئەو پیاوە پالەوانی ناوداری جوولە کە بوو ، لە پاش بەرگریەکی یەکجار سەخست .

٢-قەلای (صعب بن معاذ) کە گەورە ترین قەلای جوولە کە بوو لە خەیبەر دا ، زۆر ترین خۆراك تفاقی جەنگی تیدا بوو کەوتەدەست سوپای ئیسلام فتح کرا .

٣-قەلای (زوبیر ) لەگەل دوو قەلاکەی تری کە قەلای (ناعم ) و (صعب بن معاذ) ئەم سی قەلایە کە تبوونە ناوچەی (نطاة)

٤-قەلای (ئوبەی )

٥-قەلای (نزار ) لە گەل قەلای (ئوبەی ) ئەم دووانە لە ناچەی (الشق ) بوون ، ئەم (٥) قەلایە هیلی بەرگری جوولە کە بوون لە خەیبەر دا کە قورسترین جەنگ کوشتاریان تیدا ئە نجامدرا .

بەلام بەشی دووەمی قەلاکانی خەیبەر لە سی قەلا پیك هاتبوون :

١-قەلای (قموص ) ئەوان بە ئاسانی خۆیان بەدەستەوە دا بە بی هیچ بەرگریەك ، کەقەلای یەکی سەرکردەیەکی جوولە کە بوو بە ناوی (ابی الحقیق )

٢-قەلای (الوطیح ).

٣-قەلای (سلیم ) .

بەلی ئەم سی قەلایە زۆر بە ئاسانی خۆیان بەدەستەوە دا بە بی هیچ بەر گریەك تیدا ، فتحی ئەم قەلایانەشکرا ، هەموو یان خۆیان بە دەستەوە دا ، بەمال و سامانە کانیشیانەوە کەوتە دەست سوپای ئیسلام .

ئ

## نۆیەم : جەنگاوەریکی دوو روو منافق

لە ( ابو هریرە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت بەشداری غەزای خەیبەرمان کرد لە گەل پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) بە پیاویکی شەرکەری فەرموو کە لەگەل خۆی دا بوو ، بەنا و موسلمانیش بوو ئاماژەی بۆ کردو فەرمووی : (( هذا من اهل النار ) فلما حضر القتال قاتل الرجل قتالا شديدا )). اخرجه : عبدالرزاق ( ٩٥٧٣ ) ، و احمد ( ٣٠٩/٢ ) ، والبخاري ( ٢٨٩٧ ) ، ( ٤٢٠٣ ) ، و مسلم ( ١١١ ) والبيهقي في الكبير( ١٩٨/٨ ) وابن حبان ( ٤٥١٩ ) و صححة الباني في سلسلة الصحيحة ( ١٦٤٩ ). واتە : ئەو لە ئەهلی دۆزەخە ، کاتیك جەنگ دەستی پی کرد پیاوە کە شەری مەردانەی دە کرد .

وە لەگیرانەوەیەکی تردا لە ( اکثمي کوری ابو جون ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت: (( ووتمان ئەی پیغەمبەر ی خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) فلان کەس زۆر چاونەترسە بەجەرگە لەشەردا فەرمووی : ئەویش فەمووی : ئەو پیاوە لە ئاگر دایە ، ( اکثمي کوری ابو جون ) دەلیت : ئیمەش ووتمان : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) ئەگەر ئەو کەسە بەو هەموو عیبادەت و روخوشی و نەرم نیانیەوە لە دۆزەخدا بیت دەبیت ئیمە لەکوی بین ..؟! وە لە گیرانەوەیەکی تر دا هاتووە ووتیان : ئەگەر ئەو پیاوە دۆزەخی بیت کی لە ئیمە لە بەهەشتدا بیت ئەویش فەمووی : (( انما ذلك اخبات النفاق وهو النار )) واتە : ئەو کارانەی بۆ بۆ ناوداری ناو دەر کردنبوو نیفاق و دووروویەتی و ئەو لە ناو ئاگرە . دەلیت ك ئیمەش چاو دیرمان دەکرد لە کاتی شەرکردندا هیچ ئەسپ سواریك و پیادەیەك بەلایدا نەدە رۆیشتن ئەو پیاوە هەلیدەکوتایە سەریان تا دواتر برینی زۆر بوو لە جستەی وترا : ئەی پیغەمبەری خودا ( صلی اللە علیه وسلم ) ئە پیاوەی تۆ فەرمووی : ئەوە لە ئەهلی دۆزەخە ) ئەمرۆ زۆر بە جەگانەوە بویرانە دەجەنگا هەتاکو مرد فەرمووی : ( چووە ناو ئاگر ) نزیك بوو هەندیکلە هاوەلانی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) دوو چاری گومان بن و ، وە هەر لەو سەرو بەندە دا ووترا : ئەم پیاوە نەمردوە بەلام برینەکەی زۆر سەختە ، هەر کە شەو دا هات خۆی رانەگرت لەبەر سەختی برینەکەی خۆی کوشت ..!! ئینجا هەوا لیان دایە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) فەرمووی : ( اللە اکبر ، اشهد انی عبداللە ورسوله )). اخرجه : الطبراني في الكبير ( ٨٧٢ ) .

ی

هه ر له الطبراني دا هاتووه ده ليت : (( ئەو پیاوە كاتيك ئازارى برینەكەی زۆر بوو شمشیرەكەی دەرهینا له نیوان هەردوو مەمكی دا واته سینگی دا ، خۆ پی کوشت و زۆر بە پەلە كە سانیك چوونە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەواله كەيان پی راگەیاند ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) خودای گەورە فەرمووده كەی تۆی بەراست گەیان فلان كەس هەستاو خۆی کوشت ..!! ئینجا ئەویش فەرمووی : (( قم يا فلان فاذا انه لا يدخل الجنة مؤمن ان الله يؤيد الدين بارجل الفاجر )).اخرجه : البخاري ( ٤٢٠٣ ) .واته : فلان كەس بانگەواز بكه بەناو خەلكە كەدا كە تەنها ئیماندار نەبیت ناچیته بەهەشتەوە ، وە خوای گەورە پشتیوانی ئەم ئاینه دەكات بە پیاوی خراپه كار وە لەری دەرچوو .

هەروەها لە گێرانەوەیەكی تردا كاتیك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەوالی ئەم پیاوەی زانی كاتيك به دەستی خۆی خۆی کوشت ..!! پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( ان الرجل ليعمل عمل اهل الجنه فيما يبدو للناس وهو من اهل النار ، وان الرجل ليعمل عمل اهل النار فيما يبدو للناس و هو من اهل الجنه )). اخرجه : البخارى ( ٤٢٠٣ )، ومسلم ( ١١٢ ).واته : پیاوی واهەیه كردەوەی ئەهلی بەهەشتەی دەكات لەوەی كه له پيش چاوی خەلكیدا دیاره ئاشكرایه و لەگەل ئەوەشدا له خەلكی دۆزەخه ، وه پیاوی واش هەیه كردەوەی خەلكی دۆزەخه دەكات لەوەی كەله پیش چاوی خەلكیدا دیاره وه ئاشكرایه ، لەگەل ئەوه شدا دەچیته به هەشتەوە . بی گومان ئەم فەرموودەیە باس له دوو روو مناقق دەكات ، هەلبه ته كردەوەكانی مرۆڤی منافق هەروایه ، ئەو تەنها خۆ دەر خستنه له ناو خەلیكی د بەس.

وه لەگیرانەوەیەكی تردا پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەموویت : (( تدركه الشقوة او السعادة عند خروج نفسه فيختم له بها )) .واته : له كاتی گیان كیشان دا بەدبەختی دوچاری دەبیت یاخود بەختەوەری و كۆتایی ژیانیش هەربه وه دەبیت كەلەسەری دەمریت .

پاشان پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی كرد به ( بیلال ) به ناو خەلكی دا بانگەوازی بكات (( لايدخل الجنة الا نفس مسلمة وان الله يؤيد هذا الدين بالرجل الفاجر )) .اخرجه : الطبراني في الكبير ( ٨٧٢ ) ، والبخاري ( ٤٢٠٢ ). واته : ناچیته بەهەشتەوه تەنها موسلمان نەبیت ( خوا گەوره ش ) ئەم ئاینه سەردەخات به پاوی تاوانكار و لەری دەر چوو . له ریوایەتیكی تردا پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : (( ان الله يويد هذا الدين باقوام الاخلاق لهم ) .اخرجه : الطبراني في الكبير ( ٨٩٦٣ ) و احمد ( ٤٥/٥ ) ، وابو نعيم في الحلية ( ٢٦٢/٦ )، و ابن حبان ( ٤٥١٧ ).

ێ

## دە یەم: پیاوە اعرابیەکە یان دەشتە کی یە کە

لە (شدادی کوری هاد ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت پیاویکی دەشتە کی یان اعرابی هاتە خزمەت پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) براوی هیناو شوینی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) کەوت ووتی : لە گەلیدا کۆ دەکەم پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بە چەند هاوەلیکی خۆی سپارد کە ئامۆژگاری بکەن و فیری ئاینی ئیسلامی بکەن ، کاتیك غەزای خەیبەر کۆتایی هات دەستکەوتەکانی ئەم غەزایە دابەش کرا پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) لە دەسکەوتەکانی خەیبەر هەندیك لە غنیمەتەکانی خەیبەری دابەش کرد بەشی ئەویشی دانا واتە پیاوە اعرابیە کە ،وە دایە دەستی هاوەلەکانی خۆی کە بۆی ببەن ، ئەویش لە پشت سوپای ئیسلام مەری دەلەوەراند ،کاتیك چووە لای هاوەلەکان ئەوانیش بە شەکەی ئەویان دایە ئەویش ووتی : ئەمە چیە ..؟ ئەوانیش ووتیان : ئەمە بەشی خۆتە کە پیغەمەبری خودا بۆی داناوی وەری بگرە ، ئەویش وەری گرت بردیە خزمەت پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) ووتی : ئەمە چیە ..؟! پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی :ئەمەبەشی خۆتە بۆم داناویت ..!! ئەویش ووتی : من بەم شتانە شوینت نەکەتووم ، بەلکو بۆ ئەوە شوینت کەو تووم کە ئیرەم بەتیر بپیکریت لە پیناوی خوادا ،ئاماژەی بۆ گەردنی کرد ، ئینجا بمرم بچمە بەهەشتەوە ، پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی (( ان تصدق الله یصدقك )) واتە : گەر لە گەل خو دا دا راست بکەیت بەدلی خۆت لەگەل دەکات ، کەمیك مایەوە ئینجا هەستا بەرەو جەنگ و شەرکردن لە گەل دوژمنانی ئیسلام ، دواتر هینایانە بەردەم خزمەت پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) تیریك بەر ئەم شوینە کەوتبوو کە ئاماژەی بۆکردبوو، پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ئەو ئەم اعرابیە ئەوانیش ووتیا ن : بەلی .ئەویش فەرمووی : (( صدق الله فصدقه )) واتە: لەگەل خودا راستی کرد خوداش ئەوەی دەیویست بۆی جی بەجی کرد ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ لەناو عباکەی خۆی دا کفنی کرد ، پاشان هینا یانە بەردەمی نویژی مردووی لەسەر کرد ، ئەوەی لە نویژە کەدا ئاشکرا بوو ئەوە بوو کە فەرمووی : (( اللهم هذا عبدك خرج مهاجر في سبيلك فقتل شهيدا وانا شهيد على ذلك )).واتە : ئەی خودایە ئەمە بەندەی خۆتە لە پیناوی تۆدا کۆچی کردووە و بە شەهیدش کوژاروە و منیش شایەتی بۆ دەدەم لەسەر ئەو شتە . اخرجه : النسائي ٤/٦٠ ، والطبراني في الكبير ( ٧/١٧١ ) والبيهقي في الدلائل ( ٤/٢٢٢ ) .

ئ

**یانزەم : شوانە رەشەکە :**

لە ( جابری کوری عبدالله ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە گەل پیغەمبەری خوا دا ( صلی الله علیه وسلم ) بووین لە غەزای خەیبەر دا ، ( سریەك ) دەرچوو کەسکیکیان گرتبوو مەری پی بوو دەی لەوەراند هینایان خزمەت پیغەمبەری خودا ( صلی الله علیه وسلم ) ، وە پیغەمبەری خوا ئەوەندەی خودا ویستی قسەی لە گەل کرد . لە گیرانەوەیەکی تردا دەلیت : ( قال : ادعوا الی الاسلام وان تشهد ان لا إله الا الله وان محمد رسول الله وان لاتعبد الا الله قال العبد (الاسود ) فماذا لي إن انا شهدت وآمنت بالله ..؟! قال لك الجنة ان مت علی ذلك ).البیهقي في الدلائل النبوة (٢٢٠/٤). واتە : بانگی کرد بۆ ئیسلامیەتی بۆ ئەوەی شایەت مان بینیت بە تەنها خودا بپەرستیت ، شوانە رەشەکە یان کویلە کە رەشە کە (الاسود ؟) ووتی : چ شتیك بۆ من دە بیت ئەگەر شایەت مان بهینم وە باوەر بە خودا بکەم ..؟! پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : بەهەشتت بۆ هەیە ئەگەر لە سەر ئەم باوەر بمریت ..!! شوانە رەشەکە پی ووت : من باوەرم هیناو بە تۆ و بەوەی کە تۆ پی نیردراویت لە پەیامەکەت ، ئەی چی لەم مەرانە بکەم ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە ئەم مەرانەش ئەمانەت هەر مەریك و دووان هی مالیکە ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : چەنگیك چەم لیم بەدەم رووياندا بکە دە گەرینەوە بۆ لای خاوەنەکانیان ئەویش مشتیك لە وردە چەم لیم زیخ بەرد یان خۆلی هەلگرت و بەدەم و رووياندا هەلیدا و زۆر بە توندی بۆی دەرچوون تاکو هەر مەریکیان چوونەوە مالی خۆیان ، پاشان ئەویش هاتە ریزی جەنگاوەر کان یان موجاهیدەکان تیریکی بەرکەوت کوژرا هیچ سووجدەیەکی بۆ خودای گەورە نەبرد بوو ، وە پیغەمبەری خودا فەرمووی : (( ادخلوه الخباء )) ببەنە ناو خیمەکەوە ، هاوەلان بردیانە ناو خیمەکەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هە تاکو پیغەمبەری خودا لە کارەکانی خۆی بۆوە هاتە لای بۆ ژوورە وە پاشان هاتەدەرەوە فەرمووی : (( لقد حسن اسلام صاحبکم لقد دخلت علیه وان عنده لزوجتین له من الحور العین )) . واتە : هاوەلە کەتان بەمەستی شوانە رەشەکە ، بە باشترین شیوە موسلمان بوو من ئیستا چوومە ژوورەوە هەردوو هاوسەر ( حور عین ) ی لە لابوو .ابن هشام فی السیر (٣٩٥/٣).

وە برانە فەرموودەیەکی ترکە . اخرجه : الحاکم (٩٣/٢ ) والبیهقی فی الدلائل (٢٢١/٤ )و صححه الشیخ الا البانی فی (صحیح ترغیب ) (١٣٨١ ).

ئ

## دووانزه م :دابەش کردنی دەست کەوتەکانی فتحی خەیبەر

**بەلی دەستە کەوتەکانی فتح کردنی خەیبەر یان غەنیمەتەکانی لە هەموو غەزا کانی تر زۆر تر بوو ، لە رووی زەوی زارو دارخورماو مال سامان و کەل و پەل و تفاقی سەربازی خۆراك پۆشاك و جل بەرگ دا ، وەك لە کتابە کانی سیرە دا هاتووە ، هەروەها غنیمەتەکان لە مانەی خوارەوە پیك هاتووە :**

١-خۆراك: وەك رۆن و هەنگوین و خواردنە مەنی زۆری تیدا بوون ، کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ریگەی دا لەو خورادنانە بخوریت کە پینج یەکی لی نەبرد .

٢- پۆشاك وجل بەرگ : وەك : پۆشاکی ناو مال وەکو جەل بەرگ و راخەر فەرشی ناومال ، هەروەها ووشتر مانگاو یان چیل و مەر بزن ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پینج یەکی لەمان ە بۆ خۆی جیا کردەوە ،وە چوار بەشی لەم غنیمە تانە بە سەر هاوەلانی دا دابەش کردن بە پی ئەرکو بەپرسیارە تیان لەم جەنگە دا .

٣-دیلە کان : وەك : ئافرە تان مندال و پیاوانی جوولە کەی خەیبەر ، ئەوانیش دابەش کران بە سەر هاوەلان دا ، چونکە ئەوانیش هەر حوکمی دەستە کەوت یان غەنیمەتی هەیە .

٤-زەوی : وەك دار خورماو داری میوە کانی خەیبەر ، ئەوانیشی دابەش کرد بە ( ٣٦ ) بەشەوە ، بۆ هەر بەشیکیش ( ١٠٠ ) بەشی کۆکردەوە ، بۆ بە ( ٣٦٠٠ ) بەش ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) و موسلمانان نیوەیان بەرکەوت و و نیوەکەی تر هەلگیرا بۆ کارو باری نا ئاسایی دەولەتی ئیسلام یان سوپای ئیسلام لە کاتی پیویستیدا ، کە بە کاری بەهینین لە کاتی هەر قەیرانیك دا بەسەر موسلمانان دا بیت .

٥-لە نیو غەنیمەتەکاندا هەندیك لاپەرەی تەوراتی جوولە کە هەبوون ، جوولە کەکان دوایان کردەوە ،وە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بۆی گەراندنەوە .

بروانە : الصراع مع الیهود لابی فارس( ٣/١٤٠ )، السرە النبویە لابی شیبە ( ٣/١٤١-١٤٢ ).

ێ

بەلی ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) جوولەکەکانی خەیبەری هیشتنەوە ، لەسەر کوشتوکال کردن و ، وە سەرو نیوەی رووبەری زەویە کە بۆ خۆیان بیت ، بە مەرجیك موسلمانان هەرکاتیك بیانەویت بیاندەنەوە خۆیان چونکە ئەم زەوی مالە کوشتو کال حەلالی خۆی تیان ئەو غنیمەتی ئەم جەنگەی خەیبەر بووە ، هەروەها جوولە کەی خەیبەر خۆشیان ئەم پیشنیارەیان کرد بوو ، هەر بۆیە بە پیغەمەبری خوا (صلى الله عليه وسلم ) یان ووت : ئیمە لە ئیوە شارە زاترین لە بەرهەم هینانی ئەم رووبەرە زەویانە بەروبوومی دار خورمای خەیبەر ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) رازی بوو بە پیشنیارەکەی جوولە کە بەلام پاش ئەوەی کە خەریك بوو دەریان بکات ، ئەمەش لیهاتووی قائد و پیشەوا ئومەتی ئیسلام دەبیت هەر بەم شیوەیە بیت رەفتار بکات لەگەل جوولە کەدا ،چونکە هیشتنەوەی جوولەکە لەسەر زەویە کانیاندا ،بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەك لە موسلمانە موجاهیدە کان بمینەوە لەم شوینە ،لالەیە کی تریشەوە جوولە کە شارەزاتر بوو لە کیلان و بەرهەم هینانی زەویە کانیاندا ،هەروەها مانەوەی جوولە کە بۆ بەرهەم هینانی زەویە کان بەرهەمی زیاتر دەبیت چونکە شارەزاتر بوون لەوان ،ئا بەم شیوەیە جوولەکە مەلکەچی سوپای ئیسلام و موسلمانان بوون ، چونکە دەیان زانی ئەم جارە هەلەیەك بکەن دەر دەکرن وەکو ئەوانی تر جاریکی تر ناگە رینەوە ناو زوویە کانیان خاکە کەیان ،ئەم ناپاکەیە جوولەکەش لەراستیدا هەر روویدا پاش ماوەیەکی زۆر لە خەیبەر دا ، ئەوە بوو کە دەست دریژیان کردە سەر (عبدالله ى کوری عمر ) لەسەردەمی خلیفایەتی (عمری کوری ختاب ) دا ، ئەوە بوو هەردوو دەستی (عبدالله ى کوری عمر ) یان بری وە پیشتریش (عبدالله ى کور سوهیل ) یان شەهید کرد بوو . بەلی ئەوە بوو جوولە کەی خەیبەر هەولیاندا زیرو ئالتوون و نەکانیان بشارنەوە ،پیستە پر زیرو زیوە کانی (حوینی کوری ئەختب )یان شاردەوە ، ئیتر ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه‌وسلم ) پرسیاری پیستەکانی کرد لەمامی (حوینی کوری ئەختب ) دەر بارەی ئەم پیستانە ئەویش ووتی : لەشەرەکاندا خەرج کران ، پیغەمبەر(صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی (( العهد قريب والمال اكثر من ذلك )) واتە : ماوە کە زۆر نیە ، وە مالە کەش لەمە زیاترە ، ئینجا دایە دەستی (زوبیری کوری عوام ) — خوا لی رازی بیت — هەندیك زیانی پی گەیان و درکاندی پیستەکان لە کوین ، ئەویش ووتی : لەم کەلاوەیە کە (حوینی کوریی ئەختب ) م بین دە چووە ئیرە ، هاوەلانیش چوون لەویدا بوو هینایان و دۆزیانەوە ، ئیتر خەیبەر بوو بەمولکی موسلمانان ،هەروەك (ابن عمر ) دەلیت : ئیمە تیر نەبووین تاکو خەیبەر فتح نەکرا .

تاريخ الاسلام الذهبي في المغازي (٤٢٤)، البخاري في كتاب المغازي غزوة الخيبر (٤٢٣٤) .

ئ

## سیانزە :هاوسەرگیری پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل (صفیەی کچی ئوبیەی کوری ئەختب)

بەلی کاتیك سوپای ئیسلام فتحی قەلای (قموص) ی کرد ، (صفیە کچی حوییەی کوری ئەختب) لە ناو ئافرەتە دیلە کان بوو ، لە قەلای (قموص) ئەوە بوو ، ئیتر ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دا یە هاوەلە کی خۆی بە ناوی (دحیەی کەلبی) ئیتر دوای ئەوە یەکیك لە هاوەلانی هاتە لای پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پی ووت : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) تۆ (صیفە) کە چکی سەرۆکی هۆزەکەیە تۆ داوەتە بە هاوەلیکی خۆت ، هەر بۆیە ئەم ئافرەتە هە شیاوی خۆتە ، چونکە ئەو کەسیکی خانەدانە ، ئەگەر هاوسەرگیری لە گەل بکەیت بەلکو هۆزەکە خودا هیدایەتیان بدات ببنە ئیسلام و شوین تۆ بکەون ، پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ئەم ووتانەی بەلاوە زۆر باش بوو ، ئافەرتیکی تری دایە (دحیەکەلبی) ، وە (صفیە ی کچی حوییني ئەختبی) بۆ خۆی برد دواتر ئازادی کرد ، هەروەها ئازاد کردنەکەشی کردە مارەیی بۆی ، ئینجا پاشان مارەی کرد و بووە بە موسلمان .

ئیتر ئەوە بوو پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) گەرایەوە بۆ مەدینە لە خەیبەر دەر چوو ، (صفیە) لە پشتی خۆی سوار کرد ، ویستی بی گواسیتەوە دواتر صفیە رازی نەبوو لە ریگادا بی گواسیتەوە ، ئیتر ئەوە بوو گەیشتنە شوینك پی دە ووترا (الصبهاء) لا یاندو (ام سلمە) هەلسا بە ئامادە کردنی (صفیە) پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) لەم جیگایە (صفیە) هاوسەری گوازستەوە ، بەلام پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) لە خەیبەر دەر نەچوو تاکو (صیفە )لە عادەی یان لە سووری مانگانە تەواو نەبوو . ئەگیرنەوە کە (صفیە ی دایکی موسلمانان) خەونیکی بینی بوو و لەخەویدا کە مانگیك دە کەویتە باوەشی ،ئەم خەونەش بۆ (ابی الحقیق) باس دەکات ، ئەویش شە پەزلەیەکی لە (صفیە) دابوو، ئەوات دە خوازی بە مولکی یثرب ، واتە : مدینە . بەلی ئەم خەونەی (صفیە) هاتەدی و (خوای گەورە) ریزی لی گرت بە هاوسەرگیری لە گەل پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) و بەلی (صفیە) ئەپەری ریزی لە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دە گرت ،ئەوە بوو لەلای ووشترەکەی دادەنیشت کە (صفیە )پی بخاتە سەری بۆ ئەوەی سواری ووشترە کە بیت ، بەلام (صفیە) ئەوەندە بە ئەدە ب ورەشت بەرز بوو بۆ خی سواری ووشترەکە دە بوو پیدەختا سەرپی بۆ ئەوەی پیغەمبەری خوا ئەم کارە نەکات ، چونکە زۆر ریزی و خۆشەویستی بۆ پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) کە بەهیچ ئەندازەیە ك پیوانە نەدە کرا .......!!

السنن الكبرى (١٣٨/٩) السير النبويه لابی شیبه (٣٨٣/٢) (٣٨٣/٢).

ئ

بەلی ( صفیە ی دایکی موسلمانان ) خۆی چەند بە سەر هاتیکی دەربارەی رەوشت بەرزی جوانی پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )دە گێریتەوە ، دەفەرموویت : کە پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بیستبووی ( عائیشە ) و ( حەفصە ) وو تبوویان کە ئەوان لە ( صفیە ) بەریز ترن لە لای پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) چونکە خیزان و ئامۆزای ئەون ، کاتیك ( صفیە ) ئەم قسانەی گەیاندە پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیەوسلم ) پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) بە ( صفیە )ی فەرموو : ئەی بۆ نەت ووت : چۆن لەمن چاکتر دە بن و من هاوسەرکەم پێغەمبەری خوایە ( صلی الله علیه وسلم ) ، وە باوکم ( هاروونە ( علیه السلام ) ، وە مامم ( موسی ) ( علیه السلام ) مەبەستی پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئە ئاینی جوولە کە کە ( هاروون و موسی ) یە چونکە جوولە کە خەیبەر خۆیان دە گەرانەدەوە سەر رەچەلە کی ( هاروون ) ( علیه السلام ) نەك رەچەلە کی ( مو سی ) ( علیه السلام ) .

بەلی ( صفیە ) زۆر پێغەمبەری خوای ( صلی الله علیه وسلم ) خۆش دەویست کە زیاتر لە خیزانەکانی تری ، وە زیاتر لە هەموو کەس کارە کانی پێغەمبەری خوا رادەپەراند و بەتایبەتی لە کاتی نەخۆشی پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەو کاتە کە گیانی پاکی سپارد ، ( صفیە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : بە پێغەمبەری خوام ( صلی الله علیه وسلم )ووت: لە کاتی نەخۆشیە کەیدا ، سویند بەخوا هیوا خوازم ئەو ئازارە ی لە تۆ دا هەیە لەمندا بوایە ..؟! ئیتر لەو کاتەدا خیزانە کانی پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) – خوا لی یان رازی بیت – تەماشای یەکتریان کرد ،یان چاویان لە یەکتر دا گرت ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ئاو لە دە م تان بکەن ،ئەوانیش ووتیان : لەبەر چی ..؟! فەرمووی : لە بەر تەماشاکردنی یەکتری و یان چاوداگرتن لە یەکتری دا ، سویند بەخوا ( صفیە ) راست دە کات . بەلی ئەووش فەزل و پلە و پایەی ( صفیە کچی حوییە نی کوری ئەختب ) گەورە پیاوی جوولە کەی خەیبەر ،ئینجا هاوسەر گیری ( صفیە ) ریزیکی گەورەی تیدا بوو ، چونکە کچی سەرۆك هۆزیکی جوولە کەبوو لە خەیبەر دا ، بۆ ئەووش بوو کە نەکەویتە لای کەسیك ریزی نەزانیت و نەیناسیت ، هەر بۆیە لای خۆی هیشتیەوە ، لەم بارەیەوە دلنەوایەکی تیدا بوو بۆ ( صفیە ) چونکە پاش ئەوەی باوکی میردەکەی پیشوی باوکی وە لە خزمانی لە فتح کردنی قەلای ( قموص ) کۆژرا بوون بەدەستی سوپایی ئیسلام ،بەلی ( صفیە ) لە رەمەزانی سالی ( ٥٠ ) ی کۆچی دا وەفاتی کرد ، لە سەردەمی ( معاویە ی کوری سفیان ) وە دەش لین لە سالی ( ٥٢ ) ی کۆچی دا بووە ژیانی دونیا بەجیهیشت . زاد المعاد ( ٣٢٨/٣ ) و السیر النبویە لابی شیبە ( ٣٨٥/٢ ).

ئ

**چواردەم :هەولی تیرۆر کردنی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) لەلایەن ژنیکی جوولە کە ی خەیبەر بە مەریکی ژهراوی ، کە بەفیل و خیانەت میوانداری کرد..**

بەلی ئەگەر ئیمە بروانین لە جوولەکەی خەیبەر ، لە رابردوو دا چیان کرد بە سوملمانان دا چۆن خیانە ت نەخشە کیشیان کرد بۆ سوپای ( الاحزاب ) کە ئەو شوینە بوو مەلبەندی نەخشە وپیلان و خیانەت بوو ،هیرش کردنە سەر خەیبەر کاریکی زۆر چاك و رەوا بوو ، هەر وەك جوولە کە کانی تریش وە ك ( بني نضیر ) و ( بني قوریظة ) و ( بني قینقاع ) ، ئەوانیش مافی ئەوە یان هە بوو کە هەموو لە سەریان بدریت و بکوژرین و چونکە هەر بە هەمان شویەی ئەوان خیانەتیان کرد ، نە ك نەکوژران بەلکو لە شوینی خۆیان مانەوە ،خەریکی کوشتوکالی خۆیان بوون ، بەوە مەرجەی کە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) بۆ دا نا بوون ، بەلام کەچی موسلمانا چاو پۆشیەکی زۆریان لە جوولە کەی خەیبەر کرد ، هەر وەها ئەوانیش نا پاکیان کرد کە مال سامانیا لە موسلمانان شاردەوە ، هەر لە سەر ئەمەش دەر نەکران و سزا نەدران ، دە بوایە لە خەیبەر نەبینین چۆلیان بکردایە بەلام لەوەش چاوپۆشیان لی کردن ، لە سەر کیگە کانی خۆیان و کشت و کالی خۆیان مانەوە ، بەلی سوپای ئیسلام لە خەیبەر پاسەوانی ئەوانی دە کردن ئەوانی نا پاکانە و بی وەفاو سپلە بوون ، هەولی تیرۆر کردنی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) دا بە ژەهر خواردن کردنی لە لایەن ژنیکی جوولە کەوە لە خەیبەر دا ، ئەم ژنە بە پیلانی چەند کەسیکی جوولە کە ئەم نەخشەیەی دارشت ، ئەم ژنە جوولە کەیە ( ناوی زینەبی کچی حاریس ) بوو ، کە برای ( مرحب ) بوو ، واتە : هەردووکیان باوکی و مامی لە یەکەم قەلادا کوژران لە قەلای ( ناعم ) هەروەها ئەم ژنە هاوسەری ( سەلامی کوری میکشەم ) بوو کە ئەویش لە ( نطاة ) کوژار بوو ، ئەم ئافەرتە بە هاوکاری چەند کەسیکی جوولە کەی سپلە و خیانەتکار و پیس بۆگەن ، دە چیت مەریك سەر دە بریت کە کوشندە ترین ژەهری ئەو سەردەمەی بەسەردا دە کات و ژهراوی دەکات ، بەلکو هەر کەسیك بی خوات خیرا بی کوژیت ..!! بەلی ژەهری بە مەرکە دا دەکات ، بەتاییەتی هەردوو رانی و قولی زیاتری پیدا دەکات ، چونکە ئەوەی زانی بوو کە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) حەز بەم دوو شوینەی مەر دەکات ، ئیتر مەرەکە دە بان بۆ خیوتەگەی موسلمانان لە خەیبەر دا ، بەسورکراوەیی دەی بات بۆ پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) بەدیاری ، چونکە پیغەمبەری لە ( صدقە ) ی نەدە خوارد بەلام لە دیاری ئەی خوارد .البخاري ی کتاب الجهاد ( ٧٩/٤ ) برقم ( ٣١٦٩ ).

ئ

بەلی پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) کاتی نویژی مەغریبی بە جی هینا ، گەرایەوە بنکەی سەرەکی خۆی فەرماندی سوپای ئیسلام لە خەیبەر دا ، ئەبینی وا ئافەرتیك لەویدایە ، لە نزیك کەل پەلەکەی دانیشتووە ، ئەویش پرسیاری لی کرد چی ئەویت ..؟! زنیب کچی حاریسی ) جوولەکە وەلامی دایەوە ووتی : ئەی (ابو القاسم ) !! دیاریە کم بۆ هیناوی ، ئەویش قبولی کرد فەرمانی دا لەدەستی وەرگرن ، پاشان مەرە ژهراویە کە خرایە بەردەمی هەندیك لە هاوەلانیش لە گەلی دا بوون ، پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) فەرمانی دا بە هاوەلان بینە پیشەوەو نانی ئیوارە بخۆن ..!! ئەوانیش هاتنە پیشەوە ، پیەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) دەستی بۆ قولە کەی برد تاکو لی بخوات و بارووبەکی بردە ناو دەمی پیرۆزی هەندیکی لی قووت دا ،هەروەها (بشیری کوری براء ) یش هەندیکی لی خوارد قووتی دا ، بەلی لەم کاتەدا خیرا پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) وە فەرمانی دا بەهاوەلانی کە بە پەلە دەست لەم خواردنە هەگرن فەرمووی : (( كفوا ایدیکم ،فان هذه الذراع تخبرني انها مسمومة )). واتە : دەست هەلگرن ، چونکە ئەو قولە هەوالی دامی کە ژهراوی کراوە ..؟!! (بشیر ) ووتی : سویند بەخوا منیش بەو کرد ، بەلام لەبەر ئەوەی کە خواردنەکە لە تۆ تیك نەدەم لەدەم نەهیناوە فرییدەم ، چونکە ئەوە م بەدەستی ئەوەوە دی نەفسی خۆمم لە تۆ خۆشەویستر دانەنا ..!! بەلی (بشیر ) لە شوینی خۆی هەل نەستا رەنگی رەش هەلگەرا ،بۆماوەی سالیك بەم ئازارەوە بەری کرد دواتر هەر لەسەر ئەم مەرە ژهراویە شەهید بوو ، هەندیکی تریش لە هاوەلان لە مەرە ژهراویە کەیان خوارد ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) پی فەرموون : کە کەلەشاخ بکەن واتە : خوین بەر بوون لە پشتی خۆیان ،هەروەها خۆشی کلە شاخی کرد ، (ابن قیم ) ئەلیت : پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) بۆ ماوەی چواردە سال بەئازاری ئەم مەرە ژەهراویە ژانی بۆ پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) هەبوو ، هەروەها( ابن قیم ) ئەلیت: ئافەرتەکەیان هینا لای پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) ئەویش پرسیاری لی دەکات بۆچی وات کرد ، ئەویش وەلامی دەداتەوە دەلیت : ویستم بتکوژم ..!! پیغەمبەری خواش( صلی اللە علیە وسلم ) دەفەرموویت : (( ما کان اللە لیسلطك علي )) .واتە : خوای گەورە هەرگیز تۆ زال ناکات بەسەرمدا ...!!

وەهەندیك رای جیاواز هەیە دەلین : ئەم ئافرەتە جوولەکەیە دوای مردنی (بشیر کوری براء ) ئەویش لە جیگەی ئەو دە کوژریتەوە ..!! زاد المعاد (٣/٣٣٦ ) صحيح البخاري بشرح فتح الباري (٩/١٥٩-١٩٦ )

ئ

## پانزەم : لەدوای فتح كردنی خەيبەر روونكردنەوەی هەنديك حوكمی شەرعی :

١-حەرام بوونی زير بەزير و زيو بەزيو بفرۆشريت تەنها كيش بەكيش نەبيت ،واتە : هەر دوو پاچە زيرەكە يان ئالتوونەكە وەك يەك بن لە كيش وەزن دا ، هەروەك لە ( فضالة ی كوري عبيده )وە – خوا لی رازی بيت – دەفەرموويت : ملوانكەيەكم كری بە ( ١٢ ) دينار كە زيرو مرواری سوری تيدا بوو ليم جيا كردنەوە سەيرم كرد زياتر لە ( ١٢ ) دينار دەكات ، ئەوەم بۆ پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) باس كرد ئەويش فەرمووی : (( لاتباع حتى تفصل )). واتە : نافرۆيشت هەتا لە يەك جيا نەدەكەيتەوە .اخرجه : مسلم ( ١٩٥٢ ) ، وابو داود ( ٣٣٥٢ ). هەروەها لە گيرانەوەيە كی تردا پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموويت : (( الذهب بالذهب وزنا بوزن )) واتە : زير بە زير كيشان يە ك وە زن بيت هە ردوو هاوتابن . اخرجه : مسلم ( ١٩٥١ ).

٢-قەدەغەكردنی چوونە لای جاريە يان ئافرەتی سك پر يان خاوەن ميرد تاكو عيدەی تەواو نەبيت .

هەروەك ئەفەرموودەيە ی پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموويت: (( من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يسق ماء زرع غيره )). زاد المعاد ( ٤/١٢٢-١٢٣ ) . و البخاري كتاب المغازي برقم ( ٤٢١٥ ). واتە: هەر كەسيك كە باوەری بە خوا رۆژی دوای هەبيت ، ئاوی خۆی نا خاتە ناو زەوی يە كی كەسكی تر دا ..!!

٣-قەدەغەكردنی ( رباء ) سووی زيادە ، لە ( ابو سعيدی خدری )وە ئەويش لە ( ابو هريره )وە – خوا لی يان رازی بيت – دەليت : پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پياويكی بە كارهينا لەسەر خەيبەر ، ئەويش جۆريكی لەخورمای هينا جنيبی پی دە ووترا ، پيغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئايا هەموو خورمای خەيبەر وايە ..؟! ووتی : نەخير . ئيمە هەنديك لەو خورمايە بەدوو هەندەی تر لە خورماكانی تر دەكرين ، پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : وا مەكەن خورما بە پارە بفرۆشن ،دوای بە پارەكەی خورمای جەنيب بكرن . البخاری فی كتاب المغازی برقم ( ٤٢٤٤ ).

٤-هاوسەرگيری ( زواج المتعه ) واتە هاوسەر گيری كاتی ، لە ( علی كوری ابی تاليب ) وە – خوا لی رازی بيت – دەليت : قەدەغەی كرد لەسەر مان كە ئافرەتان مارە بكەين بۆ ماوەيەكی ديار كراو.البخاری فی كتاب المغازی برقم ( ٤٢١٦ ).

٥- حەرام كردنی خواردنی گوشتی كويدريژ يان ( كەر ) . البخاری فی كتاب المغازی برقم ( ٤٢١٦ ).

ئ

٦- حەلال بوونی گۆشتی ئەسپ لە غەزای خەیبەر دا ، لە ( جابرە ) وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ لەرۆژی خەیبەردا لی حەرام کردنی کە گۆشتی گویدریژ بخۆین ، وە ریگەی دا بە خواردنی گۆشتی ئەسپ . البخاری فی کتاب المغازی برقم( ٤٢١٩ ).

٧-حەرام کردنی گۆشتی بالندەی چرنووکدار و بە دندوو قولاب یان بالندەی پیس خۆر وبۆ گەن خۆر هەروەها ،گیانداری مردارەوە بوو ، لە ( عرباضي کوری ساریە وە ) خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( أن رسول الله ( ﷺ ) حرم یوم خیبر کل ذي مخلب من الطیر و لحوم الحمر الاهلیة والخلیسة ، وهي ما یستخلص من السبع فیموت قبل ان یذکي والمجثمة وهي التي تصبر بالنبل )) . اخرجه : الترمذي ( ١٨٧٢ ) .واتە: پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە غەزای خەیبەر دا هە موو بالندەیەکی چرنووکدار و کەری مالی و ئە و ئاژەلە وبالندەی کە درندە دەی بات مەبەستی بازو ئەو بالندانەی کە گۆشتی پیس و بۆگەن دە خۆن دن دوگیان قولابە ،مرۆڤ لی دەستینی تەوە بە چەقۆ دا راناگات و دەمریت قەدەغەی کرد ،مەبەستی بالندە ئاژەلی مردارەوە بووە ئەوانەی نیشانەی لی دە گریت دواتر مردارەوە دەبیت .

هەروەها لە ( عبداللەی کوری عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( نهی ر سول الله ( ﷺ ) یوم خیبر عن اکل کل ذي ناب من السباع وعن کل ذي مخلب من الطیر والحوم البغال )). اخرجه : البخاري ( ٥٥٣٠ ) ، و مسلم ( ١٩٣٤ ) . واتە : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لە خەیبر دا قەدەغەی کرد لە گۆشتی ئاژەلی چرنووکدار و درندە وەك بازو ئاژەلەبالندەکانی گۆشت خۆر وە سیسارك ئەوانەی گۆشتی بۆگەن و پیس دە خۆن ، خواردنی ئەمانەی حەرام کرد بخوریت ،هەروەها گۆشتی هیستریش ..!!!

بیگومان هیستر جیاوازە لە گەل ئەسپ دا گۆشتی ئەسپی حەلال کرد بەلام هیستری حەرام کرد لە گەل گۆشتی کودریژ دا ...؟!بەلام پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) قەدەغەی گۆشتی کودریژی کیوی نەکرد لە گەل ئەسپ دا ، بەلام هەروەك حەرامی کودریژی مالی کرد لە گەل هیستر دا ..!!

اخرجه : احمد ( ٣/١١١ ) والدارمی ( ٢/٨٦ ) والبخاری ( ٢٩٩١ ) ومسلم ( ١٩٤٠ ) والنسائی ( ٧/٢٠٤ ) و ابن ماجه ( ٣١٩٥ ) ، والبخاری ( ٤٢١٩ ) والنسائی ( ٧/٢٠١ ) و ابن ماجه( ٣١٩١ ) ومسلم ( ١٩٤١ ) و ابن حبان ( ٥٢٧٢ ) و ابو داود ( ٣٧٨٩ ) و النسائی ( ٧/٢٠٥ ) و( ١٩٤٢ ) و ابن ماجه ( ٢٥٨٤ ) و مسلم ( ١٩٣٣ ).

ئ

## شانزەم : باسی ( حجاجي كورى عيلاط ) كە خە لكی شاری مككە بوو

( حجاجي كوری عيلاط ) خەلكی شاری مككە بوو و يەكيك لە گشتە كانی لە شاری مككە دەرچوو ، لە و كاتە بوو ، كە موسلمانان فتحی شاری خەيبەريان دەكرد ، هەروەها ( حجاجي كوری عيلاط ) ئەم هەوالەی زانی بوو كە سوپای ئيسلام گەيشۆتە خەيبەر ، ئەو پياوەش هاتە ريزی موسلمانەكان بەشداری غەزای خەيبەری كرد ، هەروەها ( ام شيبە كچی عومەيرە )يش هاوسەری بوو ، ئەم ئافرەتە خشكی ( موصعەبی كوری عومەيرە ) بوو ، ( حجاجي كوری عيلاط ) زۆر دەولە مەند بوو ، بەلام سامانەكە ی لا ی خۆی نەبوو، مال و سامانەكەی لای هاوسەرەكەی بوو ( ام شيبە كچی عومەيرە ) ، بەلی لە خەيبەر دا ( حجاجي كوری عيلاط )

دوای لە پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) كرد كە بگەريتەوە شاری مككە ، مال و سامانەكەی لەگەل خۆ بينی بۆ خزمەت كردنی ئاينی ئيسلام و پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەويش دوای لی كرد مۆلەتی پی بدات تاكو بگەريتەوە بۆ شاری مككە ،وە ( حجاجي كوری عيلاط ) ووتی : ئەی پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەگەر هاوسەركەم بزانيت من موسلمان بووم ، ئەوا هيچم لە مال سامانەكەم دەست ناكەويت ، هەروەها ووتی : ئەی پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) مۆلەتم پيدا بۆ ئەوەی هەنديك شت بليم كە بۆ ئەوەی هاوسەرەكەم رازی بكەم ..!! پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ماوەی پيدا كە چی ئەليت بلی . هەروەك لە ( موسى كورى عەقبە ) وە – خوا لی رازی بيت دەليت : ( كاتيك قورەيشە كان ئەم هەوالەيان بيست كە پيغەمبەری خودا بەنيازی دەرچوونە بەرەو خەيبەر سەريان سورما ..!! لەو كاتەدا كە هاو پە يمانيش بوون ، بەهۆی صولحی يان ريكەوتنی حوديبيە ، هەروەها قورەيشە كان بوون بە دوو كۆمەل كۆمەليكيان ئەيان ووت : محمد و هاوەلە كانی سەردەكەون كۆمەلە كەی تريش ئەيان ووت : جوولەكەكانی خەيبەرو ها پە يمانەكانی سەردەكەون ، هەروەها ( حجاجي كوری عيلاط ) بە نهينی موسلمان ببوو ، لە گەل پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بەشداری فتح كردنی خەيبەری كرد كە هاسەرەكەی ناوی ( ام شيبە ) بوو لە بنی عبدالداری كوری قوصی بوو ،كە لەهۆزيكی قورەيش بوو ، ( حجاجي كوری عيلاط ) سەر وەت سامانكی زۆری هەبوو، دەولەمەنديكی ناسراو بوو سەرچاوەی كانزای خاكی ( بنی سولەيم ) هەموو هی ئەو بوو ، دوای ئەوەی پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە گەل هاوەلانی سەر كەوت بەسەر جوولە كەكانی خەيبەر ، ( حجاجي كوری عيلاط ) لە خزمەت پيغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم ) دوای مولەت پيدانی كرد بۆ گەرانەوەی بۆ شاری مككە ، بۆ كۆكردنەوەو وەرگرتنەوەی مال سەروەت و سامانەكە .اخرجە : ابن حبان ( ٧٢١٢ ).

ئ

له (ئەنسی كوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : ( كاتیك پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فتحی خەیبەری كرد ، (حجاجي كوری عیلاط ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) من له شاری مككه مال و سامانیكی زۆر و پارەیه كی زۆرم هەیه ، به شیوه یەك بەشوو بلاوه هەندیكیان له لای بازرگانەكانی شاری مككه هەندیكی تریش لەلای هاوسەرەكەمه ، هەروەها هاوسەرەكەشم خەلكی شاری مككه یه هەر بەم هۆیەشەوە من خزم كەسم هەیه ، ده مەویت بچم بۆ لایان مولەتم پیده دەیت ..؟! هەروەها ریگەیەك بدۆزمەوە ، وه بەریزتان مولەتم پیدەدن كه له خزمەت بەریزتان مەرجیك بەلیم هیچ رەخنه و گەله یەكم لینا كەی ..؟! پیغەمبەری (صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : بلی . ئەویش ووتی : ریگەم پی دەدی هەرچی بلیم ..!! بۆ ئەوەی هەست پی نەكەن كه موسلمان بووم ..؟! پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) ریگەی پی دا كه هەرچی بلیت بی لی ..!! له ریوایه تیكی تردا له (ابن اسحاق )– خوا لی رازی بیت – ده لیت : (حجاجي كوری عیلاط ) دەلیت : رۆیشتم هەتا كو گەیشتمه نزیك شاری مككه له (ثنية البيضاء) چەند پیاویكی قوریشم بینی گوییان قولاغ كرد بوو ، بۆ دەنگو باس هەوالی جووله كەكانی خەیبەر ، پرسیاریان له بارەی پیغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم ) دەكرد تاكو هەوالیك ببیستن ئەوان زانیبوویان كه بەرەو خەیبەر رۆیشتووه ، هەروەها ئەو پیاوانه دەشیانزانی كه شاری خەیبەر باشترین خاك ئاوەدانی ناوچەی حیجازه لەرووی كشتو كال سەوزایی دارخورماوه ، هەروه ها قەلای دامەزراوی سەنگین به هیزی لی یه ، هەروه ها پیاوی شەركەریشی زۆره ، هەر بۆ یه تامەزرۆی هەوالی خەیبەری ان دەكرد ، وه پرسیاری خەیبەریان له هەموو سوار چاكیك دا ده كرد كه بەلایان دا تیپەری بایه ، (حجاجي كوری عیلاط ) ئەلیت : كاتیك منیان بینی ووتیان : ئەوه (حجاجي كوری عیلاط ) ، هەروەها (حجاجي كوری عیلاط ) ئەلیت : ئەوان به موسلمان بوونی من نەدەزانی هەوالییا پی نەبوو ، ئەوانیش به پەله چوونه لای (حجاجي كوری عیلاط ) ووتیان : وللاهی هەوالی پیبه دەی پیمان بلی ئەی باوكی محمد ئیمه پیمان گەیشتووه كه محمد به سوپاكەیەو بەرەو خەیبەر رۆیشتووه كه شاری جووله كه كان و ناچەی كشتو كالی حیجازه ، (حجاجي كوری عیلاط ) ئەوه منیش دەیزانم بەلام هەوالی ترم لایه كه جیگەی دل خۆشیه بۆ ئیوه ..؟! ئەوانیش خۆیان دەدا به تەنیشت ووشتره كەمەوه نزیك ده بوونەوه و ده یان ووت : ئی ده ی ئەم هەواله چیه ئەی حیجاج ..؟! منیش ووتم زۆر خراپ محمد و هاوەلانی تیكشكاون ، هەرگیز لەو شیوه تان له پیشتر لەم هەواله نەبیستووه ، ئەوەند هاوەلانی كوژراوه ،بەهیچ شیوەیەك كوشتنی ئاوا نەبووه ، وه محمدیش بەدیل گیراوه ، چۆن گیرانیك ئەوانیش ووتیان نایكوژین هەتا دەیدینەوه دەست خەلكی شاری مككه و تا له نا خۆیاندا بیكوژن له تۆلەی كه له پیاوه كانیان كه بەدەستی محمد و هاوەله كانی كوژراون بەم زوانەش محمد تان بۆ دینن بەدەستی خۆتا بی كوژن ، (حجاجي كوری عیلاط )دەلیت : وتم دەی یارمەتیم بده بۆ كۆكردنەوەی مال سامان و پاره كانم ،له شاری مككه بۆ ئەوەی له قەرزدارەكانی وەربگرمەوه ،دەمەویت بگەریمەوه بۆ خەیبەر بۆ ئەوەی بەم مال سامان پارەیه قازا نجیك بكەم لەو دەست

ئ

کەوتانە ی کە محمد و هاوەلە کانی لەخەیبەر بەجیان هیشتووە ، بەر لەوەی بازرگانانی تر بگە نە خەیبەر ،بۆ بازرگانی کردنی دەست کەوتەکانی جەنگی خەیبەر ، ئەوانیش زۆر بە پەلە رۆیشتن پارە و مال سامانەکەیان بۆ کۆ کردمەوە ، هەروەها ( حجاجي کوری عیلاط ) دەلیت : هاوسەرەکەم ئەم هەوالەی بیست هات مال سا مان پارە یەکی چاکم لادا نا بوو ها بۆ لام ، ( حجاجي کوری عیلاط ) ئەلیت : منیش پیم ووت: ئەوەی لە لاتە بۆم بهینە دەمەویت هەندی لە مەرە کانی محمد و هاوەلە کانی بکرم ئەوان سەر کە توو نەبوو و شکستیان خواردووە ، هەروەها سەر وەت مال سامانیا بووە بە دەست کەوت ، ئەم هەوالە بلاو بۆ وە لە هەموو شاری مککە دا ، کە سوپای ئیسلام و موسلمانان دووجاری ئازارو زیان و شکست بوونەتەوە ، هەروەها بی باوەران یان کافرانی قورەیش لە خۆشیا شادیان دەدەبری ئەم هەوالە گەیشت بە ( عباس کوری عبدالمطلب ) کۆرو مەجلیس دا بوو دووجاری سەرسورمانی حە پە ساوی بوو ، بەجۆریك نەیدەتوانی لە شوینی خۆیدا هەلسیت لە ( مقسم ) ە وە . هەروەها لە ( ئەنسەوە ) دەلیت : پاشان ( عباس ) مندالیکی کۆیلەی خۆی نارد بۆ لای ( حجاجي کوری عیلاط ) بۆ ئەوەی باش لە هەوالەکەی دلنیا بیت ، چونکە باوەری نەدەکرد ، ئەویش پی ووت : هاوار بۆ تۆ ئەوە چ هەوالیکت بۆ هیناوین وە چی دەلیت ..؟! ( خوای گەورە ) بەرلینی باشتر لە هەوالە کەی تۆ داوە ، ( حجاجي کوری عیلاط ) دەلیت : بە کویلە کەم ووت : سلاوی من بە ( ابو الفضل ) بگەینە وە پی بلی با ژووریکم لە مالەکەی بۆ ئامادە بکە چۆلی بکە کەسی تیدا نەبیت ، من دەیم بۆ لای با دلنیا بیت کە هەوالە کە بەجۆریکە دلی خۆش دەکات ، مندالە کە گەرایەوە کاتیك گەیشتە سەردەرگا کە ووتی : مژدەبیت ئەی ( ابو الفضل ) ئەویش لە خۆشی دا ناچەوانی مندالە کەی ماچ کرد ئەوەی کە ( حجاجي کوری عیلاط ) ووتبووی هەمووی بۆ باس کرد ئینجا لەدوەای دا ( عباس ) کۆیلە مندالە کەی ئازاد کرد لە بەری مژدانە خۆشەکەی ، بەلی ( حجاجي کوری عیلاط ) هەوالی دایە کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە تەواوەتی خەیبەری فتح کردووە مال سامان مولکیکی زۆری بە غەنیمەتی دەست کەوتووە ، بەشی خودای جیا کردۆتەوە پینج یەك دەستەکەتەکانی دابەش کردووە و هەروەها ( صفیه کچی حوینی کوری ئەختب ) بۆ تەهاوسەری پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) هەروەها ( حجاجي کوری عیلاط ) ئەلیت : منیش موسلمان بووم ،بەلام هاتوومە تەوە ئیرە بۆ مال سامان پارە پولە کە لەلای خەلکە دەمەویت کە کۆیان بکەمەوە لەگەل خۆم دە بگەریمەوە بۆ لای پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە منیش دوای مولەتم لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کرد کە ئەم هەوالە ناراستە بلاو بکەمەوە ، ئەوی راستە ئەم هەوالەیە کە پیت دەلیم ، وە دوای ئەوەی کە من بۆ م باس کردی تا سی رۆژ لە لای کەس نە ترکینی ...!!!

ئ

هەر وەها هاوسەرەكەی ( حجاجي كوری عیلاط ) هەرچی زیرو زیو پار مال وسامانی هەبوو بۆی كۆكردەوە دایە دەستی ( حجاجي كوری عیلاط ) پاشان زۆر بە پەلە و خیرا پارە و مالە كەی برد بۆی دەرچوو ، دوای سی رۆژ ( عباس ) هاتە لای هاوسەرەكەی ( حجاجي كوری عیلاط ) و پرسیاری لی كرد ووتی : هاسەرەكەت چی كرد ..؟! ئەویش پی راگەیاند لە فلان رۆژ و كات سات رۆیشتووە ..!! ( عباس ) ووتی : خودا خەمت نەداتی ، هەروەها هاسەری ( حجاجي كوری عیلاط ) بە عباسی ووت : بەشداری خەمتانین لەبەر ئەم هەوالە كە لە خەیبەر بەسەر محمد و هاوەلە كانی دا هاتووە ،بەلام ( عباس ) ووتی : سوپاس بۆ خوا هەوالە كە راست نیە ئەوە پراستە ئەوە یە محمد فتحی خەیبەری كردووە و كە( حجاجي كوری عیلاط ) ئەم هەوالەی پیدام ، وە تۆش ئەگەر پیویستیت بە هاو سەركەت مەبەستی ( حجاجي كوری عیلاط ) بوو و برۆ پی بگە ، پاشان ( عباس ) پۆشاكیكی جوانی لەبەر كرد گۆچانەكەی كردە دەست ئینجا هاتە دەروە رۆیشت هەتاكو گەیشتە ( كەعبە ) توافی كرد ، كاتیك بینیان ووتیان : ئەی( باوكی الفضل ) ، لەبەر كردنی ئەو پۆشاكە نیشانەی خۆ گریە ،بەرانبەر كارەساتیكی دلتەزین كە لەخەیبەر روویداوە ، پاشان ( عباس ) رۆیشت هەتا گەیشت كرو كۆری كۆمەلی قورەیش كاتیك بەلایاندا تی پەری دەیان ووت ، ئەی( باوكی الفضل ) هیوادارین خیر چاكە نەبیت دووچاری هیچ شتیكی تر نەبووبیت ، ئەویش ووتی : دووچاری هیچ دردو بەلایەك نەبووم تەنها خیرو خۆشی نەبیت سوپاس بۆ خودا ،هەرووەها ( حجاجي كوری عیلاط ) هەوالی پیدام كە محمد فتحی خەیبەری كردووە ، بە تەواوەتی باسە كەی بۆ روون كردنەوە كە( حجاجي كوری عیلاط ) بۆی باس كردبوو ، ئیستاش ( حجاجي كوری عیلاط ) وا لەخزمەت پیغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) دایە مال سامانەكە بردە بۆ خزمەت كردنی پیغەمبەری كەی ( صلى الله عليه وسلم ) پاشان قورەیشە كان ووتیان : ئەی خەلكینە دوژمنی خودا لەدەستمان دەرچوو وەللاهی ئەگەر دەمان زانی چیمان پی دەكرد ئەوندەی پینەچوو كە هەوالەكە یان بەوشیوە پیگەیشت ئەو خەمبارییە موسلمانە كانی مككە دووچاری ببوون بەهۆی هەوالە كە ئەو هەموو خەفەتە رووی كردەوە كافرانی قوریش ، خەم و خەفەت دای گرت بەم هەوالە راستە ی كە ( عباس ) بۆی باس كرد ، هەر وەها خۆشی شادی كەوتە ناو موسلمانەكانی شاری مككە ، ناخۆشی خەفەتباری دووچاری بی باوەرانی شاری مككە بوو ). اخرجه : احمد ( ١٣٨/٣ ).

ئ

## حەفدەم : گەرانەوەی کۆچ کەرانی ( حەبەشە )

لە کاتیکدا موسلمانان خەریکی سوپاس گۆزاری و شکورانە بوون لە ( خوای گەورە ) چونکە فتح کردنیکی زۆر گەورە یان بەدەست هیناو غنیمەتیکی زۆر باشیان بەدەست هینا لە خەیبەر دا ، خۆشی و شادیان دەر دەربی بۆ ئەم سەرکەوتنە گەورەیە ،هەر لەم کاتەدا خۆشیە کی تریش دەستی پیکرد ئەویش بەگەرانەوەی کۆچ کەرانی حەبەشە بۆ شاری مەدینە لە ناو کۆچ کەران دا ( جعفري کوري ابي طالب ) ی تیدا بوو ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وە موسلمانان بە هاتنەوەی ئەم کۆچ کەرانە خۆشی شادیە کەیان بوو بە دوو خۆشی و شادی ،هەر وەك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( ما أدري انا أسر : بفتح خيبر ، أم بقدوم جعفر ..؟ )) واتە : نازانم بە کامیان زیاتر شادمان ببم : بە فتحی خەیبەر ، یانە بە گەرانەوەی ( جعفري کوري ابي طالب ). هەر ئەوەش بوو پیغەمبەری خوا ﷺ بە گەرانەوەی ( جعفري کوري ابي طالب ) ناوچەوانی ماچ کرد .وە ئەوانەی گەرانەوەی لە حەبەشەدا ئەمانە بوون :

١-( جعفري کوری ابي طالب ) لە گەل هاوسەرەکەیدا و ( عبدالله ) کوریدا .

٢-( خالیدی کوری سعید کوری عاص ) لە گەل هاوسەرەکەیدا کور کچەکەی دا ، ( سعیدی کوری خالید ) و ( ئەمەی کچی خالید ).

٣-( عمری کوری سیعد کوری عاص ) دە کاتە برای خالید .

٤-( موعەیقیب کوری ابو فاطیمە ) ، لەسەردەمی خلیفە ( عمری کوری ختاب ) سەرو کاری ( بیت المال ) بوو .

٥-( اسودی کوی نوفلی کوری خوەیلید ).

٦-( جەهمی کوری قەیس ) و هەردوو کورەکەی ( عمرو ، خوزەیمە ).

٧-( عامیری کوری ابو وەقاص ).

٨-( عوتبەی کوری مەسعوود ).

٩-( حاریث کوری خالیدي کوری صخر ) .

١٠-( عیمانی کوری رەبیعە کوری ئوهبان .

بی گومان ئەمانە هەندیك لە ناوەکانی کۆچ کەرانی حەبەشەیە .

ئ

هەروەها لە (ابو موسى ئەشعەری ) – خوا لی رازی بیت - دەلیت : (( هاتینەوە بۆ شاری مەدینە لەو کاتەدا بوو کە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) خەیبەری فتح کردبوو )).اخرجه البخارى ( ٢٥٠٢ )، ومسلم ( ٢٥٠٢ ) و ابن حبان ( ٤٨١٣ ).

هەروەها لە گێرانەوەیەکی تردا ( جابر )- خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( کاتیك پیغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم ) تشریفیان هینایە شاری مەدینە لەدوای غەزای خەیبەر ( جعفري كوري ابي طالب ) هاوەلانی گەرانەوە لە حەبەشەدا )). و ابن حبان ( ٤٨١٣ ). بەلی ( ئەنس ) دەلیت : (( کاتیك لە شاری مەدینە نزیك بووونەوە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەوالی هاتنی کۆچ کەرانی حەبەشەی بە موسلمانان راگەیاند پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( يقدم عليكم غذا اقوام هم ارق قلوبا منكم )) . واتە : سبەینی خەلکانیکتان پیدەگەن و دین بۆ لاتان لە ئیوە دل نە مترن بۆ ئە ئاینە .

زاد المعاد ( ٦١٩/٣ ) بەلی کاتیك ( جعفر ) ئامۆزای پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) گەرایەوە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) باوەشی پیدا کردو ، وە زۆر خۆشحال بوو بە گەرانەوەی ، لە ( جابر ) وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( کاتیك جعفر گەرایەوە لە حەبەشە دا ، پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەستی لە ملی کردوو باوەشی پیدا کرد )). اخرجه ايعلى ( ٣٨٩/٣ ) برقم ١٨٧٦.

هەروەها فەرمووی : (( ما أدري انا أسر : بفتح خيبر ، أم بقدوم جعفر ..؟ )) )) واتە : نازانم بە کامیان زیاتر شادمان ببم : بە فتحی خەیبەر ، یانە بە گەرانەوەی ( جعفري كوري ابي طالب ). اخرجه : الطبراني في الكبير ( ١٠٨/٢ ) والشيخ الباني فقة السيرة ( ٣٧٩ص ).

بی گومان وەك لە گێرانەوەی کی تردا (( کاتیك جعفر گەرایەوە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پیشوازی لی کردوو هەر کە چاوی پیکەوت ناوچەوانی ماچ کرد .اخرجه : ابو داود ( ٥٢٢٠ ) ، والبيهقي في الدلائل ( ٢٤٦/٤ ).

ئ

# ڕووداوه كانی سالی هەشتەمی كۆچی

بەلی یەكیك لە ڕووداوەكانی سالی هەشتەمی كۆچی ، كە بووە مایە دل خۆشی سەر كەوتنی یەكجار گەورەی سوپای موسلمانان ، هەروەها لاواز بوونی سوپای قورەیش ، كە ئەویش موسلمان بوونی سی پالەوانی ناوداری سوپای قورەیش كە ئەو سی فەرماندەیە هاتنە ریزەكانی سوپا ئیسلام و موسلمان بوون :

١-خالیدی كوری ولید

٢-عمری كوری عاص

٣-عثمانی كوری طلعة

**خالیدي كوری ولید :** یەكیك لە فەرماندەكانی سوپای قورەیش بوو ، فەرماندەی سوار چاكەكانی قورەیش دەكرد ، پیش تر ئەم فەرماندەیە دوژمنی سەر سەختی سوپای ئیسلام بوو ،دوای ئەوەی كە سوپای ئیسلام وردە وردە گەشەی كرد و ، بەهیز بوو ، وە واقیعیەتی خۆی لە ناوچە كە هینایە كایەوە ، وە بۆشیان دەر كەوت ئەوەی كە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دە لی هەر هەمووی واقیعەو راست و دروستە ،هەر وەك ( خالیدی كوری ولید ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :كە من چوومە شاری مەدینە موسلمان بووم پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەم چەند رستیە ی فەرموو: (( الحمد الله الذي هداك ، قد كنت ارى لك عقلا رجوت الا يسلمك الا الى الخير )).ابن كثير :البداية والنهاية (٢٧٨-٢٨٠ص). واتە : ستایش بۆ ئەو خوایەی ، كە تۆی هیدایەتدا عەقلیكم بە تۆوە دەبینی ئومیدم وابوو ، كە ئەو عقلەت تەنیا بەرەو شتی چاكەت ببات ، ( خلیدی كوری ولید ) دەلی : ووتم : وەك خۆت دەزانی من زیانم بۆ ئیسلام زۆر بووە ، بە تاییەتی لە كاتی غەزای ئوحودا ، دەبیت دوای لی خۆش بوونم بۆ لە خوا بكەی ، پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( الإسلام يجب ما كان قبله )) واتە : ئیسلام پیش خۆی هەموو دەسریتەوە .

ئ

**عمری کوری عاص :** بەلی ئەو پیاوە پەنای قورەیش بوو، چونکە هەر کاریك و گیر و گرفتیك هە بایە قورەیش پەنایان بۆ ئەبرد ، ئەمەش بە هۆی ژیری و زیرەکی سەلیقەی خۆی بوو ،کە درە کی بە هەموو کاریك دا دەکرد شی دەکردەوە دەی خەملاند ، هەروەها ( عمری کوری عاص ) — خوا لی رازی بیت — خۆی بۆمان دە گیریتەوە دەلیت : دەستم برد بیعەت بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بدەم ، پیغەمبەری خواش ( صلی الله علیه وسلم ) دەستی هینا و بەلام دەستم کیشا یەوە ..!!

پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : بۆ دەستت کیشا یەوە ..؟!

ئەلیت : منیش ووتم : مەرجم هەیە ..؟! ئایا ( خوای گەورە ) لیم خۆش دەبیت ..؟! چونکە من زۆر زەرەرو زیانم بە ئیسلام گەیاندووە ..!! ئەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (( أعملت أن الإسلام يهدم ماكان قبله ؟! وان الهجرة تهدم ماكان قبلها ؟! وان الحج يهدم ماكان قبله ..؟! )) . رواه مسلم ( ٣١٧ ). واتە : ئایا نەبیستووە ئیسلام پیش خۆی دەرووخینی ، گوناهو تاوان دەسریتەوە و لای دەبات ، کۆچ کردن لە پیناوی خوادا پیش خۆی دەرووخینی ، وە حەج پیش خۆی دەسریتەوە و لای دەبات .....!!!

**عثماني کوري طلحة :** بەلی ئەو پیاوە کلیلی ( کەعبی ) پیرۆزی بەدەستەوە بوو ، ئەوە بوو لە گەل ئەو دو پیاوەی تر کە ( خالیدی کوری ولید )و ( عمری کوری عاص ) بە یەکەوە بریار دە دەن کە موسلمانان بن ، بەلی هەر سی کیان بە یەکەوە چوونە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) موسلمان بوون ، ( ابن کثیر ) بداية والنهاية ( ٢٧٦-٢٨٠ص ) . هەروەها ( حافظ ) دەفەرموویت : راسترین بۆ چوون لەسەر ئەوەی کە موسلمان بوونیان دوومانگ بەر لە غەزای ( مؤتە ) بوو . لە گیرانەوەیەکی تردا هاتووە کە ( عمری کوری عاص ) - خوا لی رازی بیت - لە حەبەشە موسلمانان بووە لەسەر دەستی ( جعفري کوري ابو طاليب ).اخرجه : ابو يعلى ( ٧٣٥٢ ) و ، البزرا ( ١٧٤٠ ) و البيهقى فى الدلائل ( ٢/٢٨٥ ).

ئ

## سريەی ( غالیبی كوری عبدالله ) بۆ ( قودەید )

ئەم سريەی لە ( الرحيق المختوم )لە ( ص٣٩٧ ) كە لە ( ٢٠٠ ) سەد پیاو بوون ، بەلی ئەم سريە بۆ سەر ( بنی ملەوەح ) كە تیرەیەك بوون لە( بنی لیث ) ئەوانە خاوەنی هیزیكی گەورە بوون ، مە ترسی ئەوە یان لی دەكرا كە هیرش بكەنە سەر شاری مەدینە ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وای بە چاك زانی كە پالەوانانی ئیسلام هەلمەتیك بۆ سەر ئەو هۆزە ببن و تەمی یان بكەن هیچ كات بیر لەوە نەكەنەوە كە هیرش بكەنە سەر شاری مەدینە، ئەوە بوو لە مانگی صەفەری سالی هەشتەمی كۆچی دا بوو ، ئەم سەریە دەرچوون لەشاری مەدینە ، رۆیشتن هە تاكو گەیشتنە ( قودەید ) لە سەر رووخی دەریایی سووردا ، هەر لەم شوینەدا توشی پیاویك بوون بەناوی ( حاريثي كوری ماليكي كوري بورصا ) هەر لە ترسی ئەوەی نەوەك سخوری بۆ دوژمن بكات بە دیل گرتیان ، هەر چەندە ئەو بۆ موسلمان بوون ها تبوو ، كە ئیوارەیان لی دا هات ، یەكیك لە موسلمانەكان دەنیرن بۆ هەوال زانین ، پیاوە موسلمانەكەش سەر دە كەویتە سەر گردۆل كەیەك لە ویدا پال دە كەویت ، پیاویك لە خیوتەگە كەوە دیتە دەرەوە بە ژنەكەی دەلیت : بە خوا وا دیارە رە شایەك بە سەر ئەو گردۆكە وەیە ، بزانە صەگەكان بۆ چی نەوەریون ؟! یان هیچ مەشكەیان نەبودوویت ..؟! ژنە كەش ووتی نەخیر . پیاوەكە ، كابرای خیوتگەكە تیریك دە گریتە رەشایەكە ، لە پیاوە موسلمانە كە ئەدات وە پی ئەكەویت ، ئەویش خیرا تیرەكە دەر ئەكات و جوولە لە خۆی دەبری ،ئیتر تیری دووهەمی تی ئەگریت ئەویشی لی دەدات ، بە ژنكەی دەلی : ئەگەر گیان دار بوایە دەجوولا ، چونكە هەردووكی لیداوە ، پیاوە موسلمانەكەش دەنگ نا كات هە تاكو دینا تاریك ئەبیت ، ئینجا هەلمەت دە هینە سەریان هەندیكیان لی دە كوژن ، وە هەندیكیشیان لی بەدیل دە گرن ،وە مەرو مالاتەكەشیان بە غەنیمەت ئەبەن ، هەوال دە گاتە خەلكەكەو دوای موسلمانەكان دە كەون ، بەلام هەر لەم كاتەدا ( خوای گەورە ) فالاو زریانیكی گەورەی هەگیرساند دۆلە كە پر بوو لە ئاو لافا ، نەیان توانی بپەرنەوە ، هاوالانی سویندیان خوارد كە لەمەو پیش باران هەرەتریشقەی وامەن نەبینی بوو . ( الرحيق المختوم ) ( ٣٩٧ص ).

ئ

## سریەی ( شجاعی کوری وەهب ) بۆ ( هەوازین )

بەلی ( هەوازین ) یەکیك لە و هۆزە بەهیزانەی ناوچەی حیجاز بوو ،بۆ هەمیشە لە هەلیك دە گەران بۆ دەست وە شاندان لە موسلمانەکان ، هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ماوە ماوە تاقی دەکردنەوە ، بەهەلمەت بردنە سەریان ترسی ئەبردە دلیانەوە ، تاکو هیچ کات بیر لە هیرش کردن بۆ سەر موسلمانان نەکەنەوە ، هەر چەند ناوچەی هەوازین زۆر دوور بوو ، سوپای ئیسلام هیرشیان دە کردە سەریان ، چونکە هەوازین زۆر بە هیز بوون ، ئەوە بوو گەورە ترین جەنگیان لە گەل سوپای ئیسلام دا ئە نجامدا ئەویش جەنگی ( حونین ) بوو ، کە لە سەردەمی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کە سوپای ئیسلام ( ١٢٠٠٠ ) هەزار بوون ، وە سوپای هەوازین ( ٢٠٠٠٠ ) هەزار بوون .

بەلی لە مانگی رەبیعی یەکەم دا لە سالی هەشتەمی کۆچی دا ، پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) سریەکی ( ٢٠ ) کەسی بۆ ناردن کە ئەمیری ئەم سریەیە ( شجاعی کوری وەهب ) بوو ، بۆ ناوچەی ( بنی عامری هەوازین ) لە رۆژ هەلاتی شاری ( طائیف ) ، بەلی ( شجاع کوری وەهب ) بەریکەوت بە شەو ئەرۆیشتن بەرۆژ خیان حەشاردەدا ، تاکو لە ناکاو بگەنە سەر ناوچەی دوژمن هەلمەت بەرن نەهیلن دوژمن دەست بکەنەوە ، هەر ئەوەش بوو لە کاتی بەربەیاندا هەلمەتیان بردو ،بەسەریانداداان و ، مەر مالاتیکی زۆرو سامانیکی زۆریان دەست کەوت ، بەلام تووشی هیچ کوشتاریك نەبوونەوە ، چونکە پیاوەکانیان رایان کرد شەریان نەکرد هەلهاتن ، بەلام هەندیك ئافەرتیش بەدیل گیرا کەوتە دەست موسلمانەکان ، ئەوانیش لە گەل ئەو غەنیمەتە زۆرە هینایانەوە بۆ شاری مەدینە ، لەم هەلمەتەدا نزیکەی ( ١٥ ) رۆژیان پی چوو ، هەرئەوەش بوو لە ( بنی عامر ) کۆمەلیکیان هاتنە شاری مەدین موسلمان بوونی خۆیان راگەیاند ،دەربارەی ئافرەتە دیلە کانیش پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دوای لە ( شجاعی کوری وەهب ) و پیاوەکانی کرد ، کە ئەو ئافرەتانە بگەرینەوە بۆ کەس و کارە کانیان ، ئەوانیش مل کەچی فەرمانەکەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بوون . الرحیق المکختوم ( ٣٩٨ص )

ئ

# جەنگی موئتە و رووداوەکانی

## یەکەم : هۆکارو کات و شوێنەکەی:

ئەم جەنگە یەکێك بوو لە رووداوە گرینگەکانی سالی هەشتەمی کۆچی دا ، بەلی ئەم جەنگە بە گەورەترین جەنگی خویناوی دادەنریت ، لەسەردەمی پیغەمبەری خودا دا لە گەل دوژمنانی ئیسلام دا کردیان ، کە ئەم جەنگە بووە هۆی ئەوەی کە سوپای ئیسلام سام و ترسیان لە ئیمپراترۆیەتی رۆمی یان قەیصری رۆم بشکیت ،هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە دەست بە فتح کردنی وەلاتانی ژیردەستی ئیمپراتۆریەتی رۆم بکریت ، بەلی (موئتە ) گوندیکە لە ناوچەی (بولقاء ) کەلەوەلاتی ئوردنی ئیستایە ،لە سنووری وەلاتی شامدا و کە لەویدا شمشیری زۆر چاك دروست دە کرا ، دووقۆناغ دەمینی بۆ (بیت المقدس ) .بەلی ئەم جەنگە لە جمادی یەکەمی سالی هەشتەمی کۆچی دا روویدا بەرانبەری بە ئۆگستۆس سالی٦٢٩ زاینی دا بوو ، وە (بولقاء) ناوچەیە کە لە نیوان (شام ) و (الوادی القری ) کە پایتەختی شاری عومانە ، وە گوندیکی زۆرو باخ و باخاتیکی زۆری هەیە ،زەویەکی بەرفرەوانی هەیە .بەلی ئەوە بوو عەرە بەکانی وەلاتی شام جەنگیان هەلگیرسان لە نیوان موسلمانان و بیزەنتەکان چونکە هەردوو هۆزی (کلب ) و (قضاعة ) لە نزیك (دومە الجندل ) بوون هەمیشە کۆسپیان دورست دەکرد بۆ موسلمانان لەریگەی ریگە گرتن لە بازرگانانەی کەلوپەلیان دەهینا لە وەلاتی شامەوە بۆ شاری مەدینە ، بۆیە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە سالی پینچەمی کۆچی دا غەزایەکی کردە سەر (دومە الجندل ) بەلام ئەوام بەلاوەیان لی کردبوو ، هەروەها ریگەش گیرا لە (دحیە الکلبی ) لە کاتی گەرانەوەی وەکو نیردراوی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم )، بۆیە سریەی (زیدی کوری حاریسە ) نیردرا بۆ یەکلاکردنەوەیان لە سالی شەشەمی کۆچی دا ، وە هەردوو هۆزی (مذحج) و ( قضاعة ) دەست دریژیان دە رکردە سەر موسلمانەکان ئەو دەست دریژیەش لە دوای ریکەوتن نامەی حودیبیە و یان پە یمانی حودیبیە زیادی کرد پاش کوژرانی (حاریسی کوری عمیری الازدي ) هەروەها رەوانەکراوی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) بۆ لای فەرمانرەوایی (بوصری ) کە سەر بە رۆمەکان بوو ، هەروەها فەرمانرەوایی دیمەقش کە شامی ئیستای پی دەلین ،ئەویش بە شیوەیەکی ناشرین پیشوازی لە نیردراوەکەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کرد ، بە نیردراوەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ ووتم : کە هیرش دە کەنە سەر شاری مەدینە ، هەر لەدوای سالیکیش هەندیك لە هاوەلانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە ناوچە کەدا شەهید کران ، کە رۆیشت بوون بۆ بازرگانی کردن و بانگەوازی کردنی ئاینی ئیسلام وەلاتی شام دا .الطبراني في التاريخ (٣/٣ ) و (المسلمون والروم ي عصر النبوة ) (٨٧ص ) عبدالرحمن احمد سالم .

ئ

هەر چەندە جەنگی موئتە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەشداری تیدا نەکردووە ، بەلام ئەم غەزایە لە جمادی یەکەمی سالی هەشتەمی کۆچی دا روویداوە ، ژمارەی موسلمانەکان کە (٣٠٠٠) هەزار جەنگاوەر بوون ، لەم جەنگە دا ، هۆ کارە کەش ئەوە بوو وە لە سەروە دا باسمان کرد ، عەرە بەکانی ژێر دەست هەلاتی رۆمەکان لەوەلاتی شام و ئەوانەی فەرمانرەوایی رۆمەکان بوون لە وەلاتی شام ،دوای ئەوە کە ئەوانەی لە ژێر دەست هەلاتی رۆم دا بوون ، جەند کردەوەیەکی دوژمنکارانەیان ئە نجامدا بەرانبەری بە موسلمانان لەناچەکانی ژێر دەستی هەلاتی رۆمەکان ،ئەوە بوو جەند کەسیکیان شەهید کرد لە هاوەلان دواتریش کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نیردراوەکەی خۆی رەوانەکرد بۆ وەلاتی شام بۆ فەرمانرەوایی (بوصری) کە (شەرحەبیل) بوو ، کە سەرکردەیەکی سەر بە رۆمەکان بوو ، ئەویش نیردراوەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کوشت شەهیدی کرد ، هەر بۆیە ئەم هەلویستە دوژمنکاریانە پیویستی بە وەلامدانەوەیە کی پر بە پیست هەبوو ، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ویستی بە دوژمنانی ئیسلام بلیت : کە موسلمانان هەرئەوە نین کە لەوەلاتی خۆیان دا بە جەنگ و غەزا بکەن بەلکو هەر کەسیك هەر وەلاتیك دەست بۆ ئیسلام دریژ بکات ئەوا ئیسلام و سوپا کەی دەستی بی دەگات ، ئەگەر لە قولایی خاکی خۆیانیشدا بیت ، هەر بۆ ئەم مەبەستەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سوپایەکی (٣٠٠٠) جەنگاور پالەوانەکانی سوپایئیسلامی ئامادەکرد بۆ ئەم جەنگە ، کە سی فەرماندەی بۆ ئەم سوپایە دەست نیشان کرد ، هەروەك لە (عبدالله ی کوری عمر) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( لأمر رسول الله (ﷺ) في غزوة مؤتة (زيد بن حارثة) فقال رسول الله (ﷺ) : إن قتل (زيد) ف (جعفر) ، وإن قتل (جعفر) ف (عبدالله بن رواحة) رواه البخاري غزوة مؤتة (٤٢٦١) واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای موئتە دا (زید کوری حاریسە) کردە ئەمیریان ، وە ئامۆگاری کردن ، کە ئەگەر (زید) شەهید بوو ، ئەوا با (جعفري کوري ابو طالب) ببیتە ئەمیریان ئەگەر (جعفر) شەهید بوو ، ئەوا با (عبدالله ی کوری رواحە) ببیتە ئەمیریان .

بەلی کاتی رۆمەکانیش ئەم هەوالە یان بیت کە سوپای ئیسلام بە نیازی هەلمەتی هیرش کردن بۆ ئیمپراتۆریەتی رۆمان ، ئەوانیش بە سەرکردایەتی (هیرقل قەیصری رۆم) (١٠٠٠٠٠) هەزار جەنگاوەریان کۆ کردەوە ، وە جەندها کەسیشیان لە عەرەبی بە کری گرتە کۆکردەوە ، کە ئەوان بەکری گیراوی رۆمەکان بوون .ابن هيشام فى السيره النبويه (٢١٠/٤ ).

ئ

## دووەم : بەریکەوتنی سوپای ئیسلام بۆ موئتە :

بەلی کاتیك سوپای ئیسلام ئامادە بوو ، پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) و هاوەلان بەریان خستن ، دواتر پارانەوە لە ( خوای گەورە ) کە سەریان بخات بەسەر گاورەکانی ئیمپراتۆری رۆمەکان وە بە سەر بەرزی سەرفرازی بیان گیریتەوە .ابن هیشام فی السیرە ( ٢١/٤ ). بەلی دە گیرنەوە ئا لەو کاتەدا ( عبدالله ی کوری رەواحە ) – خوا لی رازی بیت – دەستی کرد بە گریان ، بەلی خەلیکی زۆر سەرسام بوون بە گریانەکەی ،ئەویش فەرمووی : سویند بەخوا دونیام خۆش ناویت ، بەلام گویم لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بوو ئایەتیکی لە قورئان دەخویندەوە : ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا﴾ مریم ٧١ . ئیوە ( خەلکینە ) کەستان نی یە تیپەر نەکات بەسەر دۆزەخدا ، ئیمانداران بۆ ئەوەی قەدری بە هەشت و رەحمەتی خوا بزانن ، کافران بۆ ئەوەی بکەونە ناوی ئەم پیشهاتە بریاردراوە هەرچی جیبەجی دەکریت . بەلی ئینجا ( عبدالله ی کوری رواحە ) چەند دیرە شعریکی خویند .هەروەها لە گیرانەوەیەکی تردا هاتووە لە ( عبداللەی کوری زیدە ) وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) لەگەل سوپای ئیسلام رۆیشت تاگەیشتە ( ثنیة الوداع ) فەرمووی : (( استودع الله دینكم وأماناتكم وأخواتیم اعمالكم )) . اخرجە : ابو داود ( ٢٦٠٠ ) و ابن حبان ( ٢٣٧٦ ) . واتە : خۆتان و ئاینە کەتان و کۆتای کردەوەکانتان بە خوای گەورە دەسپیرم .بەلی لە دوو گیرانەوە هاتووە دەربارەی ( عبدالله ی کوری رواحە ) ئەو کاتەی کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) سوپای ئیسلام دەنیریت بۆ ( موئتە ) ئە و کاتە ( عبدالله کوری رواحە ) دوا کەوت لە سوپا هەروەك لە گیرانەوەی یەکەمدا ( ابن عباس ) دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) سوپاکەی نارد بۆ ( موئتە ) ..!! ( عبدالله ی کوری رواحە ) دواکەوت نویژی هەینی لە خزمەت پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دا ئە نجامدا ، پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی: بۆ چی دواکەوتی ..؟! ئەویش ووتی : بۆ ئەوەی نویژی هەینی لە خزمەت تۆ دا بکەم ، پیغەمبەری خواش ( صلی الله علیەوسلم ) فەرمووی : (( لغدوة او روحة في سبيل الله خير من الدنيا وما فيها )). اخرجە : البخاري ( ٢٧٩٣ ) و مسلم ( ١٨٨٣ ).

ئ

هەروەها لە گێرانەوەی دووەم دا هاتووە : (( کە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ( عبدالله ی کوری رواحەی لە گەڵ سوپاکە ی نارد هاوکات بو لە گەڵ رۆژی هەینی ، هاوەڵانی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) هەر هەموویان رۆیشتن بەڵام ( عبدالله ) ووتی : من دوا دەکەوم نوێژی هەینی لە خزمەت پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەکەم ،( عبدالله ) دەڵیت : ویستم نوێژی هەینی لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم پاشان بگەمەوە بە سوپای ئیسلام ،وە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ئەگەر هەرچی لە زەویدا هەیە ببیە خشی ناگەیتەوە بە خیر و چاکەی زوو چوونە دەرەوەیان بۆ غەزا )).اخرجه : احمد (١٩٦٦) و ، الترمزی (١٦٤٩) . لە گێرانەوەیەکی تر دا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : (( والذي نفسي بيده لقد سبقوك بابعد مما بين المشرق والمغرب في الفضيلة )).اخرجه : الطبراني في الكبير (٢٠/١٥٧) سنن الترمذي (٢/٤٠٦). هەروەها لە کاتی بەری کردنی سوپای ئیسلامدا ( عبدالله کوری رواحە ) بە پێغەمبەری خوای ( صلى الله عليه وسلم ) ووت : فەرمانیکم بەسەر دا بدا تا لیتی وەر بگرم ..!! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (( إنك قادم غدا بلدا السجود فية قليل ، فأكثر السجود )) واتە : بەیانی دەچنە وەلاتیك سووجدە بردنی تیدا کەمە ، تۆ سووجدەی زۆر بۆ خوای گەورە ببە .هەروەها ( عبدالله کوری رواحە ) ووتی : بۆم زیاد بکە ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەویش فەرمووی : (( اذكر الله ،فإنه عون لك على ما تطلب )) واتە : یادی ( خوای گەورە ) بکە چونکە ئەو یاد کردنە بۆ هەموو داوایە کت کۆمەك و پشتیوانتە .......!!

بەڵی لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەر سی فەرماندە و یان هەرسی ئەمیرە کەی سوپای ئیسلامی دیاری کرد ، پیاویکی جوولە کە کە ناوی ( نعمانی کوری فنحەص ) بوو هات ووتی : یا ئەبو القاسم !! ئەگەر تۆ پێغەمبەریت ، زۆر و کەم جەند کەس ناوی بهینی ئەوا هەموویان ئە کوژرین ، مەبەستی لە سی ئەمیرە کەی سوپا بوو ، هەروەها جوولە کە ووتی : چونکە پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل کە کەسیکیان ئە کردە ئەمیری کۆمەلیك ، پاشا پیان ووتوبایە ئەگەر فلان کوژرا ، ئەوا نای (١٠٠) کەس بهینرایە هەر هەموویان دە کوژران ، پاشان بە ( زیدی ) ئەمیریشی ووت : وەصیەت بکە ئەگەر محمد پێغەمبەر بیت ئەوا هەر گیز ناگەریتەوە ..!!وە ( زید ) ووتی : منیش شاهیدی دەدەم کە پێغەمبەری خوایە راست گۆیە و پیاو چاکە ، شایانی باسە سی ئەمیرە کە ( جعفر ) و ( خالید ) و ( عبدالله ) بوون ..!!

هەروەها ( خالیدی کوری ولید ) سی مانگ بوو ، شایە تمانی هینا بوو ، ببوە ئیسلام هاتە ناو سوپای ئیسلام ، کە نازناوی ( سیف الله ) پیبەخشرا لە لایەن پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ...

ئ

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليەو سلم ) بە سی ئەمیرە کەی فەرموو (( أوصيكم بتقوى الله وبمن معكم من المسلمين خيرا ، اغزوا بسم الله في سبيل الله فقاتلوا من كفر بالله ،لا تغلوا ،ولا تغدروا ،ولا تقتلوا وليدا )). رواه البخاري ومسلم .واتە: ئامۆژگاریتان ئەکەم کەلە خوا شەرم بکەن و لە گەل ئەو موسلمانانەی کە وان لە گەلتان دا بەچاکی بجوولێنەوە .. بەناوی خواوە ، لە پێناوی خوادا غەزا بکەن .. کوشتاری ئەوان بکەن کە باوەریان بە خوا نیە ، بەلام ناپاکی و غەدر مەکەن و منال مەکوژن ..؟! پاشان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) بە فەرماندەی گشتی سوپای فەرموو : (( وإذا ليقت عدوك من المشركين فادعهم الى إحدى ثلاث، فأيتهن ما أجابوك إليها فأقبل منهم واكفف عنهم ..أدعهم الى الدخول في الاسلام .فإن فعلوا فأقبل منهم واكفف عنهم . ثم ادعهم الى التحول من دارهم الى دار المهاجرين .فإن فعلوا فأخبرهم أن لهم ما للمهاجرين وعليهم ما على المهاجرين. وإن دخلوا في الإسلام واختاروا دارهم فأخبرهم أنهم يكونون كأعراب المسلمين .يجري عليهم حكم الله ، ولا يكون لهم في الفي ء ولا في القسمة شيء إلا أن يجاهدوا مع المسلمين ،فإن أبوا فادعهم الي إعطاء الجزية ، فإن فعلوا فأقبل منهم واكفف عنهم ،فإن أبوا فاستعن بالله وقاتلهم ،وستجدون رجالا في الصوامع معتزلين فلا تتعرضوا لهم ،وستجدون آخرين للشيطان في رؤوسهم مفاحص فاقلعوها بالسيوف .ولا تقتلن امرأة ولا صغيرا مرضعا ولا كبيرا فانيا ،لا تغرقن نخلا ولا تقطعن شجرا ولا تهدموا بيتا )).سنن الكبرى البيهقي (٩١/٩) ،و رواه: البخاري ومسلم .واتە : ئەگەر تووشی موشریك کافران و دوژمنانی خوا بوون ، ئەوا سی ریگەیان بۆ دیاری بکەن ، جا ئەوان کامە ریگەیان هەلبژارد تۆ ئەویان لی وەرگرە ،وە دەستیان لی بگرەوە ..!! یەکەم : بانگیان بکە بۆ ئیسلام بوون ..!! جا ئەگەر موسلمان بوون لی یان وەرگرەوە دەستیان لی مەدە ..!! پاشان داوایان لی بکە لە مال و مەنزلی خۆیان کۆچ بکە بۆ لای ئەوانەی کۆچیان کردووە ..!!جا ئەگەر وە هایان کرد ئەوا هەوالیان پی راگەیەنە هەموو مافیکی کۆکەریان هە یە ..!! هەموو ئەر کیکی ئەوانیش لەسەر شانیانە ..خۆ ئەگەر موسلمان بوون ،وە ویستیان لە ناچەی خۆیان بمیننەوە ،ئەوا بە وینەی دەشتە کی یەکان موسلمانەکان حوکمی خۆیان بەسەردا جی بەجی دەکریت ..!!لە دەست کەوت و یارمەتی دان بەشیان نادریت ..!! مەگە بەشداری جیهاد و تی کۆشانی سوپای ئیسلام بکەن ..!! دووەم :ئەگەر موسلمان نەبوون ، ئەوا داوایان لی بکە جزیە بدەن ..!! جا ئەگەر ئەو هایان کرد لی یان وەرگرە دەستیان لی مەدە ..؟!!!!

سی یەم :ئەگەر ملیشان بۆ جزیە دانان نەدا ..!! ئەوا پشت بە خوا ببەستن کوشتاریان بکەن ، جا کەسانیك لە پەرستگاکان خەریکی خواپەرستین ئەوا دەستیان بۆ مەبەن ..!!بەلام هەندیکی تر ئەبینن کەشەیتان لە تەوق سەریان دا هیلانەی کردووە ، ئەوانە بەشمشیر لە ملیان بدەن ..!!وە ئافرە ت و مندالی ساوا وە پیری بەسالاچوو نەکوژن .. !! دارخورما پانەکەنەوە درخت نەبرن .. !!وە مال منەنزل نەروخینن .. !!

ێ

## سی یەم : گەیشتنی سوپای ئیسلام بە مەیدانی جەنگ :

بەلی سوپای ئیسلام لە شاری مەدینە بەریکەوت بە رەو خالی ( البقاء ) لەویدا بۆ یان دەرکەوت کە ژمارەی سەربازانی رۆمەکان ( ١٠ ) هیندەی ژمارەی سوپای موسلمانانە ، هەندیکیان کەوتنە دوو دلیەوە و ویستیان کە لە شوینی خۆیاندا بمینەوە و دامەزراو بن و نەجوولین وە دوای هاوکاری پشتیوانی زیاتر بکە ، بەلام لەو کاتە ناسکە دا کە ژمارەی سوپای رۆم بە راورد ناکریت بە ژمارەی سوپا بچکۆلانە کەی ئیسلام ، ( عبدالله کوری رەواحە ) کەوتە هاندان جۆشدانی سەربازانی سوپای ئیسلام بۆ جیهاد تی کۆشان کردن لە پیناوی زاتی ( الله ) کە رووبە رووی ئەم دوژمنە ببنەوە کە ژمارەیان ( ١٠ ) هیندەی سوپای ئیسلام ، ئەوە بوو سەربازانی ئیسلام وازیان لە دوو دلی هیناو بریاریاندا کە روو بەرووی ئەم دوژمنە زۆرە ببنەوە ، وە بەیعەتی مردنیان دا لە پیناوی زاتی ( الله ) پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) سەر بەرزی سوپای ئیسلام ، هەر لەم بارەیەوە کە ( عبدالله ی کوری رواحە ) کەوتە هاندا و جۆشدانی سەربازانی سوپای ئیسلام ، بە دیرە شعرە کانیەوە ، هەروەها فەرمووی :ئەی خەلکینە ئیوە لەسەر دلتان گرانە ئەوەیە کە بۆی دەرچوون ئەویش دواکردن و گەران بۆ بەدەست هینانی شهیدی ئیمە ناچەنگیین لەگەل ئەو خەلکەدت بە زۆری ژمارەی هیز و توانا سەربازیمان ئەم شەرەیان لە گەلدا دەکەین بە و ئاینەی کە خوا ریزی لیگرتوون پیی کە ئیسلامە کەواتە هەستن با برۆین ئیمە تەنها دوو شتمان لا مەبەستە یان سەرکەوتن یا شەهید بوون، هەروەها ( زیدی کوری ئەرقەم ) دەلیت : من هەتیو بوون لە مالی ( عبداللەی کوری رواحە ) دەژیام لەو دەرچوونە لە گەلی بووم لەسەر شتوومەکی ووشترەکەی دانیشتبووم ،وەللاهی لە شەویکدا دەرۆیشتین کە گویم لی بوو ئەم دیرە شعرەی خۆی دە خویندەوە دەی فەرموو :

إذا إديتني وحملت رحلي      مسيرة اربع بعد الحساء

فشأنك انعم وخلاك ذم      ولا ارجع الى اهلي ورائي

واتە : ئەگەر نزیك یان کردمەوە ئەم گەشتە هەلی گرتم ماوەی چوار رۆژ لەدوای ئەو ریگا بەردەلانە پلەو پایەت بەرزەو ژینیکی پر نازو نعمەتە رزگارت دەبیت ،وە زەم کراو دەبیت ئەو کەسەی بە پیچەوانەت هەلسوکەوت وەرگریت دوای ئەمە ناگەریمەوە ناو کەس و کارم ..؟!

( زیدی کوری ئەرقەم ) دەلیت : وەللاهی کە گوییستی ئەو دوو دیرە شعیرە بووم خۆم پی رانەگیرا دەستم کرد بە گریان ، ئەویش بە قامچیە کەی دەستی بەزەردەخەنەوە لیدام و فەرمووی : ئەوە چیە کورە بەلاتەوە ناخۆشە ( خوای گەورە ) شەهادەت بەمن ببە خشیت و وە تۆش لە سەر گوپلە ی ووشترە کەمەوە بگەریتەوە .

ئ

( عروه ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : سوپای ئیسلام رۆیشت تاگەیشتە سنووری ( البقاء ) کە گەیشتین بە سوپای بی ژماری ( هیرقل ) قەیصری رۆم ، هەروەها عەرەبەکانیش لە ئاوەدانیە ك لە ئاوە دانیە ( البقاء) بوون پیان دە ووت ( مشارف ماب ) پاشان دوژمن لیان نزیك دە بوونەوە ، وە سوپای ئیسلام لای دا بۆ گوندیك کە پی دە ووترا : ( موئتە ) کە نزیکەی ( ١١٠٠ )کم لە شاری مەدینەوە دوور بوو ، هەر دوو سوپا لە ویدا روو بەرووی یەکتر بوونەوە و خەلکە کە خۆیان سازدا خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ کردن لە گەل ئەم ژمارە زۆرەی رۆمەکان ، ئەوە بوو لە لای راستیانەوە کەسیکی ( بنی عوزرە ) یان دانا کە بەناوی ( قوتلەبەی کوری قوتادە ) بوو – خوا لی رازی بیت – وە لە لای چە پیشەوە کەسیکی ئەنصاریان دا بەناوی ( عوبادەی کوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – . هەروەها ( موسى کوری عوقبە ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : رۆیشتین هەتا گەیشتین بە ( کوری ابو بصرەی غسانی ) لە ( موئتە ) ژمارەیەکی زۆر لە گاورە کانی رۆم عەرەب لە گەلیاندا بوو ، وەك : هۆزەکانی ( تەنوخ ) و ( بەهراء ) هەروەها ( کوری ابو بصری ) دەر گای قەلاکەی بۆ ماوەی سی رۆژ لەسەر موسلمانەکان داخست پاشان چوونە دەرەوە بۆ ناو پارچە زەویەکی شینایی کوشتووکالی ، وە روو بەرووی یەکتر بوونەوە جەنگیکی زۆر سەخت دژوار یان لە گەل یەك دا کرد )

اخرجه : البيهقي فى دلائل النبوه ( ٣٦٤/٤ ) . هەروەها لە ( عوره )وە – خوا لی رازی بیت – دە لیت : ( زیدی کوری حاریسە ) بە ئالاکەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) چووە مەیدانی جەنگە کە کەوتە شەرکردن ، هە تاکو کەوتە سەر زەوی بە هۆی رم تیرو شمشیری گاورە کانەوە ، پاشان ( جعفری کوري ابو طالب ) ئالاکەی سوپای ئیسلام گرتە دەست ، کەوتە شەر کردن لە گەل دوژمناندا ، کوشتاریکی زۆری رۆمەکانی کرد ، هەتاکو جەنگە کە پەری سەند ، دواجار دەورەیان دا ئەویش لە ئەسپە کەی دا بەزی کە ئەسپیکی سوور باو بوو ، شمشیریکی لیدا کوشتی ئینجا بە پیادە کەوتە شەر کردن لە گەلیاندا هەتاکو شەهید بوو )). اخرجه : ابن هشام فى السير ( ٣٣١/٣ ) ، والطبراني في التاريخ ( ٣٨/٣ ) و البيهقي في الدلائل( ٣٦٠/٤ ).هەروەها لە گیرانەوەیەکی تردا لە ( کەسیکی بەنی موورەی کوری عوف ) دە گیرنەوە دەلیت: ( و للاهی لەبەر چاومە ئیستاش لەو کاتەی کە دەوری ( جعفري کوري ابو طالب ) دا ئەویش لە ئەسپە سووربباوەکە هاتە خوارەوە و شمشیریکی لە ئەسپە کەی داو کوشتی ،ئینجا بە پیادە شەری لە گەلیاندا کرد هە تاکو شەهید بوو ، دەلیت : ئای لە خۆشی نزیك بوونەوە لەو بەهەشتەی کە بۆنی خۆشە وە ئاوەکەشی سازگار و فینکە )). اخرجه : ابو داود ( ٢٥٧٣ ) ، وابن ابى شيبه ( ١٩٧٥٩ ) ،والتبرانى فى الكبير ( ١٤٦٢ ) و ( الحافظ ) فى فتح ( ٦٥١/٧ ) .

ئ
کاتێك ( جعفري کوري ابو طالب ) شەهید بوو ( عبدالله کوری رواحە ) ئالاکەی هەڵگرت بەرەو پێشەوە دەرۆیشت بەسەر ،ئەسپەکەیەوە دڵ دەرونی هەنیدك شتی بۆ دروست کرد، هەندی دلە راوکی دوو دلی رووی تیکرد پاشان کەوتە سەرزەنشت شکاندنی نەسی خۆی بەم دوو دیرە شعرە فەرمووی :

اقسمت يا نفسي لتنزلنه طائعة او لتكرهنه

مالي أراك تكرهين الجنة إن اجلب الناس و اشد والرنة .

واتە: سوێند لی دەخۆم ئەی نفس دەبیت بۆیان دابەزینە مەیدان بە خۆشی خۆت بی یان بە زۆرداری ،بۆ دەبینم بە هەشتت لاناخۆشە لەکاتیك دا دوژمن هێرشی هیناوسەرمان بە هاواری گران پاشان دابەزی لەئەسپە کەی .اخرجة : ابن سعد في الطبقات(٣/٨٢). لە کاتەی دا بەزی لە ئەسپەکەی کورە ملکیەکە هاتە خزمەتی پارچەیەك گۆشتی بۆ هینا و پی ووت : ئەمەبگرە با ئاهیکت بیتەوە بە بەردا تۆ ئەم چەند رۆژە دوچاری نارەحەتی برسیتیەکی زۆر بووی هیچت نەخواردوە ئەویش لەدەستی وەر گرت وە قە پیکی لە گۆشتەکەدا و پاشان گوێی لە هەراو گرمەی جەنگە کە بوو ، خەلکەکە کەو تبوونە شەری یەکتری ،ئەویش فەرمووی : تۆ هیشتان لەدونیای ئینجا گۆشتەکەی فریدا ،شمشیرەکەی هەلکیشا و چووە پیشەوە ، کەوتە شەر کردن هەتا ئەویش شەهید بوو ، دوای ئەو ( ثابت ی کوری ئە رقە م ) یەکیکە لە بنی عەجلان فەرمووی : ئەی خەلکینە ریکەون لە ناو خۆتان یەکیکتان بکەن بە ئەمیری خۆتا ..؟! خەلکە کەش ووتیان : خۆت ببە بە ئەمیر و پێشەوامان ،ئەویش فەرمووی : من ئەو کارە ناکەم . ( ثابت ی کوری ئە رقە م ) ئالاکەی دایە دەستی ( خالیدی کوری ولید ) ئەویش فەرمووی : بۆچی دەیدتە دەستە من ..؟ فەرمووی : تۆ شارە زاتری لە جنگ و شەر کردن پیلان دانان و نەخشەی جەنگی ..!! ئەوە بوو خەلکە کە رازی بوون کە ( خالیدی کوری ولید ) ببیتە ئەمیری موسلمانان لەم جەنگە دا ، کاتێك ئالاکەی هەڵگرت کەوتە رووبەروو بوونەوەی گاورەکان بەرگری کردن لە موسلمانان .ئا بەم شیوەیە ( خالیدی کوری ولید ) ئالاکەی سوپای ئیسلامی وەرگرت کەوتە شەر کردن ، وە کوشتاری گاوەر کانی قەیصری رۆمەکانی کرد ئەو رۆژ رۆر رۆژیکی سەختی جەنگ کردن بوو لە گەل گاورو دوژمنانی ئیسلام ،بە لی جەنگیکی زۆر سەخت بوو ، هەتاکو شمشیرەکەی دەستی ( خالید ) شکا . ( خالید ) – خوا لی رازی بیت ) خۆی لەم بارەیە دەفەرموویت : (( لە جەنگی ( موئتە ) دا ( ٩ ) شمشیر لە دەستم دا شکا ،هیچ شمشیریك لەدەستم دا خۆ نەدەگرت هەتاکو شمشیریکی یەمانیان بۆ هینام )).اخرجه : البخاری ( ٤٢٥٦ ) ابن هشام فی السیر ( ٣/٣٣٢ ) والطبراني في الاوسط ( ١٦٤٥ ) .

ئ

بەلی لەم رۆژە دا لە (موئتە) سوپای ئیسلام شەریکی یەکجار سەختیان ئەنجامدا ، کە بەهیچ پیوەریك مەزەندە نەدە کرا ، کە بەجۆریك دەست کەوتیان دەست خست ،دوژمنیان تووشی زەرەو زیانیکی یەکجار زۆر کرد کە بەهیچ شیوەیە ك بۆ دوژمن چاوەر وان کراو نەبوو ،کەلە گیرانەویە کی (عوفی کوری مالیك ئەشجەعی) بۆ مان پیشت راست دەکاتەوە دەلیت : من بەشداریم کرد لە سەریەی (زیدی کوری حاریسە) – خوا لی یان رازی بیت – دەلیت : من هاوشانی برا موسلمانەکان رۆیشتم بۆ جەنگی (موئتە) کە سیکی هۆزی (عمیر) بووە هاوریم کە وەك کۆمەکی هاوکاری هۆزی (عمیر) لە وەلاتی یەمەنەوە هاتبوونە پال سوپای ئیسلام ، لەم جەنگە دا لە گەلمان دا بوو ، هیچ چەك تاقیکی پی نەبوو تەنها شمشیریك نەبیت ، کە سیك لە موسلمانەکان جەندی ووشتری سەر بری بوو بۆ خواردن ، کابرای یەمەنی دوای کرد هەندیك لە پیستە کەی پیبدات ئەویش پی بەخشی ، زۆری نەبرد کە پیستەکەی لی وەرگرت شیوەی قەلغانیکی لی دروست کرد ،رای خست لەسەر زەوی لی گرا هە تاکو ووشك بوو ،وە پاشان دەسکیکی بۆ کرد لە شیوەی قەلغان ریکی خست ئینجا رۆیشتین رووبەرووی گاورە کان بوونەوە کە رۆم و عەرەبە کانی خیلە کانی (قضاعة) بوون شەریکی سەختیان لەگەلدا کردین ، لە ناو مەیدانی شەرەکەدا کەسیك هەبوو لە رۆمەکان ئەسپیکی سووربیاوبوو زینی ئەسپەکەی پشتوین و شمشیرەکەی بە زیرو ئالتوون پۆشی بوو ، بەسەر خەلکەکەوە دەهات دە چوو ،هانی خەلکەکەی دەدا بۆ جەنگ و شەر کردن لە گەل موسلمانەکان ، پیاوە یەمەنیە کە ئەو کەسەی لە (بنی عمیر) هاتبوو خۆی بۆ مەلاس کرد لە پشت بەردیکی گەورە دا بۆ سەی بۆ دانا ، پیاوە رۆمەیە کەش بەلای دا تیپەری ، لە پشتەوە بەشمشیر کیشای بە پشتی پیاوە رۆمیەکە ، ئە سپە کیە بەرداویە پیاوە رۆمەیەکەی بەردایەوە و دایە بە شمشیر هەتا کوشتی ، ئینجا چەك تفاقی و ئەسپە کەشی هینا و هاتەوە ئەو هەموو زیرو ئالتوونەی چەك تفاقەی وە ئەسپەی کابراو هەر هەمووی هینایە خزمەت (خالید کوری ولید) کاتیك (خوای گەورە) فتحی سەر کەوتنی بە موسلمانەکان بەخشی (خالید) ناردی بەدوای پیاوە کەی (بنی عمیر) کە خەلکە کە شایەتیان دا بۆ ئەوەی کە ئەوپیاوە یەمەنیە رۆمیە گاورە کە ی کوشتووە و دەست کەتەکانیشی هیناوە ،(خالید) هەندی لە دەست کەوتەکانی پی بەخشی ،هەندیکی تریشی نەدایەوە تاکو گەرایە وە لا هاوریکەی کە (عوفی) بۆی باس کرد (عوفیش) پی فەرموو: بگەریوە لای با ئەوەی تریش بداتەوە ،ئەویش چووە خزمەتی بۆ ئەوەی بیداتەوە بەلام نەی دایەوە، دواتر (عوف) رووێش هە تا گەیشت خزمەتی (خالید) فەرمووی : (خالید) ئەوە چیە ..؟! باش بزان کە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەست کەوتی هەموو کوژراوەکەی داوە بە بکوژە کە ..؟! (خالید) فەرمووی : راستە . ئەویش ووتی : ئەی چی ریگرتە کە کەل وپەلی کوژراوی دەستی خۆی بۆ بگەریتەوە پی ببەخشی ،(خالید) ووتی : بەلام من ئەم شتانە بەزۆر دە زانم بۆ ئەم پیاوە ،(عوفیش) ووتی : یان ئەوە تا بۆی دە گەرینیەوە یان ئەوە تا بۆ پیغەمبەری خوا باس دەکە م بۆی دە گیرمەوە ، (خالید) رازی نەبوو کەل پەلە کانی بداتەوە ..!!(عەوفیش) فەرمووی : وللاهی ئەگەر پیغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم)

ئ

بینی بۆی دە گیرمەوە و بۆی باس دەکەم )). اخرجه: مسلم (١٧٥٣ ) والبيهقي (٦/٣١٠ والطبراني ي الكبير(١٨/١٨٥).

بەلی دوای شەهید بوونی (عبدالله کوری رواحه ) ئالای سوپای ئیسلام دەکەویتەدەستی (خالیدی کوری ولید ) ئەو پالە وانە کە بەسیف الله ناسراوە دەبیتە ئەمیری موسلمانان ، ئینجا (خالیدی کوری ولید ) لەو کاتە ناسکەدا ئەو بەر پرسیاریەتە ئەخاتە ئەستۆی خۆ ی ، خالید هەستا بەدانانی نەخشەیەکی سەربازی بۆ ئەوەی دوژمنەکان هەلخەلە تینی و سەریان لی بشیوینی دوژمنانی خۆی بترسینی وەك تاکتیکیکی سەربازی شیوەی رووبە روو بونەوەکەی دەگۆریت بۆ جی گۆر کی کردنی سوپای ئیسلام ، هەروەك جی گۆر کی کردنی راست چە پی سوپای ئیسلام ،بۆ ئەوەی سوپای گاورە رۆمەکان بزانن کە سوپای ئیسلام هیزی پشتیوانی بۆ هاتووە ، وەك هیزی پشتەوەی سوپای گۆری هینایە پیشەوە ، پاشان پشتەوە شی هینایە دواوە و وە کۆمەلیك سوارچاکی لەدەروە دادەنیت و پیان دەلیت : کەئیمە هیرشمان کرد ، ئیوەش لەگەلماندا هیرش بکەن . ابن هشام فی السیره (٤/١١٢) صحیح البخاری المغازی (٤٢٦١)و البدایه والنهایه ابن کثیر (٤/٢٨٩ ). بەلی رۆمەکانی قەیصر کە ئەو نەخشیەی یان ئەو تاکتیکەی (خالیدی کوری ولید ) دە بینن ئەوان دەلین : دیارە موسلمانەکان کۆمەك و پشتیوانیان بۆ هاتووە ، هەر بۆیە زۆر دە ترسین شپرزە دەبن ،دوای ئەوەی کە ژمارەیە کی زۆری رۆمەکان دە کوژرین موسلمانان زۆر بە دامەزراوی دەجەنگان و دەرسیکی زۆر چاکی گاورە رۆمەکانی قەیصریان یان هیرقل یان دا ، ئەوە بوو کە ریگا بۆ موسلمانەکان کرایەوە کە وردە وردە پاشە کشە بکەن ئەمەش بەهۆی (١٠) بەرانبەری زۆری ژمارەی سوپاوە بوو ، چونکە لە سەرتادا رۆمەکان دەیان ویست ئابلوقە یان گەمارۆی موسلمانەکان بدەن چوار دەوریان بگرن کۆمەل کوژیان بکەن ، بەلام بە هی لیهاتووی زیرەکی ئەمیری موسلمانان (خالیدی کوری ولید ) ئەوگەمارۆیەی لەسەر سوپای ئیسلام بوو نەما وردە وردە بەروە باشەوە دە کشانەوە ،وە زەبریکی کوشندەیان لەدوژمن دا ،لەدویشدا ئەو سوپا زۆرەی رۆمەکان نەیان توانی بەدوای موسلمانەکان بکەون سوپای ئیسلام بەرەو شاری مەدینە گەرایەوە سوپا زۆرەکەی رۆمەکان نیش گەرانەوە جەنگەکە کۆتای هات ، هەروەك لە صحیح بخاری دا هاتووە دەلیت : (خالیدی کوری ولید ) – خوالی رازی بیت - فەرموویەتی : لەو رۆژەدا نۆ شمشیرم لەدەستمدا شکا ، تەنیا یەك شمشیری (یەمانی ) نە بیت لەدەستمدا خۆی راگرت . صحیح البخاری (٤٢٦٥).

ئ

## چوارەم : كۆتـايى جەنگى ( موئته )

بەلی سوپای ئیسلام بە وورەیەکی پۆلاینەوە توانیان دلیرانە خۆراگرانە دامەزراوانە بەرانبەر لەشکری یەکجار زۆر بی ژماری رۆمە کان دان بەخۆدا بگریت یەك رۆژی رەبەق توانیان پالەوانانە بجەنگن و خۆراگر بن بی چەك تفاق پشتیوانی بی خۆراك برسیەتی وەستانەوە بەرانبەر ئیمپراتۆریەتی رۆمەکان کە نیوەی خاکی سەر زەوی لە ژیر دەست دا نیوەی مولکی زەوی خاکی ئەوان بوو ، هەروەها چۆنیەتی نەخشەکەی ( خالیدی کوری ولید ) بە تیر تەسەلی لە ابن قیم لە زاد المعاد( ١٧٣/٢ ) باس دە کات یان ابن هشام السیرە دا ( ٣٣٤/٣ ) باس دە کات . بەلام لە راستیدا موسلمانان سەرکەوتنیکی یەکجار گەورەیان بەدەست هینا هەروەك ( موسی کوری عوقبە ) – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : ( خوای گەورە دوژمنی دوچاری نتیکشکان کرد وە موسلمانەکانی سەر خست بەسەریاندا ). ابن هشام فی السیرە ( ٣٣٤/٣ ) و البیهقی فی الدلائل النبوە ( ٣٦٤/٤ ) و الواقدی فی المغازی ( ٧٦٤/٢ ) .هەروەها ( زوهری ) هەمان بۆچوونی هەیە دەفەرموویت : ( خالیدی کوری ولید ) بووە فەرماندەی موسلمانان و خوای گەورە فتح و سەرکەتنی پی بەخشین و بەسەر رۆمەکاندا سەری خستن ) . وە ابن هشام فی السیرە ( ١٨٣/٣ ). بۆ بشت راست کردنەوەی سەرکەتنی سوپای موسلمانان ئەوەیە کە البیهقی لە الدلائل النبوە ( ٣٧٥/٤ ) دەلیت : موسلمانەکان سەر کەوتن بەسەر موشریکە رۆمەکان عەرەبە کانیان موشریکەکان دوچاری شکست و دۆران بوون ، وە ئەو فەرموودەیەی ( ئەنسی کوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – کە لە پیغەمبەری خوا ﷺ گیراویەتەوە دەفەرموویت : (( ... ثم خالد بن والولید من غیرە امرة ففتح الله علیه ( وفي راویة ) حتی فتح الله علیهم ، هذا یدل علی ظهورە علیهم والله أعلم بالصواب )). اخرجە : البخاري ( ١٢٤٦ ) البیهقي في الدلائل ( ٣٧٥/٤ ). پاشان ( خالید کوری ولید ) بەبی راویژیکی گشتی کرا بە ئەمیر ئالاکەی گرتە دەست ( خوای گەورە لە سەر دەستی ئەو رزگاری کردن و سەرکەوتن ) .ئەوە بە لگەیە لەسەر ئەوەی کە ( خوای گەورە ) سەری خستوە و موسلمانەکان زال بوون بەسەریان دا ( خوای گەورە ) زاناترە بەراستی ئەم جەنگە.

ئ

هەروەها ابن كثير له (البداية والنهاية(٤/٤٨٤-٤٨٧ ) دا بەوردی باسی سەرکەوتنی جەنگی (موئته ) دەکات لە گەڵ موشریکەکان گاورە رۆمیە کانی هیرقل .

راستی رووداوەکە بە و جۆرە بوو کە موسلمانەکان کەلە رۆژی یەکەمدا تاکۆتایی رۆژە کە پالە وانانە جەنگ و کوشتری گاورە کانیان کرد ، تاکو ئیوارە داهات و تاریکی شەو دای گرت ، (خالیدی کوری ولید ) توانی سوپای ئیسلام لە یەکتر جیا بکاتەوە گۆرانکاری بەسەر پەلەو پایە کانی سوپای ئیسلام بهینی وەك باسمان کرد دەستەیەکی لە سوپا پاشە کشە پی بکات ، وە دەتیە کی تریشی هینا پیشەوە وبۆ ئەوەی لە بەرە بەیان دا دەنگ و هەراو بلاو بیتەوە کە دوژمن وا بزانیت کە موسلمانەکان پشتوانیان بۆ هاتووە ...!!

بەلی کەبەیانی داهات (خالید کوری ولید ) فەرمانی بە سوپای ئیسلام کرد هیرش ببە نە سەر دوژمن هەلمەتیکی خیرایان بردە سەر دوژمن و رۆمەکانیان شپرزە کردو زەرە و زیانیکی زۆریا لیدان ، بەلی کاتیك رۆمەکان ئەمەیان بینی وایان زانی موسلمانەکان پشتوانیان بۆ هاتووە ، ئیتر ئەوانیش بەرە بەرە وورەیان نەماو کەوتنە تەمەلی خۆ دواخستن ، لەوەی کە هیرشە کەیان بە چری دریژە پی بدەن کەوتنە بەرگی کردن لە خۆ ، واتە هیزی هیرش بەردنیان نەما تەنها بەرگریان لە خۆ دەکرد لە بەرهەلمەتی پر چری موسلمانان ، بەلی وەك باسمان کرد ئا لەو کاتەدا (خالید ) کەوتەکیشانەوەی هەردوو بالی سوپای ئیسلام بالی چەپ بالی راست ،کاتیك سوپای ئیسلام لە دوژمن دوور کەتەوە و رزگاریان بوو ، ئەوکشانەوە یە خۆی لە خۆی دا وە ك فتح کردن وا بوو بۆ موسلمانە کا ،چونکە ووتمان (١٠) بەرانبەر هیزی موسلمانەکان بوون رۆمەکانی هیرقل ، بەلی ئەم بەسەر کەوتنیکی یەکجار گەورە دادەنریت لەمیژووی سوپای ئیسلام دا .الواقدی فی المغازی (٢/٧٦٤) و الرسول القائد باب المعارك خالد (ص١٧٣) زە رەرو زیانی موسلمانان وەهانە بوو بەراورد بکریت بە رۆمەکان تەنها (١٢) شەهید یان (١١) شەهید درا لەم جەنگەدا .ابن هشام فی السیره النبویه (٣/٣٤٢)و لابن حزم فی جوامع السیره (٢٢٠). بەلی لە (ابو قتادە )وە – خوا لی رازی بیت- دە فەرموویت : (... پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان وە فەرمووی : (( اللهم هو سیف من سیوفك فانصر )) (وفی راویه ) فانصر به فیومئذ سمي خالد سیف الله )). واتە :

ئەی خوایە گیان ئەو شمشیریك کەلە شمشیرەکان تۆ سەری بخەیت . لە گیرانەوەیەکی تردا موسلمانان سەر بخە بە هۆیەوە لەو رۆژە وە خالید ئیتر بە (سیف الله ) شمشیری خوا ناسراوە .

اخرجه : احمد (٢٢٥٥١، ١٧٥٠) صحیح علیشرط مسلم و ابن حبان (٧٠٤٨) و ابن هشام في السیرة (٣/٣٣٣)و بان كثير في البداية والنهاية (٤/٤٨٠ ) والبخاري (٤٢٦٠- ٤٢٦١-٤٢٦٢). و (الرسول القائد ) المحمود شيت خطاب (٢٠٦)

ئ

## پێنچەم : باس کردنی جەنگە کە لە لایەن پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) هەروەها گەرانەوەی سوپای ئیسلام ماتەمینی بۆ شەهیدەکانی جەنگی ( موئتە )

بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ دەنگ و باسی جەنگە کەی بۆ خەلکی شاری مەدینە باسکرد ،هەروەها هەوالی شەهید بوونی هەرسی ئەمیرە کەی پیدان ، وە دوای لە هاوەلان کرد کە دوای لی خۆشبوونیان بۆ بکەن ،وە برۆن بۆ بە هانا چوونیان و فەریاکە وتنیان ئەم ووتانەی پیغەمبەی خوا ﷺ لە چەند گیرانەوەیە دا هاتووە لە وانە : لە ( ئەنسی کوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : (( پیغەمبەری خوا ﷺ هەوالی شەهید بوونی هەریەك لە ( زید ) و ( جعفر )و ( عبدالله ی کوری رواحە ) - خوا لیان رازی بیت - راگەیاند وە بەخەلکەکەی فەرموو (( أخذ الراية زيد فأصيب ، ثم أخذ جعفر فأصيب ، ثم أخذ ابن رواحة فأصيب وعيناه تذرفان حتى اخذ الراية سي من سيوف الله ( خاليد بن وليد ) حتى فتحه الله عليهم )).صحيح البخاري ( ٤٢٦٢ ). واتە : زيد ئالاکەی هەلگرت دواتر شەهید کرا ، پاشان جعفر ئالاکەی هەلگرت و ئەویش شەهید کرا ، دوای ئەوان ( عبد الله ی کور رواحە ) – خوا لیان رازی بیت - ئالاکەی هەگرت ئەویش پیکرا وە شەهید بوو ، لەو کاتەدا چاوەکانی فرمیسکی مالئاوای لە یارانی لی دە باری ، هەتا کو شمشیریك لە شمشیرەکانی ( خوای گەورە ) ئالاکەی هەلگرت ،ئەویش ( خالیدی کوری ولید ) – خوا لی رازی بیت – ئەوە بوو ( خوای گەورە ) لەسەر دەستی ئەو دەرگای خیری لی کردنەوە و سەری خستن بە سریاندا .بەلی هەروەك لە ( ئەنسی کوری مالیك ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : پیغەمبەری خوا ﷺ دەنگ وباسی جەنگە کە و شەهید بوونی هاوەلانی بەخەلکە کە گەیاند بەر لەوەی دەنگ و باسیان بکاتەوە شاری مەدینە .اخرجە : البخاری ( ٣٧٥٧ ).

ئ

هەر لەم بارەیەوە ( ابو قتادە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( بەویستی خوا ماوەیەکیان پی چوو بوو کە دەرچوو بوون ولەوی مابوونەوە ، پاشان پیغەمبەری خوا ﷺ سەر کەوتە سەر مینبەر و فەرمانی کرد کە بانگ بدریت ( الصلاه الجمعه ) ئەوەش بانگێك بوو بۆ کۆکردنەوەی خەلکی بۆ کاریکی پیویست و گرنگ (( فمحمد الله واثنى عليه وقال إما بعد ثاب خبر ... ألا أخيركم عن جيشكم هذا الغزي إن اخوانكم انطلقوا حتى لقوا العدو وإن زيدا اخذ الراية فقاتل حتى استشهد فاستغفروا له الناس ثم أخذ اللواء بعده جعفر بن أبي طالب فشد علة القوم فقاتل حتى قتل شهيدا ، اشهد لة بالشهادة فاستغفروا له ، ثم أخذ اللواء سيف من سيوف الله ( خاليد بن وليد ) ولم يكن من الامراء هو أمر نفسه ففتح الله عليه )).اخرجه : احمد ( ١٧٥٠ ) و الدرامي ( ٢٤٤٨ ) و ابن ابي شيبة ( ٣٨١٢ ) و النسائي في الكبير ( ٨٢٤٩-٨٦٠٤ ) و البيهقي في الدلائل ( ٣٦٧/٤ ) و ابن حبان ( ٧٠٤٨ ) . واتە : ئینجا حمد و ستایشی ( خوای گەورەی ) کرد فەرمووی: لە پاشان دەستی کرد بە گیرانەوەی دەنگ و باس هەوالی جەنگە کە ، هەروەها فەرمووی : ئایا هەوالی سوپاکەتان پی بلیم ،کە بۆ ئەم غەزایە دەرچوون ئەوان لە چ بارودۆخیکدان براکانتان رۆیشتن هە تاکو رووبەروی دوژمنەکانتان بوونەوە ، زید ئالاکەی هەلگرت کەوتە شەر کردن لە گەلیان هەتا شەهید کرا ،دوای لی خۆش بوونی بۆ بکەن ، خەلکە کەش دوای لیخۆش بونیان بۆ کرد ، لەدوای زید ، جعفری کوری ابی تالیب ،ئالاکەی هەلگرت چاو نەترسانەهەلمەتی بردە سەریان بەسەخستی رووبەرویان بووەوە کەوتە جەنگ کردن لە گەلیاندا ، هە تاکو شەهید کرا ، وە شاهیدی دەدەم کە شەهیدە و دوای لیخۆش بوونی بۆ بکەن ، ئەوە بوو خەلکەکە دوای لیخۆش بوونیان بۆ کرد ، پاشان ( عبدالله ی کوری رواحە ) ئالاکەی هەلگرت و هەلوەستەیەکی کرد پاشان کەوتە جەنگ و شەر کردن هە تاکو شەهید بوو ، وە دوای لیخۆش بوون بۆ ئەو بکەن ، پاشان شمشیریك لە شمشیرە کانی ( خوای گەورە ) ( خالیدی کوری ولید ) ئالاکەی هەلگرت ئەو لە ئەمیرە هەلبژاردراوە کان نەبوو بەلام لیهاتووی خۆی وای کرد کە بیکەن ئەمیر و سەرکردەی سوپا ، بەهۆی ( خالید ) ( خوای گەورە ) سەری خستن و رزگاریان بوو .هەر لەم بارەیەوە لە ( ابو مسیر )وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ هەوالی شەهید بوونی ئەم سی قارەمانەی راگەیان بۆ خەلکە کەی باس کرد ئینجا فەرمووی : (( اللهم افر لزید ، اللهم اغفر لزید ، اللهم اغفر لزید ، اللهم اغفر لجعفر اللهم الغفر لعبدالله بن رواحة )).اخرجه : احمد في فضائل الصحابة ( ١٥٣١ ).

ئ

## شەشەم : پەلەو پایەی هەرسی ئەمیرە کەی جەنگی ( موئتە )

بەلی هەروەك لە ( ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت- وە دە گێریتەوە کەوا پیغەمبەری خوا ﷺ لە خەویدا ( جعفری کوری ابی تالیب ) بینی بوو کە دوو بالی هەبوو پیی دەفری لە گەل فریشتەکاندا لە ناو بەهەشتدا بۆ هەر شوینیك کە خۆی ویستی لی بایە ، چونکە لە جەنگی موئتە جعفر هەردوو دەستی لە پیناوی خوادا بە شمشیر قرتا بوو یان برا بوو ، ( خوای گەورە ) لە جیاتی دەستەکانی دوو بالی پی بەخشی لە ناو بەهەشتدا ، تاکو پی بفریت هەروەك لەم فەرموودە پیرۆزە کاندا هاتووە ، لە ( ابو هريره ) و – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : دە گێریتەوە کە پیغەمبەریخوا ﷺ دەفەرموویت : (( مر بي جعفر في ملا من الملائكة وهو مخضب الجناحين بالدم ابيض الفؤاد )).اخرجه : الحاكم ( ٢١٢/٣ ) على شرط مسلم ، و ابن حجر في ( الفتح ) ( ٧٦/٧ ) والشيخ الالباني في الصحيحه ( ٢٢٨/٣ ). واتە : جعفر بەلام دا تیپەری لە گەل کۆمەلیك لە فریشتە کان دا بوو پیشی بالە کانی خوینی پیوە بوو دلیشی پاك و سپی بوو ...

هەر لە ( ابو هريره )وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( رأيت جعفر بن ابي طالب ملكا يطير في الجنة مع الملائكة بجناحين )).اخرجه : الترمذي ( ٣٧٦٣ ) والحاكم ( ٢٠٩/٣ ) و الطبراني في الكبير ( ١٤٧٤ ) و ابن حبان ( ٧٠٤٧ ) والشيخ الالباني في الصحيحه ( ١٢٢٦ ). واتە : ( جعفری کوری ابی تالیب ) بینی وەك بالندەیەك لە گەل فریشتە کان بە دووبال دەفری لەناو بەهەشتدا ...

هەروەها لە ( ابو اومامه )وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : گویم لە پیغەمبەری خوا ﷺ بوو دەی فەرموو : (( بينا انا نائم آتاني رجلان .. ثم اشرفا بي شرفا فإذا بنفر ثلاثة يشربون من خمر لهم فقلت : من هؤلاء..؟! قالا : هؤلاء جعفر بن ابي طالب ، وزيد بن حارثة ، وعبدالله بن رواحة ... )). اخرجه : الطبراني في الكبير ( ٧٦٦٦- ٧٦٦٧ ) و النسائيفي الكبير ( ٣٢٨٦ ) و ابن خزيمة ( ١٩٨٦ ) و ابن حبان ( ٧٤٩١ ) . واتە : لە کاتیکدا من نووست بووم دوو کەس هاتنە لام ... پاشان بەرزیان کردمەوە بۆ شوینیکی بەرز و بلند چاوم کەوت بەسی کەس لە لای یەك کۆبوونەوە لە خواردنەوەی بە هەشتیان دە خواردەوە ، منیش ووتم : ئەوانە کین ..؟! ووتیان : ئەوانە جعفری کوری ئەبو تالیب ، زیدی کوری حاریسە و عبداللەی کوری رواحە یە ...

ئ

## سریەی ( ذات سلاسل ) سریه ی ابی قتادة بۆ ( خضرة )

لەدوای جەنگی موئتە دا پیغەمبەری خوا ﷺ هەلویستی ئەو هۆزە عەرەبانەی وەلاتی شامی بۆ دەر کەوت ، کە هاوکاری رۆمە گاورەکانی قەیصەریان دە کرد ، وە پشتیوانی هیرقل ی پاشای رۆم بوون ،دژ بە موسلمانەکان ، هەستی کرد وا پیویست کە هۆشیاو زیرەکی و دانایەکی تەواو بە کار بهینیت بۆ تیکدانی نیوان رۆمەکان و هۆزە عەرەبە کانی وەلاتی شام ببیتە هۆی ئەوەی کە ناچار بن یەك بگرن لە گەل سوپای ئیسلامدا ، وە دژ بە رۆمەکان ، وە جاریکی تر وا بیر نە کەنەوە دژ بە موسلمانان بۆ پال پشتی رۆمە کان سوپا کۆبکەنەوە بۆ هیرش کردنە سەر سوپای ئیسلامدا ،هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ ( عمری کوری عاصی ) هەلبژارد بۆ جی بەجی کردنی ئەم نەخشەیە ، چونکە پوری دایکی باوکی سەر بە هۆزی ( بلی ) بوو ، ئەوە بوو لە مانگی جمادی سالی ( ٨ ) هەشتەمی کۆچی دا ناردی بۆ ناو ئەم هۆزانە ئەوە بوو کە لەدوای جەنگی موئتە دا بۆ ئەوەی بۆ ناو سوپای ئیسلام رایان بکیشیت ، ( عمری کوری عاص ) – خوا لی رازی بیت – خۆی بۆمان دە گیریتەوە دەفەرموویت : پیدە چیت کە هەوالگەرە کانی ئیسلام هەوالیان هینابیت ، گوایە کۆمەلیکی هۆزی ( قضاعة ) کۆبوونەتەوە، تاکو هەلمەت بیهین بۆ سەر شاری مەدینە دا ، پیغەمبەری خوا ﷺ ( عمری کوری عاصی ) نارد بۆ ئەم هۆزە کە هۆزی ( قضاعة ) بوون ،هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو کە ئالایەکی سپی دایە دەستی ( عمری کوری عاص ) هاو را ئالایەکی رەشی لە گەلدا ناردو لە گەل ( ٣٠٠ ) پیاوی لە کۆچکەرەکان وە ئەنصارەکاندا ،( ٣ ) ئەسپ سواریان لە گەل دابوو ، وە فەرمانی دا کە یارمەتی وەر بگریت لە هۆزی ( بلی ) کە خزمی ( عمر ) بوون ، وەلە هۆزی ( عزرت ) و ( بلقین ) کە بەلایاندا تی دە پەری ، ئەم سریەی ( عمری کوری عاص ) بە شەو ریان دە کرد و بەرۆژیش خۆیان دە شاردەوە یان حەشاردەدا تاکو کەس هەستیان پی نەکات ، کە لە کۆمەلیك نزیك بووەوە هەوالی بۆ هات کە ژمارەیان زۆر زۆرە ، ئینجا ( رافعي کوري مکيث جهني ) نارد بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ دوای کۆمەکی تری لی کرد ، پیغەمبەری خوا ﷺ بە سەرکردایەتی ( ابو عبیدە ی کوری جراح ) ( ٢٠٠ ) پیاوی تری لە هاوەلان نارد کە لە کۆچ کەران و ئەنصارەکان دا ، کە ( ابو بکر ) و ( عمر ) یان تیدا بوو ، ئالای دایە دەستیان فەرمانی پیدان کە کۆك بن رای جیاوازیان نەبیت ،کە ( ابو عبیدە ) گەیشتە ( عمر ) ویستی ئیمامەت بکات بۆ خەلك ( عمر ) ووتی : تۆ کۆمەکیت بۆ من هیناوە ، من ئەمیری سوپاکەم ، ( ابو عبیدە ) دەست بەجی بە قسەی کرد ، وە ( عمر ) نویژی بۆ خەلکەکە کرد ، بەلی سوپا رۆیشت تا گەیشتنە ناوچەی ( قضاعة ) هەلمەتیان بردە سەریان شوینەکەیان گرت ، لە کۆتایی دا کۆمەلیك هیرشیان کرد ، دواتر سوپای ئیسلام هیرشیان کردە سەریان ئەوانیش رایان کرد ، شوینەکەی خۆیان بەجی هیشت هەلهاتن بلاوەیان لی کرد...

ئ

وه هەروەها (ذات السلاسل ) شوینكه ده كەویتە پشت (وادی القری) ، وه له(ذات السلاسل ) بۆ شاری مەدینە (١٠) رۆژە ریگایە بە پیادە ، هەروەها (ابن اسحاق ) دەلیت : سوپای ئیسلام لە لە سەر ئاویك لایاندا لە خای (جزام )دا ، پی دەلین : (السلسل ) هەر بەم بۆنەیەشەوە ناو نراوە (ذات السلاسل ) .

هەروەها لە (عمری كوری عاص ) – خوا لی رازی بیت – خۆ دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوامدا و فەرمووی : جل بەرگ و چەكت كۆبكەرەوە و ، وەرە لام ، منیش وام كرد چووم خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دەست نویژی دە گرت ، تەماشای كردم چاوی داگرت فەرمووی : من دە مەویت لەسەر سوپا یەكدا بتنیرم ، (خوای گەورە ) سەلامەتت كات دەست كەوتیشت هەبیت ، حەزو مالیشت دەست گیر بیت تیایدا ،(عمر ) دەلیت : منیش ووتم : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ من لە پیاناوی پارە مال موسلمان نەبوومە ، بەلكو لە خۆشی ئاینی ئیسلام موسلمان بوومە ، وە بۆ ئەوەی لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ بم ، پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی : (( یا عمرو نعم المال الصالح للمرء الصالح )) . ابن هشام فی السیره (٦٢٣/٢-٦٢٤-٦٢٥-٦٢٦ )، ابن حبان فی الموارد (٢٢٧٧ ).واتە : ئەی عمر مالی باش بۆ پیاوی باش .

وە سریە(ابوقتادە ) بۆ (خضرة ) بەلی ئەم سریەیە لە مانگی شعبانی سالی (٨ ) هەشتەمی كۆچی دا بوو ، چونكە هۆزەكانی (بنی غطفان ) لە ناوچەی (خضرة ) خۆیان حەشار دا بوو ، وە (خضرة ) زەوی (محاربە ) لە ناوچەی نجد دا ، پیەمبەری خوا ﷺ (ابو قتادە ) نارد بۆ یان لە گەل (١٥ ) پیاو دا ئەوە بۆ ئەم سریە یە هەندیكیان لی كوشتن هەندیكیشیان لی بەدیل گرتن مەرو مالاتیكی زۆری یان بە غەنیمەت كەوتە دەست ، بەلی ئەم سریەی (ابو قتادە ) دەلین : (١٥ ) شەوی پی چووە بۆ ئەم چالاكی سەربازیە دا ....

ابن هشام فی السیره (٦٢٣/٢-٦٢٤-٦٢٥-٦٢٦ ) ، ابن قیم زاد المعاد (١٥٧/٢ ) ،رحمه للعالمین (٢٣٣/٢ ) .



# بەشی سی یەم

## فتح كردنی شاری مككە

## ڕووداوەكانی فتح كردنی شاری مككە

## ڕووداوەكانی نیوان فتحی مككە و غەزای حونین

## غەزای حونین وطائف

## ڕووداوەكانی دوای غەزای حونین و طائف

# فتح کردنی  شاری مککە

بەلی کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ پە یمانی یان صولحی حودبیە ی  بەست لە گەل کافرانی قوریش ،ئەوە بوو  ، بووە مایە ئەمن ئاسایش و خۆش گوزەرانی نیمچە دوورگەی عەرەبی لە ترسی شەر جەنگ و کوشتار رزگاریان بوو، ئاشتی و ئارامی هیمنی سەرتاپایی ناوچەکەی گردەوە ، چونکە هەر دوو لا بەسەر بەستی بە ئارامی بە بەی ترس لە شەرو جەنگ ژیانیان دەکرد ، بەلی ئەمەش هەلی بۆ کافرانی نیمچە دوورگەی عەرەبی رخساند بۆ ئەوەی زیاتر ئیسلام بناسن و زیاتر شارە زای ئاینی ئیسلام و پیغەمبەری خوا ﷺ بن ،لەم ماوەیەدا بە بی ترس لیك نزیك دەبنەوە ، ئەمەش بۆ هۆی ئەوەی کە رووناکی ئیسلام پەرە بسینی لە نیمەدوورگەی عەرەبی دا ، زۆر بە جوانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بناسن ،بەلام پیشت پە یمانی حودییە لەبەر کافرانی قورەیش بەم شیوەیە خەلکی ناوچە کە بە باشی ئیسلامیان نەدەناسی بەلکو ئەوەی بهاتایە نیو ئاینی ئیسلام هەرشەی دەر کردن لە شاری مککە لی دەکراو یان هەرشەی کوشتنی لی دەکرا ، بەلام صولحی حودییە بووە بناغەی بانگەوازی ناسنی ئیسلام لە هەموو ناوچە کە دا ، هەر وەها لە کاتی بەستنی پە یمانی حودبیە دا موسلمانان و قورەیش ،ئەوەشیان ووت : کە دوو هۆزی تریشە کەن لەدەورو بەری شاری مککە ئەوانیش هۆزی ( خوزاعە ) و ( بکر ) کە ئەونیشا هاتنە ناو ها پە یمانیە کەی حودییە ، بەلی پە یمانی حودییەیە لە سەر ئەمە بەسترا کە بۆ ماوەی ( ١٠ ) سال شەرو کوشتار و جەنگ بەوەستیت ،لە ئە نجامدا هۆزای ( خوزاعە ) بە کافرو موسلمانە کانەوە چوونە پە یمانی پیغەمبەری خوا ﷺ بەلام هۆزی ( بکر ) چوونە پە یمانی قورەیش ، بەمەش هۆزی ( خوزاعە ) و هۆزی ( بکر ) ئەوانیش شەر و جەنگیان وەستان بە هۆی پە یمانی حودییە ، هەریەك لەم دوو هۆزە جەنگیان بکردایە ، یان ئەوە تا لە سەر موسلمانەکان هەژماردەکرا یان ئەوە تا لەسەر قورەیش هەژماردەکرا ، بەلام وا باس دە کری هۆزی ( خوزاعە ) بەنیەتی پاکە پاریزگاری لە پە یمانەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ دەکرد ، پابەندی هەموو بەندە کانی پە یمانی حودییە بوون ، وەك ووتمان هۆزی بکر چووە پال پە یمانی قورەیش ، ئەم دووانە ئەم ئاشتەوایەیان بەهەل زانی قۆستیانەوە بۆ بەرژەوەندی قیزە ونی خۆیان ، بەلام هۆزی ( بکر ) خۆی ئامادە کرد بۆ تۆلە سەندنەوە لە هۆزی ( خوزاعە ) ، ئەوە بوو سەر ئە نجام بە کۆمەکی قورەیش نامەردی پە یمان شکین ئەم نامەردیە یان ئە نجام دا ...!! ئەوە بوو سەردای هۆزی ( بکر ) کە فەرماندەی هۆزە کە بوو بەناوی ( نوفیلی کوری معاویە ) ئەوە بوو نەخشەو پیلانی دەکیشا بۆ ئەوەی کە دەست لە نەوەی ( خوزاعە ) بوە شینی ، ئەوە بوو داوی لە قورەیش کرد کە کۆمەکی بکەن بۆ ئەم نامەردیە کە دەست لە هۆزی ( خوزاعە ) دەشینیت ، یارمەتی دەویت لە قورەیش بە چك و مال پیاوە کانیان ، سەر ئە نجام قورەیش ئەم نەخشەی سەرداری هۆزی ( بکری ) بەدل بۆ بەلینیان بە سەرداری ( بکر ) دا کۆمەکیان دەکەن ...!!!

ی
ئەوە بوو هۆزی (خوزاعە ) هیچ ترسیکیان نەبوو لە شەرکرد جەنگ لە گەل هۆزی (بکر ) و هۆزی (قورەیش ) چونکە لە پەیمانی حودیبیەدا پەیمانیان لە نیوان دا بوو ، بۆ خیان بە بی ترس لە مۆلگەی خۆیان دانیشتبووەن ،هیچ چەك و تفاقی جەنگیان لە لا نەبوو ،بی خەم لە شینوی خۆیان دا ئەژیان ، ئەوە بوو لە نیوە شەوەیدا هۆزی (بکر) و (قورەیش ) دەستی یان لی وەشاندە ئەوانی لە گەرمەی خەو دا بوون ، ئیتر هە تا توانیان کوشتاریان لی کردن ، ئەوەشی رای دەکرد بە دوایان دە چوون هەتاکو دەیان کوشت ،ئە گیرنەوە دەلین پیاوی وا هەبوو رای دە کرد خۆی بەدوای کەعبە دا دە کرد هیشتان بە بی بەزەیەوە دەیان کوشت ، ئەوە بوو هۆزی (بکر ) و (قورەیش ) هیچ حیسابیکیان بۆ دوا رۆژی خۆیان نەکرد ، هیچ حیسابیکیان بۆ ئەم صولحەی حودیبیە نەکرد ، بەلی لە ناو هۆزی قورەیش دا ئەم پیاوانە بەژداری ئەم کارە نامەردانەیان کرد :

١-صفوانی کوری ئومییە .

٢-سوهلیی کوری عمر ، ئەوە بوو ئەم پیاوە لە جگیای قورەیش پەیمانەکەی مۆر کرد .

٣-عیکرمەی کوری ابو جهل .

٤-موکەرەزی کوری حەفص .

٥-حوتیەبەی کوری عبدالعوزا .

ئەلین جگە لە (ابو سفیان ) پی ناخۆش بوو بۆ ئەم هیرەشەی هۆزی (بکر ) بۆ سەر هۆزی (خوزاعە ) بەلام هەموو سەرانی قورەیش پیان خۆش بوو ، بەلام نەوەی (مدلج ) تیرەیەکی هۆزی (بکر ) بوون لەم ناپاکی نامەردایەتیە دا بەشداریان نەکرد و ، پەیمانەکەیان نەشکاند ،ئەم هیرشەی هۆزی (بکر ) بۆ سەر هۆزی (خوزاعە ) لە مانگی شەعبانی سالی هەشتەمدا بوو ، ئەلین (٢٢) مانگ دوای پەیمانی حودیبیە بوو ، بەواتای سالیك و دە مانگ دوای پەیمانی حودیبیە دا ..!!

ئ
بەلی ئەوە بوو دوای دەست وەشاندنی هۆزی (بە کر ) لە هۆزی (خوزاعە ) دا ئەمەش بە پال بشتی قورەیش کە هۆزی (بەکر ) ئەم کارە قیزەونەیان ئە نجامدا ، دواتر بەشا رووداني ئە و هیرشە بۆ سەر هۆزی (خوزاعە ) قوریش بە تەواوە تی پەشیمانی خۆیان دەر بری لەم نا پاکیە کە ئە نجامیان دا ئەوە بوو ، (حاریس ) و (عبدالله ) چوونە لای (ابو سفیان ) پیان راگە یاند ئەو کارەی کردتان نەشیاو قیزە ون بوو ، کە پە یمانی صولحی حودیبیە تیدا بەم کارەتان هەلوە شاندەوە ، ئیستا هیچ پە یمانیك نەماوە لە نیوان ئیوە و موسلمانەکاندا ، هەروەها (ابو سفیان ) تی گەیشت ئەو کارەی قورەیش زۆر هەلە بوو ، هەروەها ووتی بە خوا لە دەستی سوپای ئیسلام رزگاریان نابیت ، بەلی لە پاشاندا قورەیش نا چار بوو کۆبوونەوەیەك ئە نجام بدەن ، ئەوە بوو گەیشتنە ئەو ئە نجامەی کە ئەم کارەیان پاشگەز بوونەوەیە لە پە یمانی حودیبیە ، هەروەها پیغەمبەری خوا و ﷺ و موسلمانان هەرگیز لە و نا پاکیەی قورەیش کردیان بی دەنگ نا بن ، ئەوە بوو لەو کاتەی قورەیش لە کۆبوونەوە دابوون لە (دار الندوە ) ، (عبدالله ی کوری سعدی کوری ئەبو سەرحیش ) لەویدا بوو ، چەند ئامۆژگاریەکی قورەیشی کرد ، تاکو ریگە چارەیەك بۆ ئەم هەلگەورەیان دا بین ، هەروەها ئەوەشی تیگەیاندن کە پیغەمبەری خوا ﷺ هیرشیان ناکاتە سەر ئەگەر ئەم سی ری گەیە هەلبژرین : یەکەم : دوا لە قورەیش کرا کە خوینی (٢٣ ) کوژراوی هۆزی (خوزاعە )بدەن ، دووەم : یان خۆیان لە هاوپە یمانی یەتی هۆزی (بەکر ) دا مالن یان بە دوور بگرن ،سی یەم : یان خۆیان بۆ جەنگ کردن ئامادە بکە ن ، (عبدالله ) پی ووتن : کامە ریگە هەل ئەبژرین ..؟!

(سوهەیلی کوری عمر ) ئەمەی پی باش بوو کە خۆیان دامالن یان دوور بکەونەوە لە هاوپە یمانی هۆزی (بەکر ) بەلام (شیبەی کوری عوسمانی عەبدەری ) ئەو رایەی (سوهەیلی ) بە دل نەبوو ، (شیبە ) ئەوەی بە دل بوو کە خوین دانی هۆزەی (خوزاعە ) ئاسانە باشترە ،بەلام پیاویکی تر لە قورەیش کە ناوی (قورتەی کوری عبد عمر ) ووتی : نەبە خوا نەخوین دەدەین و نە لە هاوپە یمانی هۆزی (بەکر ) خۆمان دا ئەمالین یان دوور دەکەوینەوە ، بەلام (نوفاسەی کوری غەوسیش ) لە تیرە یەکی نەوەی (بەکر ) بوو ووتی : روو بە رووی سوپای ئیسلام و موسلمانان دە بینەوە ،بەلام (ابو سفیان ) ووتی : ئەمە هیچ نیە و بەلکو با دان بەم کارە دانەنین کە لە گەل هۆزی (بەکر ) کردمان ، هەروەها ووتی : خۆمن فەرمانم بەم کارە نەداوە راستیش دەکەم و وە پیشم ناخۆش بووە کە ئەم کارە تان ئە نجامداوە ، ئە ش زانم کە رۆژیکی رەش بەدواوەیە ، هەروەها قورەیش رەزامەندی دا کە (ابو سفیان ) ئەو کارە بکات ، نەکۆلی لە م کارەیان بکەن ، ئەوە بوو بریاریاندا کە نیردراویك بنیرن بۆ شاری مەدینە بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ تاکو ماوەی پە یمانی صولحی حودیبیە دریژ بکەنەوە ، جا ئەگەر ئەم کارەیان بۆ کرا ئەو لە سزای سوپای ئیسلام رزگاریان دە بیت ، هەروەها لە کۆبوونەوەکەی (دار الندوە ) هاتنە سەر ئەو رایە کە (ابو سفیان ) ئەو نیردراوە بیت بچیتە بۆ شاری مەدینە بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلام قوریش پی وا بو کە

ئ

هیشتان هەواڵە کە نەگیشتە شاری مەدینە ، هەر بۆیە (ابو سفیان ) پەلی کرد بۆ ئەوەی خیرا بگاتە شاری مەدینە ، بەلام قورەیش و (ابو سفیان ) نەیان پیکا چونکە هۆزی (خوزاعە ) خیرا تر بوون هەواڵە کەیان بە پیغەمبەری خوا ﷺ گەیاند بوو ، ئەو سا دوای چەند رۆژیك (ابو سفیان ) گەیشت ، هەروەها هۆزی (خوزاعە ) پیاویکیان نارد بۆ شاری مەدینە بۆ هەوالی پیدانی بە پیغەمبەری خوا ﷺ کە قورەیش و هۆزی (بەکر ) چیان پی کردوون ، پیاوە کەش بەناوی ( عمری کوری سالمی خوزاعی ) بوو ، تاکو ئەو ستەمی قورەیش هۆزی (بەکر ) بەگەینیت بە پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلی لەو کاتەدا قورەیش هۆزی (بەکر ) دەگەران چەواشەی خەلکیان دەکرد بۆ ئەوەی ئەم کارە قیزوونە پەردە پۆش بکەن درۆکانیان پینەبکەن ، بەلام پیاویکی خوزاعی بەناوی (عمری کوری سالمی خوزاعی ) گەیشتبووە شاری مەدینە ، بە ووردو درشتی باسە کەی بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ کە لەمەزگەوت دا بوو ، بۆی گیرایەوە ،بەلی (عمر) لە مەزگەوتدا هەستا سەرپی باسەکەی بە شیعر گیرایەوە ،قورەیش پەیمانی یان صولحی حودیبیە ی شکاند ..!! هەر لەویدا داویان کرد کە هیرشیان بکەنە سەر چونکە قورەیش و هۆزی (بەکر ) پەیمانیان شکاندووە ،لە کاتی ئاشتی دا ئەمەیان بەهەل زانیووە و ،خیانەتیکی گەورە یان ئەنجامداوە ، پەیمانیان شکاندوە ، بەلی کاتی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەواڵەی بیست یەکجار توورە بوو ، بە نیردراوەکەی هۆزی (خوزاعەی)ی راگەیاند کە تۆلەی ئەو دەست دریژیەی کردیانەسەریان دەستینن نابیت لە سەریان بچیت ئەوە بوو فەرمووی : (( نصرت یا عمر بن سالم )) ، بەلی کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لەمەزگەوت هاتەدەرەوە تووڕەی پیوە دیار بوو ، لە (ابن عباس ) ریوایەتکراوە دەلیت : کاتی پیغەمبەری خوا ﷺ لە مەزگەوت هەستا و لای عەباکەی بەدوای خۆیدا راکیشا ئەوەی فەرموو : (( لا نصرت إن لم أنصر بنى كعب – يعنى خزاعه – مما أنصر منه نفسى )). واتە : خوا سەرم نەخات لە هەر شتیك دا کە هەولی سەرکەوتنی خۆم ئەدەم هەولی سەرکەوتنی -ئەوەی کەعب نەدەم – واتە خوزاعە . بەلی بی گومان قورەیش پەیمانەکەی صولحی حودیبیەی شکاند ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە خیرا تری فتحی شاری مککەی پیرۆز بکریت لە دەست بت پەرستان جاهیلینی قورەیش رزگاری بیت ، بگرە بە هۆی ئەوە وەش هۆزەکانی عەرەبی نیمچە دوورگە باوەش بۆ ئیسلام بکەنەوە ، کە سالە های سال بوو چاوەروانی ئەنجامی زۆرانبازیی نیوان قورەیش موسلمانەکان بوون ، بەلی فتح کردنی شاری مککە قوناغیکی نوی لە میژووی ئیسلام دەست پی دەکات ئەویش قوناغی فتح کردنی ناوچەکانی تیری نیمچەدورگەی عەرەبی و هەروەها شکاندنی هەر دوو ئیمپراتۆریەتی ئەوکاتی هەمووجیهان بوو ، بەلی بانگەوازی ئیسلام سەرپاپەی دوورگەی عەرەبی گرتەوە

چونکە هاتنی ئیسلام لە ناوچەکە بووە مایەی خیر خۆشی ئەمن ئاسایش ئارامی هیمنی ناوچە کە ....!!!!

ی

لە گێڕانەوەیەکی( ابن ئیسحاق ) دا هاتووە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی سوپای ئیسلام بۆ مۆتە نارد ، لە مانگب جمادی ئاخر و مانگی رەجەبی لە مەدینە دا بە سەر برد ، هۆزی خوزاعە لە خوارووی شاری مککە دا و لە ئاوە کەی خۆیان بەناوی وەتیر ژیانیان بەسەر دەبرد ، ئەوە بوو منالە کانی بەکری کوری عبد منات هێرشیان کردە سەریان ، واتە هۆزی (بەکر ) هۆکاری رووداوە کەش کە پیاوی لە نەوەی (حەزرەم ) بەناوی (مالیك ی کوری عبادە ) کە هاوپەیمانی (ئەسوەدی کوری رەزەن ) بوو ، کاتێك بە مەبەستی بازرگانی دە رۆیشت ، لە سەر خاکی یان زەوی هۆزی (خوزاعە ) دا ئەویان کوشت وە سامانەکەیان بە تالان برد ، هۆزی یان نەوەی (بەکر ) لە تۆڵەی ئەو پیاوە یەکێك لە پیاوەکانی هۆزی (خوزاعە ) یان کوشت ،هەروەها هۆزی (خوزاعە ) هێرشیان کرد سەر (ئەسوەدی کوری رەزەن دەیلی ) هەروەها (سلما ) و (کولسوم ) و (زەیب ) کە ئەوانە سەران و سەرکردەکانی نەوەی (بەکر ) بوون ، خوێنیان رشتن ،ئەم رووداوە لە نزیك نیشانەکانی حەرەم دا روویدا ..!! وە یەکێك لە نەوەی دەیل دەڵێت : لە رۆژگاری جا هیلیەت نەوەی (ئەسود ) بە هۆی لە پێشیان لە نەوەی بەکر ، دوو خوێنباییان بووە و ئێمە یە ك خوێنبایی ، وە لەم کاتەدا ئیسلام هات نەوەی (بەکر )و (خوزاعەی ) سەر ڤال کرد ..!!

هەروەها( ابن ئیسحاق ) دەگێڕیتەوە دەڵێت : کاتی ئاشتی یان پەیمانی حودیبیە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ کافرانی قورەیش بەسترا و سەقام گیر کرا ، وە یەکێك لە بەندە کانی پەیمانی حودیبیە ئەوە بوو ،هەر کەس بیەوێت دە توانێت لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمان ببەستێت یان هاوپەیمانی بکات ،وە هەرکەسیش بیەوێت دە توانێت پەیمان ببەستێت یان هاوپەیمانی بکات لە گەڵ کافرانی قورەیش دا ، ئەوە بوو هۆزی (خوزاعە ) لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی بەست هاوپەیمانی لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ،هەروەها نەوەی دەیل کوری بەکر واتە : هۆزی بەکر ، ئەمەیان بە هەلەیان قۆستەوە ویستیان تۆڵەی خۆ لە نەوەی (خوزاعە ) بکەنەوە ، وە (نوفیلی کوری معاویەی دەیلی ) ئەو پیاوە سەرکردەی هۆزی (بەکر ) بوو ، بەلام هەموو نەوەی (بەکر ) شوێنکەوتووی ئەو پیاوە نەبوون ، لە گەڵ هۆزەکەی دا لەنیوە شەوێك دا هێرشیان کردە سەر نەوەی (خوزاعە ) لە سە ئاوی وەتیری یەکێك لەوانیان ، هەروەها شەر و کوشتار لە نیوان ئەم دوو هۆزە روویدا ، بەلام قورەیش بە چەك تفاق صیلاح پیاو مال هاوکاری نەوەی (بەکر ) یان کرد ، وە چەند کەسیك لە کافرانی قورەیش شەوانەبە نهێنی لە ناو هۆزی (بەکر ) دا شەریان دە کرد دژی هۆزی (خوزاعە ) تا ئەوەی کە خەڵکانی (خوزاعە ) لە تاو هێرشی هۆزی (بەکر ) و قورەیش دا ، نزیك بوونەوە لە (حەرەمدا ) ..!!

ئ

هەروەها واقدی لە الدلائل نبوە دا دە گیرتەوە دەلیت: ئەو شەوەی کە هۆزی (بەکر) هیرشی کردە سەر هۆزی (خوزاعە) ئەوپیاوانەی قورەیش کە (صفوانی کوری ئومیە) و (عیکرمەی کوری ابوجهل) و (سوهیلی کوری عمر) سواری ئەسپ بوون ، کویلە کانی خۆیان لە دژی هۆزی (خوزاعە) هانددان بەشداری جەنگە خویناویە کەیان کرد ..!!

هەروەها (ابن ئەسحاق) قەسەیەکی سەیر ..!! دە گیریتەوە دەلیت : کاتیك نەوەی خوزاعە گەیشتنە (حەرەم) هۆزی (بەکر) بە سەرکردەکەی خۆیان ووت : کە (نوفیلی کوری معاویە دەیلی) ئیستا وا نەوەی (خوزاعە) گەیشتنە (حەرەم) ووتیان: ئەی خوایە ، ئەی خوایە ..!! بەلام (نوفیلی کوری معاویە) قسەیەکی زۆر سەیرو کوفری هاتە سەر زمان ..!! (والعیاذ باللە) ووتی : ئەی نەوەی (بەکر) ئیستا من باوەرم بەخوا نیە .!! تۆلە ی خۆتان بستینن ،ئیوە لەناو (حەرەم) دزی دەکە بۆ لە تۆلە سندنەوە دەترسن ..!!

هەروەها پاش ئەم هەموو رووداوەی کە روویدا لە نیوان هەردوو هۆزەکە بە پال پشتی کافرانی قورەیش ،ئەوە بوو هەوالە کە گەیشتە لای پیغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینەدا ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ بە خەلکەکەی ووت : بەم زانە (ابوسفیان) دەیتە بۆ لامان بۆ ئەوەی ماوەی پەیمانی حودیبیە دریژ بکاتەوە ، ئەوە بوو لە پاش گەرانەوەی نیردراوەکەی هۆزی (خوزاعە) لە لای پیغەمبەری خوا ﷺ کە هەوالە کەیان پی گەیاند ، ئەوە بوو ، (بوودیل کوری وەرقا) لە گەرانەوەی لە (عەسفان) کە چاویان بە (ابو سفیان) کەوت کە قورەیش ئەویان رەوانەکردبوو ،بۆ ئەوەی ماوەی پەیمانی حودیبیە دریژ بکاتەوە و بەهیزی بەکات ، کاتیك (ابو سفیان) (بوودیلی کوری وەرقای) بینی ووتی : لە کوێوە دییت ؟! ئەویش واتە (ابو سفیان) زانی لە لای پیغەمبەری خوا ﷺ دە گەریتەوە ،

بوودیلی کوری وەرقا ووتی : لە گەل هۆزی (خوزاعە) رویشتین بۆ ئەم دۆلە ..!!

(ابو سفیان) ووتی : ئەی نەرۆیشتنە لای محمد ﷺ ..؟! (بوودیل) ووتی : نەخیر ..!!

بەلی (بوودیل) ریگای شاری مککە ی گرتە بەر ، بەلام (ابو سفیان) ووتی : ئەگەر (بوودیل) رۆشیتبیتە شاری مەدینە ، خورمای بەووشترە کەی خۆی داوە ..!! کاتیك رۆیشتنە شوینی یەخ کردنی ووشترە کەی (بوودیل) ، پاشەرۆیی ووشترە کەیان بینی هەلیان گرت بینیان دەنکە خورمای تیدایە ، (ابو سفیان) ووتی : سویند بەخوا لە لای محمد ﷺ بووە ..!!

ێ
بەلی ( ابو سفیان ) چووە شاری مەدینە ، ڕۆیشتەمالی کچەکەی خۆی کە هاوسەری پیغەمبەری خوا ﷺ بووە دایکە ( حبیبە ) ( ابو سفیان ) ویستی لە سەر رایەخەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ دانیشیت ، ( ام حبیبە ) رایەخەکەی کۆ کردەوە و ( ابو سفیان ) ووتی : کچەکەم نازانم ،دیارە ئەم رایەخە شیاوی من نیە ..؟! یان من شیاوی رایە خەکە نیم ..؟! دایکە حبیبە ووتی : ئەمە رایەخی پیغەمبەری خوایە ﷺ تۆش نجس و پیس و بی باوەری و کافری ، نەم ویست لە سەر رایە خەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ دانیشیت ..!!

( ابو سفیان ) ووتی : سویند بەخوا کچەکەم لەو کاتەی تۆم نەبینیوە تۆش عەقل و هۆشت لەدەست داوە !.

هەروەها ( ابو سفیان ) ڕۆیشتە لای پیغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەل کرد پیغەمبەر ﷺ وەلامی نەدایەوە ڕۆیشتە لای ( ابو بکر ) دوای لیکرد قسە لەگل پیغەمبەر ﷺ بکات ..!! ( ابو بکر ) ووتی : ئەوکارە ناکەم

ڕووێشە لای ( عمری کوری ختاب ) قسەی لەگەل کرد ، ( عمر ) ووتی : شفاعەتی ئیوە لە لای پیغەمبەری خوایە ﷺ هەروەها ووتی : ئەگەر تەنها میروو لە هاوکارو هاو دەستم بیت لە گەل کافرانی وەك ئیوەدا جەنگ و کوشتار دەکەم ..!! لە پاشاندا ڕۆیشتە لای ( علی کوری ابی تالیب ) فاتیمە کچی پیغەمبەری خوا ﷺ دانیشت بوو ،( حەسن ) کە مندال بوو لە پاوەشی فاتیمە دا بوو ، هەروەها ( ابو سفیان ) بە ( علی ) ووت: پەیوەندی خزمایەتی تۆ لە هەموو خەلك لەمن نزیکترە ،بۆ ئەم مەبەستە هاتوومەتە لای تۆ و نابیت بی هیوا بگەریمەوە ،لای پیغەمبەر ﷺ شیفاعەتی ئیمە بکە ..!! ( علی ) ووتی : ئەی ( ابو سفیان ) پیغەمبەر ﷺ مەبەستیکی هە و ناتوانین لەو بارەیەوە قەسە بکەین .!! ( ابو سفیان ) بە فاتیمەی ووت : ئەی کچی ﷴ دەتوانی بە کورەی خۆت بلیی پەنای خەلکان بدات و تا کۆتایی ڕۆژگار سالاری عەرەبەکان بیت ..!! فاتیمە ووتی: سویند بەخوا هیشتا کورە کەم نەگیشت تۆتە تەمەنیك پەنای خەلکان بدات و کەس بی رەزامەندی پیغەمبەر ﷺ پەنای کەس نادات .مەبەستی ( ابو سفیان ) پەنای بردە بۆ ( حەسن ) کە هیشتا مندال بوو ، لە پاوەشی دایکی دابوو ..!! هەروەها ( ابو سفیان ) ووتی : ئەی باوی کی ( حەسن ) کارەکە تیك چووە دژوار بووە ریگە چارەیەکم نیشان بدە ..؟! ( علی ) ووتی : سویند بەخوا هیچ نازانم بەلام تۆ سەرکردەی هۆزی کەنانەیت ،ئاشتی لەنیوان هۆزەکان سەقامگیر بکە و بۆ سەر زەویە کەی خۆت بگەریوە .( ابو سفیان ) ووتی : ئایا ئەم کارە سوودی هەیە ..؟! ( علی ) ووتی : نەخیر . بەلام جگە لەمە ناتوانیت هیچ کاریك بکەیت ..!! بەلی ( ابو سفیان ) لە مەزگەوت هەستا و ووتی : ئەی خەلکینە ،من پەنام بە خەلکان داوە ، دواتر سواری ووشترە خۆی بوو ریگەی شاری مککەی گرتە بەر و کاتیك گەیشتە لای قورەیشە کان هەر هەموو لە دەوری ( ابو سیفان ) کۆبوونەوە ووتیان : دەنگ و باس چی بوو ......؟!

ی
بەلی (ابو سفیان ) کاتێك لە شاری مەدینە گەڕایەوە سەرانی قورەیش هەر هەموو لەدەورەی کۆبوونەوە چاوەڕی هەوالیکی باشیان لە (ابو سفیان ) دە کرد ، هەروەها (ابو سفیان ) بە وردو درشتی هەوالی سەفەرکەی بۆ چوونە شاری مەدینەوە چوونە لای پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ گێڕانەوە (ابو سفیان ) ووتی : رۆیشتمە لای ﷺ قسەم لە گەل دا کرد بە لام هیچ وەلامی نەدامەوە ، ریشتمە لای (ابو بکر ) ئەویش هیچی بۆ نەکردم ، دواتر رۆیشتمە لای (عمری کوری خەتاب ) لە هەموویان زیاتر دوژمنی من بوو ، رۆیشتمە لای (علی کوری ابو تالیب ) لە هەموویان نەرم تر بوو ، پیشنیاری کاریکی بۆ کردم بەلام نازانم سوودی هەیە یان نا ..؟! قورەیشە کان ووتیان : چ کاریك ..؟! ووتی پی ووتم : پەنا بە خەلکان بدە و منیش ئەو کارەم کرد ، قورەیشە کان ووتیان : ئایا ﷺ ئەم کارەی تۆی پەسەند کرد ..؟! ئەویش ووتی : نەخیر .قورەیشە کان ووتیان : سوێند بەخوا گەمەی بە عاقلی تۆ کردووە ووتە کەی تۆ هیچ سوودیك بە ئیمە ناگەیەنی ، هەروەها (ابو سفیان ) ووتی : جگە لە مە نەمتوانی هیچ کاریك بکەم ..!!

هەروەها دە گیڕنەوە دەلین : ئا لەم کاتەدا لە شاری مەدینە پیغەمبەری خوا ﷺ بە خەلکە کەی ووت خۆتان ئامادە بکەن کەرەسەکانی سەفەر یان جەنك ئامادە بکە ، بەلام هیچ کەس نەیزانی بۆچی پیغەمبەری خوا ﷺ بە خەلکە کەی ووتوە کە خۆیان ئامادە بکەن ، ئەوە بوو (ابو بکر ) رۆیشت لای عائیشەی کچی کە هاوسەری پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ، بۆ ئەوەی تاکو کەرەسەکانی پیغەمبەری خوا ﷺ ئامادە بکات ، هەروەها پرسیاری لە عائیشە ی کچی کرد فەرمووی : کچەکەم پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی کەرە سەکانی بۆ ئامادە بکەن ..؟! عائیشە ووتی : بەلی . تۆش خۆت ئامادە بکە ، (ابوبکر ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ کوی دەروات ..؟!! عائیشە ووتی : بەخوا نازانم ، هەروەها دواتر پیغەمبەری خوا ﷺ بە خەلکە کە ی راگەیان کە با بە نهینی بیت ، نەوەك سیخورەکانی قورەیش هەستی پی بکەن، ئەو نیازی هیرش کردنە سەر شاری مککە هەیە بۆ ئەوەی بەشیوەیەکی لە ناکاو هیرش بکە سەر شاری مککە و فتحی بکەن بۆ یەك جاری لە دەستی بت پەرستانی قورەیش رزگار بیت شاری مککە فتح بکریت ،بۆ ئەوەی قورەیش باجی ئەو خیانەتە گەورەیە بدە ن کەبەرانبەر بە پە یمانی حودبیە کردیان

هەروەها لە (عوروەی کوری زوبیر )وە دە گیڕتەوە دەلیت : کاتێك پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ رۆیشتن بەرەو شاری مککە خۆی ئامادە کرد ، (حاطبی کوری ابو طلعة ) نامەیەکی بۆ قورەیشە کان نووسی وە ئەوانی ئاگادار کردوە ،نامەکەی بە یەکیك لە ئافرەتە کانی (مەزینە ) بەوتەی دەستەیەك بەسارە کە موالی یەکیك لە منالەکانی (عبدالمطلب ) دا رەوانە کرد بریك بەخشینی پیدا لە باتی ئەو کارەی کە ئە نجام دەدات ، هەروەها ئافرەتەکە نامە کەی (حاتبی ) لە ناو قژی دانا شاردیەوە دواتر بەریکەوت بۆ مککە ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ لە ئاسمانە لە لایەن (خوای گەورە ) لە نامە کەی (حاتب ) ئاگادار کرایەوە ،بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ دوو هاوەلی بەریزی رەوانەکرد کە ئەویش (علی کوری ئەبو تالیب ) و

ئ
( زوبێری کوری عوام ) نارد هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەو ئافرەتە بگرن کە نامە کەی بۆ سەرانی قورەیش هەلگرتووە و دەبات ، وە لە هێرشی ئێمە دا قورەیش ئاگادار دە کاتەوە هەواڵە کەیان پێ رادەگەیەنی ، لە دوو هاوەلە کە بەریکەوتن لە شوێنێك پێ دەوترا ( حەلیفە ) لەوێدا بە ئافرەتە کە گەیشتن ، ئەو ئافەرتەیان لە ووشترە کەی هێنایە خوارەوە ،ناو کەل وپەلە کانی گەران هیچیان نەدۆزیەوە ،هەروەها ( علی کوری ئەبو تالیب ) ووتی سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ راستی ووتوە ئەو ئافەرتە نامە کەی پیە ئێمەش راست دەکەین بە ئافرەتە کەیان ووت: یا نامەکەمان پێبدە یان تۆ لە گەل خۆمان دەگەرینەوە ، بەلام کاتێك ئافرەتەکە پێداگری ئەوانی بینی ئەویش ووتی : کەمێك برۆنە ئەولاوە ، بەلام ئافرەتەکە قژی خۆی کردەوە ،نامەکەی دەرهێنا دایە دەستیان ، ئەوانیش نامەکەیان بردەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەلی پێغەمبەریخوا ﷺ بانگی ( حاتبی کور تەلعەی ) کرد فەرمووی : بۆچی ئەم کارەت کرد..؟! ( حاتب ) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من باوەرم بە خوا و پێغەمبەرەکەی هەیە و هیچ نەگۆراوم ،بەلام لە ناو قەرەیشیە کان من پشت ریشە و کەسم نیە ژن منداڵە کانم لە نا ئەوان ژیان بەسەر دەبەن ، بەم شێوەیە ویستم لەلای قورەیشە کان جێگەیەك بۆ خۆم بکەمەوە ، ئالەم کاتەدا ( عمری کوری خەتاب ) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ رێگەم بدە با بیکوژم چونکە ئەو پیاوە خیانەتیکی گەورەی کردووە ..!! هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی عمری کوری خەتاب ئەی نازانی کە ( خوای گەورە ) لە خەلکی بەدر واتە : ئەوانەی بەشداری غەزای بەدریان کردووە فەرموویەتی هەر کارێك ئە نجام دەدەن بیدەن چونکە ئێوەم بەخشیوە ..!! هەروەها سەبارەت بە ( حاتب کوری تەلعە ) ئەم ئایەتە پیرۆزانە ی خوای گەورە هاتە خوارەوە کە دەفەرمووی : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِنْ كُنْتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنْتُمْ وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١) إِنْ يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ (٢) لَنْ تَنْفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٣) قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ **الممتحنة** ١-٣ .

ئ

واتە : ئیوە کە باوەر تان هەیە ،دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەن هاوری و پیلانی هاوریەتی لە گەل ئەوان دا مەریژن ، لەکاتیك دا ئەوان بەم راستیەی بۆ ئیوە هاتووە ، نا باوەرن ئینکارن ، وە پیغەمبەر ﷺ لە وەلاتەکەیاندا دەردەکەن و ئیوەش چونکە باوەرتان بە پەروەردگار هیناوە ،ئەگەر بۆ جیهاد لەریگەی راستی و رەزامەندی من دەرۆن ئەو کارە مەکەن بەمەست لە ( حاتب ) بووە چونکە خیانەتی کرد ! ئیوە هاوریتەی ئەوان دەشارنەوە و من بۆ ئەوەی دیشارنەوە ،زاناترم یان دانا ترم ،مەبەستی لە نامە کە بوو ! وە هەر کەسیك لە ئیوە ئەم کارە بکات ئەوا ریگەی وون کردووە ، وە ئەگەر رووبەرووی ئیوە ببنەوە ،دوژمنانی ئیوە دەست زمانیان بۆ ئیوە دریژ دەکەن ،و حەز دەکەن وەك خۆیان ئیوەش کافر بن ،لە رۆژی قیامەت دا نە خزمەکان نەمندالە کانتان سوودتان پیناگەیەنی ! هەروەها خودا دووری لە نیوان ئیوە دروست دەکات و بۆ ئەو کردەوانەی کە ئە نجامی دەدەن ، بینای یان هاوارگەی ئیبراهیم و ئەو کە سانەی لەگەل ئەودا بوون بۆ ئیوە پیشەوایەکی شیاون کاتیك بەخەلکەکەی خۆیان ووت : ئیمە لە ئیوە و ئەو بت تانەی وك خوا دە یان پەرستن ،بیزارین و بۆ هەمیشە دوژمنایەتی و رق کینە لە نیوا نماندایە تا ئەو کاتەی تەنها باوەر بەخوا بهینن ،دۆستایەتی لەنیوان ئەواندا بوونی نەبوو ، جگە لە ووتاری ئیبراهیم لەگەل باوکی کەوتی داوای لیخۆشبوونت لە خوای گەورە بۆ دەکەم و لەبەرابەر خوای گەورە ناتوانم هیچ کاریك بۆ تۆ ئە نجام بدەم ، پەروەدگارا ، پشت بە تۆ دەبەستین و بۆ لای تۆ دەگەرییینەوە و سەرئە نجامی هەموان گەرانەوە ب لای تۆیە ..!!

هەروەها هۆکاری فتح کردنی شاری مککە ئەوە بوو بەهۆی خیانەتی گەورەی هۆزی ( بەکر ) قورەیش بەرانبەر بە کوشتاری کردنی هۆزی ( خوزاعە ) هەروەها چەندین هۆی تریش هەبوو کە کاتە لە بار بوو بۆ ئەوەی شاری مککە کەعبەی پیرۆز لە بت پەرستان پاك بکریتەوە ، بۆ هەتا هەتای ئالای گە شەاوی ( لا إلە إلا اللّٰه ) بگە شیتەوە ، بەلی موسلمانان لەشاری مەدینەو دەوربەری دا بەهۆی پە یمانی حودییەی زۆر بەهیز بەتواناتر بووە لە هەمان کاتدا چەند غەزایەك پیش فتح کردنی شاری مککە کرا گەورە ترنیان غەزای خیبر بوو، کە دەست کەوتیکی جەنگی مالی یەکجار گەورەیان بەدەست هینا ،هەروەها لە ماوەی پە یمانی حودییە لە شاری مەدینە دا گرینگی دان بە پەرەسەندی هیزی موسلمانان ، لە م کاتەدا سوپای ئیسلام بەهیز و بەتواناو دامەزراو بوو ، بە پیچەوانەوە بت پەرستانی قورەیش بەرە بەرە لاواز دەبوون ، توانای جەنگ کردنیان نەمابوو وەك پیشتر بە هەرە شەگورەشە دەهاتن بە گژ موسلماناندا ،هەروەك لەجەنگی بدر و ئوحود جەنگی خەندق یان الاحزاب ، هەرشەیان دەکرد چونکە هیزو توانای سەربازیان زۆر بوو ، بەلام ئەگەر سەیری گیرانەوەی رووداوەکانی فتح کردنی شاری مککە بکەین ودەبینی کە سوپای ئیسلام لە و پەری بەهیز بەتونای دامەزراوەی دایە ،کە سوپای ئیسلام هەلمەتی بردە بۆ سەر شاری مککە دا ژمارەی سوپای ئیسلام موجاهیدان کە زۆر بەی سیر نووسە کان دە گرینەوە دەلین : ( ١٠٠٠٠ ) هەزار موجاهید بووە...

ی
له (ابن عباس ) ده گێرته‌وه ده‌لێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ڕێگه‌ی ڕۆیشتنی گرته‌به‌ر ، وه (ابو رۆهم كلسوم كوری حوسیه‌نی غه‌فاری ) وه‌ك جێگری خۆی له شاری مه‌دینه دانا ، ئه‌و غه‌زایه له (١٠) ره‌مه‌زان دا بوو له سالی هه‌شته‌می كۆچی دا ، چونكه خه‌لك به‌رۆژوو بوون كاتی كه‌یشتنه (كدید ) له نیوان (عه‌سفان و ئه‌میم ) رۆژیان شكاند ، به‌ریكه‌وتن تا له (مور ئه‌لزه هران ) دابه‌زی و (١٠٠٠٠) پیاو بوون له موسلمانان هاوریه‌تیان ده‌كرد ، هه‌روه‌ها هۆزه‌كانی سلیم و موزه‌ینه وه له هه‌ر هۆزیك ژماره‌یه‌ك له‌موسلمانان هاتبوون هه‌موو ئه‌نصاره كان كۆچ كه‌ران له گه‌ل پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ دا بوون كه‌سیان له ناوشاری مه‌دینه‌نه‌مابوو.

كاتیك پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له (مورئه‌لزه‌هران ) دابه‌زی هیشتا قوره‌یشه كان بی ئاگابوون و نه‌یانده‌زانی چی ده‌كات ، له‌و شه‌وه‌دا (ابو سفیان ی كور حه‌رب ) و (حكیم ی كوری حه‌زام ) و (به‌دیل ی كوری وه‌رقا ) هاتنه ده‌روه بۆ ئه‌وه‌ی هه‌والیكیان ده‌ست بكه‌ویت ..!! هه‌روه‌ها (عباسی كووری عبدالمتلیب ) له‌ریگا دا چاوی به پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كه‌وت و (بو سفیان ی كور حاریسه ) و (عبدالله كوری ئه‌بی ئومیه كوری موغیره ) له نیق ئه‌لعیقاب له‌ریگه‌ی نیوان شاری مككه و مه‌دینه‌دا ویستیان برۆنه لای پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ، وه دایكه سلمه (خوا لی رازی بیت ) سه‌باره‌ت به‌وانه قسه‌ی له‌گه‌ل پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كرد ووتی : ئه‌ی پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئامۆزاو كوره پورو زاوكانی تۆن ..!! پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : كارم به‌وان چیه ..؟! كوره مامم ریزی شكاندم و كوره پوور و زاواكه‌م ئه‌و كه‌سانه‌ش كه له شاری مككه زمانیان بۆ جویندان قسه‌ی نه‌شیاو بۆ من ده كردووه ..!! كاتیك ئه‌وانه له ووته كانی پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئاگادار بوونه‌وه ، (ابو سفیانی كوری حاریس ) مناله كه‌م ته‌مه‌نه‌كه‌ی خۆی یان بچووكه‌كه‌ی خۆی پی بوو ، ووتی : سویند به‌خوا ئه‌گه‌ر ریگه نه‌دات ببینم ده‌ستی مناله كه‌م ده‌گرم و ده‌رۆم و سه‌رگه‌ردان له سه‌ر زه‌وی دا ده‌سووریمه‌وه ، تا ئه‌و كاته‌ی له برسان و له تینان ده‌مرم .!! به‌لام كاتیك پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌م قسه‌یه ئاگادار كرایه‌وه ئه‌ویش وه‌ك بببیشه‌ی هه‌میشه‌یی خۆی به‌زه‌یی پیدا هاتووه ریگه‌ی دا كه‌بببین ، ئه‌وانیش چوونه‌لای شایه‌تمانیا هینا باوه‌ریان به ئیسلام هینا بوونه موسلمان ..!! به‌لی ئیسلام بووه مایه ی خیرو خۆشی بۆ ئه‌وانه‌ی كه جگه له خوا خوایه‌كی تر ده‌په‌رستن ، به‌لی باوه‌شی ئیسلام كرایه‌وه بۆ بت په‌رستان تاك به‌تاك كۆمه‌ل به‌كۆمه‌ ده‌هاتنه نیو باوه‌شی ئیسلام ، له نه‌فامی نه‌زانی سه‌رده‌می بت په‌رستی رزگاریان بوو ، هه‌روه‌ها باوه‌ریان به خوایه‌كی تاك ته‌نها هینا ، له‌ژیر ئالای گه‌شاوی بۆ هه‌میشه‌یی (لا إله إلا الله ) حه‌سانه‌وه ، هه‌ر ئه‌مانه‌ش بوون ئه‌و ئاینه‌پاكه‌یان به ئیمه گه‌یاند له‌سه‌رانسه‌ری جیهاند ، هه‌ر بویه سالی هه‌شته‌می كۆچی بوو به سالی زیرن بۆ ده‌وله‌تی مه‌دینه و سوپای ئیسلام بانگه‌وازی په‌یامه‌كه‌ی پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ چونكه ژیانی خه‌لیكی شاری مككه‌ی له تاریكی دا گۆری بۆ نووری رووناكی ،ئه‌م نووره جوانه‌ی ئیسلام سه‌رتا پای جیهانی گرتۆته‌وه ئه‌وه‌ی ده‌ستی پیوه بگریت..!!

ئ

واقدی دەڵیت : کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی فتحی مککەی بوو ، دەستەیەك دەیان ووت : مەبەستی قورەیشی هەیە ، وە دەستەیەکی تریش دەیان ووت : دەیەوێت هێرش بکاتە سەر ( هەوازین ) دەستەیەکی تریش دەیان ووت : بەرەوە هۆزی ( سەقەف ) دەڕوات ، پیغەمبەر ﷺ نوینەری خۆی ڕەوانەکرد بۆ هەموو هۆزەکان ، هەندیکیان نەهاتن و ئالایان نەبەست تا گەیشتنە ( قەدید ) وە نەوەی ( سلیم ) بە ئەسپ و تفاقی جەنگی هاتن ، وە ( عویەیینە ) لە گەڵ چەند کەسیك لە هاوەڵانی لە ( عەرج ) پەیوستی پیغەمبەر ﷺ بوو ، وە ( ئەقرەعی کوری حابس ) لە ( سەقیا ) پەیوەستی بوو ، ( عویەیینە ) بە پیغەمبەری خوای ﷺ ووت : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ تۆ نە چەك و تفاق کەرەستەی جەنگ کردنت هەیە ..!! نە جل و بەرگی ئیحرامت پۆشیوە ..!! تۆ بۆ کویی دە ڕۆیت ..!؟ پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر شوینیك کە خوای گەورە بیەویت ..!! هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ دوعاو نزای کرد بۆ ئەوەی کە قورەیشە کانی شاری مککە ئاگادار نەبنەوە ،هەروەها ( عباس ) لە ( سەقیا ) گەیشتە پیغەمبەری خوا ﷺ وە ( مەخزیمەی کوری نەوفل ) لە ( نیق ئەلعیقاب ) ڕۆیشتە لای پیغەمبەری خوا ﷺ کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە ( مورە ئەلزەهران ) دابەزی ، ( ابو سفیانی کوری حرب ) لە شاری مککە هاتبووە دەرەوە ، هەروەها ( ابن عباس ) دەڵیت : کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینە بەریکەوت لە ( مورە ئەلزەهران ) دابەزی ، عباس ووتی : سویند بەخوا ئەگەر پیغەمبەری خوا ﷺ بەشیوەیەکی لەناکاو هیرشی بکاتە سەر شاری مککە بۆ هەمیشە لە ناو دەچن .سواری ئیستر سپیە کەی پیغەمبەر ﷺ بوو بە خۆی ووت : بەرەو ئەو ڕەزە دەڕۆم ئەگەری کۆلبەریك یان شیر دۆشیك ببینم وە بینیرم بۆ شاری مککە بۆ ئەوەی قورەیشە کان لە هاتنی پیغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بکاتەوە تا بین و دوای ئەمانی لی بکەن ..!! دەڵیت : ڕۆیشتم و لەناو ڕەزەکەدا دەگەرام تا کەسیك بدۆزمەوە ،لە ناکاو دەنگی ( ابو سفیان کوری حەرب ) و ( بودەیل کوری وەرقا ) م بیست کە بە مەبەستی بەدەست هینانی هەواڵە کانی پیغەمبەر ﷺ هاتبوونە دەر ، بیستم ( ابو سفیان ) دەبی ووت: سویند بەخوا هیچ کات ئاگریکی بەو گەورەنەبینیوە ، ئەمە ئاگری خەڵکانی خوزاعەیە ..!! وتیشی بەڵام هۆزی ( خوزاعە ) لەوە زۆر کەمترن ..!!

کاتیك دەنگی ئەومم ناسیەوە ووتم : ئەی باوکی ( حەنزەلە ) ..!! ( ابو سفیان ) ووتی: ئەی باوکی فەزلیت..!! منیش ووتم : بەڵی . ( ابو سفیان ) ووتی : ئەی دایك و باوکم بەقوربانت بیت چ هەواڵیکت پیە ..!؟ ئەڵی منیش ووتم : پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵ ( ١٠ ) هەزار جنگاوەر هاتوون ناتوانن لە بەرانبەری ئەودا خۆراگری بکەن . ( ابو سفیان ) ووتی : ئەی ڕاو بۆ چوونی تۆ چیە ..!؟ ئەڵی منیش ووتم:

لە پشت سەری من سواری ئە ئیسترە بە ، تا وەکو ئەمانت بۆ وەر بگرم سویند بەخوا ئەگەر دەستی بە تۆ بگات دەت کوژیت ..!!

ئ

دەلیت : ( ابو سفیان ) لە پشت سەری من سەرکەوت ،ئیسترە کەی پیغەمبەرم ﷺ تاو دا رۆیشتینە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ، لە ریگا دا کاتیك بەلای ئاگری موسلمانان تی دەپەرین ،سەریان دەکرد و دەیان ووت : مامی پیغەمبەری خوا ﷺ سواری ئەسپەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ بووە ..!! کاتیك گەیشتنە لای ئاگرە کەی ( عمری کوری خەتاب ) ئەویش ووتی : ئەوە ( ابو سفیانە ) سوپاس بۆ خوا چونکە بی پەیمان بی بەلین تۆی خستە بەردەستی من ، ( عمری کوری خەتاب ) بۆ لای پیغەمبەری خوا ﷺ چوو ،منیش ئیسترە کەم تاو دا تا گەیشتمە بەردەم خیوەتەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل ( عمری کوری خەتاب ) بە یەکەوە گەیشتینە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ، ( عمر ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ( ابو سفیانە ) دوژمنی خوایە بی پەیمان و بی بەلین هاتووە بەردەستی تۆ ریگەم بدە با سەری بپەرینم ..!!

ئەلی منیش ووتم : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ من پەنام داوە ، لای پیغەمبەر ﷺ دانیشتم و سەریم کرد ووتم : سویند بەخوا کەس جگە لەمن بە گویی ئەو دا نا چرپینیت ..!! بەلام کاتیك ( عمری کوری خەتاب ) سەبارەت بە کوشتنی ( ابو سفیان ) پی داگری دە کرد ، منیش ووتم : ئەی ( عمر ) صبر و ئارامت هەبی ، سویند بەخوا بۆیە پیداگری دەکەیت چونکە یەکیك لە نەوەی ( عبدالمناف ) ئەگەر لە نەوەی ( عودەی کوری کەعب ) دە بوو قسە نەدەکرد . هەروەها ( عمر ) ووتی : ئەی ( عباس ) ئارام بە ، سویند بەخوا کاتیك باوەرت هینا ، بە ئەندازەیە لە باوەری تۆ شادومان بووم ، ئەگەر باوکم ( خەتاب ) باوەری دەهینا ، بەو ئەندازەیە شادمان نەبووم ،چونکە دەمزانی پیغەمبەر ﷺ لە باوەر هینانی تۆ زیاتر لە باوەر هینانی ( خەتاب ) شادمان دەبیت ..!! لە پاشاندا پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : برۆ ئەمانمان پیدا ، بەلام بەیانی بیهینەوە ..!!

بەلی ( عباس ) ( ابو سفیانی ) لە خیوتەکەی خۆیدا جیگەی کردەوە ، وە بەیانی بردیەوە بۆ لای پیغەمبەریخوا ﷺ کاتیك سەریر کرد فەرمووی : ئەی ( ابوسفیان ) ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە شایەتی بدەیت خوایەك جگە لە خوای ﷺ بوونی نیە ..؟! ( ابو سفیان ) ووتی دایك باوکم بەقوربانی تۆ بن ، چەند خزمیکی وەفادار و خۆراگریت ، سویند بەخوا ئەگەر خوایەکی دیکە بوونی دەبوو ،کاریکی بۆ من ئە نجامدەدا ..!! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئای کاتی ئەوە نەهاتووە بزانی من پیغەمبەری خوام ..؟! ( ابو سفیان )ووتی : دایك و باوکم بەقوربانی تۆ بن ، شتیك لەدلمدا دروست بووە ..!!

( عباس ) دەلیت : پیم ووت : پیش ئەوەی بتکوژن ،شایەتوومان بینە ..!! ( ابو سفیان ) شەیەتوومانی هینا پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی ( عباس ) بیبە نزیك لووتەکەی کیوە کە لە ناو دۆلەکە بیوستینە تا سوپای خوا لای ئەو تیدەپەریت ..!! ( عباس ) ئەلی ووتم : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ( ابو سفیان ) پیاویکە ئارەزووی لە سەرفرازی دەکات ،کاریك بکە لە ناو خەلکەکەی سەرفراز بیت ..!!

ئ

هەروەها پیغەمبەری خوا فەرمووی : زۆر باشە هەر کەس براتە مالی ( ابو سفیان ) لە ئەماندایە ..!! وە هەرکەس برواتە مسجد حرام لە ئەماندایە ..!! و هەرکەس دەرگای مالەکەی لەسەر خۆی دا بخات لە ئەماندایە ..!! ( عباس ) دەلی : منیش ( ابو سفیان ) برد لەو شوینە دامنا ،هۆزەکان بەبەردمی تیدە پەین ( ابو سفیان ) دەی پرسی : ئەی ( عباس ) ئەمانە کین ..؟! منیش یەك یەك ناوی هۆزە کانم پیدە ووت .

دەم ووت : ئەوە هۆزی سولە یمە ،ئەوی دەی ووت : کرام بە سولەیم چیە ؟ هۆزی کی دەکە دەهات دەی پرسی ئەمانەکین ..؟! دەم ووت : ئەوە هۆزی ئەسلەمە یە . دەی ووتم : کارم بە ئەسلەم چیە ..؟! هەروەها هۆزی جوهینە تیپەری و پرسی : ئەوانەکین ..؟! دەم ووتم :هۆزی جوهینەیە ،دەی ووت : کارم بەهۆزی جوهینە چیە ..؟! کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لەگەل دەستەیەکی سەوز دا تیپەری ، کە لە خەلکانی کۆچ کەران و ئەنصارە کان پیك هاتبوون ،هەر هەموویان چەکدار بوون و تەنها چاویان دە بینرا ، ( ابو سفیان ) پرسی : ئەی باوکی فەزل ئەمانەکین ..؟! ئەلی میش ووتم : ئەوە پیغەمبەری خوا ﷺ لەگەل کۆچ کەران و ئەنصارە کانە ..!! ( ابو سفیان ) ووتی : ئەی باوکی فەزل ،برازاکەت پاشایەتیەکی گەورە هە یە ..؟!

( عباس ) ئەلی منیش ووتم : ئەوە پیغەمبەر نەك پاشایەتی ..!! ئەلی ئەویش ووتی : راستە ..!!

( عباس ) ئەلی بە ( ابو سفیان )م ووت : تۆش برۆ بۆلای سەرکردەکانی خەلکەکە ت ئاگاداریان بکەرەوە .

( عباس ) ئەلی : ( ابو سفیان ) بە خیرای رۆیشت و رووی کردە ( مسجد الحرام ) هاواری کرد ئەی قورەیشەکان ﷺ بە سوپایەکەوە هاتووە وە ناتوانن لە بەرانبەری دا بوەستن و خۆراگر بن ..!!

قورەیشەکان ووتیان : چی بکەین ..؟! ( ابو سفیان ) ووتی : هەر کەس براتە مالەکەی من پاریزراوە ..!!

قورەیشەکان ووتیان : مالەکەی تۆ بەکەلکی ئیمە نایەت ..!! ( ابو سفیان ) ووتی : هەر کەس براتە ( مسجد الحرام ) پاریزراوە و هەرکەس دەرگای مالەکەی بەسەر خۆی دا بخات ، پاریزراوە ..!!

ئ

هەروەها لە ( هوشام کوری عوروە ) دەلێت : باوکم بۆ ( عبدالمليك کوری مەروانی ) نووسی : لە منت پرسیوە ئایا ( خالید کوری ولید ) لە رۆژی فتح کردنی شاری مککە دا ، هێرشی برد و هێرشکەی بە فەرمانی کێ بوو؟! ئەو رۆژە لەکاتی فتح کردنی شاری مککە دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ،کە گەیشتە دۆلی ( مورە ) و مەبەستی مککەی کرد ، قورەیشە کان ( ابو سفیان ) و ( حەکیم ی کوری حەزامیان ) نار تا پێغەمبەری خوا ﷺ ببینن ، لەو کاتەدا نەیادەزانی مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بۆ کوێیە ..!! هێرش دەکاتە سەر قورەیشە کان یان هێرش دەکاتە سەر شاری ( تائیف ) ، ( ابو سفیان کوری حەرب ) و ( حەکیم کوری حەزام بودەیل کوری وەرقا ) لەگەڵ خۆیان برد چونکە هاودەمی ئەویان پێ خۆش بوو، قورەیشە کان کاتێك ئەوانیان رەوانە کرد ، ووتیان : بزانن مەترسیمان لەسەرە چونکە نازانین مەبەستی محمد ﷺ بۆ کوێیە ..؟! هێرش دەکات سەر ئێمە یان هوازین یان سەقیف . هەروەها ئاشتی حودیبیە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و قورەیشەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەرپا بوو ، نەوەی ( بکر ) پەیوەستی قورەیشەکان بوو ،دەستەیەك لە نەوەی ( کەعب ) لە گەڵ تایفەی نەوەی ( بکر ) شەریان کرد ، لە پەیمانی ئاشتی حودیبیە باس کرا بوو هەر دوو لا دەست لەشەری یەکتر هەلبگرن ،قورەیشە کان بە چەك وتفاق هاوکاری یارمەتی نەوەی ( بکر ) یان دا ،ونەوەی ( کەعب ) واتە ( خوزاعە ) لە کارە ئاگادار نەبوو نەوە ،وە لەبەر ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ فتح کردنی شاری مککە بەریکەوت ،وە لە شەرەدا لە ( مور ئەلزەهران ) ( ابو سفیان ) و ( حەکیم ) و ( بودەیلی ) بینی ، ئەوان نەیان دەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێ دابەزیوە تاکو لێ نزیك کەوتنەوە ،لە ( مورە ) ( ابو سفیان ) و ( حەکیم ) رۆیشتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتیان لەگەڵ دا بەست ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی بۆ لای قورەیش نارد ، وە پێشنیاری ئیسلامی پێ کردن ، بە بیرم ماوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەرکەس براتە مالی ( ابو سفیان ) پاریزراوە ..!! وە هەرکەس براتە مالی ( حەکیم ) پاریزراوە ،وە مالی ( حەکیم ) لە خوارەوەی شاری مککە بوو ، وە هەر کەس دەرگای لە مالە کەی لەسەر خۆی دا بخات و شەرنەکات ، کاتێك ( ابو سفیان )و ( حەکیم ) لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گەرانەوە و بەرەو شاری مککە بەریکەوتن ، پێغەمبەری خوا ﷺ ( زوبیری ) بە دوای ئەواندا نارد ،وە ئالاکەی خۆی پێدا ،ئەوی کردە سە رکردەی کۆچ کەران و ئەنصارەکان و فەرمانی پێدا ئالا کەی لەسەرەوەی شاری مککە لە ( حەجوون ) هەلواسیت ،فەرمووی :لەو شوینەی بمینەوە مەرۆ تاکو دیمە لات ..!!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك رۆیشت ناو شاری مککە و بە ( خالید کوری ولید ) و موسلمانەکانی هۆزی ( خوزاعە ) و هۆزی ( سولەیم ) کەسانی تازە کە ئیمانیان هینا بوو بوونە ئیسلام ..!!

ێ

پیغەمبەری خوا ﷺ پیانی فەرمووە: لە خوارەوەی شاری مككە برۆنە ناو شارەكە ، چونكە نەوەی ( بكر ) لەوی بوون ..!! هەروەها قوریشە كانیش ئەوان نەوەی ( حارسی كوری عبدالمنات ) حەبەشیە كانیان بۆ هاوكاری بانگ كردبوو ، پیان ووتبوو : لە خوارووی شاری مككە جیگر بن ،وە ( خالیدی كوری ولید ) لە خوارووی شاری مككە هیرشی كردە سەر ئەوان ..!! بیستم : كاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ ( زوبیر ) و ( خالیدی كوری ولید ) رەوانەكرد فەرمووی : تا كەس شەری لە گەل ئیوە نەكردووە ، شەر لەگەل كەس مەكەن ..!! كاتیك ( خالیدی كوری ولید ) لە خوارووی شاری مەكە لە گەل نەوەی ( بكر ) و ( حەبەشیە كان ) نزیكەوتنەوە ، شەر و كوشتاری دەست پی كرد ،( خوای گەورە ) سەركەوتنی بە ( خالید كوری ولید ) بەخشی ، لەم شەرە دا زیاتر لە شاری مككە شەرو كوشتار روویندا جگە لە ( كورزی كوری جابری موحاربی ) و( كوری ئەشعەری كەعبی ) كە لەناو سوپاكەی ( زوبیری كوری عوام )دا بوون و لە گەلدا پەرینەوە و لەریگەی ( زوبیری كوری عوام ) كە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پیدا بوون ،لەویوە نەرۆن بوەستن ..!! ئەو دوو پیاوە رۆیشتن روبەرووی دەستەیەك لە بت پەرستانی قورەیش بوونەوە و كوژران و شەهید بوون ،لە پشاندا لە سەرەوەی شاری مككە دا ،خەلكان لە دەوری پیغەمبەری خوا ﷺ كۆ بوونەوە بەیعەتیان بەست ، پیغەمبەری خوا ﷺ نزیكەی ( ١٥ ) شەو لەشاری مككە دا مایەوە تاكو كاتیك خەلكانی لە ( هوازین )و ( سەقیف ) لە حە نین دابەزین ..!!

هەروەها لە ( عبدالله كوری ئەبی نەجیح )وە دە گیرتەوە دەلیت : كاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ خۆی بە تەواوی دابەش كرد ، بە ( زوبیری كوری عوامی ) فەرمووە : لە گەل دەستەیەك لە جنكاوەر كانی سوپای ئیسلام برواتە ناو كەدی و ( زوبیر ) فەرماندەی بالی دەستی راستی سوپاكە ی خۆی بوو ، وە فەرمانی بە ( سعدی كوری عبادە ) كرد لە گەل دەستەیەك لە جنگاوەرە كانی سوپای ئیسلام بەروە كەدا بروا و دەستەیەك لە موسلمانان گومانیان كردوو كە ئەو رۆژە ( سعد ) بەریكەوت ، دەی ووت : ئەم رۆ رۆژی جنگ و كوشتارە ریز نامینیت ..!! یەكیك لە كۆچ كەران ئەم قسەیە ی بیست ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ببیستە ( سعدكوری عبادە ) دەلیت : دەترسم هیرش بكاتە سەر قورەیشە كان ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ( علی كوری ئەبی تالیب ) كرد خۆت بە ( سعدی كوری عبادە ) بیگەیەنە ئالاكەی لیوەربگرە خۆت بەروە شاری مككە بەریكەوە ..!!

ئ

هەروەها لە ( عبداللە ی کوری ابی بکر )دە گێرتەوە دەلیت : ( صفوانی کوری ئومییە ) و ( عیکرمەی کوری ابو جهل ) و ( سوهیلی کوری عمرۆ ) لە ( خیندمە ) کۆبوونەوە وە تاکو شەر کوشتارو جەنگ بکە لە گەل سوپای ئیسلام ، وە ( حیماسی کوری قەیسی بەکری ) پیش ئەوەی پیغەمبەری خوا ﷺ براتە ناو شاری مککە ،شمشیری ئامادە دە کرد سەر قالی تیژ کردنی بوو ، هاوسەرەکەی پی ووت : بۆچی ئامادە کاری دەکەیت ..؟! حیماس ووتی : بۆ ﷺ و هاوە لە کانی ..!! هاوسەرەکەی ووتی : گومان ناکەم هیچ شتیك خۆراگری لە بەرنبەر ﷺ و سوپاکەی ئەو دا بکات ..!! هەروەها ووتی : هیوا دارم یەکیك لەوانە بینە خزمەتی تۆ ..!! بەلی ( حیماس ) لەگەل ( صفوان ) و ( سوهەیل ) و ( عیکرەمە ) لە ( خین دە مەدا ) بوون ، بەلی کاتی سوپای ئیسلام رووبەروویان بوونە شەرو کوشتار جەنگ دەستی پی کرد ، کە ( کیرزی کوری جابر ) و ( خونەیسی کوری خالید ) کە لە ناو سوپاکەی ( خالیدی کوری ولید ) دا بوون ،لی جیا بوونەوە و ،ریگەیەکی تریان گرتەبەر و کوژران یان شەهید بوون ، ئەگیرنەوە دەلین : خونەیس کوری خالید ) پیش ( کیرزی کوری جابر ) شەهید بوو ، ( کیرز ) لاشەی ( خونەیس ) لە لا بوو تاکو ئەویش شەهید بوو لەنیوان قاچەکانی دا بوو ..!! هەروەها لە نەوەی جوهینە ( موسلمەی کوری مەیاء ) شەهید بوو کەلە ناو سوپاکەی ( خالید کوری ولید ) بوو ، هەروەها لە کافرو بت بەرستانی قورەیش نزیکەی ( ١٢ ) تا ( ١٣ ) کەس کوژرا .

بەلی بت بەرستان شکستیکی گەورە یان خوراد ( حیماسی کوری قەیس ) رای کرد تا گەیشتە مالەوە بە هاوسەرەکەی ووت : دەرگای مالەوە دا بخات یان بیبەستەوە ..!! هاوسەرکەی ووتی : ئەی کوا خزمەت کارە کەت ..؟! حیماس ) ووتی : ئەگەر دەبینی کە وا ( صفوان ) و ( ئومییە ) هەلاتن و شمشیری ئەوان لە ناو ماندا سوورا و دەست و سەرەکان قرتاند ،سەر کۆنەت نەدە کردم ..!!

فتح کردنی شاری مککە ( میژووی طبري بە کوردی ) بەرگی سیەم لا پەرە ١١٥٨ تاکو لا پەر ١١٧١.

هەروەها لە (ابن ئسحاق ) دەگێرتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەرکردە کانی سوپا کەی خۆی فەرموو : تا ئەوان شەر دەست پێنەکەن ئێوە شەرو کوشتار نەکەن ..!!بەلام ناوی چەند کەسێکی برد لە کافرو بت پەرستانی قورەیش فەرمووی : ئەگەر خۆیان هەلواسی یان خۆیان لە ژێر پەردەکانی کە عبەدا ئەوکە سانە تان بینی خوێنیان برێژن و سەریان بپەرینن ..!!هەروەها (عبداللە ی کوری سعدی کوری ئەبی سەرح ) یەکێك بوو لەو کەسانە ..!!چونکە ئەو پیاوە پێشتر ئیمانی هینا بوو بە ئیسلام بەلام دواتر پاشگەز بېۆتەوە مرتد ببوو ،لە ئاینی ئیسلام دەرچوو بوو ، چوو بووە سەر ئاینە کۆنەکەی خۆی کە ئاینی قورەیش بوو ئەویش پت بەرست بوون ..!!لە رۆژی فتح کردنی شاری مککە رای کرد پەنای برد بەر مالی (عوسمانی کوری عفان ) چونکە (عبداللە ی کوری سعد )و (عوسمانی کوری عفان ) لە شیر دا برای یەکتر بوون واتە : شیریان لە یەك داینە بەیەکەوە خوراد بوو ، بەلی (عوسمانی کوری عفان ) ئەویش شاردەوە تاکو شاری مککە ئارامی بە خۆوە وەگرت ، لە پشاندا (عوسمان ) (عبداللەی کوری سعدی کوری ئەبی سەرح )ی بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی پەنای بدات و ئەمانی بداتی شفاعەتی لەلای پێغمبەری خوا ﷺ بۆ بکات ..!! بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەیەکی زۆر بیدەنگ بوو ..!! دواتر فەرمووی : ئەمانی هەیە ..!؟ بەلی کاتێك (عوسمان ) (عبداللەی کوری سعدی ) بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : من بۆیە بۆ ماوەیەکی زۆر بیدەنگ بووم تاکو یەکێکتان هەستێت سەری بپەرینی ..!! یەکێك لە ئەنصارە کان هەستاو ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا بۆ چی ئاماژە یەکت نەکرد ..!؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئاماژە لە کەس ناکەم ..!!

هەروەها (عبداللە ی کوری خەوتەل ) یەکێکی تر بوو لەوانەی کە فەرمانی کوشتنی دا بوو ، ئەو پیاوە کە ناوی (عبدالله ی کوری خەوتەل ) بوو پێشتر موسلمان بوو ئیمانی هینابوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی نارد بۆ زەکات وە گرتن ،وە یەکێك لە ئەنصارە کانی کردە یاوەری ، (عبداللەی کوری خەوتەل ) کۆیلەیەکی هەبوو وە خزمەتی دەکرد ، بە کۆیلە کەی خۆی ووت : کە بزنێك سەر ببرێت خواردنێکی بۆ ئامادە بکات ، (عبدالله کوری خەوتەل ) لە پاشاندا خەوت بەلام کۆیلە کە بزنەکەی سەر نەبری هیچ کارێکی نەکرد بوو ، کاتێك (عبدالله ) لە خەو هەستا بینی هیچ کارێکی نەکردووە،کۆیلە کەی خۆی کوشت لە موسلمان بوون ئیمان هینان بە ئاینی ئیسلام پاشگەو بۆوە مرتد بووە لە ئیسلام دەرچوو .!!

دوو کەنیزە هە بوو گۆرانیان بۆ دەووت ، یەکێکیان ناوی (فەرتنا ) بوو لە گۆرانەیە کانی جیونی یان ئیهانەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دە کرد ..!! پێغەمبەری خوا فەرمووی : دوو کەنیزەکەش لەسەری بدرێت بی کوژن ..!! هەروەها (حویریسی کوری نەقیز ) یەکێکی تر بوو لەو کەسانەی فەرمانی کوشتنی درا بوو دە بیت لەسەری بدرێت ، چونکە لە شاری مەدینە پێغەمبەری ئازار دا بوو ..!! هەروەها (مەقیسی کوری صوبابە ) یش یەکێك بوو لەوان لەبەر ئەوەی یەکێك لە ئەنصارە کانی بە هەلە براکەی کوشت ،ئەو

ئەنصارەی کوشت و گەڕایەوە ناو قورەیشە کان پاشگەز بووەوە مرتد بۆیەوە پشتی قورەیشە کانی گرت لە ئاینی ئیسلام هەلگەڕایەوە ..!! هەروەها ( عیکرمەی کوڕی ابو جهل ) و ( سارەی ) کەنیزە یەکیك لە نەوەی عبدالموتەلیب ، پیغەمبەری خوا ﷺ ئازار دەدا ، ئەوانیش فەرمانی سەربڕینی کوشتنیا بەسەر درابوو ، ( عیکرمەی کوڕی ابو جهل ) بۆ وەلاتی یەمن هەلهات و ، وە هاوسەرکەی کەدەکاتە کچی ( حەکیم ی کوڕی حارس کوڕی هشام ) ئیمانی هیناو موسلمان بوو ، لە پاشاندا هاوسەرەکەی داوی ئەمانی بۆ کرد پیغەمبەری خوا ﷺ رازی بوو ،هاوسەرەکەی ئەوی هینایەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ .

دە گیرنەوە دەلین : هۆکاری ئەوەی ( عیکرمەی کوڕی ابو جهل ) کە ئیمانی هینا ئەوە بوو ، دوای هەلاتن بۆ یەمەن ئەمە یە : عیکرمە خۆی دە گیریتەوە دەلیت : ویستم سواری کەشتی بم بەرەو حەبەشە بڕۆم ، کاتیك لە کەشتیەکان نزیك بوومەوە ،کەشتیوانەکە بەمنی ووت: ئەی بەندەی خوا ،تۆ باوەر ناهینیت وە ناباوەریت ..؟! نابیت سواری کەشتیە کەی من بی ..!! چونکە ئەگەر تۆ سەر کەویتە ناو کەشتیەکە هەر هەموومان لە ناو دەچین ،بەهۆی کفرو ئیلحادی تۆوە کە بی باوەریت ..!!

عیکرمەی کوری ابوجل ئەلی : کە س سواری کەشتیەی تۆ نابیت مەگەر ئەوەی پەشیمان و باوەر بینیت ..؟

کەشتی وانەکە ووتی : بەلی .کەس سەر ناکەویت جگە لە ئیمانداران نەبیت ..!!

عیکرمە ی کوری ابو جهل دەلی : منیش بەخۆم ووت : کەواتە بۆ لە ﷴ جیابووومەوە ،ئەو دەی فەرموو: خوای ئیمە لەدەریاو لە وشکانیە .. لە پاشاندا ئیسلامم ناسی باوەرم هینا بە ئاینی ئیسلام ..!!

بەلی دواتر ( عبدالله کوری خەوتەل ) یان گرت .و سعدی کوری حورەیسی مەخزومی و باوکی بوریدەی ئەسلەمی ئەویان کوشت ..!! مەقیس کوری صوبابە گرت ،بەدەستی نەمیلە کوری عبدالله کوژا .یەکیك بوو لە هۆزە کەی خۆی ،هەروەها یەکیك لە دوو کەنیزە کە کوری خەوتەلیان کوشت کە گورانی نیان دەووت جینیان دەدا بە پیغەمبەی خوا ﷺ بەلام ئەوەی دیکەیان هەلهات دواتر ئەمانیان بۆ وەرگرت ..!! کە ناوی ( ساریە ) بوو ،تا خەلیفایەتی ( عمری کوری خەتاب ) مایەوە ، هەروەها ( حوریریس کوری نەقیز ) بەدەستی ( علی کوری ئەبی تالیب ) کوژرا ..!!

فتح کردنی شاری مککە ( میژووی طبري بە کوردی ) بەرگی سیەم لا پەرە ١١٧١ تاکو لا پەر ١١٧٣.

واقدی ده گێرتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بە کوشتنی شەش پیاو چوار ئافرەت کە ئەوانە دەبێت بکوژرێن چونکە تاوانیان دژ بە ئیسلام ئەنجامدا بوو ، دەربارەی ئەو پیاوانەی کە لە گێرانەوەکەی سەرەوەدا ( ابن ئسحاق ) گێرایەوە ، بەلام ئافرەتەکان لە مانە بوون ( هیندی کچی عوتبەی کوری رەبیعە ) پێ زیاد دە کات . بە لام هیند بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ باوەری هینا ، وە ( سارەی کەنیزەکی عمری کوری هاشم ی کوری عبدالمتلیب ) کوژرا ، هەروەها ئافرەتیك بوو ناوی ( قوریبە ) بوو ئەویش کوژرا ، بەلام یەکیکی تر لە و ئافرە تانە ناوی ( فرتنا ) بوو ئەو زیندوو مان تاسەردەمی خلیفەیەتی عوسمانی کوری عفان بەلی ئەم چوار ئافرەتە فەرمانی کوشتنیان بەسەر دا درا بەلام دووا نیان کوژران ..!! هەروەها لە قتادە ( خوا لی رازی بیت ) دە گریتەوە دەلیت : پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەردەم کەعبە دا وەستا و فەرمووی : خوایە ك جگە لە خوای تەنها هیچ خوایە کی تر بوونی نیە .. تەنها خوایەکە کە بی شریك و هاوبەشە هیچ خوایەکی تر بوو نی نیە ..!! بەلینە کانی خۆی بردە سەر و سەر کەوتنی بە بەندەکەی خۆی بەخشی و سوپای ئەحزابی شکست پی هینا ، بزانن هەر دەست کەوتیك و خوین و سامانیك جگە لە پەروەردگاری ئاوەدانی حاجییەکان ، چیتر ئەوانە سەرناکەون ،بزانن کوشتنی بە هەلە هاوشێیوەی کوشتنی بە ئەنقەستە نیە..!! کوژراوی بە قامچی و داردەست خوینبایی هەیە ..!! ئەی قورەیشە کان ( خوای گەورە ) غروری نەفامی و شانازی کردن بە باو باپیرانتانی لە ناو برد ،خەلك لە ئادەمن ئادەمیش لە گلە دروست کراوە ..!! دواتر ئەو ئایەتەی خویندەوە کە خوای گەورە دەفەرموویت :

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ الحجرات ١٣ . واتا : ئەی خەلکینە ئیوەمان لە ژن و پیاو دروست کردووە ، بۆ هۆزو دەستە کۆمەل دابەشمان کرد تاکو یەکتر بناسن ، چونکە ریزدار ترین نی ئیوەیە یان چاکترینی ئیوە ،ئەو کەسەیە لە لای ( خوای گەورە ) کە پاریزگاری دەکات لە خۆی بە تقوا و چاکە کارە ..!! هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی قورەیشە کان ئەی خەلکی شاری مککە وا گومان دەبەن کەمن چی لە ئیوە دەکەم ..؟! ئەوانیش ووتیان : چاکەمن لە گەل دادەکەیت و چونکە تۆ برایەکی بەریزی ریزداری لە ناومان ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : برۆن ئیوە ئازادن ..!!

ئ
بەلی خوای گەورە پیغەمبەرەکەی ﷺ بە سەر قورەیشە کاندا زال کرد سەر کەوتنی بە دەست هینا ، هەروەها دەست کەوتەکانی جەنگی فتحی مککە ی بۆ گەراندنەوە و دیلە کانی بەرەلاکردو ئازادی کردن ،دوای ئەوە خەلکی شاری مککە بۆ بەیعەت کردن لەدەوری پیغەمبەری خوا ﷺ کۆ بوونەوە ، ( عمری کوری خەتاب ) لەخوارەوەی پیغەمبەری خوا ﷺ دانیشت بوو ، چاودیری کەسەکانی دەکرد ، بەلی خەلکەکە بەیعەتیان لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ بەست دەستە بەدەستە هەروەك خوای گەورە لەم دوو ئایەتەدا دەفەرموویت ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ (١) وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا﴾ النصر ١-٢ . بەلی بەیعەتان بە ست بە ( سمع طاعة ) واتە : گویرایەلی کردن شوین کەوتنی پیغەمبەری خوا ﷺ بن ، بەلی کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل پیاوەکان بیعەتی کرد ، دواتریش لە پاشاندا لە گەل ئافرەتەکانیش بەیعەتی بەست ، بەلی دەستەیەك لە ئافرەتانی قورەیش بۆ بەیعەت بەستن هاتن ، ( هیندی کچی عوتبە ) یەکیك بوو لە ئافرەتانە کە بیعەتی بەست ،بەلام هیند زۆر شەرمەزار بوو بەرامبەر بە پیغەمبەری خوا چونکە کاریکی قیزەونی کرد لە گەل ( حمزەی کوری عبدالمتلب ) کەدەکاتە مامی پیغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی ئوحود دا ،بەشیوەیەك هات بەیعەتی بەست دەم چاوی خۆی پۆشی بوو ،بەشیوە یەك کە نەناسریتەوە ، رۆیشتەلای پیغەمبەری خوا ﷺ دەترسا پیغەمبەر ﷺ لیپرسینەوەی لەگەل دا بکات سەبارەت بە ( حمزە ) ( خوا لی رازی بیت ) بەلی کاتیك ئافرەتان بۆ بەیعەت کردن لە پیغەمبەری خوا ﷺ نزیك بوونەوە فەرمووی : لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەت ببەستن ،شەریك هاوبەش بریار نەدان بۆ پەروەردگار تەنها ئەو خوایە بپەرستن کە هیچ شریك هاوبەشیکی نیە ..!!

هەروەها هیند ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ دوای شتیك لە ئیمە دەکەیت ..؟! کە لە پیاواندا دوات کرد ، ئەو کارە دەکەین ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دزی مەکەن ..!! هیند ووتی : سویند بەخوا لە سامانی ( ابو سفیان )م هەلگرتوە بەلام نازانم حەلال بوون یانە ..؟! ( ابو سفیان ) ئامادە بوو ووتی : ئەوەی هەلتگرتووە حەلالت بیت ..!! هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : تۆ هیندی کچی عوتبەی ؟! ئەویش ووتی : بەلی . پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە رابردوودا چاو بپۆشە تاکو خوای گەورە لیت خۆشبیت ..!! هەروەها پیغەمبەر ﷺ بە ئافرەتانی فەرموو : زینا مەکەن ..!! هیند ووتی : ئەی پیەمبەری خوا ﷺ مەگەر ئافەرتی ئازاد زینا دەکات ..؟! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : مندالە کانی خۆتان مەکوژن ..؟! هیند ووتی : ئیمە مندالە کانمان بە بچووکی پەروەردەمان کردن ، تۆ لە رۆژی بەدر خوینی ئەوانت رشت..!! تۆ ئەوان باشتر دەزانن ، ( عمری کوری خەتاب ) دەستی کرد بە پیکەنین ..!! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : تۆ مەتی نارەوا هەلمەبەستن بۆ یەکتری ..؟! هیند ووتی : تۆمەت هەلبەستن کاریکی قیزەونە لی خۆش بوون باشترە ..!! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : لە کارەکانتاندا نا فەرمانی من مەکەن ..؟!

ئ
هیند ووتی : ئەگەر مەبەستی ئەو کارەمان دەبوو ئیستا لیرە دانەدەنیشتین ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ بە ( عمری کوری خەتاب ) فەرموو : بەیعەتیان لە گەل ببستە و دوای بەخشینی بۆ ئافرەتەکان کرد ، ( عمر ) بەیعەتی لەگەل بەستن ، پیغەمبەری خوا دەستی ئافرەتانی نەگرت بۆ بەیعەت بەستن مەگەر ئەو ئافەرتەی کە بۆی ئەو حەلال یا مەحرەمی بیت ..!!

واقدی دەگیرتەوە دەلیت : لە ناوەدا ( خەراشی کوری ئومییەی کوری کەعبی ) ( جونەید کوری ئەدلەعی ) کوشت بە ووتەی : ( ابن اسحاق ) لەبەر تۆ لە یەك بوو کەلە سەردەمی نەفامی دا مابوویەوە لە نیوانیان دا پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( خەراش ) پیاو کوژە ( خەراش ) پیاو کووژە ..!! بەم شیوەیە سەرکۆنەی ئەوی کرد ، بە خەلکانی ( خوزاعەی ) ووت خوینبایی کوژراوەکە بدەن ..!!

عوروەی کوری زوبیر دەگیرتەوە دەلیت : ( صفوانی کوری ئومەییە ) رۆیشت بەرەو یەمەن تاکو لەویوە بۆ یەمەن بە کەشتی براوات ، ( عمری کوری وەهب ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ( صفوانی کوری ئومەییە ) سەرکردەی خەلکەکەی هۆزی بکر هەلاتووە ،دەیەویت خۆی بخاتە ناو دەریا ،ئەمانی پیببەخشە ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەمانی پی بەخشرا ..!! ( عومەیر ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ شیتك بدە بەمن تاکو ئەمانەکە بناسیتەوە ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ مەندیلە کەی خۆی پی دا کەلە کاتی رۆیشتنی لە شاری مککە لەسەری دابوو ،بەلی ( عەمەیر ) بەریکەوت تاکو ( صفوانی ) لە شاری جدە دۆزیەوە ، دەی ویست براتە ناو دەریا ، ووتی : دایك و باوکم بەقوربانی تۆ بن ، خۆت مە خەرە مەترسیەوە پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمانی پی بەخشی ..!! صفوان ووتی : دوور کەروە قسەم لەگەل مەکە .

( عومەیر ) ووتی :دایك و باوکم بە قوربانی تۆ بن ، کورە پورە کەی تۆ چاکتر باشتر و خۆراگرت لە هەمووانە ، گەورەیی ئەو گەورەیی تۆیە ..!! شەرەفی ئەو شەرەفی تۆیە و ، پاشایەتی ئەو پاشایەتی تۆیە

..!! صفوان ووتی : من لە گیانی خۆم دەترسم ..!! ( عومەیر ) ووتی : ئەو خۆراگرتر لەوەیە ،ئەوی بردە لای پیغەمبەر ﷺ ( صفوان ) ووتی : ئەمە دەلیت : تۆ ئەمانت بەمن بەخشیوە ..؟! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : راست دەکات ، ئەویش ووتی : دوومانگ مۆلەتم پی بدە ..؟! پیغەمبەر ﷺ فەرمووی : چوار مانگ مۆلەتت هەیە ..!!

زوهیر دە گیرتەوە دەلیت : ( دایکی حەکیمی کوری حارسی کوری هشام ) هاوسەری( عیکرمە کوری ابو جهل ) بووو هەروەها ( فاختەی کچی ولید ) هاوسەری ( صفوانی کوری ئومییە ) بوو ، هەروەها دایکی حەکیم ) دوای ئەمانی بۆ عیکرمە ی کوری ابو جهل کرد ،لە پیغەمبەری خوا ﷺ پیغەمبەری خواش ﷺ ئەمانی پی بەخشی ، دواتر دایکی حەکیم چووە بۆ وەلاتی یەمەن عیکرمەی کوری ابو جهل گەراندەوە ئیمان یان

ێ
باوەری هینا دواتر صفوانی کوری ئومیەش باوەری هینا بە پیغەمبەری خوا ﷺ ،هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ مارەکردنی ژنەکانیانی وەك خۆی هیشتەوە ..!!

هەروەها (ابن ئیسحاق ) دەگیرتەوە دەلیت : کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو شاری مککە ئەم دووپیاوە بۆ ( نجران ) هەل هاتن کە ( هوبەیری کوری ابی وەهبی مەخزمی ) و ( عبداللەی کوری زەبعەری سەهەمی ) هەروەها ( حسانی کوری سابت ) چەند دیریکی شعری بۆ ئەو دوو پیاوە لە نجران بوون ووت :کاتیك دیرە شعرەکانی حسانی کوری سابت یان بیست ( عبدالله کوری زەبعەری ) گە رایەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ باوەریان هینا، بەلام (هوبەیر ) لەسەر بی باوەری مایەوە لە ( نجران ) .

دەگیرنەوە دەلین : هەر لەم سالە دا لە مانگی رەمەزان ،( خالید کوری ولید ) یەکیك لە بتە کانی قورەیشی ویران کرد لە دۆلی نخلە دا ، کە ناوی ( عوزا ) بوو یەکیك لە بتە کانی نەوەی ( شەیبا )تیرەیەك لە نەوەی ( سەلیم )بوون ، هەروەها نەوەی ( ئەسد ی کوری عبدلعوزا ) دەیان ووت : ئەمە ئەو بتەی ئیمەیە کاتیك خالید کوری ولید ، بتەکەی شکاند ،یەکیك لە خزمەتکارەکانی بتەکە کە ناوی ( عوزا ) بوو ، ووتی : هیچت بینی ..؟! خالید ووتی : نە . خزمەتکارە کە ووتی : بگەریوە ویرانی بکە ..!! خزمەت کارە کە ووتی : توورەیی خۆت نیشان بدە ، ئافرەتیکی رەشی روو هاتە دەرەوە و خالید کوشتی ،زیرو خشلە کانی ناو ئەو شینەی کە ( عوزای )لی بوو بردی بۆ پیەمبەری خوا ﷺ ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمە عوزا بوو چیتر نا پەرستریت ..!!

هەروەها واقدی دە گیرتەوە دەلیت : هەر لەم سالە دا هۆزی یان خەلکانی هوزەیل بتە کە بوو بەناوی ( سواع ) ئەم خەلکە ئەو بتەیان ویرانە کرد ، ( سواع ) بەردیك بوو کە ( عمری کوری عاص ) ویرانی کرد و تیکی شکاند ، کاتیك گەیشت لای بتە کە خزمەتکارەکەی بتە ووتی : ئەتەویت چی بکەیت ..؟! ئەویش ووتی : دەمەویت ( سواع ) تیك بشکینم و ویرانی بکەم ..!! خزمەتکارە کە ووتی: تواناى ویران کردنی ئەوە نیە ..؟!! ( عمری کوری عاص ) ووتی : هیشتا گومرایت ..؟! دواتر بەردەکەی شکاند لە ناو کەلاوە کەدا ، ووتی: بەخزمەتکارە کە چیت بینی ..؟! ئەویش ووت: هیچ ئیستا موسلمان بووم ..!!

بەلی هەر لەم سالەدا ( مەنات ) لە وشلیل ویران کرا ..!! ئەم ویران کردنەیە ( مەنات ) لە سەر دەستی ( سعدی کوری زیدی ئەشهەلی ) ئە نجامدرا ..!! چونکە ( مەنات ) بتی ئەوس و خەزرەج بوون ..!!

فتح کردنی شاری مککە ( میژووی طبري بە کوردی ) بەرگی سیەم لا پەرە ١١٧٣ تاکو لا پەر ١١٧٨.

ئ

## چەند رووداويك لە فتحی مككە دا وە لە دوای فتح كردنی مككە و پيش جەنگی حونين

بەلی كاتی سوپای ئيسلام فتحی شاری مككەی كرد ئەستيرەی بت پەرستی بۆ يەك جاری كوژايەوە ، بيرو باوەريكی راستە قينە ی توحيد و يەكتاپەرستی سەر تاپەی شاری مككەی گرتووە ، بيرو باوەری پوچی نەفامی خۆر لی ئاوا بوو ، پيش فتح كردنی شاری مككە ، سوپای ئيسلام لە دەورو بەری شاری مەدينە پاك كردوە لە شريك و بت پەرستی و هاوبەش دانان ، هەروەها فتح كردنی خەيبەرو دەوروبەريشی پاكرايەوە ،بەلی تەنها لە نيمچە دوورگەی عەرەبی دوو هيز مابوون ،كە سەنگ و قورسايان هەبيت ئەويش هيزی قەرەيش لە شاری مككە ،ئەوەی تريان هيزی هوازن لە بيابانەكەی ناوچەی حيجازو نەجد دەوربەری دا ،ئەوە بوو هيزی يەكەم كە قەريش بوو لە شاری مككە بە تەواوەتی لە ناو چوو بەفتح كردنی ، هيزای دووەم مابوو ئەويش هيزی هەوازين بوو ، كە جەنگی حونين تيدا روويدا ، چونكە هيزی هەوازن تواناى (٢٠٠٠٠) هەزار جەنگاوەری هەبوو ، دەسەت هەلات هيزی هە بوو ، هەروەها جگە لە هيزی هەوازين جەند هيزی كی تريش هەبوون لەم لاو لەولادا ، پيغەمبەری خوا ﷺ وا بە چاك زانيی ئەوانيش لە بت پەرستی رزگار بكات ،بيان خاتە سەر ريبازی توحيد و يەكتاپەرستی ، ئە وە بوو پيغەمبەری خوا ﷺ جەند سريە يەكی سوپای بۆ ئەم ناوچانە روانەكرد ، كە ئە و بتانە بشكين دانيشتوانيان دوورگەی عەرەبی ئەيان پەرستن ، ئەو هەملەتەش بريتی بوو ن لە مانە :

### يەكەم :سريەی موشەللەل :

پيغەمبەری خوا ﷺ (سعدی كوری زيدی ئەشهەلی ) كردە فەرمانەدی ئەم سريەيە بۆ تيك شكاندنی بتيك كە بەناوی (منات ) كە ئەم بت كۆنترين بت بوو كە عەرەبی ناوچەكە دەی پەرستن ، ئەوە بوو ئەم بت عەرە بەكانی ناوچە بە خوايەكی گەورە يان دەزانی (والعياذ بالله ) هەروەها ئاژەليان بۆ سەر ئەبری ، ئەگيرنەوە دەلين : بەتايبەتی كە هەردوو هۆزی (ئەوس و خەزرەج ) كە لەهەموو كەس زياتر ئەيان پەرستی ،ريزيان بۆ دا ئەنا ،هەروەها (حەجيان ) ئەكرد دە بوايە برۆيشتانە ناوچەی (قودەيدە) لە سەر دەريايی سور و لەوی لە بەردەم (مەنات ) سەری خۆيان دەتراشی ، وە ماوەيە ك لەويدا دەمانەوەو پەرستينان ئە نجام دەدات بۆ (مەنات ) بەلام پيغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد كە ويرانی بكەن ..!!

ئ

**دووەم : تیك شكاندنی بتی ( عوزا )**

**بەڵی لە ( ٢٥ ) مانگی رەمەزان دا لە ساڵی هەشتەمی كۆچی دا دواى فتح كردنی شاری مككە بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە ( خالید كوری ولید ) بەبیتە ئەمیری سەریە یەكی ( ٣٠ ) موجاهید بەریكەو بۆ تیك شكاندنی بت ( عوزا ) كە گەورە ترین بت ی قورەیش بوو ،( خالید كوری ولید ) تیكی شكاند كەلە پیش دا باسمان كرد ، دوای تیك شكاندنی ( عوزا ) خالید گەرایەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەكەی پیدا.**

**سی یەم : هەڵمەتی ( یەلە ملەم ) :**

**ئەم هەڵمەتە لەكۆتایی مانگی رەمەزان دا بوو لە ساڵی هەشتەمی كۆچی دا پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە هیشامی كوری عاص ) كە ئەمیری سریەكی ( ٢٠٠ ) موجاهیدی بوو ، بەرەو ناوچەی ( یەلەملەم ) رەوانەكرد ، كە دەكەویتە باشوری رۆژ هەلاتی شاری مككە بۆ پاكردنەوەی ئە بت و صەنەمانەی كە تیدا بوو هەر هەموو پاكردەوە لە بت پەرستانی ناوچە كەدا ..!!**

**چوارەم : هەڵمەتی ( عورنە ) :**

**ئەم هەڵمەتە لە كۆتای مانگی رەمەزان دا لە ساڵی هەشتەمی كۆچی دا ئە نجام درا ، ( عورنە ) دۆلیكە لە تەنیشت عەرەفات دا ، بەڵی هەر لە دۆلە دا بوو پیغەمبەری خوا ﷺ ووتاری ماڵ ئاوای پیشكەش بە موسلمانە كان كرد ،دانیشتوانی ئەم دۆلە یەكجار دوژمنایەتی هاتنی ئاینی ئیسلامیان دە كرد ،كە سەر بە نەوە ی( هوزەیل ) بوون ئەوە بو لەساڵی چوارەمی كۆچی دا هیزیكی زۆریان كۆ كردنەوە بۆ هیرش كردنە سەر سوپای ئیسلام لە شاری مەدینە دا ، ئەوە بوو كە ئەم هەواڵە گەیشتە پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ هاوەلیكی خۆی نارد بەناوی ( عبداللە ی كوریی ئونەیسی جوهەنی ) بۆ كوشتنی فەرماندەی سوپای هوزەیل كە ناوی ( خالیدی كوری سفیانی هوزەلی ) بوو ..!!بەڵی دوای فتحی شاری مككە ، سەریە یەك روانە كران بۆ ئەم هۆزە كە هۆزی ( هوزەیل ) بوون لە ساڵی هەشتەمی كۆچی دا لە كۆتایی مانگی رەمەزان دا بوو ، كە بریتی بوون لە ( ٣٠٠ ) موجاهید ئەمیری سریە كە ( خالیدی كوری سعدی كوری عاص ) بوو بۆ كۆتایی هینان بت پەرستی لەم ناوچە یەدا ..!!**

ی

**پینچەم : جەنگی ( جوزەیمە )**

ئەم جەنگە لە کۆتای مانگی رەمەزان و لە سالی هەشتەمی کۆچی دا بوو ، بەلی ئەم جەنگە جەند راجیایی تیدایە لە سەر کردارەکانی ( خالید ی کوری ولید ) شیوەی جەنگە کەدا چونکە ( خالید ) هەندیك رەفتارو کرداری ئەنجامدا لەم جەنگەدا کە بەدلی پیغەمبەری خوا ﷺ موسلمانان نەبوو چونکە لە دوای تەسلیم بوونیان کوشتاریان کردن ،هەروەها لە ( ابن ئیسحاق ) وە بۆ مان دە گیرتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ چەندین سریەیەی بۆ دەورو بەری شاری مککە رەوانەکرد تا وە کو پیشنیاری خوا پەرستی بۆ خەلکانی ئەم ناوچەیە بکە ، پیغەمبەری خوا ﷺ ( خالیدی کوری ولید ) کردە ئەمیری ئەم سریەیە بە ( ٣٠٠ ) موجاهیدە وە ، ئەوە بوو فەرمانی پی دا کە هیچ کوشتارو جەنگ نەکات ، تەنها ئاینی ئیسلام لە ناوچە کە دا بلاو بکاتەوە پیشنیاری ئیسلامیان بۆ بکات ،ئەوە بوو لە خوارووی ( تەهامە ) خەلکە کە نیشتەجی بوون کە نەوەی ( جوزەیمە ) بوو، بەلام ( خالیدی کوری ولید ) هەلمەتی بردە سەریان دەستی بەجەنگ و کوشتار کرد بەلام ( ابو جعفر محمدی کوری علی کوری حسین ) دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ دوای فتح کردنی شاری مککە ، ( خالید کوری ولید ) لە گەل نەوەی سەلیم هۆزە کانی تر نارد بۆ بلاو کردنەوەی خوا پەرستی توحید یەکتا پەرستی بانگەوازی ئاینی ئیسلام ، نەك شەر و جەنگ کردن و کوشتار ، دەلیت : ئەوان لە نزیك ( غمیسا ) دابە زین کە یەکیك لە ئاوە کانی ( جوزیمە ) ، بەلی هۆزی ( جوزیمە ) لە سەردەمی نەفامی دا کە ( عەوفی کوری عبد عەوفی باوك ) و ( عبدالرحمان کوری عەوف کوری موغیرە ) یان کوشت کە لەووەلاتی یەمەن دەگەرایەوە مال سامانەکەشیان بە تالان برد ،کاتیك ئیسلام فتحی شاری مککەی کرد ، پیغەمبەری خوا ﷺ ( خالید کوری ولید ) رەوانەکرد بۆ سەر ئەم هۆزە کە ( جوزەیمە ) بوون ، ( خالید ) یەکیك لە ئاوە کانی ئەم هۆزە واتە : ( جوزیمە ) دا بەزی ،بەلی کاتی هۆزی جوزیمە ( خالید ) یان بینی یە کسەر ترسیان لی نیشت و دەستیان بۆ چەك تفاق کەرەسەی جەنگی برد بەرانبەر بە ( خالید ) ، ئیتر بەرانبەر بە یەکتر وەستان ، بەلام ( خالید ) بە هۆزی جوزیمەی ووت: چەك وشمشیر و رم و قەلغانەکانتان دا بنین تەسلیم بن ، پیشنیاری ئیسلامی بر کرد پی ووتن : چونکە خەلکانی ناوچە هەموو باوەشیان بۆ ئیسلام کردۆتەو ئیوەش باوەر بە ئیسلام بەهینین شمشیرە کانتان دا بنین ..!؟ بەلام پیاویك لە هۆزی جوزیمە دە گیرتەوە دەلیت : کاتیك خالید ووتی : شمشیرە کانتان دابنین ..!! یەکیك لە هۆزەکەی مە بەناوی ( جەحدەم ) بە خەلکە کەی ووت : شمیرە کانتان دامەنین چونکە خالید هەمووتان دە کوژیت و هەمووتان بەدیل دەگریت ،هەروەها ووتی : ئەی خەلکینە ئەمە ( خالید ) سویند بەخوا دوای دانانی شمشیرە کان هەمووتان بەدیل دەگریت و دوای بەدیل گرتن هەمووتان دە کوژیت ، منیش شمشیری خۆم دانانیم ، دەلیت : کە سانیك لە خەلکانی هۆزی جوزیمە ئەو پیاوە یان گرت و ووتیان : ئەی ( جەحدەم ) دە تەویت خوینی هەموو مان برژینی ، چونکە خەلکە کە هەموو موسلمان بوون شەرو جەنگ نەماوە هەمووان لە ئەماندا ژیان

ێ
بەسەر دە بەن ، بەلی پیدا گریان کرد هەر هەموو شمشیرە کانیان دانا و ، خەلید فەرمانی کرد دەست بەسەر هەمووان دا بگرن ،بەلی هەموو خەلکەکەی هۆزی جوزیمە خۆیان بەدەستەوەدا بەدیل کەوتنە دەست خالید ، هەر هەموو قول بەست کران هەریەك لە هۆزی جوزیمە دوو پیا درایە دەست موسلمانیك بە قول بەست کراوی ، بەلام کاتیك رۆ بوویەوە ( خالید ) فەرمانی دا کە دیلە کان بکوژن ،بەلی نەوەی سەلیم دیلە کانی خۆیان کوشت ، بەلام کۆچ کەران و ئەنصارە کان دیلە کانی خۆیان بەرەلاکرد ، دوای ئەو گفتوو گو دەقە قالی لە نیوان کۆچ کەران ئەنصارە کان و ( خالیدی کوری ولید ) روویدا ، دە گیرنەوە دەلین : دەمەقالیە کە لەنیوان ( ابو ئوسید ی سعدی ) و ( خالید کوری ولید ) روویدا ، ( ابو ئوسید ) ووتی : خالید لە خوا بترسە ..؟! بەخوا من هەر گیز کوشتاری موسلمانانم لە کردووە ..؟! خالید ووتی : جا تۆ چۆن دە زانی ئەوانە موسلمان بوونە .؟!ووتی دانیان نا بە ئیسلام بوون هەروەها مەزگەوتیش لە ناوچە کەیان هەن ..!!بەلی دوای گەرانەوەی ( خالید ) بۆلای پیغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن هاوەلان بەتاییەتی ( عبدالرحمانی کوری عەوف ) و ( عمری کوری خەتاب ) و ( عوسمانی کوری عفان ) لۆمەی خالد کرا ..!!

ئەویش بەرگری لە خۆی کرد لە هەمان کاتدا دوای لی خۆش بوونی لە خوای گەورە کرد ، هەر وەك پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( اللهم إني أبرأ إليك مما صنع خالد )) چونکە فەرمانی وەهای بەسەردا نەدابوو ، خالید کە هاتە لای پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر لی توورە بوو بەلام کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەر کەوت کە خالید بە هەلە ئەم کارەی ئەنجام داوە فەرمانی دا بەدنەوە ی خوینی کوژراوە کانی هۆزی جوزەیمە ..!! ( ابن ئیسحاق ) دەمەقالی گفتوو گۆی نیوان ( خالیدی کوری ولید ) و ( عبدالرحمانی کوری عەوف ) مان بۆ دە گیرتەوە دەلیت : عبدالرحمان بەخالیدی ووت : لە ئیسلامدا شیوازی سەردەمی نەفامی بە کار دە هینی ..؟! خالید ووتی : تۆ لەی باوکی تۆم سەند تەوە ..!! عبدالرحمان ووتی : درۆت کرد ..!! من بکوژی باوکی خۆم کوشت ..؟! تۆ تۆلەی مای خۆت کردوە کە ناوی ( فاکە کوری موغیرە ) بوو ،قەسەی زۆریان لە گەل یەکتر کرد ..!! کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە گفتوو گویە ئاگادار بوویەوە بە ( خالیدی ) ووت : ئارام بە دەست لە هاوەلەکانم هەلگرە ،( یا خالد ! ذروا لي أصحابي متى ينك أنف المرء ينك لو كان أحد ذهبا تنفقه قيراطا قيراطا في سبيل الله لم تدرك غدوة او روحة من غدوات أو روحات عبدالرحمن بن عوف )واتە : سویند بەخوا ئەگەر بە ئەندازەی چیای ئوحد زیرز مالت هەبیت لە ریگەی خودا خەرجی بکەیت ،نابیتە کردەوەی بەرە بەیان یان ئیاوارانی هاوەلانی من ..!! هەروەها پیغەمبەری خوا هاوەلانیشی ئاگادار کرد کە دەمەقالی لە گەل خالید دا بکەن چونکە ئەمەکاریکی باش نیە هەروەك خالیدیشی ئاگادار کردووە لەم دەمەقالیە و هاوەلانیشی لە ئاگادار کردووە ، ووتی : چونکە خالید شمشیری خوایە ..!!

ئ

بەلی دوای ئەوە بەلام کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە کارە ئاگادار بوویەوە ، دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە فەرمووی : ئەی ( خوای گەورە ) لە م کردەوەی خالید زۆر بیزارم ، علی کوری ابو تالیبی بانگ کرد ، برۆن بۆ لای ئەم هۆزە واتە :( جوزەیمە ) ری رسمی نەفامی لە ناو ئەم خەلکەدا بسرەوە ..!! بەلی فەرمانی بە ( علی کوری ئەبو تالیب ) کرد کە براوت ئەوە بوو ( علی ) ( خوا لی رازی بیت ) رۆیشت سامانەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل خۆ دا برد ، تاکو خوینی کوژراوە کانی هۆزی جوزیمە بداتەوە زیانەکانیان بۆ قەرە بوو بکاتەوە ..!! بەلی ( علی ) ئەو کارەی کرد زەرەرو زیانی هەموویانی دایەوە تەنانەت قەرەبووی قاپی سەگەکانیشی دایەوە ،هیچ خوین و سامانیك نەمایەوە ،بەلی کاتیك کۆتایی بە کارەکانی هینا لە لای هۆزی جوزیمە ( علی ) ووتی : ئایا هیچ خوینیك یان مال سامانیك ماوە قەرە بوو نەرکا بیتەوە ..؟! کاتیك گەرایەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ، پیغەمبەری خوا فەرمووی: ئەی ( علی ) کاریکی زۆر باش و زۆر چاك و تەندروستت ئە نجامدا ..!! هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ رووی کردە قیبلە و دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردووە بە شیوەیەك سپیەنی ژیر بالەکانی دەرکەوت سی جار فەرمووی : ئەی خوای گەورە لەوەی خالید ی کوری ولید ئە نجامی دا بیزارم ..!! بەلام لە پاشاندا پیغەمبەری خوا ﷺ لە خالیدی کوری ولید رازی بوو ستایشی کرد ، هە تا ئەوە بوو خالیدی کردە فەرماندەی پیشەنگی ئەو سوپا گەورەیە کە بەرەو جەنگی ( حونین ) کەوتە ری وە هەروەها سوپاکەی بو جەنگی ( تەبووکیش ) کەوتەری ، بەلی خالید کوری ولید لە حەجی مالئاوایی دا لە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ دا بوو ، کە پیغەمبەری خوا ﷺ سەری تاشی قژی پیشەوەی دا بەدەستی خالید ، ئەوەیش لە کلاوە کەی خۆی دا هەلی گرت و ، هەر کەسی ئەهات بەرووی خالید وە ( خوای گەورە ) ئەی شکاند ، بەلی کاتی جەنگی ( یەرمووك ) هاتە پیش خالید کوری ولید بەشداری کرد ، کلاوە کەی سەری لی کەوتە خوارەوە ،خالیدیش بەدوای کلاوە کەی دا ئەگەرا هەوالی کلاوە کە ی دە پرسی ، لی یان پرسی کە سیرە بەلایانەوە لە گەرمەی جەنگ دا ئەو بە دوای کلاوی سەری دا ئەگەری ، ووتی قژە کانی پیشەوەی سەری پیغەمبەری تیدا هەل گیراوە و ، لە جەنگ دا تووشی هەر کەس هاتبم پیاوانە هەلاتووە ..!! لە کۆتایی دا رای خۆم ئەوەیە لەم جەنگەی ( خالیدی کوری ولید ) لە گەل هۆزی جوزیمە )دا خالید نیەتی ئیجتهاد کردن بووە تیدا نەوەك زولم و ستەم کرد بەلکو نیەتی دامەزراندنی توحید و یەکتاپەرستی بووە لە پیناوی خودا دا نەکوەك زولم کردن ، زۆر جار هاوەلانیش لە جەنگ و غەزا کردن هەلە دە کەن ( خوای گەورە لە هەموویان رازی بیت ) خالید ئیجتهادی کرد بە نیتی صافی خۆی نەوەك لە فەرمان دەرچوون ، بەلام ئیجتهادەکەی دەر ئە نجام بووە کاریکی ناپەسەندو هەلە لای پیغەمبەری خوا ﷺ بەلام دواتر پیغەمبەری خوا لی رازی بوو دوای لی خۆش بوونی بۆ کرد ، هەروەها خلیدیش دانی بە هەلەکەی دانا..!!. غزە حونین لباشمیل ص(١٣-٣٩ ) فتح کردنی شاری مککە ( میژووی طبری بە کوردی ) بەرگی سیەم لاپەرە ١١٧٨ تاکو لاپەر ١١٨٠.

ێ

## غەزای حونین هەوازین و غەزای طائف لە سالی هەشتەمی کۆچی دا

### یەکەم : هێرشی سوپای هەوازین :

بەلی لە پاش فتح کردنی شاری مککە لە پاش (١٥) رۆژ پیغەمبەری خوا ﷺ لە مککە دا ماویەوە ، ئەوە بوو لە پاش ملکەچی قورەیش کوژانەوەی هیوای خۆزگەی بت پەرستی لە شاری مککە ، هەوازن و سەقیف ووتیان : ﷺ لە پاش قورەیش دەستی خالی بووە ، وا چاکە پیش هەلمەت بردنە سەرمان ئیمە هیرشی بکەینە سەر ..!! بەلی بەر لەوەی باسی جەنگی حونین بکەین ،وا چاکە کوورتەیە دەر بارەی هەوازین بزانین :

بەلی سیرە نووسان لە سەر ئەو یەك دەنگن کە هۆزی (هەوازین) گەورە ترین و بە هیزترین هۆزە لە نیمچە دوورگەی عەرەبی دا ، کە هۆزیکی (مضري عدناني يە ) کە پشتیان ئە چیتەوە سەر (هەوازینی کوری منصوری کوری عیکرمە ي کوری خصفری کوری قیسی کوری عیلانی کوری مضری کوری نزاری کوری معدی کوری عدنان ) ..!! ئەم هۆزە تیرە ی زۆری هەبوو وەك (ثقیف ، کعب ، کیلاب ،بني هیلال ،بني عامری کور صە عصة عە ، بني جوشمی ) عەشیرەتی بنی صوممە ،نبی نصر، عەشیرە مالیکی کور عوف ..!!

لەسەردەمی نەفامی دا هەوازن هۆزیکی درەندی شەراوی بوون ،چەندین جەنگ و کوشتاریان لەگەل هۆزەکانی دراو سیدا بەرپاکردبوو ، هەتاکو لە نیوان تیرە کانی خۆشیاندا جەنگیان دەکرد بەتاییەتی جەنگی (أنتان ) لەنیوان هە وازین و ثقیف دا بوو ،هەروەها جەنگی (فیجار) لە نیوان هەوازین قورەیشدا ، ئەم چەنگە جوارمانگ بوو هەموولە مانگە کانی حەرامدا روویان دا بوو ، خەلکیکی زۆریش لە نیوانیاندا کوژرا...!!

بەلی لە دوای تیك شکاندنی قورەیش نەمانی بت پەرستی لە ناوچە کەدا ، هۆزە کانی هەوازین ترسیان لی نیش لە هیرشی سوپای ئیسلام لە سەریان ، ئەوە بوو هاتنە ئەو رایەی کە دوو ریگا بۆ رزگار بوون بۆ خۆیان دا بنین، یەکەم: یان ئەوە تا ببنە ئیسلام بینە سەر ریبازی توحید و یەکتاپەرستی لە ژیر ئالای سوپای ئیسلام بۆ خۆیان بژین ، دووەم : یان ئەوە تا جەنگی سەرو مالی بکەن بۆ تیك شکاندنی سوپای ئیسلام ریبازی توحید ..!!

ئ

بەلی سوپای هەوازین بە هەموو هۆزەکانیاوە کە بینی وا شاری مککە فتح کرا ، ناوچە کە پاك رایەوە لە بت پەرستی دا ،چرای رووناکی توحید و یەکتاپەرستی تیدا داگیرسا ، دەستیان کرد بە خۆ کۆ کردنەوە ، چونکە زانیان لە ناوچە کەدا تەنها ئەوان مانە ریبازی توحید و یەکتاپەرستی تیدا گەشەبسەنی ،هەر بۆیە خۆیان ئامادە کرد کە بەرنگاری موسلمانەکان ببنەوە شەی مان و نەمان بکەن ، لە هەمان کاتیش دا سوپای ئیسلام بچووك تر بوون لە سوپای هەوازین ،چونکە سوپای ئیسلام نزیکەی ١٢٠٠٠ ) هەزار جەنگاوەر بوون دوای فتحی شاری مککە ،چونکە موسلمانە تازە کانی شاری مککە ش هاتنە ناو سوپای ئیسلام ، بەلام سوپای هەوازین بە هەموو هۆزەکانەوە نزیکەی (٤٠٠٠٠)هەزار جەنگاوەر بوون ، لە سوپای ئیسلام بە جەند جار گەورە تر بوون ..!! هەروەها ئەو شوینەی کە هەوازین تیدا نیشتە جی ببوون شوینی سەخت و قایم بوو لە رووی سەربازیەوە ، هەروەك هۆزی (ثقیف) بەشیکی لە سوپای هەوازین بوو ، چونکە دوای جەنگی حونین ئەوان خۆیان لە قەلاکانی شاری (طائیف) دا مەحکەم کرد ، هەروەك سیرە نووسان دە گیرنەوە دەلین : سوپای ئیسلام نەیتوانی بە سەریاندا زال بیت ..!! هەرجەند بۆ ماوە نزیکەی (٢٠) گەمارۆی شاری طائیف یان دا ،دواتر سوپای ئیسلام گەرانەوە شاری مەدینە ، لە سەر ئەنجامدا دانیشتوانی شاری(طائیف) بە ویستی خۆیان لە سالی (٩) یەمی کۆچی دا موسلمان بوون ..!!بەلام هۆزی هەوازین بەدبەختی رووی تی کرد کاروباری سوپاکە و فەرماندەیاتی سوپاکەیان کەوتە دەستی پیاویك کە بەناوی (مالیك ی کوری عەوفی نصری ) بوو ،هەر جەند پیاویکی زۆر ئازاو بە جەرك بوو ،بەلام هەوازینی تووشی شکستیك کرد هیچ هۆزیك لە دوورگەی عەرەبی دا تووشی شەکستی وا نەببوو ، بەلی (مالیك ) هەر جەند ئازاو بە جەرگ بوو ، دوای لە هۆزی هەوازین کرد ،کە بە سەر مال و منداليان بەجنگن لە دژی موسلمانان دا ، بەلام هەلەیەکی یەکجار گەورەی ئەنجامدا سەری خۆی سوپاکەشی لە سەر دانا بەم هەلە گەورە یەی کە ئەنجامی دا ..!!

ئ

بەلی یەکیك لە و جەنگانەی کە پیغەمبەری خوا ﷺ پی هەستا جەنگی حونین بوو ، ئەوە بوو کە لە (٥) شەوالی سالی (٨)کۆچی بەریکەوتن لە (١٠) شەوالی سالی (٨) کۆچی گەیشتنە شوینیك پی دە وترا (حونین ) کە دۆلیکە لە دۆلە کانی هۆزەکانی (هەوازین ) لە گەل هۆزی (ثقیف ) ئەوە بوو لە سەرەوە باسی (مالك ی کوری عەوف ) مان کرد کە هۆزە کانی هەموو کۆکردبوووە خستبوویە ژیر سەر کردایەتی خۆی ، بەلی فەرماندەی هۆزەکانی هەوازین وای بیرکردەوە کە ژن ومندال و مال سامانیش لە گەل خۆیا بهینین کە س لە جیگای خۆی نەمینی بۆ ئەوەی بەسەر سوپایی ئیسلام دا بن دەست لە سوپای ئیسلام بووە شینن ،چونکە (مالك ) وای بە چاك زانی کەوا شەری مان و نەمان بکەن ، پیاوە کانی شەرم بیان گری لە بەر چاوی ژن مندالە کانیان جەنگیکی خۆ راگرانە ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی لە م جەنگە رانەکەن خیرەت بیان گری ..!! هەروەها (مالك ی کوری عەوف ) لە ووتاریکی دا پیش دەست پی کردنی جەنگ لە گەل موسلمانەکاندا بە خەلکە کەی خۆی دەووت : محمد ﷺ هەر گیز تووشی کەسانی شارەزاو جناگاوەری ئازاو بە جەرگ نەبووە ،بەلکو لە گەل کە سانیکی بی ئەزموون و نەشارەزا لە جەنگ دا ،شەری دە کرد هەر بۆ یە سەرکەوت بە سەریاندا ..!! واقدی فی المغازی (٣/٨٩٣). لە (ئەنسی کوری مالك ) – خوا لی رازی بیت – دەگیرتەوە دەلیت : فتحی مککە مان کرد ، ئینجا چووین بۆ غەزای حونین ، بت پەرستان هاتن لە جوانترین ریزبەندیدا ،بیبینم : لە سەرەتا ریزی ئەسپەکان بوو ، دواتر ریزی جەنگاوەر کان ،دواتریش ریزی ئافرەتان ،لە دواشیان مەر و مەلاتەکان ریز کرا بوون ..!!صحیح مسلم کتاب زەکات (٣/٧٦٣) برقم (١٠٥٩). هەروەك دە گیرنەوە دەلین : (مالك کوری عەوف) بە جەنگاوەرەکانی ووت : ئەگەر دووژمنتان بینی ، کیفکی شمشیرە کانتان بشکینن و ، بەیەکجاری هەلمەتیان بۆ ببەن ..!! المستدرك الحاکم (٣/٤٨-٤٩) صحیح الاسناد .

ئ

هەروەها لە ( ابن ئیسحاق ) وە – خوا لی رازی بیت – دە گیریتەوە دەلیت : کاتیك هۆزەکانی هەوازین لە فتح کردنی شاری مککە ئاگادار بوون ، ( مالك کوری عەوف ) هەموو تیرە و هۆزەکانی کۆکردەوە ، وەك ( ثقیف ، نصر ، جشم ، تیرە ی سعدي کوری بکر ، بني هیلال ، هؤزي قیسي کوري عە یلان ، ) بەلام تیرەی ( کەعبی کوری کەلابی ) هەوازین نەهاتن ، هەروەها ( دوریدی کوری صمە ) لەگەل خەلکانی ( جشم ) بوو ،ئەو پیاوە واتە ( دورید ) پیرە پیاویکی پە کەوتە بوو ، بەسالاچوو بوو ، خەلکە کە پیرۆزیان لە راو بۆچوونەکانی ئەو دا ئەبینی ، دەربارەی جەنگ شارەزایی زۆری هەبوو ،فەرماندەی هۆزی ( تقزیە کان ) وە هاوپە یمانی ( قارب کوری ئەسود ) بوو ، سەرکردەی بنی مالك ،( سبیع کوری حارس ) ناسراوە بە ( زول ئە لخمار ) وە برایە کی ( ئە حمەری کوری حارس ) سەر کردەی نەوەی هیلال بوو ، سەرداری هەموو هۆزەکان ( مالك کوری عەوف ) بوو ، کاتی زانی شاری مککە فتح کرا ، نیازی سوپای ئیسلامی کرد ، ژن و منداله کانی لە گەل خۆ دا هینا ، کاتیك گەیشتنە دەشتایەکانی ( أوطاس ) خەلکانیکی زۆر لە دەوری کۆ بوونەوە و ( دوریدی کوری صمە ) لە ناو خەلکەکەدا دە بینرا ، ئەویان لەناو کە ژاوەیەکی بی سە رپۆش دانا و کاتیك دابەزی ووتی :

ئیمە لە کووین ..؟! ئەوانیش ووتیان : لە ( أوطاس ) ین ..!! ووتی : ئایا ئەم شوینە شیاوە بۆ سوورانەوەی ئەسپە کان ،چونکە نەسەختە و نەبەردەلانە ، بەلام بۆ چي دە نگی ووشترو کویدریژو مەرو مالات و دەنگی ژن و مندال دەبیستم ..؟!ووتیان : ( مالك ی کوری عەوف ) ژن مال و مندال و هەموو سامانەکانی لە گەل خۆ دا هیناوە ..!! ووتی : ئەی ( مالك ) لەکویە..؟! ووتیان : لیرە یە . ( مالك کوری عەوف ) یان بانگ کرد ، بە ( مالك ) ی ووت : ئەی ( مالك ) تۆ فەرماندەو سەرکردەی هەموو خەلکە کەی خۆتیت ..؟! رۆژیکمان لە بەردەم دایە هەزاران رۆژی تریش بەدوای دادی ،ئایا بۆ دەنگی ووشترو مندال و مەرو مالات دیت ،وە دەنگی گریانی مندال دەبیستم ..؟! ( مالك ) ووتی : ژن ومندال و هەموو کەسەکانمان لە گەل خۆ دا هیناوە ..!! ( دوریدی ) بەسالاچوو وە کەم بینا بوو ووتی : بۆچی ئەی ( مالك ) ..؟!

مالك ووتی : نیازی ئەوە م کرد ،مال و منالی جەنگاوەران لە پشت سەریانەوە بیت تاکو تا سەر خستن بەرگری بکەن و هەلمەت بەرن ..!!

ێ
(دورید ) سەرکۆنەی (مالك ) کرد ووتی : ئەمە شوانی مەڕەکانە ، مەگەر پیاوی هەلهاتوو دەتوانیت شتیك لەگەل خۆیدا بگەڕی نیتەوە ..؟! ئەگەر جەنگ و شەر کردن لە بەرژەوەندی تۆ دا بیت ، سویند بەخوا تەنها پیاوی شمشیر بەدەست بەکەلکی تۆ دیت ..!! وە ئەگەر جەنگ و شەر کردن لە زیانی تۆ دا تەواو بیت ، سویند بەخوا ژن و مندالە کانیشت لە دەست داوە ریسواو سەر شۆر دەبیت ..!! دورید پرسی : ئەی تیرەی یان هۆزی (کەعب )و (کیلاب ) چیان کرد ..؟! ئەوانیش وویتان :لە وان دا هیچ کەسیك نەهاتووە ..!! (دورید ) ووتی : گەورەیی و ریزی تیدا نیە ..!! ئەگەر رۆژی ریزو گەورەیی دەبوو ، ئەوا (کەعب ) و (کیلاب ) بەشداریان دەکرد ..!! هەروەها ووتی : خۆزە ئیوەش وەك (کەعب )و (کیلاب ) ئامادەی ئەم جەنگە نەدەبوون ..!! هەروەها (دورید ) ووتی : ئایا لە ئیوە کی هاتووە ..؟! ووتیان : (عمری کوری عامر ) و ( عەوفی کوری عامر ) ..!! (دورید )ووتی : بوون و نەبوونی ئەم دوو (عامرە ) وەك یەك وایە ..!! هەروەها (دورید ) بە (مالك ی کوری عەوف )ی ووت : سویند بەخوا کاریکی باشت نەکرد ، چونکە خەلکەی هەوازین و ، سامانی خەلکت خستۆتە پیشەوەی سوپاکەت ، ئەم خەلك و مال سامانەکەیان بگەڕینەوە بۆ سەر زەوی خۆیان ، خۆشت لەسەر پشتی ئەسپەکە روو بەرووی دوژمن ببنەوە ..!! ئەگەر جەنگە کەت بردەوە و سەرکەتوو بووی ئەوە کەس کارەکەت خەلکە کەت دینەوە ، بەلام ئەگەر شکستت هیناو سەرنەکەوتی ،ئەوا بەنەمالکەی خۆتان پاراستووە خەلکە کەی خۆت ماوە لەدەست نەداوە لە گەل مال سامانەکەیان ..!! (مالك ) ووتی : سویند بەخوا ئەو کارە ناکەم ، تۆ پیر بوویت بەسالاچوویت ،هەروەها راو بۆ چوونەکانت هیچ کاریگەریان نەماوە ..!! هەروەها ووتی : سویند بەخوا ئەی خەلکی هەوازین ئەگەر فەرمانەکانم جی بەجی نەکەن بە شمشیرەکەم خۆم دە کوژم ..!! ئەو قسەیەی هینا سەر زمانی خۆی تەنها بۆ ئەم مەبەستە بوو ،کە (مالك ) نەی دەوویست گرنگی بەراو بۆچوونەکانی (دورید ) بردیت ، بەلام (دورید )ووتی : من هەم لیرەم و هەم لیرە نیم ..!! (دورید ) سەرکردەی نەوەی (جشم ) بوو ، بەلام لە بەر بەسالاچوونی و تەمنی زۆری بەرەو نەمانی دەچوو ..!! بەلی ئەوە بوو (مالك ) بە خەلکانی هەوازینی ووت: کاتیك رووبەرووی دوژمن بوونەوە کیفکەی شمشیرە کانتان بشکین ، بە یەکجاری هەلمەت بەرن بۆ سەر دوژمن ..!!

ئ

له ( ابن ئیسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دەگێرتەوە دەلیت : ( مالك ) كەسانیكی نارد بۆ ئەوەی هەوالی هاتنی سوپای ئیسلام بزانن ، ئەوانیش چوون كە ئاگادری جم وجۆلەكانی سوپای ئیسلام بن ، بەلام كاتیك گەرانەوە بەتەواوی تر سا بوون ..؟! ( مالك ) پرسی : چیتان بینی ؟! ئەوانیش ووتیان : پیاوە سپی پۆشەكان بە سواری ئەسپەوە بۆیە ترساوین .

بەلام ئەو هەواله پیداگری سوور بوونی جەنگ كردنی ( مالك ) لەگەل سوپای ئیسلامدا ئەوی لەناو نەبرد ساردی نەكردوە لە جەنگ كردندا ..؟! بەلی كاتی پیغەمبەری خوا ﷺ لە هەوازین و سەقیف ئاگادار كرایەوە ،ئەویش ( عبدالله ی كوری حەدرەدی ئەسلەمی ) رەوانەكرد تا بروات و لە گە لیاندا بمینیتەوە هەواله كانی ئەوان بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ بینیت و بزانیت فەرماندە و سەركردەو هۆزەكانیان كین ..؟!( عبدالله ) رۆیشتە ناو خەلكانی هەوازین لە گەلیان دانیشت ، لەمەبەست كارو نیهینی سوپای هەوازین ئاگادار بوویەوە ،بیست و بینی كە بۆ جەنگ كردن لە گەل پیغەمبەری خوا ﷺ هاتوون ،گەرایەوە بۆ ناوسوپای ئیسلام لە مەبەستی هەوازین ئاگاداری كردنەوە هەواله كەی پی راگەیاندن ،هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ ( عمری ) بانگ كرد ،كە هەواله كانی ( عبدالله ) ی بۆ باسكرد. ( عمر ) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم پیاوە درۆ دەكات واتە : ( عبدالله )

هەروەها ( عبدالله ) ووتی تۆ هەمیشە حاشا لە راستیەكان دەكەیت ..؟! ( عمر ) ووتی ئەی پیغەمبەری خوا دەبینی یان دەبیستی كەوا ( عبدالله ) چی دەلیت ..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی ( عمر ) تۆ گومرا بوویت ،( خوای گەورە ) ریگەی نیشاندا یت ..؟!

ی

## دووەم خۆئامادە کردنی سوپای ئیسلام بۆ جەنگ کردن لە گەڵ هەوازین :

بەڵی کاتی پیغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پی گەیشت وا سوپای هەوازین بەرەو شاری مککە کەوتەری ،بە پەلە سوپای ئیسلامی ئامادەکرد ،سوپایکەی ئیسلام لە (١٢٠٠٠) هەرزارو پیك هاتبوو ،(٢٠٠٠) هەزار جنگاوەر لە کەسانەی شاری مککە بوون کە تازە ببوونە ئیسلام ، بەڵی پیغەمبەری خوا ﷺ وای بەچاك زانی کە لە دەرەوەی شاری مککە روو بەرووی سوپای هەوازین ببیتەوە ، چونکە ئەگەر لە ناو شاری مککە رووبەروویان ببیتەوە ئەوا سەرکەتنی باش بەدەست ناهینن ، چونکە خەڵکی مککە هەندیکیان تازە موسلمان ببون هەندیکی تریشیان ماوەیان دا بوو تاکو بیر بکەنەوە بۆ ئیسلام بوون ، هەندیکی تریشیان هیشتان بی باوەر بوون موسلمانە بوون ، نزیکەی (١٥) رۆژیش دە بوو شاری مککە فتح کرا بوو لە شەرو جەنگ تەواو ببو ، هەر بۆیە وای بەچاك زانی لەدەرەوەی شاری مککە روو بەروویان ببیتەوە ، ئەوە بوو کە سوپای هەوازین لەدۆڵی (حونین ) سوپاکەیان خست و لەویدا مانەوە چاوەری روو بەروو بوونەوەیان دە کرد لەگەڵ سوپای ئیسلام دا ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مککە (عەتابی کوری ئوسیدی ) دانا بۆ کارو بارو ئاسایشی شاری مککە ، بەڵی پیغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد کە سوپای هەوازین زۆرن جەند جا ر بەقەد سوپای ئیسلام چەك کەرەسەی جەنگی تواویان پیە،هەروەها سوپای ئیسلام بە ژمارە کەم تر بوون لە سوپای هەوازین ،هەروەها چەك تفاقی جەنگی کەرسەی جەنگیشیان کەمتر بوو، بۆ ئەم مەبەستە بۆ پیداویستیەکانی کەرەسەی جەنگی سوپای ئیسلام ،وای بەچاك زانی کە داخوازی کەرەسەی جەنگی لە هەندیك کەس بکات ..!! لە (ابو جعفەری کوری محمدی کوری علی حسین ) دە گیرتەوە دەڵیت : کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی هەوازینی کرد ، بیستی کەوا (صفوانی کوری ئومیە ) بریکی زۆری کەرەسەی جەنگی شمیرو رەم قەڵغانی هەیە ، ئەوی بانگ کرد ، (صفوان ) هیشتان موسلمانە بوو ناباوەر بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی باوکی ئومەییە ، کەرسەی جەنگی و شمشیرو رەم قەڵغانی خۆت بە قەرز بە ئیمە بەبەخشە تاوەکو جەنگی دوژمنی پی بکەین ..!! صفوان ووتی : ئەی ﷴ بەزۆر وەری دەگریت..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەقەرز وەری دەگرم بۆتی دەگەرینمەوە ..!! صفوان ووتی : کیشە نیە سەد قەڵغان شمشیرو رم پیدا ..!! ئەڵین : صفوان دوای لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد کە کەرەسەکانی جەنگ لە ئەستۆ بگریت و وە پیغەمبەری خوا ﷺ رازی بوو ..!!

ئەڵین : ئەمە بووە سوونەت قەرز وەك ئەمانەت دەبیت بگەرین ریتەوە ..!!

ئ

له ( جابر ) وه – خوا لی رازی بیت – ده گیرتهوه دهلیت : کاتیك گهیشتنه دۆلی حونین له یهکیك له دۆله کانی ( توهامه ) سهرهو خوار بووینهوه یان لیژ بووینهوه ،له تاریکی بهرهبهیان دا بوو، دوژمن واته ههوازین پیش ئیمه گهیشت بوونه دۆله که بۆ سهیان دانا بوو ..!! هیرشیان کرد خهلك ههلهاتن و رایان کرد ، کهس بهکهس نهبوو ..!! پیغهمبهری خوا ﷺ رووی کرده لای راست و فهرمووی: ئهی خهلکینه له دهوری من دا کۆ ببنهوه ، من پیغهمبهری خوام ﷺ وه ﷴ کوری عبدالله م ..!!دهگیرنهوه دهلین : ووشتره کان کهوتبوونه دوویهك ،خهلکان زۆری رۆیشتن چهند کهسیك مانهوه له کۆچ کهران و ئهنصاره کان و خزمهکانی پیغهمبهری خوا ﷺ له گهل پیغهمبهری خوا ﷺ مانهوه ،له ناو کۆچ کهران ( ابو بکرصدیق ) و ( عمری کور خهتاب ) له خزمهکانی ( علی کوری ابی تالیب ) و ( عباس کوری عبدالمتلیب ) ( فهزلی کوری ابو سفیان کوری حارس ) و ( ربیعه ی کوری حارس ) و ( ئه یمهن ی کوری عوبهید ) و ( دایکی ئه یمهن ) و( ئوسامهی کوری زید ) مانهوه ..!! ههروهها ئهیهکیك له پیاوانی ههوازین به سواری ئهسپیکهوه ئالایهکی رهشی له دهست دابوو ، وه رمیکی دریژی لهدهست دابوو ، له پیشهوهی سوپای ههوازین بوو ، به ههر کهسیك ده گهیشت به رمیك لیدهدا زامداری ده کرد یان شههیدی ده کرد ..!! کاتیك کهسی بهدهستهوه نهما رمهکهی خۆی بهرز کردهوه تا شوینی بکهون ..!! کایتك موسلمانهکان ههلهاتن له جهنگ پاشه کهشهیان کرد ، بهلام موسلمانه تازه کان ئهمهیان له دل دا بوو ئهوهی هاته سهر زمانیان دهریان بری ..!!

( ابو سفیان کوری حارس ) ووتی شکهستی ئهوان تا کو دهریا بهردهوام دهبیت ، لهم کاتهدا تیریك له تیرهکانی تیروپشکی کهعبهی له تیر دانهکهی خۆیدا بینی ..!! ( کلده کوری حهنبهل ) برای ( له دایکهوه ) و( صفوانی کوری ئومهییه ) هاواری کرد جادوو بهتال بوویهوه ..!! ( صفوان ) هیشتا نا باوهر بوو ، ئهماوهیهی که پیغهمبهری خوا ﷺ پی دا بوو هیشتان تهواو نهببوو ، ئهویش ووتی : بی دهنگ به خوا دهمت بشکینیت ،ئه گهر یهکیك له قورهیشهکان فهرمانرهوایی من بیت باشتره له ژیر دهستهی خهلکانی ههوازین ..!!ههروهها ( شیبهی کوری عوسمان ) ده گیرتهوه دهلیت : بهخۆم ووت ئهمرۆ تۆ لهی باوکی خۆم دهسینمهوه که له غهزای ئوحود کوژرا بوو ،ئهمرۆ ﷴ ده کوژم ..!! رووم کرده پیغهمبهری خوا ﷺ تا بی کوژم بهلام شتیك هات دلی گرتم ..!! نهم توانی ئهو کاره بکهم و زانیم ئه پاریزراوه ..!! ههروهها ( عباس کوری عبدالمتهلیب ) ده گیرتهوه دهلیت : لهگهل پیغهمبهری خوا ﷺ دا بووم جلهوی ئیستره که ئهوم گرتبوو ، پیغهمبهری خوا کاتیك ههلهاتنی خهلکانی بینی ، فهرمووی : ئهی خهلکینه بۆ کوی دهرۆن !؟ کاتی بینی کهس گرینگی به فهرموودهکانی نادات ..!! فهرمووی : ئهی عباس هاوار بکه ..!؟ ئهی ئهنصارهکان ئهی ئهو کهسانهی له بیعهتی حودیبیه ئاماده بوون ، مهبهستی پیغهمبهری خوا ﷺ بیعهت دانی لهژیر درهختهکهدا که ئهنصارهکان و کۆچهکهران بیعهتی مردنیان پی دا ، بهلی لهم کاتهدا کهسانیك وهلامی پیغهمبهری خوا یان ﷺ دایهوه ووتیان : ئامادهین ،کهسانیکیش ریگهیان نهبوو

ی
بگەرینەوە ،بەلام ووشترە کەی خۆیان بەجی هیشت بە شمشیرو رم و قەلانی دەستیان گەرانەوە ،بەدوای ئەو دەنگەدا هاتن تا گەیشتنە لای پیغەمبەری خوا ﷺ نزیکە ی (١٠٠) کەس لەدەوری پیغەمبەری خوا ﷺ کۆ بوونەوە ، شەرو کوشتاور جەنگیان دەست پی کرد ..!! سەرەتای شەرکردن ئەنصارە کانە بوون ، پیغەمبەری خوا ﷺ کاتیك بین ئەوا موسلمانەکان بە دامەزراوی شەریان دەکرد ، فەرمووی : ئەوا جەنگە کە گەرم بوو ..!! لە (جابر)وە – خوا لی رازی بیت – بۆ مان دە گیرتەوە دەلیت : لە کاتەی کە پیاویکی هەوازین هەلگری ئالاکە بوو ، شەری دە کرد ، (علی کوری ابی تالیب )و یەکیك لە ئەنصارە کان هەلمەتیان بردە سەری (علی ) لە شتەویەوە هەلمەتی بردە سەر ووشترەکەی کوشتی ، وە ئەنصارە کەش هیرشی کردە سە پیاوە هەوازینە کە قاچی قرتاند ..!! لە (ابن ئیسحاق ) وە – خوا لی رازی بیت - پیغەمبەری خوا ﷺ (دایکی سەلیمی کچی ملحانی ) بینی لە گەل هاوسەرە کەی خۆیدا بوو کە (ابو تەلحە ) بوو ، پارچەیەکی لە خۆ ئالاند بوو بە (عبدالله ی کوری تەلحە ) دوو گیان بوو ، ووشترەکەی (باوکی تەلحە ی) رادەکیشا ، دەشترسا ووشترە کە بەسەریەوە زال بیت ، سەری ووشترەکە نزیك بوو دەستی خستبووە ناو دەمی ووشترە کە پیغەمبەری خوا ﷺ پی فەرموو : ئەی دایکی سەلیمە ..؟! ئەویش ووتی : ئەی دایك و باکوم بە قوربانی تۆ بن ، ئەو کەسانەی وا هەلدین شەرناکەن وەك ئەو کەسانە وایە کە لە گەل تۆ دەکەن بکوژە ..!!

پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یا ئەوەی خوای گەورە ریگە چارەیەك بدۆزیتەوە ..!! خەنجەریك لەدەستی دایکی سەلیم دا بوو ،باوکی تەلحە ووتی : ئەوە چیە ..؟! ئەویش ووتی : ئەم خەنجەرم بۆ ئەوەیە کەیەکیك لە ناباوەران لیم نزیك بیتەوە بۆ ئەوەی سکی هەلدرم ..!! باوکی تەلحە ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ دەبیستی ئەوا چی دەلیت ..؟! (ئەنسی کوری مالك ) – خوالی رازی بیت – دەگیرتەوە دەلیت : باوکی تەلحە لەرۆژی حونین دا ، (٢٠) کەسی کوشت لە کافرو بی باوەران ،وە بەرگی ئەوانی هەلگرت ..!! هەروەها (جوبەیری کوری موتعیم ) – خوا لی رازی بیت – دە گیرتەوە دەلیت : پیش ئەوەی کە دوژمانان و بی باوەران شکست بخۆن و ، موسلمانان بۆ جەنگ هەلمەت بەرن ..!! شتیکم بینی کە هاوشیوەی پارچە قوماشی رەش لە ئاسمانەوە دە هاتنە خوارەوە ، کەوتە نیوان ئیمە دوژمانی هەوازین ،میروولە رەشەکان بلاو بوونەوە دۆلەکەی (حونین)یان پر کرد زانیم ئەو فریشتەیە بەشیوەی شکستن لە ناو بی باوەران دوژمانی هەوازین بلاوبوونەوە ..!! هەروەها (ابن ئیسحاق) – خوا لی رازی بیت – دە گیرتەوە دەلیت : کاتیك بی باوەرانی هەوازین رووخان و شکستیان خوارد ، لە نەوەی (ثقیف) (٧٠) پیاویان لی کوژرا لە ژیر ئالاکەی خۆیاندا کوژران ..!!

(میژووی طبري بە کوردی) بەرگی سیەم لاپەرە ١١٨٣ تاکو لاپەر ١١٨٦

ئ

له (ئەنسی کوری مالك ) – خوا لی رازی بیت – ده گیریتەوه دەلیت : له رۆژی حونین دا پیغەمبەری خوا ﷺ سواری ئیستریکی سپی بوو ، بەناوی (دولد ول) کاتیك سوپای ئیسلام شکستیان خوارد هەلهاتن ، پیغەمبەری خوا ﷺ له سەر ئیسترەکەی خۆی دا فەرمووی : دولدول له سەر زەوی بخەوه دولدول سکی خسته سەر زەوی و پیغەمبەری خوا ﷺ مشتی یان چەنگیك خۆلی هەلگرت و هاویشتی به ناو دوژمندا و فەرمووی : سەرکەوتوو نەبن ، دوژمنانی سوپای ئیسلام بی ئەوەی شمشیرو تیرو رمیان بەرکەویت هەلاتن.

له (ابن ئیسحاق )– خوا لی رازی بیت – دەگیرتەوه دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ کاتی سوپای ئیسلام رەوانه دەکرد ، ده یفەرموو : ئەگەر دەستان به ( بەجاد ) گەیشت دەربازی نەبیت ، (بەجاد ) یەکیك بوو له نەوەی (سعد) تاوانیکی گەورە ی ئه نجامدا بوو ، کاتیك موسلمانان ئەویان گرت له گەل کەسه کانی بردیان خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ، وه (شیمای کچی حارس )یش خوشکی شیری پیغەمبەری خوا ﷺ بوو، له ناویاندا ده بینرا و کاتیك موسلمانان به خراپەی مامەلەیان له گەل کرد ووتی: دەزانن من خوشکی شیری هاوریکەی ئیوەم ؟! باوەریان به قسه کەی نەکرد ، تاکو بردیان خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها (ئەبی جره ) و (یەزیدی کوری عوبەیدی سعدی ) دەلیت : کاتیك شەیمایان بردە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ، من خوشکی تۆم ..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : نیشانەکه چیه ..؟! ئەویش ووتی : کاتیك لەسەر شان تۆم دەبرد ، تۆش گازت دەبرد شوینەکەی ئیستاش ماوه ..!! هەروەها پیغەمبەری خوا نیشانەکه ناسیەوه عەباکەی پان کرده وه رایەخست بۆی فەرمووی : لەسەری دانیشه ..؟! هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ پی فەرموو : ئەگەر ده خوازیت له لای من بینیەوه ،خۆشەویست وئازیزیت ،ئەگەریش ناخوازیت شتیکت پی ده بەخشم بۆ لای خەلکه کەت بگەریوه ..!!شیماش ووتی : شتیکه پی ببەخشە بۆ لای خەلکه کەم ده گەریمەوه ، وه پیغەمبەری خوا ﷺ شتیکی پی بەخشی ئەوی رەوانه کرده وه بۆ لای خەلکه کەی خۆی ..!!

هەروەها له (ابن ئیسحاق ) وه دەلیت : کاتیك سوپای هەوازین شکستی هینا ، نەوەی (ثقیف) هەلهاتن و گەیشتنه شاری طائیف ده رگا کانی ئەم شاره یان لەسەر خۆدا داخست و بۆ جەنگ کردن خۆیان ئامادە کرد.

بەلام (عوروه کوری مسعود ) و ( غیلان کوری سەلمه ) له جەنگی طائیف بەشدار نەبوون ، چونکه ئەو دووانه له (جەرش ) زانیارایان وەرده گرت له سەر دروست کردنی مه نجەنیق ..!!

(میژووی طبري به کوردی ) بەرگی سیەم لاپەرە ١١٨٩.

ی

بەلی دوای ئەوەی کە سوپای ئیسلام بەسەر سوپای هەوازین سەرکەوتن ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە سوپای ئیسلام کرد، شوینی سوپای پەرتەوازەی هەوازین کەون ،ئەوە بوو چوونە شاری طائیف لەویدا خۆیان قایم کرد ،بەلی ( مالیك ی کوری عەوف ) کە فەرماندەی سوپای هەوازین بوو ، تیکشکا بە ناچاری هەلاتن و ، ئەوەی بوو ( مالیك ) چووە سەر بەرزایەك ووتی : راوەست بوەستن با ژن ومندالە ومال و سامانەکەمان پاریزراوە بیت ، بەلام خەلکەی هەوالیان پیدا کەوا  پیاویك بەدوا یانەوەیە ئەویش ووتی : ئەوە ( زوبیری کوری عەوامە ) سویند بەخوا لە شوینی خۆتان داتان دە گری ، بەلی هەرواش بوو ئەوە بوو ( زوبیری کوری عەوام ) هەلمەتی بردە سەریان ، دواتر ( مالك ) لەناو دار و درەختەکان خۆی شاردەوە و رای دە کرد تا وەکو خۆی گەیاندە کۆشکیك بەناوی ( لیبە ) ، کاتیك پیغەمبەری خوا هەوالی پی گەیشت ئەویش فەرمانی دا کەسیك دوای بکەویت ، یان تەنگی پی هەلچنی ،چونکە بە هیوای ئەوە بوو کە خوای گەورە هیدایە تی بدات ، ئەوە بوو کە پیغەمبەری خوا نوینەری خۆی رەوانەکرد بۆ لای ( مالك کوری عەوف ) ئەوە بوو پی راگەیاند ئەگەر موسلمان بیت ،ئەوا  چاو پۆشی لی دە کریت ، ژن و مندال و مال سامانەکەی و خەلکە کە ی بۆ دە گەرینیتەوە ،ئەوە بوو ( مالیك ی کوری عەوف ) بە چاکی موسلمان بوونی خۆی راگەیاند..!! بە لی دوای راو دوونانی سوپای هەوازین پەرتەوازە یان ، ئەوە بوو هەندیکان لە دۆلی ( أوطاس ) کۆ بوونەوە و خۆیان ئامادە کرد بۆ بەرنگار بوونەوەی سوپای ئیسلام بۆ ئەوەی دەست لە سوپای ئیسلام بوەشینن ،بەلی کاتی سوپای ئیسلام گەیشتە ( طائیف ) پیغەمبەری خوا ﷺ هەوالی هەندیك لە پیاوانی سوپای هەوازین بیست ، کە ئەوان وا لە دۆلی ( أوطاس ) ..!! هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ هاوەلی خۆی رەوانەکرد بۆ هەلمەت کردنە سەر ئەو کۆمەلە پیاوەی هەوازین لە دۆلی ( أوطاس ) ئەوە بوو فەرمانی کرد بە دوو هاوەلی خۆی ئەویش ( ابو عامر ) کە ناوی ( عوبەیدی کوری سەلیمی کوری حەسار )بووە لە گەورە هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ، ئەلین زووبە زوو کۆچی کردوە بۆ وەلاتی حەبەشە ،ئەگرینەوە دەلین : چاوی کویر بووە ،بەلام زوو چاك بوونە تەوە ،کە ئەو هاوەلە مامی ( ابو موسی ئەشعەری ) بوو ، ( ابوموسی ئەشعەری ) ناوی ( عبداللە ی کوری قیسی کوری سلیم )بووە سەرە تا لە گەل براکانی و کۆمەلیك ئەشعری تر هاتوو نە تبە بۆ شاری مککە ، ( ابو موسی ئەشعری ) موسلمان دەبیت کۆچ بۆ حەبەشە دەکات ، بەلام هەندیك رای بۆ چوونی تر هەیە کە ئەلین : ( ابو موسی ئەشعەری ) کۆچی بۆ حەبەشە نەکردووە ..!!

ێ

## سی یەم :جەنگی ( أوطاس )

بەڵی ئەو بوو سوپای هەوازین پەرتەوازە بوو ،هەندی چوونە شاری ( طائیف ) بەتایبەتی نەوەی ( ثقیف ) هەندیکی تریش لە دۆلیك بەناوی ( أوطاس ) خۆیان ریك دەخست بۆ ئەوەی دەستیك لە سوپای ئیسلام بوەشینن ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سرییە یەك بۆ لە ناو بردنی ئەو کۆمەلە ئەوە بوو ئەمیری سریەکە بەناوی ( ابو عامر ) ئالای سوپای ئیسلامی هەگرت بەروە دۆلی ( أوطاس ) کەوتە ری ، لەویدا تووشی جەند کۆمەلیکی لە سوپای هەوازین کەوت ، لە جەند دۆلیك دا خۆیان قایم کرد بوو ، بە تەمای هیرش کردن و جەنگ و کوشتار بوو ، ئەم کۆمەلە ( ١٠ ) برایان لەگەل دا بوو ، کە ( ٩ ) برایان یەك لەدوی یەك هاتن زۆران بازیان کرد لەگەل ( ابو عامر ) کرد ، سەر ئە نجام هەر ( ٩ ) برا بە دەستی ( ابو عامر ) کوژران ، بەلی هەر کامیان دە هاتنە مەیدا بو زۆران بازی لە گەل ( ابو عامر ) بەلام لە پیش دا ( ابو عامر ) بانگی ئیسلامی بۆ دەکردن دوای هیدایەتی بۆ سەر ئیسلام لی دە کردن ،هەروەها ( ابو عامر ) دەی ووت : خوایە شاهید بە بەسەریانەوە ..!! هەر ( ٩ ) برای کوشتن ، کە نۆرەی برای ( ١٠ ) هات ئەویش هەلمەتی دایە ( ابو عامر ) وە ( ابو عامر ) بانگی کرد بۆ سەر ئیسلام ،ئە شی ووت : خوایە شاهید بە لە سەری ،ئەویش ووتی : خوایە شاهیدییم لەسەر نەدەی ،( ابو عامر ) دەستی لی کیشا یەوە و ، کابرا بە باشی موسلمان بوو..!! لە کاتی جەنگ کردندا لە ( أوطاس ) پیاویك تیریکی لە ئەژنۆی ( ابو عامر ) دا خیرا ( ابو موسی ئەشعەری ) خۆی گەیاندە لای مامی واتە : ( ابو عامر ) لی پرسی : مامە گیان ! کی بوو تیری تی گرتی ..؟

ئەویش ئاماژەی کرد بۆ لای پیاویك ..!! ( ابو موسی ئەشعەی ) دوای پیاوە کە کەوت کوشتی ..!! ئەویش دە گەریتەوە لای مامی تیرە کە دەر دە هینی ئاوی لە ئەژنۆی دەرپەری ، ( ابو عامر ) ووتی کوری برام برۆ خزمەتی پیغەمبەری خوا ﷺ سەلامی پی بگەیەنە و پی بلی : دوای لی خۆش بوونم بۆ بکە ..!! ( ابو عامر ) ی مامی ( ابو موسی ی ئەشعەری ) دەخاتە شوینی خۆی ، دوای کەمیك شەهید دەبیت ، ( ابو موسی ) دە گەریتەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ئە چیتە ژوورەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ( ابو موسی ) هەوالی موسلمانەکانی بە پیغەمبەری خوا ﷺ راگەیاند وە هەوالی ( ابو عامر ) پی راگەیاند وە دوای لی خش بوونەکەشی بۆ باس کرد ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ دەست نویژی ئەگریت و پاشان هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز فەرمووی : ( اللهم إغفر لعبيد أبي عامر ) پاشان فەرمووی: ( اللهم اجعله يوم القيامة فوق كثير من خلقك ) ، هەروەها ( ابو موسی ) دوای لە پیغەمبەری خوا ﷺ دوای لیخۆش بوون بۆ منیش بکە ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی : ( اللهم اغفر لعبد الله بن قيس ذنبه وأخلة يوم القيامة مدخلا كريما ) بەلی سەرکردەی پاش ماوە هەوازین لە ( أوطاس ) کوژرا کە ناوی ( درويد الصمة ) بوو ، هەوروەها ( ابو عامری ئەشعەری ) لەم جەنگە دا شەهید کرا ،دواتری ( ابو موسی ئەشعەری ) لە جیگای خۆی دا نا .

ئ

## چوارەم : جەنگی ( طائیف )

پێغەمبەری خوا ﷺ پاش تەواو کرنی لە جەنگی ( حونین ) جەنگی ( أوطاس ) دا سوپای ئیسلامی بەرەو شاری ( طائیف ) بەری کرد ،چونکە ئەوانەی پاشماوە جەنگی ( حونین ) واتە : هۆزەکانی هەوازین ، کە هۆزی ( ثقیف ) یەکیك بوون لە هۆزەکانی هەوازین ئەوان کۆمەلیکی زۆریان هەلاتن لە جەنگی حونین خۆیان گەیان شاری ( طائیف ) و لەویدا خۆیان قایم کرد و خۆیان ئامادە کرد بۆ رووبەروو بونەوەی سوپای ئیسلام ،سوپای ئیسلامیش کەوتە راو دونانیان تا شاری ( طائیف ) لەویدا ئەوان خۆیان قایم کرد دەگاکانی ئەوشارەیان بە سەرخۆدا داخست ، سوپای ئیسلامیش گەمارۆی شاری ( طائیف ) یدا ، بەلم بەشیوازیکی پیشکەوتووی سەربازی ئەو سەردمە ، چونکە پیشتر ئەم پیلانانەی جەنگ بەکار نەهاتبوون ،کە لە جەنگی( طائیف ) بەکار هاتبوو ، ئەوش هەندیك لە نوی بوونەوەی سوپای ئیسلام بوو ،لە کەرەسەی جەنگی ، بۆ نموونە بەکار هینانی مه نجەنیق وە تۆپ هاویژی ، وە دروست کردنی زرییۆش بۆ هیرش کردن وە ك دەبابەی ئەوسەردە مە ،بۆ برینی دیوارە کانی شاری ( طائیف ) هەروەها هەلبژاردنی جیگای گونجاو لە لایەن پیغەمبەری خوا ﷺ هەروەها بە کار هینانی جەنگی دەروونی وەك پرۆپاگەندی سوپای بەهیزی ئیسلام ، هەروەها سوتاندنی رەز و دار خورماکانیان لەدەورە بەری شاری ( طائیف )، ئینجا پیغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی کرد ئەوانەی کە کۆیلەن ئەگەر بینە نیو سوپای ئیسلام ئەوا ئازاد دەبن ،ئیتر ئەوە بوو ( ٢٣ ) لە کۆیلە کانی شاری ( طائیف ) هاتنە خوارەوە و چوونە ریزەکانی سوپای ئیسلام ،کەواتە پیغەمبەری خوا هەولیدا سوود لە نوی ترین ئامری سەردەم وەربگری ، لەماوەی گەمارۆدانی شاری ( طائیف ) ( ١٢ ) کەس لە موسلمانان شەهید بووە ،ئەووش بە تیری تیر هاویژەکانی سەر قەلاکانیان ، هەروەها ئەوە بوو کە سوپای ئیسلام بۆ ماوەی ( ١٧ ) رۆژ گەمارۆی شاری ( طائیف )، تا ئەوە بوو وازیان لی هینان ئەوە بوو دواتر خوای گەورە هیدایەتی دان بەلام دە گیرنەوە هۆزی ( ثقیف ) تا سالی ( ٩ ) یەمی کۆچی دا موسلمان نەبوون ، بەلام لە جیاتی ئەوەی کە پیغەمبەری خوا ﷺ دوعایان لی بکات تووڕیشی نەهامەتی بن ، کەچی دوعای بۆ کردن کە خوای گەورە هیدایەتیان بدات ، بەلی هۆزی ثقیف لە ( طائیف ) و دەورو بەری دا دەژیان ، هەروەك واقدی دەگیریتەوە دەلیت ، پیغەمبەری خوا ﷺ بەرەو شاری ( طائیف ) بەریکەوت رۆیشت لە نزیك قەلاکانی شاری ( طائیف ) باری خست و ، لەوی سەربازگەی دروست کرد ، ئەوە بوو ( حوبابی کوری منز )هاتە خزمەتی پیغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیمە زۆر لە قەلاکانیان نزیك کەوتووینەوە ،وا باشە لە قەلاکانیان دوور بکەوینەوە ، یەکەم جار پیغەمبەری خوا ﷺ بی دەنگ بوو ، دواتر بانگی ( حەبابی ) کرد ،وە دوای لی کرد شوینیکی چاك بۆ سوپای ئیسلام دا بنی ، تا وەکو سوپا لە تیری دوژمن دوور کەویتەوە ، چونکە ژمارەیەك شەهید بوون ژمارەیەکیش زامدار بوون ، دوای گواستنەوەی سوپای ئیسلام لە تیر هاویژە کانی شاری ( طائیف )، ئەوە بوو هاوەلی

ێ
پیغەمبەری خوا ﷺ بەناوی (یەزیدی کوری زمعە کوری ئە سود ) بە سواری ئەسپەوە چووە پیشەوە و گفتوو گۆی لە خەلکەی (ثقیف ) کرد ، ئەمانیان پیدا بەلام ناپاکیان لەگەل کرد تیریکیان هاویژت شەهیدیان کرد ، بەلی ئەوە بوو لە کاتی گەمارۆدانی شاری (طائیف ) فەرماندەی موسلمانان (خالیدی کوری ولید ) هاتە پیشەوە بۆ نزیك قەلاکانیان بانگی لی کردن کە پیاویکتان بیتە دەرەوە بۆ زۆران بازی ،کەچی هیچ یان نەویران بینە دەرەوە ..!! لە سەر ئە نجامدا (عبداللای ) سەرداری شاری (طائیف ) بانگی کرد ئەی (خالید ) کەهەس ئەمادە ی زۆران بازی نیە ..!! چونکە ئەوان لە ناو قەلاکانیان دا ئەمینەوە بەشی چەندین سال خۆراکیان هەیە ..!! بەلی خۆیان بە دەستەوە نەدا ، بەلام پیغەمبەری خواصلی ریگایەکی تری گرتە بەر ئەویش فەرمانی دا بە سووتاندنی دارو درەختەکانی شاری (طائیف )، کاتیك بینیان وا رەزو درەختەکانیان دە سووتیت ، (عبداللای ) ثقفي ئەمەی بینی یەکسەر هاواری کرد ئەی ﷺ بۆچی باخ و باخاتەکان ئە سوتینی یان ئەبری ..؟! یان ئەی بیت لەگەل خۆت ئەگەر سەرکەوتی ، یان لەبەر خوا سیلە ی رەحم دەستی لی هەل ئەگری وەك خۆت ئەلیت ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (فإني أعها الله والرحم ) ، بەلی شاری (طائیف ) باکیان بە خۆراك نە بوو چونکە زەغیرەیەکی زۆریان هەبوو، هەروەها کانیاویشیان هەبوو باکیان بە ئاویش نەبوو، بەلام موسلمانەکان لەم دەشتاویە مابوونەوە لەبەردم تیر هاویژە کان وەستابوو ، هەندیك دەلین : بۆماوەی (١٥) رۆژ هەندیکی تریش دەلین بۆماوەی (٢٠) رۆژ مانەوە و گەمارۆی شاری (طائیف ) دا ، (١٢) پیاو شەهید بوو ، دوو کەس لە هۆزی ثقیف کوژرا ، سەر ئە نجام پیغەمبەری خوا ﷺ راویژی بە موسلمانەکان کرد کە گەمارۆی شاری (طائیف ) هەبگرن بگەرینەوە بۆ شاری مەدینە ، بەلام هەندی لەموسلمانان نارازی بوو ، سەرئە نجام هەموویان هاتنە سەر راو بۆ چوونی پیغەمبەری خوا ﷺ گەرانەوە شاری مەدینە، پیش گەرانەوەی پیغەمبەری خوا ﷺ لە شاری (طائیف ) کرد فەرمووی : ( لا إله إلا الله وحده ، صدق وعده ونصر عبده ،وهزم الاحزاب وحده ) هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (آئبون إن شاء الله ،عابدون ،لربنا حامدون ) ،هە روە ها کاتی (ثقیف ) بەجی هیشت فەرمووی : (اللهم اهدهم واکفنا مؤونتهم )) ..!! بە لی گەمارۆیی سەر شاری (طائیف ) هەلگیرا سوپای ئیسلام گەرایەوە نیو شاری مەدینە بەلام لە ریگادا جەند رووداویك رووی دا لە بەردەم سوپای ئیسلام دا ، هەلگرتنی گەمارۆ لەسەر شاری (طائیف ) ئەوە حیکمەتیکی خوای بوو ، چونکە بەم کشانەوە و یان هەلگرتنی گەکارۆ لەسەر شاری( طائیف ) ، ئەو بووە هۆی موسلمان بونیان هیدایەتی نوری خوای گەورە یان پیگە یشت ئەویش نوری ئیسلام بوو ، واز هینان لەبت پەرستی شریك هاوبەش دانان کارو کردەوەی نەفامی ، بەلام شاری (طائیف ) هیدایەتی وەرگرت هاتنە سەر ریبازی توحید و یەکتاپەرستی ئاینی ئیسلام بۆ هەتا هەتایی ئەمەش حیکمەتەجوانەکانی ئاینی ئیسلام بوو ،کە خوای گەورە ئەو نورەی خستە دلی دانیشتوانی شاری (طائیف ) لەژیر سیبەرو ئالای ئیسلام دا حەسانەوە ..!!

ێ

## پینچەم :ئەو ئایەتانەی کە لەجەنگی حونین دا هاتنەخوارەوە

**خوای گەورە دەفەرمووی :**﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُمْ مُدْبِرِينَ (٢٥) ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْزَلَ جُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ (٢٦) ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ **التوبە ٢٥-٢٧. واتە: سویند بێت بێگومان (خوای گەورە) لە زۆر شوێندا سەری خستن بە سەر بی باوەراندا ولە رۆژی حونین دا کاتێك کە بە زۆری ژمارەی خۆتان سەرسامی کردبوون ، جا ئێوە بینیتان کە ئەو زۆریە ئێوە هیچ فریاتان نەکەوت ، بی نیازی کردن ،زەویش چەندە فراوانە لیتان هاتەوە یەك و تەنگ بووەوە ،لەوە ودوا هەمووتان پشتان هەلکردو راتان کرد ..!! لە پاشاندا (خوای گەورە ) ئارامی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەر پیغەمبەرەکەی ﷺ و سە ئیماندااران و سەربازانیکی دابە زاند کە نەتاندیووە ،سزای ئەوانەشیدا کە بی باوەران بوون ، ئەوە ش سزای و پاداشتی بی باوەرانە ..!! ئینجا دوای ئەوە خوای گەورە لە هەر کەسێك کە بیەوێت شایستە بێت تەوبە و پەشیمانی وەردەگرێت خوا لی خۆشبوو میهرە بانە ..!!**

**هەروەها (خوای گەورە ) ئەم ئایە تەشی دابەزاند کە دەفەرمووی :** ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ **النساء ٢٤ .**

**واتا: هەروەها حەرامە لیتان ئەو ئافرەتانەی کە هاوسەریان هەیە ..!! جگە لە کەنیزەکتان ،( بەلی لەم زەمانەدا باوو بووە جا ئەم سنوورانە ) جگە لەوانەی کەباس کران ، حەلال بۆتان بە هۆی مال و داریتانەوە هاوسەر بگرن ،تا چوار ئافرت ، تا پاك و داوین بن ، وە لە سنووری رەوەشتی بەرز دەرنەچن ،جا لەگەل هەر ئافرەتیکدا هاوسەریتان کرد ئەوە فەرز کە مارەییە کەیان بدەنی و هیچ گوماناهیش نیە لەسەرتان لە کەم کردنەوەی ئەومارەییە ی لەسەری ریکەوتبوون ،لەدوای دیاریکردنی بەراستی خوا هەمیشە بەردەوام زاناو دانایە ..!!**

ئ

## ڕووداوەکانی دوای جەنگی حونین و سریەکان

**یەکەم: موسلمان بوونی (کەعبی کوری زوهیر):**

کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە شاری (طائیف) گەڕایەوە ، کەعبی کوری زوهیر ) هاتە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ، کەچی پیشتر دمی بە خراپی گەڕا بوو وە جنیوی دابوو بە پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلام (بوجەیری ) برای هانی دە دا بگەڕیتەوە لای پیغەمبەری خوا ﷺ تۆبە بکات ، دەست لە کارە خراپەکانی هەلگری بەرانبەر بە پیغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانان ،ئیتر ئەویش شعیریکی نووسی بە ناوی (بانت سعاد ) لە کاتی نویژی بەیانی دا هاتە لای پیغەمبەری خوا ﷺ سلاوی لی کرد و لەلای دانیشت بی ئەوەی پیغەمبەری خوا ﷺ بیناسیتەو ، ئینجا ووتی : ئەوا (کەعبی کوری زوهیر ) هاتە لات بەموسلمانی دوات لی دەکات لی خۆش بیت ،لەو کاتەدا بوو پیاویکی ئەنصاری هەلساو ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ریگەم بدە با بدەم لەملی بپەرینم ئەو دوژمنی خوایە ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : نەخیر . ئەوە هاتووە موسلمان ببیت و بگەڕیتەوە و تۆبە بکات کە خوای گەورە لی خۆش بیت ، ئینجا (کەعبی کوری زوهیری ) شعیریکی خویندەوە ..!! بەلی بە موسلمان بوونی (کەعبی کوری زوهیر ) یش دە توانین بلین شاعیرە کانی ئەوانەی کە دژی پیغەمبەر و ئیسلام ،کۆتایی پیهات چونکە ئەمانە هەر هەمووی هاتنە ناو ئاینی ئیسلام وەك ( کەعبی کوری زوهیر) ، ( ضرار بن الخطاب ) ، (عبداللە ی کوری الزبعری ) ، (ابو سفیان کوري الحارث ) ، (الحارث کوری هشام ) ، (عباس کوری مردلس ) ، بەلی ئەمانە هەمووی هاتنە ریزە کانی ئاینی ئیسلام لەدژی نەیارانی ئیسلام شعریان دە ووتەوە ، بەلی هەندیکیان جگە لەوەی شاعیر بوون بە لام لە هەمان کاتدا جەنگاوەریکی لیهاتوو پالەوانیکی دامەزراو بەهیز بوون لە ریزە کانی سوپای ئیسلام دا ،بی گومان بە هاتنی ئەو شاعیرانە لە رووی بانگەوازیەوە ئیسلام پیشکەوتنیکی بەرچاوی بە خۆ وە بینی ، چونکە ئەمانەهەم شاعیر بوون هەم جەنگاوەری بە توانا بووە لەریزەکانی سوپای ئیسلامدا، بەلی ئەمان خەلکە دەورو بەری نیمچە دورگەی عەرەبیان هاندەدا بۆ ئەوەی حەماست بیان گری بینە ناو ئاینی ئیسلام ،لەرووی ئەدەب و شیعرە وە ، ئیسلامیان بە خەلکی ئەناساند و بانگەوازیان بۆ دەکرد ، کە خەلك پۆل پۆل و دەستە دەستە و کۆمەل کۆمە بە دەم بانگەوازیە کەیان نەوە بین بۆ ریزەکانی ئاینی ئیسلام ، بەلی ئەمانە کە بوونە موسلمان خزمەتیکی زۆریان کرد بۆ ئیسلام بە هۆی رەوان بیژی شیعرو هۆنراوەکانیەوە ، کە بانگەشەی ئاینی راست و دروستی ئیسلامیان دە کرد لە ناوچەکەدا ،لە هەمان کاتیش دا رووبەرووی دژمنان و منافیقان دە بوونەوە بە شیعرو هۆنراوەکانیان ،بەلی ئیسلام بەروە پیش چوو لەرووی ئەدەب شیعرەوە هۆنراوە و بانگەشی جوانی ئەم شیرە پیاوانە بۆ ئیسلام ..!!

سير النبويه لابى شيبه (٢/٤٨٧)، بدايه والنهايه ابن كثير (٤/٣٦٩-٣٧١) سير النبوية ابن هشام (٤/١٦٨).

ی

## دووەم ریك و پیك ککردنی کارو باری زەکات :

کە پیغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی مانگی (ذو العقدة ) سالی( ٨ ) کۆچی دا ، گەیشتنەوە شاری مەدینە ،ئەوەندە ی پی نەچوو لە مانی موحەرمی سالی ( ٩ ) کۆچی دا هاوە لانی خۆی نارد بۆ زەکات کۆکردنەوە لە لای هۆزەکان کە ئەم هاوەلانەبووە : ١- ( بوریدی کوری حەصیب ) نارد بۆ لای هۆزی ( ئەسلەم ) و ( غیفار ) ،٢- ( عبادەی کوری بەشیر ) نار بۆ لای هۆزی ( سەلیم ) و ( جوهەینە )، ٣-( رافیعی کوری موکیس ) یشی نارد بۆلای هۆزی ( جوهەینە ) ، ٤- ( عمری کوری عاص ) نارد بۆ لای هۆزی ( فەزارە ) ،٥-( ضحاکی کوری شعبان ) نارد بۆ لای هۆزی ( کیلاب ) ،٦-( بوسری کوری سفیانی ) نارد بۆ لای نەوەی ( کەعب ) ،٧- ( ئیبن لوتیبەی ئەزدیی ) نارد بۆ لای هۆ نەوەی ( زبیان )، ٨- ( موهاجیری کوری ئەبو ئومەییە ) نادر بۆ ( صنعاء ) ،٩- ( زیادی کوری لە بید ) نارد بۆ ( حضر موت ) ، ١٠- ( زەبەرقانی کوری بەدر ) نارد بۆ نەوەی ( سعد ) ، ١١-( علی کوری ابی تالیب ) نارد بۆ ( نەجران ) ، ١٢- ( علائی کوری حضرمي ) نارد بۆ ( بەحرین )، ، بەلی پیغەمبەر ی خوا ﷺ ئەم هاوەلانەی خۆی نارد بۆ ئەوە ی زەکات کۆ بکەنەوە لە لای هۆزە عەرە بەکان ئەوانەی ئەوانەی دانیا نا بە ئیسلام بوون هەتنە ناو ئاینی ئیسلام ،بۆ ئەوەی پابەندی هەموو فەرمان و واجب شریعەتەکانی ئیسلام بن وە دووریش کەونەوە لە قەدەغەکراوەکانی ئیسلام ، هەروەها شوینکەوتووی پیغەمبەر و خوای گەورە بن لە ( سمع طاعه ) ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ زور بە ووردی حیسابی لە گەل ئەو پیاوانەی کرد کە ناردی بۆ ئەوەی زەکات لە ناوچەکەدا کۆ بکەنەوە ،تاکو بزانیت جیان وەرگرتووە وە چی شیان هیناوەتەوە بۆ بیت مال موسلمانان ..!!ئەوە بوو یەکیك لە و هاوەلانەی موحاسەبە و لی پرسینەوەی لە گەلدا کرد ،کە ( ئیبن لوتیبەی ئەزدیی )، کە نادری بۆ لای هۆزی ( زوبیان ) ئەم هەوالە ی پیغەمبەری خوا کە گەرایەوە ، لەزەکات وەرگرتن دەی ووت : ئەمەم هیناوە بۆ ئیوە ..!! ئەمەش پیشکەش بە من کراوە ..!!هەر بۆ یە پیغەمبەی خوا ﷺ فەرموو : (( ما بال عالم أبعثه فيقول : هذا لكم وهذا أهدي لي ..؟! أفلا قعد في بيت أبيه أو بيت أمه حتى ينظر أيهدي إليه أم لا ..؟!ولذي نفس محمد ﷺ بيده لا ينا أحد منكم منها شيئا إلا جاء به يوم القيامة يحمله على عنقه ،إن كان بعيرا له رغاء أو بقرة لها خوار ،شاة تعير )). بەلی لەم فەرموودەیەدا نارەزایی لەو کارەبەدەستانە دەر ئەبری کە لە پال زەکاتە کەدا شتیك بۆ خۆی کۆدەکاتەوە ..!! ئەو کەسە یا لە مالی دایکی بیت یان لەمالی باوکی بیت ،دابنیشی بزانی خەلکە کە هیچی پیشکەش دە کەن ..!! وە پیغەمبەر خوا ئەوکەسە یزەکات لادەدات بۆخی ئەوا ئەبی لە رۆژی قیامەت دا بەکۆلی هەلبگری هەر ئاژە لیك بیت یان ئەفورینی یان ئەزرینی ،وەك ووشتر چیل و مە رو ..!!هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : (( أيما عامل استعملناه ،فرضنا له رزقا فما أصاب بعد رزقه فهو غلو )). هەر کەسیکمان کردە کار بەدەست مووچەمان پیدا یان بۆی بریەوە ..!! ئیتر جگە لە مووچەکەی هەر چی دست کەویت ئەوە بە ( غلول ) هەژمار دەکریت ..؟!

( غلول ) واتە : لادانی دەست کەوتەکانی جیهاد یان زەکات یان جگە لە موچەکەی مانگانەی یان رۆژانەی بۆ خۆی کۆ بکاتەوە لە سەر حیسابی وظیفە کە ی پارە وەرگری یان هەر شتیك بە هدیە یان بە هەرجۆریك حەرامە..!! بی گومان جگە لەو برە ی کە بۆ ت ئامادە کراوە هیچ شتیك بۆ حەلال نابیت ،ئەو لە عرفی حوکمرانی پی دەووتریت : خراپ بەکار هینانی دەست هەلات بۆ بەرژەوەندی شخصی خۆی کە ئیستا لەم سەردەمە باوە پارەو سامان کۆدەکەنەوە ئەوانەی لە دەست هەلاتن جا گویی بە حەلال و حەرام نادەن کە ئەم ئامانەتەی مولك وسامانی خەلکیان کە وتۆ تە ژیر دەست راست چەپ هەلی دە لووشن وەك ئاژەل رەفتار دەکەن هەمووشتیك بە غنیمەت دەزانن ..!!

ی

## سی یەم : کۆچی دوای کردنی ( زینب ) کە کچە گەورەیی پیغەمبەری خوا ﷺ بوو :

بەلی لە کۆتایی سالی ( ٨ ) کۆچی دا ، خاتوو ( زینب ) کچە گەورەیی پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلی ( زینب ) هاوسەری (( ابو العاصی کوری ربیع ) بوو ، ( زینب ) ( ١٠ ) سال پیش هاتنی وەحی لە دایك بوو بوو، لەدوای ( زینب ) ( روقیە ) ئینجا ( ئوم کلثوم ) ئینجا ( فاطیمە ) لەدایك بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ زۆری خۆ ش ئەویست ،زۆر زوو موسلمان بوو ، بەلام ( ٦ ) سال پیش موسلمان بۆ نی هاوسەرەکەی ( زینب ) کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە ،بەلام لە کاتی کۆچ کردنی دا بە دەستی کافرانی قورەیش لە وەلاغەکەی کەوتە خوارەوە ، ئەگیرنەوە ئەلین مندالی لە بار چوو ، هەر بەم نەخۆشیەوە کۆچی دوای کرد ، ( زینب ) کوریکی لە ( ابو العاص کوری ربیع ) بوو ، ناوی ( علی ) بوو ئەم مندالە گەیشت بالغ بوون ئەویش کۆچی دوای کرد ، کاتیك ( زینب ) کۆچی دوای کرد ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إغسلنها وترا : ثلاثا ، أوخمسا ،وأجعلن في الاخرة كافورا )) . فەرمووی : چەند جاریکی تاك بی شۆن ، یان سی یان پینج ،لەگەل دوا جار کافوریش بە کار بهینن ..!!

## چوارەم : لەدایك بوونی ( إبراهیم ) کوری پیغەمبەری خوا ﷺ :

لە دایك بوونی إبراهیم لە مانگی ( ذو الحجە ) ی سالی ( ٨ ) کۆچی دا لە دیکی بوو ، لە و هاوسەرەی بوو کە ناوی ( ماریە قیبطی ) بوو کە ( مقوقس )ی پاشای مصر بەدیاری پیشکەشی بە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد بوو ، لە دوای لە دایك بوونی ( إبراهیم ) ماریە ئازاد کرا ، چونکە پیشتر کەنیزەك بوو ، بەلام لەدوای لە دایکبوونی ( إبراهیم ) بووە یەکیك لە هاوسەرە ئازاد کراوەکانی پیغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ بە لەدایك بوونی ( إبراهیم ) زۆر دل خۆش بوو ، هەر بۆیە هاتە ناو هاوەلانی خۆی مژدەی پیدان ،فەرمووی : (( ولد لي الليلة غلام فسميته بإسم أبي إبراهيم )) .الرحيق المختوم ٤٣٩.

ئ

## پینچه : چەند سریە یەك لەدوای جەنگی حونین

### ١-سریەی( عیینە کوری حصن ی خزاری ):

بەلی ئەم سریەیە لە مانگی موحەرەمی سالی (٩) کۆچی دا بوو ،ناردی بۆ لای نەوەی ( تمیم ) ، لەگەل (٥٠) ئەسپ سوار ، کە ئەم سریەیە هیچ هاوەلیکی لە کۆچ کەران و ئەنصارە کان لە گەلی دا نەبوو ، هۆ کاری ناردنی ئەم سریەیە بۆ سەر نەوەی ( تمیم ) ئەوە بوو ، (بنی تمیم ) خەلکی ناوچە کەی لە عەرە بەکان هاندا بوون کە (جزیە ) نەدەن ..!! بەلی (عیینە ) دەر چووە شەو رۆیی دەکرد ،بە رۆژ خۆ حەشار دەدات ،و بەشەویش دەرۆیشت ، تا ئەوە بوو لە (سارا ) دا دای بەسەریاندا ، هەروەها (١١) پیاو وە (٢١) ئافرە ت و (٣) مندالیان بە جی هیشت ..!! (عیینە ) هەر هەمووی هیناوە شاری مەدینە لە مالی (رملە ی کچی حارس ) دا بیە زاندن ..!!دواتر (١٠) پیاو لە نەوەی ( تمیم ) هاتنە شاری مەدینە ، ووتیان : ئەی ﷴ وەرە دەروە بۆ لمان کە پیغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان قسەی لە گەل کردن ، دواتر یەکیك لە ئەوان کە ناوی (عتارد کوری حاصب ) چەند دیرە شعریککی ووت : ئیتر شعیرە بە تواناکانی ئیسلام وەلامیان دانەوە یەکیك لەوانە (حسان کوری سابت ) ، لە پاشاندا ئەو دە (١٠) پیاوە موسلمان بوون ، پیغەمبەری خوا ﷺ پیاوەکان ئافرەتەکان و مندالە کانی پیدانەوە ..!!

### ٢-سریەی (قطبة ی کوری عامر ) :

بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم سریەیە رەوانەکرد بۆ لای هۆزی (خثعم ) ،لە ناوچەی (تبالە )لە نزیك (تربە ) ئەم سەریەی بەریکەوت لە مانگی (صفر) سالی (٩) کۆچی دا ، (قطبة ی کوری عامر ) لە گەل (٢٠) پیاو دەرچوو (١٠)ووشتر و بە نۆرە سواری پشتی ووشترە کان دە بوو ، بەلی هەلمەتیان بردە سەر هۆزی (خثعم) شەریکی قورەس لە نیوانیاندا روویدا ، تا ئەوە بوو کوژراو بریندا لە نیوان هەر دوو لا هەبوو ،هەروەها (قطبة ی کوری عامر ) خۆی یەکیك بوو لە شەهیدە کانی ئەم سریەیە خۆشی ئەمیری سریە کەبوو ، هەروەها غنیمەتیکی زۆریان دەست کەوت لە مەرو مالات و ووشترە کانیان ،هینایانەوە بۆ مەدینە.

ئ

### ٣-سريەی ( ضحاك كوری سفيان ) :

پيغەمبەری خوا ﷺ ئەم سريەيە نارد بۆلای هۆزی (كيلاب ) ئەم سريەيە لە مانگی رەبيعی يەكەمی سالی ( ٩ ) كۆچی دا بوو ، بۆ ئەوەی ئەم هۆزە كە هۆزی ( كيلاب ) بوون بانگيان بكات بۆ ئيسلام بوون ، بەلام ئەم هۆزە بەتبەختە مليان نەداو ئينكاريان كرد و ئاينی ئيسلاميان رەت كردەوە ، شەور كوشتار لە نيوانياندا روويدا ، موسلمانان ئەوانيان راونان دواتر پياويكيان لی كوشتن .

### ٤-سريەی ( علقمە كوری مجززی مدلجی ):

پيغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ كەنارەكانی ( جدە ) ئەم سريە يە لە مانگی رەبيعی دووەم سالی ( ٩ ) كۆچی دا بە ( ٣٠٠ ) سوارەوە ، بەلی پيغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ كۆمەليك پياوی حەبەشی كە لە نزيك كەنارەكانی ( جدە ) كۆ بوو بوونەوە ، ئە كۆمەلە پياوە ريگری جەتەگەری دزيان دە كرد ،دژ بە خەلكی شاری مككە و دەور بەری ، ( علقمە ) بۆ يان چوو تاگەيشتنە ( جزيرە ) كە حەبەشيەكان هەوالی هاتنی سريەی ( علقمە ) يان بيست يەك سەر رايان كرد بۆ دەرچوون .

### ٥-سريەی ( علی كوری ابی تاليب ) :

بەلی پيغەمبەری خوا ﷺ ( علی كوری ابی تاليب ) ی كە نازناوی شيری خوايە وە خليفەی موسلمانانيش بوو –خوا لی رازی بيت – ناردی بۆ شكاندنی بتە كانی هۆزی ( طیء ) كە ناوی ( قلس ) بوو ، ئەم هەلمەتە لە مانگی رەبيعی يەكەمی سالی ( ٩ ) كۆچی بوو ،بەلی پيغەمبەری خوا ﷺ بە ( ١٥٠ ) كە سەوە ناردی ،وە بە سواری ( ١٠٠ ) ووشتر ،وە ( ٥٠ ) ئەسپ ، ئالا يەكی سپی ئالايەكی رەش پی بوو ، لە گەل بەرە بەيان دای بەسەرياندا ،وە مال ساما نی ( عدی كوری حاتم ) وە دەست كەوتيكی زۆريان بەدەست كەوت ، ( عدی كوری حاتم ) رای كرد بەرەو وەلاتی شام ، موسلمانە كان غنيمەتەكانيا لە ريگادا دابەش كرد ، پينج يەكی بۆ پيغەمبەری خوا ﷺ هاتنەو ە شاری بۆ شاری مەدينە ،بەلام لە ناو شاری مەدينە ( عدی كوری حاتم ) خوشكيكی هەبوو ، پيرو بەسالاچوو بوو ،ئەم پيرە ژنە دوای لە پيغەمبەری خوا ﷺ كرد ،كەسم ديار نيە هەواليك نازانم ، منيش پيرە ژنيكی بە تەمەنم ناتوانم خزمەتی كەس بكەم ..؟! رزگارم بكە ،خوای گەورە رزگارت بكات ..!! پيغەمبەری خوا فەرمووی : كەسەكانت كين ..؟! ئەويش ووتی ( عدی كوری حاتم ) پيغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :ئەو كەسە ی لە خوداو پيغەمبەرەكەی هەلهاتووە ..؟! ووتی : بەلی .

پاشان پيرە نەكە رۆيشت بۆ سبەينی هاتووە ،هەمان شتی دووبارە كردەوە ..؟! پيغەمبەری خوا ﷺ هەمان وە لامی دايە وە ..؟! سی يە رۆيش پيغەمبەری خوا ﷺ ئازادی كرد ،لە تەنيشت ژنە كە پياويك وەستا بوو

ی
ووتی داوای ووشتری لی بکه ..!! که ( علی کوری ابی تالیب ) بوو ، ژنه کەش دواى لی کرد ، پیغەمبەری خوا فەرمووی : بی دەنەوە ..!! لەدوای دا خوشکه کەی ( عدی کوری حاتم ) گەرایەوە لای برا که له وەلاتی شام ،ئەویش هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ براکەی گیرایەوە که پیغەمبەری خوا ﷺ جەند میهرەبان چاکه کارە جەند چاکەی له گه ل دا کردووە ..!! هەروەها ( عدی کوری حاتم ) دە ربارەی پیغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری له خوشکه بەسالاچووە کەی کرد ..؟! ئەویش ووتی : سویند بەخوا کاریکی له گەل دا کردم باوکیشت بوایه شتی وای نەدەکرد ..!! ئینجا براکەم تۆش به خۆشی خۆت بیت یان به ناحەزی دل برۆ بۆلای پیغەمبەری خوا ﷺ ..!! ( عدی ) بەبی یەك و دوو به پەله و بی هیچ شتیك یەك سەر چووە بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ..!! بەلی ( عدی ) یان هینا بۆ ماله کەی لەبەر دەمی پیغەمبەری خوا ﷺ دانیشت ، پیغەمبەری خوا ﷺ سوپاس و وصفی سەنای خوای گەورەی کرد ، پاشان فەرمووی : چی پالی بیوە نایت که هەل بیت راکەیت ..؟! هەروەها پیغەمبەری خوا فەرمووی : لەوە را دەکەیت یان هەل دیت بەلی . ( لاإله إلا الله )..!! ئەویش ووتی : نەخیر ، پیغەمبەری خوا کەمیك قسه ی کرد پاشان فەرمووی : لەوە رادەکەیت که دە ووتریت : ( الله أكبر ) ..؟! هەروەها پیغەمبەری خوا فەرمووی : ئایا تۆ خوای کی تر جگه له خوا ئەناسیت ..؟! ئەویش ووتی : نەخیر . پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا هیچ هیزیك هەیه جگه له خوا بەهیز تربیت یان گەورە تر بیت ..؟! ئەویش ووتی : نەخیر . هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : جووله که تورەیی خوای گەورە یان بەسەرەوەیه..!!، وە گاورە کانیش گومران ..!!هەروەها ( عدی ) ووتی : من موسلمانیکی ( حەنیفم ) کاتیك ئەم ووتەیەی ووت : پیغەمبەری خوا ﷺ رووی گەشایەوە ، وە فەرمانی دا لای پیاویکی ئەنصاری دابەزیت ..!! ئینجا رۆژانه بەیانیان ئیواران دە هاته خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ. **زاد المعاد ( ٢/٢٠٥ )** . له ریوایەتیکی ( احمد ) دا هاتووە ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی ( عدی ) موسلمان به سەلامەت دەبیت ..؟! ئەویش ووتی: ئەی پیغەمبەری خوا من شوینکەوتووی تۆم ئاییم ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی ( عدی ) من له تۆ باشتر له ئاینه کەت شارەزایك هە یه ..!! ئەلی منیش ووتم : تۆ له من شارەزاتری له ئاینەکەمدا ..؟! فەرمووی : بەلی. هەروەها فەمووی : ئەوە له ئایینه کەتدا حەلال نیه ،که پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی فەرموو : منیش چارەم نەما ملم کەچ کرد بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ. **مسند الامام احمد** .

# غەزای ( تەبووك ) و رووداوە كانی

بەلی بی گومان ئەم غەزایە ناونراوە ( تەبووك ) كە شوینكە لە سەر ریگای نیوان شاری مەدینە شاری دیمەشقە ی ئیستایە كە پیشتر پیان دووت وەلاتی شام ،كە دە كەویتە نیوان ( وادی القری ) و وەلاتی شام ،وە كەتۆتە باشووری رۆژهەلاتی ( ئیلە ) كە بەندەریكە لە سەر كەنداوی ( عەقبە ) ئەو شوینەی ( تبووك ) كە كانی و ئاو دراخوەای زۆر بوو ، هەروەها ئەم شوینە پی شی دە ووتریت : ( الاصحاب ئكە ) كە وشینی پیغەمبەری ( علیە السلام ) شعیب بوو ، ئیستاش دەكەویتە ناو وەلاتی سعودیا ( ٧٦٠ ) كلیلۆ مەتر لە شاری مەدینە دوورە ..!! الرسول القائد ( ٣٩٥ ) ،سیرە النبویە لابن شیبە ( ( ٤٩٥/٢ )

بەلی غەزای تبووك لە مانگی رەجەبی سالی ( ٩ ) كۆچی دا رووی داوە ،دوای گەرانەوە سوپای ئیسلام لە گەمارۆدانی شاری ( طائیف ) سیرە نووسان ئەلین دوای شەش مانگ ئەم غەزایە رووی داوە ..!!الرحیق المختوم ( ٤٤٣ ) ،سیر النبویە للصلابی ( ٨٠٨ ) ،سیر النبویە لابی شیبە ( ٤٩٥/٢ ).

لە ( معاذ كوری جبل ) دە گیریتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( ستأتون غداإن شاء الله عین تبوك ، وإنكم لن تأتوها حتی یضحی النهار ،فمن جاء ها منكم فلا یمس من مئها شیئا حتی آتی )).

صحیح مسلم برقم ( ٧٠٦ ) ص ( ١٧٨٤/٤ ) .

بەلی ئەم غەزایە ناویكی تریشی هەیە لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە ،ناوی ( العسرە ) كە خوای گەورە دەفەرمووی : ﴿لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ التوبە ١١٧. لە صحیح البخاری دا هاتووە كە ناوی ( العسرە ) بە بۆنەوەی ئەوە وە یە ، كە سوپای ئیسلام تووشی نارەحەتی و زەحمەتی و ناخۆشی زۆر هات لە ریگادا ، چونكە بەهۆی گەرمی كەش و هەواكە و ، دووری ریگا و ، هەروە ها كەمی ئازووقەی سوپاكە ،كە می سواری ،بە هۆی ئەوەی زۆر شتیان پی بوو ،وە پیداویستیە كانی مانەوەیان ،هەروەها كەمی ئاو خۆراك لە ریگادا ..!!لە گیرانەوەیەكی ( معمری كوری عیقل ) وە هاتووە لە فتح باری دەلیت :( ئیمە لە ریگا دا بووین ،بە وەلاغی كەم و گەرمایی زۆر تینویەتی هیزی لی برییووین ، لە تاو تینوویەتی دا ووشترمان سەر دەبری ،ئاوی ناو وورگی ووشترە سەر براوەكەمان دە خواردەوە ).فتح الباری ( ١٧٤/٩ ) .

لە ( ابن ئیسحاق ) وە - خوا لی رازی بیت - دە گیرتەوە دەلیت : ( كاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە شاری ( طایف ) گە رایەوە مانگی ( ذوالحجة )و ( رجب ) لەشاری مەدینەدا بەسەر برد ، دواتر فەرمانیدا بەخەلكان بۆ غەزای رۆمەكان ئامادە بن ..!!

ئ

له ( ابن حميد )وه – خوا لی رازی بیت – دەڵیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بۆ غەزای رۆمەکان خۆیان ئامادە بکەن ، لەبەر ئەوەی وەرزی گەرما بوو ووشکە سالی بوو ، میوە کان گەییو و سیبەر خۆ شەویست بوو ، خەڵکان مانەوە لە ژیر سیبەری درەخت و میوە و دراخورماکان ،کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ نیازی جەنگی دە کرد ، ئاشکرای نەدە کرد و نەی دەهینایە سەر زمانی ،ئاماژەی بە شوینیکی مەبەست دەدا ، جگە لەغەزای تبووك ، چونکە ئەم غەزایە ریگایەکی دوور بوو ، بەشیوە یەکی ئاشکرا لە لای خەڵکی باسی دە کرد ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەرەستە و پیداویستی سەفر ئامادە بکەن ، خەڵکان خۆیانئامادە کردوو ،بەلام لە رۆیشتن بیزرا بوون ،چونکە شەر و جەنگ کردن لە گەل رۆمەکان زۆر دژوار بوو ،وە خەلك بە دژواری دەیان زانی ،لەبەر دووری ریگا و ، زۆری سوپای رۆمەکان ،زۆری کەرسەی جەنگی نوی رۆمەکان ، بەرانبەر بە سوپا ی ئیسلام ..!!هەر سە بارەت بەم گەرمایەی غەزای تبووك ، کەسانیك نارەزایان دەر بری دوو رووە کان قەسەی نەشیاویان دە خستە سەر زمانیان ، ئیتر ئەوە بوو خوای گەورە ئە ئایەتەی دابەزاند کە دەیان ووت زۆر گەرمایە خۆیان دە دزیەوە لە غەزای تبووك ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرمووی : ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالُوا لَا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ التوبە ٨١. واتا : دوو رووە کان ئەوانەی کە کە نەهاتن بۆ غەزا بەجی هیلران لە ناو شاری مەدینە دا دل خۆش و شادومان بوون بە دانشتنیان ،وە دوا کەو تنیان لە پیغەمبەری خوا ﷺ نە چوونیان بۆ غەزا ، حەزیان نەکرد جیهاد و تی کۆشان بە خۆیان و مالیان لە پیناوی خودا بکەن و بە ئیماندرانیان ووت : لەم گەرمایەدا دەر مەچن بۆ جیهاد ، ئەی ﷺ پیان بلی : ئاگری دۆزەخ زۆر بەتینترە و بە هیزترە لە گەرمیدا ئەگەر تی بکەن و بیر هۆشیان بخەن گەر ..!!

ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر هەو تی کۆشانی کرد بۆ ئەم غەزایە فەرمانیدا بە کەسانی سامان دارو دەلە مەندو زەنگین ئەوانەی توانای بەهیزی مال سامانیان هەیە لە کۆچ کەران و ئەنصارە کان خەلکانیك کە تازە بیوونە موسلمان لە هەمان کاتدا مال سامانیان هەبوو ، چونکە خۆ بەخش کردن بۆ جیهاد تی کۆشان بە مال سامان خۆبەخش کردن لە پیناوی خوای گەورە پاداشتیکی گەورە ی خوا ی گەورەیە ،هەروەکا دەستیە ك لە ئیماندارن ئەوانەی تەنها بۆ رەزامەندی خوای گەورە بەخۆیان مال و سامانیان خۆیان بە خت دەکەن لەوان ( عوسمانی کوری عفان ) کە ئە و هاوەلە بەریزە ی پیغەمبەری خوا ﷺ وە خلیفەی موسلمانان لەدوای عمری کوری خەتاب دا ، ئەو پیاوە زۆر ترین مال و سامانی خۆی بەخشی بۆ غەزای تبووك ..!!

ئ

هەروەها ئەگێرنەوە دەلێن : ( ٧ ) کەس لە ئەنصارەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای وەلاغ یان ووشتریان لی کرد ، چونکە هیچیان نەبوو سواری بن بۆ ریگا لەم غەزایە دا ، ( یامین کوری عومەیری نەزری ) ئەو پیاوە ( باوکی لەیلی عبدالرحمان کوری کەعب ) و ( عبدالله ی کوری موغەفەلی ) بینی هەردووکیان دە گریان ..!! ئەویش ووتی : بۆ چی دە گرین ..؟! ئەوانیش ووتیان : چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تاکو ووشتر یان وەلاغیکمان پیبدات ،بەلام نەییوو ..!! چونکە هیچ ئاژە لیکیان نیە بۆ سواری کە برۆ بۆ ئەم غەزایە ..!! ( یامین ) ووشتریك و بریك خورمای پیدان و لە گەل پێغەمبەری خوا ﷺ بەریکەوتن .

کاتیك پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادە کرد بۆ غەزای تبووك بەریکەوتن ،دەستەیەك لەدووروەکان مانەوە سەرۆکی هەموو دووروەکان کە ناوی ( عبدالله کوری ئوبەیی کوریی سەلول ) لەگەل کۆمەلیك لە هاو فکرە کانی ( عبدالله کوری ئوبەیی کوری سەلول ) کە ئەمانە بوون : ( عبداللەی کوری نەبتەل ) و ( رووفاعەی کوری زید کوری تابوو ت ) ئەمانە لەدوژمنە دوو رووە کانی نیوە خۆی سوپای ئیسلام بوون ،

هەروەك ( خوای گەورە ) دەر بارەی دوو رووە کان ئەم ئایەتەی دا بەزاند دەفەرمووی : ﴿لَقَدِ ابْتَغَوُا الْفِتْنَةَ مِنْ قَبْلُ وَقَلَّبُوا لَكَ الْأُمُورَ حَتَّى جَاءَ الْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَارِهُونَ﴾التوبە ٤٨.واتا: سویند بەخوا ئەو دوو روانە پیشتریش هەولیان داوە فیتنە و ئاشووب لەنیوان ئیمانداران بەر پا بکەن و چەندەها فەرمان و نەخشەیان گۆری بۆ ئەوەی فیلت لی بکەن وە ووره بروخینن ..!! هەتا خوای گەورە کردی حەق هات و سەرکەوت و دینی خوا پایەدار بوو ، لە کاتیکدا ئەوان هەمیشە سەغلەتن بە سەر بەرزی ئیسلام و پایەداری ئیسلام ..!!

هەروەها چەند کەسیکی تریش لە موسلمانان دوا کەوتن لەم غەزایە دا ، کە ئەمانە بوو ن : ( کەعبی کوری مالك سولەمی ) شاعیری بوو ، وە ( موراره کوری رەبیع ) وە ( هیلال کوری ئومەییە کوری وافیقی ) وە ( باوکی خەیسەمە نەوەی سالم ) بەلی سوپای ئیسلام بەریکەوت ئەمانە بەجی مان ..!!

بەلی کاتیك سوپای ئیسلام بەریکەوت بە سەرۆکایەتی پیشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیدا بە ( علی کوری ابی تالیب ) لە جیگای خۆی بەجی بمینی لە شاری مەدینە ئەو نیتە ئەم غەزایە چونکە کارو باری موسلمانانی لە شاری مەدینە سپاردەی ( علی ) کرد لە جیگای خۆی دا ،هەروەها کەسیکی تریش لە دوای ( علی ) دانە بە جیگری ئەویش ( صباع کوری عەرفەتی غەفاری )

ئ

بەلی کاتێك دوو ڕووەکان ئەم هەواڵەیان بیست بەتایبەتی ( عبداللە کوری ئوبەیی کوری سەلول ) پرو پاگەندەی بلاو کردەوە لە ناو خەلکدا ، بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەزبە هاوریەتی ( علی کوری ابی تالیب ) ناکات بۆیە لەگەل لە خۆی دا نەی بردووە بۆ غەزای تبووك ،کەچی ئەوەندە نەفامی نەزانن کە ( علی کوری ابی تالیب ) دووەم کەس دوای خەدیجە باوەری هیناوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەها ئەوەندە هاوری بووە هەمووکات لە گەلی دا بووە لە مندالی دا تا موسلمان بوونیشی ، هەروەها ئامۆزای پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کوری مامی پێغەمبەرە ﷺ وە هاوسەری کچەکەیەتی کە ( فاطیمە ) یە جا لەوەش سەیر تر یەکێك کە لە ( ١٠ ) کەسەی کە مووژدەی بە هەشتی پیدراوە ، هەروەها ئەهلی غەزای بدرو ئوحود و خەندە ق و یان ئەحزاب ،مووتە و ،حونین بووە ..!! جا ناحەزانی ئیسلام دینی خوا بە بەردەوام پرۆ پاگەندەی لەو جۆرە بلاو دە کەنەوە کە بەهیچ شیوەیە ك راست نیە و هیچ بنەمایەکی نیە تەنها خۆ ریسوا کردنیان نەبێت دژی ئیسلام ..!!بەلی کاتێك ئەم هەواڵە بلاو بوویەوە لە لایەن دوو ڕووەکانەوە کە بەر گوێی ( علی کوری ابی تالیب ) کەوت ، یەك سەر شاری مەدینەی بەجی هیشت بەریکەوت بۆ لای پێغەمبەری خوا لە ریگا دا لە شوینێك پی دەووتریت : ( جورفە ) بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی پی ووت : وا گومان دەکەن خەلك کە هاوریەتی منت پی خۆش نیە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : درۆیان کرد ،تۆم بۆ پاراستنی خەلکەکەو مال خیزانەکەم بە جیهیشت ، بگەریرەوە ئاگان لە خەلکە کەو منالە کان بێت ، مە گەر حەز ناکەیت بۆ من هاوشیوەی هارون بۆ موسا بێت بەم جیاوازیە دوای من پێغەمبەرایەتی نامینیت ..!! بەلی ( علی ) گەرایەوە بۆ شاری مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ بەردوام بوو لە رۆیشتن بۆ تبووك ..!!بەلی کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ( حوجر ) لەویدا دابەزی ، خەلکەکەی لە چالاوە کەی هەلگرت ، کاتێك شەو داهان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە ئاوە مەخۆنەوە وە دەست نویژ مەگرن ..!! ئەگەر هەویرتان کردووە بیدەن بە ووشترە کان و خۆتان لی مەخۆن ، وە کەس لە ئیوە ئەمرۆ لە ناو خیوتگەی سەربازی نەر واتە دەروە ..!! بەلی خەلکان فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ یان جی بەجی کرد بەلام جگە لە دوو کەس نەبێت ..!! ئەویش ئەو دووکەسە لە نەوەی ( ساعیدە ) بوون ، یەکێکیان بۆ دەست بە ئاو گەیاندن رۆیشتە دەروەوە ..!! ئەوەی تریان ووشتریکی لی وون ببوو بەدوای دە گەرا ..!! ئەوەی بۆ دەست بە ئاو گەیاند رۆیشت نەیتوانی میز بکات ..!! ئەوەی بەدوای ووشترەکەی دا دە گرا ، با ئەوی بۆ کویستانی ( طي ) برد ..!! کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەم دوو کەسە دا ئاگادار کرایەوە ، فەرمووی : ئەی من پیم نەوتن بە تنها نەچنە دەروەوە ..؟!ئەوەی نەیتوانی میز بکان پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کرد چاك بوویەوە ..!! ئەوەی بەدوای ووشترە کەی خۆی دا دەگرا بۆ کویستانی ( طي ) چوو خەلکانی ( طي ) هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هاوەلە یان بۆ گەراندەوە ..!!

ئ

دە گیرنەوە هەر لەم ناوچەیە دا ( حوجر ) خەلکان هاتنە لای پیغەمبەری خوا ﷺ کە ئاویان نەماوە پیویستیان زۆر بە ئاوە ،ئیتر پیغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد و دەستی بەرز کردە ئەوە بوو ( خوای گەورە ) هەوریکی نارد باران باری خەلکەی تیر بوون لە ئاو پیداویستیەکانیا لە ئاو پر کرد ..!! بەلام لە ریگا دا خەلکانی بەجی دە مان نەیان دەتوانی بەریگادا برۆن یان خۆیان دەشاردەوەو نەدەرۆیشتن بەریگا دا ئەم هەوالەیان گەیاندە پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی: کارتنان پی نەبیت ، ئەگەر خیری هەبیت ، ئاوا پیوەستی ئیوە دەبیت ، ئەگەر جیاوازی هەبیت ،ئەوا خوا ئیوەی ئاسوودە کردووە ..!! بەلام دووروو ئەوانی ریکار خۆیان دە دەخست بە بەردەوام تانە و تەشەنەیان دە کرد لە پیغەمبەری خوا ﷺ هاوەلەکانی ، ئەوە بوو لە ( حوجر ) ووشترە کەی پیغەمبەری خوا ﷺ وونبوو ، بۆی دە گران نەیان دە دۆزیەوە یەکیك لە دووروو کان بەوناوی ( زیدی کوری ئەسیبی نەوەی قینقاع ) ووتی : محمد ﷺ دەلیت هەوالە کان لە ئاسمانەوە بۆ دیت ، بولام نازانیت ناتوانیت ووشترکەی لە کویە ..!؟ ( عمارە ی کوری حەزم ) ئەم هەوالەی بە پیغەمبەری خوا ﷺ راگەیاند ..!! بۆ پیغەمبەری خوای ﷺ گیرایەوە ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سویند بەخوا تەنها شتیك دەزانم کە ( خوای گەورە ) پیم دەلیت :ئیستا ووشترەکەی نیشانداوم لە فلان دۆل دایە جلەوەکەی وا لەداریکە گیری خوار دووە ، برۆن بیهینن ووشترە کەیان هینا بۆی ..!! هەروەها یەکیکی تر لە دوو رووە کان لە هەموو شوینك بەدوای پیغەمبەری خوا ﷺ وە بوو تەهابوو بیانوو گرتن پروو پاگەندەی درۆ ، لە کەسەیان پرسی : کاتیك لە ناوچەی ( حوجر ) ئاو نەبوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ پاریەوە لە خوای گەورە ، باران بارین روویدا ، وە بەو کەسمان ووت ئیستا تۆ چی دەلیت : ئەویش ووتی : ئەمە تەنها پارچە هەوریکە باران باری و لیرەوە تی پەری ..!! ئە گیرنەوە دەلین : لەریگادا ( ابو ذرالغفاري ) بەجی ما نەی دەتوانی بەریگادا بڕوات ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەکەی دووبارە کردوە ووتی ئەگەر خیر هەبیت ، ئەوا پیوەست دەبیت ، وە ئەگەر جیاواز بیت ، ئەوا خوای گەورە ئیوە لەو زیاتر ئاسوودە کردووە ..!! ئەلین : کاتیك ( ابو ذرالغفاري ) ئەم فەموودەی پیغەمبەری بیست ، وە لاوازی ووشتەکەی بینی ، کەل وپەلەکانی خۆی لە سەر پشتی ووشترە کەی خۆی هینایەخوارەوە ،لە سەر پشتی خۆی دانا ، وە یەکیك لە موسلمانەکان ( ابو ذرالغفاري ) لەدواوە بینی ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ یەکیك لە ریگادا وا دیت ..!؟ پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : چەند باش دە بوو ئەگەر ( ابو ذرالغفاري ) بیت ..!! کاتیك سەیریان کرد ووتیان : سویند بەخوا ( ابو ذرالغفاري )..!؟ هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خوای گەورە لە ( ابو ذرالغفاري ) خۆش بیت ..!! چونکە بەتەنها ریگا دەبیت ..!! بە تەنها دەمریت ..!! بە تەنها حەشر دە کریت ..!!

ی
دە گێرنەوە دەڵێن : چەند کەسێك لە دوو روو و ریا کارە کان لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دا بوون ، لەوانە : ( ودیعەی کوری سابت ) و ( مەخشی کوری عمیر ) ئەو دووانە یەکێکیان بەوە ی تریانی ووت : وا گومان دە کەن جەنگ لە گەڵ نەوەی ( ئەسفەر ) بکە ن هاوشێوەی شەرە کانی دیکەیە ..؟! سوێند بخوا بەیانی دەبینیم بە تەنافەکانەوە بەستراون ..!! ئەم ووتانەیان بۆ ترساندی موسلمانان بوو ..!! بەلام ئەوەی تریان کە ناوی ( مەخشی کوری عمیر ) بوو ووتی : سوێند بە خوا حەز دەکەم یەکی ( ١٠٠ ) قامچیمان لێبدەن بەلام بۆ ئەو ووتانەی تۆ ئایەتی قورئانی پیرۆز رەوانە نەکرێت ..!! هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خوای گەورە ئاگادار کرایەوە ، بە هاوەڵێکی خۆی فەرموو کە ناوی ( عمارەی کوری یاسر ) بوو فەرمووی : برۆ بۆ لای ئەو خەڵکانەی قسەی نارەوایان هێناوە تە سەر زمانیان ، بپرسە بزانە چیان ووتووە ..؟! ئەگەر حاشا یان کرد .بلی .ئەمە و ئەمەتان باس کردووە ، چونکە قسە کانی ئەوانی بۆ باس کرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەلی کاتێك ( عمارەی کوری یاسر ) رۆیشت لایان ، قسەی لە گەڵ کردن ،ئەوانیش بۆ دوای لی بردن هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە ( ویعەب کوری سابت ) لە و کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای ووشترەکەی خۆی وەستابوو ،ئەوویش ووتی : ئی پێغەمبەری خوا ﷺ قەسەمان کرد بۆ ئەوەی کات بەسەر بەرین ..!! دواتر ( خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند دەفەرمووی : ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ﴾التوبە ٦٥. واتا : کاتێك تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گوفتاری نابەجێیان ئاگادر دەبیت و لێیان دەپرسیت ئەوە خەریکی چین ..؟! ئەوە بی گومان دەڵێن بەراستی ئێمە تەنها دەمەتەقی و گەمە و گاڵتە مان دەکرد ، پێیان بلی : ئایا ئێوە خواو یایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتە تان دەکرد ..؟! بەلی کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە تبووك ( یەحیای کوری رووبە ) وە فەرمانرەوایی ( ئیلە ) هاتی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەست ،هەروەها خەڵکانی ( جەبارء ) و ( ئەزرەحیش ) بەهەمان شێوە پەیمانیان بەست بۆ هەر کامیان پەیمانی نووسی ..!!

( مێژووی طبري بە کوردی ) بەرگی سێیەم و بەرگی چوارەم لاپەرە١٢١٢-١٢٢٠.

ێ

**هۆکارەکانی غەزای تبووك :**

**١-بەبێ هیچ هۆیەك پاشای ناوچەی (بلقاء) کەناوی (شەرحەبیل کوری عمر غەسانی ) بوو کە سەر بە قەیصەری رۆمەکان بوو ، ئەوە بوو یەکیك لە هاوەلە کانی پیغەمبەری خوای ﷺ شەهید کرد کەناوی ( حاریسی کوری عومەیری ئەزدیی ) بەلی (حاریس ) نیردراوی پیغەمبەری خوا ﷺ بوو بۆلای سەرۆکی (بوصرا ) کە بانگب بۆ موسلمان بوون ئەکرد ، بۆ تۆلە سەندنەوە ئەم شەهیدە غەزای مۆتە بەر پاکرا بەلام سوپای ئیسلام زۆر بچووك بوو لە چاو سوپای رۆمەکان دا ..!!**

**٢-ئەوە بوو سالیك بەسەر غەزای موتە بەرسەر نەچوو ، قەیصەر لە رۆمان لە عەرەبی غەسان سوپایەکی گەورەی پیك هینا ،تاکو کوشتاری خویناوی دژی موسلمانەکان بە پا بکات ..!!**

**٣-هەوال گەیشتە پیغەمبەری خوا ﷺ کە رۆمەکان سوپایەکی گەورە یان لە وەلاتی شام ئامادە کردووە قەیصەری رۆم موچەی سالیکی بەسەر سوپا دابەش کردووە ..!! لە هۆزە عەرەبەکانی شام هاوکاری رۆمەکان دەکەن ،لە هۆزی (لخم ) و (جوزام ) و (عامیلە ) و (غسان ) خەلکیکی زۆری ئامادە کردووە سوپاکەیان گەیشتە (البلقاء ) جا پیغەمبەری خوا ﷺ وای بەچاك زانی سوپای ئیسلام لە پیشدا هەلمەت بەریتە سەر دوژمن ..!!**

**٤-هەروەها سرینەوەی ئاسەوارە کانی جەنگی موتە یەکیك بوو لەهۆیانەی جەنگی تبووك ، چونکە هەندیك دەیان ووت موسلمانەکان شکاون لە جەنگی موتە بەرانبەر بەرۆمەکان ..!!**

**٥-بەهیز کردنی ووەری ئەو هۆزە عەرەبانەی ناوچەکە کە دل یان بۆ ئیسلام لیدەدا بەلام نەدە ویران لە بەر فەرمانرەوایەکانی رۆمەکان ،ئەمەش هۆیەك بوو بۆ ئەوەی ئەم جەنگە بەر پا بیت ..!!**

**٦-هەروەها (ابن کثیر ) وای بۆ ئەچیت ئەم غەزایە لە گەل قوناغی جیهادا گونجاوە بە پی ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوای گەورە کە دەفەرموویت :ل**﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾**التوبە ١٢٣.**

**٧- بۆ ترساندنی هیزی رۆمەکان چونکە وا پیویست بوو ئەوان بە سوپای زۆرەی خیانەوە ترسیان لە سوپای ئیسلامدا بنیشت ، سوپای ئیسلام بە هیزە کەمە خۆیەوە بەرنگاریان ببیتەوە ،چونگە جەنگ بە زۆر کەم ژمارەی سوپاوە نیە ، بولکو بە دانای حیکمەتی پیشەوای سوپاکەوەیە بەلام پیشەواسوپای ئیسلام ئەوەیە کە پیشەوایی هەموو مرۆڤایەتیە ، هەروەهاش بووە ترس توقاندن کەوتە دلی رۆمەکان ..!!**

ئ

## ئەو کەسانەی لە غەزای تبووك دا مال و سامانیان بەخشی لە پیناوی خوا دا

بەلی بی گومان پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە ووردی سەرتجی رووداوەکانی ناوچەکەی دەدا ، هەر بۆیە ئەی زانی پیویستە عەرەبەکانی ژیردەست هەلاتی رۆمەکان ، رۆمەکان دەرسیك بدرین بۆ ئەوەی نەویرن چاو ببرنە ناوچەی حیجاز ،وە لە دوورگەی عەرەبی نزیك نەبنەوە ، چونکە ئەگەر رۆمەکان تەماع بکەن شاری مەدینە ئەوا وورەی موسلمانەکان لە ناوچەکەدا دەرووخیت ،هەروەها وورەی جوولە کە مونافیقە کان بەرز دە بیتەوە ،ئەو کات رەنجی (٢٠) سالی خزمەتی ئیسلام لە ناو چەکەدا بە خەسار دەچیت ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا بە پیویستی دەزانی هەلمەتیکی فەراون بەریتە سەر رۆمەکان ، پیش ئەوەی ئەوان هیرش دەست پی بکەن بۆ ناوچەی حیجاز نیمە دوورگەی عەرەبی ،بی گومان لەم غەزایەدا پیغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشکرا جاری دا بە ناو شاری مەدینە شاری مککە و ناو چەکە دا ، کە پیشتر بۆ هەر غەزایەك دە چوو ئاوا بە ئاشکرا جاری نەدەدا ، بەلی جاری دا بە ناو خەلکە دا بۆ جیهاد کردن ، بی گومان جیهاد کردنیش پیویستی بە هیزو تواناو مال و سامان هەیە بۆ ئەوەی سوپایەکی بتەوە بەهیز پیك بهینی، بۆ ئەوەی بەو پەری متمانەوە دامەزراوی و هیزو تواناوە لەرووی توانی سەربازی توانای ئابووری سوپاو پیداویستی کەرەستەی جەنگی وەك شمشیر و رم مەنجەنیق قەلغان ، هەروەها خوراك و پیداویستی ریگا و ئەو ئاژەلانەی کە پیداویستیەکانیان پی دا هەلەدگرن وەك ووشترو ئەسپ و هیستر ، بی گومان ئەمانەش پیویستی بە مال و سامانی زۆر هەیە کە تیدا پیشکەش بە سوپا بکریت بۆ ئەوەی بە بی کەم و کوری بەریکەویت بۆ بەرەکانی جەنگی رۆمەکان ،بەلی لەم غەزایە دا بەخشیش و خۆ بەخت کردن زۆر بوو لە ناو هاوە لاندا کە لە پیناوی خوا بە سەر و مال سمانیان خۆیان بەخت دە کرد لە پیناوی خوا دا ،چونکە جیهاد خۆ بەخت کردنە بەسەر مال و سامان ، لە پیناوی سەرکەوتنی ئاینی خوای گەورە دا ، هەر بۆ یە موسلمانا دەستیان دایە بەخشین لە پیناوی خوا دا ، یەکیك لەم هاوەلانە (عوسمانی کوری عفان ) – خوا لی رازی بیت کە بووە سەر قافلەی موسلمانان لە بەخشندەیی ، ئەوە تا (عبدالرحمانی کوری خوباب ) – خوا لی رازی بیت – بۆمان دە گیرتەوە باسی بەخشینی (عوسمان ) دە کات و ئەلی : لە خزمەتی پیغەمبەری خوا ﷺ ئامادە بووم کە موسلمانانی بۆ کۆمەکی کردنی (العسره ) ئەوە بوو (عوسمان ) هەستا ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ (١٠٠) ووشتر بە هەموو تفاقیکەوە لەسەر منە لە پیناوی خوا دا ،دواتی ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ (٢٠٠) ووشتر بە هەموو تفاقیکەوە لەسەر منە لە پیناوی خوا دا ، پاشان ووتی : (٣٠٠) ووشتر لەسەر منە بەهەموو تفاقیکەوە لە پیناوی خوا دا ،منیش چاوم لی بوو پیغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر فەرمووی : (( ما علی عثمان ما عمل بعد هذه ،ما علی عثمان ما عمل بعد هذه )).

واتە :دوای ئەم کارەی عوسمان هەرچی بکات هیچی لەسەر نابیت .!!

ئ

هەروەها لە (عبدالرحمانی کوری سمرەوە) – خوا لی رازی بیت – ئەگیرتەوە دەلیت : ((عوسمان کوری عفان ، (١٠٠٠) هەزار دینار ،یان (١٠٠٠) مسقال زیری کردە ناو کراسەکەی هینایە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمەش لە کاتیك بوو کە پیغەمبەری خوا ﷺ کۆمەکی بۆ سوپای ئیسلام کۆدەکردوە ، هەروەها ئەگیرنەوە دەلین : عوسمان کوری عفان (١٠٠٠٠) هەزار دیناری بەخشیوە بە سوپای ئیسلام لە جەنگی تبووك دا ،وە لەگەل (٦٠٠)ووشتر ،(١٠٠) ئەسپ بۆ سواری ، هەروەها (عبدالرحمن کوری عوف) یەکیکی تر بوو لە هاوەلان – خوالی رازی بیت – ئەویش (٤٠٠٠٠) هەزار دیناری بەخشیوە ، بی گومان (ابو بکر صدیق) – خوا لی رازی بیت - ئەویش هەموو سەروەت سامان و مالە کەی خۆی بەخشی لە پیناوی خوا دا ، بەلام (عمری کوری خەتاب) – خوا لی رازی بیت - نیوەی مال و سامانەکەی هینا بەخشی وای زانی پیشی (ابو بکر صدیق) دە کەویت ..!! هەروەها دەولەمەندە کان هەموو یان ئەهاتن لە پیناوی خوا دا مال سامانیان ئە بەخشی ، بەلام هەژارە کان ئەوەی لە توانایان دا هەبوو ئەیان هینا ، ئەوە بوو یەکیك لە هەژارە کان ناوی (ابو عقیل) بوو نیوەی صاع خورمای هینا ، بەلام تواجیان لیدە دا بەکەمی بەخشی شەکە ، ئەوە بوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ ئەوەی جیاوازی بەخشیش بە کەم و زۆری نیە لە نیوان موسلمانان وە لەنیوان دەولەمەندو هەژارە کان ، چونکە مونافیقە کان دە یان ووت : دەولەمەدە کان وەك (عوسمان) و(عبدالرحمان) ئەوە بۆ ریاییە ، وە گالتەشیان بە هەژارە کان دە کرد بەهۆی کەمی بەخشیشە کە یان ، هەر بۆیە ئەم ئایە تە دابەزی (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾التوبه ٧٩. واتە: ئەبی ئەو بی باوەرانە تانە و تەشەنەو تواج و پلار دە گرنە ئەو ئیماندارانەی کە زیادە بەخشن لە خیر کردندا بە ویستی خۆیان لە ریگەی خوا دا ، و گالتە و تواج پلاریش لە ئیماندارانی هەژار دە گرن کە بیجگە لەرەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەویت ، ئینجا هەر گالتەشیان پیدەکەن ،ئەوانە خوای گەورە تۆلە یان لی دەسینیت و ریسوایان دەکات ، بە هۆی ئەو گالتە کردنە یانەوە و سزای بە ئیش و ئازاریش بە شیانە ..!!

ئ

## هەلویستی موناڤیق و دوو رووەكان لە غەزای تبووك :

بەلی كاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ جاری دا بە ناوی سوپای ئیسلام و شاری مەدینە و شاری مككە و دەورو بەری بۆ ئەوەی خۆیان ئامادە بكەن بۆ روو بەروو بوونەوەی رۆمەكان لە تبووك دا ، ئەوە بوو موسلمانا بە پی توانا كۆمەكیان بۆ سوپای ئیسلام كۆكردەوە ،بەلام ئا لەم كاتە ناسكە دا موناڤیق دوو رووە كان دەستیادایە قەسەی نا بەجی و پرو پاگەندە بەناو موسلمانان دا بۆ ساردكردنەوەیان لە غەزای تبووك دا وە ئەوەشیان ووت : زۆر گەرمایە مەچن بۆ جەنگ و غەزای تبووك ، ئەوە بوو قورئانی پیرۆز دابەزی كە ( خوای گەورە ) دەفەرمووی : ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالُوا لَا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ (٨١) فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ التوبه ٨١-٨٢. بەلی لە كاتی خۆ ئامادەكردنی غەزای تبووك دا پیغەمبەری خوا ﷺ بە ( جدی كوری قیسی ) فەرموو : (( یا جد ! هل لك العام فی جلاد بنی الاصفر ..؟! )) واتە : ئەی جد پیت خۆشە ئەم سال لە گەل رۆم دا بەجەنگین ..؟! ئەویش ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ مۆلەتی من دەدەی كە تووشی فتنە نە بم ..؟! دە بە خوا خزمەكانم دەزانن هیچ پیاویك وەكو من شەیدای ئافرەت نەبووە ..!! جا من دەترسم ئەگەر ئافرەتانی رۆم ببینم ئارام نەگرم ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ پشتی لی هەل كرد و ماوەی دا كە فەرمووی (( قد أذنت لك )). ئەوە بوو دەر بارەی ئەو موناڤیق یان دوو رووە ئەم ئایەت هاتە خوارەوە ، كە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلَا تَفْتِنِّي أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾التوبە ٤٩. واتە :لەو دووروووە بی چاوە رووانە ، كە سانیك هەن كە دەلین : مۆلەتم بدەو تووشی گوناهو سەر پیچیم مە كە ..!! بە بیانووی ئەوەی كە لە غەزادا یە..!! لەوانیە تووشی گوناهو هەلە بیت ..!! لە حالیكدا ئەو جۆرە كەسانە باچاك بزانن كە لە گوناهو تاواندا رۆچوون ، بی گومان دۆزەخیش گەرمارۆی بی باوەرانی داوە و رزگار بوونیان ئە ستەمە ..!!

ێ
وه هەندێك لە مونافیق و دوو ڕووە كان بیانویان ئەگرتەوە بۆ ئەوەی مۆڵەتیان پی بدا بەشداری غەزای تبووك نەكەن ، پیغەمبەریش ماوەی ئەدان یان مۆڵەتی پی ئەدان ، ئەوە بوو قورئانی پیرۆز دابەزی گلەیی لە پیغەمبەری خوا ﷺ كرد كە بۆ چی ماوەی ئەم دوو ڕوو مونافیق درۆزنانەی ئەدا ، چونكە ئەوانە درۆزنن خۆ دە دزنەوە لە غەزای تبووك ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ﴾ التوبه٤٣. واتە: خوا لیت خۆش بیت ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ چی مۆڵە تتن یان ماوەت پیدان ..؟! نەدەبوایە ماوەییان بدەیتی ..!! هە تاكو بەچاكی بۆت دەربكەوت كی ڕاست دەكات و باوەر ی دامەزراوە ، كیش درۆزن دوو ڕوو و مونافیقە ..!!

بەلی هەوال بە پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشت كەوا دوو ڕووە كان وا لە مالی (سوەیلیمی یەهوودی ) كۆ بوونەوە خەلكی هاندەدان بۆ ئەوەی پاشگەز ببنەوە كە لە گەل سوپای ئیسلام بەری نەكەون ، خۆیان بدزنەوە بە بیانووی جۆراو جۆر پەشیمان ببنەوە خەلكە كەش بەشیمان كەنەوە ..!! بۆ ئەم مەبەست كە پیغەمبەری خوا ﷺ خیرا بە پەلە هاوەلانی نارد تاكوو ئەو نەخشەو پیلان تیك بشكینی ، ئەوە بوو كە سەرۆكی مونافیقەكان یان دوو ڕووە كان كە سەرداریان بوو ئەویش (عبدالله ی كوری ئوبەیی كوری سەلول ) بوو، ئەوە بوو قورئانی پیرۆز دەبارەی ئەو مونافیقە هاتە خوارەوە ، كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَاتَّبَعُوكَ وَلَكِنْ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنْفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾التوبه ٤٢. واتە:

ئەگەر غەزای تبووك دەستكەوتیكی ئاسان و نزیك بوایە ..؟! یا سەفەریكی كورت و مام ناوەند بایە ..؟! ئەوا ئەو دوو ڕوو و مونافیقانە شوینت دە كەوتن ئەی ﷺ ، بەلام ڕیگەی دوورو پر زەحمەت و مەینەت بۆ ئەوان زۆر قورسە ئەستەمە ،جا لەوە ودوا ئەوان دین سویند بەزاتی خوا دە خۆن و دەلین : ئەگەر ئەگەر بماتوانیایە ئەوا لە گەل ئیوەدا دەهاتین یان دەر دەچووین بۆ ئەم غەزایە ..!! ئەوانە بەو ڕفتارو درۆیانەیان ،خۆیان تیا دە بەن ، خوایش دەزانیت بەڕاستی ئەوانە درۆزنن ..!!

بەلی ئا بەم شیوەیە غەزای تبووك بووە هۆی جیابوونەوەی كۆمەلەی ئیمانداران و ،كۆمەلەی دوو ڕوو مونافیقە كان ..!!

السیره اللصلابی (٨١٣-٨١٥ ) السیر النبویه لابی شهبه (٢/٤٩٧-٤٩٨ ).

ێ

لە (عبدالله ی کوری عمر ) - خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە غەزای تبووك دا ، رۆژیك پیاویك لە موناڧیقەکان لە کۆریدا دانیشتبوو ،ووتی : کەسمان نەدیوە یان نەبینیوە وەك ئەم قورئان خوینانەمان ! لە هەموو کەس چلیس ترو ، زمان درۆزن ترو ، ترسنوۆك تر ..؟! پیاویك لە کۆرە کەدا بەم موناڧیقە ی ووت : دۆرت کرد ، تۆ دوو روو موناڧیقی ، وە هەوالیش بە پیغەمبەری خوا ﷺ رادە گەیەنم ..!! کاتیك قسەی ئەو پیاوە موناڧیقە گەیشتەوە پیغەمبەری خوا ﷺ وە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە ..!! عبداللەی کوری عمر ئەلیت : ئەو پیاوە موناڧیقە م بینی بە گوریسی ژیر سکی ووشترەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ خۆی هەلواسی بوو بە بەردیش ئازاریان ئەدا ،واتە : لەبەر ئەم ووتانەی چونکە تاوانیکی زۆر گەورە یە رجمیان دە کرد بە بەرد ..!! (عبدالله ) ئەلی : پیاوە کە ئە ووت : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ گالتەو گە پمان کرد ..!! پیغەمبەری خواش ﷺ پی دەفەرموو (( أبالله وآياته ورسوله كنتم تستهزئون )). واتە : گالتەتان بە خوا وبە ئایەتەکانی و پیغەمبەرەکەی ئەکرد ..؟!!هەروەها چەند کەسیکی ترلە دوو روو موناڧیقەکان کە (قتادە ) بۆمان دە گیرتەوە – خوا لی رازی بیت – لە کاتیك دا کە پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ غەزایی تبووك دە رۆیشت و لە ریگا بوون ، چەند کەسیك لە دوو رووە کان لە پیشەوە ئەرۆیشتن ووتیان : ئەم پیاوە واتە : پیغەمبەری خوا ﷺ ، بە هیوای ئەوەیە کە کۆشك و قەلاکانی شامی بۆ فتح بکریت..؟

ئەی هوو ،ئەی هوو ..؟! ئەوە بوو خوای گەورە لە م قسانەی ئاگاداری کردوە ، پیغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی (( إحبسوا على هولاء الركب )) . واتە : فەرمانی دا ئەو دوو روانە بوەستینن ..!! وە پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە لایان فەرمووی : (( قلتم كذا قلتم كذا )) . واتە : وە هاو وەهاتن ووت : ئوانیش ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ گالتەو گە پمان کرد ..!! ئەوە بوو ئەم ئایەتی قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە،

کە خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ (٦٤) وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ﴾ التوبه ٦٤-٦٥.

ئ

## سوپای ئیسلام لە تبووك :

**کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە تبووك هیچ ئاسەواریکی یان شوینەواریکی سوپای رۆمە کانی نەبینی تەنانەت عەرەبەکانی سەر بە رۆمەکانیش لەوی نەبوون ، هەر چەند سوپای ئیسلام بۆ ماوەی نزیکەی (٢٠ ) شەو لە تبووك مانەوە ، هیچ کە لە رۆمەکان نەهاتن بۆ جەنگ کردن لە گەل سوپای ئیسلام دا ، بەلام ئەوە بوو کارەبەدەستەکانی شارەکانی وەلاتی شام زۆربە یان وایان بەچاك زانی کە صولح و ریکەوتن و پە یمان ببەستن لە گەل پیغەمبەری خوا ﷺ ، ئەوە بوو (یوحەننای کوری روئبە ) پاشای ئەیلە هاتە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ هاوپە یمانی لە گەل دا بەست ، ئەوە بوو جزیە شی دا بە سوپای ئیسلام ، وە ئیستریکی سپی جەند بوردەیەکیشی بە دیاریی بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ نارد ، هەروەها دانیشتوانی (جەربا ) و (ئەزروح) ئەوانیش پە یمانیانە بەست و صولحیانە کرد ، جزیەشیان دا بەسوپای ئیسلام ،بەلی ئەوەبوو پاشاو سەرۆك هۆزانەی ناوچەکە بی خەم و پشت راست بوون لە سوپای ئیسلام هەروەها سوپای ئیسلامیش لە سنوورەکانی وەلاتی شام پشت راست بی خەم بوو ،ئەوانەی لە ژیر دەست هەلاتی فەرمانرەوایی رۆمەکان دا بوون، هەروەها لە لە تبووك دا ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە (خالیدی کوری ولید ) کە بچیت بۆ (دومەت الجندل ) کە کردەیە ئەمیری سریە یەك کە فەرماندایەتی (٤٠٠ ) پیاوی کردە دەست ، ناردی بۆ ناوچەی دومەت الجندل ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ بە (خالید ) راگەیاند کە سەرداری ئەو ناوچەیە واتە دومەت الجندل لە روای گای کیوی ئەبینی ، ئەوە بوو (خالید ) هیرشی کردە سەر ئەم ناوچەی دومەت الجند ئەوە بوو پاشای یان سەرداری ئەو ناوچەی یە بەدیل گرت ، کەناوی (ئوکەیدەری کوری عبدالملك کیندی ) بوو ، ئەو پاشا یە بەدیل گیرا ، ئەوە بوو (خالید ) ئە پاشایەی هینایە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ،ئەویش صولح و پە یمان وریکەوتنی لەگەل دا ئە نجامدا وە لە سەر جزیە دانیش ریکەوتن ،لە پاش (٢٠ ) شەو دا ئەوە بووپیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە سوپای ئیسلام کرد کە بگەرینەوە بۆ شاری مەدینە ، بەلی لەمانگی رجب سالی (٩ ) کۆچی بەریکەوت بۆ تبووك لەکانگی رەمەزانی سالی(٩ ) کچی گەیشتە شاری مەدینە ،نزیکە ی (٥٠ ) رۆژیان پی چوو لەم غەزایەدا.!!**

**کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ و سوپائیسلام گەیشتەوە مەدینە ژن ومندال ئەوانەی لەشاری مەدینە دا بوون پشوازی گەرمیان لی کرد لە (ثینة الوداع ) سروودیان دە ووتەوە بۆ سوپای ئیسلام ..!!**

ێ

## دوواکەوتەکان غەزای تبووك

بەلی ئەوە بوو کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ و سوپای ئیسلام گەرانەوە شاری مەدینە ،ئەوە بوو ئەوانەی بە هەر هۆکاریك بوو دووا کەتن نەچوون بۆ غەزای تبووك ، ئەوانە بە دووا کەو تووە کانی غەزای تبووك ئەناسرین ئەمانە : چوار جۆر بوون :

١-ئەوانەی کە عوزری شەریعی یان حجەی شریعی یان هەبوو کە ئەمانەبوو چاوپۆشیان لی دەکرا کە بەشداری غەزای تبووك نەکەن ،ئەوانیش ژن و مندال پیر و بەسالاچوو پە کەوت و نەخۆش و لاوازەکان بوو وە هەژارەکان و دەست کورتەکان تواناى چەك تفاقی کەرەسەی جەنگی پیداویستی ریگا یان نەبوو ..!!

ئەوانەی کە عزری شەرعیان هەبوو کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلَا عَلَى الْمَرْضَى وَلَا عَلَى الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنْفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٩١) وَلَا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوْا وَأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنْفِقُونَ﴾التوبه ٩١-٩٠.واتە: لاواز نەخۆش و ئەوانەی کە خەرجی غەزایان دەست ناکەویت ،هیچ گوناهو گلەییەکیان لەسەر نیە لەبەشداری نەکردنی غەزای تبووك ،کاتیك دلسۆزا بن بۆ خواو پیغەمبەرەکەی ،لەسەر ئەوچاکە خوازو پاکانە هیچ جۆرە گلەیی و رەخنە یەك نیە ،خوای گەورە لی خۆش بووە و میهرە بانیشە ..!!

٢-ئەو کە سانەی کە عوزری شرعیان نەبوو یان حجەیان نبوو بۆ دواکەو تنیان یان بەشداری نەکەن ،ئەمانە بوون کە خوای گەورە دەفەرمووی : ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾التوبە ١٠٢ . واتە: بیجگە لە وانە کەسانی تریش هەن کە دان بە گوناهو هەلە کانیان دا دەنین و کرداری چاك و کرداری خرا پیشیان تیکەل کردووە ،ئەمانە نزیکە خوا تەوبە یان لی وەر بگریت ،چونکە بەراستی خوا لی خۆشبووە میهرەبانە.!!

ئ

هەروەها خوای گەورە دە فەرموویت : ﴿وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ اللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ التوبه ١٠٦. واتە : کەسانیکی تریش هەن لە بەجی ماوە کان ئە نجامی کردەوەیان دوا خراوە بۆ فەرمانی خوا ، یان سزایان دەدات ئەگەر بەردەوام بن لەسەر دوو رووی ،یا خود تەو بەیان لی وەرگریت ئەگەر پەشیمان بن ،خوای گەورە هەمیشە زاناو دانایە ..!!

لە صحیح البخاری و مسلم دا هاتووە ئەو سیانەی کە دووا کەتوون ئەمانە بوون :( هیلالی کوری ئومەییە ) و ( کەعبی کوری مالیك ) و ( مراری کوری ربیع ) ..ئەمانە دواکەوتن بەلام نیازی ئەوە یان هەبوو بەدوای سوپا دا برۆن ،بەلام بۆیان ریك نەکەوت ،ئیتر دوا کەوتنەکەیان لە بەر دوو رووی نەبوو ،چونك پاك و دل سۆز بوون ،ئەمانە وەك ( ابو لوبابە ) ئەوانەی وەك ئەو نەبوون ..!! ئەوە بوو پیغەمبەری خوا فەرمانی دا بە موسلمانان کە لیان دوور بکە ونەوە قسەیان لەگەل نەکە هەتاکو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموویت : ﴿وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّىٰ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لَا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ التوبه ١١٨. واتە : هەروەها خوای گەورە تۆبەی ئەو سی کەسەی وەر گرت کە لە غەزای تبووك دوا کەوتووبوون دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لییان تەنگ بوو ، خۆشیان لەخۆیان بیزار بوون ، دلنیاش بوون کە هیچ پەنایەك نیە لەخشم و قینی خوا بیانپاریزیت جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە ، پاشان تۆبەی لی وەرگرتن ، تا تۆبە بکەن ، بەراستی هە خوا تۆبە وەرگرە میهرەبانە ،( بەلی ووتمان لە غەزای تبووك سی هاوەل بی هیچ بیانویەك دوا کەوتن بەلام نیازی چاکیان لەدل دابوو ، ئەمانە بوون ( هیلای کوری ئومەییە ) ( کەعبی کوری مالك ) ،( مراری کوری رەبیع ) کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ گەرایەوە شاری مەدینە موونافیق و دوو رووە کان هاتن بیانویان بۆ خۆیان دەدۆزیەوە بەلام ئەم سی کەسە هیچ بیانوویان نەدۆزیەوە ،وە دانیان بەهەلەکەی خۆیان دانا ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کەس قسەیان لەگەل دا نەکات ، وە دەبیت نەچن بۆلای خیزانەکانیان ،ئەم دەرسەئ ئەوسی پیاوە ( ٥٠ ) شەویان پی چوو ،دواتر ئەم ئایەتە هاتە خوارە وە خوای گەورە تۆبە لی وەرگرتن ..!!

ێ
**٣-ئەعرابی موناقیقەکان یان دەشتە کی یە دوو رووەکانی دەورو بەری شاری مەدینە :**

**ئەمانەبوون کە خوای گەورە دەفەرمووی :** ﴿وَجَاءَ الْمُعَذِّرُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ الَّذِينَ كَذَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ سَيُصِيبُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾**التوبە٩٠. واتە: لە کاتی غەزای تبووك دا پاکانەکەران لە بیابان نشینەکان یان عەرەبە دەشتە کیە کانی دەوروبەری شاری مەدینە،هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی مۆڵەتیان پی بدات کە نەچن بۆ جیهاد و تی کۆشان لە جەنگی تبووك دا ،هەروەها ئەوانی کە درۆیان لەگەل خوا پیغەمبەرە کەی ﷺ دا کرد ،دانیشتن بەشداری غەزای تبووك یان نەکرد ..!! ئەوانە کە بی باوەر بوون لەناو ئەوانەدا لە ئایندە دا سزایەکی پرئیش و ئازاریان تووش دەبیت ..!!**

**قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەمانەش هاتە خوارە وە کە دەفەرموویت :** ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالُوا لَا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ (٨١) فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (٨٢) فَإِنْ رَجَعَكَ اللَّهُ إِلَى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُلْ لَنْ تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَنْ تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُمْ بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ﴾**التوبە ٨١-٨٣.**
**واتە: دوو رووە کان ئەوانەی لەناوی شاری مەدینەدا دوواکەتوون خۆیان دزیەوە لەغەزای تبووك دا ،ئەوانە دل خۆش و شادومان بوون لەناو شاری مەدینەدا بە دانیشتنیان و دوواکەتنیان لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ دا نەچوونیان بۆغەزای تبووك ، حزیان نەدەکرد جیهاد تی کۆشان بە خۆیان و مالیان لە پیناوی خوا دا بکەن ..!! و بە ئیماندارانیان ووت : لە م گەرمایەدا دە رمەچن بۆ جیهاد ، ئەی ﷺ پییان بلی : ئاگری دۆزەخ بەتینترو بە هیزترە لە گەرمیدا ،ئەگەر تی بگەن و بیرو هۆشیان بخەنە گەر ..!! جا وازیان لی بهینە با کەمیك پیبکەنن لە ژیانی دونیادا و دەبیت زۆر بگرین لە ژیانی قیامەتا لە پاداشتی ئەو کارو کردەوەیەی دەیکەن ..!! ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ جا ئەگەر خوا لە غەزای تبووك تۆ گەراندەوە بۆ شاری مەدینە پاشان دەستەیەك لەو دوو روو دونیا پەرستانە مۆلە تیان لی خواستی تا لە ئایندە دا بەشداری غەزا بکەن و دەربچن لە گەل ئیوەدا ،ئەوە تۆ پییان بلی : ئیتر هەرگیز لە گەل مندا دەرناچن و هەرگیز نابیت لە گەل مندا بجەنگن دژ بە دوژمن ،چونکە بەراستی ئیوە لە سەرەتاوە رازی بوون بەدانیشتن و نەهاتن ، دە ئیتر هەر دانیشن لە گەل ئەوانەدا کە مانەوە و دوواکەتن و نەهاتن ..!!**

ێ

## سالی (٩)یەمی کۆچی بەسالی وەفدەکان ناسراوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ

### یەکەم : هاتنی وفدی (بني ثقيف):

بەڵی لەمانگی رەمەزاندا لە سالی (٩) کۆچی پێغەمبەری خوا لە گەڵ هاوەلانی گەرانەوە شاری مەدینە لە غەزای تبووك دا هەر لەم مانگەدا وفدیکی (بني ثقيف): هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ موسلمان بوون ، بەلام موسلمان بوونیان بەم شیوەیە بوو ، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەجەنگی (طائيف) و (أوطاس) دا ، (بني ثقيف) رایان کردو هەلاتن ، ئەوە بوو ،دوای ئەوە گەورە و سەرداری (بني ثقيف) کە ناوی (عروه کوری مسعود الثقفي) بوو ،هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ موسلمان بوونی خۆی راگەیاند و موسلمان بوو ، لە پاشاندا گەرایەوە بۆ لای هۆزە کەی دوای موسلمان بوونی لی کردن ، بەلام ئەوان دوا کەیان رەت کردەوە و موسلمان نەبوون..!! نەك هەر موسلمان نەبووە بەلکو (عروه کوری مسعود) دیان کوشت ، بەلی (بني ثقيف) ماوە یك ئاوا بەم شیوەیە مانەوە موسلمان نەبوون ، دوا تر بۆیان دەر کەوت وردە وردە ئیسلام گەشە دە کات پۆل پۆل و دەستە دەستە خەلك ئیسلام بوونی خۆیان رادەگەیەنن لە ناوچە کەدا ،هەروەها ئیسلام رۆژە بەرۆژ و مانگ بەمانگ و سال بە سال لە گەشە سەندن دایە پەرە دەسینی ، هەروەها ئەوانیش بۆ یان دەرکەوت ناتوان بەرنگاری سوپای ئیسلام ببنەوە بەرانبەر بەئیسلام راوەستن ،ئینجا بیریان لەوە کردەوە بینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ موسلمان بن ، بۆ ئەم مەبەستە ویستیان کە کەسیك بە وەفد بنێرن کە ناوی (عبد ياليل) بوو ، بەلام ئەو پیاوە بەتەنها رازی نەبوو بچیت خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ترسا لەوەی ئەویش بەدەردی (عوره کوری مسعود) براوا کە گەرایەوە ناویان ئەویش بکوژن ،هە ربۆیە دوای کرد کە بە تەنها نەروات چەند کەسیکی لە گەل دا بنێرن ، هەر بۆیە پینج کەسی دەکەیان هەریە ك لە سەردارانی (بني ثقيف) نارد لە گەلی دا بە (عبد ياليل) شە ش پیاو بوون،کە (عثمان کوری ابي العاص) یەکیك بوو لە و پیاوانە ، چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ،هەروەها لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتن ، پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی ئیسلامی بۆ روون کردنەوە دواتر دوای موسلمان بوونیانی لی کردن ،بەلام ئەم شەش پیاوە دوایەکی سەیریان ..!! لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە ریکەوتنیکیان لە گەل دا ببستیت یان ریکەوتنیك مۆر بکات لە گەل یاندا ، ئەویش بەم دوا سەیرو سەمەرانەی کە کردیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، دوایە کانیش ئەمانەبووە : کە پغەمبەری خوا ﷺ ریگەی بە (بني ثقيف): بدات کە زینا بکەن ..!! خواردنەوەی شەراب بخۆنەوە ..!! خواردنی ریباش یان لی قەدەغەنەکات ، (للات) ناوی یەکیك لە پەرستراوەکانی ئەوان کە (مينه) بوو ، ئەم بتە ی ئەوان هەر بمینی کە دەیان پەرست ..!! لە نویژ کردنیشدا لیان خۆش بیت ...!! بتەکانیش ئەوانەی هەیەان بوو بیجگە لە (للات) هەموویان بشکینن بەلام بە دەستی خۆیان نەبیت ..!!

ێ

بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە دوا کاری کۆتای کە شکاندنی بتە کان بوو ،هیچی تری جی بەجی نەکرد ..!! بەلام پێغەمبەری خوا هیچ کات لەم دوایانەی کە کردیان رازی نەبوو جگە لە شکاندنی بتەکان نەبێت ..!! بەلام ئەوانیش لە پاش راویژی خۆیان لەناویەکتری دا ،بە ئیسلام بوون رازی بوون ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ (عثمانی کوری ابي العاصي ) کردە سەرداری (بني ثقيف) چونکە ئەو پیاوە زۆر پەرۆش بوو بۆ ئیسلام بوونی ، بەلی کاتیك وفدە کە گەرایەوە ناو قەومەکەی خۆیان ، بەهۆزە کەی خۆیان راگەیاند کەوا ئەوان رازی بوون بەو مەرجانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان داناون هەروەها ئیسلامیان قبول کردووە ،بەلام (بني ثقيف) لە سەرتای گەرانەوەی وەفدە کەدا ئیسلامیان قبول نەکرد دوای چەند رۆژیك دواتر ترسان لەوەی کە ئیسلام لە ناویان ببات ترسی خواش چووە دلیانەوە ئیسلام بوونی خۆیان راگەیاند ،بەلام دوای گەرانەوەی وفدە کەی (بني ثقيف) ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پاش چەند رۆژیك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەلیك هاوەلای خۆی رەوانەکرد بە فەرماندەیاتی خالیدی کوری ولید ، بە بەشداری کردنی (موغیرەی کوری شوعبە ) (ابو سفیان کوری حرب) ئەوانەی دوای وفدەکە روانە کرد ..!!

ئەوە بوو وفدەکە دوای چەند رۆژیك توانیان قەومەکەی رازی کرد بە موسلمان بوونیان ،هەروەها ئاگاداریان کردنەوە لە سەر ئەنجامی بتی (للات ) لە و کاتەدا ئەو کۆمەلە هاوەلە گەیشتن بە فەرماندەیایەتی (خالیدی کوری ولید ) گەیشتنە شاری (طائیف) هەروەها (موغیرەی کوری شوعبە ) رۆیشتن بۆ رووخاندنی (الربة) لە ژێر پاسەوانیە کی توند ی (بنی میعتە ) تیرە یەکی هۆزی ثقیف بوون ،ئەوانە ئەم بتە یان دەپاراست ،ئا لەو کاتەدا (بني ثقيف) هەموویان چوونەدەرەوە بۆ لای بتە کە ئەوە بوو ، ئەوان پیان وابوو ئەو بتە کەس نایتوانی بی رووخینی ..!! ئەگێرنەوە ئەلین : (موغیرەی کوری شوعبە ) پیاویك بوو زۆ حەزی لە گالتە و پیکەنین بوو ،ووتی : بە هاوری کانی دەبیت ئەم رۆ کاریك بکەم هەموو (بني ثقيف) پیبکەنن ..!! جا رۆیش بە شتیك لە بتەکەی دا کەوتە خوارەوە هەلهات ، خەلکە کەی (بني ثقيف) بەیەك دەنگ ووتیان بەولا تر بچیت (موغیرە ) ئەوا (الربە ) کوشتی ،خەلکە کە پی خۆشحال بوون ئەو یان بینی کەوتەخوارەوە ..!! بە هاوەلانی (موغیرە )شیان ووت : هەرکەسی دەیەویت نزیك بیتەوە هەولبدات بیروخینیت ، سوێند بەخوا کەس ناتوانیت ..!! هەر لەو کاتەدا (موغیرە) هەستاو ووتی : خوا نا بووتان بکات ئەی (بني ثقيف) ئەوە بەردیکی بی ئاگایە ، بەسەلامەتی خوا بزانن و هەر ئەو بپەرستن ..!! ئینجا بە تەواوەتی بتەکەیان رووخاند و تەختیان کرد ..!! بەلی بەم شیوەیە گەورە ترین دووەم بت لە دوورگەی عەرەبی لە ناو برا و تەخت کرا ،وە لەشوینی ئەو بتە مەزگەوتی تیدا دورست کرا بۆ ( عوسمانی کوری العاص )..!!سيره النبويه لابن هشام (١٩٥/٤)،بيهقى دلائل النبوه (٣٠٤/٥) ، الواقدى المغازى (٩٦٨/٣) واقدى المغازى (٦٧١/٣) سير لابن هشام (٣٠٨/٣-٣١٢).

ئ

**دووەم : هاتنی وفدی (بنی تمیم ):**

**بەلی هاتنی وفدی بنی تمیم کە سەر کردە و ناودار و سەر داری (بنی تمیم ) ناوی (عطارد کوری حاجب ) بوو ،وە چەند کەسیکی دیکەشی لە گەل دا بوو بەناوی (الاقرع کوری حابس ) ، ( الزیرقان کوری بدر ) ، (عمر کوری الاهتم ) ، (الحبحاب کوری یزید ) بەلی ئەمانە هاتن بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەلین : سەرەتای سورەتی (الحجرات ) بە بۆنەی ئەوانەوە هاتەخوارە وە ، وە لە سیرەی لابن هشام دا هاتووە (٣٢٤/٤-٣٢٥) دەلی: ( یا محمد ﷺ أخرج إلینا ) واتە : ئەی محمد ﷺ وەردەری ئیشمان پیتە ..!! هەر بۆ یە خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ (٤) وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾الحجرات ٤-٥ . واتە : بەراستی ئەوانەی لە دەرەوەی ژوورەکان بانگت دەکەن ، ئەوانە زۆر بەیان نەفامن و ژیری وەرناگرن چونکە رەوشتی کۆمەلایەتیان لەم بوارە رەچاو نەکردووە ،خۆ ئەگەر ئەوانە ئارام و خۆ گر بوونایە ، تا دە چوویتە دەرەوە بۆ لایان ،ئەوا چاکترو رەواتر بوو بۆیان ، خوای گەورە لی خۆش بوو میهرەبانە ..!! بی گومان دە کریت ئەو ئایەتانەی سوورەتی الحجرات رینمووی بیت بۆ سەرجەم موسلمانان تاریزی گەورە و پیشەواو سەر کردەکانیان بگرن ..!! دوای چوونە خزمەتی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی بۆ روون کردنەوە ئەوانیش ئیسلامیان قبول کرد رازی بوون بینە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام ،لە گەل موسلمانان بانگەوازی بۆ بکەن ..!**

**سی یەم :هاتنی وەفدی (بنی سعد کوری بکر )**

**بەلی وفدی بنی سعد کوری بکر هاتنە خزمەتی پیغەمبەری خوا ﷺ کە پیاویك بە نوینەری خۆیان دەنیرن بەناوی (ضمام کوری ثعلبة ) ئەوویش چەند پرسیاریك لە پیغەمبەری خوا ﷺ دەکات ، دەربارەی خوا پەرستی نویژو زەکات و رۆژوو حەج هتد ..!! دوای پرسیار کردنەکە باوەر دە هینی دە بیتە موسلمان وە بریار دەدات کە هەموو واجبە کان جی بەجی بیکات دوریش کەویتەوە لەوە کە ئیسلام قەدەغەی کردووە .! دوای ئەوە کە (ضمام ) دە گەریتەوە ناو هۆزەکەی خۆی ، یەکەم ووتەی ئەلیت : (بئست اللات والعزی ) واتە : خراپ ترین شت اللات و العزی یە ، کاتیك هۆزەکەی ئەم ووتەیەی (ضمام ) دەبیستن زۆر بە سەر سورمانیەوە دەلین : ئەی (ضمام ) چۆن وا دەلیت ..؟!لە م بت بترسە ..!! لە شیتی بترسە ..!! ئەوویش پیان دەلی : ئەو دوو بتە ناتوانن هیچ زەرەرو قازا نجیك بە کەس بە گەیەنن ..!! خوای گەورە پیغەمبەریکی بۆ تان ناردووە کتیبیکی پیدا ناردووە رزگارتان دەکات لە نەهامەتییە کان ، من باوەرم هیناوە و موسلمان بووم ، ئیوەش باوەر بهینن و موسلمان بن ..!؟ ئەو رۆژە تا ئیوارە کەس نەما لە (بنی سعد کوری بکر ) موسلمان نەبن هەر هەموویان باوەریان هینا و موسلمان بوون ، هەروەها (ابن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : نەمان بیستووە وفدی هیچ هۆزیك لە هۆزی (بنی سعد ) باشتر بیت یان لە (ضمام ) باشتر بیت ..!!سیر لابن هشام (٣٣٢/٤-٣٣٣).**

ئ

## چوارەم : وفدی (بنی حنیفه )

بەلی لە سالی (٩) کۆچی دا ، وەفدی بنی حنیفه ، هاتن بۆلای پیغەمبەری خوا ﷺ کە لە (١٧) پیاو پیك هاتبوون هەروەها لە نیو ئەو پیاوانە (مسلمەی ) دۆزنیان لە گەل دا بوو ، کەناوی (مسلمەی کوری ثمامة ی کوری کبیري کوری حبش کوری حارثي کوری بني حنیفة )یە ، ئەم وەفدە (مالك ی ئەنصاری ) داییەزان پاشان هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ هەموو موسلمان بوون ، بەلام راو بۆ چوونی زۆر هەیە لەسەر (مسلمەی) دۆرزن کە (مسلمه ) زۆر ئینکارو ملهوری کردووە ،وە گویی پینەدانی لی دەرکەوتووە ، هۆکارەکەشی وەرگرتنی کورسی دەست هەلات بووە ، لە گە ل وەفدە کانی تردا نەهاتووە بۆ لای پیغەمبەری خوا ﷺ ،هەروەها پیغەمبەر ﷺ لە سەرەتاوە هەولی دا نەرم نیانی بە گوفتاری راکیشیت بۆ ئیسلام ،کەزانی هیچ سوودیکی نیەو بی خیرەو چاوەروانی کرد ،کە نیشانەیەکی لی دەربکەویت ،چونکە پیشتر پیغەمبەری خوا ﷺ لە خەویدا نشانەی ئەو پیاوە بینی بوو ، خەزینەکانی دونیایی دراوەتی دوو بازنەی ئالتوونی دەکەویتە بە ردەست ، بەدەستی گەورە بوون ،نیگای بۆ هات فوویانپیدا بکات فووی پیدا کردن ، نەمان ، وای لیکدایەوە کە دوو کەسی درۆزن لەدوای خۆیدا دەردەکەون ،کە ئەو هەلویستە ناشرینە لە (مسلمه ) دا دەرکەوت ..!! (مسلمه ) دەی ووت : ئەگەر ﷴ دەسەلات و پایەی خۆی بدا بەمن دوای خۆی شوینی دە کەوم ..!! پیغەمبەری خوا پارچە پیستەیەکی گرت بەدەستیەوە و رۆشت بۆ لای (مسلمه ) لە گە ل ووتار بیژە کەیدا کەناوی (ثابت کوري قیس ی شماس ) بوو ، رۆیشت تا بینی لە ناو هاوریکانیەوە بە ناریکی راوەستا بوو ، قسەی لەگەل هاوریکانی دە کرد ، (مسلمه ) ووتی : ئەگەر بتەویت ئیمە ریگریت ناکەین ..!؟ بە مەرجیك ئەم کارە دوای خۆت بدەیتە دەستی ئیمە ..!!؟ پیغەمبەری خوا ﷺ بە (موسلمە)ی فەرموو : ئەگەر دوای ئەم پارچە پیستەیەم لی بکەیت پیت نادەم ..!! وە هەر گیز فەرمانی خوای گەورە نادریتە دەست تۆ ..!! والله هی لە بەر چاوی من تۆ هەر ئەو کەسەی کە من لەخەوما بینیومە ..!؟ ئەمەش (ثابت کوري قیس ی شماس ) لە جیاتی من وەلامت دەداتەوە پاشان رۆیشت ..!!

صحیح البخاری وفد بنی حنیفه باب قصه الاسود العنسی (٦٢٧/٢-٦٢٨ ) و زاد المعاد (٣١/٣-٣٢ ).

ئ
## پینچەم : هاتنی وفدی ( عامری بنی صعصە ) :

لە ( ابن ئیسحاق ) – خوا لی رازی بیت – دە گیرتەوە دەلیت : وفدی ( عامری کوری توفیل ) لە گەل ( ئەربودی کوری قیس ی کوری مالك ) ،( جبارەی سەلمی ) کە پیاویکی هۆشمەند ی خەلکەکەی خۆی بوو ،هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ هەروەها ( عامری کوری توفیل )بە نیازی خیانەت کردن هاتنە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ، خەلکە کە پییان ووت : ئەی ( عامر ) خەلك زۆر موسلمان بوون تۆش باوەر بیهین و موسلمان ببە ..!!ئەوە بوو ( عامر ) ووتی : سویند بە خوا سویندم خواردووە ، دانەنیشم تا عەرەبە کانی ناوچە کە نە بنە شوینکەوتنی من ..!! بەلام کاتیك چوونە خزمە پیغەمبەری خوا ﷺ ( عامر ) بە ( ئەربود کوری قیسی کوری مالك ) ووت : کاتیك گەیشتنە لای ئەو پیاوە واتە : پیغەمبەری خوا ﷺ ( عامر ) ووتی : من سەر قال و مشغولی دەکەم تۆش بە شمشیر بیکوژە ، بەلام کاتیك چوونە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ( عامر ) ووتی : ئەی ﷺ شتیکمان پی ببەخشە ..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : نەخیر نا تا باوەر بە خوا تاك و تەنها نەهینیت ..؟! ئیتر ( عامر ) دوو بارە ووتی : ئەی ﷺ شتیکمان پی ببەخشە ..؟! دوو بارە پیغەمبەری خوا ﷺ ووتەکەی خۆی دووبارە کردوە ، ( عامر ) ناپاك و خیانەت کار چاوە روان بوو کە ( ئەربودی کوری قیسی کوری مالك ) کارە کەی خۆی تەواو بکات ،واتە مەبەستی کوشتنی پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ..!! بەلام ( ئەربود ی کوری قیس کوری مالك ) لە شوینی خۆی نەجوولا هیچ شتیکی ئەنجانەدا ، بەلام ( عامر ) کاتیك هەلویستی ( ئەربودی کوری قیسی کوری مالك ) بینی دیسان ئەو ووتەیەی پیشووی دوو بارە کردوە کە ووتی : ئەی ﷺ ﷺ شتیکان پی ببەخشە ..؟! دیسان دووبارەوە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : نەخیر نا . تا باوەر نەهینی بە خوا تاك تەنها ..؟! کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ رازی نەبوو هیچی پیببە خشیت . ئەویش ووتی: سویند بەخوا شاری مەیدن پر دە کەم لە سوارە سوورە کان و پیادەکان ، کاتیك ( عامر ) رۆیشت پیغەمبەری خوا ﷺ دوعاو نزای کرد فەرمووی : ئەی خوای پەروەردگار شەری ( عامری کوری توفیل ) لە من دوور بخەرەوە ..!! بەلی کاتیك وفدە کەی ( عامری کوری توفیل ) یان ( عامری بنی صعصە ) گەرانەوە و لەلا پیغەمبەری خوا ﷺ رۆیشتن ، لە ریگادا ( عامر ) بە هاوریکەی ووت : ئەی ( ئەربود ) تۆ چیت بەسەرهات بۆچی ﷺ نە کوژت ،دوای ئەوەی کە من پیشنیاری کوشتنی ئەوم بۆ کردی ..؟! چیت بەسەر هات ، سویند بەخوا لە تۆ زیاتر لە هەموو خەلکانی زەوی دەترسام ، بەلام چیتر نا ..!! ( ئەربود کوری قیس ) ووتی : بە ( عامری کوری توفیل ) ئەی بی باوك پەلە مەکە ، هەر کاتیك ویستم بی کوژم ، دە بوویتە دیواریك لە نیوان من و ئەو دا سویند بەخوا جگە لە تۆ هیچ کەسیکی دیکەم نە دە بینی ..!!کە دەم ویست بە شمشیر تۆ بکوژم ..؟! بەلی ( نبی عامر کوری صعصە ) بەرەو شوینکەی خۆیان بەریکەوتن ، وە لە ریگادا ( خوای گەورە ) ( عامری کوری توفیل ) تووشی نە خۆشی تاعوون کرد ئەوی کوشت .!هەندیکیش دەلین : لەریگادا هەروبروسکە کوشتی.!

ێ
**شەشەم : وفدی ( تجیب ):**

بەلی ئەم وفدە بە سەدەقەی هۆزە کە یانەوە هاتبوونە خزمە پیغەمبەری خوا ﷺ ،بەو بەشەی کە لە پشکی هەژاران زیاتر بوو ، وفدەکە لە (١٣) پیاو پیك هاتبوون ، ئەم وفدە کە هاتنە خزمە پیغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پیغەمبەری خوا یان ﷺ دە کرد ، دوایان دە کرد پاش فیری قورئانی پیرزۆ و سوننەتەکان بن ، هەروەها چەند شتیکی تریان داوا کرد لە پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بووی نوسین ،زۆر نەمانەوە لە لای پیغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش مۆلە تی پیدان بگەرینەوە ، غولامیکیان لای کاروانە کە بوو ناردیانە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ووتی: وەللاهی من هیچ نازانم ئەوەندە نەبیت دوات لی دەکەم نزام لای خوا بۆ بکەیت تا کو لیم خۆش بیت و بەزەیی بیتەوە پیمداو دلم دەولەمەند بکات ، پیغەمبەری خوا ﷺ نزا و دوعای بۆ کرد ، هەروەها بە دامەزراو ترین و باشترین مرۆژی لی دە رچوو ، لەکاتی هەلگەرانەوە کەشدا دامەزراو بوو ، هانی کەس و کارەکەشی دەدا کە باوەر دا مەزراو بن و هەانەگەرینەوە لە شەریعەت و یاسای ئیسلام ، خەلکەکەی ئەم هۆزە لە سالی (١٠) کۆچی دا جاریکی تر گەیشتنەوە بە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی مال ئاوایيدا ..!!

**حەوتەم: وفدی ( طيء ):**

بەلی کە ئەم وفدە هات خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ پیاویکیان لە گەل دا بوو ، بە ناوی (زيد الخيل ) قەسە و گتفوگۆیان کرد لە گەل پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش باسی ئیسلام بۆ کرد ئەوانیش باوەریان هینا موسلمان بوو ، هەروەها ئەم وفدە باش موسلمان بوون ، دەربارەی ئەو کەسە ی کە ناوی (زيد الخيل ) بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی (زيد ) فەرموویەتی : باسی چاکەی هیچ پیاویکی عەرەبم لەلادا نەکراوە ئیلا کە بینیومە هەستم کردووە کەمترە لەوەی بیستوومە ،جگە لە (زيد ) کە هەرچی لە بارەوە ووتراوە کەمتر بووە لە(زيد ) هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا (زيد الخير ) واتە زیدی خیرو بەرە کەت ..!!

ێ

**هەشتەم : وفدی ( عبدقیس ):**

**له (ابن عباس ) – وا لی رازی بیت- ده گێرتەوە دەڵیت :وفدی عبد قیس هاتنه خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ وه پیغەمبەری خوا ﷺ پی فەرموون : ئیوه کێن هاتوون ..؟! ئەوانیش ووتیان : (ربیعه ) پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەخێر بێن ئەو کەسانه ، دوور بن له شەرمەزاری و پەشیمانی ، دەڵیت : ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیمه له ریگا یەکی دوورە وه هاتووینه لات ..!! له نیوانیشماندا ئه دەستەیه یان ئەو کۆمەله بی باوەرەی (مضر) هەن ، ئیمه ناتوانین پینه خزمەتت مەگەر له مانگه حەرامکراوەکاندا نەبیت یان قەدەغەکراوە کاندا نەبیت ..!! هەر بۆیه دوایت لی دەکەین فەرمانیکی روون وئاشکرامان به سەر دا بەدەیت ..؟! بۆ ئەو کەسانەی یان ئەو خەلکانەی پاش خۆمانی لی ئاگادار بکەینەوە و ، هەر بەم هۆیەشەوە بچینه به هەشتەوە، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پی کردن به چوار شت ، قەدەغەشی کردن له چوار شت ، وه فەرمانی پی کردن باوەر به هینن به خوای تاك و تەنها ، هەروەها فەرمووی : ئائا ده زانن باوەر بوون مانا چییه ..؟! وتیان : خوا و پیغەمبەره کەی باشتر ده زانن ..!! فەرمووی : شەیه تمان بهینن ( أشهد إن لا إله إلا الله وأشهد ان ﷺ رسول الله ، نویژ بکەن و ، زەکات بدەن ،رۆژووی مانگی رەمەزان بگرن ، پینج یەکی دەست کەوتەکان بدەن ، هەروەها لی قەدەغه کردن به کارهینیانی کولەکەی وشك وەکو قاپ و ،گۆزەی سەوز بۆ مەی ،قاپی سواقدۆاو به زفت و ،یان فەرمووی (نقیر) دار چالکراو بۆ پاراستنی خورما و فریکه خورما ، یان به قیر سواقدراو ، فەرموویشی : ( احفظوهن واخبروا بهن من وراءکم ) واته :ئەمانه لەبەر بکەن و خەلکانی دوای خۆتانی لی ئاگادار بکەنەوە ..!!**

**صحیح البخاری فی کتاب الایمان برقم ( ٥٣ )**

**نۆیەم : هاتنی وفدی ( همدان ):**

**بەلی هاتنی وفدی ( همدان ) به سەرۆکایەتی ( ملك کوری النمط ) چوونه شاری مەدینه خزمه پیغەمبەری خوا ﷺ ، پیەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی بۆ روون کردنەوە و ، ئەوانیش موسلمان بوون ، بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ ( ملك کوری النمط ) کردە گەورەی ئەوان و سەرکردەیان ،بەلی کاتیك گەرانەوە بۆ شوینەکەی خۆیان خەلکی همدان به تیکرای دوای ئەوان موسلمان بوون ..!!**

**سیره لابن هشام ( ٣٣٩/٤-٣٥١ ).**

ی

## دەیەم : هاتنی گاورە کانی یان نصرانیەکانی (نەجران ):

بەلی پیغەمبەری نامەیەکی نووسی بۆ شاری (نەجران ) کە شاریك بوو خەلکی ئاینی نصرانی یان گاورە کان تیدا نیشتە جی بوون ، کە (٧) قوناغ لە شاری مککەوە دوور بوو بەلای وەلاتی یەمەن دا ،بەلی لە نامەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ هاتبوو کە بانگتان دەکەم بۆ پەرستنی خوای گەورە ،لە جیاتی پەرستنی بەندە کان بانگتان دەکەم ، لەجیاتی دەسەلاتی بەندە کان ، ئەگەریش رازی نابن یان قبولی ناکەن ..!! دەبیت (جزیە ) یان سەرانە بدەن بە دولەتی ئیسلام لە شاری مەدینە دا ، وە ئەگەریش بەوە رازی نابن کە (جزیە ) بدەن ئەوا جەنگ رادە گەیەنم لە گەل تاندا ، وە سلاو تان لی بیت ..!! بەلی کاتیك نامەکەی پیغەمبەری خوا گەیشتە شاری (نەجران ) ، قەشە کەیان خەلکی شارە کەی کۆ کردەوە و ، نامە کەی پیغەمبەری خوای ﷺ بۆ خویندنەوە ، ئەوانیش واتە : خەلکی شاری (نەجران ) بریاریاندا کە (١٤) کە لە پیاوە ناودارو هۆشمەندە کانیان رەوانەبکە بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها دە گیرنەوە دەلین : وفدە کەی شاری (نەجران ) (٦٠ ) پیاوی ناوداری خەلکی نەجران بوونە ..!!بەلی ئەو پیاوانەی شاری نەجران هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوانە ئاوا هاتن بۆ خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ بە جل بەرگی ئاوریشم ئالتوون زیرو زیووەوە لە بەریان دا بوو ..!! ئینجا کە هاتنە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ لەناو مەزگەوت دا روو وەو رۆژهەلات نویژیان کرد ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بە هاوەلانی لیان گەرین با نوژی خۆیان بکەن ..!! ئینجا دواتر هاتنە خزمە پیغەمبەری خوا ﷺ ئەویش رووی لی وەرگیران ..!! (عوسمانی کوری عفان ) پی فەرموون : ئەوا بە بۆنەی ئەو جل بە رگ و زیر ز ئالتوون زیو و ئەوانە کە پیغەمبەری خوا ﷺ رووی تی نە رکردن ، ئینجا وفدە کە رۆیشتنەوە گەرانەوە شوینی خۆیان بۆ بە یانی هاتنەوە بە جل و بەرگی قەشەیە کانیانەوە گەرانەوە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوانیش سلاویان لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد ئەویش وەلامی دانەوە و بانگی کردن بۆ ئیسلام بوون ، وەفدە کەی نە جران رازی نەبوون ووتیان : ئیمە لە پیش ئیوە موسلمان بووین ..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سی شت ریگرە لەوەی موسلمان بن : پەرستنتان بۆ خاچ یان صلیب ..؟! خواردنتان بۆ گۆشتی بەرزا ..؟! بانگەوازیاتان بۆ عیسی کە کوری خوایە ..؟! واتە : خوای گەورە کوری هەیە ..؟! ئینجا قسە و گفتو گۆی زۆر لە نیوان وفدی (نەجران ) و پیغەمبەری خوا ﷺ روویدا ، هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ وەلامی دەدانەوە بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ، ئەوانیش ئەیان ووت : تۆ قسە یان جنیو بە (عیسی – علیه السلام ) دەدەیت و دەلیت : ئەو بەندەی خوایە ..؟! پیغەمبەری خواش ﷺ پی فەرموون : بەلس بەندەی خوایە و پیغەمبەریشە و ووشە یەکیشە خوای گەورە داویەتی بە (مەریم ) بی نیاو لە پیاوان ، ئوانیش تورە بوون و ووتیان : ئایا هەرگیز کەسیکت بینوە بەبی باوك ..؟!

ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووی : ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٥٩) الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلَا تَكُنْ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ال عمران ٥٩-٦٠.واتە: بەڕاستی نموونەی دروست بوونی عیسی لە لایەن خواوە ، وەك نموونەی ئادەم وایە كەل خاكدروستی كرد و لەوەودوا فەرمانی داو پیی ووت : بە ئینسان ئەویش بوو ، عیسی دایکی هەبوو ، بەلام ئادەم دایك و باوكیشی نەبوو ..!!حیقەت و ڕاستی هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە ، كاواتە نەكەیت بچیتە ڕیزی ئەوانەی كە گومان كاركردی هەیە لە سەریان ..!!

ئینجا كاتیك بە بەلگە هینانەوە سوودی نەبوو بۆیان ، پیغەمبەری خوا ﷺ بانگی كردن بۆ موباهەلە كردن لە گەلیان دا كە لەم ئایە تەی خوای گەورە دا دەفەموویت : ﴿فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾ال عمران ٦١. واتە: دوای ئەوەی كە هەموو ئەو ڕاستیانەیان پی گەیشت دەربارەی ( عیسی كوری مەریم ) جا ئەگەر كە سانكی هەر موجادەلە یان كردوو لەسەری ڕۆیشتن و شتی نارەوایان دەربارەی عیسی ووت : تۆش ئەی ﷴ پییان بلی : وەرن با كورانی ئیمە و كورانی ئیوە ، ئافرەتنی ئیمەو ئافرەتانی ئیوە خۆمان و خۆشتان بانگ بكەین و ئامادەبین لە شوینیكی تایبەت دا ، پاشان لە خوا بپاڕینەوە و ئینجا داوا بكەین نەفرین و لە عنەتی خوا بباریتە سە ر درۆزنەكان ..!!ئینجا پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل ( حسن ) و ( حسین ) و كورە زای ( فاتیمە )ی كچی فەرمووی : پییان : كاتیك من نزاو پاڕانەوەم كرد ئیوە بەلین : ( ئامین ) ، بەلام ئەوان لە نیوان خۆیان دا هەندیك پرس ڕاو بۆچوونیان كرد ،لە خۆیان ترسان ..!! چونكە دلینابوون كە ﷴ ڕاستەو پیغەمبەری خوایە ﷺ وە هەر كەسیكیش دوعای لە دژی پیغەمبەریك دا بكات ئەوا تیا دەچیت ..!! هەروەها ووتیان : ئیمە قسە بە تۆ ناكەین هەر فەرمانیك یان حوكمیك دەیت بەسەر ماندا قبول مانە و ڕازین پی : هەر بۆ یە ڕیكەوتن لە گەل یاندا لەسەر ( ٢٠٠٠ )هەزار جل بەرگ و پۆشاك ، ( ١٠٠٠ ) لە مانگی ڕەجەب ،( ١٠٠٠ ) لە مانگی صەفەر دا پیش ئەوە بگەڕینەوە بۆ وەلاتی خۆیان دوایان لە پیغەمبەری خوا ﷺ كرد كەسیكی دەست پاكیان لە گەل دا بنیریت بۆ وەرگرتنی مالی ڕیكەوتنە كە ..!! پیغەمبەری خوا سەیری هاوەلانی خۆی كرد فەرمووی : (( لأبعثن معكم رجلا أمينا حق أمين )) واتە : كەسیكتان لە گەلدا ئەنیرم بەڕاستی دەست پاكە و دلسۆزە ..!! ئینجا فەرمووی : هەستە ئەی ( ابو عوبیدەی كوری جەراح ) تۆ دست پاكی ئەم ئومەتەیت ..!! ابن قیم زاد المعاد ( ٦٣٣/٣ ) سیرالبنویە لابی شیبە ( ٥٤٧/٢ )بدایەو والنهایە ( ٤٨/٥ ).

## حەجی مال ئاوایی ( حجة الوداع ) و ڕووداوە کانی

بەلی ئەگەر سەریری ڕووکنەکانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز بکەین حەج کردن ڕووکنیە لە ڕووکنە کانی ئاینی ئیسلام لە پینچەمین پایە کانی ئایەنی ئیسلام دا یە ، ئەوە بوو حەج کردن لە سالی (١٠) یەمینی کۆچی دا حەج کردن واجب یان فەرز کرا بە سەر موسلمانان دا ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ال عمران ٩٧.واتە: لەو مالەدا (کەعبە ) نیشانەو بەلگەی زۆر و ئاشکرا هەیە ، کە یەکیکیان شوینی تایبەتی خواپەرستی ئیبراهیمە، هەروەها لەوەی بچیتە ناوی پیوستە ئەمین و ئاسودە بیت ، لە هەموو دەستدریژ یەك ، جا ( خوای گەورە ) ش بریاریداوە لەسەر خەلکی حەج و سەرانی (بیت الحرام ) بکەن بە تەها ئەوانەی کە توانای (دارایی و تەندورستیان ) هەیە ، جا ئەوەی کە باوەری نەهیناوە ئەوە با بزانیت بەراستی خوا بی نیازە لە هەموو خە لکان پیویستی بە چاکە و پەرستنی کە س نیە ..!! هەروەك لە سنن النسائی ،ابن ماجە ،ابو داود ،ترمزی دا هاتووە کە ئەو حەجە میراتی باوکە گەورە مانە کە ئیبراهیمە ،کە پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : (( كونوا على مشاعركم فإنكم على إرث من إرث أبيكم إبراهيم )). هەروەها لە فەرموودەیەکی مسلم دا هاتووە و برقم (٣١٢٤ ). دەفەرموویت (( لتأخذوا مناسككم ،فإني لا أدري لعلى أحج بعد حجتي هذه )). بەلی هەر بوم فەرموودەیە موسلمانانی ئاگادار کردۆتەوە کە کاتی لیك جیا بوونەوە نزیك بۆ تەوە بۆ سەفەری کۆتایی دەچیت ئەویش قیامەتە ..!! هەر بەم بۆ نەیەوە ئەم حەجە ناو نراوە ( حجه الوداع ) چونکە پیغەمبەری خوا ﷺ بە فەرموودە کانی مالئاوایی کردووە ..!! یان ناویش نراوە ( حجه الاسلام ) ،چونکە یەکەم حەج بووە کە لەدوای کۆچ کردن بۆ شاری مەدینە ،بەلام پیش کۆچ کردن پیغەمبەری خوا ﷺ چەندجار پیش هاتنی وحی دوای هاتنیشی حەجی کردووە ..!! هەروەهاش ناو نراوە ( حجه البلاغ ) ، چونکە زۆر بە جوانی لە م حەجەدا هەموو کاروبارە کان و کردارە کانی حەج کردن فیری موسلمانان دە کات ، وەك حوکمە شەرعیە کان و یاساو ریساکانی حەج کردن لە ئیسلام دا ..!!

ێ

## یەکەم : ووتارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ( حجه الوداع ) دا :

بەلی هەروەها ( ابن هشان ) لە سیره دا( ٤/٣٥٣-٣٥٤ ) دە گێرتەوە دەلیت : پێنج شەو مابوو لە مانگی ( ذوالعقدة ) دا لە سالی ( ١٠ ) کۆچی دا پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینەوە بە مەبەستی ( حەج ) کردن بەرەو شاری مککە بەریکەوتو لە کاتی ووتاری ( حجه الوداع ) زیاتر لە ( ١٠٠ ) هەزار موسلمان لە خەزمەتی دا بوون لە پیاوان و ئافرەتاندا ..!!دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أيها الناس إسمعوا قولي ، فاني لا أدري لعلي لا ألقاكم بعد عامي هذا بهذا الموقف أبدا،أيها الناس أن دماءكم وأموالكم عليكم حرام الى أن تلقوا ربكم كحرمة يومكم هذا و كحرمة شهركم هذا ، وإنكم ستلقون ربكم فيسألكم عن أعمالكم وقد بلغت ،فمن كانت عنده أمانة فليؤدها الى من أتمنه عليها ،وان كل ربا موضوع ،ولكن لكم رؤس أموالكم لاتظلمون ولا تظلمون ، قضى الله أنه لا ربا ، وأن ربا عباس عبدالمطلب موضوع كله ،وأن كل دم كان في الجاهلية ، موضوع ،وان أول دمائكم أضع : دم ابن ربيعة بن الحارث بن عبدالمطلب ،وكان مسترضعا في بني ليث فقتلته هذيل فهو اول ما أبدا به من دمائ الجاهلية ..!! أما بعد أيها الناس ..! فأن الشيطان قد يئس من أن يعبد بارضكم هذه أبدا ولكنة إن يطع فيما سوى ذلك فقد رضي به مما تحقرون من أعمالكم ، فحذروه على دينكم ..!! أيها الناس إن النسي زيادة من الكفر يضل بة الذين كفروا يحلونه عاما، ويحرمونه عاما ليوا طئوا عدة ما حرم الله ، فيحلوا ما حرم الله ويحرموا ما أحل الله ، وان الزمان استدار كهيئته يوم خلق الله السموات والأرض وان عدة الشهور عندالله أثناعشر شهرا منها اربعة حرم ،ثلاثلة متوالية و رجب مضر الذين بين جمادي و شعبان ..!! أما بعد أيها الناس .! فأن لكم على نسائكم حقا ولهن عليكم حقا، لكم عليهن أ لايوطئن فرشكم أحدا تكرهونه ،وعليهم أن لا يأتين بفاحشة مبينة ،فأن فعلن فأن الله قد أذن لكم أن تجهروهن في المضاجع ،وتضربوهن ضربا غير مبرح ، فأن انتهين فلهن رزقهن وكسوتهن لأنفسهن بالمعروف ،استواصوا بالنساء خيرا ،فأنهن عندكم عوان لا يملكن لأنفسهن شيئا والكم إنما اخذوتموهن بأمانة الله واستحللتم فروجهن بكلمات الله ..!! فاعقلوا يا أيها الناس قولي ، قد بلغت ، وقد تركت فيكم ما إن اعتصمتم به فلن تضلوا أبدا أمرا بينا : كتاب الله وسنة نبيه ..!! أيها الناس .! اسمعوا قولي واعقلوه يعلمن أن كل مسلم أخ للمسلم وأن المسلمين إخوة ،فلا يحل لامري مسلم من أخيه الا ما أعطاه عن طيب نفس منه فلا تظلمن أنفسكم ،اللهم هل بلغت ..؟! )).

طبري تاريخ الامم الملوك ( ٢/٤٧٥ ) ، و صحيح مسلم برقم ( ١٢١٨ )، وسيرة لابن هشام ( ٤/٣٥٣-٣٥٤ ).

ئ

واتە: ئەی خەلكینە ..!! قسە كانم ببیستن، چونكە رەنگە پاش ئەم سالەم هەرگیز لەم شوینە (عەرفات) پیتان نەگەمەوە ..!! ئەی خەلكینە .! بی گومان خوینتان و سامانتان لیتان قەدەغە یە ، هاتا دەگەنە پەروەردگارتان ،وەك قەدەغە بوونی ئەم رۆژە تان قەدەغەبوونی ئەم مانگە تان ،بی گومان ئیوە دە گەنە پەروەردگارتان ، لە بارەی كردەوە كانتانەوە لیتان دەپرسی ،جا ئەوە پیم راگەیاندن ..!؟ هەر كەسی ئامانەتیكی لایە با بیگەرینیتەوە دەست خاوە نەكەی ..!؟ وە هەموو سوود (ریبا )یەك لابراوە ، بەلام قازانج و سەرمایەكانتان هی خۆتانن ..!؟ نەستم بكەن و نەستەمتان لی بكری ..!؟ (خوای گەورە) بریاری داوە كە سووخۆی واتە: (ریبا ) نەمینی ، وە سوودی (عباسی كوری عبدالمتلیب كەل هۆزی (بنی لیث) بەدایە ن داربوو هۆزی (هزیل ) كوشتی ، ئەوە یەكەمین خوینی سەدەمی نەفامییە كە لە ویوە دەست پیدەكەم ..!! ئەی خەلكینە ..! بەراستی شەیتان بی هیوا بووە كە هەرگیز لەم سەر زەویە دا بپەرستری ، بەلام بەوە رازی دەبی كە لە شتی دیكە دا بە قسەی بكری ، لەو كردەوە خراپانەی كە بە كەمیان دەگرن ،جا لەبارەی ئانەكەتانەوە لی بە ئاگاو وووریا بن ..!؟ ئەی خەلینە .! بی گومان دواخستنی جەنگ تیدا حەرام كراوە كان و دەستكاری كردنیان كوفریكی زیادەیە كە كافرە كانی پی گومرا دەبن كە سالیك حەلالی دەكەن و سالیك حەرامی دەكەم یان قەدەغەی دەكەن ، تاكو بكەویتە بەر ئەو مانگە خوا حرامی كردوە و سەرنجام ئەوەی خوا قەدەغەی كردوە حەلایلی بكەن و ئەوەی خوا حەلالی كردوە قەدەغەی بكەن ، وە رۆژگار سال و مانگ ،كراوەتە سەر ئەو حالەتە ئاساییە ی كە خوا ئاسمانە كان و زەوی تیدا فەراهەم هیناوە ، ژمارەی مانگە كانی سال لە لای خواگەورە (١٢) مانگن چواریان حەرامن ،واتە: جەنگ كردن تیدا قەدەغە كراوە ، سیان لەدوای یەكن ( محرم ، صەفر ، ربیع الاول ،و ە (رەجب ) ی (مضر ) دەكەویتە نیوانی جمادی و شعبان وە ..!! ئەی خەلكینە .! بی گومان ماف تان بەسەر ژنە كانتانەوە هەیە ، ئەوانیش مافیان لە سەرتانە : مافتان لەسەریانە كەهیچ كەس فەرمووی مالەوەو سەرجیگاتان نەكەن كە جەز بەچارەی نەكەن ، لەسەریان پیویستە كە كاری ناقۆلای ئاشكرا ،واتە : سەرپیچی هاوسەر نەكەن ، وە ئەگەر كردیان ئەوە خوا مۆلەتی داون پاش ئامۆژگاری كردن و بی سوود بوونی كەواز لە سەر جیگایان بهینن ئەگەر ئەمیش دادی نەدا ئەلیدانیكی ناره حەت نەرم و بی ئازاردان و بریندار كردن لیان بدەن ،جا ئەگەر وازیان لە یاخی بوون هینا ،كە جل بەرگی و پوشاكی باو بەسەندیان بۆ دابین بكەن ..!! لە گەل ژنان دا باش و چاك بن ،چونكە لەبەردەستتان دیلن و هیچیان پیناكری واتە: ژنان مل وبەملەیان لە گەل پیاوان پی ناكری ،وە ئیوە وە ك سپاردەی خوا ئەوانتان هیناوە بە وشەكانی خوا داویننتان حەلال كردووە..!! ئەی خەلكینە لە قسە كانم تی بگەن ..!؟ ئەوا پیم راگەیاندن ،وەشتیكم لە نیودا جیهیشتوون كە ئەگەر ،دەستی پیوە بگرن هەرگیز وون نابن ، شتیكی روون ، كتیتی خوای گەورەیە ،وە ریبازو سوونە تەكانی پیغەمبەرە كەیەتی ..!؟

ئ

ئەی خەلکینە .!قسە کانم ببیستن لییان تی بگەن ،بزانن .! کە هەموو موسڵمانیك برای موسڵمانە ،وە موسڵمانان بران ، وە ئافرەتان خوشکن و پیاوان وئافرەتان خوشك وبران ، جا موسڵمان هیچ شتیکی برایە کەی بۆ رەوانیە ماڵ و سامان مەگەر بەرەزامەندی خۆ پیدا دەجا ستەم لە خۆتان مەکەن ،ئەی خوایە : من گەیاندم ئەم بانگەوازە ..؟! هەروەها لە ( ابن ئیسحاق ) بۆمان دەگیریتەوە لە کە پیغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتا ووتارە کەیدا فەرمووی : (( وأنتم تسألونني ،فما أنتم قائلون ؟! قالوا : تشهد أنك بلغت وأديت ونصحت ،فقال .بأصبعة السبابة يرفعها الى السماء وينكتها الى الناس اللهم اشهد ! اللهم اشهد ! ثلاث مرات )). صحيح مسلم برقم ( ٢٩٤١ ) واتە : لە بارەی منەوە لیتان دەپر سری : ئایا چی دەلین ؟! ووتیان : شایەدیی دەدەین ، کە گەیاندووتە و ئە نجامت داوەو دلسۆزیت نواندووە ئەویش پاش ئەو سی جارە پەنچەی شایەدیمانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو ،ئاماژەی بەرەو لای خەلکەکەی پیکرد و ،فەرمووی : ئە خوایە شایەد بە ! ئەی خوایە شایەد بە ! شایەنی باسە ،کە ئەم ئایە تەی قورئانیش هەر هەمان ئەو رۆژە کات و سات شوینەدا هاتۆتە خوارەوە ،کە پیغەمبەری خوا ﷺ ئەو ووتارە گرینگە گشتگیرەی تیدا داوە ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ المائدە ٣. بەلی ئەم رستەیە ی کە لەم ئایە تەدا دەلیت :﴿ ...الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا...﴾ المائدە ٣. واتە : ئەم رۆ ئاینی ئیسلام بەرنامەکەی بە کۆتایی گەیاندو نازنیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و رازیم بەوەی کە ئیسلام ببیتە بەرنامەو دین و ئاینتان ..!!

ئ

## دووەم: بەریکەوتن بۆ حەج کردن لە شاری مککەی پیرۆز لە مانگی (ذوالعقدة ) سالی (١٠)کۆچی دا :

بەلی پیغەمبەری رۆشنایی چاومان دەستی کرد بە خۆئامادە کردن بۆ حەجی مالئاوایی ، ئاگاداری خەلکیشی کرد کە بەنیازە ئەم سال واتە سالی (١٠) کۆچی حەج بکات ، ئەوە بوو موسلمانان زۆر بە چاکی بەدەم بانگەوازیە کەی رۆشنایی چاومان چوون ، ئەوە بوو لە هەموو لایەکەوە لە شاری مەدینە و دەورو بەری گوندە کان شاخ و دۆلە کان بیا بان نشینەکان، موسلمانان بە پیادە بە سواری هاتن بەدەم بانگەوازیە کەی رۆشنایی چاومان پیغەمبەری ئاخر زمان ﷺ ، بەلی موسلمانان بەو پەری دل خۆشیەوە شادومانی حەزیان بە حەجی مالی خوای گەورە دە کرد ، هەر بۆ یە زۆر بە گەرمی پیشوازیان لی دەکرد ،کە دەمیك بوو موسلمانان حەجی مالی خوای گەورە یان لی قەدەغە کرا بوو ، بەلی زۆر شادومان بوون بەوەی کە لە گەل پیغەمبەری خوا سەردانی مالی خوا دەکەن ، بەلی لە رۆژی شەمەی کە لە (٢٥) مانگی (ذوالعقدة ) پیغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوە ی کە نویژی نیوەرۆی بە چوار رکعات لە شاری مەدینە بە جی هینا ،لە گەل (١٠) هەزار خەلکی موسلمان کەوتەری ، ئەلین : پیغەمبەری خوا ﷺ (ابو دجاجە ) لە شوینی خۆی لە شاری مەدینە دا جی هیشت بۆ ئاگاردار بوون لە شاری مەدینە و را پەراندنی کاروباری خەلك ، بەلی رۆیشتن تاگەیشتنە (ذوالحلیفة ) ، لە نزیك شاری مەدینە لەویشدا دوو رکعات نویژی عصری کرد ،ئەو شەوە لەیدا مایەوە کە رۆژ بوویەوە خۆی شۆرد بۆ مەبەستی ئیحرام بەستن ، پیغەمبەری خوا ﷺ (١٠٠) ووشتری بۆ (هدی ) لەگەل خۆیدا هینا بۆ سەر برین ، پاشان سواری ووشترە کەی بوو کە ناوی (القصواء ) بوو ، دەستی کرد بە (إهلال ) دەی فەرموو :(( لبيك اللهم لبيك ، لبيك لا شريك لك لبيك ،إن الحمد والنعمة لك والملك ،لا شريك لك )). هەروەها لە ریگادا عومرەشی خستە حەجە کەی دا فەرمووی : (( لبيك بعمرة وحجة )). بلام موسلمانان هەندیکیان بۆ عومرە ئحرامیان بەستبوو هەندیکیشیان بۆ حەج کردن ،هی واش کە بۆ ئیحرامی بۆ حەج و عومرە بەستبوو ،ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە (١٠٠) هەزار موسلمانی لە گەل دا بوو بە (تلبية ) و (تكبير ) و (تهليل ) کەوتەری ،بەلی دەنگی توحید و یەك خوا پەرستی ئەوناوەی پرکردبوو ،ئەمە یەکەم جار بوو نیمچە دوورگەی عەرەبی دەنگی تهلیل و الله اکبر تلبية پر کرد بوو ، گەیشتنە (سرف ) شوینك بوو لە نزیك شاری مککە ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە سەر دان بۆ حەج و ئیحرام پۆشین لەم شوینەدا ،وە گەیشتنە (ذي طوى ) شەو لەم شوینەدا مانەوە ،وە پیغەمبەری خوا ﷺ نویژی بەیانی لە گەل موسلمانان دا کرد ، پاشان غسل ی چوونە ناو مککەی پیرۆزی ئە نجامدا ..!!

ێ

## سی یەم : چوونە ناو مككەی پیرۆز دوای هەشت شەو لەرێگادا :

بەلی ئە هەموو خە لكە لە رۆژی یەك شەممەی رۆژی (٤) مانگی (ذولحجة) سالی (١٠) كۆچی دا گەیشتنە ناو شاری مككە ،كاتێك (كەعبە)ی پیرۆز بەردیا كەوت لە پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلكە كە دا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((اللهم أنت السلام، ومنك السلام، فحينا – ربنا – بالسلام . ألّلهم زد هذا البيت تشريفا وتعظيما، وتريما، ومهابة وبرا ، وزد من حجة أو اعتمره تكريما وتشريفا، وتعظيما وبرا )).كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ كەیشتە (كەعبە ) هەر بە سواری ووشترەكەی دا طوافی كرد ،بە گۆپالەكەی دا بەدەستیەوە بوو ، ئستیلامی بەردە رەشەكەی كرد ، ئەمەش بۆ ئەوەی چاویان لی بیت ،خەلكە ی فێری حەجی مالی خوا بكات ، وە پرسیاری دەربارەی چۆنیەتی حەج كردنی لی بكەن ، ئەوە بوو لە هەموو لایەكەوە دەورەیان لی دا و طوافی یان لە گەل دا كرد ، كاتێك موسلمانا خەریكی طواف كردن بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بەسەریان دا كە (اضطباع) بكە ن ، لە (٣) طوافی یەكەم دا (رمل ) بكەن و ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە :﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَأَمْنًا وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَنْ طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾البقره ١٢٥. جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((ابدا بما بدا الله به )). واتە : بەم شیوەیە دەستی پی ئەكەم كە خوا دەستی پی كردووە واتە : لە پشیەوە سەر ئەكەومە سەر (صفاء) پاشان (مرواء) ئەوە بوو سەر كەوتە سەر (صفاء) هەتا كەعبەی لیوە دەركەوت ،روو بەرووی كەعبەی پیرۆز وەستا، فەرمووی : (( لا إله إلا الله وحده لاشريك له ، وله الملك وله الحمد ، وهو على كل شيء قدير ، لا إله إلا وحده ،أنجز وعده ،ونصر عبده ، وهزم الاحزاب وحده )). پاشان لەسەر (صفاء) هاتە خوارەوە و ، سەر كەوتەوە سەر (مرواء) پاشان گەرایەوە بۆ (صفاء) ئا بەم شیوەیە تاكو (٧) جار ئەم سەرو ئەم سەری دە كرد ..!! كە لە (سعی ) نیوان (صفاء ) و (مرواء ) فەرمانی بە هاوەلان دا كە (هدی ) یان پی نیە حەجەكەیان بكەن بە (عومرە ) ئیحرام بشكینن ، لە پاشان دا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەل خەلكە كە رۆیشتنە (الأبطح ) كە شوینیكی فروان بوو لە رۆژ هەلاتی شاری مككە ، لەویدا مانەوە تا رۆژی چوارشەمە ، پیش نویژی بۆ خەلكە كە كرد ، ئەو چەند رۆژە نەگەرایەوە (كەعبە ) ، هەروەها لە رۆژی پیچ شەممەدا ،كە (٨) رۆژی مانگی حەج كرد بوو ،ئەو پی دە وتریت (ترويه ) پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەل خەلكەكەدا بەرو (مینا ) بەریكەوت ، ئەمەش دوای ئەوەی كە خەلكە كە لە (الأبطح) ئحرامیان شكاندبوو ، بە نیەتی حەج عومرەشیان بەست و ،رۆیشتن هەتا گەیشتنە (مینا ) لەویدا پێغەمبەری خوا ﷺ (نویژی نیوەرۆ عصرو مغریب و عیشای جی بەجی كرد ..!!

ئ

## چوارەم : بەریکەوتن بۆ ( عەرە فات ) :

بەلی دوای رۆژهەلاتن پیغەمبەری خوا ﷺ بەرەو (عەرە فات) کەوتنە ری ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بەسەر خەلکە کەدا ، کە لە ( نمره ) جادریکی گەورە هەل بدەن ، کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ( عەرەفات ) کەوتە ری ، قورەیشە کان بە نیاز بوون ، وەك سەردەمی نەفامیدا لە ( المشعر الحرام ) بوەستن ، بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ وای نەکرد ، بەلکو لەم شوینەدا تیپەری کرد ، بەجی هیشت ، ئەویش بە پی فەرمانی خوای گەورە بوو کە دەفەرموویت : ﴿ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾البقره ١٩٩. واتە : خەلکی لە کویو دابەزین و گەرانەوە ئیوەش لەویوە دابەزن و بگەرینەو خۆتان جیامەکەنەوە ،دوای لی خۆش بوون لە خوا بکەن ،چونکە بەراستی پەروەردگاتان زۆر لیخۆشبوو میهرەبانە ..؟! ئەوە بوو جادرە کەی بۆ هەل درا ، لەوی دابەزی هەتاکو رۆژ لار بوویەوە ،ئینجا سواری ووشترە کە ی بوو ، تا گەیشتە دۆلی یان شیوی ( عەرەنە ) لەوی ووتاری مال ئاوایی خویندەوە کە پی دە ووتریت : ( حجە الوداع ) یان ( حجە البلاغ ) ،کە لە پیشدا باسمان کرد کە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أيها الناس إسمعوا قولي ، فاني لا أدري لعلي لا ألقاكم بعد عامي هذا بهذا الموقف أبدا ،أيها الناس أن دماءكم وأموالكم عليكم حرام الى أن تلقوا ربكم كحرمة يومكم هذا و كحرمة شهركم هذا ، وإنكم ستلقون ربكم فيسألكم عن أعمالكم وقد بلغت ،فمن كانت عنده أمانة فليؤدها الى من ائتمنه عليها ،وان كل ربا موضوع ،ولكن لكم رؤس أموالكم لاتظلمون ولا تظلمون ، قضى الله أنه لا ربا ، وأن ربا عباس عبدالمطلب موضوع كله ،وأن كل دم كان في الجاهلية ، موضوع ،وان أول دمائكم أضع : دم ابن ربيعة بن الحارث بن عبدالمطلب ،وكان مسترضعا في بني ليث فقتلته هذيل فهو اول ما أبدا به من دمائ الجاهلية ..؟! أما بعد أيها الناس ..! فأن الشيطان قد يئس من أن يعبد بارضكم هذه أبدا ولكنة إن يطع فيما سوى ذلك فقد رضي به مما تحقرون من أعمالكم ، فحذروه على دينكم ..؟! أيها الناس إن النسي زيادة من الكفر يضل بة الذين كفروا يحلونه عاما، ويحرمونه عاما ليوا طئوا عدة ما حرم الله ، فيحلوا ما حرم الله ويحرموا ما أحل الله ، وان الزمان استدار كهيئته يوم خلق الله السموات والأرض وان عدة الشهور عندالله أثناعشر شهرا منها اربعة حرم ،ثلاثة متوالية و رجب مضر الذين بين جمادي و شعبان ..؟! أما بعد أيها الناس .! فأن لكم على نسائكم حقا ولهن عليكم حقا، لكم عليهن أ لايوطئن فرشكم أحدا تكرهونه ،وعليهم أن لا يأتين بفاحشة مبينة ،فأن فعلن فأن الله قد أذن لكم أن تجهروهن في المضاجع ،وتضربوهن ضربا غير مبرح ، فأن انتهين فلهن رزقهن وكسوتهن لأنفسهن بالمعروف ،استواصوا بالنساء خيرا ،فأنهن عندكم عوان لايملكن لأنفسهن شيئا والكم إنما اخذوتموهن بأمانة الله واستحللتم فروجهن بكلمات الله ..؟! فاعقلوا يا أيها الناس قولي ، قد بلغت ، وقد تركت فيكم ما إن اعتصمتم به فلن تضلوا أبدا أمرا بينا : كتاب الله وسنة نبيه ..؟! أيها الناس .! اسمعوا قولي واعقلوه يعلمن أن كل مسلم أخ للمسلم وأن المسلمين إخوة ،فلا يحل لامري مسلم من أخيه الا ما أعطاه عن طيب نفس منه فلا تظلمن أنفسكم ،اللهم هل بلغت ..؟! )).

طبري تاريخ الامم الملوك ( ٤٧٥/٢ ) ، و صحيح مسلم برقم ( ١٢١٨ )، وسيرة لابن هشام ( ٣٥٣/٤-٣٥٤ ).

ئ

## پێنچەم : بەرەو ( مزدلفة ):

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ دوای خۆر ئاوا بوون دا سواری ووشترەکەی بوو، وە ( ئوسامەی کوری زید ی ) لە پشتیەوە سوار ببوو ، بە خەڵکە کەی فەرموو : لەسەر خۆ بەرییکەوت پەلە نەکەن ، هەتا کو گەیشتنە ( مزدلفة ) ئەوە بوو لەویدا بە جمعی تاخیر یەك بانگ و دووقامەت نوێژی مەغریب و عیشا بە جی هینا ،لە نیوانیان دا نوێژی سووننەتی بە جی هینا ، دوای ئەوە خەوت یان راکشا تاوە کو رۆژهەلات ،نوێژی فەرزی بەجی هینا ، پاشان سواری ووشترەکەی بوو تاگەیشت ( المشعر الحرام ) لەوی رووی لە ( قیبلە )ی پیرۆز کرد زۆر دووعا نزا پارانەوەی کرد ، هەروەها خەریکی ( تهلیل ) و ( تکبیر ) بوو ، بە پی وەستا تاکو بە تەواوە تی دونیا رووناك بوویەوە ، ریوایەتکراوە دە گیرنەوە پیغەمبەری خوا ﷺ لە ( مزدلفة ) زۆر دووعاو پارانەوە نزای کردووە بۆ ئۆمەتەکەی بۆ ئەوەی خوای گەورە لە ئۆمەتەکەی خۆش بیت ، ئەلین : خوای گەورە دووعاو نزاو پارانەوەکەی قبول کردووە ، کە خوای گەورە وەحی بۆ رەوانە کردووە کە دەفەرموویت من لیان خۆ ش بووم بەلام جگە لەو زولم ستەمەی کە لەیەکتری دەکەن یان لە یەکتریان کرووە ..!! کە فەرموویەتی : (( یارب ! إنك قادر علی أن تثیب المظلوم خیرا من مظلمته ،وتغفر لهذا الظالم )). بەلی لە ئیوارە دا خوای گەورە وەلامی نەدایەوە بۆ بەیانی دووبارە ئەم دووعا نزاو پارانەوەی کرد ، خوای گەورە وحی بۆ رەوانەکرد کە چاوپۆشی لە شتیکی لی کردوون ، پاشان پیغەمبەری خوا ﷺ بەرەو ( مینا ) کەوتە ری ، هیشتان خۆ ئاواو نەببوو ، ( فەزلی کوری عباسی ) ئامۆزای خۆی لە پشتیەوە سواری ووشترە کەی بوو ، کە گەیشتە دۆلی ( محسیر ) پەلی بە ووشترە کە ی کرد تاکو خیرا تیپەری ، دوای ئەوە رووی لە ( جمرة العقبة ) کرد ، ( ٧ ) بەرد یان چەوی بچکۆلەی تی گرت ، لە گەل هەر بەردیکیشیان دەی فەرموو : ( الله اکبر ) لە رجمی شەیتان بوویەوە رووی لە شوینی ئاژەل سەر برین کرد ، بەدەستی پیرۆزی ( ٦٣ ) ووشتری سەر بری ، ئەشی فەرموو : (( نحرت ههنا ومنی کلها منحر )). واتە :لیرە دا ئاژەل سەر دەبرم مینا هەر هەمووی شوینی ئاژەل سەر برینە ، پاشان ( علی کوری ابی تالیب ) ( ٣٧ ) ووشتری سەر بری ،دوای ئەە پیغەمبەری خوا فەرمانی کرد لە هەر ووشتریك پاچە گۆشتیك کۆ بکاتەوە ، هەموو پارچەکان لەمە نجەلیك بکولینیت ،ئیتر خۆی لە گۆشتەکەی خوارد لە ئاوەکەشی خوارد ، پاشان سەری تاشی خەکەکەش دەوریان دابوو ، نەیان هیشت تالە موویەکی بکەویتە سەر زەوی ، بەمە پیغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەی تەوافی کەعبە بکات ئیحرامی شکاند ، جل وبەرگی خۆی لەبەر کرد ، بۆنی خۆشی لە خۆیدا موسلمانان هەر هەموو وەك ئەو ئە نجامیاندا ، پاشان فەرمانی بە ( علی ) دا گۆشتەکە وە ( صدەقە )دابەش بکات ، ئەوی فەرمانەکەی ئە نجامدا ..!!

ێ

## شەشەم : بەرەو کەعبەی پیرۆز :

بەڵی لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ووشترەکەی بوو ، بەرەو کەعبە کەوتە ڕێ تا طوافي ( إفاضة ) بەجێ هێنێ ، کە بە یەك دەنگیی یەکێك لە پایە ( روکن ) کانی ( حەج ) .. تواف کر نوێژی نیوەڕۆی لە مککە بەجێ هێنا ، بەلام ( سەعی نێوان صفا و مراوی ) ئەنجام نەدا ، پاشان تەشریفی هێنایە لای ( بنی عبدالمتلیب ) کە خەریکی ئاودانی خەڵك بوون لە ئاوی بیری ( زمزم ) ،فەرمووی : (( إنزعوا بني عبدالمطلب ،فلولا أن يغلبكم الناس على سقايتكم لنزعت معكم )). واته : ئەی نەوەی عبدالمتلیب ! خەریکی ئاو دەرهێنان بن ،ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە خەڵك دەست بە سەر ئاودانە کەتان دا بگرێت منیش لە گەڵتاندا ئاوم دە رئەهێنا ..!! ئەوانیش دۆلکەیەکیان دایە دەست ئاوی لێ خواردەوە ، پاشان تەشریفی بردە لای ئەو ( سقایە ) یەکە ( عباس ) سەر پەرشتی ئەکرد ، فەرمووی : (( إسقوني )) . عباس ووتی : ئەی فضل ! بچۆ بۆ لای دایکت و لای ئەو شەربەتێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنە ،چونکە ئەم خەڵکی دەستی تێ ئەخەن ..!! بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لا حاجه لی فيه إسقوني مما يشرب الناس )).

فەرمووی : من پێویستم بەوە نیە ، لە وە دا خەڵکی تێدا ئە خۆنەوە بم دەنێ ..!!

بەڵی ئەمە ئەوپەری دادو یەك سانیە بۆ پێغەمبەری مرۆڤایەتی ڕۆشنایی چاومان سەروەر رابەرو پێشەوامان ئازیز ڕۆشنایی چاومان ،خۆزگە گشت سەرکردەو رابەرو فەرماندەکان و سەرۆکەکان پادشاو شازادەکان وەها بان ،تۆزێك سوونەتەکانی پێغەمبەری خوایان جێ بەجێ دەکرت ،یان هەر تۆزێك شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دە بوون ، ئێستا ژیانی دونیا بەم شێوەیە نەدە بوو ، زولم ستەم سەر تا پەی زەوی گرتۆتەوە و لە دەست سەرکردەو پاشاو شازادە سەرۆکەکانی ئەم سەردەمەدا ،چونکە ئەمانەی ئەم سەردەم هیچ کات سەرکردە نین پێشەوانین ،تەنها وەك مەشەخۆر یان میکرۆب بەر بووینە گیانی فەقیر هەژاران بۆ خۆ بەزل زانی خۆیان دەلەمەند کردنی کەس وکاری خۆیان لە رەفایەتی خۆیان سەل ناکەنەوە ، بۆیە هەمیشە خۆیان دەولەمەند دەکەن و ڕۆژ بە ڕۆژ خانوو کوشکی تازە دەکردن دروست دەکەن لە پێش چاوی ئەم خەڵکە هەژارە دا ، نەگویی یان هەیە ببیستن لە چاویان هەیە ببینن ، هیچ گوێی بە خەڵکی خۆیان نادەن ، وەلاتەکانیان داگیر کردووە ،بۆ پەرژەوەندی خۆیان ،نەحەیا یان هەیە نەشەرم هەر ڕۆژی و لەسەر پەیتك قەسە بۆ خەڵك دەکەن ،هەتا بکرێت بۆیان بکرێت درۆ فیتنە بلاو دەکەنەوە لەناو خەڵك دا ، کەی سەرکردە ئاوایە کەی سەرکردە دەبێت میلەتکەی لە برسان بمرێت بە خۆی کەیف وسەفا بکات هەر ڕۆژەو لە ولاتێك دا گەشت بکات ، یارب خوای ئەم زولم ستەم قبول نەکە ی بەزوو ترین کات حەقی ستەم لێکراو بەستێنێت ، ئەوەی زولم ستەم دەکات درۆ دەکات لەگەڵ خەڵك دا ڕووی ڕەش کەیت ڕیسوای بکەیت.

ئ

## حەوتەم : گەرانەوە بۆ (مینا ) :

بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ دوای نیوە رۆ گەرایەوە بۆ (مینا ) لەویدا لە شوینی مەزگەوتەکەی ئەم رۆدا دابەزی ، کۆچەران لە لای راست و ،ئەنصارەکان لەلای چەپەوە دابەزاند ،خەلکە کەش لە دوای ئەوانەوە بەدەوریاندا دابەزاندن ، هەر لە رۆژی سەربرینی ئاژەل دا واتە لە یەکەم رۆژی چەژنی قوربان دا ، پیغەمبەری خوا ﷺ بەسەر ووشترەکەیەوە ووتاریکی تر ی فەرموو ،کە تیدا هەندیك ئەو مافانەی مرۆڤی دووپات کردەوە کە لەرۆژی (عەرفات ) دا پیشکەشی کردبوو ، وە ئامۆژگاری خەلکەکەی کرد کە چاودیری برایەتی و یەکیتی و یەك ریزی بکەن لە نیوان خۆتاندا ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ هەرسی رۆژی چەژنی قوربان لە (مینا ) مایەوە واتا : (ایام التشریق ) هەموو رۆژیك رۆژئاوا دەبوو رجمی شەیتانی دە کرد ، کە هەر رجمیکی (٧ ) بەردی بچووك بوو یان (٧ ) چەوی بچکۆ لە بوون ،لە گەل هەر بەدیك دەی فەرموو (الله اکبر ) رجمی یەکە م دووەم دوعای دە کرد نزا وپارانەوەی دە کرد ، بەلام لە رەجمی سەیەم دا تی پەری راوە نەستا رۆیشت ، لەو ماوە یەدا کە پیغەمبەری خوا ﷺ لە (مینا ) مایەوە نویژی بۆ خەلکە کەدە کرد بەلام نویژی چواری کورت دە کردنەوە ، بەلی پیغەمبەری خوا ﷺ هەر لە (مینا ) لە رۆژی سی یە می چەژنی قوربان دا ،واتە : لە دووەم رۆژی (ایام التشریق ) دا کە پی دە وتریت (النفر الاول ) ووتاریکی تری دا ..!! لە بیهقی یەوە دە لیت : ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ النصر ١

لە رۆژی دووهەمی (ایام التشریق ) هاتۆتە خوارەوە ، بەلام خوای گەورە زانا ترە . لەراستی دا دووبارە کردنەوەی ووتارەکانی پیغەمبەری خوا لە حەجی مالئاویدا کاریکی پیویست بوو ، چونکە دەیزانی ئەوا کۆتا حەجیەتی ،هەروەها ئاینەکەشی بە تەواوەتی بۆ موسلمانان روون کردۆتەوە ، بەلی رۆژی حەتەم پی دە وتریت : رۆژی (الزینە ) چونکە ئەو ووشترانەی کە بۆ (هدی ) دە هینران ئەارزینرانەوە ، بەلام رۆژی هەشتەمیش پی دەوتریت رۆژی (ترویە ) چونکە لەو رۆژە دا ووشترە کان ئاو ئەدان ، بەلام رۆژی نۆیەم پی دەوتریت رۆژی (عەرفە ) بە بۆنەی ئەوەوە حاجیان لە عەرەفات ئەوەستن ،بەلام رۆژی دەیەمیش رۆژی (النحر ) واتە : سەربرین و قوربانی کردن ، رۆژی حەجی گەورە ، بەلام رۆژی یانزەم رۆژی (القر ) چونکە میوانداریان تیدا دە کرد ، پیشی ئەووتریت : (الرووس ) چونکە سەری ئاژەلە کانی قوربانیان تیدا ئەخوارد ، یان یەکەم رۆژ ی (ایام التشریق ) یان دووەم رۆژی (ایام التشریق ) یان پی دە وتریت (النفر الاول ) چونکە کەسی پەلی بیت جائیزە لەو رۆژە بەرەو مککە بگەریتەوە ،سی یەم رۆژیش پی دەوتری (النفر الثانی ) ئەوە تا خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَى وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾**البقره ٢٠٣**.

ێ

## هەشتەم : بۆ ( الابطاح ) لە مككە دا :

بەلی لە سی یەم رۆژی ( ايام التشريق ) دا ، لە چوارەم رۆژی چەژنی قوربانـدا ، كە رۆژی سی شەمە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ لە گەل موسلمانەكاندا كەوتنە ری ، هاتن لە ( الابطاح ) دا بەزین ، لەویدا نویژی نیوەرۆ نویژی عصرو ، مەغریب ، عیشا بە موسلمانان دا كرد ، پاشان لە ( سحردا ) توافی ( زیارە ) ی ئنجامدا ، نویژی بەیانی لە كەعبە دا بە موسلمانان كرد ،دوای ئەوە فەرمانی دا بەموسلمانا بەرەو شاری مەدینە بكەونە ری ، دە ست یان بە ( تكبير ) و ( تهليل ) كرد ، ئەیان ووت : ( آيبون ) و ( تائبون ) و ( ساجدون ) و ( لربنا حامدون ) و ( صدق الله وعده ونصر عبدة ) و ( هزم الاحزاب وحده ) ، بەلی لە كاتی گەرانەوەی دا بۆ شاری مەدینە لەریگادا گەیشتنە ( غدير خم ) لەویدا پیغەمبەری خوا ﷺ ووتـاریكی تری بۆ خەلكە كە دا فەرمووی : (( اما بعد ، ألا أيها الناس ! فإنما أنا بشر يوشك أن يأتي رسول ربي فأجيب وأنا تارك فيكم ثقلين ، أولهما كتاب الله فيه الهدى والنور ، فخذوا بكتاب الله ، واستمسكوا به ))

واتە: ئەی خەلكینە میش مرۆڤم ، پەیام بەری پەروەردگارم یان نیردراوی پەروەردگارم یان رسول ی پەروەردگارم ، هات وا تە مەرگ یەخەی پی گرتم ، جا من دووشتان لە ناو دا بەجی ئەهیلم : یەكەمیان قورئـانی پیرۆزە كە هیدایەت و نووری تیدایە یان رووناكی تیدایە یان رۆشنایی تیدایە ..!! دەست بگرن بە قورئـانی پیرۆز دا ..!! بەلی بەم شیوەیە موسلمانانی هانـدا تـاوەكو دەست بە قورئـانی پیرۆزە وە بگرن لە پاشاندا فەرمووی (( أهل بيتي ،أذكركم الله في أهل بيتي ، أذكركم الله في اهل بيتي ، أذكركم الله في أهل بيتي )) بەلی لە دووەم جار فەرمووی : ( ئەهل و بيتی خۆی )سی جار دووبارە ی كردەوە ،واتە: چاودیری ئەهل بیت بكەن ..!! بەلی ئەوە بوو كاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوە ( ذوالحليفة ) چەند میلیكی مابوو بۆ شاری مەدینە ، شەو لە ( ذوالحليفة ) مایەوە ، كە چاویشی بە شاری مەدینە كەوت سی جار ووتی : ( الله اكبر ) ( الله اكبر ) ( الله اكبر ) لە پاشان فەرمووی : (( لا إله إلا الله وحده ، لاشريك له ، له الملك وله الحمد ،وهو على كل شيء قدير )) ئەمە شی دووبارە كردەوە كە دەی فەرموو : (( ( آيبون ) و ( تائبون ) و ( ساجدون ) و ( لربنا حامدون ) و ( صدق الله وعده ونصر عبدة ) و ( هزم الاحزاب وحده )

ئیتر ئەوە بوو لە ذوالحليفة ) شەو لەویدا مایەوە كە رۆژ بوویەوە بەرۆژ رووناك گەرایەوی شاری مەدینە.

صحيح البخارى كتاب الحج ،والبدايه والنهايه ابن كثير ( ٥/٢٠١-٢٠٢ )،سيرةالنبوية لابي شيبة ( ٢/٥٦٧-٥٨١ ) ، وسيرة النبوية لابن هشام ( ٢/٣٩٣-٤٠٠ ) و الرحيق المختوم ( ٤٧٢-٤٧٧ )

ئ

## نەخۆش کەوتنی پیغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژەکانی پیش کۆچی دوای کردنی

**یەکەم : ئەو ئایەتانەی کە ئاماژە بە وەفاتی پیغەمبەری خوا ﷺ دەکەن :**

بەلی ئەوە بوو و لە دوا مانگی سالی (١٠) کۆچی دا ، پیغەمبەری خوا ﷺ حەجی مالئاوایی لە گەل زۆر ترین موسلمانان دا ئەنجامدا ، بەلی سەرتایی سالی (١١) کۆچی دەست پیدەکات ، پیغەمبەری خوا ﷺ یەکەم مرۆڤە کە لە بەر چاو رۆشنی دا ،هەستی ئەکرد کە کاتی مەرگ و کۆچ کردنی یەکجاری نزیك بۆتەوە ،وا هەستی پی دە کرد کە ئەرکی سەرشانی لە تەواو بوون دا یە ، بە پی ئەم ئایەتە ی قورەئان کە خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ المائدە ٣. بەلی ئەم ئایەتانە ئاماژەیەك بوون ، بۆ کۆتا تەمەنی پیغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانی دونیا دا ، هەروەك قورئانی پیرۆز دە فەرموویت ئەویش مرۆڤە وەك برا پیغەمبەرە کانی تر دا کە ئەویش هەمان مەرگ ئە چیژی کە ئەوان چەشتیان ،بەلی ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز ئاماژە یە بۆ دەرخستنی نیشانەکانی کۆچی دوای رۆشنای چاومان سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ کە پیشەوای ئومەی ئیسلام ،کە (خوای گەورە ) دەفە رموویت : ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ ال عمران ١٤٤. واتە: ﷺ تەنها پیغەمبەریك نەبووە وەفات بکات ، بی گومان پیغەمبەرانی پیش ئەویش وەفاتیان کردووە ، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژراو شەهید بوو ، ئیوە پاشگەز دەبنەوە و هەلدە گەرینەوە ..؟! لە دین ئاینەی کە بە ئیوەی راگەیاندووە ..؟! ئەوا هەرگیز زیان بە خوا ناگەیەنیت ،لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە ..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ﴾الزمر ٣٠. واتە : ئەی ﷺ تۆ دە مریت و ئەوانیش دەمرن کەس نامینیت ..!!

ئ

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِنْ مِتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ﴾ الانبياء ٣٤. واتە : ئیمە پیش تۆ ﷴ ژیانی هەمیشەیی مان بە هیچ کەس نەبەخشیوە ،جا ئایا ئەگەر تۆ بمریت ،(دوای مەرگی تۆ ) ئەوە ئەو خەلکە ژیانی هەمیشەیی دەبە نەسەر و نامرن ..؟!

هەروەها دەفەرموویت : ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾الانبياء ٣٥.واتە : هەمووکەسیك دەبیت مردن بچیژیت و شەرابی مەرگ بنۆشیت ، بی گومان ئیمە ئیوە تاقی دەکەینەوە بە شەر و ناخۆشی و بەلاو بە خیر وخۆشی و دارایی و توانایی ، سەر ئە نجام هەر بۆ لای ئیمە دە هینرینەوە تا پاداشتان بدەینەوە ..!!

هەروەها دەربارەی سوورەتی (نصر ) کە (خوای گـەورە ) دەفـەرموویت ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ (١) وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا (٢) فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ﴾ النصر ١-٣. بەلی (عمری کوری خەتاب ) – خوا لی رازی بیت – دەربارەی ئەم سورەتە پرسیاری لە (ابن عباس ) کرد کە چۆنی لە م سورتە تی دە گەیت ..؟! ئەویش وەلامی دایەوە کە ئەوە ئەجلی پیغەمبەری خوایە ﷺ قورئانی پیرۆز ئاماژەی پی دەکات ،(عمری کورە خەتاب )یش فەرمووی : منیش هەر وا لی تی دە گەم ..!!

هەروەها (خـوای گـەورە ) دەفـەرموویت : ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ (٢٦) وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾الرحمن ٢٦-٢٧.

واتە : هەموو ئەو کەسانەی لە سەر رووی زەوین ، هەر هەمووی فەو تـاوو تیاچـووە ، دەبیـت بمـرن ..!! تەنها زاتی پەروەردگار خاوەن بلندی و برزداری تۆیە کە دەمینیتەوە .

هەروەها (خوای گەورە ) دەفـەرموویت : ﴿وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ القصص٨٨.

واتە : لە گەل خوا دا ،هانا و هاوار لە خوایەکی تر مەکە ..!! چونکە جگە لەو زاتە خوایە کی تر نیـە ..!! هەرچی شت هەیە تیاچووە لە ناو چووە جگە لەو زاتە ،فەرمانرەوایی هەر شایسـتەی ئـەوە ..!! هـە موانیش هەر بۆ لای ئەو دە گەرینەوە ..!!

ئ

## دووه م : تەمەنی پیغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی وەفات کردنی دا :

بەلی دە ربارەی تەمەنی پیغەمبەری خوا ﷺ راو بۆچوونی جیاواز هەن ، هەندیك ئەلین : کاتی پیغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد تەمەنی (٦٣) سال بووه ، هەروەها (ابن عباس) – خوا لی رازی بیت – دە گیرتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ (١٣) سال لە مککە دا وە حی بۆ دەهات و ،وە (١٠) سال لە مەدینە وەحی بۆ هات دواتر کۆچی کرد ..!! هەروەها (عبدالله کوری عمر) – خوا لی رازی بیت – دەگیرتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ لە سالی (٩) یە می کۆچی دا و (ابو بکر صدیق) کردە سەرکردەی حاجیان و ری و رەسمەکانی حەجی فیری خەلکان کرد و سالی دواتر واتە : سالی (١٠) کۆچی دا پیغەمبەری خوا ﷺ حەجی مالئاوایی کرد ، کە گەرایەوە شاری مەدینە لە مانگی ربیع الاول وەفاتی کرد ..!!هەروەها لە (ابن ئیسحاق) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ لەرۆژی دووشەمەی (١٢) رەبیع الاول کۆچی دوای کرد لە شەوی چوارشەمە بەخاك سپیردرا ..!!

## سی یەم : سەرتایی نەخۆشیە کەی پیغەمبەری خوا ﷺ :

لە دایکە (عـائیشە )وە – خوا لی رازی بیت – دە گیرتەوە دەلیت : ئەو شەوەی ، کە پیغەمبەری خوا ﷺ چووە قبرستانی (بقیع) گە رایەوە مالەوە ، کە بۆ بەیانیە کەی بینم پی ووت : (وا رأساه) واتە : ئـای سەرم دیشی ..!؟ (عـائیشە) ئەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ ش فەرمووی : (بل أنا والله یا عائشە وا رأساه) واتە : منیش بە خوا ئەی (عـائیشە) سەرم دە ئیشی ..!! ئیتر هەر ئەوو نەخۆشیە بوو ،کە بووە هۆی وەفات کردنی پیغەمبەری خوا ﷺ ..!!

هەروەها لە (ابن هشام) باسی کردووە لە سیرە دا کە (ابو مویهبە) یەکیك بوو لەو کۆیلانەی کە پیغەمبەری خوا ﷺ ئـازای کردوە ، وە عەرەب پی دەلین : (مولی) دە گیرتەوە دەلی : پیغەمبەری خوا ﷺ لە نیوە شەویك دا لە دوای ناردم و لەگەل خۆی بردم بۆ گۆرستانی (بیقم الغرقد) کە لە تەنیشت مەزگەوتی پیغەمبەرە ، زۆر بۆیان پارایەوەو دواوای لیبوردنی بۆ لە خوا کردن ، دوای گەرایەوە مالی ، وە بۆ بەیانەکەی نەخۆش کەوت ..!!

سیرە النبویە لابن هشام (٤/٣٧٨-٣٧٩).

ئ

## چوارەم : دواهەفتەی ڕۆشنایی چاومان ﷺ :

بەلی نەخۆشیە کەی توند بوو ، کە وای لیهات دەی پرسی لە خیزانەکان کە من سەبینی لە کوی دەبم ؟!هەروە ها دووبارەی دە کردەوە کە من سەبینی لە کوی دە بم ؟! خیزانەکانیشی لە قەسە کانی تی دە گەیشتن ، هەروە ها مۆلە تیان پی دا کویی پی خۆشە لە ویدا بیت ..!! ئەوە بوو بریاری دا بچیت بۆ مالی _دایکە عائیشە ) – خوا لی رازی بیت – ئەوە بوو کە ئەم دوو هاوەلە کە ( فضل کوري عباس ) و ( علي کوری ابي طالب ) بە پالیان هەگرت بە هەر جۆریك بیت تا گەیشتنە مالی (دایکە عائیشە ) – خوا لی رازی بیت – پیغەمبەری خوا ﷺ لەویدا مایەوە دواین هەفتەی ژیانی ئازیزمان لەویدا بوو ..!!

بەلی (دایکە عائیشە ) ئەو ذکری دە خویند کە کاتی خۆی لە پیغەمبەری خوا ﷺ فیری ببوو ، هەروەها فوی دە کرد بەخۆیداو ، بەمەبەستی بەرەکەت دەستیشی دە هینا بە سەر پیغەمبەری خوا ﷺ ..!!

## پینچەم : پینج ڕۆژ پیش وەفات کردنی :

بەلی لە ڕۆژی چوارشەمەدا کە دە کاتە پینج ڕۆژ پیش وەفات کردنی ، ئەوە بوو پیغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە مەزگەوت ، خەلك لە خزمەتی دا دانیشت بوون ، چەند وەصیەتیکی کرد وە چەند راسپاردەیەکی بۆ ئومەتەکەی بەجی هیشت ئەویش ئەمانە بوون :

١-دەرکردنی شریك و بت پەرستان لە دوورگەی عەرەبی دا .

٢-خە لات کردنی ئەو وەفدانانی کە دین بۆ شاری مەدینە بە مەبەستی موسلمانان بوونیان .

٣-قەدەغەکردنی کە گۆر بکریت بە مەزگەوت .

وەك ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموویت : (( قاتل الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور انبيائهم مساجد ).سيرة ابن هشام ( ٧١٢ ) .

٣-راسپاردەی نویژ ئەو کەسانەی لە ژیر دەستاندان .

٤-هیچ نەماوە لە مژدەکانی پیغەمبەرایەتی جگە لە خەون .

بیگومان سی جار ئەم ووتەیەی دوو بارە کردووە کە فەدەی فەرموو :( اللهم هل بلغت ) .

صحيح مسلم كتاب الصلاة ( ٣٤٨/١ )

ی

پاشان دا بەزی لە سەر مینبەر نوێژی نیوەڕۆی کرد ، ئینجا گەڕایەوە سەر مینبەر ، ئەو ووتارەی لە بارەی دوو بەرکی فەرموو بوو ، پاشان وصیەتی کرد بە چاکە کردن لە گەل برا ئەنصارەکان ،چونکە ئەوان پشت و پەنای پیغەمبەری خوا ﷺ بوون ، ئەوەی لەسەر ئەنصارە کان بوو کردیان ، وە ماوە تەوە ئەوەی کە پیویستە پاداشت و چاکە یان بدریتەوە ، هەروە ها فەرمووی : چاکەی چاکە کاران قبول بکەن ، چا پۆشی بکەن لە خراپەی خراپە کارایان ، یان لە ریوایەتیکی تردا هاتووە فەرمووی : ( خەلك زۆر دەبن ، ئەنصارەکان کەم دەبنەوە ، تا وەکو خویی چیشتیان لی دیت ، هەر کەسیك لە ئیوە کاریکی گرتە دەست زیانی تیدا بیت بۆ کەسیك یان قازا نجیکی پی بگەینیت ئەوا چاکە کارە کانیان قبول بکات و چاوپۆشی لە خراپە کارە کانیان بکات . پاشان فەرمووی : بەندەیەك خوای گەورە ڕای داوە تە دەست خۆی لەوەدا کە گولیکی مالی دونیا بە خواستی خۆی هەلگریت ، لە گەل ئەو نازو نیعمەتەدا کەلای خۆی هەیە ، بی گومان ئەوە یانی هەلبژاردوە کە لای خوای گەورە یە ..!!

لە ( ابو سعید خدری ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : ئەوە بوو ( ابو بکر صدیق ) – خوا لی رازی بیت – گریا ،ووتی : باوك دایکمان دەینە قوربانی تۆ ، ئیمە سەر مان سورماوە لەوە ، خەلك ووتیان : سەیری ئەو ریش سپیە بکەن . پیغەمبەر ﷺ هەوالی بەندەیە ك دەدا کە خوا ڕای داوەتە دەستی لەوەدا کە گولیکی دونیای پیداوەو ، لە نیوان ئەوە دا کەلای خوایە ..!! ئەوە دەلیت : باوك و دیکمان بە قوربانت بیت لە راسیتدا پیغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسە بوو کە راکەی درا بوو دەست و ئاماژەبوو بۆ کۆچی دوای رۆشنایی چاومان پیغەمبەری خوا ﷺ ( ابو بکر صدیق ) هەوالی پیداین ..!!

پاشان فەرمووی : متمانە پیکراو ترین کەسیك لای من لە هاوەلیتی و مال و ساماندا ( ابو بکر صدیق ) خۆ من جگە لە خوا خۆشەویستیکی ترم هەلبژاردایە ( ابو بکر صدیق ) هەلدەبژارد ،بەلام من تەنها برایەتی خۆشەویستی ئیسلامە ، هەموو ئەو دەرگایەنەش دینە سەر مەزگەت دا یخەن ،جگە لە دەرگای ( ابو بکر صدیق ؟ ) .مشكات المصابيح ( ٥٤٦/٢ ).

ئ

## شەشەم : چوار رۆژ پێش وەفاتی ﷺ

بەڵی لە رۆژی پێنج شەمە دا چوار رۆژ پێش وەفاتی ﷺ ئەوە بوو ئازاری نەخۆشەیە کە ی زۆر بەهێز تر بوو ، ئا لەو کاتە دا فەرمووی : با نوسراویکتان بۆ بنووسم کە لە دوای ئەم نوو سراوە تووشی سەر لێشیواو گوماراو هیلاکەت نەبن ..!! ( عمری کوری خەتاب ) بوو جەند پیاویکی تر دانیشت بوون ، ( عمری کوری خەتا ب ) ووتی : بە خوا ئازارەکە زۆری بۆ هیناوە ،ئیوە قورئانتا لە لایە ، پەراوی خوا بەسە ، هەروەها ئال بیت یان کەس و کاری پیغەمبەری خوا ﷺ جیاوازیان بۆ دروست بوو ، بووە قسەو باسیان ، هەندیکیان ووتیان : نزیك ببنەوە با پیغەمبەری خوا ﷺ بۆتان بنووسیت ..!! هەندیکیشیان ئەوەی ( عمری کوری خەتاب ) یان دەوتەوە ، کە بوو بەدەنگە دەنگیان ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : برۆنە دەرەوە ..!! صحیح البخاری باب مرض النبي ﷺ (٦٣٧/٢).بەڵی لەم رۆژە دا وصیەتی کرد بە چەند شتیك دا ئەوە بوو فەرمووی : یهود و نصرانی و موشریکان لە دوورگە دا دەر بکرین ، وەصیەت بیت بە دەست گرتن بە قورئان و سووننەت ،یان بەریکی کردنی سوپای ( ئوسامە ی کوری زید ) بۆ جەنگ کردن لە گەڵ سوپای رۆما لە وەلاتی شام ، یان فەرمووی : نویژو پاراستنی مافی مولکی یەمین ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەو ئازارە زۆرەی کە بە هۆی نەخۆشیە کەی کە هەیبوو ، نویژی جماعەی بۆ خەلك دە کرد ، واتا رۆژی پینج شەمە پیش چوار رۆژ پیش وەفاتی پیغەمبەری خوا ﷺ بەڵی ئەو رۆژە نویژی مەغریبی بۆ مویلمانان کرد سوورەتی ( المرسلات ) تیدا خویند،بەلام لە کاتی نویژی عیشا دا نەخۆشیەکەی زۆر زیاتر بوو ، بەشیوەیەك نەیتوانی کە لەمەزگەوت براواتە دەرەوە ،( عائیشە ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوە خەلك نویژیان کرد ..؟! ئەڵی میش ووتم : نەخیر . ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ خەلك چاوەری تۆ دەکەن ..؟! پیغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ئاو بۆ لە سەر شۆرگە کە بۆ دا بنین..؟! ئاومان بۆ دانا خۆی شۆرد و ئینجا هەولیدا یە خۆی هەستایەوە ، کەوت و لە هۆش خۆی چوو..!! پاشان هۆشی هاتەوە ،فەرمووی : خەلك نویژیان کرد ..؟! ئینجا بۆ جاری دووەم و سی یەم وەکو جاری یەکەم کەوتەوە ، هەر کە دەیویست هەول بدا ، بەخۆی هەلیسیت لە هۆش خۆی دە چوو..!! ناردی بە شوین ( ابو بکر صدیق ) کە نویژ بۆ موسلمانان بکات ، ( ابو بکر صدیق ) نویژی هەموو ئەو رۆژانەی کرد بۆ موسلمانان ، ئەوە بوو ( ابو بکر صدیق ) ( ١٧ ) نویژی کرد لە ژیانی پیغەمبەری خوا ﷺ دا بۆ موسلمانان کرد ..!! بەڵی ( عائیشە ) سی یان چوار جار چووە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی کە ( ابو بکر نویژ بۆ خەلك نەکات ) نەوەك خەلکە کە بە نەخۆش کردنی و نویژ نەکردنی پیغەمبەری خوا ﷺ رەش بین بن ..!! بەلام پیغەمبەری خوا ﷺ رازی نەبوو ، فەرمووی : ئیوە دەستە خوشکی ژنەکانی سەردەمی ( یوسف ) -علیه السلام - ن . بلین با ( ابو بکر ) پیش نویژی بۆ موسلمانان بکات ..!!

مشکاە المصابیح ( ١٠٢/١ ).

ئ

## حەوتەم : پیش رۆژیك یان دوو رۆژ پیش وەفاتی ﷺ

بەلى رۆژى شەمە بوو يان رۆژى يەك شەمە، پیغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد کە نەخۆشیە کەی سووك بووە لی دووپیاو ،چوونە ژێر بالی بۆ نوێژی نیوە رۆ ، ئەوە بوو (ابو بكر صديق ) پیش نوێژی بۆموسلمانان دە کرد ، ئەوە بوو کە پیغەمبەری خوا ﷺ بینی ویستی بکشیتەوە دواوە ، پیغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە بەردە وام بیت ، فەرمووی : لە پال (ابو بكر صديق ) دا بنین ..!! لە لای دەستی چە پی (ابو بكر) دایان نیشاند ، (ابو بكر ) وە کو پیغەمبەر ﷺ نوێژی بۆ موسلمانان کرد، موسلمانان گویان لە تکبیرە کانی بوو ..!! صحيح البخاري (٥٦/١ ) و صحيح البخاري (٩٨/١-٩٩ ). بەلی هەر لەم رۆژە دا رۆژیك پیش وە فاتی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو کە غولامەکانی خۆی ئازاد کردن ،حەوت دیناری هەبوو هەمووی کرد بەخیر ،چەکەکانیشی کرد بە صەدەقە بۆ موسلمانان ، لە شەوە کەشدا (عایشە ) – خوا لی رازی بیت- زیتی لە دراو سیەکەی وەرگرت بۆ چرا هەکردن ..!!

## هەشتەم : دوا رۆژی ژیانی ﷺ واتا رۆژی دووشمە

لە (ئەنسی کوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – دە گیریتەوە دەلیت: رۆژی دووشمە لە کاتیك دا کە نوێژی بەیانی بوو (ابو بكر ) پیش نوێژی بۆ موسلمانان دە کرد ، لە پەریکدا پیغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی (عائیشە ) لا دا کە تەماشایی ناو حەرەمی مەزگەوتی دەکرد ،لە کاتیکدا (ابو بكر ) لە گەل موسلمانان نوێژی بە بەکۆمەل یان دە کرد ، لە پاشان دا زەردە خەنەیەکی جوانی بۆ کردن ،(ابو بكر ) هەنگاوی نا بیتە دواوە ریزی نویژ کەرە کان ، وای زانی پیغەمبەری خوا ﷺ دەیەویت بیت بۆ نویژ ..!!

(ئەنس ) دەلیت : خەریك بوو موسلمانان نوێژە کەیان ببرن لە خۆشی هاتنی پیغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی پیرۆزی ئاماژەی کرد نوێژە کەیان تەواو بکەن ، ئینجا پەردەی ژوورەکەی (عائیشە ) ی دا دایەوە و چووە ژوورەوە دوای ئەوە ئیتر پیغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی نوێژی تر نەبوو ..!! کە کاتیك هەر لەم رۆژە دا رۆژی جشتگا هاتبە ر واتا رۆژ بوویەوە بانگی (فاطیمة ) ی کچی کرد شتیکی بە گویی دا چرپاند پی فەرموو کە لەم نەخۆشیە دا دەمرم ، ئەویش واتا : (( فاطیمة ) ووتی :منیش دەستم کرد بە گریان ، پاشان بانگی کردمەوە پی فەرمووم : کە من یەکەم کەس دە بم پی دە گەم بەم هەوالەش زۆر دل خۆش بووم .

صحيح البخاري (٦٣٨/٢ ) . پاشان مژدەی دا (فاطیمة ) کە خانمی هەموو ژنانی دونیا یە ، کاتی (فاطیمة ) ئەو هەموو ئازارەی بە باوکیەوە بینی ووتی : ئەی هاوار بۆ باوکم ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی (فاطیمة ) ئتر لەمەو دوا باوکت ئیش و ئازاری نامینیت ..!! صحيح البخاري (٦٤١/٢ ).

بەلی ئەوە بوو سەرە مەرگی پیغەمبەری خوا ﷺ دەستی پی کرد ، ئا لەو کاتەدا سەری لە سەر رانی ( عائیشە ) بوو ، دەی فەرموو : یەكیك لە نازو نیعمەتەكانی خوا ئەوە بوو كە پیغەمبەر ﷺ لە مالەكەی من و لە ژووری خۆمدا لە كۆشی خۆمدا وەفاتی كرد ،خوای گەورە هەناسەی ئەوی تیكەلاو بە هەناسەم كرد لە كاتی وەفاتی دا ، ( عبدالله ی كوری ابو بكر ) هاتە ژوورە وەو سیواكیكی بەدەستەوە بوو ، منیش پشتی پیغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو بینیم سەیرس دەكات ، زانیم كە حەزی لە سیواك كردنە ،ووتم : بۆت بهینم ..؟! بە ئاماژەی سەری فەرمووو : بەلی . سیواكم بۆ كرد ، كەمیك رق بوو ، ووتم :بۆت نەرم بكەمەوە ..؟!

بەسەر ئاماژەی كرد فەرمووی : بەلی . منیش نەرمم كردەوە ، هەروەها كوندە یەكی ئاوە دانرا بوو ، دەستی تیدا خست دەم چاوی پیرۆزی پی تەر دە كردو دەی فەرموو: ( لا إله إلا الله ) ئای خوایە كە مردن ساتەو ساتی سەختی هەیە ..؟! صحيح البخاري باب مرض النبي ﷺ (٢/٦٤٠). دواتر پیغەمبەری خوا ﷺ چاوی روانیە بنمیچی مالەكە ، لیوە كانی جوولا ( عائیشە ) گویی بۆ هەلخست گویی لی بوو دەی فەرموو : ( مع الذين أنعمت عليهم من النبيين والصديقين والشهداء والصالحين ،اللهم اغفر لي ،وارحمني ،والحقني بالرفيق الأعلى )). صحيح البخاري باب مرض النبي ﷺ ( ٢/٦٣٨ )،( ٢/٦٣٣ )،( ٢/٦٤٠ )،( ٢/٦٤١ )

واتە : خوایە بم خەیتە ریزی ئەوانەی نازو نیعمەتت بە سەر دا رشتن لە پیغەمبەران و شەهیدان و صالحان ، خوایە لیم ببورە رەحمم پی بكە ، خوایە بە رەفیقی ئە علا ،خوایە بە رفیقی ئەعلا ..!!ئەم ووتەیەی دوای سی جار ووتەوە ، دەستی پیرۆزی شل بوو گیانی پیرۆزی سپاردو گەیشت بە رەفیقی ئەعلا .......!!

(أنا الله وأنا إليه راجعون ) بەلی ئەم رووداوە ناخۆشە و دل تەزینە لە كاتی چیشتگای گەرم دا رووی دا لە رۆژی دووشەمەی ١٢ رەبیعی یەكەم سالی ( ١١ ) كۆچی تەمەنی پیرۆزی ( ٦٣ ) چوار رۆژ بوو ..!!

لە (ئەنسی كوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : هەر گیز رۆژیكم نەبینیوە رووناكتر جوانتر لەو رۆژەی پیغەمبەر ﷺ تیدا وەفاتی كرد . مشكاة المصابيح ( ٢/٥٤٧ ).

ئ

## دەیەم :میراتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای وەفات کردنی :

ئەوە کە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای وەفات کردنی بەجێما لە مال و سامانەکەی بریتی بوو لە :

١-ئێسترێکی سپی لەگەل چەکەکەی .

٢- پارچە زەویەك کە کردبووی بە صەدەقە .

٣-قەلغانێك یان درع کە لە رەهنی جوولە کەیەك دا بوو لەبری ربە یان ( صاع ) جۆ وەك بخاری لە ( عائیشەوە ) – خوا لی رازی بێت – گێرایە تەوە کە دەلیت : (( توفي النبي ﷺ ودرعه مرهونة عند يهودي ثلاثين )) . لە ریوایە تێکی تردا دە لیت ( بثلاثين صاعا من شعير ). صحيح البخاري ( ٢٩١٦ ).

بەلی ئا بەم شێوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە یارمەتی الله عز وجل توانی لە ماوەی ( ٢٣ ) سالەی پێغەمبەرایەتیە کەیدا پەیامی خوای تبارك وتعالى یان الله عز وجل بە تەوا وەتی بگە یەنی بە قسەو رەفتار و کردار دا ، بەلی لە ماوەی ئەم ( ٢٣ ) سالەی دا هەموو ئێش ئازارو نارەحەتیەکی بینی لە بەرانبەر ناحەقی بت پەرستانی نیمچە دوورگەی عەرە بیدا ، بەلی ئەوە بوو پێغەمبەری خوا توانی کۆمەلیکی زۆری قوتابی پێبگەینی لە هاوەلانی خۆی بۆ ئەوەی ئەو ئاینە پاکە بگەینە ئێمە کە ئێستا پەیرەوەی دە کەین ، بە پێغەمبەری خوا توانی بەرنامەی خوا بە هاوە لە کانی بگەیەنی بۆ دروست کردنی دەلە تێکی بەهێزو بتەوی دامەزراوی ئیسلامی لە سەرانسەری نیمچە دوورگەی عەرە بی دا ، ئەوە بوو هەر ئەم دەلە تە ئیسلامیە توانی دوو ئیمپراتۆری گەورەی ئەو کات شکست پی بینی کە فارس رۆما کان بوون بەشکی زۆری لە خاکی فارس رۆم هاتنە ژێر سایەی ئالای ئیسلام ، بەلی پێغەمبەری خوا حوکمی سەرانسەری نیمچە دوورگەی عەرەبی دە کرد ، کاتێك وەفاتی کرد نە دیناریك و نەدەرهەمیکی لە پاش خۆیدا بەجی نەهیشت ،بە بەندەیە نەکەنیزەکیك ،هیچ شتێك لەم دونیایەدا بەجی نەهیشت جگە لەوانەی سەرەوە باسمان کرد ،بەلی کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد فاطیمەی کچی ووتی : (( يا أبتاه .. أجاب ربا دعاه .. يا أبتاه .. من الجنة الفردوس مأواه .. يا أبتاه .. إلي جبريل ننعاه ). بەلی ئەوە بوو لە رۆژی دووشەمەی ربیعی یەکەم دا لە سالی ( ١١ ) کۆچی دا کۆتایی بە ژیانی دونیا هینا سەروەرمان و رۆشنایی چاومان ﷺ ...!!!

ئ

# سەرچاوەکان


١-غزوه أحد لمحمد احمد باشميل .

٢- السيره النبويه لابى شهبه.

٢-الرحيق المختوم.

٣-السيرة ابن هشام .

٤-والبيهقى في الكبرى.

٥-الفتح البارى ابن حجر العسقلانى

٦-الامام احمد فى سنن .

٧-ابو داود فى سنن.

٨-ابن ماجه فى سنن .

٩-عبدالرزاق فى المصنف .

١٠-طبراني في الاوسط.

١١-ابو نعيم في الحلية .

١٢-الحاكم في المستدرك .

١٣-صحيح البخاري .

١٤-صحيح المسلم .

١٥-ابن حبان في سنن .

١٦-البيهقي في الدلائل النبوة.

١٧-النسائي في الكبير

١٨-الطحاوي في المعاني الاثار .

١٩-زاد المعاد هدي خير العباد ابن قيم جوزي .

ئ
٢٠-الترمذي في سنن .

٢١- البخاري في الادب مفرد.

٢٢-سيرة اعلام نبلاء.

٢٣-جوامع سيرة .

٢٤-شرح الزرقاني على الواهب .

٢٥- الواقدي فيالمغازي .

٢٦-ابن سعد  في طبقات .

٢٧-ابن هيشام في السيرة النبوية .

٢٨-ابن كثير في البداية والنهاية .

٣٠-السيرة النبوية ضوء المصادر الأصلية .

٣١-غزوة بني قريضة ( لباشميل .

٣٢-الرحيق المختوم .

٣٣-سيرة النبوية لأبي شيبه .

٣٤- الحديث القران .

٣٥-رسائل النبي .

٣٦-تاريخ الخليفة .

٣٧-صحيح مسلم كتاب النكاح .

٣٨-السيرة النبوية صحيحة .

٣٩-الطبراني في التاريخ .

٤٠-شيخ الالباني في رواء الغليل .

٤١-طيراني في الكبير .

٤٢-كليات رنور في المكتوبات .

ئ
٤٣-الذهبي في التاريخ الاسلام .

٤٤-الحافظ في المطالب العالية .

٤٥-ابن عساكر في التاريخ دمشق .

٤٦-طبراني في التفسير .

٤٧-السيرة النبوية الصلابي .

٤٨-مشكاة المصابيح .

٤٩-الامام احمد في المسند.

٥٠-حلية الأولياء .

٥١-الرسول القائد .

٥٢-دلائل النبوة الواقدي .

٥٣-رحمة للعاليمن .

٥٤-السيرة النبوية لأبي حاتم .

٥٥-ابن كثير في التفسير .

٥٦-السيرة المغازي .

٥٧-روضة الأنف .

٥٨-ژیانی پیغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرموودە کاندا بە کوردی ، محمدملا فائق شارە زووری .

٥٩-ژیان نامەی پیغەمبەر ﷺ بەکوردی ،علی محمد محمدالصلابی .

٦٠-ژیانی ئازیزمان بە کوردی بە رگی یەکەم و دووەم ، حبیب محمدسعید.

٦١- پوختەی ژیاننامەی پیغەمبەری خوا ﷺ ،ماموستا علی با پیر .

٦٢-ژیانی پیغەمبەری مەزن ،شیخ عبدالعزیز بارەزانی .

٦٣-نوری نەمر ، فتح الله گولەن.

ئ

٦٤-ساتيك بو ناسينى ﷴ ،ماموستا ابو بكر .

٦٥-ميژووى طبري به كوردى ، محمدبن جرير طبري ، وەرگيرانى : زانەر محمد .

٦٦- پيغەمبەره كەت بناسه ، ماموستا على خان .

٦٧- پوختەى ژيانى پيەمبەرى خوا ﷺ ،ماموستا ملا عبدالخالق حسن شوانى .

٦٨- پەيامەكانى نور ، بديع و زمان سعيد نوورسى ،وەرگير :فاروق رسول يەحيا.

ئ

ئ

ێ

ێ